# پرسیارە بێ وەلامەکان
# بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان



سەردار کەریم

پرسیارە بێ وەلامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان







| | |
|---|---|
| ناوی کتێب | پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان |
| دانراوی | سەردار کەریم |
| ئامادەکردنی | عبدالرحمان عبدالله |
| دیزاینی بەرگ | مستەفا احسان |
| نەخشەی ناوەوە | عبدالرحمان عبدالله |
| ساڵی بڵاوکردنەوە | ٢٠١٥ز |

پەیجەکەمان لە فیس بوک بەناوی پرسیارە بێ وەڵامەکانە بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

# پرسیارە بێ وەڵامەکان

# بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

دانراوی

**سەردار کریم**

ئامادەکردنی

**عبدالرحمان عبداللە**

# پێشـەکــــــــی

**بسم الله الرحمن الرحيم و الصلاة و السلام على خاتم الانبياء و المرسلين و على اله و اصحابه و من اتبع هداه الى يوم الدين**

بەڕێزان وەك ئاگادارن هێرشێکی زۆر هەیە لەسەر ئاینی ئیسلام وە کەوتوەتە ناو قوتابخانەکان و فەرمانگەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و هەموو سوچ و کونجێکی کۆمەڵگای کوردییەوە . هەموو کەس دەڵێت ئەمە کاری بێدین و ملحدەکانە بەڵام ئەوەی کە زۆرینەی خەڵکی نایزانێت ئەوەیە چۆن ملحدەکان ئەم کارە دەکەن ؟ بۆیە ئێمە لەم پێشە کییەدا بۆتان ڕون دەکەینەوە ئەم کارانە چۆن سەری هەڵداوە و چۆن بڵاو بوەتەوە ؟ وە الحمد الله توانیومانە لەم کتێبەدا زیاتر( ٢٠٠ ) گومان پوچەڵ بکەینەوە بە بەڵگەی ئاینی و زانستی و عقلی و نقلی وە سەرچاوەی زۆربەی گومانەکانیشمان ڕوون کردوەتەوە بۆتان .

## سەرەتا با بزانین گومان چۆن دروست دەکرێت وە سەرچاوەکانی چییە ؟

**لە ڕێگای قورئانەوە** : دێن ئایەتێك دادەنێن وە دەڵێن ئەمە هەڵەیە یان هەر ڕەخنەیەکی تر بێت لێی دەگرن . کاتێك موسوڵمان سەیری دەکات قسەی ڕەخنەگرەکە تەواوە و ئایەتی قورئانە . بەڵام هاتوون ئایتە کەتان بە تەواوی بۆ دانانێن و دەیبڕن . یان ئایەتەکە نابڕن !؟ لەو کاتەدا دەبێت ئێمە هۆشیار بین بزانین پاش و پێشی ئایەتەکە چی نوسراوە ؟ بەو شێوەیە گومانەکەی پوچەڵ دەکرێتەوە.

**تەفسیری قورئان** : زۆرترین سەرچاوەی گومانەکان لە تفسیری ( قرطبي ) وەردەگرن . چونکە ئیمامی قرطبي بە ڕەحمەت بێت هەرچییەکی بیستووە یان خوێندویەتیەوە لە تفسیرەکەیدا نوسیوێتی وە هەر خۆشی لە پێشەکیەکەیدا دەڵێت من زانیاریەکانم لە بێژنگ نەداوە و ڕاست و نا ڕاستم لێك جودا نە کردوەتەوە دامناوە بۆ کەسانی دوای خۆم بۆیە هەمیشە سەیری بەڵگەی دژە ئیسلامەکان بکە لە تفسیری قرطبي دەری دەهێنن وە دەڵێن خۆ ئەوە قسەی ئێمە نییە و قسەی مفسرەکانی خۆتانە . بەڵام ئەوان ئەو پارچانە دەکەن بە بەڵگە کە لاوازە و کە لە خورافاتەوە نزیکە . بۆ نموونە ڕوداوی هەورە تریشقە دەڵێن بەهۆی قامچیی مەلایکەتەوەیە وە زۆر شتی تریش کە لە قرطبیدا نوسراوە .

**حەدیسەکان** : وەك دەزانن حەدیسەکان ڕاست و درۆ و هەڵ بەستراو لاواز و ... هتد . هەیە ئەمان دێن حەدیسە درۆ و لاواز و هەڵبەستراوەکانت بۆ دادەنێن وە دەڵێن ئەوە قسەی بخاري و مسلم و ... هتدە بەڵام ئەو بەشانەی لێ دەبڕن کە دەڵێت ئەم حەدیسە ڕاست نییە ؟ یان بە وێنە دای دەنێن لە انترنێتدا وە ژمارەی لاپەڕە و کتێب و حەدیسەکەشت بۆ دا دەنێن . بەڵام دێن حاشیەکەی ( پەراوێزەکەی ) لە وێنەکەدا دەبڕن کە حوکمی ئەو حەدیسەی تێدایە نا ڕاستە و هۆکاری ناڕاستیەکەشی دەبڕن .

**کتێبە ئیسلامیەکان** : دێن لە کتێب و سەرچاوە ئیسلامیەکان دەگەڕێن وە دەیکەن بە بەڵگە بەسەر ئاینی ئیسلامەوە و قسەی مێژو ونوسێك یان زانایەکت بۆ دادەنێن لەگەڵ ناوی کتێب و لاپەڕەکەشی . بەڵام ئاگادار بن چونکە ئەمە نابێت بەبەڵگە بۆ ئاینی ئیسلام و بۆ قورئان و بۆ حەدیسەکان !؟ چونکە ئێمە دین لە قورئان و سونة وەردەگرین نەك لە مێژوونوسێك یان مفسرێك یان ئیمامێك !؟ وە ئەگەر قسەی ئەو مێژوونوسە یان مفسرە یان ئەو ئیمامە مطابقی قورئان و سونەت بو وەری دەگرین پێچەوانەی بوو وەری ناگرین و نابێت بە بەڵگە بۆ ئاینی ئیسلام . بۆیە ئێوەش ئاگاداری ئەو سەرچاوانە بن و بە ناوی کتێب و ئیمام تێ نەکەون !؟ وە پێوەرتان بۆ ئەو گومانانە قورئان و سونەت بێت نەك قسەی فلان نوسەر یان فلان ئیمام .

**قسەی گیرفان و کۆپی و پەیست** : زۆر جار کەسێك گومانێك یان ڕەخنەیەك لەسەر ئاینی ئیسلامی مەزن بڵاو دەکاتەوە ، خۆشی نازانێت ئەو ڕەخنەیە باسی چی دەکات یان بیستوێتی !؟ یان بینیوێتی لە سایدێك !؟ دێت کۆپی دەکات و بڵاوی دەکاتەوە . هەمیشە پرسیاریان لێ بکەن ئەمە مانای چییە و سەرچاوەکەی چییە و بەڵگەی چییە ؟ دەبینین کەسەکە دەمی دەبێت بە تەڵەی تەقیو ( فبهت الذي كفر ) وە ٩٨% ی ئەو گومانانەی دەیبینین و دەیبیستین لەم خەڵکە عەوامەی کۆپی و پەیستەوەیە . وە زۆرەها جاریش ئەو شتەی ئەو باسی دەکات لە ئاینی ئیسلامدا بونی نییە ؟ هی ئاینەکانی ترە بۆ نموونە ئەو سێوەی ئادەم و حەوا خواردیان . وە زۆر نمونەی تریش

**نەزانینی زمانی عربی** : خەڵکانێکی زۆر گومان بڵاو دەکەنەوە خۆشیان نازانن ئەو شتەی بڵاو کراوەتەوە مانای چییە ؟ وە کەسەکە عربی نازانێت ! ئیتر ڕەخنە لەچی دەگرێت لە کاتێکدا نازانێت ئەو شتەی بڵاوی کردوەتەوە مانای چییە ؟ وەك ئەوەیە ئێمە کارێك بکەین و شارەزایمان نەبێت . بەهەموو شێوەیەك ئەو کارە سەقەت دەکەین و ناتوانین وەك کەسێکی شارەزا کارەکە بەڕێوە بەرین . کابرای دژە ئیسلامیش بەهەمان شێوە ڕەخنە لە ئیسلام و قورئان و حەدیس دەگرێت وە خۆشی عربی نازانێت و نازانێت مانای ئەو شتە چییە کە بڵاوی دەکاتەوە و جەنابی لێی ناڕازییە !؟

**بە گشتی ئەمە سەرچاوەکانی گومان و چۆنێتیی دروست کردنیان بوو . با ئێستا بێینە سەر باسی ئەوەی کێ ئەو گومانانە دروست دەکات ؟**

**١- هەموو سەدەکانی مێژووی مرۆڤ** : ٥٠% ی گومانەکان لەسەر بوونی ( الله ) یە کە خالقی کەونە و کێ و کەی و چۆن الله و کەون دروست بووە !؟ ئەم پرسیارە هێندە کۆنە کەس مێژووەکەی نازانێت !؟ بۆیە ئێمەش وەك موسوڵمان و ئومەتی ئاخر زەمان پشکی شێرمان بەر دەکەوێت لەم گومانانە . و کێشەی دژە ئیسلامیش لەوەدایە ١٠٠% یان نەخوێندەوارن و بێ ئاگان لە مێژووی مرۆڤ و هیچ خوێندنەوەیەکیان نیە بۆ خوداکان لە مێژودا ، وە کاتێك بونی خودا یان خالقێك ڕەت دەکەنەوە . بەڵگەیان خوداوەندە کۆنەکانە لای بابلی و ئاشوری و ڕۆمانی و ... هتد . وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکرێت ئەم خوداوەندانە چۆن دروست بوون و دەوریان چی بووە و خەڵکی و دەوڵەت لە زەمانی خۆیاندا چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردون ؟ وە ئایا جیاوازیی ئەو خودا وە بەندانە و الله ی خالق چی بووە ؟ کابرا هیچ نازانێت و بە گوێرەی دەق و بەڵگەی مێژووی قسە ناکات ؟ بەڵکو بەڵگە و قسەکانی هەمووی بە بۆچونی خۆی و وابزانم و بیستومە و قسەی گێرفانن

**٢-کافرانی قورەیش و جولەکە و منافقەکانی مەدینە** : زۆربەی زۆری ڕەخنەکان لە ئاینی ئیسلام لەو سێ سەرچاوەیەوە سەری هەڵداوە لەگەڵ سەرەتای سەر هەڵدانی ئاینی ئیسلامدا . وە ئێستا خەڵکی زیندووی دەکاتەوە . بەڵام کابرای کە ڕەخنە دەگرێت بە هەمان شێوە نە خوێندەوارە و تەنانەت هێندە بە نەزانی یان بە حیقد و ڕقەوە ڕەخنە دەگرێت هەموو شتێك ڕەت دەکاتەوە و هێندە بیر ناکاتەوە ئەگەر ئەو ڕەخنەیە ڕاست بووایا !؟ ئایا ئێستا کاریگەریی هەیە یان ئەو کاتە کە اسلام لاواز بوو !؟ طبعا ئەو کاتەی کە اسلام سەرەتای سەر هەڵدانی بوو دەتوانرا ئاینی ئیسلام پوچەڵ بکرێتەوە و نەهێڵن سەر هەڵ بدات . وە دەیان توانی خەڵکیی لێ دور بخەنەوە بڵێن ئەو قسەیە یان ئەو ڕوداوە ڕاست نییە !؟ بۆ نموونە لەت بونی مانگ یان ئیسرا و میعراج و ڕوداوی فیل و ... هتد. ئەگەر لە کاتی خۆیدا و گەرما و گەرم نەیان توانی بێت ئەو ڕوداوانە بە درۆ بخەنەوە . ئادەی پێم بڵێ پاش ١٤٠٠ ساڵ و لە ساڵی ٢٠١٥ دا بەتەمایت تۆ چی بکەیت وە چیت پێ دەکرێت ؟ ئایا مشرکەکانی قورەیش و منافقەکان و جولەکەکان ئەقڵیان پێ نەدەشکا ئەو ڕوداوانە بە درۆ بخەنەوە ؟ یان ئەو ڕەخنانە ی تۆ دەیگریت ئەوانیش بیگرن ؟ یان ئەوانە ڕوداوی ڕاستین و خەڵکەکە خۆی بە چاوی خۆی بینیوێتی و ئاگادار بووە بۆیە نەیتوانیوە ڕەخنە بگرێت یان بە درۆی بخاتەوە ؟ کەواتا کاتێك تۆی موسوڵمان ڕوو بەڕوی ڕەخنەیەك دەبیتەوە دەبێت حسابی ئەوە بکەیت ئەو ڕەخنەیە تازە نییە و ١٤٠٠ ساڵ کۆنە و لە دژە ئیسلام بپرسیت بۆچی کاتی خۆی ئەو شتە بە درۆ نەخرایەوە ؟

**٣-شیعة و معتزلة** : زۆربەی گومانەکان لەسەر ئاینی ئیسلام لە کتێب و سەرچاوەی ئەو دو فیرقەیە دەر دەچێت وە ئەو کەسەی ڕەخنە دەگرێت یان لەو دوو فیرقەیەیە یان دژە ئیسلامە و لە کتێبەکانی ئەو دوو فیرقەیەوە ڕەخنەکانی دەرهێناوە بۆیە تۆش وەك موسوڵمانێك دەبێت وریا بیت و شارەزایت هەبێت لەو دوو فیرقەیە و لە گومانەکانیان بۆ ئەوەی بتوانیت وەلامیان بدەیتەوە

**٤-ڕۆژهەڵات ناسەکان** : هەندێك لەو گومانانە لە کتێبی ڕۆژ هەڵات ناسەکانەوە دەر دەچێت وە ئەوان هاتوون ڕەخنەیان گرتووە و ئێستا بەرگوێی من و تۆ دەکەوێت

**٥-کڵێسا** : بووە بە سەرچاوەی تازە کردنەوەی هەموو گومانەکان وە ئەو هەموو خاڵانەی لە پێشەوە باسمان کردن لە چۆنێتی دروست کردنی گومان لە قورئان و تەفسیرەکانی و حەدیس و ... هتد . لەگەڵ سەرچاوەکانی ئەو گومانانە لە خوداوەندە کۆنەکان و کافرانی قورەیش و شیعە و معتزلة و ... هتد . کڵێسا هاتووە پارەی باش و کەناڵی تلفزیۆنی و ماڵ پەڕ و پەیج و گروپ و کەناڵی لە یوتوب دروست کردووە و ئەو گومانانەی هەر هەموو نوێژەن کردوەتەوە

**٦-بێدین و ملحدەکان** : ئەم داماوانە هاتوون ئەوانەی سەرەوە کە باسمان کردووە نقلی دەکەن یان ترجمەی دەکەن بۆ کوردی . و دەمی هەر کەسێکیش دەکەیتەوە دەڵێت بێدینەکان دژایەتیی ئیسلام دەکەن ملحدەکان دوژمنی سەرەکیمانن . بەڵام کابرای موسوڵمانیش لەو داماو ترە و بێ ئاگایە لە سەرچاوە و کانی و منبعی ڕەخنە و گومانەکان لەسەر ئیسلام . وە نازانێت کابرای بێدین ئەو خاڵانەی سەرەوە کە باسمان کرد بوە بە سەرچاوەی بۆ ڕەخنە گرتن لەسەر ئاینی ئیسلام . وە هیچ بێدینێك یان ملحدێك نییە خۆی هات بێت . لێکۆڵینەوە و دراساتی کرد بێت لە سەرچاوە ئیسلامیەکان و کتێبی نوسی بێت ، بەڵکو کامەیان زۆر شارەزایە و باوکی ڕۆحییانە و شتی بەهێز دەنوسێت بە حسابی ئەوان . جەنابی مامۆستا یان کۆپی و پەیست دەکات یان ترجمەی ئەو سەرچاوانەی سەرەوە دەکات بۆ زمانی کوردی.

**لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە : کێ ئەم گومانانە بڵاو دەکاتەوە بەتایبەتی لە کوردوستاندا !؟**

وەك ئاگادارن لە دوای ساڵی ٢٠٠٥ و ڕوخانی حکومەتی بغداد عیراق لە زاخۆوە هەتا بصرە موڵکی هەمو جیهان و دەستە و ڕێك خراوێکی ناوخۆ و جیهانییە . وە هەموو ئەو لایەنانە کار دەکەن هەریەکە و بە گوێرەی منهج و پرۆگرامی دیاری کراوی خۆی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا دەگونجێت . وە کێشەکە لێرەدایە هەر لایەنێك هەڵ دەستێت بە ناوی بێدین یان ملحدەوە ڕەخنە و گومانەکانی بڵاو دەکاتەوە . بەلام ئەو موسوڵمانانەی کە لەگەڵ دژە ئیسلامەکاندا مناقشە دەکات دەزانێت ئەمانە بێدین نین و لەژێر ناوی بێدیندا خۆیان شاردوەتەوە و بە پلەی یەکەم ( تبشیریەکانن ) واتا ئەو ڕێکخراوە جیهانییانەی بڵاو بونەتەوە لە جیهاندا ئاینی مەسیحی بڵاو دەکەنەوە . پاشان کاکەی و زەردەشتی و مجوسی و شیعە و یەزیدی و ... هتد .

**بەم پرسیارە کۆتای بە پێشەکیی ئەم کتێبە دەهێنم : ڕۆڵی تاکی موسوڵمان چییە ؟**

ڕۆڵی تاکی موسوڵمان ئەوەیە ئەگەر نەشارەزا بێت با وەلامیان نەداتەوە !؟ بەڵکو یان گوێگر بێت یان هەوڵ بدات بگەڕێت بە دوای وەڵامدا و فێر بێت چۆن وەڵام بداتەوە . چونکە وەڵام دانەوە بەنە شارەزای دەبێتە خاڵێکی لاواز بۆ کەسەکە و بۆ ئاینەکەشی. ئەو کەسانەی نەشارەزان با نەچنە پەیج و گروپی دژە ئیسلامەکان . چونکە بە چونی تۆ بۆ ئەو شوێنانە دەبیتە هۆکاری بەرز بونەوەی ژمارەی ئەندامەکانی و بازاڕ گەرم کردنیان . موسوڵمانی کورد زۆر تەمبەڵ و کەم تەرخەمن . هیچ یارمەتیی ماڵ پەڕ و پێگە و پەیجە ئیسلامیەکان نادەن کە وەڵامی ئەو دژە ئیسلامیانە دەدەنەوە تەنانەت لایکی بابەتەکانیشیان ناکەن بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو لایکەوە چەند برادەرێکی تری ئەو بابەتە ببینێت ئەوە باسی شێر کردن و بڵاو کردنەوەی بابەت هەر ناکەم . چونکە ئاستی کار کردنی موسوڵمانی کورد تا ئێستا لەو ئاستەدایە بە دوای ناوی الله و محمددا دەگەڕێن لەسەر توێکڵە شوتی و دار و ئەو بابەتانە زیاتر بڵاو دەکەنەوە نەك بابەتێکی فکری یان معرفی ؟

# ناوەرۆکی کتێب وچەند تێبینیەك

١- لەم کتێبە تەنها بەگوێرەی قورئان و فەرموودە وەڵامی گومانەکانمان داوەتەوە .

٢- لەم کتێبە لە روی زمانەوانی زۆر گرینگیمان نەداوە وە هەندێك ووشەی عەرەبی تێدایە لە وانەیە توشی ئەم رەخنەیە ببینەوە بلێ ووشەی عەرەبی تیدایە وا دەکەین لە کاتی چاپ کردن ئەم ووشانەش لابدەین ئەوەش بزانین من شانازی دەکەم کە موسڵمانێکی کوردم.

٣- زۆر گرنگیمان به دیزاین نەداوە بۆ کتێب جونکە وەڵامدانەوەی گومانەکان زۆر لای ئێمە گرنگتر بوو .

٤- سەرجاوەمان دانەناوە هەم لە ژێرەوەی لاپەرەکان وە هەم لە کۆتایی کتێب جونکە لەناو گومانەکان خۆمان ئاماژەمان بەسەرجاوەکە کردووە

٥- وێنەمان داناوە لە پرسیارەکان بەلأم بزانە هەندێك لە وێنەکان رِەخنەی دژە ئیسلامەکانە وەك خۆی بۆمان دا ناونەتەوە بەلأم هەندێکی تر لە وێنەکان خۆمانن روونکردنەوەمان بۆی داوە ئێوەش دەتوانی سوودی لێ وەربگری جونکە لە ناو پرسیارەکان ئاماژەمان بۆ وێنەکان کردووە.

٦- ئایەتەکانی و فەرموودەکان (bold ) بۆ کردووە بۆ جوانتر دیاربوونیان وە بەم شێوە ئاماژەمان بە ژمارەی ئایەتەکەو سورەتەکە کردووە بۆ نموونە (سورەتی **الواقعة** لە ٧٥دا ) .

٧- وە زۆر لینکمان داناوە لە ناو کتێب وەکو بەلگە بۆ پشت راست کردنەوە نووسینەکانمان بەلأم ئاسانکاریمان کردووە بۆ ئەو کەسانەی کەوا نێت بەکارناهێنن لە ژێر لینکەکە هێلێکمان لە ژێر داناوە نوسیومانە بابەتی ناو لینك ، مەگەر بابەتەکە دووروو درێژ بێت یان بە دوا گەران بێت کە وا پێویستی نەبێت ئەو کات دامانناناوە .

٨- ناوی کەسەکانمان لاداوە گۆریومانە بۆ فکرەی خۆیان مەگەر کەسێکی دیار بێت ، بەلأم لە بەیجی پرسیارە بێ وەڵأمەکان ماوەتەوە ئەتوانن سەیری بکەن .

٩- زۆر گرینگیمان بە خاڵبەندی نەداوە ، وە زۆر نیشانەی پرسیار مان دانەوە جونکە ئێمە پرسیار دەکەین .

١٠- بۆ هەر رەخنەیەك ئەتوانی سەردانی پەیجەکەمان بکەیت بە نامە ئاگادارمان بکەنەوە بەلأم لەسەر هەر بابەتێك کۆمێنتت هەبوو دەتوانی لە کۆمێنت دابنێت ئێمەش وەلامتت ئەدەینەوە.



﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِؤُواْ نُورَ اللّهِ
بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ
نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ {٣٢} هُوَ
الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ
الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ
كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ {٣٣}﴾: التوبة:

ژمارە: **یەك**

## خودا کێ درووستی کردووە؟




**وەڵامێک بۆ ئەوکەسانەی دەڵێن خودا کێ درووستی کردووە؟ یان چۆن درووستبووە؟**

جارێ یەک پرسیار بۆ تۆ ئەی مولحید. گەر بەپێی پرسیارەکانی مولحید بێت کەدەڵێن کێ خوای درووست کرد باشە ئەم پرسیارە با هەرلە کۆمپیوتەرێکەوە دەست پێ بکەین باشە؟

کێ کۆمپیوتەری درووست کرد؟ وەڵام:مرۆڤ،

ئەی کێ مرۆڤی دروست؟ وەڵام:خودا،

ئەی کێ ئەم گەردوونەی درووست کردووە بەوەی لەنێوەندیدایە؟ وەڵام : خودا،

ئەی کێ خودای درووست کرد؟ **وەڵام**:ئەم پرسیارە زۆر بی مانایە و پرسیارێکی هەڵەیە یان نەخۆشی دەروونی کەسەکە دەردەخات یان نەزانین یان ئەقڵ بەکارنەهێان، باشە گەر بشڵێین خودا یەکێکی تر درووستی کردووە،

*(تێبینی) :گەر خودا درووست کراو بێت واتە یەکێکی تر درووستی کردبێت ئەوە نابێتە خودا وسیفەتی خودایی بوون لەدەست دەدات ودەبێتە بەندە (عبد) خودا واتە درووستکەری هەموو شتێک دەتوانین بڵێین خاڵی کۆتایی کەکەس پێش ئەو نەبووەو کەسیش درووستی نەکردووە ،

مولحیدیش هەر دەڵێ ئەی کێ ئەوی درووست کرد ؟

ئەی ئەوی تر کێ؟

ئەی ئەوی تر کێ؟

ئەی ئەوی تر کێ؟

ئەوی ئەوی تر کێ؟ ..........................................هـــــتـــــد

پاشان هەر دەبێت بگەینە خاڵێکی کۆتا کەپرسیارەکەمان بوەستێنین و پێش ئەو خاڵە هیچی تر نەبووبێ وایە؟ وەک ووتمان ئەم پرسیارەی مولحیدان زۆر هەڵەیە مەنتقی نییە چونکە باوەڕیان بەخودانییە ناچار پرسیاری بێ مانا دەکەن، رەنگە بپرسن بۆچی هەڵەیە؟ چونکە ناگەیتە هیچ ئەنجامێک جگە لەو ئەنجامەی کە هێزێک دەبێت کۆتا هێز بێت و هیچ درووست کەرێکی نەبێت وهیچیشی لەپێشەوە نەبێت. گەر سەیری یاسای داینامیکی گەرمی بکەین ئەوە بۆمان دەردەکەوێ

داینامیك واتە موڤ یان جولە ،

لە ئەلکترۆن دەست پێدەکات و دواتر بۆ نیوترۆن و دواتریش پرۆتۆن . لەناو، پرۆتۆنیش کوارگ، لەناو کوارگیش، ( هێگز).، هێگز پێکهاتووە لەکانتین ،، کانتین : واتە هێڵی لەولەبی ئالۆزی وزە پەیداکەر وزە بەرهەم دێنێت زانا (بۆزۆن) لەم خاڵەدا وەستاوە کە بەبەرەو پێش خەری یاسای داینامیکی گەرمی دادەنرێت. واتە خاڵی کۆتا کە پێش ئەوە هیچ نەبوبێ ؟!

یان بۆ زیاتر تێ گەیشتن بانموونەیەک بێنینەوە

ئێمە هەمومان یاریەکانی گۆرەپان و مەیدامان بینیوە بەتایبەتی ماراسۆن و راکردنی یاریزانەکان کە دەبینین لە کۆتاییەکەی یەك کەس یەکەم دەبێت گەر بپرسین کێ یەکەم بووە؟ هەر دەڵێن ئەو ئەی بۆچی نابێت کەسێکی تر هەبێت لە پیش ئەوەوە؟ گەر بە فەلسەفەی مولحیدەکان بێت دەبێت یەکێکی تر لە پێش ئەو لەو یاریە یەکەم بوبێت بەس خۆ کەس یەکەم نەبووە؟ ئایا ئەمە مەنتقە؟

ئایا ئەو کەسەی وادەڵێ کەسێکی ساغە؟ ئەمە بۆ ئێوە بەجێ دەهێڵم،

سەبارەت بەوەی خودا چۆن هەبووە لەچی درووست بووە؟ خودای گەورە خۆی نایەوێت ئێمە لەم دونیایەدا هەموو ئینفۆرمەیشن و زانیاریەکمان هەبێت، هەر وەکو دەفەرموێت :(**وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ**)البقرة٢٥٥، واتە : (هیچ کام لە دروستکراوانی زانست و زانیاری تەواویان نیە دەربارەی زانیاری و زانستەکانی ئەو) ئێمە هیچ لە زانستی خوا نازانین تەنها ئەوەی خۆی پێی داوین، وە زۆر شت هەیە نەوەك ئیسلام بەڵکو پەیامبەرمان (صلی الله علیه وسلم) پرسیاری لە جیبرئیلی ئەمین کردوە وتوویەتی من نایزانم بەلام نەیوتووە وەلامی ئەم پرسیارە تەرکە و کەس نایزانێت.! بەڵکو بێگومان خودا دەیزانێت،

مولحیدان هەمیشە دەڵێن و دەڵینەوە بۆخودا ناتوانین ببینین؟ گەر هەیە بابیبینین ؟ وادەزانن موسوڵمانان ناتوانن وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە، خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرمێ:(**لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ ۖ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ** )﴿١٠٣﴾الانعام* واتە:دەزگای بینایی و (بۆچوونی ئادەمیزاد) ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، زانیاری ئەو خوایە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئاگاداریشە بەهەموو دەزگاکانی بینایی، هەر ئەوە وردبین و ئاگایە.،

بەڵام ئێمە دەتوانین دروستکراوەکانی خودا ببینین دەتوانین و بیربکەینەوە وە بەپێی زانست دەتوانین دەسەڵات و گەورەیی خودامان بۆدەربکەوێت و بیپەرستین چونکە هەموو ئەم گەردوون و بوونەوەرانە هەمووی بەڵگەن بۆ بوونی خودایەک ئەویش بێ گومان (الله)، گەر هەر بینینیش دەکەنە پێوەر خۆ زۆر شت هەیە نابینرێن و درک پێ ناکرێن لەهەمان کاتتدا بونیشی هەیە؟ عەقڵمان بە زۆر شت ناشکێت کە بونی هەبێت بەڵام لەهەمان کاتدا بونی هەیە؟ مرۆڤانێک لەسەردەمانێکدا ژیاون کە ئەم تەکنەلۆژیا و شارستانی ئیستا بینن ڕەنگە لەو سەردەمە کەسێک باسی ئەم سەردەمەی بۆ بکردنایە بە شێتیان لەقەڵەم بدایە ؟ کارۆ موگناتیسی و هێزی کێشکردن و بەکتریا و چەندەهای تر بە چاوی ئاسایی نابینرێن دەبێت بە چەند شتیک بونیان بسەلمێنرێت وەکو تلسکۆب و شتی تر تا ئاستی بینی چاو زیاتر بێت بۆ ئەو شتە یان دەستی لێ بدرێت باشە گەر ئەوە پێ ویستی بە لەمس و بە تلسکۆب هەبێت بۆ بینینی ئەی دەبێ جەنابت خوا بەچی بزانی کە دەتەوێ بیبینیت؟ خۆت نان دەخۆیت و چەندین سیفەتت هەیە کە تایبەتە بە مرۆڤەوە کە لە ماددە پێکهاتووە بۆیە هەر بەشێوەی ماددگەرایی بیر دەکەیتەوە و وا دەزانی خودا ماددەیە تاکو بیبینیت؟

ڕەنگە پرسیاری زۆرتر دروست بێت لەمێشکی ئەم ماددەگەرایانەدا

ئایا خوا نان دەخوات؟

ئەی چۆن دەژی ؟

چی ئەکات؟

خێزانی هەیە؟

مناڵی هەیە؟

ئەها سەیر بکە عەقڵت لێکدانەوەی هەمان سیفەت دەکات بۆ چوار دەورت چونکە تۆ خۆت ئەمانەت هەیە بۆیە وابیردەکەیتەوە؟! گەر رۆبۆرتێک بکەینە نموونە کە مرۆڤ دروستی کردوە گەر گریمان هێنامانە قسە لەوانەیە ئەویش وەکو تۆ چۆن بۆ خودا بیر بکەیتەوە ئاواش لە مرۆڤ بیربکاتەوە کە بە کارەبا ئیش دەکات پێکهاتەکانی ئاسنە تواناکانی سنور دارە ئەسوتێ و تێک ئەچێت ئیتر ئەو سیفەتانەی کە هەیەتی بەو شێوەیە بیرلەمرۆڤ دەکاتەوە. بەڵام جیاوازی نێوان ئێمەی موسوڵمانی یەکخواپەرست و ئێوەی مولحید ئەوەیە باوەرمان بە غەیب هەیە وە دڵنیاشین بونی هەیە وە بە زانستی مەنتقیش هەم خوا و هەم زیندوو بونەوەش دوای مردن دەسەلمێنرێت ئیتر بۆ رەددی دەکەیتەوە ؟ کە خودا بونی هەیە؟ تۆ جارێ خۆت دەزانی لاشە و گیان و دڵت بەبێ ئەوەی خۆت هەستی پێ بکەیت و بەشداربیت لە کردارەکانی هەناوی رۆژانە کە وەکو دینامۆیەک وایە هەموو کاتێک کار دەکات بەبێ ئەوەی تۆ ئاگاداریش بیت کە ئەوە نەما دەمریت؟ تا ئیستا تۆ خۆتت دۆزیوەتەوە بە عەقڵێکی سەلیمەوە درکت بە شیرینی دڵ کردووە کاتێک لەو رێ یەوە درک دەکەیت بەڕاستییەکان؟

یان کێشەی تۆ خۆ بەگەورە زانینە؟ کێشەی تۆ ئەوەیە خۆت دەربخەیت؟

کاکی مولحید خۆی نەدۆزیوەتەوە شەوانە خۆی دەدزێتەوە لە چەندین پرسیار کە بەمێشکی دا دێت و سروشتی خۆی داوای لێ دەکات کە خودایەک هەیە و دەبێ ئیمانی پێ بێنێت گینا رەنجەرۆیە بەڵام خۆی دەدزێتەوە؟ کاکی مولحید لەو ناوبانگەی دەترسێت کە نەمێنێت لەو نەمانی رێزە دەترسێت لەناو هاوشێوەکانیدا کە زۆر بلیمەتە و رەدی ئیسلام دەداتەوە وەئەوە لەدەست بدات کەبەو مولحیدییەی بەدەستی هێناوە ئەگەر چی بشزانێت ئیسلام ڕاستە ، هەمان هەڵوێستی ئەبو جەهل کە دەیزانی پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕاسگۆیە و هەرگیز درۆیەکی نەکردوە وە دەشی زانی پەیامەکەی حەقە و ئیسلام حەقە بەڵام چی رێگری لێکرد ببێتە موسوڵمان؟ طەبعەن دەسەلات و ناوو ناوبانگی لە هۆزی قورەیش لەمەککە طەبعەن خۆ بەگەورە زانینی وای لێکرد کە حەق وەرنەگرێ؟! کاکی مولحید وا دەزانی هەمان شێوەی تۆ روینەداوە لە ڕابردوودا؟ ئایا ئەو شتانەی باسمان کردن هەمان ئەو شتانە نین کە تۆ ئیستا تێیدایت ؟ نازانم بۆ وا خۆتان دەردەخەن کە بێ کێشەن و زۆر مرۆڤ دۆستن و هەڵەتان نییە هەموو هەڵەکان تەنیا لە موسوڵمانان و دیندارەکانی تر دەردێنن؟ دەتانەوێ بەم رێگەیە هەدەفی خۆتان بشارنەوە و یاری یەک گۆڵی بکەن؟ اسلام تەنیا لەلایەنی دەرونیتان دەدات وەک هەدەفێک تاکو بێداربینەوە هەستن لەو خەوەی کە تێیدان وا دەزانن ڕاستن! ئایا پەرچەکردارێک رۆژانە پێتان ناڵێ خودایەک بوونی هەیە دەبێ بروای پێبکەیت چەندین روداو دێتە پێشت کە پەرچە کردارت و دەرونت ئاگادارت دەکاتەوە

خودایەک هەیە ؟! تاکەی خۆت دەدزیتەوە ؟ نازانم دەبێ دۆزینەوەی ڕاستییەکان چی بێت کە مرۆڤەکان جارێ خۆیان ون کردوە؟ تۆ کە خۆت ون کردوە و خۆتت نەدۆزیوەتەوە یانی هەر بە ڕاست بەتەمای لەدەرەوەی خۆت ڕاستی بدۆزیتەوە؟ تۆ چاوشارکێ لەگەڵ خۆتدا دەکەیت؟ خۆت هەڵدەخەڵەتێنی فریوت خواردوە بە شەیتان و بەڵگەکانی بویتە بەندەی ئەو و درکیشی پێ ناکەیت. وە دەشڵێن بە شانازیشەوە بەڵێ خودا نییە! ئای ئەم ڕستەیە چەند قورسە وتنی بەڵام لە تەرازوی ڕاستیدا چەند بێ مانایە! ئایا هەر ئێوە ڕاستن؟ بەڵگەتان هەیە کە خوا بونی نییە؟

نمونەی ئەم قسەیە ئەگەر لە کوردستان کەسێک بێت بڵێ دەیسەلمێنم یۆرانیۆم لە کوردستان هەیە بە دۆزینەوەی غرامێک یان کەمتریش ئەوا دەبێتە بەڵگە بۆی کەبونی هەیە؟ بەڵام گەر بڵی بونی نییە یۆرانیۆم لە خاکی کوردستاندا ئەوا دەبێت بچێت بست بە بست خاکی کوردستان بگەرێ تا بیسەلمێنێت کە بونی نییە یۆرانیۆم گینا هەر بەقسە بۆی ناچێتە سەر بۆیە بەڵگە بۆ نەبوونی خودا هاوشێوەی ئەمەیە بونی سەلماندنی شتێک ئاسانترە وەک لەنەبونی!

ئینجا بابێینە سەر عەقڵی مولحیدەکان!

ئایا ئێوە هەموو گەردون گەراون ئەستێرە بە ئەستێرە و گالاکسیەکان یان هەر بڵێین هەموو گەردون گەراون کە بڵێن خودا بونی نییە چونکە بە عەقڵی ئێوە بێت دەبێ هەرخودا شتێکی ماددی بێت بۆیە دەڵێم ناو گەردون؟! لێرەدا دەڵێم مولحید کەسێکە خۆی بەگەورە دەزانێت و لوت بەرزە و حەق وەرناگرێت و ملکەچ نابێت کە باوەر بەبونی خوا بکات دەڵێ لەخۆیەوە ئەم جیهان و گەردونە دروست بون و هەر لەخۆیانەوە ئەستێرە و کاکێشان و لەناویدا کۆمەڵەی خۆر و هەسارەکانی تر و هێزی کێشکردن و ئەمانە هەمویان لەخۆیانەوە درووست بون و ئێمەش لە هیچەوە دروست بوین و مرۆڤیش لە مەیمونەوە پەرەی سەندووە. من ئازادم بیروباوەری خۆم بڵاوکەمەوە شتێک دڵنیاییەک دەزانم کە تیایدا خۆشییەکانی مرۆڤی تیا بەرجەستە دەبێت وە لەدڵسۆزیمە کە قسە دەکەم و ئەم پۆستە دەکەم تاکو مولحید بیربکاتەوە و هیچ نەبێت ببێتە یەکەم دەرگاکردنەوە بۆ ناسینی خودا وەک وتم من خۆشییەک شک دەبەم دڵنیاییەک شک دەبەم حەز ناکەم مرۆڤێکی تر لێی بێ بەش بێت حەز دەکەم ئەویش وەک من بگات بەو دڵنیاییە و بزانێت کە چییە کێ یە و لەکوێوە هاتووە و خوای خۆی بناسێت تاکوو لە دوا رۆژدا سەرگەردان نەبێت کەواتە ئەمە لەدڵسۆزییە! ئەوانەی کە ئەڵێن خودا نیە وەک کوێرێک وایە بلێ ژورێک تاریکە چونکە خۆی هیچ نابینێت و هەست بە ڕوناکی ناکات ئەگەر روناکیش هەبێت ئەوا هەر هەستی پێناکات وەبەو هەست نەکردنەی ئەو مانای ئەوە نیە کە ڕوناکی نیە بەڵکو ئەوەیە ئەو کەسە توانای بینینی نیەو کێشەکە لە خۆیەتی. بەڵام دڵسۆزی ئەوان لەچیدایە بۆ ئێمە یان دەمانکەنە مەیمون یان بێ ئامانجیمان بۆ بەرهەم دێنن لەبەردەم

ژیانێکی کاتیدا دەڵێن دەبینەوە بەهیچ یان ئەو فەلسەفەیەی نیتچە دێننەوە کە دەڵێ(**پێم بڵێ پێش لەدایک بونم لەکوێ بوم تا پێت بڵێم دوای مردنم بۆ کوێ ئەچم**؟)

---

**ژمارە: دوو**

## ئایا زنیم جنێوە یان وەسفە ؟



لە سورەتی **القلم** ١٣ دا خودای زانا دەفەرموێت : (**عتل بعد ذلك زنيم** ). دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئەوە جنێوە و چۆن دەبێت خودا لە کتێبەکەیدا جنێو بدات و خەڵکی بە زنیم وەسف بکات و زەنیم واتا منداڵی زینا یان کوڕی زینا.

بەڵام ئەو دژە ئیسلامانە شارەزای زمانی عەرەبی نین یان شارەزان و خۆیان گێل دەکەن . چونکە زنیم بەو مانایەی ئەوان نایەت . بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنین پێشەکی دەچین بۆ ناو هۆزەکانی عەرەب و بزانین هیچ هۆزێکی عەرەب هەبووە لەقەبیان زنیم بووبێت یان بە زنیم بانگ کرا بێتن یان پێیان گوترابێت هۆزی زنیم ؟

دوو هۆزی عەرەب هەیە بە ناوی زنیم بن الجوهري وە ازنم بن يربوع الجوهرييە وە عوامی کوڕی شوذبی شیبانی هۆنراوەی پێدا گۆتون و دەڵێت :

**فلو أنها عصفورة لحسبتها مسومة تدعو عبيدا وأزنما**

وە هەروەها ابن الأعرابي دەڵێت :

بنو أزنم کوڕی عبید کوڕی ثعلبة کوڕی يربوعە و حوشتری ازنمیش بە ناوی ئەوانەوە ناو نراوە و ئەم شیعرەش هەیە لەسەر ئەو هۆزە و حوشترەکانیان کە دەڵێت :

**يتبعن قينـي أزنمـي شـرجب لا ضـرع السـن ولـم يثلـب الإبـل تركـب قينـي هـذا البعيـر**

وه ابن الزنيم ناوی یەکێکە لە شاعیرەکانی ئەم هۆزە

کەواتا مادام دوو هۆز هەبێت بە ناوی زنیمەوە و شاعیریشیان هەبێت بە ناوی ابن الزنیمەوە . ئەو ناوە بە مانای زیناکار یان کوڕی زۆڵ نایەت وە هیچ کەس ڕازی نییە بەوەی سەر بە هۆزێك بێت بە کوڕی زۆڵ یان منداڵی زینا بانگ بکرێت . هەروەها صەحابی بەڕێز سارية بن زنيم الديلي الكناني کە یەکێك بووە لە صحابەکان باوکی ناوی زنیم بووە و لە هۆزی کنانە بووە . ئەم سەحابەیەش ناسراوە لە ڕیواتەکە ی عمری کوڕی خطابدا کە دەفەرموێت یا سارية الجبل الجبل کەواتە دەبێت بزانین زنیم مانای چییە ؟ زنیم واتا هەر شتێك خۆی بە شتێکدا هەڵ واسێت بۆ نمونە بە زمانە بچکۆلە دەگوترێت زنمة چونکە خۆی هەڵواسیوە بەناو دەمدا بە بەشی خوارەوەی گوێ دەگوترێت زنمة چونکە گوارەی پێدا هەڵ دەواسرێت . وە لەناو عەرەبیشدا حوشتری ڕەسەن پارچەیەك لە گوێیان دەبڕی و لێیان نەدەکردەوە بەڵکو وازیان لێ دەهێنا بە گوێوەی دەمایەوە پێیان دەگوت زنمة و ئەو دوو هۆزەی سەرەوە کە باسمان کردن ناسراو بوون بەوەی حوشتری ڕەسەنیان هەبوو گوێیان دەبڕی بۆیە پێیان دەگوتن هۆزی زنیم و هۆزی ازنم. ئەگەر بە لێکدانەوەی دژە ئیسلامەکان بێت دەبێت ئەو دوو هۆزە هەردوکیان منداڵی زینا بن بەڵام لە ڕاستیدا زنیم ئەو مانای نییە واتا هەڵواسراو بە شتێکدا . وە ئایەتەکەش دەفەرموێت (**عتـل بعـد ذلـك زنـيم** ). عتل واتا ڕاکێشان وە زنیم واتا خۆی هەڵ واسیووە . ئەم ئایەتەش لەسەر ولیدی کوڕی مغیرە دابەزیوە چونکە زۆر ئازاری موسوڵمانەکانی دەدا کە واز لە ئیسلام بهێنن و بگەڕێنەوە بۆ بت پەرستی وە پاش ئازار و ئەشکەنجەدانیان قاچیانی دەگرت و ڕای دەکێشان پاشان لە جێگایەکدا فڕێی دەدان . لێرەدا تێ دەگەین بۆ بە ( عتل ) وەسف کراوە چونکە لە قاچەوە موسوڵمانەکانی ڕادەکێشا وە سەر سەخت ترین دوژمنی موسوڵمانەکان بوو بە هەموو شێوەیەك ئازاری دەدان و کەس نەبوو وەك ئەو ئازاریان بدات چونکە کەسێکی دەوڵەمەند و خاوەن دەسەڵات بوو کەس نەی دەوێرا ڕوو بەڕووی ببێتەوە موڵك و ماڵی هێندە زۆر بوو لە حساب نەدەهات . یەکێك بوو لە هەرە سەر گەورەکانی قورەیش و دورگەی عەرەبی وەك پارە و وەك دەسەڵات و وەك گەورەیی . شانازیی بەو شتانەوە دەکرد کە گەورەی هۆزەکانە ، بۆیە خودای تعالی بە زنیم ناوی بردووە . واتا هیچ گەورە نییە بەڵام خۆی بە قورەیشدا هەڵ واسیوە و هیچ ئەسڵ و فەسڵێکی نییە . کاتێك ولید ئەو ئایەتەی بیست زانیی زنیم واتا خۆی هەڵ واسیوە بە قورەیشدا چوو لە دایکی پرسی من کوڕی کێم ؟ دایکی گوتی تۆ کوڕی شوانەکەیت کوڕی باوکت نیت !! من لەگەڵ شوانەکەدا نوستوم تۆم بووە

کەواتە **عتل بعد ذلك زنيم** واتا خەڵکی ڕادەکێشا و خۆی هەڵ واسیوە بە هۆزەکەیدا ...

**پرســـیاری بـــێ وەڵامـمـــان ئەمەیـــە** : بۆچی ولیـدی کـوڕی مغیرة پێغەمبـەری (صلی الله علیـه و سـلم) نـه کوشـت ؟ خـۆ ئـەو کاتـە موسـوڵمانەکان هـیچ دەسـەڵاتێکیان نـەبوو بەڵگەشـمان ئایەتەکەیـە کـە دەڵێـت عتـل ولیـد هـەتا تاقـەتی هەبوایـە لە موسوڵمانانی دەدا پاشان بە قاچ ڕای دەکێشان کابرایەکی عتل بوو

ئایا ئەمـە بەڵگـە نییـە بـۆ ئـەوەی کـافری وەختی خـۆی زۆر لـە کـافری ئێسـتا بـە اخـلاق تـر و ڕاسـت تـر بـووە و ڕاسـتیەکانی قبـوڵ کردوە و وەك کافری ئەم زەمانە سەرسەخت نەبون و هەموو شتێك ڕەت بکەنەوە ؟

هەروەها وەلیـدی کوڕی مغیرة بـاوکی خالیـدی کـوڕی وەلیـدە . ئەو کاتە خالیـد کافر بـوو . بـۆچی وەلیـد بـە خالیـدی نـەگوت پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) وە موسوڵمانەکان لەناو بەرێت چونکە قورئان ئەسڵی ڕەچڵەکی باوکیانی کەشف کردووە ؟ شیعەی ڕافیزەش ئەم خاڵەیان کردوە بە خاڵێکی لاواز بەسەر خالیدەوە بەڵام خالید زنیم نە بووە بەڵکو باوکی زنیم بوە .

**کۆتا پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : دژە ئیسلامەکان دەڵێن محمد (صلی الله علیه و سلم) (٤ ساڵ) یان (٥ ساڵ) دوای مردنی باوکی لەدایك بووە واتا کوڕی عبدالله نییە و العیاذ بالله زۆڵە . ئەم ئایەتی( **عتل بعد ذلك زنیم**) ئەو درۆ و بوهتانەش پوچەڵ دەکاتەوە . چونکە کاتێك ولیدی کوڕی مغیرە زانیی کوڕی شوانەکەیە و کوڕی باوکی نیە و خۆی هەڵ واسیوە بە قورەیشدا ئەی بۆچی وەلیدیش پێی نەگوت : محمد تۆش کوڕی عبدالله نییت و (٤) ساڵ دوای مردنی باوکت لە دایك بوویت ؟ وە ئەو کاتە خەڵکی پیر و بە تەمەنیشی لێ بوو دەیان توانی ئەو زانیارییە پشت ڕاست بکەنەوە و پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) وە موسوڵمانانیش زۆر بێ هێز بوون دەسەڵات و هێز لای وەلیدی کوڕی مغیرە بوو نەك موسوڵمانەکان . وە ولید دەی توانی قورئان پوچەڵ بکاتەوە بڵێت وەسفی من دەکات بە ( زنیم ) کەچی محمد خۆشی عتلە کوڕی عبدالله نییە و لە گەورەکانی قورەیش نییە . وە خودای محمد بە من دەڵێت ( زنیم ) کەچی نێرراوەکەی خۆشی ( زنیمە ) !؟

بەڕێزان خۆشەویستان مەزنی ئەم ئاینی ئیسلامە لەوەدایە هەر چەندێك دژایەتی بکرێت بەهێزتر دەبێت چونکە هەر قورئان خۆی وەڵامیان دەداتەوە . وەك بینیتان ئەوان ڕەخنە لەوە دەگرن قورئان جنێو دەدات و خەڵك بە زۆڵ لەقەڵەم دەدات . بەڵام نازانن چەواشەکاری دەکەن و زنیم مانای زۆڵ نییە !! پاشان هەر وشەی زنیم خۆی بوو بە بەڵگەیەکی کۆنکرێتی بۆ دوژمنانی ئیسلام کە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) کوڕی عبدالله یە و (٤ ساڵ) دوای مردنی باوکی لە دایك نەبووە ئەگینا ولیدی کوڕی مغیرە دەی توانی بە هەمان وەسف کە ( زنیمە ) بیداتەوە بە چاوی پێغەمبەردا (د.خ) وە قورئانیش پوچەڵ بکاتەوە لە کاتی لاوازی و سەرەتا دا کە دەسەڵات لای وەلید بووە نەك لای محمد (صلی الله علیه و سلم).

**ژمارە: سێ**

## ئایا ئەم ئایەتە هەڵەیە (لا اقسم بهذا البلد ).

لە سورەتی **البلد** لە ئایەتی ١ دا دا خودای زانا دەفەرموێت (**لا اقسم بهذا البلد** ). واتا سوێند دەخۆم بەم ناوچەیە کە دەکاتە مەکە بەڵام دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئەم ئایەتە هەڵەیە چونکە بە ( لا ) دەستی پێ کردوە و لا بۆ( نهی ) کردنە لە شتێك واتا بە حسابی ئەوان ئایەتەکە دەڵێت سوێند ناخۆم بەم شارە کە مەکەیە.

باشە ئەگەر وای دابنێین ئەو ئایەتە هەڵەیە . کێ شارەزاتر بوو لە زمانی عەرەبی ؟ کافری قورەیش یان کافری زەمانی ئینتەرنێت و کۆپی و پەیست ؟ ئەم ئایەتە مکیە واتا لە مەکە دابەزیوە لە کاتێکدا کافرانی قورەیش هەمیشە بە شوێن پێغەمبەر (د.خ) و موسوڵمانەکانەوە بوون بۆ ئەوەی هەڵەی لێ بگرن .
ئەگەر ئەم ئایەتە هەڵە بووایە دەیان توانی قورئان پوچەڵ بکەنەوە کە تحدایان دەکات ناتوانن قورئانێکی هاو شێوە دروست بکەن . ئەی بۆچی قورئانیان پوچەڵ نە کردەوە لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی نەگاتە دەست ئێمە ؟ وەڵامەکەی ئاسانە چونکە ئەوان شارەزاتر بون لە زمانی خۆیان وە دەیان زانی ئەوە لای قەسەمە واتا سوێند خواردن . کاتێك دەچێتە سەر ووشەیەك ئەو ووشەیە ( لا ) لانابات بەڵکو تەئکیدی دەکات وە نموونە زۆرە لە شیعری عەرەبدا لا لە شیعردا بەکار دەهێنن خەڵکی نەزان بیخوێنێتەوە بە ( نا ) تێ دەگات بەڵام مەخسەد لە نا نییە بەڵکو پێچەوانەیە

بۆ نموونە

**فلا و حق الذي مسحت كعبته ... و ما هريق على الانصاب من جسد**

لێرەدا **فلا وحق** واتا بە حەق بەڵام نەزان دەڵێت نا بە حەق

**تذكرت ليلى فاعـترتني صبابـة ... وكاد صميم القلب لا يتصدع**

لێرەدا **لا يتصدع** واتا ناخی دڵ پارچە پارچە بووە نەزان دەڵێت دڵم پارچە پارچە نە بووە

**فَلاَ وابيك ابنة العامري ... لا يدعـي القـوم أني أفر**

لێرەدا **فلا و ابيك** واتا ئەوە باوکتە بەڵام نەزان دەڵێت ئەی کچی عامر ئەوە باوکت نییە

وە لە قورئانیشدا هاتووە سورەتی **الواقعة** لە ٧٥دا **فلا اقسم بمواقع النجوم** واتا سوێندی پێ دەخۆم . هەروەها لە **سورەتی القیامة ١** و **٢** دا دەفەرموێت (**لا اقسم بیوم القیامة و لا اقسم بالنفس اللوامة**) . هەروەها لە سورەتی **ال عمران ١٥٣** دا دەفەرموێت( **لکیلا تحزنوا** )، واتا بۆ ئەوەی دڵ گران بن نەك بۆ ئەوەی دڵ گران نەبن . لە سورەتی **طه ٩٢ و ٩٣** دا باسی موسا و هاروون دەکات علیهم السلام کاتێك هارون لای بنو اسرائیل بوو ئەوانیش پشتیان کردە خودا و شوێن گوێرەکە ئاڵتونیەکە کەوتن موسا (ع) بە هارون دەڵێت : (**ما منعك اذ رایتهم ضلوا الا تتبعن** ). ئەگەر نەزان ڕاڤەی بکات دەڵێت **لا تتبعن** واتا شوێنم مەکەوە بەڵام مانای ئەوەیە شوێنم کەوە

نموونە زۆرە لە قورئاندا بەڵام ئەمەندە بەسە . وە ئەو جۆرە دەستەواژە و قسانە لە زمانی هەموو قەومێکدا هەیە لە کوردەواریی خۆشماندا دەڵێن : پێت نەڵێمەوە واتا پێت دەڵێم . کارێکت دەبێت لای کەسێك کە ئاگای لە کەسێك بێت یان کارێکی بۆ بکات کاتێك دەڕۆیت پێی دەڵێیت بۆ فڵان کەس پێت ناڵێم . واتا پێت دەڵێم و دووبارەی دەکەمەوە لێت لە یادی نەکەیت .

زۆرجار دەلێین : نەکەی فڵان شت بکەی ! مەبەستمانیش هاندانە بۆ کردنی ئەو شتە . یان بە هاوڕێ و خزمێك دەلێین : نەیەیت بۆ سەردانیمان ! واتا وەرە بۆ سەردانمان . یا بۆ نموونە کەسێك نوێژ ناکات یا هەرکارێکی خێر ، کە مەبەستمانە بیکات و بە شێوەی (نەکردن ) فەرمان بە (کردن)ی دەکەین و، دەلێین : برا تۆ نوێژ مەکە ، یا نەکەی فڵان کار یان فڵان شت بکەیت! یان کەسێك دەنێریت بۆ کارێك پێی دەڵێت بە قسەم نەکەیت واتا بە قسەم بکە وە زۆر شتی تریش هەیە لە زمانی کوردیی خۆشماندا بە ( نا ) دەیڵێین بەڵام ناکە حسابی بۆ ناکرێت و بەرامبەر تێ دەگات مەبەستی نە کردنی نییە بەڵکو کردنێتی و بە بەڵێ دێت نەك ( نا )

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : ئەگەر ئەو ئایەتانەی بە لا دەست پێ دەکات لا اقسم و زۆر ئایەتی تریش هەڵە بونایە . ئایا باشترین بەهانە نەبوو بۆ قورەیش بڵێن خوداکەت تحدامان دەکات قورئانێکی وەك ئەوەی ئیسلام بنوسین کەچی هەموو قورئانەکەتان هەڵەیە وە خەڵکیش شوێن قسەی کافرەکان دەکەوتن،چونکە زمانی خۆیانە و شارەزان و ئیسلام و قورئانیان پوچەڵ دەکردەوە بەڵام وەك چۆن ( نا ) لە زمانی کوردی و هەموو زمانێکی تر لە جیهاندا حسابی بۆ ناکرێت و بە بەڵێ وەر دەگیرێت زمانی عەرەبیش هەمان شتە . بەڵام کاکی دژە ئیسلام لە ڕق ئەستوری و کینە و نە شارەزایی خۆی پاش ١٤٠٠ ساڵ دەیەوێت قورئان پوچەڵ بکاتەوە . بەڵام ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش لە مەکەدا زۆر بە ئاسانی پوچەڵ دەکرایەوە . ئەوان زیاتر پێویستیان بە پوچەڵ کردنەوەی ئیسلام بوو بەڵام نیان تانی !؟

دژە ئیسلام ئێستا خەبەری بوەتەوە و دەڵێت ئەو ئایەتانە هەڵەیە لە کاتێکدا زمانی خۆشی پڕە لەو ووشانە و ڕۆژانە خۆشی بەکاری دەهێنێت.

## پرسیارە بێ وەلآمەکان ژمارە :چوارەم
## نێربازی لە بەهەشتدا.




نەیارانی ئیسلام دەڵێن لە بەهەشتدا منداڵی جوانی لێیە بۆ نێربازی . پرسیار بە چی بەڵگەیەك دەڵێن بەهەشت نێربازیی تێدایە ؟ لە کاتێکدا ئەو چەواشەکاریەی ئەوان باسی دەکەن و کردویانە بە بەڵگە لەم دوو ئایەتەوە وەریان گرتووە **سورەتی الواقعة ١٧( و يطوف عليهم ولدان مخلدون** ) هەروەها لە سورەتی **الانسان ١٩ دا** دەفەرموێت ( **و يطوف عليهم ولدان مخلدون**)

فەرموو بەڕێز تێمان بگەێنە لە کوێدا باسی نێر بازی دەکات ؟ لە شەریعەتی موسا و عیسا و محمددا علیهم السلام نێر بازی یاساغە و قەدەغەیە و حەرامە !! ئەی بە چی بەڵگە و چی یاسایەك خودا حەلاڵی دەکات لە بەهەشتدا ؟ بۆچی لە دنیادا حەرامە و لە بەهەشتداحەلاڵە؟

---

## پرسیارە بێ وەلآمەکان ژمارە :پێنج
## خۆ ڕەحەت کردن بە ناوگەڵی منداڵ المفاخذة




مسألة ١١ ـ المشهور الأقوى جواز وطء الزوجة دبراً على كراهية شديدة، والأحوط تركه خصوصاً مع عدم رضاها.

مسألة ١٢ ـ لا يجوز وطء الزوجة قبل إكمال تسع سنين، دواماً كان النكاح أو منقطعاً، وأما سائر الاستمتاعات كاللمس بشهوة والضم والتفخيذ فلا بأس بها حتى في الرضيعة، ولو وطأها قبل التسع ولم يفضها لم يترتب عليه شيء غير الاثم على الأقوى، وإن أفضاها بأن جعل مسلكي البول والحيض واحداً أو مسلكيْ الحيض والغائط واحداً حرم عليه وطؤها أبداً لكن على الأحوط في الصورة الثانية، وعلى أيّ حال لم تخرج عن زوجيته على الأقوى،

٢٢١

نەیارانی ئیسلام بە هەموو جۆرەکانیەوە . دەڵێن ئیسلام حەلاڵی کردوە پیاو خۆی ڕەحەت بکات بە ناو گەڵی منداڵ . وە بەڵگەشیان بۆ ئەم قسەیەیان فەتوایەکە لە اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء ی سعودی دەرچووە . فەتواکەش دەڵێت : بەڵێ جایزە خۆ ڕەحەت کردن بە ناوگەڵی منداڵ چونکە پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم) ئەو کارەی کردووە لەگەڵ عائیشەدا کاتێك تەمەنی (٦)ساڵان بووە. چونکە منداڵ بووە بۆیە بەو شێوەیە جنسی لەگەڵدا کردووە.

لێرەدا گومانی دوژمنانی ئیسلام تەوا دەبێت . وەلامی ئەم گومانەش بەم شێوەیەیە : ئەم فەتوایە هیچ ئەسڵ و ئەساسی نییە ؟ وە دروست کراوە . ئێمە لە خوارەوە بە عربی دەقی فەتواکەمان بۆ داناون کە خەڵکی نەفس نزم و نەخۆش دروستیان کردووە . ئەگەر لە هەر شوێنێك ئەم گومانەتان بینی داوای دەقی فەتواکە یان لێ بکەن لە سەرچاوە ئەسڵیەکەی کە **اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء لە سعوديەيە** . ئەمەش لینکی ئەو مەرکەزی فتوایەی سعودیەیە پێیان بڵێن فەرموون لەم لینکە فەتواکەمان بۆمان دەربهێنن

http://www.alifta.net

طبعا ناتوانن بۆتان بهێنن چونکە درۆ دەکەن . وە ئەوان بە نوسین بۆتان دەهێنن وەك لە خوارەوە دامان ناوە یان بە وێنەیەك بۆتان دەهێنن . وە مفاخذة و خۆ ڕەحەت کردن لە ئیسلامدا نیە بە هیچ شێوەیەك وە هیچ دەقێکی قورئان و هیچ حەدیسێکی لەسەر نییە !! ئەگەر دەڵێن وا نییە با حەدیسەکان بهێنن بە متن و سندەوە یان دەقە قورئانیەکە بهێنن. وە مفاخذة و خۆ ڕەحەت کردن لە ئاینی شیعەدا هەیە وە خومەینی لە **کتێبی تحرير الوسيلة** لاپەڕە (٢٢١) مەسئەلەی ژمارە ( ١٢) دا دەڵێت : جایزە بە منداڵی شیرە خۆرەش خۆت ڕەحەت بکەیت . بەڵگەی کتێبەکە و ژمارەی لاپەڕەکەشم لە وێنەکەدا بۆ داناون . ئەوە لینکی مەرکەزی فەتواکەمان لە سەرەوە داناوە . کێ دەتوانێت با لەو سەرچاوەیەوە فەتواکەمان بۆ بهێنێت . ئەمەش فەتوا درۆکەیە کە دوژمنانی ئیسلام دروستیان کردووە و لە تۆڕی ئینتەرنێتدا بڵاوی دەکەنەوە.

---

فتوى رقم (٣١٤٠٩) تاريخ ٧ \ ٥ \ ١٤٢١هـ
الحمد لله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعده ... وبعد
فقد اطلعت اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء على ما ورد الى سماحة المفتي العام من المستفتي ابو عبدالله محمد الشمري والمحال الى اللجنة من الامانة العامة لهيئة كبار العلماء برقم ١٨٠٩ وتاريخ ٣\٥\١٤٢١هـ وقد سأل المستفتي سؤالا هذا نصه
انتشرت في الآونة الاخيرة ، وبشكل كبير وخاصة في الأعراس عادة مفاخذة الأولاد الصغار ، ماحكم ذلك مع العلم أن رسول الله صلى الله عليه وسلم كان قد فاخذ سيدتنا عائشة رضي الله عنها
وبعد دراسة اللجنة للاستفتاء أجابت بمايلي : ليس من هدي المسلمين على مر القرون أن يلجأن إلى استعمال هذه الوسائل الغير شرعية والتي وفدت إلى بلادنا من الافلام الخلاعية التي يرسلها الكفار وأعداء الإسلام ،أما من جهة مفاخذة رسول الله صلى الله عليه وسلم لخطيبته عائشة فقد كانت في سن السادسة من عمرها ولا يستطيع ان يجامعها لصغر سنها لذلك كان صلى الله عليه وسلم يضع إربه بين فخذيها ويدلكه دلكا خفيفا ، كما أن رسول الله يملك إربه على عكس المؤمنين
بناء على ذلك فلا يجوز التعامل بالمفاخذة لا في الأعراس ولا في المنازل ولا في المدارس ، لخطرها الفاحش ولعن الله الكفار ، الذين أتوا بهذه العادات الى بلادنا

اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء
عضو: بكر بن عبد الله ابو زيد
عضو: صالح بن فوزان الفوزان
الرئيس : عبد العزيز بن عبد الله بن محمد آل الشيخ

---

## پرسیاره بێ وه‌ڵامه‌كان ژماره :شه‌ش

## ئایا خودا فیرعه‌ونی به كافری خلق كرد ؟

١٣٤- خلق الله يحيى بن زكريا في بطن أمه مؤمنا وخلق فرعون في بطن أمه كافرا .
(صحيح) ( عد طب ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٨٣١)
١٣٤- خوای گه‌وره یه‌حیای كوڕی زه‌كه‌ریای له‌سكی دایكیدا به ئیماندار درووست كردو
فیرعه‌ونیشی له‌سكی دایكیدا به‌بێ باوه‌ر دروست كردووه.

11 – إن الله جل ذكره خلق يحي بن زكريا في بطن أمه مؤمنًا وخلق فرعون في بطن أمه كافرًا.
الراوي: عبدالله بن مسعود المحدث: ابن الوزير اليماني- المصدر: العواصم والقواصم - الصفحة أو الرقم: 6/250
خلاصة حكم المحدث: إسناده جيد

2 – خلق الله فرعون في بطن أمه كافرًا وخلق يحيى بن زكريًا في بطن أمه مؤمنًا
الراوي: عبدالله بن مسعود المحدث: ابن القيسراني- المصدر: ذخيرة الحفاظ - الصفحة أو الرقم: 3/1293
خلاصة حكم المحدث: له طريقان في الأول متروك وفي الثاني من ليس بشيء

10 – خلق الله جلّ ذكرُهُ يحيى بن زكريًا في بطن أمه مُؤمنًا وخلق فرعون في بطن أمه كافرًا
الراوي: عبدالله بن مسعود المحدث: الهيثمي- المصدر: مجمع الزوائد - الصفحة أو الرقم: 7/196
خلاصة حكم المحدث: إسناده جيد

1 – خلق الله فرعون في بطن أمه كافرًا وخلق يحيى بن زكريًا في بطن أمه مُؤمنًا
الراوي: عبدالله بن مسعود المحدث: ابن عدي- المصدر: الكامل في الضعفاء - الصفحة أو الرقم: 8/277
خلاصة حكم المحدث: [فيه] نصر بن طريف عامة ما يرويه ليس بمحفوظ أجمعوا على ضعفه

9 – خلق الله عزّ وجلّ فرعون في بطن أمه كافرًا ، وخلق يحيى بن زكريًا في بطن أمه مؤمنًا
الراوي: أنس بن مالك المحدث: ابن عدي- المصدر: الكامل في الضعفاء - الصفحة أو الرقم: 2/10
خلاصة حكم المحدث: [فيه] أيوب بن خوط كثير الغلط والوهم

6 – خلق الله يحي بن زكريا في بطن أمه مؤمنًا ، و خلق فرعون في بطن أمه كافرًا
الراوي: عبدالله بن مسعود المحدث: الألباني- المصدر: السلسلة الصحيحة - الصفحة أو الرقم: 1831
خلاصة حكم المحدث: أسانيده واهية و ذكر له شاهدا عند مسلم

له‌م ماوه‌یه‌دا حه‌دیسێك بڵاو بوه‌ته‌وه وه‌ك له وێنه‌كه‌دا له سه‌ره‌وه به ره‌ش دانراوه سه‌رچاوه كه‌ی به‌م شێوه‌یه نوسراوه ( صحيح ) ( عد طب ) عن ابن مسعود. ( الصحيحة ١٨٣١ )
حه‌دیسه‌كه ده‌ڵێت خودا یحیای كوڕی زه‌كه‌ریای له سكی دایكیدا به ئیمان داری دروست كرد وه فێرعه‌ونیشی له سكی دایكیدا به بێ باوه‌ڕ دروست كرد

پاش گه‌ڕان به دوای ئه‌و سه‌رچاوه‌یه‌ی بێدینه‌كان بڵاویان كردۆته‌وه( صحيح ) ( عد طب ) عن ابن مسعود .

( الصحيحة ١٨٣١ ) حه‌دیسه‌كه‌یان به صه‌حیح نوسیوه . به‌ڵام ئه‌و حه‌دیسه صحيح نییه !! پاشان نوسیویانه

( عد طب ) نازانم ئه‌وه نوشته‌یه ناوی جنۆكه‌یه یان ڕه‌چه‌ته‌ی دوكتۆره یان چییه ؟ قسه له‌سه‌ر ئه‌وه‌یان ناكه‌م

چونکـە ( عـد طـب ) هـیچ مانایـەکی نییـە وەك سـەرچاوە،پاسـان ژمـارەی حەدیسـەکە نوسـیویانە (١٨٣١) بـا بـزانم لـە کـوێ و لـە چـی سـەرچاوەیەکی حـەدیس و کتێبـە کـانی حەدیسـدا ژمـارە ( ١٨٣١) ژمـارەی ئـەو حەدیسـەیە بـۆ بـە سـەرچاوە بهێـنن گرنـگ نییـە حەدیسـەکە لـە چی کتێبێکدایـە گرنـگ ئەوەیـە ئایا ژمـارەی ئـەو حەدیسـە هـەمان حەدیسـە یـان نـا ؟ وە بـۆ زیـاتر دڵنیای حەدیسی ژمارە( ١٨٣١) مان بۆ داناون لە بوخاری و ترمذیدا

هـەردووکیان باسـی خـواردن دەکـات هەریەکـەیان بـە جـۆرێکی جیـا و دوو حەدیسـی جیـاواز وە لینکـی هـەردووك حەدیسـەکەمان لـە خـوارەوە دانـاوە . هـەروەها لینکـی ئـەو حەدیسانەشـمان لـە خـوارەوە دانـاوە کـە باسـی لـە دایـك بـوونی یحیـا و فیرعـەون دەکـات . هیچیـان صـحیح نـین وە شـە ش حەدیسیشـمان لەسـەر وێنەکـە بـۆ دانـاون خۆشـتان دەتـوانن باقیاتی حەدیسەکان لە لینکەکەدا ببینن **لە خوارەوە.**

هـەر کـەس دەڵێت وا نییـە یـان ڕاسـت ناکـەن بـا بەڵگـە دا بنێـت واتـا حەدیسـمان بـۆ دا بنێـت بـە مـتن و سـندەوە لـە سـایدی حەدیسـی بـاوەڕ پێکـراوەوە بێـت . ئەگـەر بشـڵێن ئـەو حەدیسـە لـە تفسـیری طبریـەوە دەر هێنـراوە ... طبـری محـدث نـەبووە بـەڵکو مفسـر بـووە !! هـەروەها هـەر کەسـێك شـارەزایی هـەبێت لـە تفسـیری طبری بـاش دەزانێـت طبری بـە ڕەحمـەت بێـت لـە تفسـیرەکەیدا وەك ئەمانـەتی عیلمـی هـەموو حـەدیس وە ڕیوایەتـەکانی دانـاوە بـە بـێ لێکۆڵینـەوە لـە ڕاسـتییەکانی ئـەو حەدیس و ڕیوایەتانە.

---

حەدیسی ژمارە ( ١٨٣١ ) لە بوخاریدا باسی ئەوە دەکات ئەگەر کەسێکی بەڕۆژوو بیری چوو نان بخوات یان ئاو بخواتەوە

http://hadith.al-islam.com/Page.aspx?pageid=192&BookID=24&PID=1835

1831 حدثنا عبدان أخبرنا يزيد بن زريع حدثنا هشام حدثنا ابن سيرين عن أبي هريرة رضي الله عنه ﴿ عن النبي صلى الله عليه وسلم قال إذا نسي فأكل وشرب فليتم صومه فإنما أطعمه الله وسقاه ﴾

هەمان ژمارە لە ترمذیدا باسی خواردن دەکات

http://hadith.al-islam.com/Page.aspx?pageid=192&BookID=26&PID=1754

1831 حدثنا سلمة بن شبيب ومحمود بن غيلان وأحمد بن إبراهيم الدورقي قالوا حدثنا أبو أسامة عن هشام بن عروة عن أبيه عن عائشة قالت ﴿ كان النبي صلى الله عليه وسلم يحب الحلواء والعسل ﴾ هذا حديث حسن صحيح غريب وقد رواه علي بن مسهر عن هشام بن عروة وفي الحديث كلام أكثر من هذا

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :حەوت

## حەرام کردنی بەراز



دەڵێن بۆیە تەورات و قورئان خواردنی گۆشتی بەرازی حەرام کردووە چونکە لەلای فیرعەونیەکان حەرام بووە و تەوراتیش لە فیرعەونیەکانی وەرگرتووە پاشان قورئانیش لەوانی وەرگرتووە . بەڵگە شیان بۆ ئەم قسانەیان شەڕی نێوان دوو خوداوەندی فیرعەونییە بەناوی ( ست وە حورس ) وە لێرەدا بە هەموو جۆرەکان ناوەکانی خوداوەندی ( ست ) م **نوسیووە** بۆ ئەوەی ئاسان بێت بۆ گەڕان بە دوایدا

یان الهة ست یان الهة ستش یان الهة سوتخ Seth - Set - Setekh

وە دەڵێن گوایا خوداوەندی ست لە شێوەی بەرازێکی ڕەشدا بووە و هێرشی کردوەتە سەر برازاکەی خۆی ( حورس ) وە کوشتویەتی بۆیە ڕقیان لە بەرازە . یان دەڵێن نەخێر لە کاتی ڕاوە بەرازدا حورسی کوشتووە . پاش گەڕان و لێکۆڵینەوەم بە دوای ست دا کە پەیوەستە بە ئەفسانەی اوزیس و اوزریس گەیشتمە ئەم ڕاستییانەی خوارەوە

هەموو یەکێك لە خوداوەندە فیرعەونیەکان هێمایەکی ئاژەڵی هەبووە . وە ( ست ) هێما ئاژەڵیەکەی بەرازی ڕەش نە بووە !! بەگوێرەی ئەو وێنانەی سەر بەردەکانی قەبرەکان کە دۆزراوەتەوە شێوەی کەرێکی هەبووە دووقاچ و دوو گوێچکەی درێژی هەبووە لەگەڵ کلکێکی کورتدا . وە بە شێوەیەکی تریش دروست کراوە،وەك سەگێك کە لەسەر **چوار** پەلی نیشتووە ملێکی لاکێشەی هەیە وە گوێچکەکانی **چوار** گۆشەیە وە پێشی دەم و چاوی درێژ و قەوسە و کلکێکی هەیە ... وە زانایانی شوێنەوار تا ئێستا نەیان زانیووە ئەم خوداوەندە چی ڕەمزێکی حەیوانی هەیە !؟ بەلام بە گوێرەی نوسینەکان و وێنەکان دەڵێن دەبێت یەکێك لەو دوو شێوەیەی سەرەوەی

هـــــەبێت کـــــە باســــــمان کـــــرد وە ڕەمــــــزی حــــــەیوانیی ( ســــــت ) بــــــەم شــــــێوەیە دەنوســــــرێت Setekh

وەك لە سەرەوە بۆم ڕون کردنەوە و هێما و ناوەکانیشم داناوە ( ست ) نە لە نزیك و نە لە دوور پەیوەندیی بە بەراز و بەرازی ڕەشەوە نییە وە لە کاتی راوە بەرازیشدا حورسی نە کوشتووە ! وە هیچ ئاسەوارێکیش نییە بۆ حەرامیی بەراز لە ئاینی فیرعەونیدا !! وە ئەو ئەفسانەی بەرازی ڕەشە لە ادبیات و ئاسەوارەکانی فیرعەونیەکاندا نییە و قسە و خەیاڵی خەڵکە .. چونکە ئاسەواری فیرعەونیەکان تا ئێستا ماون . وە هیچ ئاماژەیەك نییە بۆ ست و بەراز خۆشتان دەتوانن بگەڕێن و ناوەکانم لە سەرەوە بۆ داناون لەگەڵ هێما ئاژەڵیەکی خوداوەند ( ست ) . هەروەها بەڵگەیەکی تریان هێناوەتەوە گوایا خوداوەند ( ئەدۆنیس ) بەرازێکی ڕەش برینداری کردووە . وە عەشتار هاتوەتە خوارەوە تەداویی کردووە بەڵام فریای نەکەوتووە و لە شوێنی برینەکەی ادونیس گوڵاڵە سورەیەك هاتۆتە دەرەوە وە ئەمە هەموو بەڵگەکانیانە بۆ حەرامیی بەراز لای کەنعانی و فینیقیەکان ،وە دەڵێن زۆر لە قەومە کۆنەکانی تریش ڕقیان لە بەراز و بەرازی ڕەشی کێوی بووە . بۆیە تەورات و قورئانیش لەو سەرچاوە و ئەفسانە کۆنانەوە بەرازیان حەرام کردووە و حوکمی خوداوەندە کۆنەکانە و بە ناوی حوکمی خودای ئاسمان لە تەورات و قورئاندا نوسیویانەتەوە . بۆ وەڵامی ئەم گومانەش یەك چارە هەیە زیاتر نییە ئەویش ئەمەیە

کاتێك باسی فیرعەونیەکان دەکرێت . ئاسەوارێکی بێ شومار دۆزراوەتەوە و ناو کاتی خوداوەندەکان زانراوە و دیاری کراوە و کەس ناتوانێت درۆ بکات بە دەمیانەوە . ئەگەر دەڵێن خوداوەندی ( ست ) هێماکەی بەراز بووە یان لە شێوەی بەراز بووە یان لە کاتی ڕاوەبەرازدا خوداوەند حورسی کوشتووە با بەڵگەمان بۆ بهێنن بەگوێرەی ئاسەوارەکان یان وێنەی خوداوەند ست لە شێوەی بەرازدا !! وە لە سەرەوە ناو هێمای ئاژەڵیی ستم بۆ داناون،ئەگەر دەڵێن فینیقی و کنعانی و قەومەکانی تر بەرازیان بە حەرام داناوە با ئاسەوارێکمان لەو ئاسەوارانە بۆ بهێنن !! ئەگەر نا توانن بیهێنن وە پشت دەبەستن بە قسە و لێکۆڵینەوەی خەیاڵی نوسەرێك ئەو قسانە بە بەڵگە وەر ناگیرێت و قسەی گیرفانن . فەرموون ئەوە کۆمپیوتەر لەبەر دەستتان دایە بە بەڵگەی ئاسەواری کۆن قسەکانتان بسەلمێنن !! دڵنیاتان دەکەمەوە بە هیچ شێوەیەك ناتوانن ئەوەی فیرعەونیەکان بسەلمێنن و هیچ ئاسەوارێکمان لەسەر خوداوەندی ست بۆ بهێنن کە بەراز بووە . وە بۆ کنعانی و قەومەکانی تریش بە هەمان شێوە هیچ ئاسەوارێك بوونی نییە .

لە کۆتاییدا دەڵێم : نە شەریعەتی موسا و نە محمدیش علیهما السلام حەرام کردنی بەرازیان لە فیرعەونە کان و فینیقی و کنعانی و قەمەکانی ترەوە وەر نەگرتووە . و حوکمێکی خودای تاك و تەنیایە..

## پرسیارە بێ وەلاٌمەکان ژمارە :هەشت

## کەری باڵدار و خورافاتی زاست خوازەکان




نەیارانی ئیسلام ڕەخنە لە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەگرن و دەڵێن بە سواری کەرێکی باڵدار چوە بۆ بیت المقدس و لەوێوە چووە بۆ ئاسمان . وە دەڵێن ئەمە خورافاتە و ئەقڵ قبوڵی ناکات !! باشە با بزانین اسلام دوای خورافات کەوتووە یان بێدین بێدین بە ناوی زانستەوە دەڵێت کەون دروست بووە بە هۆکاری تەقینەوەی مەزن وە بەڵگەشیان بۆ قسەکانیان جورج لومتری بلجیکییە کە لە ساڵی ١٩٢٧ دا بە بۆچوونی خۆی وای دادەنێت کەون بە هۆکاری تەقینەوەیەکی مەزن دروست بوو بێت . وە لە ساڵی ١٩٢٧ وە زانایانی دوای ئەو هاتوون و هەر یەکێکیان فەرەزیاتی داناوە بۆ تەقینەوەی مەزن وە دەڵێن ملیارەها ساڵە ئەم تەقینەوەیە ڕووی داوە . ئێمە لامان گرنگ نییە چەند ملیار ساڵە ڕوی داوە چونکە بۆچونی جیاجیا

هەیە لەسەر ژمارەی ملیارەکان . بەڵام ئەوەی گرنگە لامان ئەم لێکۆڵینەوانەی باس لە تەقینەوەی مەزن دەکات هەر هەمووی فەرەزیاتە و هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە !! پاشان ئەم زانست خوازانە بوونی خودا ڕەت دەکەنەوە لەسەر فەرەزیات !! باشە با وای دا بنێێن **یەك** ملیار ساڵە ئەو تەقینەوەیە ڕوی داوە بەڵگەتان چییە بۆ ئەو ملیار ساڵە ؟ وە ئایا چی شتێکتان لەبەر دەستتدایە کەسێکی نەخوێندەوار یان عەوام ڕازی بکەن بە دید و بۆچوونەکانتان ؟ ئێوە باوەڕتان بە نەزەریەیەك هەیە کە بە بۆچوونی زانایانی فیزیا دەڵێن لەوانەیە بەو شێوەیە کەون خەلق بووبێت وە .. بۆچوونیش هەمیشە لە گۆڕاندایە و جێگیر نییە لەوانەیە سبەینێ یان ماوەیەکی تر ئەو بۆچوونە بگۆڕرێت . ئێوە باوەڕتان بە ملیارەها ساڵ هەیە کە خۆشتان نازانن چییە و کەی بووە ؟ **بەڵام** باوەڕتان بە ١٤٠٠ ساڵ نییە کە بە بەڵگەی حاشا هەڵ نەگر ئەو کەرە باڵدارەی تۆ باسی دەکەیت ئیسپات کراوە.

بەڵگەشمان بۆ ئیسپات کردنی ( بوراق ) ئەوەیە : باسی بوراق اسرا و معراج شتێکی تازە نییە و لە ٢٠١٤ دا باس کرا بێت بەڵکو کۆنە و ١٤٠٠ ساڵە باس کراوە . ئەگەر درۆ بووایە بە دڵنیاییەوە قورئان و منهجی اسلام و دینی محمد صلى الله عليه و سلم لەگەڵ دابەزینی سورەتی اسرائدا کۆتایی پێ دەهات و نە دەگەیشتە ئێمە . چونکە ئەو کاتە لە مەکە کافرانی قورەیشی لێ بوو کە زۆر لە تۆ زیرەك تر و وریاتر بوو وە زۆر لە تۆش بە پەرۆش تر بوو اسلام بە درۆ بخەنەوە و ئەم ئاینە تازەیەیان لە کۆڵ بێتەوە،بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان ئەوەیە ابو جهل یەکەم کەس بوو کە ئەو ڕوداوەی بیست و لای سەیر بوو لە شەوێکدا لە مەکەوە چووە بۆ بيت المقدس و گەڕاوەتەوە . ابو جهل زۆر لە تۆ ئاقڵ تر بووە بۆ ئەوەی بە بەڵگەوە قسە بکات : لە پێغەمبەری (صلى الله عليه و سلم) پرسی ئەگەر بچم خەڵکی کۆ بکەمەوە لەبەردەم ئەوانیشدا هەمان قسە دەکەیت ؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی بەڵێ . ابو جهل خەڵکیی کۆ کردۆتەوە و هەمان پرسیاری لێ کردۆتەوە پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) گوتویەتی بەڵێ ئەم شەو چووم بۆ بيت المقدس و هاتومەتەوە . خەڵکیش لایان سەیر بووە و پێیان گوتووە باشە بيت المقدسمان بۆ وەسف بکە چۆن بوو ؟ چونکە لەناو خەڵکەکاندا بازرگانەکانی قورەیشی تێدا بو کە هات و چۆی بيت المقدسیان دەکرد . پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) بە وردی باسی شوێنەکانی بۆ دەکردن و **وەڵامی** ئەو کەسانەی دەدایەوە کە بيت المقدسیان بینی بوو . هەروەها جولەکە هەبوون لە مدینە دەیان توانی بە درۆی بخەنەوە و سورەی الاسراء بە درۆ بخەنەوە .

لە کۆتاییدا دەڵێم کێ شوێن خورافات کەوتوە ؟ ئێمەی موسوڵمان کە کافرانی قورەیش جولەکە نەیان توانیوە بوراق بە درۆ بخەنەوە لە زەمانی خۆیدا و ئەم ئاینی ئیسلامەیان لە کۆڵ بێتەوە . یان ئێوەی بێدین بە ناوی زانستەوە باسی ئەگەری تەقینەوەی مەزن دەکەن کێ دوای خورافات کەوتووە ؟ ئێمەی موسوڵمان کە باسی ١٤٠٠ ساڵ دەکەین . یان ئێوەی بێدین کە باوەڕتان بە ١٣،٨ ملیار ساڵ هەیە و هیچ بەڵگەیەکیشتان پێ نییە ؟ ئادەی فەرموو بتوانە نیو ملیار ساڵم بۆ ئیسپات بکە بە بەڵگەوە.

**ئاگاداربە** ئەگەر بڵێیت لە قورئانیشدا باسی تەقینەوەی مەزن کراوە لە سورەتی الانبیاء ٣٠ دا(**ان السماوات و الارض كانتا رتقا ففتقناهما** ). کەواتە تۆ باوەڕت بە قورئان هەیە و تەقینەوەی مەزنت لە قورئانەوە وەر گرتووە.

ئاگاداربە گەر دەتەوێت باوەڕ بە خورافاتی ١٤ ملیار ساڵی تۆ بکەین فەرموو بە نموونەی ئاسان بۆمان بسەلمێنە کە هەموو کەس لێت تێ بگات و بە زمانی خەڵکی عەوام قسە بکە و باوەڕت پێ بکات . ئەوە ئێمە وەك موسوڵمان ڕاستیی بوراقمان بۆ سەلماندیت کە ابو جهل و جولەکە نەیان توانیوە بە درۆی بخەنەوە، فەرموو جەنابیشت بۆمان بسەلمێنە بۆچی باوەڕت بە ١٤٠٠ ساڵ نییە بەلام باوەڕت بە ١٤ ملیار ساڵ هەیە . کاممان شوێن خورافات کەوتووین ؟ ١٤٠٠ ساڵ نزیك ترە و خەڵکی لێ تێ دەگات یان ١٤ ملیار ساڵ کە لەسەر بیر و بۆچون و فەرەزیات دامەزراوە و هەمیشە لە گۆڕاندایە .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نۆ

## ئاڤێستا چییە ؟

پرسیارە بێ وەلامەکان 9 ئاڤێستا چییە ؟

زەردەشت و ئاڤێستا





eer sha aow dan sadawee arzee shar bajeer bapadsha sha shan qawat
brda barax ao qan sareesaree barzee eesh shonasara shaood madeena
schn madia ba padsha machod dsha yad by sharesh bo ewa bababraba dza
shar barat bar eak desh shonasara shawwd madeena



eer sha aow dan sadawee arzee shar bajeer bapadsha sha shan qawat
brda barax ao qan sareesaree barzee eesh shonasara shaood madeena
schn madia ba padsha machod dsha yad by sharesh bo ewa bababraba dza
shar barat bar eak desh shonasara shawwd madeena

کورد دەڵێت ئەسڵی ئاینی کورد کتێبی ئاڤێستایە کە زەردەشت هەڵگری ئەو پەیامەیە . قسەیەکی خراپ نییە و ئێمەش وەك موسوڵمان ناتوانین بڵێێن وا نییە !! چونکە هیچ بەڵگەیەکمان پێ نیە بڵێین زەردەشت پەیامبەر نە بووە . ناش توانین باوەڕی پێ بکەین چونکە هیچ بەڵگەیەکیشمان پێ نییە کە ئیسپاتی بکات زەردەشت پێغەمبەر بووە و خاوەنی کتێبی ئاڤێستا بووە . **بۆیە ئێمەی موسوڵمان نە باوەڕی پێ دەکەین و نە بە درۆشی دەخەینەوە و لەو نێوانەدا دەوەستین**

ئێمەی کورد هیچ نازانین دەربارەی کتێبی ئاڤێستا !! هەر ئەوەندە دەزانین دەڵێێن **چوار** توخمەکە ئیتر ئەو **چوار** توخمە چییە و لە کوێدا باس کراوە و دەوریان چییە نای زانین !!؟؟ هەموو کتێبێکی ئاسمانیش کە هاتۆتە خوارەوە بۆ هەر پێغەمبەرێك بێت . پێویستی بە تەفسیر و مفسر نە بووە . پێغەمبەرەکە ووشەکانی بۆ گوتوون و ئەوانیش شوێنی کەوتوون . بۆیە لە زەمانی موسا و عیسا و محددا علیهم السلام هیچ مفسرێك نە بووە تفسیری کتێبەکانیان بکات و خەڵکی تێگەیشتوون لە پێغەمبەرەکانیان چییان پێ گوتوون منیش وەك کوردێك داوا لە برا زەردەشتیەکانم دەکەم . بتوانن دەقەکانی ئاڤێستامان بۆ بکەن بە پۆست و بڵاویان بکەنەوە بۆمان بۆ ئەوەی من و تۆ وەك کوردێك بزانین ئاڤێستا باسی چی دەکات ؟ وە ئایا کاتێك دەڵێن کتێبی ئێمەی کورد ئاڤێستایە من و تۆ هیچی لێ تێ دەگەین ؟ ئەگەر وای دا بنێین ئێستا زەردەشت لەناوماندایە و ئاڤێستامان بۆ دەخوێنێتەوە . ئایا بە بێ مفسر ئێمە لە شەریعەتی زەردەشت تێ دەگەین ؟داواکارم لە خوشك و برا زەردەشتیەکان ڕۆژانە بتوانن ئاڤێستامان پێ بناسێنن و دەقەکانیمان بۆ دا بنێن بە بێ تەفسیر و لێك دانەوە !! ئەگەر نەش توانن دەقەکانمان بۆ دا بنێن کەواتە شوێن چی کەوتوون ؟ وە بۆچی دەقەکانی ئاڤێستامان پێ ناڵێن چییە ؟ ئێستا ئەگەر تەورات یان انجیل یان قورئان بهێنین و بە بێ تەفسیر و مفسر دەتوانین لێی تێ بگەین و بزانین خودا داوای چی دەکات و حوکمەکانی ئەو کتێبە و ئەو شەریعەتە چییە ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :دە

## کێ عەرشی خودا هەڵ دەگرێت ؟

ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ 

ڕەخنـە هەیـە گوایـا مەلایکـەت عەرشـی خـودا هـەڵ دەگرێـت !! وە بـۆچی مەلایکـەت عەرشـی خـودا هـەڵ دەگرێـت ؟ ئایـا خـودا پێویسـتی بـەوە هەیـە یـەکێك عەرشـەکەی بـۆ هـەڵ بگرێـت ؟ پرسـیاری ئێمـەش ئەوەیـە لـە ڕۆژی حسـابدا خـودای تعـالی رۆحـی هـەموو بونـەوەوەرەکان دەکێشـێت و تەنانـەت هـەموو مەلایکەتـەکان هیچیـان نـامێنن وە لـە کۆتایـدا ملـك المـوت دەمێنێتـەوەخودا پێی دەفـەرموێ ( بمـرە ئـەی فریشـتەی مـردن ) ئـەویش دەمرێـت و کـەس نامێنێتـەوە . ئـەی ئـەو کاتـە کێ عەرشـی خـودا هـەڵ دەگرێـت و دەیخاتـە سـەر پشـتی ؟ خـۆ کـەس نـەماوە بـەس خـودای تعـالی مـاوە و هـەموو مەلایکەتەکانیش مردوون.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :پانزە

## ئایا خودا و پێغەمبەر (د.خ) باسی کوردیان کردووە ؟



1 – لا تقومُ السّاعةُ حتّى تقاتلوا قومًا صغارَ الأعيُنِ ذُلفَ الأنوفِ كأنّ وجوهَهُمُ المَجانّ المُطرَّقةُ ولا تقومُ السّاعةُ حتّى تقاتِلوا قومًا نعالُهُمُ الشّعرُ

الراوي: أبو هريرة المحدث: الألباني - المصدر: صحيح ابن ماجه - الصفحة أو الرقم: 3323
خلاصة حكم المحدث: صحيح

بـۆ ئـەو خوشـك و بـرا موسـوڵمانانەی کـۆپی و پەیسـت دەکـەن . ئـەم جارەیـان پرسـیارەکەمان بـۆ موسـوڵمانانە ! و لێیـان دەپرسـین ئایـا ئێـوە فـەرقی نێـوان ئایـەت و حـەدیس دەکـەن ؟ فـەرقی نێـوان تەفسـیر و ڕاوی دەکـەن ؟ واتـا ئـەو کەسـەی حەدیسـەکە دەگێڕێتـەوە ؟ بـۆ نموونـە لـەم ماوەیـەدا بـڵاو بوەتـەوە گوایـا ئایـەت هاتۆتـە خـوارەوە لەسـەر کـورد وە

حەدیســـــــــێکیش پــــــاڵ پشـــــــتی ئـــــــەو ئایەتــــــــە دەکـــــــات وە ئایەتەکـــــــە ئەمەیـــــــە

خـــــــوای گەورە لە ســــــــورەتی **فەتـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــح** لە ئـــــــــایەتی ١٦ دا ئەفەرمێـــــــــت

**قُــلْ لِلْمُخَلَّفِــينَ مِــنَ الْأَعْــرَابِ سَــتُدْعَوْنَ إِلَــى قَــوْمٍ أُولِــي بَــأْسٍ شَــدِيدٍ تُقَــاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْــلِمُونَ فَــإِنْ تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِنْ تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُمْ مِنْ قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا**

واتا لەگەڵ قەومێکدا شەڕ دەکەن زۆر ئازا و چاو نەترسن و بەهێزن وە دەڵێن ئەو قەومە کورد بەگوێرە ی ئەم حەدیسەی خوارەوە

**قالَ اِبْن أَبِي عُمَر وَجَدْت فِي مَكَان آخَر حَدَّثَنَا اِبْن أَبِي خَالِد عَنْ أَبِيهِ قَالَ نَزَلَ عَلَيْنَا أَبُو هُرَيْرَة رَضِيَ اللَّه عَنْهُ فَفَسَّرَ قَوْل رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالهمْ الشَّعَر" قَالَ هُمْ الْبَارِزُونَ يَعْنِي الْأَكْرَاد**

ئیبن عومەر ((عبداللە کوڕی عمر )) فەرمووی کە ئەبو هریرەوە لە تەفسیری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم )کە فەرموویەتی ئێوە جەنگ لەگەڵ قەومێکدا ئەکەن کە پێڵاوەکانیان لە توکی ئاژەڵە کانیان دروستکردووە ئەوانە (( البارزون یعنی * الاکراد * )) (کوردەکانن ) واتە لەسەر شاخەکان ئەژین یان بە شاخەکاندا هەڵئەگەڕێن

تێبینی نموونە بۆئەوەی کە پێڵاوەکانیان لە توک دروست کردووە وەکو کڵاش و جۆرەکانی تر

وەك دەبینن ئایەتێکیان هێناوە و لە تفسیری ابن کثیردا وەریان گرتووە گوایا ئەو قەومە کوردن . هیوادارم موسوڵمان و بێ دینیش لە یە ك شت تێ بگەن !! کاتێك دەڵێن حەدیس واتا قسە بێت و لە زاری پێغەمبەرەوە (صلی اللە علیە وسلم) کرا بێت و وەرگیرابێت . وە زۆر ئاساییە کەسێکی بێدین فەرقی حەدیسەکان نەکات !! بەڵام زۆر سەیرە خەڵکێکی موسوڵمان هەست بەو فەرقە نەکات !!؟

با بزانین ئایا ئەو ئایەت و حەدیسە باسی کورد دەکەن ؟ لەم حەدیسەدا پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ناڵێت ئەو قەومە کوردن !!؟ سەیری دەقەکە بکەن بە عەرەبی . بەڵکو ابو هریرە دەڵێت ئەو قەومە کوردن . کەواتە ئێمە ئەو قسەیەی ابو هریرە وەك حەدیس وەر ناگرین چونکە ابو هریرة پێغەمبەر نییە و کابرایەکی ئاساییە وەك من و تۆ قسەکە بەو شێوەیە تەفسیر دەکات . ئەوە پەیوەندیی بە پێغەمبەرەوە (صلی اللە علیە وسلم) نییە !! وە لە هەمووی گرنگ تر بچن تفسیری ئەو ئایەتە بگەڕێن بە زۆر قەومی تر تفسیر کراوە واتا بەس بە کورد تفسیر نە کراوە و هەر هەموو مفسرەکانیش دەق حەدیسێکی صحیحیان نە کردووە بە بەڵگە کە پێغەمبەر (د.خ) ئەو قەومەی دەست نیشان کردبێت کێیە !! وە لە هەمووی گرنگ تر ئەوەیە هیچ سوپایەکی ئیسلامی لەگەڵ کورددا شەڕی نە کردووە !! کەواتە ئەو ئایەتە باس لە کورد ناکات چونکە سوپای اسلام لەگەڵ کورددا شەڕی نە کردووە !! هەر کەس دەڵێت اسلام شەڕی لەگەڵ کورد کردووە با لە مێژوودا ئەو شەڕەمان بۆ بهێنێت و پێمان بڵێت ساڵی چەند بوو لە کوێ بوو سەرکردەی سوپای اسلامی کێ بوو سەرکردەی سوپای کورد کێ بوو ؟ سوپای ئیسلامی چی دەوڵەتێکی کوردیی ڕوخاند ؟ وە سنوری دەوڵەتی کورد هەتا

كوێ بوو وە كێ سەرۆكی كورد بوو لەو زەمانەدا و چیی لێهات ؟ هەروەها ئێمە خۆمان كوردین و دەزانین كڵاش بۆ فیز و جوانی لەپێ دەكرێت نەك بۆ شەڕ وە جارێك بەناو ئاودا پێ برۆ دەبێت فڕێی بدەیت . ئیتر ئەم كڵاشەیان لە كوێوە هێنا و لەگەڵ ئەم حەدیسەدا دایان نا ؟ هەروەها ئەو ئایەتە و ئەو حەدیسە باسی مەغۆل و تەتار دەكات چاویان بچكۆلە و لوتیان قنج و بچكۆلەیە . وە كورد بەو شێوەیە نییە ! هەروەها مەغۆل و تەتار گەورەترین ئیمپراتۆریەتیان هەبوو لە سنوری ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی چینەوە هەتا سوریا و هەتا پۆڵۆنیا و نیوەی ڕوسیا ڕۆشت وە ئەو ئایەتە باسی تتار دەكات وە هیچ قەومێكی تر لەو شێوەیە شەڕی لەگەڵ ئیسلامدا نە كردووە!!

تكایە هەر كەسێك بەڵگەی مێژویی پێ نییە با قسە لەسەر ئەم باسە نەكات ؟ وە هیچ بەڵگەیەكیش نییە لەسەر ئەوەی ئەو ئایەتەی ١٦ ی سورەتی **الفتح** و ئەو حەدیسە باس لە كورد بكات و نە لە دوور و نە لە نزیك پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) باسی شەڕی كوردی نە كردووە و بە هیچ شێوەیەكیش سوپای ئیسلامی و كورد شەڕیان نە كردووە ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :دوانزە

## ئایا پێغەمبەر (د.خ) مەی و شەرابی خواردوەتەوە ؟




زۆر جار دەبینین و دەبیستین بەڵگەمان بۆ دەهێنن گوایا پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) مەشرەبی خواردوەتەوە كەچی ئیسلام دەڵێت حەرامە لە كاتێكدا پێغەمبەرەكەیان خواردویەتیەوە . وە چەند حەدیسێكمان بۆ دا دەنێن وەك بەڵگە لەسەر ( **شرب النبيذ يان**

**نبذ له** ) وه ئەو حەدیسانە هەر هەموی صحیحن و ڕاستن و درۆ نین بەڵام ئەوەی درۆیە و چەواشەکارییە ئەمەیە خەڵکی بە گشتی نازانن فەرقی نێوان ( خمر و نبیذ ) چییە ؟ ئەو حەدیسانەی کە بە بەڵگە دای دەنێن لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وه هەمووشی ڕاستن باسی ( نبیذ ) دەکات نەك ( خمر ) !! واتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نبیذی خواردوەتەوە نەك خمر !! با بزانین فەرقی نبیذ و خمر چییە ؟

لە زمانی عەرەبیدا ( نبذ ) واتا فڕێ دان یان کەوتنە ناو یان ئیهمال کردن . زەمانی زوو لە جیهاندا شەربەت نە بووە وەك ئێستا !! خەڵکی هاتوون خورما یان ترێ یان هەر میوەیەکی تر بێت هێناویانە و خستویانەتە ناو ئاوەوە بۆ دوو ڕۆژ بۆ ئەوەی تامی ئاوەکە خۆش بێت کاتێك دەی خۆنەوە . ئەو خورادنەوەیەش پێی دەگوترێت **نبیذ** . بەڵام ئەگەر لە **سێ** ڕۆژ زیاتر بمێنێتەوە و بترشێت پێی دەڵێن ( خمر ) ئەوەیان حەرامە،وه هەموو حەدیسەکان کە لەسەر نبیذ هاتووە و پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم )خواردویەتیەوە هیچ کام لەو نبیذانە لە **سێ** ڕۆژ زیاتر نەماوەتەوە . و هەمیشە پرسیاری کردووە ئەو خواردنەوەیە کە نبیذە هی خورما بوو بێت یان هی ترێ : ئایا چەند ڕۆژە لە ئاودایە ؟ ئەگەر دوو ڕۆژ و نیوی پێ چوو بێت فەرمانی کردوە ئەو نبیذە بڕێژن وە نەی خواردوەتەوە . کێ دەڵێت وا نییە یان ئیسلام پینە و پەڕۆ دەکات با بە گەوێرەی زمانەوانی یان مێژوو یان هەر لایەنێکی تر بێت با بۆمان بسەلمێنێت ( نبیذ ) واتا مەی ؟

فەرموون ئەوە عەرز و ئەوە گەز و ئەوەش هەموو فەرهەنگە عەرەبییەکان لەم لینکەدایە . مانای نبیذمان بۆ دەربهێنن بزانین بە مانای شەربەت دێت یان مەی ؟

http://www.baheth.info/index.jsp

ئەمەش لینکی هەموو حەدیسەکانی مسلم و بخاری و .... هتد با حەدیسێکمان بۆ بهێنن کە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) خمر یان مەیی خواردوەتەوە یان نبیذ بە مانای مەی دێت

http://www.dorar.net/hadith

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :سیانزه

## کەری باڵدار له کوێدا باس کراوه ؟

الراوي: أنس بن مالك المحدث: مسلم- المصدر: صحيح مسلم - الصفحة أو الرقم: 162
خلاصة حكم المحدث: صحيح

الراوي: أنس بن مالك المحدث: الألباني- المصدر: صحيح الجامع - الصفحة أو الرقم: 127
خلاصة حكم المحدث: صحيح

با سەرچاوەکانتان وەك ئەم حەدیسانەی
خوارەوە درۆ نەبن وەك سەرەوە ڕاست بن !؟

الراوي: عبدالله بن عباس المحدث: ابن الجوزي- المصدر: موضوعات ابن الجوزي - الصفحة أو الرقم: 2/178
خلاصة حكم المحدث: لا يصح

الراوي: أم هانئ المحدث: الذهبي- المصدر: تاريخ الإسلام - الصفحة أو الرقم: 1/245
خلاصة حكم المحدث: غريب

لێره و لەوێ وێنەمان بۆ دا دەنێن هی ئاسەواره کۆنەکان کە ئاژەڵی باڵدار هەبووه لە شارستانیه کۆنەکاندا وه لە ئاینە مرۆیەکاندا و دەڵێن بوراق و ئیسرا و میعراج لە هەموو ئاینەکانی تردا هەبوه و ئەفسانەیەکه و هاتۆته ئاینی ئیسلامەوه . پرسیاری منیش زۆر ئاسانه و بێ پێچ و پەنایە،دەڵێم ئادەی بێ زەحمەت بە گوێرەی سەرچاوه ئیسلامییەکان پێم بڵێن لە کوێدا نوسراوه ( بوراق باڵی هەبوو ) ؟یەك سەرچاوەم بۆ بهێنن زیاتر نا !! ئەگەر نەتان توانی بهێنن کەواته بوراق و کەری باڵدار شتێکه لە خەیاڵی تۆدا هەیه و هیچ سەرچاوەیەکت پێ نییە بڵێیت بوراق باڵی هەبووه

تکایه حەدیسێکی صحیحم بۆ بهێنه به متن و سندەوه . دەزانم نازانیت متن و سند چییه !! بۆیه له وێنەکەدا بۆم داناویت حەدیسی صحیح چییه ؟ وه دوو حەدیسەکەی سەرەوه باسی بوراق دەکات وه صحیحن دوو حەدیسەکەی خوارەوه هەر باسی بوراق دەکات بەڵام صحیح نین .

---

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :چوارده

## بۆچی نابێت موسوڵمان تکنلۆجیا بەکار بهێنێت ؟

هەمیشه پێمان دەڵێن ئەگەر ئێوه شوێن خودا و خودا پەرستی کەوتوون نابێت کۆمپیوتەر و فیسبوك و مۆبایل و فڕۆکە و هیچ شتێك بەکار بهێنین چونکە ئێمە ئیمان دارین و باوەڕمان بە خودا نییە . کێشەکه لەوەدایە زۆر لە جولەکەکانیش هەمان قسە دەکەنەوه و دەڵێن نابێت موسوڵمان ئەو شتانه بەکار بهێنێت ئێ باشە کابرای بێدین ئەو تکنلۆجیایه به هی خۆی دەزانێت تۆی جولەکه بۆچی شوێن قسەی ئەوان دەکەویت ؟

باشە با وای دا بنێین خیلافەتی ئیسلامی هەیە وە هەموو دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە سایەی یە ك دەوڵەتدا دەژین و فەرمان دەر دەکرێت نابێت هیچ جۆرە تکنلۆجیایەك بێتە ناو دەوڵەت و موسوڵمان بەکاری نە هێنێت !! ئایا ئەو کۆمپانیایانە خۆیان بە دەست ماچ کردن و بە نرخی داشکێنراو بەرو بومەکانیانمان پێ نا فرۆشن ؟ ئایا زیانێکی زۆر ناکەن ؟ ئایا هەموو خاوەن دوکان و کۆمپانیا و کۆمپانیا مەزنەکان هەمیشە لە هەوڵدا نین کە بازاڕیان زیاتر بێت و شتی زیاتر بفرۆشن ؟ ئایا شەڕی نێوان دەوڵەتەکان لە دێر زەمانەوە هەتا ئەمڕۆمان کە ٢٠١٥ یە لەسەر فراوان کردنی بازاڕ و بەروبوم نە بووە ؟ یان کاکی بێدین بێ ئاگایە لە مێژوو وە بێ ئاگایە لە باری ئابوریی دەوڵەتان و چۆنێتیی بەڕێوە بردنی و پەرە پێدانی !! ئەی کاکی جولەکە تۆ بۆچی پێمان ڕەوا نا بینیت تکنلۆجیا بەکار بهێنین خۆ تۆ لە هەموو کەس باشتر ئاگاداری مێژوو ، وە بازاڕ و مامەڵەی بازرگانییت وە خۆشتان دەزانن ئەو کارە زەرەری زۆری بازاڕی تێدایە لە هەمووی خۆشتر جیهان مەمنونە لەگەڵ ئیسلامدا مامەڵە بکات وە گەشت و گوزار و خواردنی حەڵاڵ دەکەنەوە لە وڵاتەکانی خۆیاندا لە دەرەوەی وڵاتە ئیسلامییەکان بۆ ئەوەی قازانجی زیاتر بکەن تازە بە تازە بێدینی کورد دەیەوێت زەرەر و زیان لەو کۆمپانیایانە بدەین و شمەکەکانیان بەکار نەهێنین !! وە بۆ زانیاریشتان لە جیهاندا خزمەتێکی تازە کراوەتەوە بە ناوی ( HalalTrip) لە هەموو جیهاندا ئەو شوێنانەت نیشان دەدات کە خواردنی حەڵاڵ دەفرۆشن و چێشتخانەی حەڵاڵی تێدایە وە ناو وێنەی خواردنەکانیشتان دەداتێ لەگەڵ عینوانی شوێنەکانیش . وە الحمد لله لە جیهاندا کێ بڕکێیە بۆ ئەوەی زیاتر چێشتخانەی خواردنی حەڵاڵ بکرێتەوە . وە لە ساڵی ٢٠١٣ بازاڕی خواردنی حەڵاڵ گەیشتە ١٤٠ ملیار دۆلار . هێشتا ساڵی ٢٠١٤ نەزانراوە . وە پێش بینی دەکرێت هەتا ساڵی ٢٠٢٠ بگاتە ١٩٢ ملیار دۆلار واتا ساڵی ١٩٢ ملیار دۆلار وە پێگەی حلال تریپ هەوڵ دەدات کاتی نوێژەکان و ئاراستەی قیبلەش دەست نیشان بکات لە گوگڵدا بۆ موسوڵمانان کە دەچن بۆ دەرەوەی وڵات بۆ گەشتیاری .

ئەمەش لینکی هەواڵەکەیە

The World's Leading Authority on Halal/Muslim Friendly Travel - Connecting you to the Muslim Traveler

http://arabic.cnn.com/business/2015/01/12/halal-food-smart-app

**هەواڵەکە**

---

**دبي، الإمارات العربية المتحدة (CNN) -- قام موقع متخصص بالسفر والسياحة المتوافقة مع الشريعة الإسلامية "حلال" بإطلاق تطبيق فريد من نوعه للسياحة الحلال، يوفر للمشتركين فرصة التعرف على الأماكن التي توفر الخدمات الحلال في أي دولة يزورونها حول العالم.**

والتطبيق الذي عرضه موقع "HalalTrip" متوفر باللغتين العربية والإنجليزية، وهو يسمح للمستخدمين بوضع ملاحظاتهم على الخرائط لتحديد الأماكن التي يمكن العثور فيها على منتجات وخدمات "حلال" وكذلك مشاركة صور الوجبات "الحلال" والتجارب السياحية.

وذكر الموقع أن التطبيق يأتي في وقت باتت فيه المطاعم والمنشآت السياحية حول العالم تتوجه بشكل متزايد نحو المنتجات الحلال إذ تسعى للحصول على رخص من مؤسسات الترخيص المعتمدة من أجل اجتذاب سياح الدول الإسلامية.

ولفت الموقع إلى أن سوق السياحة الحلال بلغ عام ٢٠١٣ أكثر من ١٤٠ مليار دولار، ومن المتوقع أن يواصل النمو حتى يصل إلى ١٩٢ مليار دولار عام ٢٠٢٠، مضيفا أن التطبيق يركز على قطاعين أساسيين، الأول مشاركة التجارب السياحية المتوافقة مع الشريعة، والثاني المساعدة على تحديد مواقع الصلاة والمطاعم التي تقدم الأطعمة الحلال بكل بلد.

ويتمتع التطبيق أيضا بميزة تحديد وقت الصلاة بحسب البلد الذي يسافر إليه المستخدم، وكذلك تحديد القبلة، على أن يتضمن خلال الأشهر المقبلة خدمة إضافية لحجز الرحلات والفنادق، وهو متوفر في "آب ستور" و"غوغل بلاي".

---

وه لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی تازه‌ش كراوه ده‌ڵێت هه‌تا ساڵی ٢٠٣٠ بازاڕی حه‌ڵاڵی ئیسلامی ده‌گاته (١٠ ) تریلیۆن دۆلار له ساڵێكدا واتا به به‌رز بوونه‌وه‌ی ئه‌و بازاڕه نیو ملیار له ساڵێكدا هه‌تا ساڵی ٢٠٣٠ ئه‌م كڕین و فرۆشتنه‌ش شمولی هه‌موو شتێكی حه‌ڵاڵی ئیسلامی ده‌كات وه‌ك خواردن و ده‌رمان و مكیاج و هه‌موو جۆره به‌كار هێنه اسلامییه حه‌لاڵه‌كان . ئه‌مه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی وڵاته غه‌یره اسلامییه‌كان له كێ بڕكێدان بۆ ئه‌وه‌ی بتوانن شمه‌كی حه‌ڵاڵ وه‌به‌رهێنن بۆ ده‌وڵه‌ته اسلامییه‌كان .

---

## پرسیاره بێ وه‌ڵامه‌كان ژماره :پانزه

## خودا هیدایه‌تمان نادات ئێمه تاوانمان چییه ؟

1. يا أيها الرسول بلغ ما أنزل إليك من ربك وإن لم تفعل فما بلغت رسالته والله يعصمك من الناس إن الله لا يهدي القوم الكافرين ﴿المائدة: ٦٧﴾

2. إنما النسيء زيادة في الكفر يضل به الذين كفروا يحلونه عاما ويحرمونه عاما ليواطئوا عدة ما حرم الله فيحلوا ما حرم الله زين لهم سوء أعمالهم والله لا يهدي القوم الكافرين ﴿التوبة: ٣٧﴾

3. ذلك بأنهم استحبوا الحياة الدنيا على الآخرة وأن الله لا يهدي القوم الكافرين ﴿النحل: ١٠٧﴾

1. يا أيها الرسول بلغ ما أنزل إليك من ربك وإن لم تفعل فما بلغت رسالته والله يعصمك من الناس إن الله لا يهدي القوم الكافرين ﴿المائدة: ٦٧﴾
2. إنما النسيء زيادة في الكفر يضل به الذين كفروا يحلونه عاما ويحرمونه عاما ليواطئوا عدة ما حرم الله فيحلوا ما حرم الله زين لهم سوء أعمالهم والله لا يهدي القوم الكافرين ﴿التوبة: ٣٧﴾
3. ذلك بأنهم استحبوا الحياة الدنيا على الآخرة وأن الله لا يهدي القوم الكافرين ﴿النحل: ١٠٧﴾

بێدینەکان زۆر پۆستمان بۆ دا دەنێن و دەڵێن خودا لە قورئاندا دەڵێت : (**ان الله لا يهدى القوم الكافرين**) واتا خودا هیدایەتی کافرەکان نادات . ئەگەر خودا هیدایەتمان نەدات ئێمە تاوانمان چییە ؟ با خودا هیدایە تمان بدات و بمان هێنێتە سەر ڕێگای ڕاست وە کێشە لە ئێمەوە نییە بەڵکو لای خوداوەیە چونکە ئەو هیدایەتمان نادات .

وە وشەی هیدایەت واتا ڕێگا نیشان دەر ، بۆ وەڵامی ئەو گومانە دەبێت **یەك** شت بکەین بە بنەما و هەمیشە لەسەری بڕۆین . ئەویش ئەوەیە کاتێك گومان لەسەر اسلام بڵاو **دە** کرێتەوە بە تایبەتی لەسەر ئایەتەکانی قورئان . ئەو گومانانە بێدینەکان خۆیان دروستیان نەکردوە و بە دوایدا نەچوون بەڵکو شیعة و معتزلة و جولەکە و گاورەکان ئەو گومانانەیان دروست کردوە و ئەو گومانانە زۆر کۆنن و ١٤٠٠ ساڵە هەیە وە بناغەی ئەو گومانانەی ئایەتی قورئان **یەك** شتە ( ئایەتەکە دەقرتێنن ) بۆ نموونە (**ان الله لا يهدي القوم الكافرين**) لە سێ شوێن لە قورئاندا هاتووە **المائدة ٦٧** وە **التوبة ٣٧** وە **النحل ١٠٧** وەك لە وێنە کەدا دەیبینن . لە یەکەمیاندا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەڵێت ئەگەر پەیامەکەت نەگەیێنێت کەواتە تۆ پەیامی خودات نەگەیاندووە و خوداش هیدایەتی کافر نادات ؟ واتا هەرکەس پەیامی پێ نەگەیشت بێت چوزانێت اسلام چییە ؟ وە چۆن ئەو کەسە ڕێگا بدۆزێتەوە . بۆ نموونە ئێستا خەڵکێکی زۆر هەیە لە افریقیا و امازۆن و شوێنی تر هیچ پەیامێکیان پێ نەگەیشتووە چۆن ڕێگایان نیشان دەدرێت، وە ئایەتی دووەمیان باسی ( النسيء ) دەکات کاتی خۆی مانگەکانیان پاش و پێش دەخست وە خودا دەڵێت ڕێگا نیشان دەری ئەو کەسانە نییە کە احکامی خودا پاش و پێش دەخەن وە خۆشیان دەزانن کامەیان ڕاستە و بە عمدی پاش وپێشی دەخەن، وە ئایەتی سێیەمیشیان **النحل ١٠٧** ئەگەر ئایەتەکانی پێش ئەو بخوێنینەوە لە ١٠٤ وە . باسی ئەم بێدین و گاور و جولەکانە و خەڵکی بە عام دەکات . کە دەزانن ئاینی ئیسلام چییە و زۆر شارەزان تێیدا کەچی کاریان ئەوەیە دژایەتیی ئیسلام و قورئان دەکەن.

ئێ خۆ کابرا لە موسوڵمانان شارەزاترە لە ئاینی اسلام بەڵام هەر خەریکی ڕەخنەیە . خودا هیدایەتی چیی بدات و ڕێگای چیی نیشان بدات لە کاتێکدا شارەزاییان هەیە لە قورئان و سونەت زیاتر لە موسوڵمانەکان !؟ وەك لە وێنەکەدا دەبینن ئەوان هەمیشە خەریکی بڕینی ئایەتەکانن بۆیە ئێوەش هەمیشە دەقی ئایەتەکان بە تەواوەتی بزانن وە زۆر جار هەیە بەس بە دەقی ئایەتەکە ماناکانمان دەست ناکەوێت بەڵکو دەبێت سیاقی ئایەتەکە سەر **بگەرێن** واتا ئایەتەکانی پاش و پێشی ئەو ئایەتە ئەو کات ئەو گومانە پوچەڵ دەکرێتەوە چونکە بەرامبەرمان هەمیشە ئایەتەکان دەبڕێت و ئەو بەشە دەڵێت کە خۆی مەبەستێتی ، لە حەدیسیشدا هەر هەمان شت دەکەن کابرای دژە اسلام لە من شارەزاترە دەق و تەفسیر و حەدیسمان بۆ دەهێنێت ئێمە نەمان بیستووە هێندە شارەزایە کەچی دەڵێت خودا هیدایەتمان نادات ؟ ئێ بەرێزم خۆ تۆ لەمن باشتر لە دین دەزانیت من یان خودا ڕێگای چیت نیشان بدات ؟ خۆت شارەزای

هەمو ڕێگاکانیت وە شوێنی ناکەویت وەك ئەوە وایە کەسێك هەواڵی شوێنێك یان عینوانێکت لێ دەپرسێت تۆ بە جوانی بۆی دەست نیشان دەکەیت بەڵام ئەو بە پێچەوانەی قسەکانی تۆ دەڕوات و بزر دەبێت و شوێنەکە نا دۆزێتەوە ... ئەوە خەتای من نییە . چونکە من بە جوانی ناو نیشانی ئەو ماڵەم بۆ کردووە کە بۆی دەچێت . بەلام بەرامبەرە کەم بە پێچەوانەی قسەکانی من ڕۆشتووە و ماڵەکەی نە دۆزیوەتەوە دەبێت لۆمەی خۆی بکات نەك من.

---

## پرسیارە بێ وەلاّمەکان ژمارە :شانزە

## ئاژەڵەکانی کەشتیی نوح



بێدینەکان ڕەخنە لە پێغەمبەر نوح (ع) دەگرن و دەڵێن چۆن ئەو کەشتییە جێگای ئەو هەموو ئاژەڵەی تێدا بوەتەوە ؟ وە گاڵتەش دەکەن دەڵێن ئەی کەنغەری تێدا بووە ؟ بە حساب ئەوان زۆر شارەزان و بە دوای سەرچاوەدا دەڕۆن و گاڵتە بە ئەقڵی خەڵکی دیندار دەکەن وە شتی زانستییان دەوێت بە بەڵگەوە ... منیش ئەم پرسیارەیان لێ دەکەم Rhinocerosوحید القرن کە لە وێنە کەدا دەی بینن ئێستا بەس لە افریقیا دەبینرێت وە لە هەرکەس بپرسین دەڵێت وحید القرن لە افریقیا دەژی و لەوێ زۆرە . بەڵام ئەم ئاژەڵە لە دورگەکانی سەرووی باکوری بریطانیا دۆزراوەتەوە . هەروەها لە نیمچە دورگەکانی تشوکوتکا کە دەکەوێتە ڕۆژ هەڵاتی بیابانی سیبیریای بەفری لە باکوری ڕوسیا دۆزراوەتەوە . و لە ساڵی ٢٠٠٧ دا لە یاقوتیا کە هەر دەکەوێتە باکوری ڕوسیا و لە تەنیشت تشوکوتکایە لە سیبیریا وحید القرنێك دۆزراوەتەوە وەك خۆی ماوەتەوە تەنانەت خواردنی ناو سکیشی ماوەتەوە . باشە ئادەی بێدینی

بەڕێزوەرە پێشەوە و بە بەڵگە پێم بڵێ ئایا کەشتییەکەی نوح وحید القرني تێدا بوو ؟ وحید القرن بەچی گەیشتە افریقیا ؟ نوح لە کوێ دەژیا ؟ ئایا طۆفانەکەی هەموو جیهانی گرتەوە یان ئەو ناوچەیە بوو کە ئەوانی لێ دەژیا ؟ ئایا جیهانی ئەو کاتە بە گوێرەی جوگرافیا کوێ بوو ؟ ژمارەی دانیشتوان چەند کەس بوون ؟ چەند جۆر ئاژەڵ لەو ناوچەیەدا دەژیا ؟ تکایە باسی چاخی بەفرین و ملیۆن و ملیار ساڵم بۆ مەکە باسی شتێکم بۆ بکە من و باپیرەم لێت تێ بگەین !! وە بە ئەقڵی ٢٠١٥ و گوگڵ و تەیارە و کارەبا قسەم بۆ مەکە ... بۆ زانیاریشتان مێژووی نوسین دەگەڕێتەوە بۆ ٥٠٠٠ ساڵ لەمەو پێش کە نوسین هەبووە . بۆیە کەس بە خەیاڵ قسە نەکات و باسی ملیۆن و ملیار ساڵ بکات . وە بۆ زانیاریشتان استرالیا ساڵی ١٦٠٦ دۆزراوەتەوە امریکا ساڵی ١٤٩٢ دۆزراوەتەوە باقیي وڵاتانی اوروپا لە باکورەوە بگرە هەتا ڕوسیا تەمەنیان ناگاتە ١٥٠٠ ساڵ . هەولێر ساڵی بیستەکان بەس قەڵا بوو ... بۆیە ئەگەر شارەزا نییت لە مێژوو و جوگرافیا بێدەنگ بە . ئەگەر شارەزاشیت فەرموو وەرە پێشەوە ئێمە بێدەنگ دەبین و گوێ دەگرین لێت وە پێما بڵێ تۆ لەسەر چی بنەمایەك کەشتیي نوح و ئاژەڵەکانی ناوی ڕەت دەکەیتەوە ؟ وە تۆ بە ئەقڵی ئێستا قسە دەکەیت وا دەزانیت جیهان وەك ئێستا گەورە بووە و ئەو هەموو ئاژەڵەی تێدا بووە ؟ پرسیارەکانی سەرەوەشت بیر نەچێت وەلامیان بەرەوە .

http://www.bbc.co.uk/arabic/scienceandtech/2015_١٥٠١٢١/٠١/vert_earth_animals_from_the_ice_age

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :حەڤدە

## ئایا پێغەمبەر سەر بڕینی هێناوە ؟

پەیامی محمد بۆ مرۆڤایتی .
من سەربڕینم بۆ هێناون

کەشف کردنی درۆیەکی تری نەیاران و دژە ئیسلامەکان ؟







قال: رسول الله صلى الله عليه وسلم لقد جئتكم بالذبح

DAVID

آخر الحديث (وهو تحت رقم ٧٠٣٦ من المسند

دوژمنـانی ئیسـلام بـە هـەموو شـێوەیەك دەیانـەوێت گومـان بـڵاو بکەنـەوە لـە ڕێگـای درۆ کـردن و بڕینی دەقەکانـەوە خـەڵکی چەواشـە دەکـەن . دەڵـێن محمـد (صـلى الله علیـه و سـلم) گوتویـەتی مـن هـاتووم سـەر بـڕینم بـۆ هێنـاون وەك لـە وێنـەکـەدا دەی بیـنن برادەرێکـی جولەکـە بـڵاوی کردۆتـەوە و بێدینـەکانیش کـۆپی و پەیسـتی دەکـەن و بـڵاوی دەکەنـەوە . بـــــەڵام ئـەوەی جێگای پێکەنینە ئەوان هاتوون بەس ئەو بەشەیان بڵاو کردۆتەوە کە خۆیان دەیانەوێت

وە نوسـیویانە : پـەیامی محمـد مرۆڤایـەتی مـن سـەر بـڕینم بـۆ هێنـاون . وە ئەسـڵی ڕیوایەتەکـە دوور و درێـژە بـەڵام ئـەوان بـەس سـەر بڕینەکـەیان نوسـیووە و ژمـارەی حەدیسەکەشـیان بـە هەڵـە نوسـیووە بـۆ ئـەوەی کـەس نـەی دۆزێتـەوە . کـاتێکیش پرسـیاری لـێ دەکـەین دەڵێـت ئـەوە ژمارەکـەیم دانـاوە خۆتـان بگـەڕێن لـە کتێبـە کانتانـدا بیدۆزنـەوە ؟ ئـێ کـاکی درۆزن چی بدۆزمەوە ؟ ئەو ژمارەیەی تۆ هەڵەیە و ئەمە ڕاستییەکەیە

روایة الإمام البخاري٣٦٧٨

مسند الإمام أحمد ١١/ ٦١٠. ٦١١

ڕیوایەتەکە بە کوردی دەڵێت : عروەی کوڕی زبێر پرسیاری لە عبدالله ی کوڕی عمرو کردوە مشرکەکانی قورەیش چی شتێکیان کردووە کە زۆر ئازاری پێغەمبەری داوە (صلى الله علیه و سلم) ؟ ئەویش دەڵێت جارێك لای کعبە بووین سەرگەورەکانی قورەیش کۆ بوبونەوە دەیان گوت : زۆر سەبرمان لەم کابرایە گرتووە جنێو بە باپیرانمان دەدات ڕەخنە لە ئاینمان دەگرێت جنێو بە خوداوەندەکانمان دەدات وە تەفرەقەی تێ خستوین ئیتر سەبرمان نەما و دەبێت حەدێکی بۆ دا بنێێن دەڵێت ئەوان لەو قسانەدا بوون پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) پەیدا بوو . گەیشتە سوچی کەعبە ئەوا ئەو قسانەیان پێ دەگوت جارێك سوڕایەوە و گەیشتە لایان هەمان قسەیان پێ گوتەوە هەتا ( ٣ ) جار بەو شێوەیە بوو . پاشان پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) پێی گوتن من سەر بڕینم بۆ هێناون . یەکێکیان پێی گوت ابو القاسم بڕۆ لێرە مەمێنە ئەویش ڕۆشت . بۆ سبەینێ هەمان شێوە هاتەوە منیش لەوێ دانیشت بوم لەگەڵیان موشریکەکان گوتیان بیستتان دوێنێ چیی پێ گوتین ؟هەمویان هێرشیان بۆ برد گوتیان تۆ دوێنێ پێت گوتووین سەرتان دەبرم ؟ ئەویش فەرمووی : بەڵێ من دوێنێ وام پێ گوتون . یەکێکیان عەباکەی داکەند و لە ملی ئالاند خەریك بوو بی خنکێنێت ابو بکری صدیق لە ژێر دەستی دەری هێنا

بەڵێ بەڕێزان ئەمە ئەسڵی ڕیوایەتەکەیە وە پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) قسەکەی ڕووی لە موشریکەکانی قورەیش بووە بە تایبەتی ئەو چەند کەسەی هێرشیان بۆ برد و وەك ترساندن پێی گوتن سەرتان دەبرم بۆ ئەوەی لێی دور بکەونەوە و ئازاری نەدەن . چونکە ئەو کاتە اسلام هێشتا لاواز بوو خەڵکی باوەڕدار کەم بون تەنانەت موسوڵمان بەس خۆی و ابوبکری صدیق بوو. ئەگەر ئەو قسەیەی پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) وەك هەڕەشە نە بووایە و وەك منهج بووایە !! ئایا کافرەکانی قورەیش ئەو قسەیەیان نە

دەقۆستەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لە محمد (صلی الله علیە و سلم) بترسن و شوێنی نەکەون بڵێن دوای مەکەون چونکە ئاینی محمد (صلی الله علیە و سلم) ئاینی سەربڕینە ...بەڵام کاتێك محمد (صلی الله علیە و سلم) پێی گوتون **لقد جئتلم بالذبح** کابرای قورەیشی تێگەیشتووە پێیان دەڵێت دەبێت سەرتان ببڕم وەك هەڕەشەی کەسێکی بێ دەسڵات کاتێك دەرەقەتی بەرامبەرەکەی نایەت و هەڕەشە دەکات. وەك چۆن کەسێك شەڕ دەکات و هەڕەشە دەکات دەڵێت باشە دەبێت بت کوژم ؟ ئەویش بەو شێوەیە هەڕەشەی لەو جەماعەتە کردووە و هیچ حەدیسێك نییە تێیدا پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) بڵێت خەڵکی سەر بڕن بەڵکو لە حە دیسی ژمارە ٢٥٩٩ ی موسلیمدا . ابو هریرة پێی دەڵێت دوعا بکە لە موشریکەکان ئەویش دەفەرموێت : من نە نێردراوم بۆ لعنت کردن بەڵکو بۆ ڕەحمەت . بەڵام کاکی جولەکە و گاور باسی کتێبەکەی خۆی ناکات تێیدا نوسراوە

لە **سفر الملوکی یەك** بکە بەشی ١٨ دێڕی ٤٠ ایلیا ی پێغەمبەریان لە پاش نیوەڕۆی ڕۆژێکدا ٤٥٠ کەسی سەر بڕیوە ..

ئادەی پێم بڵێ محمد صلی الله علیە و سلم کێ سەر بڕی ؟ ئادەی ئەگەر ڕاست دەکەن **یەك** حەدیس بهێنن تێیدا بڵێت خەڵکی سەر ببڕن ؟ ئەو ڕیوایەتەش حەدیس نییە بەڵکو گێڕانەوەی بەسەر هاتێکە کە ڕووی داوە و ڕووی قسەی پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) بەس لەو جەماعەتە بووە بۆ ئەوەی بیان ترسێنێت و لێی دور بکەونەوە . ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) سەر بڕینی هێنا بێت بۆ موشریکە کان و جیهان . ئەی بۆچی ڕۆژی فتحی مەکە هەموو موشریکەکانی سەر نەبڕی ؟ ئەی بۆچی عەفووی کردن ؟

فەرموون ئەمەش دەقی ڕیوایەتەکەیە بە عربی وەك خۆی وە ئەو ڕیوایەتەش ڕاستە و لاواز نییە

.......................................

جاء في أن عروة بن الزبير رحمه الله قَالَ : سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو عَنْ أَشَدِّ مَا صَنَعَ الْمُشْرِكُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

قال يعقوب ، حدثنا أبي ، عن ابن إسحاق ، قال : وحدثني يحيى بن عروة بن الزبير ، عن أبيه عروة ، عن عبد الله بن عمرو بن العاص ، قال : قلت له : ما أكثر ما رأيت قريشاً أصابت من رسول الله فيما كانت تظهر من عداوته ؟ قال حضرتهم وقد اجتمع أشرافهم يوما في الحجر ، فذكروا رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فقالوا : ما رأينا مثل ما صبرنا عليه من هذا الرجل قط سفَّه أحلامنا ، وشتم آباءنا ، وعاب ديننا ، وفرق جماعتنا ، وسب آلهتنا ، لقد صرنا منه على أمر عظيم ، أو كما قالوا . قال : فبينما هم كذلك إذ طلع عليهم رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فأقبل يمشي حتى استلم الركن ، ثم مر بهم طائفاً بالبيت ، فلما أن مر بهم غمزوه ببعض ما يقول ، قال : فعرفت ذلك في وجهه ، ثم مضى ، فلما مر بهم الثانية غمزوه بمثلها ، فعرفت ذلك في وجهه ، ثم مضى ، ثم مر بهم الثالثة ، فغمزوه بمثلها ، فقال : تسمعون يا معشر قريش ، أما والذي نفس محمد بيده لقد جئتكم بالذبح ؛ فأخذت القوم كلمته حتى ما فيهم رجل إلا كأن على رأسه طائر واقع ، حتى إن أشدهم فيه وطأة قبل ذلك ليرفؤه بأحسن ما يجد من القول ؛ حتى إنه ليقول : انصرف يا أبا القاسم ، فوالله ما كنت جهولاً . فانصرف صلى الله عليه وسلم ، حتى إذا كان الغد اجتمعوا في الحجر وأنا معهم ، فقال بعضهم لبعض : ذكرتم ما بلغ منكم ، وما بلغكم عنه ، حتى إذا بادأكم بما تكرهون تركتموه ، فبينما هم في ذلك إذ طلع رسول الله صلى الله عليه وسلم ، فوثبوا إليه وثبة رجل واحد فأحاطوا به يقولون له : أنت الذي تقول كذا وكذا - لِما كان يبلغهم عنه من عيب آلهتهم ودينهم

قال : فيقول رسول الله صلى الله عليه وسلم : نعم أنا الذي أقول ذلك . قال : فلقد رأيت رجلاً منهم أخذ بمجمع ردائه . قال : وقام أبو بكر الصديق رضي الله تعالى عنه دونه يقول - وهو يبكي - : أتقتلون رجلاً أن يقول ربي الله . ثم انصرفوا عنه ، فإن ذلك لأشد ما رأيت قريشاً بلغت منه قط .

## پرسیاره بێ وه‌لاّمه‌کان ژماره :هه‌ژده

## اسکندری مکدۆنی ذي القرنين نی یه




زۆر له ته‌فسیره‌کانی قورئان ئاماژه به‌وه ده‌ده‌ن که ذي القرنين که له ئایه‌تی ٨٣ ی **سوره‌تی الكهفدا** ناوی هاتووه ( اسکندری مکدۆنییه ) به‌لام ئه‌و قسه‌یه ڕاست نیه و ئه‌و موفه‌سیرانه‌ی به‌و شێوه‌یه لێکیان داوه‌ته‌وه نه شاره‌زا بوون له مێژوو . چونکه اسکندری مکدۆنی وه‌ك( وول دیورانت) له کتێبی قصة الحضارة دا باسی ده‌کات به‌شی دوو لاپه‌ڕه (٢٥٩٥) و دوای ئه‌ودا ده‌ڵێت

اسکندری مکدۆنی خۆی به خودا داده‌نا و زۆر معجب بوو به خوداوه‌ند اخیل اخیلیوس وه هه‌میشه نوسخه‌یه‌کی الیاذه‌ی پێ بوو به خه‌تی ارسطۆ له‌سه‌ری نوسرا بوو شه‌وانه دی خسته ژێر سه‌رینه‌که‌ی که ده‌نوست . وه اسکندر له ته‌مه‌نی ٢٠ ساڵییه‌وه بوو به ملك وه زۆر باوه‌ڕی به سیحر و جادوو هه‌بوو هه‌میشه کۆڕه‌کانی پڕ بون له ساحیر و جادو گره‌کان وه قوربانی زۆری ده‌کرد بۆ خوداوه‌ندی ترس له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی زۆر ئازا بوو به‌ڵام زۆر شوێن خورافات ده‌که‌وت

وه کاتێك مه‌دحیان ده‌کرد زۆر مغرور ده‌بوو . وه زۆر حه‌زی له نێر بازی بوو و سیفاتی نێر بازیی تێدا بوو وه هفستیونی زۆر خۆش ده‌ویست که کوڕێکی جوان بوو . وه ئالوده‌ی مه‌ی بوو . له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا سه‌رکرده‌یه‌کی ئازا و به جه‌رگ و خاوه‌ن ویژدان بوو . وه هه‌چ په‌یمانێکی بدایه به سه‌ری ده‌برد له‌گه‌ڵ دوژمنه‌کانیدا وه خه‌ونی به‌وه‌وه ده‌بینی ڕۆژ هه‌لاّتی ده‌ریای ناوه‌ڕاست بخاته سه‌ر وڵاتی یۆنان بۆیه سوپاکه‌ی به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات جوڵاند له ته‌مه‌نی ٢٠ ساڵیدا باوکیان کوشت به پلانێکی فارس و یۆنانیه‌کان وه اسکندر چووه جێگای باوکی و پلان گێڕه‌کانی کوشت وه سوپای بۆ یۆنان برد یۆنانیه‌کان شه‌ڕیان نه‌کرد و خۆیان دا به ده‌سته‌وه و کردیان به خوداوه‌ند . پاشان به‌ره‌و باکور ڕۆشت بۆ صربیا و هه‌تا بوخارست ڕۆشت وه فیتنه‌ی ئه‌وێی نه هێشت که هه‌ڵ گیرسا بوو پاش کوشتنی باوکی پاشان سوپاکه‌ی

بەرەو ڕۆژ هەڵات بەڕێ کرد وە خۆشیی لەگەڵیاندا بوو کاتێك گەیشتە سەر گۆڕی اخیلی خوداوەند ڕۆنی کرد بە سەریدا و تاجە گوڵینەی لەسەری دانا وەك شکۆیەك وە بە ڕوتی بێ جل و بەرگ بە دەوری قەبرەکەیدا سوڕایەوە و طوافی دەکرد و پێیدا هەڵ دەدا . وە دەگەیشتە هەر جێگایەك سوپاکان شەڕیان نە دەکرد و خۆیان دەدا بە دەستەوە بەس لەگەڵ فارسەکاندا شەڕی کرد بە سەرکردایەتیی دارای سێهەم وە دارا ڕای کرد و تەنانەت خێزانەکەشی بە جێهێشت بۆ اسکندر وە لە صور لەگەڵ فینیقیەکاندا شەڕی کرد خۆیان نەدا بە دەستەوە پاش ئەوەی شکاندنی( ٨ ) هەزارکەسی لێ سەربڕین وە (٨٠) هەزاری کردن بە کۆیلە و فرۆشتنی . وە اورشلیم تسلیمی بوو بەڵام غەزە شەڕی کرد هەموویانی کوشت وە ژنەکانی برد بۆخۆی . پاشان چووە میسر وە چوو بۆ پەرستگای ئامون و کڕنوشی بۆ خوداوەند ئامون برد وە کاهینەکان پلەی فیرعەونیان پێدا و میسریان تەسلیم کرد پاشان هات بەرەو عیراق وە لە نزیکی هەولێر جارێکی تر سوپای دارای تێك شکاند و دارای تێدا کوژرا . با زۆر لەسەر شەڕەکانی نەڕۆین . بەڵام اسکندری مکدۆنی بچوایەتە هەر دەوڵەت و هەر شارێکەوە دەچووە سەر مەزاری خوداوەندەکانیان و دەچووە سەر ئاینی ئەو قەومە بۆیە کاهینەکان و گەلیشپشت گیرییان دەکرد و شەڕیان لەگەڵ نە دەکرد وە لە کۆتایی ژیانیدا خۆی کرد بە خوداوەند و کوڕی خوداوەند زیوسی یۆنان و أمون ی میسری فیرعەونی وە بڕیاری خوداییەکەی بڵاو کردەوە بە ناو وڵاتانی ژێر دەستیدا بەڵام ئەوەی سەیرە لای خەڵکی اسکندر خۆی خودا بوو کەچی قوربانیی دەکرد بۆ خوداوەندەکانی تر وە اسکندری مکدۆنی لە بابل مرد پاش ئەوەی چەند شەوێك کێ برکێی مەی خواردنەوەیان دەکرد لەگەڵ ئەفسەرەکانی سوپاکەیدا وە زۆری خوارد بۆوە و نەخۆش کەوت و مەیەکە کوشتی . لە تەمەنی ٣٣ ساڵیدا مرد .

ئەوەی جێگای سەر سوڕمانە نازانم چۆن ئەو موفەسیرە موسوڵمانانە دەڵێن ذو القرنین اسکندری مکدۆنی بووە و خودا لە قورئاندا باسی کابرایەکی نێر بازی بت پەرست دەکات کە خۆی بە خودا داناوە و هەمیشە خەریکی مەی خواردنەوە بووە . و لە کێ برکێی مەی خواردنەوەدا مردووە . هەر کەس دەیەوێت زیاتر بزانێت دەربارەی اسکندری مکدۆنی کلیکی ئەم لینکە بکات و لە سەرەوە لای ڕاست لە جێگای گەاندا تەنیشتی نوسراوە رقم الصفحة بنوسێت ژمارە ٢٥٩٥ وە لاپەڕەکانی دواتری بخوێنێتەوە زانیاریی زیاتری دەست دەکەوێت دەربارەی اسکندر. وە ئەو کتێبە زۆر بەسودە ١٦ هەزار لاپەڕەیە ئەگەر تاقەتتان هەبێت بیخوێننەوە ئاگاداری هەموو مێژووی دونیا دەبن وە کتێبێکی ناسراوە لە هەمو جیهاندا و زانیاریەکانی باوەڕ پێکراون لە هەموو زانکۆ جیهانیەکاندا لە نوسینی وول دیورانتە

http://www.civilizationstory.com/

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نۆزدە

## دژە ئیسلام و پینە و پەڕۆ

کاتێـك دژە ئیسـلامەکان ڕەخنـەمان لـێ دەگـرن دەڵـێن ئێسـتا ئیسـلامیەك دێـت و پینـە و پـەڕۆی دەکـات . وا دەزانـن ڕەخنەیـەکی زۆر موهیمیـان گرتـووە و کـەس نییـە وەڵامیـان بداتـەوە . وە زۆربـەیان تـوڕە دەبێـت کـە وەڵامـی دەدەینـەوە !! باشـە بـەڕێـز ئەگـەر یـەکێك قسـە لەسـەر خـۆت بکـات و کێشـەیەکت بـۆ دروسـت بکـات لـە نـاو خـزم و دۆسـتان و دراوسـێتدا و کارەکـە بگاتـە پـۆلیس و ئاسـایش تـۆ چی دەکـەیت ؟ ئایـا تـۆ دەڵێیـت دنیـا ئـازادە و چی دەڵـێن بـا بیڵـێن ؟ یـان تـۆش بـەرگری دەکەیت و ئیسپاتی دەکەیت ئەو شتە ڕاست نییە ؟

**سەرچاوەی گومانی دژە ئیسلامەکانیش سێ سەرچاوەیە زیاتر نییەوەکو لە پێشەکی کتێب باسم کرد**

**یەکەمیان** : تفسیری قرطبییە دەیکەن بە بەڵگە و بەهەرا و دەڵێن ئەوەتا سەرچاوەی خۆتانە . بەلام ئەوانە ی لە تفسیر شارەزان دەزانن قرطبی بە ڕەحمەت بێت لە تفسیرەکەیدا هەموو ڕا و بۆچوونەکانی نوسیووە و دای ناوە وەك ئەمانەتێکی عیلمی وە لە بێژنگی نەداوە یان ڕون کردنەوەی لەسەر بدات . دژە ئیسلامە کانیش ئەوانەی لێ دەر دەهێنن کە خۆیان دەیانەوێت و دەیکەن بە بەڵگە بۆ سەر ئیسلام

**دووەمیان** : لە کتێبەکانی ئیسلامدا دەگەڕێن وە ڕاو بۆچونی فیقهیی جیاواز دەهێنن و دەیکەن بە بەڵگە وە ڕاو بۆچوونی جیاوازیش لە ئیسلامدا مایەی بەهێزیی ئیسلامە چونکە لە ناو مالێکدا کە **یەك** خێزانن ڕاو بۆچونی جیاواز هەیە ئومەتی ئیسلامیش ئومەتێکی مەزنە و خاوەنی چەندەها گەل و چەندەها کلتوری جیاوازە . بۆیە زانایانی ئیسلام یاسای ئیسلامیان لەگەڵ ڕا و بۆچوونی ئەو گەلانەدا داناوە لەسەر بناغەی قورئان و سونەت بە بێ لادان لە بنەمای ئیسلام کە قورئان و سونەتە

**سێیەمیان** : بڕینی ئایەت و دەقەکانە بەگوێرەی ویستی دژە ئیسلامەکان لەگەڵ هێنانی حەدیسی لاواز بۆیە دەبێت موسوڵمان ئاگادار بێت کاتێك دەقێکی قورئان یان حەدیسێکی بۆ دادەنێن لێ بکۆڵێتەوە لە دەقی ئایەتەکە بە تەواوەتی لەگەڵ سیاقی ئایەتەکە واتا ئایەتەکانی پاش و پشتی ئەو ئایەتە بهێنێت گومانی ئەوان پوچەڵ دەکاتەوە . یان بگەڕێت بە دوای ئەسڵی حەدیسەکەدا کێشەکان نامێنێت

منیش پرسیار دەکەم : دەڵێم کاکی دژە دین جەنابت لەو **سێ** قۆڵەوە هێرشم بۆ دەکەیت ئەی نابێت من وڵامت بدەمەوە ؟ ئایا ئەوە پینە و پەرۆیە یان دەرخستنی درۆ و گومانەکانی تۆیە ؟ ئەی بەڕێزم بۆچی تۆ ڕازی نابیت کەسێك بوختانت بۆ بکات ؟ بۆچی من ڕازی بم تۆ بوختانم بۆ بکەیت ؟

**فەرموو ئەمەش کۆتا قومبەلەیە لە منەوە کە گومان و بوختانەکانی تۆ پوچەڵ دەکاتەوە**

تۆ هیچ سەرچاوەیەکت پێ نییە ڕەخنەی لە ئیسلام پێ بگریت . سەرچاوەی ڕەخنە کانت هەر کتێب و سەرچاوەکانی خۆمانە . وە ڕۆنی خۆمان دەدەیت لە سمێڵی خۆمان . کەواتە ئەو ڕەخنانەی تۆ بڵاوی دەکەیتەوە گومانە لە مێشکی تۆدا هەیە ویان لە نەشارەزایتایە یان لە ڕق و کینەتایە بەرامبەر بە ئیسلام ئەو گومانانە بڵاو دەکەیتەوە ؟ ئادەی بێزەحمەت بێجگە لە سەرچاوە ئیسلامییەکان پێم بڵێ تۆ پشت بەچی سەرچاوەیەکی تر دەبەستیت لە مێژوودا ؟بۆیە حاڵی ئێوە وەك حاڵی ئەم دوو برادەرە وایە . هاتوون دزیان لە سەیارەی کەسێك کردووە پارەی تێدا بوو بردویانە لەگەڵ مۆبایلی کابرا . پاشان هەر بەهەمان مۆبایل وێنەی ( سیلفی ) ی خۆیانی بڵاو کردۆتەوە بە مۆبایلە دزراوەکە لە ڕێگای ئی کلاودەوە وێنەی خۆیانیان بڵاو کرد بۆوە کە ٥٠٠٠ دۆلاریان دزیووە . کابراش کاتێك کۆمپیوتەرەکەی دەکاتەوە دەبینێت وێنە هاتووە بۆ حسابی کۆمپیوتەرەکەی ئەویش لای سەیر دەبێت و تلفۆن بۆ پۆلیس دەکات و دوانەکە دەگیرێن لە ڤیدیۆکەدا پۆلیسکە پێ دەکەنێت وە دەڵێت ئەو دوانە دڵخۆش نین بە بینینی ئێمە و میدیاکان . چونکە کارێکی گەمژانەیان کردووە و لە یوتوب و لە ئیکلاود وێنەی خۆیانیان بڵاو کردۆتەوە لە ڕێگای مۆبایلە دزراوەکەوە . وە خۆیان خۆیانیان بەگرت داوە دەزانم ئێوەش دڵخۆش نابن بە ئێمە و بە **وەڵامەکانمان** چونکە ئێوەش لە سەرچاوەکانی خۆمانەوە گومانە کانتان بردووە . ئێمەش لە ئێوە شارەزاترین لە سەرچاوەکانمان کاتێك دەگەڕێین بە دوای گومانەکانتاندا وەلامتان هەدەینەوە و گومانەکانتان کەشف دەکەین بەڵام ئێوە بۆ ئەوەی ئەو دزییە بشارنەوە ناوی دەنێن پینە و پەرۆ .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست

## خواردنی گۆشتی مردو ئاژەڵ و مرۆڤ لە ئیسلامدا

گومانی ئەم جارەمان هی بەناو موسوڵمانە قورئانی و موعتیزلە دژە ئیسلامەکانە و دەڵێن لە فیقهی ئیسلامیدا خواردنی گۆشتی مردووی مرۆڤ و ئاژەڵ حەڵاڵ کراوە و ئیتر ئەوانیش بە ئارەزوی خۆیان ترش و خوێ بەم بابەتەوە دەکەن ، و بە حساب ئاینی ئیسلام ئاینێکە خواردنی مردوو حەڵاڵ دەکات وە ڕیزێك سەرچاوەتان بۆ دا دەنێن . کاتێك خەڵکی عەوامی موسوڵمان یان نا موسوڵمان دەیبینێت . دەڵێت : ئەمە چۆن ئاینێکە دەڵێت گۆشتی ئاژەڵ و مرۆڤی مردوو بخۆن !؟ خۆ ئەوە قسەی ئێمە نییە بەڵکو قسەی کابرای مەلایە و عەمامەی بە سەرەوەیە یان بیرمەندی ئیسلامیە لەسەر تلفزیۆن بۆ ئەو بابەتە ئەم سەرچاوانەت بۆ دا دەنێت

: حواشي الشرواني على تحفة المحتاج بشرح المنهاج ج ١ ص ١٢٦، المؤلف: عبد الحميد الشرواني

تفسير مقاتل بن سليمان ج١ ص٢٨٠ هەروەها كتاب الإقناع في حل ألفاظ أبي شجاع ج ٢ ص ٥٦٢ هەر هەمان سەرچاوە ج٢ ص ٥٨٦، هەروەها كتاب الذخيرة المؤلف شهاب الدين ين القرافي ق ٧هـ،، ج٤ ص ١١٠كتاب جامع الأمهات ج١ ص ١٣٧ المؤلف/ إبن الحاجب الكردي ق٧هـ . هەروەها كتاب الزواجر ج٢ ص ٥٤٢، المؤلف: ابن حجر الهيثمي .

هەروەها مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج ج ٤ ص ٣٠٨



بەڕێزان کاتێك ئەم نوسینە دەبینن یان بیرمەندێکی فنکوشی لەسەر تلفزیۆن ئەم هەموو سەرچاوانە دەژمێرێت بۆتان . خەڵکی موسوڵمان و نا موسوڵمانیش دەکەونە شك و گومانەوە لە ئاینی ئیسلامی مەزن . وە لایان سەیرە چۆن اسلام ڕێگا دەدات بە خواردنی گۆشتی مردوو ئایا ئەمانە زۆمبین ؟

کاکی قورئانی و معتزلەش بە ئارەزووی خۆی قاوە دەگرێتەوە و منهج و فقهی ئیسلامی ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت دەبێت ئەم کتێب و حوکمانە لا ببرێت چونکە لەگەڵ سەردەمدا نا گونجێت و ئەمانە هەر هەمووی هەڵەن و بە هەڵە نوسراون. بەڵام ئەوەی لەم بەینەدا زەرەر مەندە معتزلە و قورئانیەکانن .چونکە ئەو سەرچاوانە هەر هەمووی باسی ئەو قورئانە دەکات کە ئەوان دەڵێن ئێمە قورئانیین . وە حوکمی خواردنی گۆشتی مردوو لەو سەرچاوانە ی سەرەوە کە دامان ناون

وە معتزلە و قورئانی ڕەخنەی لێ دەگرێت لە باسی تەفسیری ئایەتی ٣ ی سورەتی **المائدەدا** هاتووە ، ئایە تەکەمان لە وێنەکەدا داناوە . سەرەتای ئایەتەکە دەفەرموێت گۆشتی مردوتان لێ حەرام کراوە لەگەڵ هەرئاژەڵێکی مردوو . ئێ ئەگەر فقهی ئیسلامی و هەر چوار

مەزهەبەكە بڵێن گۆشتی مردوو حەلاڵە . كەواتا پێچەوانەی ئایەتەكەیە . وە ناكرێت ئەو ئیمامە بەڕێزانە هەڵە بكەن و تەفسیری ئایەتێك بكەن بڵێت گۆشتی مردووی ئاژەڵ حەرامە

ئەمان بێن لە كتێب و سەرچاوەكانیاندا بڵێن گۆشتی مردووی ئاژەڵ و مرۆڤیش حەلاڵە . بەڵام ئەو كەسەی هەڵەیە كاكی بیرمەندی فنكوشی و بەناو قورئانییە . چونكە لە كۆتایی ئایەتەكەدا دەفەرموێت : ( **فمن اضطر في مخمصة غير متجانف لاثم فان الله غفور رحيم** )

وە ئەو سەرچاوانەی سەرەوە و هەر چوار ئیمامی مەزهەبەكە باسی تەفسیری كۆتایی ئایەتەكە دەكەن چونكە دەفەرموێت ( فمن اضطر ) واتا ئەگەر هیچ خواردنێك نەبوو وە ئەو كەسە مضطر بوو واتا مەجبور بوو.

لە كەیدا مەجبور بوو ؟ هەر ئایەتەكە خۆی وەڵام دەداتەوە ( في مخمصة ) واتا كاتێك مرۆڤ برسی دەبێت و هیچ نییە بیخوات و لاواز و بێ هێز دەبێت وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێت پێستی سكی بە پشتیەوە دەنوسێت وە كابرا بەرەو نەمان و مردن دەچێت ئەوە پێی دەڵێن ( مخمصة ) لەو كاتەدا ئەگەر حەیوانێكی مرداروە بوی بینی بۆی هەیە بیخوات یان مرۆڤێكی مردووی بینی بۆی هەیە بیخوات . واتا كابرا مەجبورە بۆ ئەوەی نەمرێت وە بەردەوام بێت لە ژیان چونكە مەجبورە ئەوە بخوات . ئەگینا ئەگەر خواردنی تر هەبێت بە دڵنیاییەوە مرۆڤەكە ناتوانێت شتی مردوو یان مرۆڤی مردوو بخوات . چونكە سروشتی مرۆڤ وایە ناتوانێت نە ئاژەڵ ووە نە مرۆڤی مردوو بخوات بەلام كاتێك مەجبور بو هیچ شتێكی تر نە بوو بە دڵنیاییەوە من و تۆش ئەو گۆشتانە دەخۆین چونكە مجبورین بۆ ئەوەی نەمرین . وە ( مخمصة ) لە زمانی عەرەبیدا واتا برسێتی كە نزیكت بكاتەوە لە مردن . وە پاشان ئایەتەكە دەفەرموێت:

(**غير متجانف لاثم** ) متجانف واتا الميل و الجور . بە كوردی واتا نەك كەسەكە خۆی حەزی لەو شتە بێت و مەیلی بۆی هەبێت . یان كاتێك ئەو شتەی كرد زیادە ڕەویی تێدا بكات ، ئەگەر خواردنی تر هەبوو كابرا بۆی نییە ئاژەڵ یان مرۆڤی مردوو بخوات وە ئەگەر مەجبوریش بو نابێت هێندە بخوات زیادەڕەوی بكات بەڵكو هێندە بخوات كە پێی تێر بێت وە ئەگەر بەو شێوەیە بوو خودا دەیبەخشێت چونكە كۆتایی ئایەتەكە دەفەرموێت **فان الله غفور رحيم** .

بەڵێ بەڕێزان وەك بینیتان كابرای فنكوشی و بەناو قورئانی هیچیان لە مانای ئەو ئایەتە تێ نەگەیشتون وە ڕەخنە لە فقهی ئیسلامی مەزن دەگرن . لە كاتێكدا دەقی ئایەتەكە دەفەرموێت ( فمن اضطر ) وە ئەو سەرچاوانەش كە ئەوان دایان ناوە هەر هەموویان لە سەرەتای خواردنی گۆشتی مردوودا نوسیویانە ( فمن اضطر ) وە لە باسی تفسیری ئایەتی ٣ ی **المائدەدا** ئەو باسەیان كردوە بە تایبەتی ( **مخمصة** ) دا . ئادەی كاكی فنكوشی پێمان بڵێ بۆچی فقهی ئیسلامی هەڵەیە یان بۆچی بگۆڕرێت ؟لە كاتێكدا جەنابتان لە قورئان تێ نەگەیشتوون خۆ دەبێت زانیاریتان لە مێژوو هەبێت و بزانن كە مرۆڤ گرنگ نییە دیندار بێت یان نا !؟ لە كاتی برسێتیدا هەموو شت دەخوات بە شەرتێك هیچ خواردنێكی لا نەبێت . با سێ نمونە لە هەزارەها ڕوداو بۆ بیرمەندە فنكوشییەكان باس بكەین لەم زەمانەدا كە دەڵێن فقهی ئیسلامی بۆی نا گونجێت

مێژونوسی جیهانی وڵ دیورانت لە کتێبە ناسراوەکەیدا ( قصة الحضارة ) باسی ساڵی ١٦١٠ و ١٦١١ دەکات کاتێك شەڕکەوتە نێوان پۆڵۆنیا و ڕوسیا لە نێوان کاثۆلیك و ارؤذۆکسەوە و سویدیش یارمەتیی پۆڵۆنیای دا لەو ماوەیەدا خواردن و کشتوو کاڵ نەما وە خەڵکی گۆشتی مردویان خواردووە بۆ ئەوەی بژین . لە وێنەکەدا بۆمان داناون چۆن ئەو سەرچاوەیە بدۆزنەوە ؟ لە بەشی لاپەڕەکەدا بنوسن( ١٠٨١٩) خۆی باسی وردەکاریی ئەو شەڕانە و خواردنی گۆشتی مردوتان بۆ دەهێنێت ئەمەش لینکی کتێبی قصة الحضارەیە

http://www.civilizationstory.com

کاکی فەنکوشی ڕەخنە لە فقهی ئیسلامی دەگرێت کە دەڵێت ئەگەر لە شوێنێك بویت وە هیچ خواردنێکی لێ نەبوو مرۆڤ بۆ ئەوەی لە برسان نەمرێت مەجبور دەبێت گۆشتی مردوو بخوات . وە دەڵێت ئەو حوکمە بۆ ئەم سەردەمە ناشێت ئەی فنکوشی نەزان ئابڵۆقەی ئەلمان بۆ لیننغراد لە مانگی ٩ ی ١٩٤١ هەتا مانگی ١ ی ١٩٤٤ بەردەوام بوو واتا ٨٧٢ ڕۆژ ئەو شارە ئابلۆقە درا بو هیچ خواردنێك نەمابوو لە شارەکەدا . هەر کەسێك بمردایە دەیان خوارد بۆ ئەوەی خۆیان لە برسان نەمرن . وە لەوانەیە زۆریشتان ڕۆمانی ( مردو خۆرەکان ) تان خوێند بێتەوە کە باسی ئەو ئابلۆقەیە دەکات . خۆ ساڵی ١٩٤٤ ئێستایە و زەمانێکی زۆر دوور نییە !؟ لە ساڵی ١٩٧٢ دا فڕۆکەیەکی وڵاتی اورغوای کەوتە خوارەوە و لەبەر بەفر و شوێنی شاخاوی نەیان توانی زوو فریایان بکەون . ئەوانەی لە ژیاندا مابوون مردووەکانیان خوارد بۆ ئەوەی نەمرن لە برسان . خۆشتان دەتوانن لە گوگڵ بگەڕێن و بنوسن

1972 Andes flight disaster

کاکی موسەقەفی بەناو ڕۆشنبیر بێ ئاگایە لەوەی مرۆڤ لە کاتێکدا چارەی نەمێنێت مەجبورە هەموو شتێك بخوات بۆ ئەوەی نەمرێت کەچی دێت ڕەخنە لە ئایەتی ٣ ی **مائدة** و فقهی ئیسلامی دەگرێت لە کاتێکدا ناتوانێت ڕەخنە لە ساڵی ١٩٧٢ بگرێت و بڵێت بۆچی ئەوانە گۆشتی مردویان خواردوە ؟ یان ڕەخنە لە ئابڵۆقەی لیننگراد بگرێت . خۆ ئەوانە لەم زەمانەدا بووە ؟ وە ئایا فقهی ئیسلامی پێت دەڵێت برۆ گۆشتی مردوی مرۆڤ یان ئاژەڵ بخۆ ؟

یان بە گوێرەی تەفسیری ئەو ئایەتە دەڵێت ئەگەر چارت نەما بۆ ئەوەی لە برسان نەمریت بۆت هەیە گۆشتی مردوو بخۆیت !؟ فەرمون ئەمەش لینکی کتێبی الإقناع في حل ألفاظ أبي شجاع کە بەناو قورئانی و فنکوشییەکان ڕەخنەی لێ دەگرن وە خۆشتان بچن بۆ لاپەڕە ٥٨٤ هەتا ٥٨٦ بخوێننەوە بزانن لە تفسیری ئایەتی ٣ ی المائدة و لە باسی ( مخمصة ) دا باسی خواردنی گۆشتی مردوو کراوە ؟ یان دەڵێت موسوڵمان دەبێت ببێت بە زۆمبی و گۆشتی مردو بخوات ؟ وە لە وێنەکەشدا وێنەی لاپەڕەی ٥٨٤ مان بۆ داناون بۆ ئەوەی بزانن چۆن ئەو بەشە و ئەو لاپەڕەیە بدۆزنەوە ( ٢-٥٨٤ )

http://shamela.ws/browse.php/book-6121#page-582

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست و یەك

## ئەقڵ لە کوێدایە ؟

بێدینەکان هەمیشە داوای بەڵگەی مادی دەکەن بۆ هەموو شتێك وە هەر شتێك مادی نەبێت و نەبینرێت و هەستی پێ نەکرێت باوەڕیان پێی نییە . وە هەمیشە فەخر بەوەوە دەکەن ئەوان خاوەن ئەقڵن و خەڵکی دیندار بێ ئەقڵ و نەزانە ، بەڵام ئەوەی سەیرە لە هەر بێدینێك بپرسە کوا ئەقڵ و ئەقڵ لە کوێدایە ؟ و دەتوانیت ئەقڵم نیشان بدەیت ؟ بۆ نمونە کاتێك دەڵێین دڵ یان گورچیلە یا هەر بەشێکی تری لەشی مرۆڤ هەمومان دەتوانین ببینین و هەستی پێ بکەین یان ئەشیعەی بگرین . بەڵام کەس ناتوانێت شوێنی ئەقڵ دەست نیشان بکات یان ئەشیعەی بگرێت.

کەواتە کاکی بێ دین شانازی بە چیەوە دەکەیت ؟ وە بۆچی دیندار بێ ئەقڵ بێت و تۆش ئاقڵ بیت ؟ لە کاتێکدا ناتوانیت بۆمان بسەلمێنیت ئەقڵ لە کوێدایە ؟ و هیچ بەڵگەیەکی مادیت پێ نییە بۆ ئەوەی بتوانیت ئەقڵمان نیشان بدەیت ؟ وە هەمیشە دەڵێن ئاین ئەقڵ دوا دەخات و بەرەو دوای دەبات . وە بێدین و ئیلحاد ئەقڵ بەرەو پێش دەبات ، بەڵام بێدین و دین دار هەردووکیان مرۆڤن و هەردووکیان **یەك** بوون و **یەك** لاشەیان هەیە فەرموو کاکی بێدین بە شێوەیەکی زانستی و مختبری و لە لایەنی بایولوجییەوە تێمان بگەێنە و بۆمان بسەلمێنە چۆن ئەقڵی دیندار و بێدین کار دەکات و ئەقڵی تۆ زانستییە و ئەقڵی دیندار کار ناکات !؟

طبعا ئەمە کارێکی ئاستەمە و قەت بێدین ناتوانێت ئەو کارە بکات وە ئەقڵ شتێکی مادی نییە و ناتوانرێ کاری لەسەر بکرێ و ناتوانرێت بسەلمێنرێت لە کوێدایە ؟ کەواتە بێدین و ملحدەکان شانازی بە شتێکەوە دەکەن خۆشیان نازانن چییە و لە کوێدایە ؟ کەواتە ئەقڵ چییە ؟ مادام لە جیهانی مادیدا بونی نییە کەواتە ئەقڵ شتێکی معنوییە و بەرجەستە نییە و مادی نییە.

با دەست پێکمان بۆ وەڵامی ئەم گومانە لە ووشەی عقڵەوە بێت چونکە کاتێك بە زمانی کوردی یان هەر زمانێکی تر دەڵێین ئەقڵ هیچ مانایەك نابەخشێت ؟ چونکە ئەم ووشەیە عەرەبییە ئێمە بەکاری دەهێنین بۆیە دەبێت بە گوێرەی سەرچاوە عەرەبیەکە بزانین **عقل** مانای چییە ؟

لە زمانی عەرەبیدا هەمو وشەیەك سەرچاوەی هەیە و لەسەر وەزنی ( فعل ) وە وشەی عقل عقل لە خۆی سەرچاوەیە و ( یعقل و عقال و معقل و معقول و ... هتد ) لە عقلەوە سەرچاوەیان وەر گرتووە با بزانین عقل مانای چییە؟

عقل بە مانای بەربەست و حبس کردن دێت وە بۆیە بە ئینسان دەڵێن عقلی هەیە چونکە دەی بەستێتەوە و ڕێگریی لێ دەکات کە بکەوێتە تاوانەوە . هەروەها پێشی دەڵێن ( حجر ) واتا سجن کردن چونکە سجنی دەکات و دەستی بەسەردا دەگرێت بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەڵەوە . هەروەها پێی دەڵێن ( نهیة ) واتا نهی لێ دەکات شتی خراپ بکات وە پێێ دەڵێن ( معقل ) واتا پەنای بۆ دەبات بۆ

هەموو کارەکانی کاتێك دەڵێن فلان عاقلە واتا ڕا و بۆچونە کانی کۆ دەکاتەوە ئینجا قسە دەکات یان بڕیار دەدات . لە کوردەواریی خۆشماندا دەڵێن قسە بجووە ئینجا بیکە . هەروەها کاتێك (٤) پەلی ئاژەڵێك دەبەسترێتەوە بۆ ئەوەی سەر ببڕێت دەڵێن یعقل البعیر یان الشاة یان ... هتد . کابرای عاقلیش قسەکانی یان کار و بارەکانی و باش و خراپەکان پێکەوە دەبستێتەوە ئینجا قسە دەکات یان ئەو کارە دەکات واتا هەڵەشە نییە و پاش بیر کردنەوە و تێگەیشتن ئینجا بڕیار دەدات یان قسە دەکات کاتێکیش دەڵێین ( معقول یان ئەو شتە معقولە ؟ ) واتا ئەو بابەتانە پێکەوە نا بەسترێتەوە و گرێ نادرێت و پەیوەندییان بە یەکەوە نیە بۆیە لامان نا معقولە و باوەڕی پێ ناکەین چونکە هەر چۆنێك بیری لێ بکەینەوە ئەو بابەتانە یەك ناگرنەوە یان ڕاست نین بۆیە لامان معقول نییە !؟ بە هەر حاڵ وشەی عقل واتا بەستنەوە و هەر کەسێکیش بابەتەکان یان قسەکان یان هەڵس و کەوتەکان پێکەوە ببەسێتەوە پێی دەڵێن عاقل چونکە لە شتەکان تێ گەیشتووە و ڕووداوەکانی پێکەوە بەستوەتەوە . بێدینەکان دەڵێن قورئان هەڵەی کردوە و عقل لە مێشکدایە نەك لە دڵدایە . لە سەرەوە داوای بەڵگەی مادیمان لێکردن بۆ شوێنی عەقل . وە ئێستا پێیان دەڵێین باشە با قسەی ئێوە بێت و عقل لە دڵدا نە بێت وە دور دەکەوینەوە لە قورئان و زمانی عەرەبی . پێمان بڵێن بۆچی ئەم شتانە لە زمانی کوردیدا هەیە من و تۆ و باو باپیرانمان بەکارمان هێناوە و لە زمانی هەموو گەلێکدا هەیە.

هەمو شتێکت پێ ناڵێم با لە دڵی خۆمدا بێت چونکە دوو دڵم لەوەی ڕاستیەکان بپارێزیت با دڵنیا بم و دڵم مطمئن بێت ئەو کات هەمو شتێکت پێ دەڵێم چونکە دەزانم دڵت ڕەقە بەڵام من دڵم نەرمە و بە دڵ سافیی خۆم هەموو شتێك دەڵێم بۆیە دەبێت تۆ دڵت گەورە بێت چونکە دڵم لای ئەو شتەیە وە دڵم پێوەیەتی هی من بێت . وا نەزانیت من دڵدارم بەڵام دڵم گۆڕاوە بەرامبەر خەڵکی چونکە دڵیان نەخۆشە هەرچەندە دڵم بۆی لێ دەدات هەمان خانو و بکڕم بەڵام دڵم پێوەی نییە چونکە دڵم بە بەریەوە نەماوە لەگەڵ هەموو کەس ببم بە دراوسێ وە دڵم ڕەش بووە لە خەڵکی دوڕوو . بۆیە هەمیشە دڵە ڕاوکێمە و دڵم نایەت بە جێیان بهێڵم دڵم گوشراوە و دڵم ناخۆشە بەڵام دڵم خۆشە هێشتا خەڵکی باش ماون و هەمیشە دڵ لە دڵ دەڕوانێت بۆیە دڵ گران مەبە و خودا بە دڵی خۆت لەگەڵ دەکات و ئاواتەخوازم دڵ ئاوەدان و دڵ فراوان بیت و چاو دڵت ڕون کە کوڕەکەت بینییەوە هێندە دڵ ناسك مەبە کاتێك دڵت لە شتێك دەتۆرێت و شت مەگرە دڵ ؟ تۆزێکیش دەبێت تورە بیت مەڵێ دڵم نایەت و لە کاتی نان خواردندا مەڵێ دڵم نای بات و هەر شتێکت بینی مەڵێ ناچێت بە دڵمدا یان دڵم پڕە دڵم پیسە دڵم شکاوە ؟ چونکە دڵت دەڵێت دڵم درۆ ناکات بۆیە بە دڵ پێم بڵێ دڵت لام بێت داخی دڵت هەڵ ڕێژە و مەڵێ دڵم گۆڕاوە ؟ هەردووکمان دڵمان یەکە و دڵت لێی سارد نەبێتەوە دەزانم دڵت پێوەیەتی و دڵت بۆی لێ دەدات دڵم تەقی پڕ بەدڵ پێم خۆشە بێم بۆ ئەم جێگە دڵگیرە زۆر دو دڵم بەڵام دەرگای دڵم واڵایە دڵت هیچ نەکات و دوور بێت لە دڵە راوکێ لە ناخی دڵەوە دڵی پڕ سۆزت بە مەزن دەزانم و هیوادارم دڵت ئاسودە بێت بەڵام کاتێك دەبینم دڵت ناخۆشە خەریکە دڵم شەق دەبات و دڵم بۆسۆی ئاگری لێ دێت و کزەی دێت بۆ حاڵت و دڵم بۆت خاو دەبێتەوە و دڵم دەرهات هەتا توانیم بت بینم چونکە دڵم تۆی گرتووە چونکە خۆت دەزانیت دڵ لە گوڵ ناسکترە و دڵ ئاگای لە دڵە ئەگەر دڵی خۆمت بۆ

بکەمەوە سەرت سپی دەکەیت بەڵام دڵ لە دڵ مەدە چونکە من دڵم سافە و هەمیشە هەواڵی دڵ خۆشکەرت دەدەمێ خۆشت دەزانیت دڵم نایەت دڵت بشکێنم ئەگینا قسەیەکم دەدا بە دڵتدا هەتا ماوی لە دڵت دەر نەچێت هیوادارم وا نەکەیت هەردووکمان نا بەدڵ کارەکانمان بکەین وەك دەبینن لە زمانی کوردیدا هەموو کار و هەست و نەستێك بەستراوە بە دڵەوە نەك بە ئەقڵ یان مێشکە وە . لە زمانەکانی تریشدا هەمان شێوەیە و ئەمە ئەدەبیات و شیعری خۆشەویستی نییە بەڵکو هەڵس و کەوتی ڕۆژانەیە و بۆ ئەوەی بابەتەکە دور و درێژ نەبێت قسەی ترم دەربارەی دڵ و بەکارهێنانی دڵ نە نوسیوە ئەگینا زۆر لەوە زۆرترن.

**پرسیاری بێ وەڵاممان ئەمەیە** : ئادەی کاکی بێدین بە شێوەیەکی مادیی مختبری پێمان بڵێ ئەقڵ لە کوێدا یە ؟ کەس وێنەی مێشك یان کەلە سەرمان بۆ دا نەنێت !؟ وە بۆچی هەموو هەڵش و کەوت و خۆشی و ناخۆشی و کار و بارەکانی ژیان بەستراوە بە دڵەوە لە زمانی کوردیدا و نە بەستراوە بە مێشك یان ئەقڵەوە ؟ کۆتا قسەشمان لەسەر دڵ ئەمەیە کاتێك خەڵکی دەڵێن ئەوە ی لەناو دڵمدایە یان ئەگەر دڵمت بۆ بکەمەوە هەموو شتێك دەزانیت یان پێت دەڵێم . ئەی بۆچی ناڵێت ئەگەر ئەقڵمت بۆ بکەمەوە یان ئەوەی لە مێشکمدایە کەس نای زانێت ؟ ئەگەر بڵێیت ئەوە قسەی عامە و خەڵکی نەیان زانیوە مێشك ئەو کارانە دەکات . فەرموو ئەشیعەیەکی ئەقڵمان بۆ بگرە و بڵێ ئەوە ئەقڵە ئیتر کێشە نییە لە کوێدایە ؟

---

**پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست و دوو**

**پاپۆری چارۆکەدار و بە مەکینە**




دژە ئیسلامییەکان ڕەخنە لە ئایەتی ٣٢ و ٣٣ ی سورەتی **الشورى** دەگرن کە دەفەرموێت :

**(ومـــن آياتـــه الجـــواري فـــي البحـــر كـــالأعلام * إن يشـــأ يســـكن الـــريح فـــيظللن رواكـــد علـــى ظهـــره)**

واتا یەکێك لە بەڵگەکانی خودا ئەوەیە پاپۆڕ و بەلەمەکان لە ئاودا ڕێ دەکەن بە هەوا ئەگەر ئەو هەوایە نەمێنێت ناتوانن ڕێ بکەن . ئەمانیش دەڵێن خودا حسابی ئەم ڕۆژەی نە کردووە !! کە مەکینە و ماتۆڕ دێتە کایەوە و پاپۆڕ و بەلەمەکان پێویستی بە چارۆکە و هەوا نامێنێت پاڵی پێوە بنێـــــت ! بـــــــەڵکو بـــــــــە هێـــــــــزی مـــــــــاتۆڕ دەچێـــــــت بـــــــــەڕێوە

وەڵامی ئـەم گومانـە زۆر ئاسـانە . چونکـە هـەموو مـاتۆڕ و مەکینەیـەك بـەبێ هـەوا کار ناکات و ناتوانێـت بسـوڕێتەوە . بـۆ نموونـە : هـەموومان سـەیارەمان هەیـە و شـوتەی هـەوای هەیـە فلتـەری تێدایـە وە دەمی شـوتەکە ڕوی کردۆتـە دەرەوە بـۆ لای ڕادێتەرەکـە بـۆ ئەوەی بە ئاسانی هەوا ڕا بکێشێت بۆ ناو مەکینەکە و کار بکات . ئەگەر ڕاست دەکەن دەمی شوتەکە بگرن بۆ ئەوەی هەوای بۆ نەچێت بزانم دەتوانیت یە ك هەنگاو سەیارەکەت لێ بخوڕن ؟

وە هەموو مەکینە و ماتۆڕێکیش بە هەوا کار دەکات چەند بچوك یان مەزن بێت یان مولیدەی کارەبا بێت یان مەکینەی فڕۆکە و پاپۆڕ و هی هەر ئامێرێکی تر بێت . ئەگەر هەواکە نەمێنێت مەکینەکەش دەوەستێت و ئەو ئامێرە ناتوانێت ڕێ بکات !! ئایەتەکەش هەمان شت دوپات دەکاتەوە دەڵێت خودا هەوای دروست کردوە ئەگەر ئەو هەوایە نەمێنێت پاپۆڕەکان ناتوانن ڕێ بکەن.

کەواتـە بـە هـەردووك حاڵەتەکـە ئـەو ئایەتـە تـەواوە ئەگـەر هـەوا نـەبێت پـاپۆڕ و بەلـەمی چارۆکـەدار ناتوانێـت ڕێ بکـات و ئەگـەر هـەوا نـەمێنێت پـاپۆڕی بـە مەکینـەش ناتوانێـت ڕێ بکـات ئەمـەش بەڵگەیـە بـۆ مـوعجیزە ی قورئـان کـە باسـی چـۆنێتیی ڕێکردنـی پـاپۆڕ دەکـات . وە هـەر کـەس دەڵێـت وا نییـە یـان خـۆی بـە کەسـێکی زانسـتی دەزانێـت بـا بێـت بۆمـان ئیسـپات بکـات چـۆن مـاتۆڕ و مەکینـەکان بـێ هـەوا کـار دەکـەن سوپاسـی دەکەین .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست و سێ

## ئایا ریح بەس بە مانای با یان ڕەشەبا دێت ؟



لە پرسیاری بێ وەڵامی ژمارە ( ٢٢ ) دا باسی ئەوەم بۆ کردن ئایا ڕاستە کە دەڵێن بەلەم و پاپۆڕ وەختی خۆی بە چارۆکە لە ئاودا ڕێیان دەکرد ؟ زۆر برادەران ڕەخنەیان گرت گوایا ( ریح ) واتا با یان ڕەشەبا وە با بەمانای هەوا نایەت !؟ هەرچەندە خۆی با لە هەواوە دروست دەبێت و مادەی خامی با یان ڕەشەبا هەر هەوایە . بەڵام نە شارەزای لە زمانی عەرەبیدا دەبێتە هۆکاری تێ نەگەیشتن ،

چونکە خودای تعالی لە سورەتی **الانفال** ٤٦ دا دەفەرموێت : **(ولا تنازعوا فتفشلوا و تذهب ریحکم)** ئەگەر بە تێگەیشتنی خەڵکی عەوام و بێدین ئەم ئایەتە وەربگێڕین بۆ زمانی کوردی بەم مانایە دێت واتا ناکۆك مەبن لە نێوان خۆتاندا و پاشان فەشەل بهێنن و باکەتان یان ڕەشەباکەتان بڕوات ! ئایا بەم شێوەیە هیچ مانایەك دەبەخشێت ؟ کاتێك دەڵێین ریحکم واتا باکەتان لە نێوانتاندا دەڕوات و فەشەل دەهێنن ئەگەر نا کۆك بن . وە بەم شێوەیە ئایەتەکە هیچ مانایەك نا بەخشێت!

***کەواتە دەبێت بزانین ریح مانای چییە ؟***

ریحکم واتا ( **قوتکم** ) واتا هێزەکەتان . وە ئایەتی ٤٦ ی **سورەتی انفال** ئەمە ماناکەیەتی : ئەگەر ناکۆك بن لە نێوان یەکتریدا تەفرەقەتان تێ دەکەوێت و هێزەکەتان نامێنێت و فەشەل دەهێنن . کەواتە ووشەی ریح لێرەدا واتا هێز و قوەت وە خودای تعالی ئاماژەی بەو هێز و قوەتە کردووە لە ئایەتی ٣٣ ی **سورەتی الشورادا** چونکە یەکەم باخیرە بە بخار ( هەڵم ) بڕوات لە ساڵی ١٧٧٨ دا دروست کراوە وە ئەو هێزی بخارییە پاشان پەرەی سەند بۆ دیزڵ و هاوشێوەکانی . کەواتە ڕۆشتنی باخیرە بەس بە با نییە بەڵکو ( با = الریح ) واتا هێز یان قوەت . ئیتر ئەو هێزە هێزی باکە خۆیەتی یان هێزی ترە وەك ماتۆڕ و دیزڵ و نەوەوی یان هەر هێزێکی تر بێت وە ئیعجازی قورئانییەکە لێرەدایە ( ریح = هێز و قوەت ) ئەو هێزە جاران خەڵکی لە بادا دەی بینی . بۆ پاڵ پێوەنانی باخیرەکان . وە ئێستا ئەو هێزەی لەم ئایەتەدا هاتووە هێزی ماتۆڕە .. چەند ١٠٠ ساڵێکی تر ئەو هێزی ماتۆڕەش نامێنێت چونکە نەوت نامێنێت ئەو کات بە هێزێکی تر باخیرە دەڕوات .

هەروەها هەر هەمان ئایەت دەفەرموێت( **ان یشا یسکن الریح** )واتا ئەگەر خودا بیەوێت ئەو هێزە ڕا بگرێت ئیتر ئەو هێزە با بێت یان نەوت بێت یان هێزی نەوەوی بێت یان هەر هێزێکی تر . وەك باسمان کرد بە نەمانی نەوت ئەو هێزی ماتۆڕە نامێنێت لەوانەیە بدیلی تر بێتە کایەوە . بەلام کاتێك ئەو بدیلانە نامێنن . ئایەتەکە هەر ماوە و باس لەو هێزە دەکات کە دێتە کایەوە .

بۆیە دەڵێین سبحان الله لە گەورەیی خودا و هەڵبژاردنی ئەو دیقەتە لە ووشەکاندا و مانەوەی ئێعجازی قورئان بۆ تا هەتایە .

هەرچەندە هێزەکان بگۆڕرێن یان تەواو ببن بەڵام مانای ئایەتەکە هەر ناگۆڕرێت .

## پرسیارە بێ وەلاٌمەكان ژمارە :بیست و چوار

## ئایا داعش نوێنەری ئیسلامە ؟

ڕۆژ نییە بەزمی قۆڕی **داعش** نەبینین بە هەموو شێوازێك وە كۆتا بەزمیان سوتاندنی فڕۆكەوانە ئوردونیە كەیە وە لەسەر ڤیدیۆكەیان فەتوایەكی ئیبن تەیمیەیان داناوە . هاتوون ئەوانیش وەك دوژمنانی ئیسلام فەتواكەیان بڕیوە پێش و دواكەی و لە مەبەستەكەی خۆیان لایان بردووە . لە خوارەوە دەقی فەتواكەم بۆ داناون بە عربی وە ئەو بەشەی داعش بڕیوێتی و لەسەر ڤیدیۆكە دای ناوە خراوەتە نێوان دوو كەوانەوە . ئەمەش دەقی فەتواكەیە بە كوردی

---

الْمُثْلَةُ واتا وەك ئەوان . لە ( مثل ) هاتووە كاتێك كەسێك تەمسیل دەكات پێی دەڵێن ممثل چونكە وەك ڕاستی دەورەكە دەبینێت . وە مثلة واتا وەك ئەوان كردن ئەگەر لە كاتی شەڕدا سوپای بەرامبەر هات و ئەسیر و كوژراوەكانی سەر بڕی یان گیانی پارچە پارچە كردن بە زیندوی یان بە مردووی سوپای بەرامبەریش هەمان كار دەكاتەوە بۆ ئەوەی سوپاكەی تر ئەو كارە نەكات . فەتواكەی ابن تیمیة باسی ئەوە دەكات وە دەڵێت مثلة : حەقی خۆیانە ئەگەر بیكەن بۆ ئەوەی وەك ئەوان بكەنەوە یان بۆ تۆڵە وەرگرتن لە بەرامبەر وە دەتوانن نەیكەن وە سەبر گرتن باشترە . وە نابێت ئەو ( تمثیلە ) بۆ جیهاد زیاد بكرێت وە نابێت وەك سزا بێت وەك ئەوان بكەنەوە . داعش ئەمانەی نە نوسیوە و ئەمەی نوسیوە لەسەر ڤیدیۆكە ( بەلام ئەگەر تمثیل كردنەكە بانگەشە بێت بۆ ئیمان هێنان ، یان دەست درێژیی بەرامبەر نەهێڵێت یان بنە بڕ بكات . لێرەدا دەبێت بەوەی حەدێكی شەرعیتان جێ بە جێ كرد بێت و دەبێت بە جهادێكی مشروع ،لێرەوە بەشە بڕاوەكەی داعش لە فەتواكە تەواو دەكەم **ابن تیمیة** دەڵێت : بەسەرهاتەكەی ئوحد بەو شێوەیە نەبوو . واتا لە غزوەی ئوحددا كاتێك حمزەی مامی پێغەمبەریان (صلى الله علیه وسلم) پارچە پارچە كرد پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرمانی كرد كە موسوڵمانان بەو شێوەیە نەكەنەوە و حەدیسیش زۆرە لەو بارەیەوە . ابن تیمیة دەڵێت بۆیە سەبر گرتن باشترە وە لێردا حەقی خودا واجیبە **(وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ) وە ( جزع ) حەرامە .** جزع واتا پێچەوانە یان دژی سەبر گرتنە یعنی دەبێت سەبرتان هەبێت و دان بە خۆتاندا بگرن و هەڵ نەچن وەك ئەوان بكەنەوە.

وەك بینیتان داعشی بێدین هاتووە وەك دژە ئیسلامەكانی كردووە پارچەیەكی لەو فەتوایە وەرگرتووە و كردوێتی بە بەڵگە بۆ كارە قێزەونەكەی وە ابن تیمیة دەڵێت دەبێت سەبر بگرن و وەك ئەوان نەكەنەوە . وە ئەگەر ئەو پارچەیەش وەر بگرین كە لە نێوانی دوو كەوانەكەدایە و داعش دای ناوە هەر مانای ئەوە نا بەخشێت ئەو فڕۆكەوانە بسوتێنێت . چونكە سوپای ئوردونی هیچ داعشێكی

نەسوتاندووە و پارچە پارچە ی نە كردووە هەتا داعشیش هەمان شت بكاتەوە هەروەها سوتانی ئەو فرۆكەوانە نابێتە هۆكاری ئیمان هێنانی گەلی ئوردونی چونكە خۆیان موسوڵمانن وە نابێتە هۆكاری ئەوەی هێرش بۆ سەر داعش بنە بڕ بكات

وە داعش هیچ حەدێكی شەرعیی تطبیق نە كردووە . چونكە فەتواكە دەڵێت پاش شەڕی ئوحد موسوڵمانە كان نەهاتن لاشەی كافرەكان پارچە پارچە بكەنەوە لە تۆڵەی حەمزەدا . وە لە ئیسلامدا نابێت لاشەی مردو پارچە پارچە بكرێت و كەس بۆی نییە هیچ كەسێك بسوتێنێت ! بۆیە داوا لە خوشك و برایانی كوردم دەكەم ئاگاداری ئەم داعشە كافر و بێدینانە بن كە دێن بە ئارەزوی خۆیان یاری بە ئایەت و حەدیس و فەتواكان دەكەن بۆ بەرژەوەندیی ڕۆژئاوا و ناشرین كردنی ئیسلام . وە هەر كوردێك دەزانێت برای یان باوكی یان خوشكی یان هەر كەسێكی سەر بە داعشە خۆی لەگەڵیاندا ڕێك بخات

هەتا هەموویان كشف دەكات و پاشان بیان داتە دەست هێزەكانی ئاسایش بۆ ئەوەی نەتوانن ئاژاوە دروست بكەن لە كوردوستاندا و ئەم ئازادیەمان لێ تێك بدەن بەناوی ئاینەوە چونكە تاكێك پێڵاوی پێشمەرگەیەك یان پۆلیسێكی كورد یان هەر تاكێكی كورد لەسەرو ابو بكری بغدادی و هەمو داعشەوەیە و ئەوانە هیچیان موسوڵمان نین و ئاینی ئیسلام بێ بەرییە لەم گومڕایانە .

ئەمەش دەقی فەتواكەی ابن تیمیة بە عربی وە نێوان دوو بازنەكە ئەو پارچەیەیە كە داعشی دژە ئیسلام بڕیوێتی و كردوێتی بە بەڵگە بۆ ئەم یاریە سیاسییە بۆ ناشرین كردنی ئیسلام.

---

وقال ابن تيمية: الْمُثْلَةُ حَقٌّ لَهُمْ، فَلَهُمْ فِعْلُهَا لِلاسْتِيفَاءِ وَأَخْذِ الثَّأْرِ، وَلَهُمْ تَرْكُهَا وَالصَّبْرُ أَفْضَلُ، وَهَذَا حَيْثُ لَا يَكُونُ فِي التَّمْثِيلِ بِهِمْ زِيَادَةٌ فِي الْجِهَادِ، وَلَا يَكُونُ نَكَالًا لَهُمْ عَنْ نَظِيرِهَا، ( فَأَمَّا إذَا كَانَ فِي التَّمْثِيلِ الشَّائِعِ دُعَاءٌ لَهُمْ إلَى الْإِيمَانِ، أَوْ زَجْرٌ لَهُمْ عَنْ الْعُدْوَانِ، فَإِنَّهُ هُنَا مِنْ إقَامَةِ الْحُدُودِ، وَالْجِهَادِ الْمَشْرُوعِ ) وَلَمْ تَكُنْ الْقِصَّةُ فِي أُحُدٍ كَذَلِكَ، فَلِهَذَا كَانَ الصَّبْرُ أَفْضَلَ، فَأَمَّا إذَا كَانَ الْمُغَلَّبُ حَقَّ اللَّهِ تَعَالَى فَالصَّبْرُ هُنَاكَ وَاجِبٌ، كَمَا يَجِبُ حَيْثُ لَا يُمْكِنُ الِانْتِصَارُ، وَيَحْرُمُ الْجَزَعُ
الفتاوى الكبرى لابن تيمية ج٥/ص: ٥٤٥

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :بیست و پێنج

## حەدیسەكان بۆچی جۆراو جۆرن ؟

هەموو زانستێك لە جیهاندا كەسانی تایبەتیی خۆیی هەبووە هەوڵی بۆداوە پاشان بووە بە منهج و ڕێچكە بۆ خەڵكانی دوای خۆی . وە بناغەی ئیسلامیش دوو سەرچاوە و دوو زانستە قورئان كە لە كاتی خۆیدا دابەزیوە و خەڵكی لەبەریان كردووە . دووەمیان سونەتە واتا ئەو قسە و كردارانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ژیانیدا كردوونی . وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك بخاري٣٤٤٥ دا نوسراوە دەڵێت (**لا تُطرونِي كما أَطرتِ النصارى عيسى ابن مريمَ فإنّما أنا عبدُ اللهِ ورسولە**)

واتا بە شان و باڵمدا هەڵ مەدەن و بم كەن بە خودا وەك چۆن مسیحییەكان عیسای كوڕی مریمیان كرد بە خودا.

وە صحابەکان بە جوانی تێ دەگەیشتن و قسە و کردارەکانی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) دەم بە دەم دەگێڕایەوە هەتا گەیشتە زەمانی تابعین واتا ئەو کەسانەی صحابەکانیان بینیوە و قسەیان لێ وەرگرتوون پاشان وردە وردە صحابەکان یان دەکوژران یان دەمردن . بۆیە ترسان ئەو قسە و ڕەفتارانەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کە پێی دەڵێن سونە نە مێنێت و بفەوتێت . وە خەڵکی ئەو ئەمانەتەی نییە بۆ گێڕانەوەی سونەت وەك صحابەکان وە بە ئارەزوی خۆیان قسەکان زیاد و کەمی پێوە دەنێن.

بۆیە لە زەمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە سەحابەکاندا هیچ کام لە قسەکان و هەڵس و کەوتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەنوسرایەوە . وە سونەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەماو دەم دەگێڕرایەوە صحابەکان دەیان گێڕایەوە بۆ خەڵکی پاش ئەوەی صحابە دەمردن ئەو کابرایە دەی گێڕایەوە لە دەمی صحابەکەوە پاشان کابرای تر دەمرد نەوەی تازە دەیان گێڕایەوەلە دەمی کابرای زیندوو  بۆ ئەوەی کە گوێی لێ بووە لە صحابەکە و ئەویش بۆ صحابەکە . ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی علم الرجال دروست بێت

واتا زانستی خەڵك ناسی : ئەم زانستە لە هیچ بیروباوەڕ و منهجێکی پێش ئیسلام و دوای ئیسلامدا بوونی نەبووە . ئەو کەسانەی حەدیسەکانیان کۆ دەکردەوە وەك موسلیم و بوخاری و ... هتد ، دەهاتن گوێیان دەگرت لەو کەسەی حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە و لێیان دەپرسی لە کێ گوێی لێ بووە ئەویش دەی گوت لە فلان . پاشان دەچون بۆ لایفلان ئەویش لە کەسێکیتر گوێی لێ بووە . زۆربەی حەدیسەکان چەند مانگی پێ چووە بۆیە ك  حەدیس کەگەڕاون و سەفەریان کردووە هەتا بچن بۆ لای ئەو کەسە و لە زاری کەسەکەوە حەدیسەکە ببیستن و بینووسنەوە

ئەمەش پێی دەڵێن ( سند ) سنەدی حەدیس واتا ئەو کەسانەی کە بیستویانە و گێڕاویانەتەوە . وە ورد بینییان کردووە لە کەسەکاندا بزانن کێیە ؟ وە لەو زەمەنەدا ئەو کەسە لە ژیاندا بووە یان نا ؟ یان ئەو کەسە کاتێك ئەوقسەیەی گێڕاوەتەوە پیر بووە و خەڵەفاوە یان نەخۆش بووە یان ڕاستگۆ بووە یان درۆزن بووە یان فشەکەر بووە یان هەر نوقسانییەکی تری هەبووە لێیان کۆڵیوەتەوە و بە گوێرەی ئەو نوقسانیانەی کە لە کابرادا هەبووە حەدیسەکانیان لە بێژنگ داوە

بۆیە هەر کەسێك دێت و حەدیسێکمان بۆ دا بنێت بە کۆپی و پەیست یان ترجمەی بکات لێی وەرناگیرێت چونکە دەبێت سنەدی حەدیسەکان بزانرێت کێ بوون ؟ لەبەر ئەوە هەر کامێکمان بەدوای حەدیسێکدا دەگەڕێین دەبینین **یەك** قسە و **یەك** بەسەرهاتە بەڵام بە زۆر شێوە هەیە یەکێك یان دوانیان ڕاستە باقیاتەکەی صحیح نییە . ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بخاری و مسلم و هاوکارەکانیان زۆر ماندوو بوون هەتا حەدیسێکیان کۆ کردۆتەوە . وەك ئەمانەتی عیلمی نوسیویانەتەوە و دایان ناوە، بەڵام لێکۆڵینەوەیان لێ کردووە و گوڵ بژێریان کردووە ڕاستەکانیان بۆ دەست نیشان کردوین و ئەوانەی تر کە صحیح نین هۆکاری نا ڕاستیەکانیان نوسیوە چییە نەك بە جێیان هێشت بێت و ئێمە نەزانین ئەو حەدیسە بۆچی لاوازە یان وەر ناگیرێت . بۆ ئەوەی باشتر

تێ بگەن !! لە کتێبی پیرۆزدا ( ابوکریفا ) هەیە واتا ئەو سفرانەی لە تەوراتدا لابراون . هیچ کەس نازانێت کێ لای بردووە و بۆچی لابراوە و کەی لایان بردووە بەس دەڵێن ابوکریفایە و تەواو . بەڵام کاتێك دەڵێین حەدیسێك صحیح نییە هۆکاری نا ڕاستییەکەی بە وردەکاری باس کراوە بەهۆکاری علم الرجالەوە . تەنانەت ئەوانەی حەدیسیان کۆ کردۆتەوە هێندە پرسیاریان لەو کەسە و خەڵکی تر کردووە دەربارەی ئەو کەسە وایان زانیوە دەیەوێت ژن و ژن خوازیی لەگەڵدا بکات . بەڵام ئەوەی گرنگە لەم باسەدا حەدیسەکان کە ئیمامی بوخاری کۆی کردۆتەوە لە زەمانێکی نزیکدا بووە چونکە لە ساڵی ١٩٤ دا لە دایك بووە و لە ٢٥٦ دا مردووە . واتا نەوەی سێهەمی دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە ئەو نەوەیە

لە باوکیانەوە بیستویانە و ئەوانیش لە صحابەکانەوە یان کەسێکی تر کەوتوەتە بەینیانەوە . وە ناسینی کەسەکان لە حەدیسەکە گرنگ ترە واتا سندەکەی . بۆیە دەبینین یە ك دانە لە حەدیسەکان جۆراو جۆرن و دانەیەکیان ڕاستە چونکە حسابی هەموو وردە کارییەك بۆ ئەو کاسانە کراوە کە گێڕاویانەتەوە . لەبەر ئەوە ئێمەی موسوڵمان هەموو حەدیسێك وەر ناگرین هەتا نەزانین سەنەدەکەی کێیە و چییە ؟ ئەم وردە کارییەش لە مێژودا بەس لەئیسلامدا هەیە.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست و شەش
### وەڵامی میزی پێغەمبەر لە قاپێکدا بۆ معتزلة و بێدینەکان

وەڵامی میزی پێغەمبەر (د.خ) لە قاپێکدا بۆ معتزلة وبێدینەکان

ئامۆژگاری

سوننەتە لەیادکراوەکان

میز بکەرە ناو قاپێکەوە و لە ژێر جێگەی نوستنت دای بنێ

"كان النبي له قدح من عيدان تحت سريره، يبول فيه بالليل"،
اخرجهه أبو داود والنسائي والحاكم في المستدرك
صحيح الألباني صحيح الجامع 4832 - الجامع الصغير

واتە پێغەمبەر شەوانە میزیی دەکردە قاپێکەوە و لە ژێر جێگەی نوستنەکەی دای دەنا

گومانی ئەم جارەمان بە شێوەیەکی تەحەداوە وەڵام دەدەینەوە بۆ معتزلە و بێدینەکان . هەر **چەندە** کەس نازانێت معتزلة چییە ؟ ئەمانە کۆمەڵە موسوڵمانێکن باوەڕیان بە مێژوو لەگەڵ کتێبە ئیسلامیەکان و تەفسیرەکان نیە و ئاینی مەزنی ئیسلام بە ئارەزوی خۆیان و بە گوێرەی بەرژەوەندی و تێگەیشتنی خۆیان لێك دەدەنەوە نموونەشیان لە ئێستادا **هەیە** وە کاتێك ئێمەی موسوڵمان کێشمە کێش دەکەین لەگەڵ بێدینەکاندا.

ئەو ڕەخنە و سەرچاوانەی بێدینەکان لایانە و دەی دەن بە ڕوماندا ٩٠% ی لە کتێب و سەرچاوەی ئەم معتزلانەیە . وەك ئەو وێنەیە کە دەیبینن باسی ئەو حەدیسە دەکات

ئەوان دەڵێن چۆن دەبێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کارێکی لەو شێوەیە بکات ؟ ئایا ئیسلام ناڵێت النظافة من الايمان ؟ کاکی بێدینیش دێت ئەو حەدیسە بە فۆتۆ شۆپ دەکات بە سونەتێك موسوڵمانان ئێستا نای کەن بە فەزڵی خودا ئێمەش وەلامی ئەم دژە ئیسلامانە دەدەینەوە هەریەك بە گوێرەی سەرچاوەکانی خۆیان

بۆیە بە یەقینەوە لە سەری دڵیان دەدەین و وەك خۆیان وەلام دەدەینەوە چونکە پێوەری معتزلە و بێدین بۆ ڕەت کردنەوەی ئاینی ئیسلامی مەزن ئەقڵە نەك نەقڵ . بۆیە منیش شوێن حەدیسەکە ناکەوم صحیحە یان نا ؟ وە ئایا ئەو وێنەیە فۆتۆ شۆپە یان ڕاستە ؟

وە دەڵێم ئەو حەدیسە ١٠٠% صحیحە و ئەو وێنەیەش بێدین دروستی نە کردوە و ڕاستە .کێشە لە ئاستی تێ نەگەیشتنی بەرامبەردایە و با بگەڕێینەوە بۆ ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر . هەموو کەس دەزانێت توالێت نە بووە و خەڵکی لە دەشت و دەر دەستیان بە ئاو گەیاندووە تا ئێستاش یەکەم کێشەی هیندستان دابین کردنی تەوالێتە ! چیی تیدایە ئەگەر هەر ماڵێك قاپێك جامۆلکە یەك دا بنێ لە سوچێکی ماڵەکەیدا بۆ ئەوەی شەو تەنگاو بوو میزی تێ بکات و بەیانی هەستا لە خەو بی ڕێژێت ؟ ئایا ئەوە شەرمە ؟ ئایا ئەوە سوکایەتیە ؟ یان چی شتێکی نا ماقوڵی تێدایە ؟

دڵنیام ئەگەر ئێستا کوردوستان یان هەر جێگایەکی تر حاڵەتێکی لەو جۆرە ببینێت هەر یەکەمان شتێك دا دەنێت بۆ میز کردن . پاشان ئەو جامە کە دا دەنرێت شەرت نییە میزی تێ بکرێت چونکە زۆربەی زۆر ی خەڵك دەنوێت هەڵ ناستن بۆ میز کردن وە زۆر مرۆڤ لەو شێوەیەیە

کەواتە بۆ احتیاط هەر دا دەنرێت . وە هیچ شتێکی خراپی تێدا نا بینرێت لەو کارەدا و لەوانەیە مانگێك (١) جار میزی تێ نەکرێت وە کەوتوتە سەر کەسەکە پاشان با بێین حسابێك بۆ شەو ڕۆژ بکەین لەو زەمانە دا . با بڵێین سەعات ( ٦ )ی ئێوەرە دنیا تاریك بووە و خەڵکی سەعات( ٩ )ی شەو نوستوون

کاکی معتزلەی دور لە خودا و منهجی ئیسلام ئادەی پێم بڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەتا( ٩) ی بەیانی نوستووە ؟ یان زۆربەی شەو شەو نوێژی کردووە ؟ یان جەنابیشت وەك بێدین باوەڕت بە شەو نوێژ نییە و دەڵێیت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەت شەو نوێژی نە کردووە ؟ئادەی خۆت بۆم حساب بکە چەند سەعات شەو نوێژی کردوە ؟ دەڵێن شەوانە هێندە شەو نوێژی کردووە ئەژنۆکانی خوێناوی بون . ئادەی کاکی معتزلەی ئەقلانی پێم بڵێ هەڵ نەستاوە بۆ نوێژی بەیانی ؟ ئایا شەو نوێژ و نوێژی بەیانی بە دەست نوێژ دەکرێت یان بێ دەست نوێژ ؟

ئایا کەسێك هەموو شەوێك دوو جار لە خەو هەستێت دەست نوێژ بگرێت مەجالی میزکردنی دەبێت لە قاپ دا !؟ ئایا چەند سەعات خەوتووە شەوانە و چەند سەعات شەو نوێژی کردووە ؟

**کۆتا پرسیاری بێ وەڵامم** دەرخستنی ئاستی گەمژەیی تۆ و بێدینە کە ئەو وێنەیەی بڵاو کردوەتەوە و تۆش پشت گیری دەکەیت حەدیسەکە دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شەوانە میزی دەکردە قاپێکەوە لەژێر جێگەی نوستنەکەی دای دەنا ئادەی بە هەردووك لاتان بگەڕێن و پێم بڵێن ئەو کاتە جێگای نوستن هەبوو ؟ ئەگەر هەبوو ئەو جێگای نوستنەیماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) درێژی و پانی چەند بوو ؟ ئایا یەك نەفەری بوو یان دوو نەفەری بوو ؟ بەرزیی ئەو سیسەمە یان قەرەوێڵەکە چەند بوو ؟ وە جێگای چەند قاپ میز لە ژێریدا دەبووەوە ؟ ئێستا تۆ بە ناوی پێشکەوتنەوە تەوالێت لە ژوری نوستنەکەشت دا دەنێیت ئاساییە لە لات .

سەیری وێنەکە بکە کابرا لەسەر ئەو جادەیە میز دەکات ئاساییە لە لای . بۆچی ئاسایی نە بێت کاتێك تەوالێتت نەبێت شتێکت لا بێت بۆ احتیاط میزی تێ بکەیت ؟فەرموو سەیرێکی ئەم لینکە بکەن لەم زەمانی ٢٠١٥ یەدا ٦٢٠ ملیۆن هیندی لە هیندستان تەوالێتیان نییە و لە چۆڵەوانی پیسایی دەکەن . ئەگەر تۆی بێدین یان معتزلەی دژە ئیسلام یەکێك بیت لەو هیندییانە و بۆ احتیاط قاپێك لای خۆت دا بنێیت بڵێیت نەوەك شەو میزم بێت تێی دەکەم وە بەیانی دەیڕێژم و پاکی دەکەمەوە چی عەیبەیەکی تێدایە ؟ چی زیانێکت لێ دەکەوێت ؟ لەوانەیە مانگی جارێکیش میزت نەیەت لە کاتی نوستندا .

.........................................

http://arabic.cnn.com/scitech/2014/04/21/india-unicef-mrpoo

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست و حەوت

## ئایا پێغەمبەر (د.خ) خەتەنە کرا بوو ؟

گومانێك هەیە دروست کراوە دەڵێن . بۆچی پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه و سلم) سونەتی خەتەنە کردنی داهێناوە لە کاتێکدا خۆی خەتەنە نەکراوە ؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش حەدیسێکی درۆ هەیە دەڵێت : کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لە دایك بووە بە خەتەنە کراوی لە دایك بووە . ئاگاداربن ئەو حەدیسە نەك زەعیفە بەڵکو ئەسڵ و ئەساسیشی نییە و هیچ کەس لە دایك نابێت بە خەتەنە کراوی . بەڵکو ئەو ڕیوایەتانە لای شیعەی( ١٢) ئیمامی هەیە و دەڵێن ئیمامەکانیان لە دایك دەبن خەتەنە کراون.

ئەوەی هەمووان دەیزانین کە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لە نەوەی ئیسماعیلە وە ئیسماعیلیش کوڕی ابراهیمە عليهم السلام .

وە یەکەم جار کە سونەت و یاسای خەتەنە کردن ابراهیم (ع) دای هێنا وەك لە تەورات **سفر التكوين** بەشی ١٧ دەقی ٩ بۆ ١١ نوسراوە

ئینجا خودا بە ئیبراهیمی گوت تۆش پەیمانەکەم بەجێ دەهێنیت ... خۆت و وەچەی دوای خۆت لە نەوەکانیان .... ئەمەش پەیمانەکەمە کە بەجێی دەهێنن لەنێوان من و ئێوە و وەچەی دوای خۆت، هەموو نێرینە یەکتان خەتەنە دەکەن خۆتان خەتەنە دەکەن، ئەمەش دەبێتە نیشانەی پەیمانەکەی نێوان من و ئێوە

کەواتە پەیمانی خودا لە نێوان خودا و ابراهیمدا (ع) ئەوە بووە کە خۆی و نەوەکانی و نەوەکانی دوای خۆشی خەتەنە بکرێن . وە پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) لە نەوەی اسماعیلە . کەواتە ئەو پەیمانەی نێوان خودا و ابراهیم (ع) شمولی ئەویش دەکات و لە دورگەی عەرەبیدا خەتەنە کردن هەبووە پێش هاتنی ئیسلام وە ئاینی ئیسلام شتێکی تازەی نە هێناوەهەتا مشت و مڕی لەسەر بکرێت و بڵێن ئایا پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه و سلم) خەتە نە کراوە یان نا ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست و هەشت

## ئایا ئەم ئایەتە هەڵەیە ؟

لە قورئاندا سورەتی **البقرة** ئایەتی ١١٤ دا خودای زانا دەفەرموێت : (**و لن ترضى عنك اليهود و لا النصارى حتى تتبع ملتهم** ...) واتا جولەکە و گاورەکان لێت ڕازی نابن هەتا شوێن ئاینەکەیان نەکەویت . لێرەدا حەز دەکەم هەڵەیەك ڕاست بکەمەوە کوردی خۆمان بەکاری دەهێنێت (ملة) واتا ئاین یان بیر و باوەڕ نەك قەوم !!؟ بەڵام کوردی خۆمان بە هەڵە ڕاڤەی دەکات بۆ قەومیش بەکاری دەهێنێت دەڵێت میلەتی کورد یان عرب یان ... هتد

برادەرە جولەکەکان دەڵێن ئەو ئایەتە هەڵەیە ،چونکە جولەکە کۆمەڵگایەکی داخراوە و هیچ کەسێکی غەیری جولەکە وەر ناگرێت .

ئەی خودا ئەو ڕاستییەی نە دەزانی ؟ کە دەی زانی بۆچی ئەو ئایەتەی دابەزاند ؟

بۆ وەڵامی ئەو گومانە منیش دوو پرسیاریان لێ دەکەم .

**یەکەم** : ئەگەر دەڵێن ئاینی جولەکە داخراوە . یەك دەقمان لە تەورات بۆ بهێنن کە دەڵێت ئاینی جولەکە داخراوە ... یەك دەق زیاتر نا !! ئەگەر ئەو دەقەتان هێنا کەواتە خۆتان بە دەستی خۆتان چاڵتان بۆخۆتان هەڵکەند وە سەلماندتان کە ئاینی جولەکە بۆ کات و ساتێك و کۆمەڵێك خەڵکی دیاری کراو هاتووە . و ئاینەکەتان مفعولی نەماوە.

ئەگەر بڵێن دەقی تەورات وا ناڵێت و حاخامەکان لە تلمودا وا دەڵێن . کەواتە ئێوە شوێن خودا نەکەوتون و شوێن مرۆڤ و حاخامەکانتان کەوتوون

**دووەم** : ئەگەر بڵێن نەخێر ئاینەکەمان بۆ هەموو کات و زەمانێکە و بۆ هەموو کەسێکە . بەهەمان شێوە دەڵێم بێزەحمەت یەك دەقی تەوراتم بۆ بهێنن کە دەڵێت : ئاینی جولەکە بۆ هەموو جیهانە . بە هەمان شێوە چاڵ بۆ خۆتان هەڵ دەکەنن . چونکە ئەگەر ئاینەکەتان بۆ هەموو جیهانە بۆچی کۆمەڵگاکەتان داخراوە و غەیری جولەکە وەرناگرن ؟

من پەلەم نییە بۆ وەڵام دانەوە هیوادارم هیچ برادەرێکی نە شارەزای جولەکە لە خۆیەوە قسە نەکات وە بڕۆن پرس بکەن بە گەورە حاخامەکانتان ئەو کات وەڵام بدەنەوە . دڵنیاشم وەلامتان دەست ناکەوێت هەتا ڕۆژی قیامەت .

کەواتە دەبێت دان بنێن بەوەی ئەو ئایەتەی ١١٤ ی سورەتی **البقرة** ڕاستە . بەڵام ئێوە هەڵەن کە شوێن ئەم ئاینی ئیسلامە جیهانییە ناکەون کە کراوەیە و بۆ هەموو جیهانە و بۆ کات و سات و کۆمەڵێك کەسی دیاری کراو نییە و بۆ گەلێکی داخراو نییە . بەڵگەشم ئایەتی ٢٣ ی سورەتی **سبئە** دەفەرموێت : ئێمە تۆمان ناردووە بۆ هەموو خەڵکی بۆ ئەوەی ببیت بە مژدە دەر و ئاگادار کەرەوە بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەو شتە نازانن. ئێوەی جولەکە و هاو شێوەکانتان و دژە ئیسلامەکان و بێ باوەڕان ئەو زۆرینەیەن کە ئەو شتە نازانن و یان دەزانن و شوێنی ئەم ئاینەی ئیسلام ناکەون ... کۆتا **پرسیارێشم بۆتان ئەوەیە** : ئاینی جولەکە ناوی چییە ؟ بە ئێمە دەڵێن شوێن کەوتووی ئاینی اسلام . ئایا ئێوە پێتان دەڵێن شوێن کەتووی ئاینی چی ؟ ناوی دینەکەتان چییە ؟ ئەگەر بڵێن شوێن کەوتووی شەریعەتی موساین ؟ موسا (ع) مرد و نەما بەڵام خودای موسا ماوە و نامرێت ؟وە ئەگەر ڕازی بین بەوەی بڵێن کە ئێمەی جولەکە شوێن کەوتووی شەریعەتی موساین . پێم بڵێن کوا شەریعەتی موسا (ع) ؟ کاتێك موسا (ع) مرد کۆتا وەسێتی ئەوە بوو تەورات نەداتە دەستتان و متمانەی پێ نەکردن وەك لە **سفر التثنية** ( دوا وتاری موسا ) بەشی ٣١ دەقی ٢٦ و ٢٧ . کەواتە ئاینی جولەکە ناوی چییە و کوا کتێبەکەی ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :بیست و نۆ

## مافی مرۆڤ چییە ؟

هەموومان مافی مرۆڤمان بیستووە لە زۆربەی قسە و گفت و گۆ کانماندا ووشەی مافی مرۆڤ بەکار دەهێنین یان بە بەرزی ڕا دەگرین . بەڵام ئەوەی خەڵکی بە عام نای زانێت ئەم پرسیارانەیە کە وەڵامی نییە یاساکانی مافی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٤٨ دامەزراوە .

ئایا پێش ساڵی ١٩٤٨ مرۆڤ بوونی هەبوو ؟ ئەگەر بوونی هەبووە مافی هەبوو ؟ ئەگەر مافی هەبوو .

بۆچی یاساکانی مافی مرۆڤیان دانا ؟پێش ساڵی ١٩٤٨ و هەردوك جەنگە جیهانییەکان ... مرۆڤ بوونی نەبوو لە ئەوروپادا . وە مرۆڤ دوو بەش بوون یان گەورە یان ئاغا بوون . وە جۆری دووەمیشیان کۆیلە بوون دەبوایە کاریان بکردایە بۆ ئاغاکانیان

بۆیە یاساکانی مافی مرۆڤیش ناو نرا مافی مرۆڤ . چونکە لە ساڵی ١٩٤٨ وە حسابیان بۆ کرا وەك مرۆڤێك بژین و مافی ژیانیان هەبێت وەك مرۆڤ ئەگەر لاپەڕەکانی مێژووش هەڵ بدەینەوە هەموو سەرۆك و ئیمپراتۆرەکان خودا بوون و گەلەکانیشیان کۆیلە بوون و حسابی مرۆڤیان بۆ نەکراوە . واتا هەتا ساڵی ١٩٤٨ حسابی مرۆڤ بۆ خەڵکی نەکراوە و هەر کۆیلە بووە هەتا ١٩٤٨ دانیان پێدا ناون ئەمانە مرۆڤن و مافی ژیانیان هەیە لە بەرامبەردا فەرمون پێمان بڵێن چی یاسایەك و چی ئاینێك وەك ئیسلام بووە بۆ بەرز ڕاگرتنی مرۆڤ ئایات و حەدیس زۆرن لەو بارەیەوە بۆ ئێوەی بەڕێزی جێ دەهێڵم و یە ك ئایەت دەکەم بە نموونە بۆ بەرز ڕاگرتنی مرۆڤ و حساب کردنی بە مرۆڤ نەك کۆیلە و بە چاوی سوك سەیر کردنی ئەویش ئایەتی ٧٠ ی سورەتی **الاسرایە** کە دەفەرموێت

**(و لقد كرمنا بني ادم و حملناهم في البر و البحر و رزقناهم من الطيبات و فضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا)**

تکایە هەر کەس دێت و ئایەتێك یان حەدیسێکم بۆ بەراورد دەکات لەگەڵ یەکێك لە بەندەکانی مافی مرۆڤ با خۆی ئیحراج نەکات و زانیاریی هەبێت دەربارەی مێژوو . وە بە ئەقڵی ٢٠١٥ قسە نەکات وە هێندە خوێندەوار بێت بتوانێت هەمان یاسا بەراورد بکات لە مێژووی گەلاندا هیچ نەبێت بۆ ماوەی ١٤٠٠ ساڵ هەتا ئێستا ئەو کات قسە بکات یان ڕەخنە بگرێت.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سی

## الناس واتا هەموو خەڵك یان کۆمەڵێکی دیاری کراو

الحَدِيثُ (٨)

عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: {أُمِرتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ ، وَيُقِيْمُوا الصَّلَاةَ ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّ الإِسْلَامِ ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ تَعَالَى}

رَوَاه البُخَارِيُّ وَمُسْلِمٌ

الأربعون النووية

حەدیسێکی صحیح هەیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت ( **امرت ان اقاتل الناس حتى يقولوا لا اله الا الله** )واتا فەرمانم پێ کراوە بجەنگم لەگەڵ جەڵکیدا هەتا دەڵێن( لا اله الا الله) . وە دژە ئیسلامەکان ئەم حەدیسەیان وەرگرتووە و دەڵێن ئاینی ئیسلام ئاینی شەڕە و وازلە خەڵکی نا هێنێت هەتا خەڵکی نە کوژێت و نەڵێن (لا اله الا الله) وازیان لێ ناهێنن . بۆ ئەوەی ڕادەی نە شارەزایی ئەو کەسانە دەربخەین دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی زمانی عەرەبی و ووشەی ( **ناس** ) مانای چییە ؟

لە ئایەتی ٢٢ ی سورەتی **البقره**دا دەفەرموێت : **(يا ايها ( الناس ) اعبدوا ربكم الذي خلقكم و الذين من قبلكم** ). واتا ئەی خەڵکینە ئەو خودایە بپەرستن کە ئێوە و خەڵکی پێش ئێوەی بەدی هێناوە . ئایا لێرەدا خودا مەبەستی هەموو خەڵکییە یان کۆمەڵە خەڵکێکی دیاری کراوە ؟ چونکە پێش ئیسلام خەڵکانێکی زۆر هەبوون خودایان نە پەرستووە وکە ئیسلامیش هات ئەو بێ باوەڕانە هەبوون و دەمێنن هەتا ڕۆژی قیامەت

ئایەتی ١٣ ی سورەتی **البقرة** دەفەرموێت :( **و اذا قيل لهم امنوا كما امن الناس قالوا انؤمن كما امن السفهاء**) واتا ئەگەر پێیان بڵێن ئیمان بهێنن وەك چۆن خەڵکی ئیمانیان هێناوە . ئەوانیش دەڵێن ئایا ئێمەش وەك نەزان و هیچەکان ئیمان بهێنین ؟ لێرەشدا ووشەی ( **الناس** ) واتا کۆمەڵێکی دیاری کراو نەك هەموو خەڵکی وە ئەو کۆمەڵە لە هەموو کات و زەمانێکدا هەن . کە خەڵکی ئیماندار بە نەزان و گێل دا دەنێن و دەڵێن ئێمە چۆن شوێن ئەو خەڵکە دەبەنگ و گەمژانە دەکەوین کە خاوەنی ئاینن.

هەروەها لە سورەتی **الحج** ٢٧ دا دەفەرموێت : **(و اذن في الناس بالحج)** . واتا ڕێگا بە خەڵکی بدە بێن بۆ حەجی ماڵی خودا لە مەکە . ئایا لێرەدا ووشەی ( الناس ) خودا مەخسەدی لە هەموو خەڵکییە بێن بۆ حەج بۆ مەکە یان مەخسەدی هەموو خەڵکییە ؟ ئایا کافر و مشرك و خاوەنی ئاینەکانی تر دێن بۆ حەج بۆ مەکە ؟ یان کۆمەڵێك خەڵکی تایبەتییە ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سی ویەك

## شەڕی نێوان خودا و شەیتان

إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾

هەر کەس دەم دەکاتەوە دەڵێت خودا دنیای بۆیە دروست کردووە شەڕی نێوان خێر و شەڕە و نێوان چاکە و خراپە و خودا و شەیتان . بەڵام ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی ورد و شارەزایانە بڕوانینە بابەتەکە دەبینین ئەو شەڕی نێوان خێر و شەڕ و خودا و خراپەکارانە هیچیان ئاینی ئاسمانی نین بەڵکو بیرۆکەی خودای خێر و شەڕ هەر هەموویان بیرۆکەی ئاینە مرۆیەکانن . وە سەرچاوەی هەر هەمووشیان دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆکی عشتار و تموزی بابلییەکان

وە ئەو ڕاستییەمان باشتر بۆ دەر دەکەوێت لە قورئانی پیرۆزدا سورەتی **الحجر** ئایەتی ٣٢ بۆ ٤٣ دا باس لەوە دەکات کارتێك خودای تعالی ابلیسی دەرکرد لە ڕەحمەتی خۆی . ابلیس گوتی : بم هێڵەوە هەتا ئاخر زەمان . خودای تعالاش داواکارییەکەی قبوڵ کرد . وە ابلیس گوتی : بەندەکانت هەر هەمویان لا دەدەم لە ڕێگای ڕاست وە ناهێڵم شوێن منهجی خودا بکەون بێجگە لە بەندە دڵسۆز و لایەنگیرەکانت نەبێت . ناتوانم ئەوان لە خشتە بەرم

بەڵام خودای تعالی وەڵامی دایەوە : ڕێگای من ڕێگای ڕاست و دروستانە وە تۆ دەسەڵاتت نییە لەسەر بەندەکانم ئیللا دەسەڵاتی تۆ لەسەر ئەوانەیە کە شوێنت دەکەون . وە جێگای هەر هەموو ئەوکەسانەی شوێنت دەکەون دۆزەخە

کەواتە ئایەتی ٤٢ ی **سورەتی الحجر** بەڵگەیەکی کۆنکرێتییە کە ئاینی ئیسلام کێشمەکێش و جەنگی نێوان خودا و شەیتان یان خێر و شەڕ نییە . بەڵکو ئاینی ئیسلام منهجی خۆیی داناوە و منهجی تێگەیشتن و هزرە

چونکە کاتێك دەفەرموێت( **هذا سراط علي مستقيم** )منهجەکە دانراوە وە ئیبلییش ناتوانێت و هیچ دەسەڵاتی نییە ئیللا بەسەر ئەو کەسانەدا نە بێت کە شوێنی دەکەون . وە ئایەتی( ٤٢ ) هەموو ئەو گومانانە پوچەڵ دەکاتەوە کە دەڵێت ئاینی ئیسلام وەك ئاینەکانی تر کێشمە کێش و صراعی نێوان خودا و شەیتان یان نێوان خێر و شەڕە . وە ئاینی ئیسلام ئاینی منهج و فکر و تێگەیشتنە ئەگەر ڕێگای خودات هەڵ بژارد و تێی گەیشتیت هیچ شەیتانێکی جن و مرۆڤ نا توانێت لە خشتەت بەرێت چونکە هیچ دەسەڵاتێکیان نییە بەسەرتدا.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سی و دوو

## بێ دین و بایعی

وەك دەزانن تا ئێستاش لە عێراق سیاسەتی کۆبۆن ( بایعی ) بەڕێوە دەچێت . ئەم سیاسەتە لە بنەڕەتدا بۆ ئەو کاتانە بەکار دەهێنرێت کە ئەو وڵاتە لە شەڕدا بێت یان لە قەیرانێکی گەورەدا بێت وە دەوڵەت بۆ ئەوەی ژیانی هاوڵاتییان دابین بکات کۆبۆن دەدات بە خێزانەکان بۆ ئەوەی بەگوێرەی ئەو کۆبۆنە خواردن و سوتەمەنی وەر بگرن . کاتێك دۆخی وڵات باش دەبێت چیتر ئەو

کۆبۆنە یان ئەو وەرەقەی بایعییە نا مێنێت و خەڵکی بە ئازادی شمەکی خۆیان دەکڕن بەڵام ئەگەر سەیری دۆخی عێراق بکەین لە جەنگی جیهانیی دووەمەوە تا ئێستا کار بەو وەرەقەی بایعییە دەکات هەتا ئەمڕۆمان کە ساڵی ٢٠١٥ یە . وە خەڵکەکەش لەگەڵیدا ڕاهاتوون بووە بە بەشێك لە ژیانیان وە تەنانەت زۆربەی خەڵکیش نازانن ئەو کۆبۆنە یان ئەو وەرەقەی بایعییە بۆ کاتی نا ئاسییە وەك لە سەرەوە باسم کرد

بێ دینی کوردیش چەند ڕەخنەیەکی هەیە لەسەر ئاینی مەزنی ئیسلام وەك کوشتن و فرە ژنی و بە شودانی کچی( ٩) ساڵ . هەمیشە نەك دوبارە بەڵکو ملیۆن بارەی دەکاتەوە . بەبێ ئەوەی شارەزایی هەبێت لە زمانی عەرەبی وە لەو ڕەخنانە تێ بگات کە دەیگرێت ؟ یان شارەزایی لە مێژوو بێت وە بزانێت شوکردن ژیانی کۆمەڵایەتی چۆن بووە لەناو گەلانی جیهاندا بە گشتی.

بێدین هەر خەریکە هەمان ڕەخنەی سواو دەگرێتەوە بە ئەقڵی ٢٠١٥ قسە دەکات وە شارەزا نییە لە مێژوو **لەوەش خۆشتر لەم ڕۆژانەدا کەسێك دەی گوت بۆچی ئایەتی فیسبوك دانەبەزیوە** ؟ هەتا خەڵکی باوەڕ بهێنن بە خودا !! با منیش لێرەدا بوەستم و وازیان لێ بهێنم چونکە کابرا تا ئێستاش لەسەر وەرەقەی بایعییەکە دەڕوات و وا دەزانێت هەموو جیهان وەرەقەی بایعییان هەیە و هەر چاوەڕوانی حکومەتە بەشە خۆراکی بۆ دابین بکات

بەڕێز بێدین جەنابیشت تۆزێك فراوانتر بیر بکەرەوە و واز بهێنە لە کارتی بایعی کاتێکیش ڕەخنە دەگریت تۆزێك بە هزر بیر بکەرەوە و با ژێر خانێکی ڕۆشنبیریی باشت هەبێت و شارەزا بیت لە مێژووی گەلان و بار و دۆخی کۆمەڵگاکان لە پێش خۆتدا چۆن ژیاون و چییان کردووە . ئەو کات ڕەخنەش بگریت ئاساییە . چونکە خاڵی هاوبەش دروست دەبێت لە نێوانماندا . بەڵام تۆ هەر وا بزانیت بایعی هەبووە و لەسەر ئەو سیستەمە بڕۆیت دڵنیابە ڕەخنەکانت هیچە و خۆشت نازانیت باسی چی دەکەیت.

---

## پرسیارە بێ وەلآمەکان ژمارە :سی وسێ

## ئایا زانست جێگای خودای گرتۆتەوە ؟

بێدین و ملحدەکان دەڵێن ئێمە چیتر پێویستیمان بە خودا نییە و مرۆڤ هەموو شتێك دەزانێت وە زانستی سەردەم جێگای خودای گرتۆتەوە و بۆیە دەبێت ئاین و خودا نەمێنێت و ئەقڵ و تاقیگەکان کەلێنی ئاین و خودا پڕ بکەنەوە.

لە بەرامبەریشدا نە خودا و نە هیچ ئاینێك و نە هیچ کتێبێکی ئاسمانیی وەك تەورات و ئینجیل و قورئان ناڵێت گۆشە گیربە و شوێن زانست مەکەوە یان زانست بەکار مەهێنە ،،، بەڵکو ئەو کتێبە ئاسمانییانە فەرمانمان پێ دەکەت شوێن ئەو خودایە بکەوین کە خالقی ئەم کەونەیە و بەدیهێنەری ئەم زانستەیە کە لەم سەردەمەدا سەری هەڵداوە،وە بیرکردنەوەمانە لەوەی بۆچی ئێستا ئەم

زانیاری و زانستە تاقیگەی و الکترۆنییانە هەیە و لەمەوبەر نەبوون وە تا چەند ئەم زانستانە بەردەوام دەبن و ڕاستن !! چونکە هەموو زانیارییەکی تاقیگە کە ئێستا لەبەر دەستماندایە تا ئەو ڕادەیە ڕاستیە کە ئامێرێکی تازەتر یان تاق کردنەوەیەکی تازەتر دێتە ئاراوە . ئەوکات هەموو ئامێرەکانی پێش خۆی و هەموو نەزەریاتەکانی پێش خۆی سفر دەکاتەوە و نامێنێت

بەڵام خودا و منهج و کتێبی خودا هەر دەمێنێت . بچوکترین نمونە نەخۆشیی ( طاعونە ) ئەگەر لە هەر کەسێك بپرسین هۆکاری بڵاو بونەوەی نەخۆشیی طاعون چییە ؟ یەکسەر دەڵێت مشکە . وە بۆ ماوەی ٧٠٠ ساڵە زانایان و تاقیگەکان و لێکۆڵینەوە زانستییەکان دەی سەلمێنن نەخۆشیی طاعون لە ڕێگای مشکەوە بڵاو دەبێتەوە و بووە بە زانیارییەك و زانستێکی چەسپاو بەڵام ئێستا لە٤ ساڵی ٢٠١٥ دا و پاش ٧٠٠ ساڵ دڵنیابی کە مشك هۆکاری طاعونە بۆیان دەرکەوت مشك هۆکاری بڵاو بونەوەی طاعون نییە . کەواتە ٧٠٠ ساڵ زانستی تاقیگە بە هەڵە زانیاریی بڵاو کردوەتەوە . هەموو زانستەکانی تریش هەمان شێوەن شتی تازە و نوێتر نەزەریاتەکانی پێش خۆی سفر دەکاتەوە . کەواتە کاتێك ملحد پشت بە بەڵگە زانستیەکان دەبەستێت بۆ نەبونی خودا !! وە بەڵگەی تازەتر دێتە پێشەوە و ئەوانەی پێش خۆی ڕەت دەکاتەوە هەڵوێستیان چی دەبێت ؟

کاتێکیش کە دەمرێت و فریشتە و ڕاستیەکان دەبینێت هەڵوێستی چی دەبێت ؟ چونکە ئاینی ئیسلام فێری کردووین کاتێك بەلای سەر قەبراندا دەڕۆین سڵاویان لێ بکەین و بڵێین سڵاوی خوداتان لێ بێت جێگای خەڵکێکی ئیماندار . خۆ لە سەر قەبراندا خەڵکی بێدینیشی لێیە !! بۆچی ئێمە دەڵێین خەڵکی ئیماندار بەوانیش ؟ چونکە کە دەمرن دەزانن خودا هەیە و لێ پرسینەوە هەیە . ئەوکات ئیمان دەهێنن بەڵام ئەفسوس ئیمانەکەیان هیچ سودێکی نابێت بۆیان . چونکە ئیمان هێنان لە ژیاندایە نەك پاش مردن بۆیە هیوادارم کەشف کردنی هۆکاری بڵاو بونەوە طاعون ببێت بە وانەیەك بۆ ئەو بەڕێزە بێدینانە وە بیر بکەنەوە کە ٧٠٠ ساڵە زانست دەڵێت هۆکاری بڵاو بونەوەی طاعون مشکە بەلام ئێستا دەڵێت مشك نییە . کەواتە مناقشە و زانست و بەدواداچونی تاقیگە بۆ ماوەی ٧٠٠ ساڵ ڕاست دەر نەچوو وە ئەو تیمەی هەستاون بەو کارە و دۆزیویانەتەوە کە مشك هۆکاری بڵاو بونەوەی طاعون نییە دەڵێن دەبێت جارێکی تر ئەو ٧٠٠ ساڵە لە مێژوو سەر لەنوێ بنوسینەوە !!ئایا ئەو کەسانەی پشتیان بەو زانیارییە بەستووە و بوونی خودایان ڕەت کردوەتەوە بۆ ماوەی ٧٠٠ ساڵ ئێستا هەڵوێستیان چی دەبێت ؟ ئەی کاتێك مردن و ڕاستییەکانیان بینی و زانییان خودا هەیە هەڵوێستیان چی دەبێت ؟ **فەرموون** لەم لینکە هەواڵی بێبەرێتی مشك لە نەخۆشیی طاعون ببینن . وە بەو بەڕێزە بێدینانەش دەڵێم : السلام علیکم دار قوم مؤمنین وإنا إن شاء الله بکم لاحقون .

http://arabic.cnn.com/scitech/2015/02/25/plague-blame-game-gerbils-replace-rats-prime-suspects

**لینکەکە سەرچاوە**

---

**بعد قرابة ٧ قرون، برأ بحث علمي ساحة الفئران من نشر وباء الطاعون الذي فتك -- (CNN) أتلانتا، الولايات المتحدة الأمريكية ، وهو نوع من القوارض تتم تربيتها كحيوان Gerbil بالملايين في أوروبا بالقرن الرابع عشر، ووجه أصابع الاتهام إلى اليرابيع .أليف أحيانا**

ودحض علماء من النرويج وسويسرا، في دراسة نشرت في "دورية وقائع الأكاديمية الوطنية للعلوم، معتقدات شائعة منذ مئات السنوات، بكون الفئران حاضنة للبراغيث حاملة المرض، ورجحوا انتشار الوباء إلى اليرابيع وأنواع أخرى من القوارض في آسيا الوسطى، وأضاف بروفيسور نيلس كريستيان ستينش، في مقابلة مع هيئة الإذاعة البريطانية: إذا كنا على صواب فهذا يقتضى منا إعادة كتابة هذا الجزء من التاريخ."

واستقصى العلماء في دراستهم الموجة الثانية لوباء الطاعون بأوروبا، وبدأت بـ"الموت الأسود" من الفترة ١٣٤٧ وحتى ١٣٥٣، واستمرت بشكل متقطع لمدة أربعة قرون أخرى، وتستند استنتاجاتهم بعدم مسؤولية الفئران عن نشر الوباء، نظرا لاقتصار تواجدها في مناطق محددة بشمال أوروبا إبان تلك الفترة، كما أن ذروة انتشار الوباء لا تتطابق والأحوال الجوية الملائمة لنشر سريع للمرض بواسطة براغيث الفئران.

وقارن الفريق البحثي سجلات لحلقات الأشجار الدائرية مع سبعة آلاف و٧١١ حالة تاريخية لتفشي الطاعون لرؤية ما إذا كانت ظروف الطقس ستكون الظروف المثلى لحالة تفشٍ سببتها الفئران.

ورجح العلماء ظهور المرض وانتشاره إبان كل فترة بخطوط التجارية، وتنقل القوافل التجارية بمناطق موبؤة بالمراض بآسيا الوسط ونقلها إلى أوروبا، وللتحقق من صحة نظريتهم يعمل الباحثون على تحليل الطاعون عن طريق حمض نووي من ضحايا الوباء.

وطمأن كين كيج، خبير الطاعون بـ"مراكز السيطرة على الأمراض والوقاية" الأمريكية مربي اليرابيع كحيوانات أليفة: "اذا اشتريته من محل لبيع الحيوانات الأليفة فليس لديك ما تقلق بشأنه."

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سی وچوار

## تەورات و کەر و ڕەخنەی بێ دین




بێ دینەکان ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن و دەڵێن قورئان لە **سورەتی الجمعة** ٥ دا باسی بنو ئیسرائیل دەکات و دەڵێت نمونەی ئەو کەسانەی خودا تەوراتی پێدان بۆ ئەوەی پەیڕەوی بکەن پاشان پەیڕەوییان نەکرد ( لێرەدا مەخسەدی لە زاناکانی بنو ئیسرائیلە ) ئەوانە وەك گوێ درێژێك وایە بارە کتێبێك لەسەر پشتی بێت . وە ئەوانە نمونەی خراپ ترین قەومن ئەو قەومەن کە ئایاتی خودا بە درۆ دەخەنەوە وەك دەبینن ئەم ئایەتە هیچ سوکایەتییەکی تێدا نییە . چونکە گوێ درێژ ئەگەر بارەکەی کتێب بێت یان زێڕ یان هەر شتێکی بەنرخ خودی گوێ درێژەکە هیچ سودێکی لێ نا بینێت و ناش زانێت چیی بار کردووە ؟ کاری گوێ درێژەکە بەس گواستنەوەیە !!؟ کاتێکیش جولەکە تەوراتیان پێ درا زاناکانیان ڕێزیان لەو کتێبەی خودا نەگرت !! بۆ ئەوەی ڕاستیی قسەکانمان بسەلمێنین ناگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە ئیسلامییەکان و بۆ تەفسیرەکانی بەڵکو دەگەڕێینەوە بۆ خودی تەوراتەکەی موسا (ع) با بزانین چی

دەڵێت ؟ لە **سفری التثنية واتا دوا وتاری موسا بەشی ٣١ دا لە دەقی ١ بۆ ٨** باسی ئەوە دەکات موسا (ع)

یشوع دەکات بە جێگری خۆی .

http://www.kitebipiroz.com/bible/deu/31

.........................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » دواوتاری موسا » بەشی ٣١

**یەشوع جێگەی موسا دەگرێتەوە**

1

جا موسا چوو بەم وشانە لەگەڵ هەموو نەوەی ئیسرائیل قسەی کرد و

2

پێی وتن: (من ئەمڕۆ تەمەن سەد و بیست ساڵانم، ئیتر توانای چوونە دەرێ و هاتنە ژوورێم نەماوە و یەزدانیش پێی فەرمووم: "لەم ڕووبارەی ئوردون مەپەڕەوە".

3

یەزدانی خوداتان لەپێشتانەوە دەپەڕێتەوە، خۆی ئەو نەتەوانە لەپێشتانەوە لەناودەبات و ئێوەش دەبنە میراتگریان. یەشوع لەپێشتانەوە دەپەڕێتەوە وەك یەزدان فەرمووی.

4

هەروەها یەزدان چی بە سیحۆن و عۆگ و بە خاکەکەیان کرد، دوو پاشاکەی ئەمورییەکان، کە لەناوی بردن ئاواش بەوان دەکات.

5

جا کاتێك یەزدان ئەوانی خستە دەستتان بەگوێرەی هەموو ئەو فەرمانانەی فەرمانم پێتان کرد، ئاوایان لێ دەکەن.

6

بەهێزبن و ئازابن، لێیان مەترسن و مەتۆقێن، چونکە یەزدانی خوداتان لەگەڵتان دەڕوات، پشتگوێتان ناخات و وازتان لێ ناهێنێ(.

7

جا موسا یەشوعی بانگکرد و لەبەرچاوی هەموو ئیسرائیلدا پێی وت: (بەهێزبە و ئازابە، چونکە تۆ لەگەڵ ئەم گەلە دەچیتە ناو ئەو خاکەی یەزدان سوێندی بۆ باوباپیرانیان خوارد کەوا بیانداتێ و تۆش بۆیانی دابەش دەکەیت وەك میراتیان،

8

یەزدانیش خۆی لەپێشتەوە دەڕوات، ئەو لەگەڵت دەبێت، پشتگوێت ناخات و وازت لێ ناهێنێ، مەترسە و ورە بەرمەدە(.

.........................................................

پاشان لە **دەقی ٩ بۆ ١٣** وەسێت بۆ کاهینەکان دەکات چی بکەن .

کتێبی پیرۆز » دواوتاری موسا » بەشی ٣١

**خوێندنەوەی تەورات**

9

ئینجا موسا ئەم فێرکردنەی نووسی و دایە دەستی کاهینەکان، کەوا نەوەی لێڤین و هەڵگری سندوقی پەیمانی یەزدانن، لەگەڵ هەموو پیرانی ئیسرائیلدا.

10
موسا فەرمانیشی پێکردن و وتی: (لە کۆتایی هەر حەوت ساڵێك، لە کاتی ساڵی بەتاڵکردنەوەی قەرزەکان [a]، لە جەژنی کەپرەشینەدا [b]،

11
کاتێك هەموو ئیسرائیل دێن تا لەبەردەم یەزدانی خودات دەربکەون لەو شوێنەی کەوا هەڵی دەبژێرێت، ئەم فێرکردنە لە بەرامبەر هەموو ئیسرائیلدا گوێیان لێ بێت کە دەیخوێنیتەوە.

12
گەل کۆبکەنەوە، پیاو و ئافرەت و منداڵ و ئەو نامۆیانەش کە لە شارۆچکەکانتانە تا گوێ بگرن و فێر بن لە یەزدانی خوداتان بترسن و هەموو وشەکانی ئەم فێرکردنە پەیڕەو بکەن و کاری پێ بکەن.

13
هەروەها نەوەکانیشتان کەوا ئەم فێرکردنەیان نەزانیوە، گوێ دەگرن و فێر دەبن لە یەزدانی خوداتان بترسن، بە درێژایی ئەو ڕۆژانەی لەسەر ئەو زەوییە دەژین کەوا ئێوە لە ڕووباری ئوردون بۆی دەپەڕنەوە تا دەستی بەسەردا بگرن).

..............................

پاشان خودا داوا دەکات یشوع بێت لەگەڵ موسادا ( ع ) بۆ ئەوەی لەگەڵ خودادا قسە بکەن ( ٣ ) قۆڵی وە خودا لە **دەقی ١٦ بۆ ١٨** پێیان دەڵێت.

یەزدان بە موسای گوت ئەوەتا تۆ لەگەڵ باوباپیرانت سەردەنێیتەوە جا ئەم گەلە هەڵدەستن و لەشفرۆشی دەکەن لەگەڵ خوداوەندە بێگانەکان لەو خاکەی ئەوان دەچنە ناوی لەنێویان و وازم لێ دەهێنن و ئەو پەیمانەم دەشکێنن کە لەگەڵیان بەستوومە ئیتر لەو ڕۆژەدا توڕەییم بەسەریاندا گڕ دەگرێت و وازیان لێ دەهێنم و ڕوی خۆم لێیان دەشارمەوە و دەبنە نێچیر و توشی زۆر ناخۆشی و بەڵا دەبن هەتا ئەوەی لەو ڕۆژەدا دەڵێن ئایا لەبەر ئەوە توشی ئەو بەڵایانە بووین چونکە خودا لەگەڵمان نیە؟ منیش لەو ڕۆژەدا ڕوی خۆم دەشارمەوە لەبەر هەموو ئەو خراپەیەی کەوا کردیان و کە دوای خودای دیکە کەوتن.

بەڕێزان وەك دەبینن ئەوانە دەقی تەوراتن وە خودا بە موسا دەڵێت ئەوە تۆ دەمریت و جولەکە دەچنە ناو گەلانی ترەوە و شوێن خودای ئەو گەلانە دەکەون و پەیمانیان لەگەڵ خودادا دەشکێنن واتا شوێن تەورات و خودای تەورات و موسا ناکەون وە خوداش پشتیان تێ دەکات چونکە ئەوان پشتیان کردوەتە خودا و شوێن کتێبی خودا و خودا نەکەوتون وە شوێن خراپە کاری کەوتوون . ئەمە بەڵگەی حاشا هەڵ نەگرە و لە خوداوەیە کە بنو ئیسرائیل شوێن تەورات و خودای تەورات و موسا ناکەون

**باشە با ئێستا بزانین هەڵوێستی موسا (ع) چی بووە پاش خودا ؟**

پاشان موسا (ع) سرودێکی فێرکردن وەپاش سرودەکە لە دەقی **٢٥ بۆ ٢٩ بە بنو ئیسرائیلی گوت** فەرمانی بە لاوییەکانی هەڵگرانی سندوق پەیمانی یەزدان کرد و وتی ئەم پەڕتوکەی تەورات ببەن و لە تەنیشت سندوق پەیمانی یەزدانی خوداتان دایبنێن هەتا وەك شایەتی بەسەرتانەوە لەوێ بێت چونکە من یاخی بون و کەلەڕەقیتان دەزانم ئەوەتا من ئەمڕۆ هێشتا زیندوم لەگەڵتاندا و ئێوەش بەربەرەکانێی یەزدان دەکەن جا باشە دوای مردنم چی دەکەن ؟

دیقەت بدەن موسا (ع) فەرمان بە لاوییەکان دەکات کە کاهینەکانی جولەکەن تەورات بەرن لە صندوق العهد دای بنێن . واتا موسا متمانەی بە جولەکە نە کردووە تەوراتیان بداتە دەست چونکە جولەکە زۆر ئازاری موسایان داوە وە خوداش شایەتیی دا وەك لە

پێشەوباسمان کرد کە جولەکە پشت دەکەنە خودا بۆیە موساش ترساوە دوای مردنی شتی خراپ تر بکەن و تەوراتی نەداوەتە دەستیان . ئینجا با بزانین موسا چیی تری گوتووە

هەمو پیرانی هۆزەکان و کوێخاکانتانم بۆ کۆبکەنەوە، تا ئەم وشانەیان بەگوێدا بدەم ئاسمان و زەوی بکەم بە شایەت بەسەریانەوە چونکە دەزانم ئێوە دوای مردنم بە تەواوی گەندەڵ دەبن و لەو ڕێگایە لادەدەن کە فەرمانم پێ کردون لە ڕۆژانی ئایندەدا توشی خراپە دەبن چونکە لە بەرامبەر یەزدان خراپە دەکەن، بەو بتانە کە بەدەستی خۆتان دروستتان کرد پەستی بکەن

ئەوەتا موسا (ع) ئاسمان و زەوی و پیر و کوێخاکان دەکات بە شایەت بەسەر جولەکەوە و دەزانێت دوای مردنی موسا جولەکە گەندەڵ دەبن و بت دەپەرستن نەك خودا وە خراپەکاری دەکەن !! کەواتە خودا و موسا هەردوکیان متمانەیان بە جولەکە نە کردووە و تەوراتیان نەداوەتە دەستیان و زانیویانە ئەمانە شوێن تەورات ناکەون . کاکی بێدینی کوردیش دێت ڕەخنە لە قورئان دەگرێت .

ئادەی بێ زەحمەت پێم بڵێ تۆ لە خودا و موسا زاناتریت ؟ هەردووکیان دەڵێن ئەم قەومە شوێن تەورات ناکەون . وە ئێستا هێندەی تلمود پیرۆزە و کاری پێ دەکەن هێندە تەورات گرنگ نییە لە لای جولەکە . ئێ خۆ قورئانیش هەمان شت دەڵێت : دەڵێت زانا و کاهینەکان شوێن تەورات ناکەون . کەرێك چەند سود لەو کتێبانە وەر دەگرێت زاناکانی جولەکەش هەمان شێوەن چونکە ئەوان عیلمی ناو تەورات دەگوێزنەوە و گواستنەوەی تەورات لە جیلێکەوە بۆ جیلێك کاری زاناکانیانە نەك خەڵکی عەوام !! خودی تەوراتیش هەمان شایەتی دەدات وەك لەسەرەوە باسمان کرد . موساش (ع) لاویەکان و کوێخا و کاهینەکانی کرد بە شایەت بۆ ئەوەی ئەو ئەمانەتە هەڵ بگرن و بیگوێزنەوە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سی وپێنج

## لای نیچە کام خودایە مرد ؟

هەر بێ دینێك هەڵ دەستێت دەڵێت نیچە گوتی خودا مرد . فەرموو پێمان بڵێ خودا کێیە و چییە لە فکر و فلسفەی نیچە شەدا چونکە خوداوەندەکان یان خوداکان ناسراون لە لای ئاینە مرۆییەکان وەك بابلی و سۆمەری و فێرعەونی و فارس و یۆنان و رۆمانییەکان و گەلەکانی تریش وە خوداش ناسراوە لەلای ئاینە ئاسمانیەکان تەورات و ئینجیل و قورئانیش داواکارییەکەشم زۆر ئاسانە نیچە مەبەستی لە کام خودایەیە ؟ ئەگەر بڵێیت هەر هەموویان هەڵەیە . چونکە ئەو کات دەبوایە نیچە بی گوتایە ( خوداکان مردن ) بە کۆ نەك بەتاك بڵێت ( خودا مرد ) کەواتە نیچە مەبەستی لە خودایەکی دیاری کراوە !! ئەگەر بشڵێیت خوداکان هەمویان یەکن و فەرقیان نییە !! ئەوە تا سەر ئێسقان نەزانیت و هیچ شارەزای مێژوی گەلان نییت وە جیاوازیی نێوان خوداوەند و خودا ناکەیت واتا ( اله و رب ) یان ( الهة و رب )

فەرموو بە دەقێکی صریح و ڕون پێم بڵێ نیچە مەبەستی چییە دەڵێت خودا مرد و کام خودایە مرد لە فکری نیچەدا ؟ ئاگاداربە وەڵامی منجە منج و قسەی گیرفان نادەمەوە !! چونکە هەمو شتێك لە دنیادا رون و ئاشکرایە و نیچە خۆی دەزانێت مەبەستی لە کام خودایەیە . بەلام تۆ نازانیت و ئاگاداری فکری نیچە نییت و وەك توتی بەدوای نیچەدا دەخوێنیت ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سی وشەش

## شیری خواردن






بێ دین و ملحدەکان دەڵێن زانست گەیشتوەتە لوتکە و دەتوانێت هەموو شتێك دروست بکات و دابین بکات

پرسیارێکی بچکۆلە : بۆچی زانست و تکنلۆجیا نا توانێت پیاڵەیەك شیر دروست بکات ؟ گژ و گیا و پوش و پەلاش زۆرە . ئاژەڵیش ئەو گژ و گیایە دەخوات و دەی کات بە شیر وە شیریش پێویستیەکە لە پێویستییە گرنگەکان بۆ هەموو کەسێك و زۆربەی خواردنەکان .

لەوانەیە كەسێك بڵێت خۆ ( شیری سۆیا ) هەیە ئەویش هەر شیرە فەرقی چییە لەگەڵ شیری ئاژەڵدا ؟ وەڵام : شیری سۆیا لە ماش دەر دەهێنرێت واتا طبیعی نییە وەك شیری ئاژەڵ وە زۆر پێك هاتەی شیری تێدایە . بەڵام تام و خواردنی زۆر جیاوازە لە شیری ئاژەڵ ؟ هەروەها شیری سۆیا لەگەڵ ئەوەی سوودی هەیە بەڵام لە بەرامبەریشدا بەهەمان بڕی سودەكەی زیانیشی هەیە بەڵام شیری ئاژەڵ بەس بە تەنها سودی هەیە و زیانی نییە بۆ مرۆڤ و منداڵیش . خۆشتان دەتوانن بەدوادا چون بكەن بۆ شیری سۆیا وە لەسەر وێنەكە ناوی علمیی شیری سۆیام بۆ نوسیون بە عربی و انگلیزی و لاتینی وە شیری سۆیا لە كوردوستان نییە لەوانەیە زۆرمان شارەزایمان نەبێت دەربارەی.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :سی وحەوت

## قورئانی و عەلەمانی و عەدنانی و نەزانی

كۆمەڵێكی موسوڵمان هەن پێیان دەڵێن ( معتزلة ) مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ نزیكەی ١٢٥٠ ساڵ ئەمانە عەقڵی خیان دەكەن بە حاكم و دادوەر . بە درێژایی مێژووی ئیسلام ئەمانە بونیان هەیە وە لەگەڵ موسوڵمانەكاندان پێكەوە نوێژ دەكەن . وە زاناكانیان و خەڵكی عەوامیشیان كێشەیان نە بووە لەگەڵ عوامی موسوڵماناندا . وە كێشەكانیان بچوك بووە بە گفت و گۆ گەیشتوونەتە چارەسەر وە كێشەكان گەورە نە بوون . مەبەستی من لێرەدا باس كردنی ئەسڵ و پەیدابونی معتزلة نییە !!؟

لەم ڕۆژانەدا كە تێیدا دەژین هەمان فكر هەر هەیە و بەردەوامە . لێرەدا بە تایبەتی باسی كوردوستانی خۆمان دەكەم خەڵكانێكی زۆر پەیدا بوون شوێن ئەم فكرە كەوتوون . كێشەی سەرەكییان ئەوەیە زۆربەی زۆریان هیچ عربی نازانن هەتا لە قورئان و سونەت تێ بگەن !! وە هەر هەموویان دەڵێن ئێمە ئەوەی باش بێت وەری دەگرین ئەوەی خراپ بێت وەری ناگرین . قسەیەكی جوان و لۆجیكە منیش هاوڕایانم بەڵام با بزانین ئەمانە بەچی پێوەرێك باش و خراپ جودا دەكەنەوە ؟

كە منداڵین باش و خراپ لە دایك و باوكمانەوە وەر دەگرین پاشان تۆزێك مەزن دەبین لە چوار دەور یشمان وەری دەگرین پاشان لە قوتابخانە لە مامۆستاكانمانەوە پاشان قوتابخانە تەواو دەكەین لە شوێنی كارەكانمانەوە وەری دەگرین ئەوەی مەبەستمە ئەمەیە دایك و باوك منهج و پرۆگرامێكی خۆیانیان هەیە چوار دەوریش بەهەمان شێوە كاتێك بە منداڵی بە قسەیان ناكەین ئەوان یان ئامۆژگاریمان دەكەن یان لێمان دەدەن یان بە جۆرێك لە جۆرەكان دەیانەوێت ڕاستییەكانمان پێ بڵێن چونكە ئێمە نازانین كامە باشە و كامە خراپە

پاشان لە قوتابخانە بەهەمان شێوە باش و خراپە لە مامۆستاكانمانەوە وەردەگرین ئەگەر لەسەر منهجی ناو كتێبەكە نەڕۆین دەرناچین و بۆ ساڵێك دەمێنینەوە . ناتوانین لە تاقی كردنەوە و یاساكانی قوتابخانە بە ئەقڵی خۆمان بكەین ئەوەی چاك بێت وەری

بگرین ئەوەی خراپ بێت ڕەتی بکەینەوە پاشان قوتابخانە تەواو دەکەین دەبێت پابەند بین بە یاسا و ڕێسای ئەو شوێنەی کاری تێدا دەکەین و ناتوانین ئەوەی باش بێت وەری بگرین و ئەوەی خراپ بێت ڕەتی بکەینەوە . .

هەروەها کاتێکیش ئامێرێکمان یان سەیارەکەمان تێك دەچێت دەبێت بە قسەی وەستاکە بکەین و ناتوانین ئەو پارچەیەی ئێمە دەمانەوێت بگۆڕرێت و ئەوەی لامان باش نییە نە گۆڕرێت .

وە بە نیسبەت هەموو شوێنێك و کارێکەوە بەو شێوەیەیە دەبێت بە گوێرەی یاساکان بڕۆین بەڕێوە تەنانەت کاتێکیش شت دەکڕین ناتوانین ئەوەی لامان باشە بیکڕین و ئەوەی باش نییە نەی کڕین چونکە لێرەدا یاسای ئەو برە پارەیەی ناو گیرفانت کڕینەکانت دیاری دەکات نەك ئەوی لات باشە بیکڕیت و ئەوەی باش نییە نەی کڕیت

ئەگەر ئەمانەش پێچەوانە بکەینەوە هەر هەمووی ڕاست دەر دەچێت . واتا ئەگەر خۆت دایك یان باوك بیت دەتوانیت باش و خراپ بۆ منداڵەکەت هەڵ بژێریت . ئەگەر مامۆستا بیت دەتوانیت باش و خراپ فێری خوێند کارەکانت بکەیت . ئەگەر خاوەن کار بیت بەهەمان شێوە باش و خراپەکان دیاری دەکەیت چونکە شارەزایت کام پارچە باشە بۆ چاك کردنەوەی فلان ئامێر . ئەگەر گیرفانیشت پڕ بوو دەتوانیت باشترین شمەك بکڕیت بەلام گیرفانیشت بەتاڵ بوو بە گوێرەی پارەکەت شتێکی خراپ دەکڕیت و پینە و پەڕۆی پێ دەکەیت

**پرسیاری کۆتایی من ئەوەیە** : بەڕێزم پێوەری تۆ چییە بۆ ئاینی ئیسلام و منهجی قورئان و حەدیسەکان کە بتوانیت کامە باشە وەری بگریت و کامە خراپە وەری نەگریت ؟ عرببیەکی زۆر باش دەزانیت ؟ چەند کتێبی تفسیر یان فقه یان احادیث و علم الرجال و جرح و تعدیلت خوێندوەتەوە ؟ هەتا بتوانیت باش و خراپ لێك جیا بکەیتەوە . لەسەر چی بنەمایەك شتی باش لە معتزلة وەر دەگریت و شتی خراپ وەر ناگریت ؟

بە شەرتێك لە ژیانتدا ناتوانیت لە هیچ شوێنێکدا بە ئارەزوی خۆت ئەوەی لات باشە وەری بگریت یان کاری پێ بکەیت وە ئەوەی خراپە ڕەتی بکەیتەوە . ئەگەر ئازایت کارێکت هەبێت لە فەرمانگەیەکدا و ڕۆتینی ئەو فەرمانگەیە ڕەت بکەرەوە . بزانە کارەکەت بۆ دەکرێت ؟باشە بۆچی ئاینی خودا و قورئان و سونەت هێندە لا سوکە بە گوێرەی هەوا و ئەقڵی خۆت ڕەتی دەکەیتەوە لە کاتێکدا تۆ هیچ عیلمێکت نییە و هیچ نەت خوێندووە لە بوواری ئاینیدا هەتا بزانیت کامە باشە وەری بگریت و کامە خراپە ڕەتی بکەیتەوە

هەموو سەرچاوەی تۆ ئەقڵی ئێستاتە و بە ئەقڵی خۆت شتێك ڕەت دەکەیتەوە کە زانیاریت نییە دەربارەی ئادەی پێم بڵێ جیاوازیی تۆ و کابرای بێدین   چییە ؟ هەردووکتان ئەقڵتان دادوەرە . بڕۆن بگەڕێن بۆ هەمو ساید و پەیج و گروپ و ماڵپەڕە دژە ئیسلامەکان ٩٥% ی ئەو ڕەخنانەی لە ئیسلامی دەگرن هەر هەمووی لە کتێبەکانی معتزلەوە وەر گیراوە.

**برسیاری سەرەکی ئەمەیە** ( پێوەری تۆ چییە بۆ ئەوەی باشە وەری بگریت . ئەوەی خراپە ڕەتی بکە یتەوە ) بە گوێرەی چی سەرچاوەیەك کە خۆت لێت خوێندوە و شارەزایت تێیدا شت وەر دەگریت و ڕەتی دەکەیتەوە ؟

## پرسیارە بێ وەڵاٌمەکان ژمارە :سی وهەشت

## کێ بەر پرسە لە هەژاری و برسێتیی خەڵکی ؟

کەم کەس هەیە ئەم وێنەیەی نە دیبێت !! بەلام هیچمان چیرۆکەکەی نازانین ؟ کیفن کارتر سالَی 1993 ئەم وێنەیەی گرتووە ئەو مندالّە دەیەوێت بگات بە کەمپی پەنابەرانی سودان وێنە گرەکە دالّەکەی لێ دور دەخاتەوە . بەلاّم هەلّی ناگرێت بیبات بۆ کەمپەکە بۆیە مندالّەکە دەمرێت کارتری وێنە گر خەلاّتی بولیترز وەردەگرێت بەلام پاش چەند مانگێك خۆی دەکوژێت مرۆڤەکان زالّمن ئەو وێنەیە بەکار دەهێنن وەك هەژاندنی ویژدان بەلاّم وێنە گرەکە ویژدانی نە بوو مندالّەکەی ڕزگار نەکرد کابراش خۆی کوشت منالّەکەش مرد دالّەکە هیچی دەست نەکەوت بەلاّم وێنەکە ماوە خەلّکی بلاّوی دەکەنەوە بۆ داوای داد پەروەری



زۆر خەڵکی وێنەی منداڵێکی برسیمان بۆ دا دەنێن کە پێستی بە ئێسقانیەوە نوساوە و لەسەری دەنوسن سەیری عەدالەتی خودا بکەن !! بۆچی ئەو منداڵە بەو شێوەیە دەژی ؟ لە بەرامبەریشدا خاوەن وێنەکە نە ئاگاداری عولمەیە ( جیهان گیری ) و نە ئاگاداری باری ئابوریی جیهان و ململانێی دەوڵەت و سەرمایە دارەکانە بۆ قۆرخ کردنی بازاڕەکان و هەڵ گیرساندنی شەڕ بۆ پارە پەیدا کردن

ڕێکخراوی اوکسفامی بریطانی کە یەکێکە لە مەزنترین ڕێکخراوی جیهانی کە لە ساڵی ١٩٤٢ دا دروست بوە . و لە (٩٠) وڵاتی جیهاندا بنکەی هەیە بۆ نەهێشتنی فەقیری و برسێتی لە تازەترین لێکۆ ڵینەوەیدا کە کردوێتی پشتی بەستووە بە سەروەت و سامانی دەوڵەمەندەکان لە ساڵی ٢٠١٣ دا بە گوێرەی گەورەترین بانکی جیهانی کە ناوی کردیت سویسە . هەروەها لێکۆڵینوەیان کردووە لە ڕێگای گۆڤاری فۆربس کە ناو سەروەتی دەوڵەمەندەکانی جیهان بڵاو دەکاتەوە بە ئاماری ڕەسمی

وە ئۆکسفام دەڵێت سەروەتی نیوەی جیهان لای ٨٥ کەسە کە دەکاتە ١،٧ تریلیۆن دۆلار . وە ئەگەر پارەی ئەو ٨٥ کەسە دابەش بکرێت بەسەر خەڵکی هەژاردا برسێتی و هەژاری لەسەر زەوی نامێنێت هیوادارم ئەو بێدینانەش کە ئەو وێنانە بڵاو دەکەنەوە تۆزێك

خۆیان هیلاك بکەن و بگەڕێن و واز لە کۆپی و پەیست بهێنن و بزانن ئەو (٨٥) کەسە کێن ئەو پارە زۆرەیان هەیە و چۆن کۆیان کردۆتەوە و چەند ماڵیان وێران کردووە هەتا بوون بە خاوەنی ئەو سەروەتە

وە چەند دەوڵەتیان وێران کردوە و چۆن ڕێگا دەگرن لەوەی بەروبومەکانیان نرخی دانەبەزێت و هەمیشە یاری بە نرخی خواردن و قوتی خەڵکی فەقیر و هەژار بکەن . ئەو کات تێ دەگەیت هەژاری سەر زەوی پەیوەندیی بەو حوتە زەبەلاحانەوە هەیە کە دەستیان گرتووە بەسەر خواردن و هەموو گەورە و بچوکێکی بازاڕدا .. هەر کەس دەیەوێت بە انگلیزی بە دوای ئەو هەواڵەدا بگەڕێت لە خوارەوە دام ناوە چی بنوسێت ؟ فەرموو بەدوای هەواڵەکەدا بڕۆن.

85 Soraya equivalent to half the wealth of the world's poor?

ئەمەش لینکی هەواڵەکە بە عربی بە ڤیدیۆ

http://www.bbc.co.uk/arabic/multimedia/2015/01_١٥٠١١٩/uk_oxfam_report_most_rich

..........................................................................................................................

# پرسیارە بێ وەلامەکان ژمارە :سی ونۆ

## بۆچی دەبێت خودا نەبێت ؟

مرۆڤ و ئاژەڵ لە کاتێکدا لە دایك دەبن دەبێت گەورە و بەخێو کەرێکیان هەبێت . ئەگەر بەخێوکەر نە بێت ئەو مرۆڤە یان ئەو ئاژەڵە دەمرێت . کە گەورە دەبن دەبێت لەناو خێزانێکدا گەورە هەبێت ، ئەگەر دایك یان باوك یان برا یان خوشکی گەورە یەکێکیان ئاقڵ و گەورە نە بێت و سەر پەرشتی نەکات ئەو خێزانە تێك دەچێت.

لە قوتابخانە و لە ناو هاوڕێکاندا ئەگەر دوو کەس و بەرەو ژوور بین دەبێت یەکێکمان ئاقڵ بێت و گوێ ڕایەڵی بین و پرس و ڕای پێ بکەین . لە شوێنی کارەکانماندا دەبێت بەڕێوەبەر هەبێت ، ئەگینا کارەکان بە باشی ناڕوات . لە شارێکدا دەبێت مدیر ناحیە و قایمقام و شارەوانی و زۆر دەزگای تر هەبێت ئەگینا خزمەت گوزاری دەوەستێت و پشێوی دروست دەبێت

لە دەوڵەتێکدا دەبێت سەرۆك و جێگر و وەزارەتە جیا جیاکان هەبێت ئەگینا دەوڵەت ناڕوات بەڕێوە و توشی پشێوی دەبێت . تەنانەت لە کارگەکانیشدا کە مەکینە و کۆمپیوتەر بەڕێوەی دەبەن دەبێت کەسانێك هەبن چاودێری ئەو کۆمپیوتەر و ئامێرانە بکات ئەگینا بەروبومی کارگەکە تێك دەچێت . بە کوردی و بە کورتی هەمو شتێك و شوێنێك لە جیهاندا پێویستی بە دروست کەر و کارگێڕ و بەڕێوەبەر و مشور خۆر هەیە ئەگینا ئەو کارە ناکرێت یان ناچێت بەڕێوە .

ئێمەی مرۆڤ و زەویش لە چاو کەوندا خاڵێکیش نین !! بەڵکو هەر دیاریش نین و هیچ قەبارەیەکمان نییە لە چاو گەورەیی کەوندا .

باشە بۆچی ئەم کەونە خالق و بەڕێوەبەرێکی نەبێت ؟ پێوەری تۆ چییە بۆ ڕەت کردنەوەی خودا ؟

باوەڕت بە ( ١٣ )**ملیـــار** ساڵ هەیە كە كەونی تێدا دروست بووە !! باوەڕت بە بیردۆزی پەرەسەندن هەیە كە بونەوەرەكان لە گەردیلەوە پەرەیان سەندووە بە ملیۆنەها ساڵ .. لە بەرامبەریشدا بەڵگەكانت بۆ قسەكانت چەند پێوەرو چەند ئامێرێكە

ئەگەر زانایەك پەیدا ببێت یان ئامێرێكی نوێ بێتە كایەوە . ئەو حساباتانەی تۆ هەمووی ڕەت دەكاتەوە و دەڵێت ئەمەیان ڕاستە . وە ئەو زانیارییانەی پێشووو هەڵە بوون . لە لایەكی تریشەوە باوەڕت بە ملیارەها و ملیۆنەها ساڵ هەیە هیچ بەڵگەیەكت لا نییە لەسەر( ١٠) هەزار ساڵ نەك ملیۆنێك ساڵ ؟ بڕۆ بگەڕێ بزانە مێژووی نوسین چەند ساڵە هەیە ؟ وەڵام (٥)هەزار ساڵە مێژووی نوسین هەیە !!! ئەی پێم بڵێ پێوەری تۆ چییە بۆ ملیارەها ساڵ لە كاتێكدا مێژووی نوسین ( ٥) هەزار ساڵە ؟ بۆچی بۆ هەموو شتێك دەبێت گەورە و دروست كەر هەبێت ؟ بۆچی بۆ كەونێكی مەزن خودا نەبێت؟ كێ دوای خورافات كەوتووە ؟ ئیماندار یان تۆی بێ ئیمان كە باوەڕت بە ( ١٣) ملیار ساڵ هەیە ؟ وە هیچ نوسراو كتێبێك نییە پشتی پێ بەستیت باسی نەك ( ١٣) ملیایر بەڵكو (١٣) ملیۆن ساڵی كرد بێت ؟؟ كاكە با كەمتری بكەینەوە هیچ سەرچاوەیەكت لا نییە باسی( ١٣٠ )هەزار ساڵی كرد بێت با كەمتری بكەینەوە هیچ سەرچاوەیەكت لا نییە باسی ( ١٣) هەزار ساڵی كرد بێت ؟

ئێمە سەرچاوەمان لایە كە قورئانە ١٤٠٠ ساڵە هەیە . جەنابت باوەڕت پێی نییە بەڵام باوەڕت بە (١٣) ملیار ساڵ هەیە كامیان خورافاتە ؟ باوەڕ بوون بە (١٣) ملیار ساڵ بە بێ بەڵگە و هیچ سەرچاوەیەك ؟ یان باوەڕ بوون بە ١٤٠٠ ساڵ و سەرچاوەیەك ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :چل

## كێ هۆكاری ڕەگەز بازییە ؟

ئایا ڕەگەز بازی پەیوەندیی بە حەز و ئارەزووەوە هەیە ! یان خودا بەو شێوەیە خلق كردون ؟

وەك دەبینین لەم زەمانەی ئێمەدا ژن لە ژن مارە دەكرێت و پیاویش لە پیاو . زۆر كەس دەڵێن ئەو كەسە بەو شێوەیە دروست بووە و تاوانی چییە ؟ زۆر كەسی تر دەڵێن باشە قورئان بۆچی باسی ئەو كێشەیەی نە كردووە ؟ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ قورئان دەبینین بە وردی باسی ئەو كارەی كردوە بەڵكو كات و شوێن و زەمانەكەشی دیاری كردووە !؟

لە **سورەتی الاعراف** ٨٠ دا خودای تعالی دەفەرموێت لوط بە قەومەكەی دەڵێت ئێوە كارێك دەكەن هیچ كەس لە پێش ئێوە نەی كردووە . كەواتە ئەو كارە لە پێش قەومی لوطدا (ع) نە بووە و خەڵكی نەیان كردووە !؟ ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی كە هاورەگەزی نەخۆشی نییە بەڵكو حەز و ئارەزووە !؟

پاش قەومی لوطیش هەر خەڵكی لەسەر ئەو كارە بەردەوام بوون بۆیە هود (ع) بە قەومەكەی دەڵێت : **هود** ٨٩ (**و ما قوم لوط منكم ببعيد)**

واتا هود قەومەكەی بە ئاگا دەهێنێت وازلەو كارە بهێنن چونكە خودا قەومی لوطی نەهێشت لەبەر كاری هاو ڕەگەزی بوو . وە ئێوەش وازلەو كارە بهێنن وە خۆشتان دەزانن و بیستوتانە قومی لوط چییان بەسەردا هات و ماوەیەكی زەمانییی كەم هەیە لە نێوان ئێوە و قەومی لوطدا بۆچی پەند وەر ناگرن !؟ پاشان خودای تعالی فەرمانمان پێ دەكات لەگەڵ ئافرەتدا بەو شێوەیە بین كە خودا فەرمانی پێ كردوە و دایناوە بۆ مرۆڤ وەك لە **سورەتی البقرة** ٢٢٢ دا دەفەرموێت( **فاتوهن من حيث امركم الله)** . وەك چۆن دەم بۆ خواردن كراوە گوێ بۆ بیستن هەروەها مرۆڤیش بۆ جنس كردن خودای تعالی شوێنی تایبەتیی بۆ خلق كردووە .

لەو ئایەتانەی سەرەوە بۆمان دەر دەكەوێت هاو ڕەگەزی پەیوەندیەكی شهوانیی حەز و ئارەزوی مرۆڤە نەك ناحیەی فسیۆلۆجیی لەشی ئەو كەسە بێت . یان ئەو كەسە خودا بەو شێوەیە خلقی كرد بێت !؟ بەڵكو هاو ڕەگەزی كردار و ویستی مرۆڤەكە خۆیەتی

بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەش وەك بینیتان لە سەرەوە پێش قەومی لوط ئەو كارە نە بووە بەڵكو داهێنانی قومی لوط بووە . هەروەها ئەو كارە لە قورئاندا و لە تەورات و ئینجیلیشدا ئیدانە كراوە و بە كارێكی نا مرۆی لە قەڵەم دراوە . وەك دەبینین لە سورەتی الانبیاء و النمل دا بەم شێوەیە باس كراوە

الانبیاء ٧٤ (القرية التي كانت تعمل الخبائث انهم كانوا قوم سؤ فاسقين ). هەروەها لە **سورەتی الا عراف** ٨٠ **و النمل ٥٤ دا دەڵێت :**

**و لوطـــــــــــــــا اذ قـــــــــــــال لقومــــــــــــــه اتــــــــــــاتون الفاحشـــــــــــــة**

وەك دەبینین ئەم ٣ دەستەواژەیە بەكار هێنراوە ( الخبث ، الفسق ، الفحش ) الخبث واتا الردئ خراپ هەروەها بە مانای لكع دێت واتا - تافە هیچ و پوچ . هەروەها الفسق واتا سەر پێچی و لە فەرمان دەرچون هەروەها بە مانای ئەوە دێت كەسانێك دژی فطرة و ژیان دەجوڵێنەوە . وە فحش هەموو شتێكی خراپە بكرێت بە وتن و بە كردار . یان هەر شتێك لە حەدی خۆی دەر بچێت كەواتە ئەگەر كاری هاو ڕەگەزی لە گەڵ بون و لاشەی مرۆڤدا بووایە و خودا ئەو كەسانەی بەو شێوەیە خلق بكردایە حەزیان لە هاو ڕەگەزی بوایە ، بەو شێوەیە قەومی لوطی بنە بڕ نەدەكرد ! هەروەها بە خبث و فسق و فحش لە قەڵەمی نە دەدان !؟

هەروەها لە **سورەتی الشعراء ١٦٥** دا دەفەرموێت ( **اتاتون الذكران من العالمين**) . وەك تعجب و سەر سوڕمانێك خودای تعالی لە زمانی لوطەوە باس لە ڕەگەزبازی دەكات و . بە شتێكی سەیر دراوە لە قەڵەم ئایا چۆن پیاو پیاو ئەو كارە دەكەن !؟

وە بەڵگەی ڕاستیمان بۆ قسەكانمان كە لە زەمانی لوطەوە ئەو كارە دەستی پێ كردووە زانای و دانایی لوط بووە كە خودای باڵا دەست زانای و علم و زانستی پێ بەخشیوە و لە علم و وەحێكی خوداییەوە قسەی كردوە چونكە لە **سورەتی الانبیاء ٧٤** دا خودای تعالی وەسفی لوط (ع) دەكات و دەفەرموێت : (**و لوطا اتیناه حكما و علما** )

ئەگەر کەسێك هاوڕەگەزی بکات و بڵێت : خودا وای دروست کردوم و من چارەسەرم نییە ! بەهەمان شێوە قورئان وەڵامی داوەتەوە لە سورەتی **القمر٣٣** دا دەفەرموێت : **(كذبت قوم لوط بالنذر)** . واتا قەومی لوط ئەو هەڕەشە و ئاگادارییانەیان بە درۆ خستەوە کە لوط (ع) پێی دەدان !؟ ئەگەر خودا عەبدەکانی خلق بکات و کابرا بڵێت من بەو شێوەیە خلق کراوم و سێڵەکانی لەشم بەو شێوەیە ئەو کات خودا ی زانا بەو شێوەیە هۆشداری و ئاگاداریی پێ نە دەداین ؟ هەروەها خودا قەومی لوطی (ع) لەناو نەدەبرد چونکە خۆی بەو شێوەیە دروستی کردوون . بۆچی لەناویان دەبات و تاوانیان چییە ؟ کابرا بە ویستی خۆی بەو شێوەیە دروست نەبووە

هەروەها بە نیسبەت ئافرەت لەگەڵ ئافرەتدا ڕەگەزبازی دەکەن ئەوەش کەسانێکی زۆر کەمن ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ خەڵکی بە عامدا . وە زۆر ئافرەت هەیە منداڵیشی هەیە و ئەو کارە دەکات وە پەیوەندیی بە حاڵەتی نفسی و هەوا و هەوەسەوە هەیە نەك بە لایەنی خلقی وە دروست کردنی ئەو پیاوە یان ئەو ژنەوە ، ئەو کەسانە هەوەس بازن نەك ڕەگەزباز

وە جوانترین وەسف بۆیان ( هەوەس بازە ) نەك ( ڕەگەزباز ) وە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی وشەی ڕەگەزبازیان بڵاو کردوەتەوە هەتا ئەو عەیبە بخەنە سەر خودا و لایەنی فسیۆلۆجیی مرۆڤ بە شەرتێك لە جیهان دا ئەو نەخۆشییە هیچ علاجێکی نییە بێجگە لە علاجی نفسی وە باشترین ناو بۆ ئەو دیاردەیە هەوەس بازییە نەك ڕەگەزبازی !؟ چونکە پەیوەندیی بە حەز و ئارەزووەوە هەیە نەك ڕەگەز و ڕەگەزبازی

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :چل و یەك

## ئایا مانگ دوو کەرت بووە

دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە ئایەتی یە ك ی **سورەتی القمر** دەگرن کە تێیدا خودای تعالی دەفەرموێت ئاخر زەمان نزیك بوەتەوە و مانگ دوو کەرت بوو . وە دەڵێن ئەم بەسەرهاتە درۆیە و مانگ دوو کەرت نەبووە و هیچ بەڵگەیەکی فیزیکی یان زانستی نییە لەسەر لەت بوونی مانگ . لە بەرامبەریشدا موسوڵمانی سەرلێشێواو هەیە بە ناوی قورئانییەکانەوە دەڵێن ئەو ڕوداوە هێشتا نە هاتووە ، خودا هیدایەتیان بدات بۆ ڕێگای ڕاست با وای دا بنێین ڕاست دەکەن و مانگ دوو کەرت نە بووە !!؟ ئێمەش ئەم شیکارییەی بۆ بکەین .

ئەم ئایەتە مەکییە واتا لە مەکە دابەزیوە و خۆشتان دەزانن موسوڵمانان لە مەکە لاواز و بێ دەسەڵات بوون . ئەم ئایەتەش دەخوێنرایەوە و کافرەکانی قورەیش زۆر لە کافرەکانی ئەمڕۆ و قورئانیەکانیش شارەزا تر بوون لە زمانی عەرەبی

وە دەیـان زانـی ئـەم ئایەتـە بـۆ ئـەو کاتەیـە یـان بـۆ داهـاتووە ئەگـەر لـەو کاتـەدا مانـگ کـەرت نـە بـوو بێـت کەواتـە کافرەکـان دەیـان تـوانی لەوێـدا قورئـان بـە درۆ بخەنـەوە و ئـەو ئایەتـە باشـترین بەڵگـە بـوو بـۆ کافرەکـان کـە قورئـان ڕاسـت نییـە و درۆ دەکـات . وە ئەگـەر بـۆ داهـاتوو بێـت بەهـەمان شـێوە باشـترین بەهانـە بـوو بـۆ کافرەکـان دەیـان گـوت سـەیری محمـد (صـلی الله علیـە وسـلم) وە ئاینەکـەی بکـەن دەڵێـت مانـگ دوو کـەرت دەبێـت . کەواتـە بـە هـەردووك بارەکـەدا ئـەو ئایەتـە لـە مەکـەدا باشـترین بەڵگـە بـووە بـۆ پوچـەڵ کردنـەوەی قورئـان و بنـە بڕکردنـی ئـاینی ئیسـلام لـە سـەرەتای دەسـت پێکیـەوە پاشـان کـە موسـوڵمانان چـون بـۆ مەکـە جولەکـەی لێ بـوو کـە زۆر لـە کـافرانی قـورەیش زیـرەك تـر و بـەتوانا تـر بـوون وە اهلی کیتاب بوون دەیان توانی بەو ئایەتە ئیسلام بنە بڕ بکەن و تەمەنی نەگاتە ١٤٠٠ ساڵ !!

وە هــەروەها منافقــەکانیش لــە مەدینــە بــوون دەیــان تــوانی ئــەم ئایەتــە بقۆزنــەوە بــۆ دژایــەتیی ئــاینی ئیســلامی مــەزن . هـەروەها پـاش مردنـی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) خـەڵکێکی زۆر هـەڵ گەڕانـەوە هـەر دەیـان تـوانی ئـەم ئایەتـە بکـەن بـــــە بەڵگـــــە بـــــۆ زیـــــاد کردنـــــی شـــــوێن کـــــەوتووەکانیان !!..

پاشـان ئـاینی ئیسـلام هاتـە دەرەوەی دورگـەی عـەرەبی وە دوو ئیمپراتۆریـەتی مـەزنی فـارس و ڕۆمیـان بەزانـد کـە خـاوەنی شارسـتانیی گـەورە بـوون . خـەڵکانی شـارەزا و زانـای زۆریـان تێـدا بـوو هـەر دەیـان تـوانی بـەم ئایەتـە ئـاینی ئیسـلام پوچـەڵ بکەنـەوە و ڕزگاریـان بێـت لـەم ئاینـە تازەیـە . یـان خـەڵکیی لێ دوور بخەنـەوە و بڵـێن ئـەوە درۆیـە و مانـگ دوو کـەرت نـەبووە و ئەم قورئانە ڕاست نییە

**پرسیاری سەرەکی ئەمەیە** : بۆچی ئەو هەموو ڕوداوانە ڕووی دا و هیچیان ئەو ئایەتەیان بە درۆ نەخستەوە ؟ ئایا ئەقڵیان پێ نەشکاوە ؟ کاکی دژە ئیسلام تۆ ئێستا ئەقڵت پێ شکا ؟ ئایا کێ زیاتر سودی لە بە درۆ خستنەوەی ئەو ئایەتە وەر دەگرت کافرانی قورەیش یان جولەکە و منافقەکانی مەدینە یان ئەوانەی دوای مردنی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هەڵ گەڕانەوە لە ئیسلام یان شوێن کەوتووانی دوو ئیمپراتۆریەتی مەزن .... یان گرگنێکی نەزانی دژە ئیسلامی وەك تۆ لە ساڵی ٢٠٠٠ دا پەیدا بوویت ؟

**پرسیاری ئەقڵیش ئەمەیە :** فەرموو ١٤٠٠ ساڵ تەرحت دەدەمێ سەرچاوەیەکم بۆ بهێنە ئەو ڕوداوەی بە درۆ خست بێتەوە ؟ ئەگەر سەرچاوەشت لا نییە !! کەواتە ئەو ڕوداوە ڕاستە و مانگیش زەنگیانە نییە بشارڕێتەوە کاتێك دوکەرت بوە هەموو خەڵکی بینیوێتی لە جیهانی ئەو کاتەدا بۆیە نەیان توانیوە بیکەن بە بەڵگە بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئاینی ئیسلامی مەزن . تۆی دژە ئیسلامیش بۆ خۆت سیر بخۆ و کلارنێت لێ بدە یان بەڵگە بهێنە کە ئەو ڕوداوە بە درۆ خراوەتەوە .

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :چل و دوو

## شەیتان چییە یان کێیە ؟

### چۆن شەیتان و بێدین و ابلیس لێك جودا دەکەیتەوە ؟

زۆر جار گاور و بێدینەکان حەدیسی شەیتانمان بۆ دەکەن بە بەڵگە . و گاڵتە بە اسلام دەکەن بۆ نمونە ئەمە چەند حەدیسێکە لەو حەدیسانە

– 1- ئەی ابو هریرة نینۆکەکانت ببرە کە درێژ بوون . چونکە شەیتان دەچێتە ژێریەوە

– 2- سەرقاپی مەنجەڵی خواردنەکانتان داپۆشن کە خوادنی تێدا بوو دەرگاکانتان دابخەن و مەشکەی ئاوە کانتان گرێ بدەن و چراکان بکوژێننەوە چونکە شەیتان ناتوانێت سەرقاپ هەڵ بداتەوە و ئاو بکاتەوە و دەرگا بکاتەوە

– 3- ئەگەر باوێشکتان دا دەست بگرن بە دەمتانەوە چونکە شەیتان دێتە دەمتانەوە

– 4- ئەگەر پارویەك لە دەستتان کەوتە خوارەوە پاکی بکەنەوە پاشان بیخوات و وازی لێ نەهێنێت بۆ شەیتان

ئەگەر ئێمە بەو شێوەیە بیخوێنینەوە ئێمەش وەك موسوڵمان هەمان شت یان لێ تێ ناگەین یان گومانمان لا دروست دەبێت یان گاڵتەی پێ دەکەین !؟ بەڵام کاتی خۆی عەرەبی کافری بت پەرستی قورەیش گاڵتە یان بەم حەدیسانە نە کردوە ؟ وە دەیان توانی بەم حەدیسانە ئاینی اسلام پوچەڵ بکەنەوە و بیکەن بە بەڵگە بۆ ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شێتە یان لە خۆیەوە قسە دەکاتبەلام نەیان توانیوە بیکەن بە بەڵگە !! چونکە شیطان لە زمانی عەرەبیدا ئەسڵەکەی ( شطن) ە واتا دور کەوتنەوە . بۆ نمونە هەر حەبلێك یان گوریسێك کە ئەسپێك یان ئاژەڵێکی تری پێ ببەسرێتەوە بۆ ئەوەی خاوەنی ئەو ئاژەڵە لێی دور بێت و ئاژەڵەکە جوتە ( لوشکە ) یان قۆچی لێ نەدات پێی دەڵێن شطن چونکە گوریسەکە دوری دەخاتەوە لە ئازار و لوشکە و قۆچی ئاژەڵەکە و دەتوانێت سەیتەرە بکات بەسەر ئاژەڵەکەشدا و لێی را نەکات و هەر بە خۆی بێت

وە لە زمانی عەرەبیشدا هەر شتێك زەرەر و زیان بە مرۆڤ بگەیێنێت و دووری بخاتەوە لە سەلامەتی پێی دەڵێن شیطان . لە قورئانیشدا (٤٦) جار باسی شەیتان کراوە . هەر( ٤٦ )جارەکە بە مانای دور خستنەوە و زەرەر و زیانی مرۆڤ هاتوە .بەڵام قورئان بە ناوی ابلیس (١١) جار هاتوە هەر (١١) جارەکە بۆ سەرپێچی هاتوە نەك دور خستنەوەوە کێشەکە لێرەدایە کابرا کە زمانی عەرەبی نازانێت فەرق نێوان ( ابلیس و شیطان ) ناکات کە ابلیس ناوە و شیطان سیفەتە بۆ ابلیس کە کاری ابلیس دوور خستنەوەی مرۆڤە لە هەموو چاکەیەك . وە ئەو حەدیسانەی کە باسی شەیتان دەکات و جوار دانەیمان بە نمونە داناوە هەر هەمووی دەڵێت شەیتان ناڵێت ابلیس . ئەگەر بگوترایە ابلیس ئەوکات کافرانی قورەیش گاڵتەیان بە ئاینی اسلام دەکرد بەلام کاتێك دەڵێت شەیتان

ناتوانن گاڵتەی پێ بکەن چونکە زمانی خۆیانە و دەزانن ابلیس مانای چیە و شەیتان مانای چییە . وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە زمانی ئەو کاتەی خۆیان بە خەڵکی ڕاگەیاندوە میکرۆب چییە ؟ چونکە درێژ کردنی نینۆك چڵك و پیسی دەچێتە ژێر وە ئەو میکرۆبانە دەچنە خواردنەوە یان دەم و لوتەوە کاتێك لوتت یان دەمت پاك دەکەیتەوەوە خەڵکی وەختی خۆی ئەو پیسی و ڕەشیەی ژێر نینۆکی بینیوە و زانیوێتی پیسە وە ئەگەر بیگوتایە ئەوە میکرۆبە کابرا لێی تێ نەدەگەیشت چونکە مایکرۆسکۆب لە ساڵی ١٥٩٠ وە دۆزراوەتەوە و گەیشتوە بەم ئاستەی ئێستا و خەڵکی میکرۆب دەزانێت و دەناسێت . بەلام کابرای عەرەب زانیوێتی ئەو شەیتانە ی ژێر نینۆك پیسیە و ابلیس نییە هەمان شت بە نیسبەت پارو ئەگەر لە دەستت بکەوێتە خوارەوە پاکی بکەرەوە ئەو کات بیخۆ . کابرا دەزانێت ئەو شەیتانەی لەو پاروە دەنیشێت پیسیە وزیانی پێ دەگەێنێت نەك ابلیسە . زۆر جار خۆشمان شتمان لە دەست دەکەوێتە خوارەوە پاکی دەکەینەوە یان ئاوێکی پێدا دەکەین و دەیخۆین دەڵێین میکرۆبی لێ نیشتوە و ئەو میکرۆبەش دور مان دەخاتەوە لە لەش ساغی کابرای عەرەبیش تێگەیشتوە شیطانی ئەو خورادنە واتا پیسی و دوری دەخاتەوە لە لەش ساغی وە بە نیسبەت باوێشکیشەوە هەمان شتە . چونکە کاتێك مرۆڤ باوێشك دەدات میکرۆبی دەرەوە هەڵ دەمژێت بۆیە دەست گرتن بەدەمەوە دەت پارێزێت لەو زیانە و ئەو شەیتانە نایەتە گیانتەوە کە زیانت پێ بگەێنێت و دورت خاتەوە لە لەش ساغی بەلام ( ابلیس ) نایەتە گیانتەوە

وە لە حەدیسی دووەمدا مانای شەیتانمان بە جوانی بۆ دەر دەکەوێت چونکە شەیتان ئەم کارانە دەکات : سەرقاپی خواردنە کانتان داپۆشن چونکە پیسی تێ دەچێت بەلام ئێمە دەڵێین میکرۆبی تێ دەچێت . دەرگاکانتان دا بخەن ئێ باشە شەیتان ئیشت بە دەرگا کردنەوە چییە ؟ و چۆن دەرگا دەکاتەوە ؟ بەلام کاتێك دەرگا دانەخەیت دز دێتە ناوەوە هەموو جۆرە ئاژەڵێك دێتە ژورەوە ئێمە نازانین چی زیانێك بە ماڵەکە دەگەێنێت و چی دەشکێنێت و چی تێك دەدات پاشان مار و دوپشك دێتە ژورەوە و نازانین چوەتە کوێوە و پێوەمان دەدات ! وە زۆر زیانی تریشمان توش دەبێت لە ڕێگای دەرگا دانەخستنەوە . پاشان دەڵێت چراکانتان بکوژێننەوە چونکە کاتێك تۆ چرات داناوە مشکێك یان مارێك خۆی لێ بدات و بیخات ماڵەکەت سوتا ئەگەر ئێستاش ئێمە گڵۆپ نە کوژێنینەوە پارەیەکی زۆرمان بۆ دێت وە دەڵێت مەشکەکانتان ببەستن ، چونکە ئەگەر هەر ئاژەڵێك خۆی لێ بدات ئاوەکەت دەڕژێتوە ماڵەکەت تەڕ دەبێت و زیانت لێ دەدات . ئێستاش پیاوم دەوێت بڕواتە دەرەوە و ئاو نەگرێتەوە !؟ با بزانێت چی زەرەر و زیانێکی لێ دەکەوێت !؟ کەواتە شەیتان لە زمانی عەرەبیدا واتا زەرەر و زیان و دورخستنەوە نەك شەیتانی اسڵی کە ابلیسە ، وە ابلیسیش هەر کاری دور خستنەوەی مرۆڤە لە خودا کەواتە کاری ابلیس شەیتانە و زەرەر و زیانە ئەگینا شەیتان نایەتە ژێر نینۆکەوە و ماڵت ناسوتێنێت و ئاوت بەر ناداتەوە و نەوەستاوە لە بەردەرگا چاوەڕوانی تۆ بکات بچیتە دەرەوە و ئەویش بێتە ژورەوە !؟ وە ڕەخنەی بێ دینەکان لە دوو ڕووەوەیە یان شارەزان و عمدا ئەو ڕەخنانە دەگرن . یان نە شارەزان و فریان بە زمانی عەرەبیەوە نییە ! وە احتمالی دووەمیان تەواوە چونکە ئەگەر بیان زانیایە شەیتان چیە و ابلیس چیە ئەو ڕەخنانەیان نەدەگرت !؟ وە کافرەکانی قورەیش زۆر لە مان ورد تر و شارەزا

تر بوون و دەیان توانی کاتی خۆی اسلام پوچەڵ بکەنەوە یان وا بکەن خەڵکێکی زۆر لە اسلام دور بخەنەوە بەم جۆرە ڕەخنانە . بەلام کابرا زمانی خۆیەتی و دەزانێت بەو جۆرە ڕەخنانە کابرای بت پەرست دەبێت بە گاڵتە جاڕی موسوڵمانەکان و بە نئەمانەش هەر هەمووی بەڵگەن بۆ ڕاستیی پەیامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لە لایەنی خودایەکی زاناوە ئەم پەیامەی بۆ ئێمە گواستوەتەوە و لە زەمانێکی جاهلیدا باسی میکرۆب و پیسایی بۆ کردون کە ئێمە ئێستا دەزانین زەرەر و زیانی ئەو شتانە چییە ؟ وە ئەو ڕەخنانەی کە دژە ئیسلامەکان باسی دەکەن و دەڵێن شەیتان دێنە ژێر نینۆك یان ناو دەمەوە یان هەر حەدیسێکی تر لەسەر شەیتانە و دژە ئیسلام دەی کات بە ڕەخنە لەسەر ئاینی مەزنی ئیسلام هزان لە قەڵەمیان دەدەن کە شارەزا نین لە زمانی عەرەبی بۆیە لە قورئانیش تێ ناگەن و نابن بە موسوڵمان ڕەخنە نین بەڵکو ڕادەی نەزانی و تێنەگەیشتنی کابرای دژە ئیسلامە لە زمانی عەرەبی و ئاینی مەزنی ئیسلام .

••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••••

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :چل و سێ

## بەڵگە چییە کە گۆشتی مالکی کوری نویرە کولێنراوە ؟

یەکێکی تر لەو گومانانە کە دوژمنانی ئیسلام و شیعەکان کە دژی هاوەڵانی پێغەمبەری خوان وبڵاوی دەکەنەوە بەناو خەڵك و دەڵێن کە گوایە **خالیدی کوری ولید** موسڵمانی کوشتووە بەڵگەش بەو ریوایەتە دەهێننەوە کە إمامی طبری گێڕاویەتەوە کە دەڵێت : گوایا خالیدی کوڕی وەلید بە ڕەحمەت بێت مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە و سەرەکەشی کوڵاندووە و خواردوێتی

بۆ وەڵامی ئەم گومانە ئێمەش دەڵێین : لە ئاینی ئیسلامدا عیلمی حەدیس و علم الرجال هەیە کە لە هیچ ئاین و منهجێکی تردا نییە ! علم الرجال واتا گەڕان بە دوای ئەو کەسانەی ئەو بەسەرهاتە یا ئەو ڕوداوە یا ئەو حەدیسەی گێڕاوەتەوە . ێ

ێستا با بزانین ئەو کەسانە کێن ؟ ئەم حەدیسە **ئیمامی طبری** دای ناوە و ئەسڵی حەدیسەکە لەم کەسانەوە وەرگیراوە ( ابن حميد لە سلمةوە لە محمدی کوڕی اسحاق لە طلحةی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ابوبکەی صدیقەوە ) واتا ( ئەو کەسانەی ئەم ڕیوایەتەیان گێڕاوەتەوە ) خەڵکی **درۆزن** و چەواشەکارو کەسانی لاوازی تێدایە و سندەکە پچراوە ، وەموسڵمانان دینەکەیان وەرناگرن تەنها لە فەرمووەدەی ڕاستەوە نەبێت وە ئەو حەدیسە ڕاست نییە و صحیح نییە وە دوو ڕیوایەت هەیە باسی ئەو بەسەرهاتەی خالدی کوڕی ولید دەکات .

وە هۆیەکانی راست نەبوونی گێڕانەوەی ئەو بەسەر هاتە ئەم خاڵانەیە

**هۆی یەکەم** : لە سندەکاندا واتا ئەو کەسانەی گێڕاویانەتەوە محمدی کوری حمید رازیی تێدایە کە یەکێکە لە گێرەرەوەکان کەسێکی درۆزنە وەك إمام إبن حبان دەڵێت: یەکێك بوو لە وانەی کە ناسراو بوو بەوەی ڕوداوەکانی هەڵ دەگێڕایەوە سلمة بن فضلی تێدایە کە زۆر هەڵەی کردووە وەك إمام إبن حجر

**هۆکاری دووەم** : عنعنة یە . عنعنة واتا ( گێڕانەوەی فلان لە فلانەوە ) بۆ نمونە ( عن محمد بن حمید عن سلمة بن فضل عن ... هتد ) وە لەم حەدیسەدا ئەو دوو کەسەی تێدایە کە باسمان کرد وە شتێکی تر هەیە پێی دەڵێن تدلیس واتا (تدلیس لە علم حدیث مانای ئەوەیە کە کەسەکە سندی ریوایەتیك دەداتە پاڵ کەسێك ی تر کە پێی وایە لە ئەوەی گوێ ڵێ بووە) وە لەم حەدیسەشدا مدلسی تێدایەدەڵێت: راستگۆیە بەڵام هەڵەی زۆرە

**هۆکاری سێ** : ئەم گێرانەوەی مرسلة مرسل واتا ئەو کەسەی حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە لە دەمی صحابەوە نەی بیستووە یان ئەوی نە بینیووە . وە لەم حەدیسەدا طلحةی کوری عبدالله ی تێدایە وە ئەویش بە إمامی أبو بکری نەگەیشتووە و کاتی ڕوودانی ئەم ڕووداوە لەسەردەمی ئەو نەبووە بۆیە گێڕانەوەی ئەم بەسەر هاتە لە طلحەوە مرسلة وە حدیثی مرسلیش یەکیکە لە بەشەکانی حدیثی لاواز.

وەك إمام أبو سعیدی علائی دەڵێت: طلحةی کوری عبدالله ی کوری أبو بکر لە باپیرە گەروەیەوە گێراو یەتیەوە أبو بکر ڕەزای خوای لێبێت. وە أبو زرعةش دەڵێت:مرسلة،ئەمەش دیارە کە شاردنەوەی ناوێت

هەروەها ریوایەتێکی تر هەیە کە لە پێش ئەم ریوایەتەیە واتا پێش ڕیوایەتی طبری گێڕاویەتیەوە هەر لە کتێبی(تاریخ الرسل والملوك)ی طبری کە تیایدا هاتووە ئەم ریوایەتەش هەر راست نییە چونکە لە زاری شعیبەوە بۆ سیف و بۆ حزیمة بۆ عوسمان و بۆ سوید گێڕراوەتەوە

وە شعیب ی کوری إبراهیمی کوفی حدیثەکانی لاوازن هەروەها امام إبن حجر دەڵێت: کتێبەکانی(سیف کە کەسیك بووە کتیبی زۆری داناوە ولەناو خەلکی ناسراوە لە کتێبەکانی کتاب الردة وکتاب الفتوح الکبیر) باسی ئەویان کردووە وە بن عدی یش باسی کردووە و دەڵێت : نەناسراوە و حدیث و هەواڵێ زۆری لایە وە هەندێکی نەناسراوە وە هەندکێ تیدایە کە ستەم لە سلف ی ئوومەت دەکات هەروەها :سیف ی کوری عمر الضَّبِّيُّ کە زانایان زۆر قسەیان لەسەری کردووە وەك إمام شمس الدین ذهبی دەڵێت: عباس لە یحیی دەڵێت : حەدیسەکانی لاوازە، وە لە مطین یش کە لە یحیی دەڵێت :هیچ خێری پێوە نییە

وە أبو داود دەڵێت : هیچ نییە. إبن حبان دەڵێت:تۆمەتبار کراوە بە بێدینی

أبو حاتم دەڵێت : تەرك کراوە. ابن عدی دەڵێت:بەگشتی حدیثەکانی نەناسراون

مكحول بيروێتى كه له جعفرى كورى أبان دەڵێت گوێم لێبوو ابن نمير دەيگوت سيف الضبي تميمي به درۆ دەيگوت كەسێك له بنى تميم واى پێووتم (مەبەستى له گێرانەوەى حديثە) وه سيف الضبي حديثى ون دەكرد وه تۆمەتبار كراوە به بێدينى.

هەروەها حزيمةى كورى ثابتى عقفانيى تێدايه حال و وەزعى نەزانراوە وه هيچم نەبينيوه لە بارەى باسكردنى ژيانى تەنا ئەوە نەبێت إمام إبن ماكولا لە إكمال باسى كردووه . وه له كتێبى إمامى طبرى به خزيمة ناوى هاتووە بەڵام هەلەى نوسينەوە بووە.

إمام ماكولا لە بارەى حزيمة دەڵێت (وأما حزيمة أوله حاء مهملة مفتوحة بعدها زاى مكسورة فهو حزيمة ابن شجرة العقفاني عن عثمان بن سويد عن سويد بن مثعبة الرياحي قال: قدم خالد بن الوليد البطاح حديث مالك بن نويرة روى عنه سيف بن عمر)

**هۆكارى چوارەم**: عثمان ى كورى سويدى جذامى ئەويش حال و وەزعى نەزانراوە.

وه حزيمة و عثمان هەردووكيان حال و وەزعيان نەزانراوە وه گێرانەوە لەوانەش لاى ئێمە رەت كراوەتەوە.

وەك امام ابن صلاحى شارزورى دەڵێت(نەزانراوى دادپەروەرى لە رووى شاكراو پەنهانەوە بەگشتى وەگێرانەوەى نەزانراو قەبوڵ نييە لە لاى زانايان)

**پێنجەم**: چيرۆكەكە بە پێچەوانەى گێرانەوە راستەكانە

له گێرانەوەكە دەڵێت إمامى أبو بكر وتوويەتى(ئەگەر گوێتان لە بانگ نەبوو ئەوا هێرش دەست پيبكەن وه بكوژن و بسوتێنن.! لەگەڵ ئەمەش ژياننامەى إمامى أبو بكر پێچەوانەى ئەمە دەڵێت : چونكە كاتێك يەكەم سوپاى ئامادە كرد بۆشام بە سوپاكەى گوت : ئەم (١٠) شتە مەكەن ژن و منداڵ و گەورە و پەك كەوتە مەكوژن . دارى بەر دار مەبڕن . شوێنى ئاوەدان وێران مەكەن . مەڕو ماڵات مەكوژن . دار خورما مەسوتێنن و وشكى مەكەن . مەترسن و زيادە ڕۆى مەكەن . كەواتە چۆن ابوبكرى صديق فەرمان دەكات بە كوشتنى موسوڵمان وه دەڵێت گوێتان لە بانگ نە بو بيان كوژن !؟

وه هەروەها سيف(سيف كورى عمر) خۆى لە گێڕانەوەكەيدا دەڵێت كە أبوبكرى صديق رەزاى خواى لەسەربێت فرمانى پيكردووه بە ميهرەبانى و دڵنەرمى هەر لەسەرەتاوە فرمانيان پيدەكات كە كەس نەكوژن... باشە سيف چۆن دووحالەت لە إمامى أبو بكر دەگێڕێتەوە جاريك فرمان بە كوشتن و سووتان و جاريك بە نەكوشتن و دڵ نەرمى؟!

هەروەها : ئەم چيرۆكە هيچ عەقڵيك باوەرى پێناكات!

دەڵێم ئەم گێرانەويە عەقل باوەرى پيناكات چونكە ريوايەتەكە دەڵێت پرچى مالك بۆماوەيەكى زۆر هەر بەداگيرساوى مابۆوە(لەكاتى سووتاندنى)بەڵام پێدەچيت سيف ى رافضى درۆزن لە كاتى دروست كردنى ئەم ژيرۆكە لە بيرى چووبێت كە پرچى مرۆڤ هەر كە ئاگرى لێ نزيك بێتەوە راستەوخۆ هەلدەكروزيت و

نامێنیــت نــەوەك بــۆ ماوەیــەکی زۆر بــە داگیرســاوی بمێنێــەوە!بەڵام ئــەم درۆزنانــە هــەردەم درۆ دەکــەن دوای ئــەوە خــوای گــەورە لــە خراپتــرین کارەکانیــان ئاشــکرایان دەکــات بــەجۆرێك هــەر کەســێك دەتوانیــت درۆکانیــان ئاشکرا بکات.

لــە کۆتایشــدا لەوانەیــە بپرســین بــۆچی إمــامی طبــری ئــەم جــۆرە ریوایەتانــە لــە کتێبەکــەی بــاس دەکــات؟ هەنــدێك کــەس دەپرســن بــۆچی بــۆچی إمــامی طبــری ئــەم جــۆرە ریوایەتانــە لــە کتێبەکــەی بــاس دەکــاتن کــە لاوازن بــەم شیوەیە؟وە دەشڵێن موسڵمانان پابەندن بەهەموو ئەوانەی لە نێوکتێبەکاندا هاتووە؟

لــەوەڵامــدا دەڵێم:کۆمــەڵێك لــە زانایــان مــەرجی دانــاوە کــە دەبیــت گێرانەوەکــە راســت بێــت ئــەوجا لــە کتێبــەکانی خــۆی باســی بکات وەك إمامی بخاری وای کردووە لە صحیحەکەیدا.

وە بەشێکی تر لە زانایان هەلساون بە نوسینەوە هەموو ئەو ریوایەتانەی کە لایان بووە یان گوێیان لێبووە بەر لەوەی حوکمی لەسەربدات ئایا ئەو گێرانەوەیە راستە یاخود نا وەك إمامی طبری و کەسانی تریش خوای گەروە لە هەموویان رازی بێت. خۆ ئەگەر پرسیارکەر سەیری پێشەکی کتێبەکیە إمامی طبری (تاریخ رسل والملوك) بکاتن وەڵامی ئەو پرسیارەی لادەست دەکەویت کاتێك إمامی طبری دەڵێت

**(ئەوەی لەم کتێبەم دایە لە هەوالی پێشینیان و رابردووان خوێنەر هەندێکی لاسەیرەو نایناسێت، یاخود گوێگر بەکاریکی زۆرخراپ و قێزەونی دەزانیت لەبەر ئەوەی ئەو هیچ روویەکی راستی بۆ ئەو باسە نەزانیوە و هیچ مانایەکی نییە لە راستیدا با بزانێت لە راستیدا ئێمە ئەو باسانەمان دانەهێناوە بەلکو ئەوانەمان لە پێش خۆمانەوە نەقڵ کردووەو هیناومانە،وە ئێمە ئەوەی بۆمان هاتووە وەکو خۆی باسمان کردووە)**

لەو قسانەوە بۆمان دەردەکەوێت إمامی طبری مەرجی دانەناوە کە ئایا ئەو رووداوە ڕاستە یان نا تا بینوسێەوە وە نەشی وتووە ئەوەی لەم کتێبە دایە هەمووی راستە بەلکو بە پچەوانەوە وتوویەتی کە ریوایەیت ناراستیشی تێدابیە.

کەواتە ئەو کەسەی ئەو گومانەی دروستکردووە چۆن چۆنی پیمان دەڵێت ئیمەی موسڵمانان دەبی پابەند بین بە هەموو ئەو باسانەی لە نێ، کتێبەکاندا هاتوون؟

# پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :چل و چوار

## ئایا ابوبكری صدیق جنێوی داوە ؟

شــبهەیەك یــان گومانێــك هەیــە بــڵاوی دەكەنــەوە گوایــا پێغەمبــەر (صــلی الله علیــە وســلم) لەگــەڵ هــاوەڵانی جنێــو فــرۆش و دەم پــیس بــوون بــە تایبــەتی ابــو بكــری صــدیق كاتێــك جنێــوی داوە و پێغەمبــەریش (صــلی الله علیــە وســلم) بــێ دەنــگ بــووە بۆیــە دوژمنــانی اســلام دەڵــێن اســلام و پێغەمبەرەكــەی جنێــو فرۆشــن وە جنێــو دەدەن و دەڵێن

اعضض ببضر اللات . ( **اعضض واتا بیگەزە** ) ( بضر ئەو گۆشتە زیادەیەیە كە لە ناو گەڵی ئافرەتدایە بە كوردی پێی دەڵێن (قیتكە یان میتكە ) وە ( لات ) یەكێكە لە خوداوەندەكانی قورەیش بوو كە ثقیف دەی پەرست . وە دەڵێن بۆیە ناو نراوە اللات چونكە مێینەی خودایە ( الله ) هائەكەیان لا بردووە و ( ت ) یان لە جێگای داناوە بووە بە اللات وە دەڵێن ئەم لاتە ناوی پیاوێك بوە گەنمی هاڕیوە و وەك ناو ساجی دروستی كردوە و داویەتی بە حاجیەكان كە هاتون بۆ حەج بە عەرەبی واتا كان یلت للحجیج لذا سموە لات وە اعضض ببظر اللات واتا بڕۆ گاز بگرە لەو گۆشتە زیادەیەی ناوگەڵی لات. لە صولحی حدەیبیەدا عروة بن مسعود الثقفي كە سەرگەورەی ثقیف بوو زۆر جنێوی دا بە موسوڵمانان ابو بكر ی صدیق (ر.ض) وەڵامی دایەوە گوتی ( بڕۆ گۆشتی زیادەی ناو گەڵی لات بگەزە) مەبەستی ابو بكر ی صدیق ئەوەیە دەبێت وەڵامی ئەو جنێو سوكایەتیانە بدرێتەوە كە عروة پێی داون . بەڵام بە شێوەیەك بێت وانەی لێ وەر بگرێت نەك سوكایەتی بكات بەو كەسە بە جنێودان !؟ چونكە كافرەكانی قریش بتە گەورەكانیان وەك ( اللات ) بە مێ دادەنا و كەچی خۆشیان مێیان زیندە بەچاڵ دەكرد بۆیە ابو بكر پێی دەڵێت بڕۆ قیتكە یان میتكەی اللات بمژە بۆ ئەوەی عروة كە گەورەی قەومەكەی بوە بیر بكا تەوە ئایا خودا وەندەكەی نێرە یان مێیە ؟

ئەو قسەیە جنێو نییە بەڵكو مەسەلەیێكی جاهیلەكانی قورەیش بووە ؟ وەك چۆن لای خۆمان مەسەل هەیە بە كەسی نەزان دەگوترێت گا بە گوندا دەناسێت یان ڕۆستەم نێر بوو یان مێ بوو !؟ ابو بكر یش بە زمانی ئەمڕۆمان پێی دەڵێت : ئایا لات نێرە یان مێیە تۆ ئەو دوژمنایەتیەمان لەگەڵدا دەكەیت و جنێومان پێ دەدەیت لەسەر لات . كەچی خۆشتان نازانن لات نێرە یان مێیە ؟

پاشان لات بتێكی بێ گیانە نە نێرە و نە مێیە ؟ هەروەها دوای ئەو ڕوداوە عروة بوو بە وسوڵمان و یەكێكە لە صحابە ناودارەكانی اسلام . ئەوانەی ئەو شبهەیە بڵاو دەكەنەوە و دەڵێن پێغەمبەر و صحابەكان جنێویان داوە نە شارەزان لە مەسەلە عەرەبیەكاندا و لە بتەكانی قورەیشدا یان دوژمنی اسلامن یان خۆیان كەسێكی دەم پیسن.

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :چل و پێنج

## ئەم نامەیە لە کوێیە ؟



پاسخ یزدگرد



نامه عمر

دژە ئیسلامی کورد نامەیەك بڵاو دەکەنەوە . گوایا نامەی یزدگردی ئیمپراتۆری فارسی ئاگر پەرستە بۆ خەلیفەی ئیمانداران عومەری کوڕی خطاب . وە گوایا ئەو نامەیە هەڕەشە و سوکایەتییە بۆ خەلیفەی موسوڵمانان وە ئێمە دەقی نامەکەتان بۆ ترجمە ناکەین . چونکە هیچ نییە و سوکایەتییەکی بێ مانای تێدایە وە هێندە گرنگ نییە و نامەکەش بوونی نییە هەتا ڕاستییەکانتان بۆ وەرگێڕین بۆ کوردی وەك لە وێنە کەدا دەبینن ئەوە وێنەی نامە ئەسڵییەکەیە . ئەمەش بەڵگەیە کە ئەو نامەیە ماوە و وێنەی گیراوە لە زەمانی کامێرادا دەبێت ئێستا پارێزراو بێت لە یەکێك لە مۆزەخانە جیهانییەکاندا . یان لە یەکێك لە وەزارەتەکان لە دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی جیهان . مادام بۆ خەلیفەی موسوڵمانانیش نێردراوە . کەواتە دەبێت ئەو مۆزەخانەیەی ئەو نامەیەی پاراستووە یان ئیسلامی بێت . یان لە یەکێك لە وڵاتە ئیسلامییەکانەوە وەری گرت بێت

چونکە نامەی جاران یە ك نوسخە بووە . لە یزدکرد نوسراوە و گەیشتووە بە دەست شێری ئیسلام خەلیفە عومەر پرسیارەکە زۆر ئاسانە : بێزەحمەت پێمان بڵێن ئەو نامەیە لە چی مۆزەخانەیەك هەیە ؟ لە زەمانی ئێستا ئینتەرنێت هەیە و دەتوانین بە کلیکێك هەمووومان بچینە ناو هەموو مۆزەخانەیەك و دڵنیا بین لەوەی ئەو نامەیە ڕاستە.

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :چل و شەش

## سلمة بن قيس الاشجعى کێيه ؟

الموسوعة الشاملة

www.islamport.com

بحث في الصفحة الحالية

پرسیاره بێ وەڵامەکان 44 سلمة بن قيس الاشجعي کێيه ؟

الكتاب : البداية والنهاية

مصدر الكتاب : موقع يعسوب

[ ترقيم الكتاب موافق للمطبوع ]

بوجوه مقبولة فسمعها عمرو قبلها، ورده إلى عمله وعذر ضبة فيما تأوله ومات عمر، وأبو موسى على صلاة البصرة.

خبر سلمة بن قيس الاشجعي والاكراد بعثه عمر على سرية ووصاه بوصايا كثيرة بمضمون حديث بريدة في صحيح مسلم " اغزوا بسم الله قاتلوا من كفر بالله " الحديث إلى آخره، فساروا فلقوا جمعا من المشركين فدعوهم إلى إحدى ثلاث خلال (1)، فأبوا أن يقبلوا واحدة منها، فقاتلوهم فقتلوا مقاتلتهم، وسبوا ذراريهم، وغنموا أموالهم. ثم بعث سلمة بن قيس رسولا إلى عمر بالفتح وبالغنائم، فذكروا وروده على عمر وهو يطعم الناس، وذهابه معه إلى منزله، كنحو ما تقدم من قصة أم كلثوم بنت علي، وطلبها الكسوة كما يكسى طلحة وغيره أزواجهم، فقال: ألا يكفيك أن يقال بنت علي وامرأة أمير المؤمنين ؟ ثم ذكر طعامه الخشن وشرابه من سلت، ثم شرع يستعلمه عن أخبار المهاجرين، وكيف طعامهم وأشعارهم، وهل يأكلون اللحم الذي هو شجرتهم، ولا بقاء للعرب دون شجرتهم ؟ وذكر عرضه عليه ذلك السفط من الجوهر، فأبى أن يأخذه وأقسم على ذلك، وأمره بأن يرده فيقسم بين الغانمين.

وقد أورده ابن جرير مطولا جدا.

وقال ابن جرير: وفي هذه السنة حج عمر بأزواج النبي صلى الله عليه وسلم، وهي آخر حجة حجها رضي الله عنه.

قال: وفي هذه السنة كانت وفاته.

دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئاینی ئیسلام هاتووه و کوردی لەناو بردووه . بەڵگەشیان بۆ ئەو باسە کتێبی البداية و النهاية ١٥٠/ ٧ کە دەڵێت : عومەری کوڕی خطاب صحابی **سلمة بن قيس الاشجعي** ناردووه کوردی ئیبادە کردووه . و سەیری وێنەکە بکەن هەواڵەکەی تێدایە وەك خۆی کە نوسراوه . و بە خەتی سور هەواڵەکەمان دەست نیشان کردوه بۆتان .

پرسیارەکانیشمان ئەمانەیە هەواڵەکە دەڵێت ( سرية ) یەکی ناردووه . ئایا سریەیەك چەند کەسە ؟ لە ئێستادا سریەیەك پێك هاتووه لە **سێ** بۆ **پێنج** بەش وه ژمارەیان لە نێوان( ٦٠ بۆ ١٩٠ )کەسە و نەقیبێك کە سێ ئەستێرەی هەیە دەیان بات بەڕێووە ئەی ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش سریەیەك چەند کەس بوون ؟ ئەم سریەیە لە کوێ شەڕیان کرد و لە چی ناوچەیەکی کوردوستان بوون ؟ چەند کەسیان کوشت ؟ ئایا سریەیەك دەتوانێت هەموو کوردوستان بگرێت و بیکوژێت ؟

ئەمەش سەرچاوەی هەواڵی وێنەکەیە لە کتێبی البداية و النهاية بەشی ٧\١٥٠

http://islamport.com/w/tkh/Web/927/2603.htm

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :چل وحەوت

## ئایا پێغەمبەر (د.خ) ویستویەتی انتحار بکات ؟

ئایا پێغەمبەر (د.خ) ویستویەتی انتحار بکات ؟

الراوي : عائشة أم المؤمنين المحدث : البخاري المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم: 6982 خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

أولُ ما بُدِئَ به رسولُ اللَّهِ صلّى اللهُ عليه وسلّم من الوَحْيِ الرؤيا الصادِقةُ في النَّوْمِ، فكان لا يَرى رؤيا إلا جاءتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ فكان يأتي حِراءً فيَتَحَنَّثُ فيه، وهو التَّعَبُّدُ، الليالِيَ ذواتِ العَدَدِ، ويَتَزَوَّدُ لذلك، ثم يَرْجِعُ إلى خديجةَ فتُزَوِّدُهُ لمِثْلِها حتى فجِئَهُ الحقُّ وهو في غارِ حِراءٍ، فجاءه المَلَكُ فيه فقال اقرا فقال له النبيُّ صلّى اللهُ عليه وسلّم :( فقُلْتُ: ما أنا بقارِئٍ فأخَذَني فغطَّني حتى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثم أرْسَلني فقال اقرأ فقُلْتُ: ما أنا بقارِئٍ فأخَذَني فغطَّني الثانيةَ حتى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثم أرْسَلَني فقال: اقرأ فقُلْتُ: ما أنا بقارِئٍ، فأخَذَني فغطَّني الثالثةَ حتى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثم أرْسَلَني فقال: اقرأْ باسْمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَقَ حتى بَلَغَ - {عَلَّمَ الإنْسانَ ما لَمْ يَعْلَمْ} فرَجَعَ بها تَرْجُفُ بَوادِرُهُ، حتى دَخَل على خديجَةَ، فقالَ «زَمِّلوني زَمِّلوني» فزَمَّلوه حتى ذهب عنه الرَّوْعُ، فقال: «يا خديجَةُ، ما لي» وأخْبَرَها الخبرَ، وقال: «قد خَشِيتُ على نفسي» فقالتْ له: كَلّا أبْشِرْ، فواللَّهِ لا يُخْزِيكَ اللَّهُ أبدًا إنك لَتَصِلُ الرَّحِمَ وتَصْدُقُ الحديثَ، وتَحْمِلُ الكَلَّ وتَقْرِي الضيفَ وتُعِينُ على نوائبِ الحَقِّ، ثم انطلَقتْ به خديجةُ حتى أتَتْ به وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أسَدِ بْنِ عَبْدِ العُزّى بْنِ قُصَيٍّ وهو ابْنُ عَمِّ خديجةَ أخو أبيها، وكان امْرَأً تَنَصَّرَ في الجاهليةِ وكان يكْتُبُ الكتابَ العربيَّ فيَكْتُبُ بالعربيةِ من الإنجيلِ ما شاءَ اللَّهُ أن يَكْتُبَ، وكان شَيْخًا كبيرًا قد عَمِيَ، فقالتْ له خديجةُ: أي ابْنَ عَمِّ اسمعْ من ابنِ أخيكَ فقال ورقةُ: ابنَ أخي ماذا تَرى؟ فأخبَرَهُ النبيُّ صلّى اللهُ عليه وسلّم ما رأى، فقال ورقةُ: هذا النّاموسُ الذي أُنزِلَ على موسى، يا لَيْتَني فيها جَذَعًا، أكونُ حَيًّا حين يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. فقال رسولَ اللهِ صلّى اللهُ عليه وسلّم : أوَمُخْرِجِيَّ هم فقال ورقةُ نعم لم يَأْتِ رجلٌ قَطُّ بمِثْلِ ما جِئْتَ به إلا عودِيَ، وإن يُدْرِكْني يَوْمُكَ أنْصُرْكَ نصرًا مُؤَزَّرًا ثم لم يَنْشَبْ ورقةُ أن تُوُفِّيَ وفَتَرَ الوَحيُ فَتْرَةً حتى حَزِنَ النبيُّ صلّى اللهُ عليهِ وسلم فيما بَلَغَنا حُزْنًا غدا منه مِرارًا كَيْ يَتَرَدّى من رُءُوسِ شَواهِقِ الجبالِ فكلما أوْفى بذِرْوَةِ جبلٍ لكي يُلْقِيَ منه نفْسَه تَبَدّى له جبريلُ، فقال: يا محمدُ، إنك رسولُ اللَّهِ حقًّا، فيَسْكُنُ لذلك جَأْشُهُ وتَقِرُّ نفْسُهُ فيَرْجِعُ فإذا طالتْ عليه فَتْرَةُ الوَحْيِ غدا لمِثْلِ ذلك، فإذا أوْفى بذِرْوَةِ جبلٍ تَبَدّى له جبريلُ فقال له مِثْلَ ذلك

حەدیسێك هەیە لە صحیحی بوخاریدا باس کراوە و حەدیسەکەش صحیحە وەك لە وێنەکەدا دەبینن دەقی حەدیسەکە بە زمانی عەرەبی دانراوە لەگەڵ ئاستی راستییەکەی و ژمارەکەشی . لەم حەدیسەدا دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چەند جارێك ویستویەتی خۆی بکوژێت و لەسەر شاخی بەرزەوە خۆی فرێ بداتە خوار ئێمەش جارێ دەقی حەدیسەکەتان بۆ دەکەین بە کوردی پاشان بۆتان ڕون دەکەینەوە گومانە کە لە کوێدایە ؟

ئەمەش دەقی حەدیسەکەیە بەکوردی

سەرەتای وەحی بە خەون دەستی پێکرد هەرخەونێکی ببینیایە بۆ بەیانی دەهاتە دی . وە دەچوو بۆ ئەشکەوتی حەرا و نانی لەگەڵ خۆی دەبرد کاتێك نانەکەی تەواو دەبوو دەفەڕایەوە خدیجە نانی تری دەداێ و دەچووەوە بۆ ئەشکەوتەکە هەتا ئەو کاتەی فریشتەیەك هات بۆ لای گوتی بخوێنە . ئەویش گوتی من ناتوانم بخوێنم !! گوشیمی گوتی بخوێنە ؟ منیش گوتم ناتوانم بخوێنم .

جارێکی تر گوشیی گوتی بخوێنە واتا سورەتی **اقرء ی** هەمووی پێ گووت هەتا گەیشتە ( **علم الانسان ما لم يعلم** ) کاتێك گەڕایە ماڵەوە دەلەرزی گوتی دام بپۆشن دام بپۆشن . کاتێك هاتەوە سەر خۆ گوتی ئەی خەدیجە چیمە ؟ ئەویش بۆی گێڕایەوە چی ڕووی داوە و بردی بۆ ماڵی ورقەی کوڕی نوفل کە ئامۆزای خدیجە بوو . ورقەش بوبوو بە مەسیحی وە بە زمانی عەرەبی ئینجیلی دەنوسییەوە تەمەنی زۆر بوو کوێر بو بوو . خەدیجەش گوتی گوێ بگرە بزانە چی ڕوی داوە ؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە . وەرەقەش گوتی ئەوەی تۆ بینیوتە ئەو شەریعەتەیە کە بۆ موسا دابەزیوە هەروەها گوتی خۆزگەم دەژیام هەتا پشت گیریم بکردیتایە لە کاتێکدا قەومەکەت دەرت دەکەن ؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتی ئایا دەرم دەکەن ؟ ئەویش گوتی بەڵێ . چونکە هەر کەسێك ئەو شتەی پێ درا بێت کە بە تۆ دراوە بەرەنگاریی دەکەن . وە پێغەمبەر (د.خ) زۆر خەمناك بوو . پاشان وەرەقە مرد هەروەها وەحی بۆ ماوەیەك وەستا وای لێ هات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆری پێ ناخۆش بوو کە وەحی وەستاوە ( پێیان ڕا گەیاندین ) چەند جارێك دەی ویست لەسەر شاخی بەرز خۆی فرێ بداتە خوارەوە و خۆی بکوژێت جبریلی بۆ دەر دەکەوت پێی دەگوت : ئەی محمد تۆ بە ڕاستی پەیام بەری خودایت . ئەویش هێور دەبووەوە . و خۆی نە دەکوشت پاش ماوەیەکی تر دەی ویست خۆی بکوژێت بە هەمان شێوە جبریل بۆی دەر دەکەوت و هێوری دەکردەوە.

بەڕێزان لێرەدا حەدیسەکە تەواو بوو . با ئێستا ئەو گومانە پوچەڵ بکەینەوە بە ئیزنی خودا

وەك دەبینن ئەم ڕوداوە لە سەرەتای وەحیدا بووە . پێغەمبەر (د.خ) نەی زانیوە وەحی چییە ؟ چونکە یە ك جار جبریلی بینیووە و ترساوە و لەرزی لێ هاتووە کەواتە بۆچی انتحار دەکات بۆ شتێك کە نەزانێت چیە ؟ پاشان هەموو جارێك کە ویستویەتی خۆی بکوژێت جبریلی بۆ دەر کەوتووە هێوری کردۆتەوە !! کەواتە ئەو قسەیە ئەسڵ و ئەساسی نییە کە بڵێن چونکە وەحیی لێ بڕاوە ویستویەتی خۆی بکوژێت ... ئەی خۆ هەموو جارێك جبریل نەی هێشتووە خۆی بکوژێت ... بەلام ئەو جبریلی بینیووە . مادام بینیوێتی چی پێویست دەکات خۆی بکوژێت لە کاتێکدا هۆکاری خۆ کوشتنەکەی ئەوە بوە جبریل نایەت بۆ لای ؟پاشان هەر بوخاری خۆی ئەم حەدیسەی لە حە وت شوێنی تر باس کردوە . بەڵام بە تەنها لە یە ك شوێندا باسی ئەم خۆ کوشتنەی کردووە ئەویش لە کتێبی ( الايمان ) باب بدء الوحي باسی ئەم زیادەیەی کردووە واتا باسی خۆ کوشتنەکەی کردووە لەسەر شاخی بەرزەوە . ئەی بۆچی بوخاری لە **شەش** حەدیسەکەی تردا باسی ئەم زیادەیەی نە کردوە ؟ وە هەر حەدیسەکە خۆی وەڵامی گومانەکەی تێدایە و بوخاری دای ناوە بۆمان بەڵام خەڵکی نە شارەزا و دوژمنانی ئیسلام یان تێی ناگەن یان بە عمدا گومان بڵاو دەکەنەوە . چونکە لە سەرەتای خۆ کوشتنەکەدا نوسراوە ( فيما بلغنا واتا وەك پێیان ڕاگەیاندوین ) لێرەوە قسەی یەکێك لە حەدیس گێڕەرەوەکانە کە ناوی الزهرييە . وە زهری یەکێك بووە لە تابعییەکان و عائشەی نە بینیوە !! و زانایانی علمی حەدیس و **جرح و تعديل** لێیان کۆڵیوەتەوە دوو کەسی تر لە گێڕرانەوەکەدان یونس و معمر وە ئەو زیادەی خۆ کوشتنە هی ئەو دوو کەسەیە کەواتە حەدیسەکە تا دەگاتە

خۆ کوشتنەکە تەواوە و صحیحە وە لەوێوە بوخاری خۆی نوسیویێتی زهری دەڵێت وەك پێیان ڕا گەیاندووین . لەوێوە قسەی زهریە نەك عائشة یان خەڵکانی تر کە لە سندەکەدان .

لەوانەیە بپرسن بۆچی بوخاری لە کتێبەکەیدا باسی کردوە ؟ و بە صحیح لە قەڵەمی داوە ؟

وەلام : وەك لە حەدیسەکەدا دەبینن بوخاری نوسیویێتی ( فیما بلغنا ) لە زمانی زهریەوە . کەواتە خەڵکی شارەزا دەزانێت لەوێوە قسەی زهریە و باقی حەدیسەکە صحیحە . بەڵام خەڵکی نەشارەزا یان خەڵکان کە دژایەتی ئیسلام دەکەن خۆیان لا دەدەن لەو ڕاستیە. وە باس کردنی ئەو ڕوداوە لە لایەن بوخاریەوە بەڵگەیە بۆ راست و دروستی ئەو پیاوانەی حەدیسیان بۆ گواستوی نەتەوە . و ئەوەی بیستویانە وەك خۆی نوسیویانە . بەڵام تێبینی خۆشیان داناوە بۆ ئەوەی خەڵك تێ بگات لە مەخسەدیان . وەك دەبینن لە حەدیسەکەدا کاتێك گێڕانەوەکە دەچێتە زاری زهری بوخاری نوسیویێتی ( فیما بلغنا ) واتا وەك پێیان ڕاگەیاندوین ئەم ڕوداوەش هەیە لە کاتی وەحی وە فلان کەس وا دەڵێت . ئەمەش ئەمانەتێکی عیلمیی ئەو زانا پایە بەرزانەیە کە بە ڕاستی و دروستی هەموو شتێکیان بۆ نوسیوین.

---

## پرسیارە بێ وەلامەکان ژمارە :چل وهەشت

## یاجوج و ماجوج لە کوێن ؟




دژە ئیسلامەکان گاڵتە بە چیرۆکی یاجوج و ماجوج دەکەن کە لە سورەتی الکهف و الانبیائدا ناویان هاتووە . ئەو قەومە ذي القرنین بەندی کردون لە ژێر زەویدا . واتا ئەوان لەسەر زەوی نین بەڵکو لە ژێر زەوین . بەڵام دژە ئیسلامەکان دەڵێن بۆچی تا ئێستا گوگڵ نەی توانیوە کەشفیان بکات ؟

لە کاتێکدا گوگڵ لە ئاسمانەوە دەتوانێت نەخشەی هەموو زەوی بکێشێت ؟

وەڵام : یاجوج و ماجوج لە ژێر زەوین ، گوگڵ یان مانگە دەست کردەکان چۆن دەتوانێت بیان بینێت لە ژێر زەویدا و وێنەیان بگرێت یان شوێنیان دیاری بکات ؟ پاشان لەسەر زەوی چەندەها شوێن هەیە مرۆڤ نازانێت و دەرکی پێ نە کردووە . یەکێك لەو شوێنانە ئەشکەوتی هانگ سۆنگ دۆنگە لە ڤیتنام کە خەڵکێکی گوند نشینی ئەو ناوچەیە ساڵی ١٩٩١ بە سودفە کەشفی کردووە . وە ساڵی ٢٠٠٩ تیمێکی بریطانی چونەتە ناو ئەشکەوتەکەوە و زانیاریی زیاتریان دەست کەوتووە

**پرســیاری بــێ وەڵامـمــان** ئەمەیە : ئەو ئەشکەوتەی ڤێتنام بە حسابی بێدین بێت (١٣) ملیار ساڵە هەیە بۆچی( ٢٥ )ساڵە دۆزراوەتەوە ؟ خۆ ئەو ناوچەیەش ئاوەدانییە و خەڵکی لێیە بۆچی (١٣ ) ملیار ساڵە کەس ئەو ئەشکەوتەی نە بینیوە ؟ بە شەرتێك ئەشکەوتەکە (٢٠٠ مەتر قوڵە ٦ کیلۆمەتر و نیە درێژە و ١٥٠ مەتر پانە )وە ڕوباریشی تێدایە لەژێر زەویدا وە سەوزایی و داریشی تێدایە . واتا هەمو جۆرە پێدا ویستییەکانی ژیانی تێدایە

پاشان هەر دوور مەڕۆن ئەشکەوتی هەزار مێرد لە کوردوستان تا ئێستا کەس تێی نەچووە و هیچ نازانین دەربارەی ! کابرای بێدین و زانست خواز بۆچی ناچیت کشفی بکەیت بزانیت چی تێدایە ؟ وە هەزارەها شوێنی تریش هەیە لە جیهاندا لەو شێوەیە بەرەو قوڵایی زەوی دەچێت و ئێمە نازانین لە کوێدایە ؟ فەرموو دژە ئیسلام ئەو شوێنانەمان بۆ کشف بکە و قورئان بە درۆ بخەرەوە ؟

وە زۆر کەس دەڵێن یاجوج و ماجوج لە تەورات و ئینجیلیشدا باس کراوە بە ناوی ( جوج ماجوج یان گوگ ماگۆگ ) لە پەیمانی کۆندا سفری حزقیال بەشی ٣٨ و ٣٩ وە لە پەیمانی تازەشدا لە سفری یوحنا اللاهوتی بە شی ٢٠ دەقی ٨ دا ناویان هاتووە . بەڵام ئەو چیرۆکەی کتێبی پیرۆز نە لە دوور و نە لە نزیك پەیوەندییان نییە بە یاجوج و ماجوج کە لە قورئاندا هاتووە و باسێکی ترە . هەر کەس دەڵێت هەمان باسە با بە سەرچاوە و تفسیری جولەکە یان گاور بۆمان بسەلمێنێت

خۆشتان دەتوانن زیاتر بگەڕێن دەربارەی ئەو ئەشکەوتە . و ئەوە لینکی ڤیدیۆیەی دامان ناوە تازەیە هی ٢٠١٥ یە !! ئەمەش لە سایدی باوەڕ پێکراوی ناشیونال جیوگرافی باسی ئەو ئەشکەوتە دەکات

http://ngm.nationalgeographic.com/2011/01/largest-cave/peter-photography#/09-forest-cave-entrance-714.jpg

لەم لینکەشدا نەخشەی ئەو ئەشکەوتەی تێدایە لەگەڵ چەند وێنەیەك

http//:www.sondoongcave.org/

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :چل ونۆ

## ئایا پێغەمبەر (د.خ) ناوی قثم بووە ؟

قثم (لسان العرب)

قَثَم الشيءَ يَقْثِمه قَثْماً واقْتَثَمه: جَمَعه واحترفه.

ويقال: قَثام أَي اقْثِم، مطرد عند سيبويه وموقوف عند أَبي العباس.

ورجل قَثُومٌ: جَمّاع لعياله.

والقُثَم والقَثوم: الجَموع للخير.

ويقال في الشر أَيضاً: قُثَم واقْتَثَم.

ويقال: إِنه لقَثُوم للطعام وغيره؛ وأَنشد: لأَصْبَحَ بَطْنُ مَكةَ مُقْشَعِرّاً، كأَنَّ الأَرضَ ليس بها هِشامُ يَظَلُّ كأَنه أَثناءَ سَرْطٍ، وفَوْقَ جِفانِه شَحْمٌ رُكامُ (* قوله «كأَنه أَثناء إلخ» كذا بالأَصل ولينظر حرر كأَنّ). فلِلكُبَراءِ أَكْلٌ حيثُ شاؤوا، ولِلصُّغَراءِ أَكْلٌ واقْتِثامُ قال ابن بري: يعني هشام بن المغيرة، قال: والاقتثام التَّزَلُّل.

وقَثَم له من العطاء قَثْماً: أَكثر، وقيل: قَثَم له أَعطاه دُفعة من المال جيِّدة مثل قَذَمَ وغَذَمَ وغَثَمَ.

وقُثَم اسم رجل مشتق منه، وهو معدول عن قاثم وهو المُعطي.

ويقال للرجل إِذا كان كثير العطاء: مائحٌ قُثَمٌ؛ وقال: ماحَ البِلادَ لنا في أَوَّلِيّتنا، على حَسودِ الأَعادي، مائحٌ قُثَمٌ ورجل قُثَم وقُذَمٌ إِذا كان معطاء.

وقَثَم مالاً إِذا كسبه.

وقُثام: اسم للغنيمة إِذا كانت كثيرة.

دەڵێن گوایا محمد صلى الله عليه و سلم ناوی قثم بووە نەك محمد !؟

بۆ وەڵامی ئەو گومانەش با لە سەرەتادا .... گریمانەی ئەوە دابنێین کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی قثمە . وە با بزانین ناوی قثم وەك ناو بۆ مرۆڤ چۆن دەگوترێت ؟ دەبێت قافەکە ضمەی بخرێتە سەر وە ثائەکە فەتحە وەر دەگرێت واتا بەم شێوەیە دەخوێن درێتەوە ( قوثەم ) وەك چۆن دەڵێین ( عومەر = عمر)

باشە با بزانین قوثەم مانای چییە لە قاموسی عەرەبیدا یان لای عەرەب بە چی مانایەك دێت ؟

ئەم ووشەیە بە مانای کۆکردنەوە و بەخشین دێت . وە کاتێك عەرەب بە کەسێك دەڵێت ( رجل قثم ) واتا پیاوێکی بەخشندەیە و هەمو شتێك دەدات بە بەرامبەرەکەی . وە هەروەها کەسانێکیش هەموو جۆرە کارە خێرەکانی تێدا کۆ بوبێتەوە هەر پێی دەڵێن رجل قثم کەواتە ناوی قوثەم وەك لایەنی زمانەوانی ناشرین نییە و ناوێك نییە ببێتە مایەی شەرمەزاری بۆ خاوەن ناوەکە وە چەند حەدیسێك هاتووە دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی قثمە ئەمانەی خوارەوەیە

الكامل في الضعفاء " لابن عدي (٦٥/٧) . هەروەها الحافظ العراقي في تخريجه لأحاديث إحياء علوم الدين (٣٨٣/٢ هەروەها تاج الدين السبكي في " طبقات الشافعية " (٢٨٧/٦) : هەروەها " طبقات الشافعية " (٣٣٠/٦)

بەڵام هەر هەمویان حەدیسەکانیان ڕەت کردوەتەوە چونکە ( البحترى ) گێڕاویەتیەوە و بحتریش لای زانایانی علمی حەدیس ناسراوە کە درۆزنە و هیچ کام لە اهلی حەدیس هیچ حەدیسێکیان لێ وەر نە گرتووە وە زۆر لە کتێبەکانی سیرەی نبویش ناوی ( قثم ) هاتووە بەڵام هیچیان وەك ناو ناویان نە بردووە بەڵکو وەك سیفەتێك یان لەقەبێك بۆ پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) داناوە .

پاشان ئەگەر ناوی ( قوثەم ) بوایە ئەو کات کافرەکانی قورەیش بەو ناوەوە بانگیان دەکرد یان بۆیان دەکرد بە دەهۆڵ . ئەی بۆچی هیچ کام لە سەر چاوەکانی قورەیش باسی ئەو ناوە ناکەن !؟ پاشان کاتێك قەیسەری ڕۆم لە بيت المقدس ابو سفیانی بینی و هەواڵی محمدی (صلى الله عليه وسلم) لێ پرسی . بۆچی ابو سفیان نەی گوت ئەوە ناوی محمد نییە بەڵکو ناوی ( قثمە ) ؟خۆ لەو کات و زەمانەدا کەس نەبوو بەقەدەر ابو سفیان دوژمنی اسلام و منهجی اسلام بێت ؟ کەواتە ئەگەر پێغەمبەر (د.خ) ناوی ( قثم ) بێت هیچ عەیبەیەکی تێدا نییە و ناوی قثم وەك لەسەرەوە باسمان کرد بە مانای شتی خراپ و شتی پیس نایەت . وە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویش نییە بڵێت ناوی قثم بووە !؟ وە هیچ حەدیسێکی صحیحیش نییە بڵێت ناوی قثم بووە !؟

کەواتە ئەوە نە ڕەخنەیە و نە مایەی عەیبەشە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) !؟

فەرمون ئەمەش لینکی قاموسی الباحث العربي کە هەرە فەرهەنگە گەورەکانی لە خۆی گرتووە . وەك تحدایەکی تر بۆ کڵێسای مسیحیی کورد زمان دا دەنێین و با بگەڕێن بزانن قثم مانای چییە !؟

index.jsp/http://www.baheth.info

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :پەنجا

## ئایا عائشة خاتون شیری داوە بە کەس ؟

گومانێکی شیعەی ڕافیزە هەیە و هەموو دژە بێدینەکانیش بڵاوی دەکەنەوە . گوایا دایکمان عائشة شیری داوە بە کوڕان بۆ ئەوەی ببێت بە برای وە هات و چۆی ماڵی بکەن !! واتا ارضاع الكبير . باسەکەی من و پرسیارەکەی من لێدەدا دەربارەی ارضاع الكبير نییە وە ان شاء الله پرسیارێکیش لەسەر ئەوە دا دەنێم بە جودا . بەلام لێرەدا بۆ وەڵامی ئەو گومانە دوو پرسیار دەکەم

**یەکەمیان** : کاتێك دەڵێن ارضاع یان شیردان بە کەسێك ئەگەر گەورە بێت یان منداڵ بێت . دەبێت ئەو ئافرەتە شیری تێدا بێت ئەو کات دەتوانێت شیر بدات بەڵام دایکمان عائشة هیچ منداڵی نە بووە . ئافرەتێکیش منداڵی نە بوو بێت کەواتە بە درێژایی ژیانی یە ك قەترە شیری نە بووە ... کەواتە چۆن شیری داوە بە کوڕان بۆ ئەوەی ببێت بە برای ؟

**دووەمیان** : فەرمون یەك حەدیسمان بۆ بهێنن یەك حەدیس زیاتر نا ... بڵێت خاتوو عائشة شیری داوە بە خەڵکی ؟ گرنگ نیە حەدیسەکە صحيح بێت یان لاواز بێت

---

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :پەنجا و یەك

## تەمەنی شوکردنی کچان چەندە ؟




هەرچییەك هەڵ دەستێت زمانی لە ئاینی ئیسلامی مەزن درێژ دەکات و دەڵێت چۆن دەبێت ئافرەت لە تەمەنی (نۆ)ساڵیدا شوو بکات ؟ لە کاتێکدا ئەو کەسەی ڕەخنە دەگرێت میمۆریی مێشکی سفرە و هیچی تێدا نییە دەربارەی مێژوو !! هەروەها خەڵکی وەختی

خۆی چۆن ژیاون ؟ وە شوكردن و ژن هێنان چۆن بووە ؟ كابرا بە ئەقڵی ٢٠١٥ و فیسبوك و ئایفۆن و ئینتەرنێت بیر دەكاتەوە . وا دەزانێت دنیا هەر بەم شێوەیە بووە كە ئێستا تێیدا دەژی فەرموون سەیری كۆنتیسە مارگریت بوفورت بكەن ٨٠٠ ساڵ دوای هاتنی ئیسلام . ئەم كۆنتیسەیە شووی كردووە لە تەمەنی ( **حەوت** ) ساڵیدا نەك ( **نۆ** ) ساڵیش . مارگریت لە مانگی ٥ ی ساڵی ١٤٤٣ لە دایك بوە و لە ٧ ی ٢ ی ١٤٤٤ دا تەمەنی(**نۆ**) مانگ بووە مارە بڕراوە . لە ساڵی ١٤٥٠ دا كە تەمەنی ( حە وت )ساڵ بووە یەكەم شووی كردووە شوی دووەمی لە تەمەنی **دوانزە** ساڵیدا كردووە . لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا شووی سێهەمی كردووە . لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا شووی چوارهەمی كردووە ساڵی ١٤٧٢ . بەڕێزان دیقەت بدەن (**پانزە**) ساڵ بووە( **سێ**) شووی كردوە

بۆیە لێرەدا دوو پرسیار دەوروژێت.

**یەكەمیان** : ئایا ئەو دژە ئیسلامانە بۆچی تۆزێك نا خوێننەوە و لە دنیا تێ بگەن و بزانن خەڵكی كاتی خۆی چۆن ژیاوە ؟ وە چۆن كارو باری كۆمەڵایەتییان بەڕێوە بردووە ؟ ئەقڵی دژە دێن هێندە تەسك و بێ زانیارییە وا دەزانێت دونیا هەر وەك زەمانی ئێستا وا بووە و بە چاوی ٢٠١٥ سەیری دنیا دەكات و ئەقڵی سڕ بوە بێ ئاگایە لە مێژوو !! ؟

**دووەمیان** : بۆچی ڕەخنە ناگرن لە دەوڵەتی بریطانیا كە منداڵیان بە ٧ ساڵی داوە بە شوو ؟ پرسیاری سەرەكیش ئەمەیە : بە چی پێوەرێك كابرای دژە دین دەڵێت (**نۆ**) ساڵ منداڵە ؟ وە منداڵی ئێستای (**نۆ**) ساڵ و ١٠٠٠ ساڵ لەمەوپێش فەرقیان چی بوو ؟ ئادەی دژە ئیسلام پێم بڵێ پێوەری تۆ چییە بۆ جیاوازیی نێوان تەمەنی مرۆڤ و هەڵس و كەوتی لە نێوان (٢٠١٥ و ١٠١٥) دا ؟ وە یاسای ١٨ ساڵ لە كەیەوە داهاتووە و پێش ئەو یاسایە چی یاسایەك هەبوو بۆ دیاری كردنی تەمەنی هەرزەكاری ؟

بۆ دڵنیایی خۆشتان و بۆ ئەوەی بزانن سەرچاوەكەم ڕاستە ! خۆشتان دەتوانن بە دوای زانیاریدا بگەڕێن و بنوسن زانیاریی زیاترتان دەست دەكەوێت بەو زمانەی كە دەی زانن

Margaret Beaufort, Countess of Richmond and Derby

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :پەنجا و دوو

## ئایا خودا نوێژ بۆ پێغەمبەر (د.خ) دەكات !؟

إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿الأحزاب: ٥٦﴾

زۆربەی خەڵكی ئەم ئایەتە دەكەن بە بەڵگە بۆ ئەوەی خودا نوێژ دەكات بۆ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەلام زۆر لێیان ناگیرێت چونكە شارەزای زمانی عربی نین و نازانن ( صلاة ) مانای چییە !؟

بۆ ڕاڤە کردنی ووشەی ( صلاة ) دوو نموونە دەهێنینەوە .

یەکەمیان بەیتی شیعری ( الراعي النميري ) یە کە ساڵی ٩٠ ی هجری لە دایك بووە . و داواکارم بەیتی کۆتایی ئەم هۆنراوەیەمان بۆ ترجمە بکەن بۆ کوردی کە دەڵێت( **صلى على عزة الرحمان و ابنتها ليلى و صلى على جاراتها الاخر**) . ئایا لێرەدا ئەو هۆنراوەیە دەڵێت خودا نوێژ لەسەر لیلا و دراوسێکانی دەکات ؟

**يـــا أهـــل مـــا بـــال هـــذا الليـــل فـــي صـــفر يـــزداد طـــولاً ومـــا يـــزداد فـــي قصـــر**

**فـــي إثـــر مـــن قطعـــت عنـــي قرينتـــه يـــوم الحـــدالى بأســـباب مـــن القـــدر**

**كأنمـــا شـــق قلبـــي يـــوم فـــارقهم قســـمين بـــين أخـــي نجـــد ومنحـــدر**

**هـــم الأحبـــة أبكـــي اليـــوم إثـــرهم قـــد كنـــت أطـــرب إثـــر الجيـــرة الشـــطر**

**فقلـــت والحـــرة الـــرجلاء دونهـــم وبطـــن لجـــان لمـــا اعتـــادني ذكـــري**

**صلى على عزة الرحمن وابنتها ... ليلى وصلى على جاراتها الأخر**

وە هەروەها ئەم حەدیسەش صحیحە و خەڵکانێك هاتوون بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە صدقةیان بۆ هێناوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتویەتی ( اللهم صلّ عليهم ) ئایا خودا نوێژی لەسەر ئەو خەڵکە یان بۆ ئەو خەڵکە کردووە ؟ یان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەڵێت خودایە نوێژ بۆ ابو اوفى بکە ؟ ئەمەش دەقی حەدیسەکەیە

....................ان رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ، إذا أتاه قومٌ بصدقتِهم ، قال : اللهمَّ ! صلِّ عليهم فأتاه أبي ، أبو أَوْفَى بصدقتِه ، فقال : اللهمَّ ! صَلِّ على آلِ أبي أَوْفَى . وفي رواية : " صلِّ عليهم"

الراوي: عبدالله بن أبي أوفى المحدث: مسلم - المصدر: صحيح مسلم - الصفحة أو الرقم: ١٠٧٨

خلاصة حكم المحدث: صحيح

ئێستاش پرسیارەکە زۆر ئاسانە و داواکارم لەو دژە ئیسلامانەی دەڵێن خودا نوێژ دەکات لەسەر محمد (صلى الله عليه وسلم) با بێن بەیتی اخیری ئەو شیعرە و ئەو حەدیسەمان بۆ ترجمە بکەن !؟ وە ئەگەر کەس نەی توانی ترجمەی بکات . کەواتە هەڵە تێگەیشتوون و نازانن ( صلاة ) مانای چییە و خودا نوێژ ناکات لەسەر پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) !؟

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :پەنجا و سێ

## ناوگەڵی ئافرەت لە نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا



دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە ئاینی مەزنی ئیسلام دەگرن و دەڵێن ئاینی ئیسلام بۆ شەهوەت هاتووە و سەیری ئافرەت دەکات بەس بۆ ناوگەڵی . وە شەرەف لە ناوگەڵی ئافرەتدا دەبینێت ، لە بەرامبەریشدا کاکی یان دادەی دژە ئیسلام ئاستی نەخوێندەواری و نەزانی و جاهیلی خۆی نازانێت !! وە بێ ئاگایە لە مێژووی ئەوگەلانەی ئەم ئێستا شانازییان پێوە دەکات . بۆیە پێویستە ئەو بەناو ڕۆشن بیرانە زلەیان لێ بدرێت زلەی میهرەبانی بۆ ئەوەی بێنەوە هۆش خۆیان ئەمەش یەکەم زلەمانە بۆیان

کاتێك دژە ئیسلامی کورد باسی مافی ئافرەت لە ڕۆژئاوا دەکات . خۆی بێ ئاگایە لە ئافرەت و مافی ئافرەت لە ڕۆژئاوا چۆن بوە و بۆچی گەیشتوەتە ئەم ئاستە ؟ بێ ئاگایە کە ئافرەت هیچ بونێکی نە بووە لە ژیاندا و تەنانەت وەك ئاژەڵیش حسابی بۆ نەکراوە . بەلاَم بێدینی نەخوێندەواری کورد مقارنەی مافی ئافرەت و ئیسلاممان بۆ دەکات . وە دەڵێت اسلام زوڵمی لە ئافرەت کردووە بەلاَم ئەفسوس هەموو مێژووی اسلام بگەڕێ . ئافرەتی بە سوکی سەیر نە کردووە و قەت بە چاوی مراقبە و چاودێری و دڵ پیسییەوە سەیر نە کردووە و هیچ دەقێکی قورئانی یان حەدیس نییە لەسەر ئەوەی پیاوان وەك ڕۆژئاوا بێن کلیل و قفڵ دروست بکەن بۆ ناوگەڵی ژن و کچەکانیان . وە ناوگەڵی ئەو ئافرەتە دا بخەن بە

ئـاگرو ئاسـن و قفڵـی بـدەن و پاشـان . قفڵـی بـدەن و کلیلـی قفڵـەکانیش لای بـاوك و مێـرد و براکانیـان بێـت . بۆیـە دەبینـین اوروپـا داوای مـافی ئـافرەت دەکـات چونکـە ئافرەتانیـان لـە زەلیـل تـرین شـێوەی ژیانـدا دەژیـان . بـەڵام قـەت ئـافرەت لـە ئیسـلامدا بـەو شـێوەیە زەلیـل نـە بـووە ! بـەلام کاکـە و دادە ی نـە خوێنـدەوار بـە نـاوی مـافی ئافرەتـەوە دەمیـان درێـژە بەرامبـەر بـە ئـاینی مـەزنی ئیسـلام لـە هـەمان کاتـدا کـوردەی دامـاو بێ ئاگایـە و نازانێـت چـۆن ئـەم ئافرەتانـەی ڕۆژئـاوا گەیشـتونەتە ئـەم حاڵـەی ئێسـتایان !؟ وە نازانێـت هـەتا هـەیا ماوەیـەکی نزیـك لـە ڕۆژئـاوادا ئـافرەت ناوگـەڵی سـجن دەکـرا بـە ئاسـن و چـەرم لـە پـێش و پاشـەوە . هـەروەها کلیـل دەدرا بـۆ ئـەوە نـەتوانێت بـە پـاش و پـێش لەگـەڵ پیاوانـدا سـەرجێی بکـات وە دووکـونی بچوکیـان دەهێشـتەوە لـە پـێش و پـاش بـۆ میز کـردن و پیسـای ئـادەی دژە دینی نەخوێنـدە وار پـێم بڵێ شـەرەفی کـابرای ڕۆژئـاوا لـە کوێـدا بـوو ؟ وە شـەرەفی جـەنابت لـە کوێدایـە ؟ لـە کاتێکـدا خـۆت ڕازی نابیـت خوشـکت یـان دایکـت یـان ژن و کچـت ناوگەڵی بکاتەوە بۆ هەموو کەسێك.

بەڵێ بەڕێزان ئافرەتی ڕۆژئاوا شارەزای مێژوی خۆیەتی وە لە مۆزەخانەکاندا تا ئێستاش ئەو سەرپێ ئاسنین و کلیل و قفڵەکانیان ماوە کە نەنکەکانیان لە پێیان دەکرد . بۆیە ئافرەتی ئەوروپی خۆی ڕووت دەکاتەوە و ناوگەڵی گرنگ نییە لە لای . چونکە نایەوێت وەك داپیرانی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت وە تۆڵە ی داپیرانی دەکاتەوە ، بەڵام ئاینی ئسلامی مەزن بە هیچ شێوەیەك کۆت و زنجیری بەو شێوەیە وەحشی گەریی دانەناوە بۆ ئافرەتان و ئافرەت ئازاد و سەربەست بووە ناوگەڵی بەس بۆ مێرەکەی بووە . بەبێ ئەوەی زنجیر و کلیل و قفڵی هەبێت !! حەیا و شەرەفی لە خۆی زیاتر خۆش ویستووە و پاراستویەتی . بە ملیۆنەها بێوەژنمان هەبووە لەبەر خاتری منداڵەکانی شوویان نە کردوەتەوە کە حەقی خۆشیان بووە شوو بکەنەوە . بە سەربەرزی خۆی و مناڵەکانیشی پێ گەیاندووە ئەو بێوەژنانەش دایك و نەنك و دراوسێمان بوون و مایەی فەخر و شانازیی هەمووان بووە . هۆکەرەکەشی ئەوە بووە پەروەردەی ئەم ئاینە مەزنەی ئیسلام بووە ئادەی دژە ئیسلام کاتێك تۆ دەڵێیت شەرەف لە ناوگەڵی ئافرەتدا نییە ! پێم بڵێ پێوەری تۆ چییە بۆ شەرەف ؟ وە ئایا ڕازییت ژنت یان کچت یان خوشکت یان دایکت لەش فرۆش بێت ؟ بە شەرتێك لە ڕۆژ ئاواش هەتا ئێستا هیچ پیاوێك ڕازی نییە ئەو ئافرەتەی لەگەڵیدایە بچێت لەگەڵ پیاوی تردا سەرجێی بکات ! ئادەی پێم بڵێ بۆچی لای تۆ ئاساییە شەرەف لە ناو گەڵی ئافرەتدا نەبێت لە کاتێکدا خۆشت ڕازی نییت خێزانەکەت لەگەڵ کەسێکی تردا سەر جێی بکات ؟

هیوادارم کەس ئەو قسە هیچە نە کات: ئەگەر ئافرەتەکە ڕازی بێت و بە ڕەزامەندیی خۆی بێت قەیناکە لەگەڵ پیاوی تردا با سەر جێێ بکات !! ئەو وێنانەش دی بینن دەرپێ ئافرەتانە بە کلیل و قفڵەوە کە ئێستا لە زۆربەی مۆزەخانەکانی جیهاندا هەیە و کابرای دژە ئیسلامی کوردیش ڕەخنە لە ئیسلام دەگرێت و ڕۆژئاوا بەرز ڕا دەگرێت لە کاتێکدا هیچ ئایەت و هیچ دەقێك نییە لە ئیسلامدا زوڵم لە ئافرەت بکات بەو شێوەیەی لە وێنەکاندا دەی بینن.

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :پەنجا وچوار

## ئافرەت و مافەکانی لە نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا



دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئیسلام مافی ئافرەتی پێشێل کردووە . زوڵم لە ئافرەت دەکات بەڵام لە ڕۆژ ئاوا ئافرەت ئازادە دەتوانێت هەموو شتێك بکات دەتوانێت هەموو شتێك بڵێت . وە دوای ڕزگار کردنی ئافرەت دەکەن ، ئەوەی ئەم توتییانە نایزانن دوو شتە .

**یەکەمیان** ئاینی ئیسلام هیچ زوڵمێکی لە ئافرەت نەکردووە چونکە ئەم ببغایانە شت دەڵێنەوە و شارەزای مێژو نین ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش ژیانی خەڵکی و بە تایبەتی ئافرەت چۆن بووە و کاتێك ئیسلام هاتووە چۆن ڕێزی لە ئافرەت گرتووە لەچاو کۆمەڵگاکانی پێش خۆیدا و چۆن پلە و پایەی ئافرەتی بەرز کردوەتەوە

**دووەمیـــان** ئاستی نە شارەزای و نە خوێندەواریشیان لە ژێر سفرەوەیە لە مێژووی ڕۆژئاواشدا بۆ نمونە باسی ٤١٥ ساڵ لەمەو پێشتان بۆ دەکەم لە بریطانیا کاتێك ئافرەت کاتێك دەرەوە ، دەبوایە دەمی دا بخات و لەگەڵ پیاواندا قسە نەکات وەك لە وێنە کە دا دەبینن ئەم جۆرە قناعە ئاسنانەیان لەسەر دەکردن و بە قفڵ دایان دەخست هەتا دەمی دابخرێت و نەتوانێت لەگەڵ پیاودا قسە بکات ئەم قیناعی سەرانە هی زەمانێکی زۆر دور نییە بەڵکو هی ساڵانی ١٦٠٠ لە بریطانیا . تەنانەت زۆر پیاویش دەمی ژن و کچەکانی دادەخست کاتێك دەچووە دەرەوە بۆ ئەوی کچەکانی و ژنەکەی لەگەڵ هیچ کەسێکی تری دەرەوەی ماڵی خۆیاندا قسە نەکەن !؟

لـــــــــــــە کتێبـــــــــــی تـــــــــــاریخ العـــــــــــالم بەشـــــــــــی( ١ لاپـــــــــــەڕە ٣٩٥ )دا نوســـــــــــراوە

ئافرەتان لە اوروپادا بەم شێوەیە لە قەڵەم دەدران دواکەوتوو ، و جاهیل بوون وە کۆسپ بوون لە ڕێگای علم و نوردا وە کتێبە ئاینیەکان بوونی ئافرەتیان بە تاوان دەزانی لە جیهاندا . وە دەیان ووت دەبێت شەرم بکەن لە خۆیان کە ئافرەتن . وە دەبێت هەتا مردنیان بە نا ئومێدی بژین . چونکە زەوییان بە نەفرەت کردووە . و لە بەهەشت دەریان کردوین بۆ سەر زەوی !؟ ئادەی نەخوێندەواری بێدین ئادەی نەزانی عەلەمانیەت . ئادەی ئەو کەسەی داوای مافی ئافرەت و ئازاد یی ئافرەت دەکەیت . پێم بڵێ تۆ ئاگاداری ئەم سوکایەتیە هەیت بە ئافرەت کراوە لە ڕۆژئاوا ؟ یان وەك طوطی هەر لە خۆتەوە هاوار دەکەیت و دەڵێیت اسلام مافی ئافرەتی پێشێل کردووە ئادەی سوکایەتیەکی لەم جۆرەم بۆ بهێنە لە اسلامدا ؟ کاکە و دادە ی جاهیل کاتێك اوروپا داوای ئازادیی ئافرەت دەکات نایەوێت بگەڕێتەوە دۆخی جاران و دەمی کلیل و قفڵ بکرێت !؟ بۆیە ئەگەر ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر اسلام بگەیشتایەتە اوروپا ئەم کلیل و قفڵەی نەدەهێشت چونکە پێغەمبەر( صلى الله علیه و سلم )دەفەرموێت : **(استوصوا بالنساء خيرا)** . وە زۆر حەدیس و ئایەتی تریش هەیە کە پێگەی ئافرەت بەرز ڕا دەگرێت نەك وەك کڵێسا سەیریان بکات و بە سەرچاوەی لعنت و شەڕیان دا بنێت وەك لە کتێبی پیرۆز **سفر التكوين ٣** دا باس کراوە . ئەگەر ئێوە بڵێن ئاینەکان هەموو **یەك** شتن وە ئەوە ئاینی جولەکە و مسیحییە بەو شێوەیە . کەواتە ئاینی ئیسلام ڕاستە و مافی ئافرەتی داوە و لە سوکایەتی ڕزگاری کردووە

دیقەت بدەن زەنگۆڵەیەك بە سەر سەری ئافرەتەکەوە دانراوە . وەك چۆن زەنگۆڵە دەخرێتە ملی مەڕ و ماڵات و ئاژەڵەوە !! بۆ ئەوەی بۆ هەر شوێنێك بچێت بزانرێت بەرەو ئەو شوێنە چووە ، هەتا لەگەڵ پیاواندا قسە نەکات .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :پەنجا وپێنج

## ئایا ئافرەت نیوەی پیاوە ؟

فَإِن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ ۚ وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَىٰ ۚ

1 - عن عُقْبَةَ بنِ الحارثِ قالَ : تَزَوَّجتُ امرأةً ، فجاءَتْ امرأةٌ فقالتْ : إنّي قد أرضَعْتُكما ، فأتيتُ النبيَّ صلّى اللهُ عليه وسلّم ، فقال : ( وكيفَ وقد قيلَ ، دَعْها عنكَ ) . أو نحوَه .

الراوي : عقبة بن الحارث المحدث : البخاري المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم: 2660 خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

هەمیشە گوێمان لێ دەبێت دژە ئیسلامەكان دەڵێن ئافرەت لە ئیسلامدا پێگەی نزمە و بە دوو ئافرەت حسابی **یەك** نەفەریان بۆ دەكرێت . وە دەبێت ئافرەتێك بەرامبەر پیاوێك بێت نەك دوو ئافرەت بەرامبەر پیاوێك بێت وە بەڵگەشیان بۆ قسەكانیان ئایەتی ٢٨٢ ی سورەتی **البقرەیە** ... كە باسی ئەوە دەكات لە كاتی كڕین و فرۆشتن یان قەرزداندا بۆ شایەتی دان بۆ گرێ بەستێك دەبێت دوو ژن و پیاوێك شایەتی بدەن ئینجا گرێ بەستەكە تەواوە

**وەڵام** : لە پێشدا دەبێت ڕادەی نەزانیی ئەو كەسانە ڕون بكەینەوە لە زانینی زمانی عەرەبیدا !! چونكە نازانن مانای ( شاهد و شهید ) چییە ؟ وە لە ئایەتی ٢٨٢ ی بقرەدا بە ( شهید ) هاتووە نەك شاهد . وە لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە : بۆچی بە شهیدین نوسراوە نەك شاهدان یان شاهدتان ؟ لە قورئاندا ( ٣٦ ) جار ووشەی شهید هاتووە . ئەگەر دیقەت بدەن هەر هەمووی بەو مانایە هاتووە بۆ خودا و پێغەمبەرانی لە دنیا و قیامەتدا . وە بەس بە تەنها لە ئایەتی ٢٨٢ دا بۆ خودا و پێغەمبەرانی نییە . بۆچی ؟

چونكە ووشەی شهید واتا شایەتیی تەواوەتیی ١٠٠% كە ئەو كەسە ڕاستە و لەسەر حەقە . واتا كاتێك دەگوترێت شهید واتا ئەو كەسە لەسەر حەقە و ڕاستییەكەی گوتووە هەرچییەك بڵێت یان بیكات تەواوە . بەڵام كاتێك دەڵێن شاهد لەوانەیە ڕاست بكات لەوانەیە درۆ بكات . بەڵام شهید بە هیچ شێوەیەك درۆ ناكات و ڕاستییەكان دەڵێت و باوەڕ پێ كراو ترە لە شاهد . هەروەها ئافرەت وەك پیاو نییە درۆ ناكات بە تایبەتی لە شتێكدا كە بینی بێتی یان ئاگاداری بوبێت وە شایەتیی ئافرەت زۆر ڕاسترە لە شایەتیی پیاو ئەو ئایەتەش باسی قوت و بژێوی خەڵكی دەكات بۆیە دەبێت هیچ غەل و غەشێك نەكات چونكە ئایەتە كە باسی حەق و ماف و پارەی كەسانێكی پەك كەوتە یان نەزان یان منداڵ یان سەقەت دەكات كە هەموو كەس دەتوانێت هەقی بخوات و ئەو موڵك و ماڵ و پارەیەی بەرێت . بۆیە دەبێت ئەو كەسانە زۆر ڕاست گۆبن و نەهێڵن هەقی ئەو كەسە بخورێت و ئەوەی بینیویانە و زانیویانە بە ئەمانەتەوە بینوسن یان بێڵێن

كەواتە لێرەدا ئەو ئایەتە پلەی ئافرەتی بەرز كردوەتەوە بە ( شهید ) ناوی بردووە نەك بە ( شاهدة ) وە كابرای كافری عەرەب و منافقەكان زۆر لەم كافرانەی ئێستا پەیدا بوون و ڕەخنە دەگرن لەو ئایەتە زۆر شارەزاتر بوون لە زمانی خۆیان . وە جیاوازیی نێوان ( شاهد و شهید ) یان زانیوە . ئەگینا هەر لەگەڵ دابەزینی ئایەتەكەدا دەیان توانی ئەو ئایەتە پوچەڵ بكەنەوە و گاڵتە بە قورئان و شوێن كەووتوانیان بكەن وە ئەم ئایەتە و ئاینی ئیسلامیش ١٤٠٠ ساڵ بڕی نەدەكرد . وە دەیان گوتی قورئانی محمد (صلی الله علیە وسلم) لە پلە و پایەی ئافرەت كەم دەكاتەوە و دوانیان بە **یەك** كەس حساب دەكات وە خەڵكیان لە ئیسلام سارد دەكردەوە و نەیان دەهێشت بگاتە ٢٠١٥، پاشان ئایەتە ئامۆژگارییە نەك یاسا بێت چونكە یاساكانی دادوەرایەتی لە ئیسلامدا زۆرن وە كەوتوەتە سەر ئەو دادوەرە لەو كاتەدا بە چی حوكم دەكات بۆ نموونە حوكم ( النكول ) یان ( الیمین المردودة ) یان حوكم كردن بە ( قافة ) یان ( القرعة ) یان ( القسامة ) ئەم حوكمانە هیچی لە قورئاندا باس نەكراوە بەڵام لە داد وەریی ئیسلامیدا هەیە و دادوەر بە گوێرەی

کات و ڕوداوەکان دەتوانێت حوکم بدات . وە ئێمە ڕون کردنەوە نادەین بۆ ئەو حوکمانە بۆ ئەوەی بابەتەکە دوور و درێژ نەبێت بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان زۆرە کە ئەو حوکمە بەس بۆ کڕین و فرۆشتن و قەرزە.

بۆ نموونە هەتا ئێستاش ڕادەی ئافرەت بۆ کار و باری بازاڕ و بازرگانی لە جیهاندا ناگاتە (١%) بەڵکوو زۆر لەو ڕێژەیە کەمترە . وە پێش ١٠٠٠ ساڵ ئەسڵەن ئافرەت بوونیان نەبووە لە بازاڕەکاندا هەتا حساب و کتاب بزانن بەڵام ئێستا خوێندەواری زۆر بووە و خەڵکی دەتوانێت ژن بێت یان پیاو بێت خۆی بڕی شتەکان ببینێت و حسابی بکات و بینوسێت ئەگەر یە ك ئافرەتیش بێت هیچ کێشەیەك نییە چونکە خوێندەواریی هەیە و خۆشی دەتوانێت ئەو شتانە حساب بکات و بینوسێت ،هەروەها ئایەتەکە ڕونی کردوەتەوە لە کوێدا و بۆچی دەبێت دوو ئافرەت بێت! چوونکە باسی مامەڵەی پارە و بازاڕ دەکات . بەڵام کابرای دژە ئیسلام نەشارەزای مێژووە و ئاگادار نییە هەتا دوای جەنگی ڤیهانیی دووەمیش ئافرەت لە بازاڕدا بوونی نەبووە لە هەموو جیهاندا !؟ وە مامەڵەی پارە و کڕین و فرۆشتنی بازاڕ هەر پیاو بووە ، بۆیە لە حساب و کتابیان نەزانیووە و شارەزای حساب نەبوون پاشان خەڵکی لە جیهاندا لەو کاتەدا زۆربەی زۆریان نەخوێندەوار بوون حسابیان نەزانیووە بۆیە دەڵێت ئەگەر یەکێك لە ئافرەتەکان بڕەکەی بیر چووەوە ئەوی تریان بیری بخاتەوە وە لە باقیاتی حوکمەکانی تردا **یەك** ئافرەت **یەك** پیاوە بۆ نموونە : ئەگەر ئافرەتێك ببینێت کەسێك دزی دەکات یان کەسێکی کوشتووە یان هەر کارێکی تر بێت ئەو ئافرەتە بە تەنها بینی بێتی. لای دادوەر شایەتیی ئافرەتەکە وەر دەگیرێت و چاوەڕوان ناکەن بن بە دوو ئافرەت ئینجا شایەتییان وەر بگیرێت . پاشان ئەگەر ژنێك بچێتەوە بۆ ماڵەوە پیاوەکەی ببینێت زینا دەکات لەگەڵ ئافرەتێکی تردا . ئەو ئافرەتە **چوار** جار سوێند دەخوات کە ڕاست دەکات وەك چۆن پیاو **چوار** جار سوێند دەخوات ئەگەر بینێت ژنەکەی زینای کردووە وەك لە سورەتی **نور** ٦ هەتا ٩ دا هاتووە. خۆ دادوەر چاوەڕوان ناکات دوو ئافرەت بن و **هەشت** جار سوێند بخۆن ئینجا شایەتییان قبوڵ بکرێت ؟ بە هەر حاڵ بۆ ئەوەی بابەتەکە دوور و درێژ نەبێت . شایەتیی دوو ئافرەت بە یە ك کەس بەس بە تەنها لە مامەڵەی پارە و قەرزدایە نەك لە هەموو شتێکدا . وە بابەتەکە کۆتایی پێ دێنم بەم حەدیسە کە لە وێنەکەدا دەی بینن .

**عقبەی کوڕی نافع** دەڵێت ژنم هێنا ، ئافرەتێك هات بۆ لام گوتی من شیرم داوە بە هەردووکتان منیش چوم بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆم گێڕایەوە . بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گوتی مادام واز لە ژنەکەت بهێنە . ئایا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چاوەڕوانی کرد ببن بە دوو ئافرەت ئینجا شایەتییەکەیان وەر بگیرێت ؟ بە هەر حاڵ ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئافرەت نیوەی پیاو نیە و لە چەند حاڵەتێکی تایبەتیدا دوو ئافرەت بە **یەك** شایەت حسابن وە خودای تعالی پلە و پایەی ئافرەتی بەرز کردوەتەوە بە ( شهید ) ناوی بردووە کە بەرز ترین پلەی ڕاست گۆییە . چونکە ( شاهد ) دەکرێت درۆ بکات و دەکرێت ڕاست بکات وە کەسێك بە شایەتی ڕاستەقینە حسابە کە خەڵکی بیناسن و بزانن ( شاهدە ) و درۆ ناکات نتیجەی مامەڵە کردنیان لەگەڵیدا. بەڵام کاتێك دەگوترێت ( شهید ) ئەوە مەجالی تێدا نییە کە ڕاست گۆیە و درۆ ناکات وە خودای تعالی ئافرەتی بە ( شهید ) لەقەڵەم داوە نەك بە

( شاهد ) وە پلەی بەرز کردوەتەوە بەڵام خەڵکی نەزان لە بواری زمانی عەرەبیدا ئەو شتانە نازانن و هەر هەمووی بە شایەت لەقەڵەم دەدەن بەڵام لە ناوەڕۆك و مانادا جیاوازیی نێوان زەوی و ئاسمان هەیە لە وشەی ( شاهد ) و ( شهید ) دا.

---

## پرسیارە بێ وەلاًمەکان ژمارە :پەنجا وشەش

### ئافرەت و سوڕی مانگانە




نوســـــــــــــــــینەکە بخوێنــــــــــەوە پاشـــــــــان ســــــــەیری لینکــــــــی ڤیدیۆکـــــــــە بکـــــــــە

بێدینـەکان گاڵتـە بـە ئیسـلام دەکـەن و دەڵـێن ئـاینی ئیسـلام زوڵـم لـە ئـافرەت دەکـات و وەك کۆیلـە سـەیری دەکـات و دەیـان چەوسـێنێتەوە . لـە بەرامبەریشـدا کابرای بێـدین خۆشی نازانێت بـۆچی وا دەڵێت و ئـەم قسـانەی لـە کێ و لـە کوێـوە وەرگرتـووە ؟ بـۆ نموونە ئێستا باسی شتێکی زۆر ئاسایی و سادەی ئافرەتان دەکەین کە مانگانە تووشی دەبێت . ئەویش سوڕی مانگانەیە

پێش هاتنی ئیسلام ئاینی جولەکە و مەسیحی هەبووە ، ئافرەتیان بە گڵاو قێزەون لە قەڵەم داوە لە کاتی سوڕی مانگانەدا . وە دەبوایە دوو کۆتری کو کوختیی بکردایە بە خێر کە پاك دەبووەوە . بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی تێ ڕوانینی ئافرەت لە تەورات و ئینجیلدا نوسینی سەر ڤیدیۆکە بخوێننەوە . بەڵام ئاینی مەزنی ئیسلام هات ئافرەتی لەو پیسی و گڵاوییە ڕزگار کرد.

**پرسـیاری بێ وەڵامـمان ئەمەیە** : کابرای بێـدینی نـەزان بێ ئاگایـە لـە سـەرچاوە ئاینییـەکان .بێ ئاگایە لـەوەی گومانی چەوسـاندنەوەی ئافرەت کڵێسا درووستی کردووە بۆ ئەوەی عەیبەکانی خۆی بشارێتەوە . وەك لە ڤیدیۆکەدا دەی بینن . ئافرەتی ڕۆژئاوا ١٨٠٠ ساڵ بـە دەسـت ئـەو یاسـایەوە دەیـان ناڵانـد کـە گڵاون بۆیـە داوای ئـازادیی ئـافرەت دەکـات !! نایـەوێ بـە پیسـی و گڵاوی سـەیر بکرێـت لـە بەرامبەریشدا ئاینی ئیسلامی مەزن بۆ جیهانی سەلماند الله خالقی مرۆڤە و ئافرەت تووشی ئازار دەبێت لە سوڕی مانگانەدا نەك گڵاو

بێت وەك لە ئایەتی ٢٢٢ ی البقرەدا هاتووە . وە قورئان ١٢٠٠ ساڵ پێش شۆڕشی فرنسی ئافرەتی لەو گڵاوییە ئازاد كردووە و پلە و پایەی بەرز كردۆتەوە . وە شۆڕشی اسلام پێش شۆڕشی فرنسی بووە چونكە لە لایەن خودایەكی زاناوە یاسا و ڕێساكاانی بۆ دانراوە

ئەمەش لینكی یوتوبە بۆ ئەو كەسانەی دەیانەوێت لە یوتوب سەیری ڤیدیۆكە بكەن بە كوالیتی بەرز

https://www.youtube.com/watch?v=KQbjR2-Y3Ug

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :پەنجا و حەوت

## سوری مانگانە لای غەیرە ئیسلامەكان




**بابەتەكە بخوێنەوە پاشان سەیری لینكی ڤیدیۆكە بكە!**

لە پرسیاری ( ٥٦ ) دا باسی تێ ڕوانینی مرۆڤمان كرد بۆ ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا لەم بەشەدا لای بوذی و هیندۆس و ئاینە وثنییەكانی تردا باسی پلە و پایەی ئافرەتتان بۆ دەكەین لە سوڕی مانگانەدا ، وە خۆشتان بەراورد بكەن . كێ مافی ئافرەتی پاراستوە و وەك مرۆڤ سەیری كردووە ؟ ئاینی ئیسلامی مەزن یان ئاین و خەڵكی بە گشتی ؟

ئەم وینەیە لە ناو فیدۆیەكە دەرم هێناوە بزانە كابرا چ دەڵێت نوسینەكە بخوێنەوە

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە :** ئەگەر كەسێك پێمان بڵێت ئێستا ئەو شتانە نەماوە و خەڵكی هۆشیارن و بەو شێوەیە سەیری ئافرەت ناكەن !! ئێمەش دەڵێین ئاینی مەزنی ئیسلام ١٤٠٠ ساڵە ئەو ڕێز و پلە و پایەی داوە بە ئافرەت و بەرزی كردوەتەوە ، ئەی بۆچی دان بە ڕاستییەكاندا نانێن ؟ ئەی بۆچی دەڵێن ئیسلام زوڵم لە ئافرەت دەكات ؟

بەڵگەشمان بۆ قسەكانمان ئایەتی ٢٢٢ ی سورەتی **البقرەیـە** كە لە لایەن خودای باڵا دەست و زاناوە بۆی ڕوون كردوینەتەوە ئافرەت گڵاو نییە . ئەگەر ئەم كتێبی قورئانە نوسینی مرۆڤ بوایە ئێمەش ئێستا هەستمان پێ دەكرد ئافرەت گڵاو نییە . نەك پێش

١٤٠٠ ســـــــــــــــــاڵ.

ئەمەش لینكی یوتوبی ڤیدیۆیە بە كوالیتیی بەرز

https://www.youtube.com/watch?v=IuUZGnfxfxw

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :پەنجا و هەشت

### ئایا پێغەمبەر (د.خ) چوار ساڵ دوای مردنی باوكی لە دایك بوو ؟

زكریا بطرس لە یەكێك لە بەرنامەكانیدا بە ناوی ( كوڕی كێیە ؟ ) دا تانەی داوە لەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كوڕی عبدالله ی باوكی نییە و ضوار ساڵ پاش مردنی عبدالله ئامنة محمەدی (صلی الله علیه وسلم) بووە . و بەڵگەكانی كتێبی مێژوییە وەك طبقات ابن سعد و ... هتد . بۆ زانیاریتان ئەمە یەكێكە لەو گومانە هیچانەی مەسیحییەكان دروستیان كردووە لە ڕێگای كەناڵی الحیات و زەكەریا بطرسی گەورەیانەوە . بۆ وەڵامەكەشی دەڵێین

لە عاداتی قورەیش و عەرەبدا وا بووە ئەگەر گومانیان لە ڕەچەڵەكی منداڵێك بووایە ماڵی باوكی پیاوەكە پاش مردنی كوڕەكەیان دەیان ناردەوە بۆ لای خاڵوانی و كەس و كاری دایكی . بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باپیری عبد المطلب و پاشان مامی ابو طالب بەخێویان كردووە . ئەمە شایەتییەكی مەزنە كە منداڵی بنەماڵەی باوكی بووە و نە نێرراوەتە لای خاڵوانی پاش مردنی باوكی .پاشان دووژمنی سەرەكیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ابو لهب مامی بوو . چەند جار ویستویەتی بیكوژێت . ئایاتی لەسەر دابەزیوە كە دەخرێتە دۆزەخەوە خۆی و ژنەكەی . ئەی ابو لهب كە مامێتی نەی دەتوانی پەیامی محمد (صلی الله علیه وسلم) پوچەڵ بكاتەوە لە سەرەتاوە و بڵێت ئەوە منداڵی زۆڵە و من مامیم و ئەو كابرایە لە خێزانی ئێمە نییە . بەو شێوەیە پەیامەكەی پوچەڵ دەكردەوە و تۆڵەی خۆشی وەر دەگرت لەسەر ئەو ئایەتەی لەسەری دابەزیووە ... بۆچی وای نەكرد و بڵێت ئەو كوڕە زۆڵە یان بێژیە قورئان بەس باسی یە ك كەسی كردووە بێژییە لە سورەتی **القلم** ١٣ دا ئەویش ولیدی كوڕی مغیرەیە . وە یەكێك بووە لە هەرە پیاوە گەورە و دەوڵەمەندەكانی قورەیش و خاوەنی هەموو شتێك بووە . ئێ باشە كاتێك ئایەتی (**عتل بعد ذلك زنیم** )هاتە خوارەوە . بۆچی ولیدی كوڕی مغیرە نەهات بڵێت محمد (صلی الله علیه وسلم) پاشەڵی خۆشت وەك منە و چۆن بە من دەڵێیت منداڵی زینا لە كاتێكدا كەس نازانێت باوكی تۆش كێیە ؟ ئایا ولید نەی دەتوانی بەو قسەیە قورئان پوچەڵ بكاتەوە ؟ لە كاتێكدا ولیدی كوڕی مغیرە وەك ابو لهب وا بوو بۆ دژایەتی ئیسلام . ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كوڕی باوكی نە بووایە ! ئایا ولید نەی دەتوانی ئەو

ئایەتە و قورئان پوچەڵ بکاتەوە و ئاینی ئیسلام لەناو بەرێت ؟هەروەها ئایەتی ١٦٤ ی سورەتی **ال عمران** دەفەرموێت ( **لقد من الله على المؤمنين اذ بعث فيهم رسول من انفسهم** ). ئەو ئایەتە دەڵێت نێرراوێکیان بۆ دەنێرێت لە خۆیانە . ئەگەر محمد (صلى الله عليه وسلم) لە ئەسڵی قورەیش نە بوایە و زۆڵ بووایە و باوکی نە ناسرایە !! ئایا کافرانی قورەیش و منافقەکانی مەدینە تەنها ئەو ئایەتە یان بەس نە بوو بۆ بە درۆ خستنەوەی قورئان و بیان گوتایە خودای محمد (صلى الله عليه وسلم) راست ناکات و ئەو نێردراوە باوکی کەس نازانێت کێیە وە ئەو ئایەتە ڕاست نییە و دەیان توانی قورئان پوچەڵ بکەنەوە پاشان جولەکەی مەدینە دەیان توانی هەمان شێوە قورئان بە درۆ بخەنەوە ! چونکە لە ئایەتی ١٦٤ ی سورەتی **البقرەدا** نوسراووە اهل الكتاب دەی ناسن وەك چۆن منداڵەکانیان دەناسن . چونکە لە کتێبەکانیاندا باس کرا بوو ئەی بۆچی ئەوانیش نەیان توانی بڵێن ئەسڵی محمد (صلى الله عليه وسلم) کوڕی باوکی نییە و ئەو ئایەتەش درۆیە و لە کتێبەکانی ئێمەدا هیچ شتێك لەو بارەیەوە نە نوسراوە ؟ بەڵێ بەڕێزان بەڵگە زۆرە بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەو گومانە کە بەس تەنها خەڵکی نەزان دەی لێنەوە و باوەڕی پێ دەکەن . ئەوانەی نە شارەزان لە مێژوو ، وە خەڵکی نە خوێندەوار باوەڕ بەو جۆرە گومانانە دەکەن . بۆیە منیش لێرەدا دەوەستم و ناچمە شیکاریی مێژویی و حەدیسەکانەوە . و بە تەنها باسی ئەو بەڵگانەم بۆ کردن کە دەتوانرا لە کاتی خۆیدا قورئان و ئاینی ئیسلامی پێ پوچەڵ بکرایەتەوە و تەمەنی ئیسلام هەر لەناو قورەیشدا بووایە و ئاینی ئیسلامیان بنە بڕ بکردایە و نە گەیشتایە بە ئێمە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :پەنجاو نۆ

## ئایا قورئان لە تەورات و تلمودەوە وەرگیراوە

هەر کەس هەڵ دەستێت دەڵێت قورئان لە تەورات و ئینجیلەوە وەرگیراوە . وە خەڵکانێکی تازەش پەیدا بوون دەڵێن قورئان لە تلمودەوە وەرگیراوە . بابەتی ئەم جارەمان دوور و درێژ دەبێت بەڵام ئێمە کورتمان کردوەتەوە بۆتان ، بەم شێوەیە ئێمە ڕوون کردنەوەیەکی بچوك دەدەین و سەرچاوەکەتان بە لینک بۆ دادەنێین خۆتان دەتوانن لینکەکە بکەنەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بن قسەکانمان ڕاستە و خۆشتان زیاتر شارەزایی پەیدا بکەن لە سەرچاوەکانی کتێبی پیرۆزدا

پێشەکی با بزانین نوسخەی ئەسڵیی تەورات لە کوێیە ؟ نوسخەی ئەسڵیی تەورات بوونی نییە . چونکە کاتێك موسا (ع) لە سەرە مەرگدا بو خودا پێێ فەرموو قەومەکەت دوای خۆت سەرپێچیی خودا دەکەون و بت پەرستی دەکەن و دژایەتی خودا دەکەن . بۆیە موساش فەرمووی تەورات بخەنە ناو ( صندوق العهد سندوقی پەیمان ) وە بەو شێوەیە تەوراتی ئەسڵی لای جولەکە نەما بۆ زانیاریی زیاتر سسەیری **سفر التثنية** ( دوا وتاری موسا ) بەشی ٣١ دەق ١٤ بۆ ٢٩ بکەن

ئەمەش لینکەکەیەتی

http://www.kitebipiroz.com/bible/deu/31/26#v26

..........................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » دواوتاری موسا » بەشی ٣١

**پێشبینی یاخیبوونی ئیسرائیل**

١٤- یەزدان بە موسای فەرموو: (ئەوەتا ڕۆژانت لە مردن نزیك بۆتەوە، یەشوع بانگ بکە و لەناو چادری چاوپێکەوتندا بوەستن تا ئەرکی پێ بسپێرم.) جا موسا و یەشوع چوون و لەناو چادری چاوپێکەوتندا وەستان

١٥-ئینجا یەزدان لە ستوونی هەورێك دەرکەوت و ستوونی هەورەکە لە دەروازەی چادرەکە وەستا.

**١٦-**یەزدان بە موسای فەرموو: (ئەوەتا تۆ لەگەڵ باوباپیرانت سەردەنێیتەوە، جا ئەم گەلە هەڵدەستن و لەشفرۆشی[c] دەکەن لەگەڵ خوداوەندە بێگانەکان لەو خاکەی ئەوان دەچنە ناوی لەنێویان و وازم لێ دەهێنن و ئەو پەیمانەم دەشکێنن کە لەگەڵیان بەستوومە.

**١٧-**ئیتر لەو ڕۆژەدا توورەییم بەسەریاندا گڕ دەگرێت و وازیان لێ دەهێنم و ڕووی خۆم لێیان دەشارمەوە و دەبنە نێچیر و تووشی زۆر ناخۆشی و بەڵا دەبن، هەتا ئەوەی لەو ڕۆژەدا دەڵێن: "ئایا لەبەر ئەوە تووشی ئەو بەڵایانە بووین چونکە خودا لەگەڵمان نییە؟"

**١٨-**منیش لەو ڕۆژەدا ڕووی خۆم دەشارمەوە لەبەر هەموو ئەو خراپەیەی کەوا کردیان و کە دوای خودای دیکە کەوتن.

١٩-ئێستاش ئەم سروودە بۆ خۆتان بنووسن و نەوەی ئیسرائیلیشی پێ فێر بکەن، بیخەنە دەمیانەوە تا بۆ من ببێتە شایەت بەسەر نەوەی ئیسرائیلەوە،

**٢٠-**چونکە من دەیانبەمە ناو ئەو خاکەی سوێندم بۆ باوباپیرانیان خوارد، ئەوەی شیر و هەنگوینی لێ دەڕژێت، جا دەخۆن و تێر دەبن و قەڵەو دەبن و ئینجا دوای خودای دیکە دەکەون و دەیپەرستن و پشتم لێ دەکەن و پەیمانەکەم دەشکێنن.

**٢١-**جا کاتێك تووشی بەڵا و ناخۆشی دەبن، ئەم سروودە وەك شایەت وەڵامیان دەداتەوە، چونکە لە دەمی نەوەکەیان لەبیر ناکرێت، من دەزانم ئەوان ئەمڕۆ بیر لە چی دەکەنەوە، بەر لەوەی بیانبەمە ناو ئەو خاکەوە وەك سوێندم بۆ خواردن(.

**٢٢-**جا موسا لەو ڕۆژەدا ئەم سروودەی نووسی و نەوەی ئیسرائیلیشی پێ فێرکرد.

**٢٣-**ئینجا یەزدان فەرمانی بە یەشوعی کوڕی نون کرد و فەرمووی: (بەهێزبە و ئازابە، چونکە تۆ نەوەی ئیسرائیل دەبەیتە ناو ئەو خاکەی لەسەری سوێندم بۆیان خوارد و منیش لەگەڵت دەبم).

**٢٤-**دوای ئەوەی موسا بە تەواوی لە نووسینی وشەکانی ئەم فێرکردنە بووەوە لە پەڕتووکێك،

**٢٥-**فەرمانی بە لێڤییەکانی هەڵگرانی سندوقی پەیمانی یەزدان کرد و وتی:

**-26**-ئەم پەڕتووکەی تەورات ببەن و لە تەنیشت سندوقی پەیمانی یەزدانی خوداتان دایبنێن، هەتا وەك شایەتی بەسەرتانەوە لەوێ بێت.

**٢٧-**چونکە من یاخیبوون و کەللەڕەقیتان دەزانم، ئەوەتا من ئەمڕۆ هێشتا زیندووم لەگەڵتاندا و ئێوەش بەربەرەکانێی یەزدان دەکەن، جا باشە دوای مردنم چی دەکەن!

**٢٨-**هەموو پیرانی هۆزەکان و کوێخاکانتانم بۆ کۆبکەنەوە، تا ئەم وشانەیان بەگوێدا بدەم، ئاسمان و زەوی بکەم بە شایەت بەسەریانەوە

٢٩-چونکە دەزانم ئێوە دوای مردنم بە تەواوی گەندەڵ دەبن و لەو ڕێگایە لادەدەن کە فەرمانم پێ کردوون. لە ڕۆژانی ئایندەدا تووشی خراپە دەبن، چونکە لە بەرامبەر یەزدان خراپە دەکەن، بەو بتانە کە بەدەستی خۆتان دروستتان کرد پەستی بکەن .

...............................................

پاش مردنی موسا (ع) شەڕو شۆڕی زۆر رویدا هەتا بنو اسرائیل جێگیر بوون لە فلسطین ناچینە وردە کارییەکانەوە هەتا لە زەمانی داود و سلیماندا علیهم السلام بە تەواوەتی جێگیر بون . پاش مردنی سلیمان جولەکە بوون بە دوو مەملەکەت یهوذا لە قودس باشوریەکان و سامرە لە نابلس باکوربیەکان . پادشای باکوربیەکان یربعام بتی بۆ دروست کردن گوتی چیتر پێویست ناکات بچن بۆ قودس بۆ ئەوەی ئازارتان نەدەن ئەم بتانە خودای ئێوەیە و بی پەرستن . سەیری **سفری پاشایانی** یەکەم بکەن بەشی ١٢ دەقی ٢٥ بۆ ٣٣ ئەمەش لینکەکەیەتی

http://www.kitebipiroz.com/bible/1ki/12

......................................................

**بابەتی لینکەکە**

کتێبی پیرۆز « پاشایان ١ « بەشی ١٢

**گوێرەکە زێرینەکانی بێتئێل و دان**

25 ئینجا یارۆڤعام شارۆچکەی شەخەمی ناوچە شاخاوییەکانی ئەفرایمی کردە شارێکی قەڵابەند و تێیدا نیشتەجێ بوو، لەوێشەوە دەرچوو پنیئێلی نۆژەن کردەوە.

26 یارۆڤعام لە دڵی خۆیدا وتی: "ئێستا پاشایەتییەکە بۆ ماڵی داود دەگەڕێتەوە."

27 ئەگەر ئەم گەلە سەربکەون بۆ ئەوەی لە پەرستگای یەزدان، لە ئۆرشەلیم قوربانی پێشکەش بکەن، دڵی ئەم گەلە بۆ گەورەکەیان دەبێت، ڕەحەڤعامی پاشای یەهودا، منیش دەکوژن و دەگەڕێنەوە لای ئەو.

28 پاش ڕاوێژکردن پاشا دوو گوێرەکەی زێرینی دروستکرد و بە گەلی وت: (ئەی ئیسرائیل، بۆ ئێوە زەحمەتە سەربکەونە ئۆرشەلیم. ئەوەتا خوداوەندەکانت، ئەوانەی لە خاکی میسرەوە دەریانهێنایت.)

29 ئینجا یەکێکیانی لە بێتئێل دانا و ئەوی دیکەیان لە دان.

30 ئەم کارەش بووە گوناه. گەل بۆ پەرستش دەچوونە بێتئێل و هەتا دانیش دەچوون بۆ پەرستنی ئەوەی دیکە.

31 یارۆڤعام نزرگەکانی سەر بەرزاییشی دروستکرد، لە هەموو لایەکی گەلەوە خەڵکی کردە کاهین، هەرچەندە لە نەوەی لێڤیش نەبوون.

32 ڕۆژی پازدەی مانگی هەشتی کردە جەژن، هەروەک ئەو جەژنەی لە یەهودا هەبوو، قوربانی سەرخستە سەر قوربانگاکە. بەم جۆرەی کرد لە بێتئێل، قوربانی بۆ ئەو دوو گوێرەکەیە سەربری کە دروستی کردن، هەروەها لە بێتئێلدا کاهینانی ڕاگرت بۆ نزرگەکانی سەر بەرزایی کە دروستی کردبوون.

33 لە پازدەی مانگی هەشت، لەو مانگەی کە خۆی بۆ خۆی دایهێنابوو قوربانی سەرخستە سەر قوربانگاکە کە لە بێتئێل دروستی کردبوو. جەژنی بۆ نەوەی ئیسرائیل دانا و بۆ بخوور سووتاندن سەرکەوتە سەر قوربانگا.

هەروەها مەملەکەتی **یهوذاش باشوریەکان** بەهەمان شێوە دەستیان کرد بە بت پەرستی و جادوو گرتنەوە و دوور کەوتنەوە لە خودا پەرستی وە خراپەکاریەکانیان لە **سفری پاشایانی دووەم** بەشی ١٧ دەقی ٩ بۆ ٢٣ دا نوسراوە وەك لەم لینکەی خوارەوەدا دەی بینن

http://www.kitebipiroz.com/bible/2ki/17

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » پاشایان ٢ » بەشی ١٧

9 نەوەی ئیسرائیل بە نهێنی چەند کارێکیان لە دژی یەزدانی خودایان کرد کە ڕاست نەبوون. لە قوللەکانی چاودێرییەوە هەتا شارە قەڵابەندەکان لە هەموو شارۆچکەکان نزرگەی سەر بەرزاییان بنیاد نا.

10 لەسەر هەموو گردێکی بەرز و لە ژێر هەموو دارێکی سەوز بەردی تەرخانکراو و ستوونە ئەشێراکانیان بۆ خۆیان دامەزراند.

11 لەوێ لەسەر هەموو نزرگەکانی سەر بەرزایی بخووریان سووتاند، وەك ئەو گەلانەی یەزدان لەپێشیان ڕایماڵین، بە کارە خراپەکانیان یەزدانیان پەستکرد.

12 ئەو بتانەیان پەرست کەوا یەزدان پێی فەرمووبوون، (ئەم شتە نەکەن.)

13 یەزدانیش لە ڕێگای هەموو پێغەمبەران و ڕاگەیەنەرانی نیگای خودا ئیسرائیل و یەهودای ئاگادار کردەوە، فەرمووی: (لە ڕێگا خراپەکانتان بگەڕێنەوە و فەرمان و فەرزەکانم بەجێبهێنن، بەگوێرەی تەواوی ئەو تەوراتەی کە باوباپیرانی ئێوەم پێی ڕاسپارد، ئەوەی لە ڕێگای بەندە پێغەمبەرەکانمەوە بۆم ناردن.)

14 بەڵام گوێیان نەگرت و وەك باوباپیرانیان کەللەڕەقییان کرد، ئەوانەی بڕوایان بە یەزدانی خودایان نەکرد.

15 فەرزەکانی ئەویان ڕەتکردەوە، هەروەها ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ باوباپیرانیان بەستبووی و ئەو ئاگادارکردنەوانەی کە پێت دان ڕەتیان کردەوە. دوای بتی بووچ کەوتن و بووچ بوون. بەدوای ئەو گەلانەی دەوروبەریان کەوتن، کەوا یەزدان فەرمانی پێ کردبوون، (وەك ئەوان نەکەن.)

16 وازیان لە هەموو فەرمانەکانی یەزدانی خودایان هێنا و بۆ خۆیان دوو گوێرەکەی لەقاڵبدراویان دروستکرد و ستوونە ئەشێرایەکیان دروستکرد، کڕنۆشیان بۆ هەموو هێزەکانی ئاسمان برد و بەعلیان پەرست.

17 کوڕ و کچەکانیان وەك قوربانی سووتاند. فاڵیان گرتەوە و جادووگەرییان کرد، خۆیان فرۆشت بۆ ئەنجامدانی ئەوەی لەبەرچاوی یەزدان خراپ بوو، ئیتر پەستیان کرد.

18 لەبەر ئەوە یەزدان زۆر لە ئیسرائیل تووڕە بوو و لەبەردەمی خۆی دووری خستنەوە. تەنها هۆزی یەهودای هێشتەوە،

19 هەروەها یەهوداش فەرمانەکانی یەزدانی خودای خۆیان بەجێنەگەیاند. نەریتەکانی ئیسرائیلیان پەیڕەو کرد کەوا دایانهێنابوو.

20 لەبەر ئەوە یەزدان هەموو وەچەی ئیسرائیلی ڕەتکردەوە، زەلیلی کردن و ڕادەستی تاڵانکەرانی کردن، هەتا ئەوەی لەبەردەم خۆی دووری خستنەوە.

21 کاتێك خودا ئیسرائیلی لە بنەماڵەی داود جیاکردەوە، یارۆڤعامی کوڕی نەڤاتیان کردە پاشای خۆیان. یارۆڤعام ئیسرائیلی لە شوێنکەوتنی یەزدان دوورخستەوە و بووە هۆی ئەوەی کە ئەوان گوناهێکی گەورە بکەن.

22 نەوەی ئیسرائیلیش هەموو ئەو گوناهانەی یارۆڤعامیان پەیڕەو کرد کەوا کردنی و خۆیان لێی لانەدا،

23 هەتا ئەوەی یەزدان ئیسرائیلی لەبەردەم خۆی دوور خستەوە، هەروەك چۆن لە ڕێگای هەموو بەندە پێغەمبەرەکانییەوە فەرمووبووی. ئیتر ئیسرائیل لە خاکەکەی خۆیانەوە ڕاپێچی ئاشور کران، هەتا ئەمڕۆش هەر لەوێن.

وە هەردووك مەملەكەتی یهوذا و سامرە هەمیشە لە شەڕ و پێکدا دان بوون وە ئەگەر باکورییەکان بێ هێز بوونایە پەنایان دەبرد بۆ ئاشوریەکان وە باشوریەکانیش پەنایان دەبرد بۆ میسر و فیرعەونیەکان بۆ ئەوەی پشت گیریان بکەن دژ بە یەکتری و نەهێڵن بفەوتێن وە لە هەمووی گرنگ تر ئەوە بوو هەر یەك لەم مەملەكەتانە تەوراتی تایبەتی خۆیی هەبوو . وە بەم شێوەیە بەردەوام بوون لە بت پەرستی وە خودایان دەپەرست بە گوێرەی بتەکانیان و کتێبی تەوراتیان و پەرستنیان بە گوێرەی ئەو بتانە بوو کە دروستیان دەکرد . بۆیە خودا پێغەمبەر ارمیای بۆ ناردن وە پێێ گوتن مادام ئێوە خودا ناپەرستن و خەریکی بت پەرستین منیش بابلیەکانتان بۆ دەنێرم هەتا زەویی فلسطین پاك بکەمەوە لە بت پەرستیی ئێوە . سەیری **سفری ارمیا** بەشی ٢٥ دەقی ١ بۆ ١٤ بکەن.

http://www.kitebipiroz.com/bible/jer/25

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » یەرمیا » بەشی ٢٥

### حەفتا ساڵ ڕاپێچی

1 ئەو پەیامەی لە ساڵی چوارەمی یەهۆیاقیمی کوڕی یۆشیای پاشای یەهودا، کە دەکاتە ساڵی یەکەمی نەبوخودنەسری پاشای بابل، سەبارەت بە هەموو گەلی یەهودا بۆ یەرمیا هات.

2 ئەوەی یەرمیای پێغەمبەر سەبارەت بە هەموو گەلی یەهودا و بۆ هەموو دانیشتووانی ئۆرشەلیم ڕایگەیاند:

3 (لە ساڵی سێزدەیەمینی یۆشیای کوڕی ئامۆنی پاشای یەهوداوە هەتا ئەمڕۆ، ئەم بیست و سێ ساڵە، سروشی[a] یەزدانم بۆ دەهات و منیش بەردەوام قسەم لەگەڵ کردن، بەڵام ئێوە گوێتان نەگرت.

4 یەزدانیش بەردەوام هەموو بەندە پێغەمبەرەکانی خۆی بۆ ناردن، بەڵام ئێوە گوێتان نەگرت و گرنگیتان پێ نەدا.

5 پێیان وتن: (لە ڕەفتارە ناشیرین و کردەوە خراپەکانتان بگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی نیشتەجێ بن لەسەر ئەو خاکەی کە یەزدان داویەتییە ئێوە و باوباپیرانتان، لە ئەزەلەوە و بۆ هەتاهەتایە.

6 شوێنی خوداوەندەکانی دیکە مەکەون بۆ ئەوەی بیانپەرستن و کڕنۆشیان بۆ ببەن. بە دروستکراوەکانی دەستتان پەستم مەکەن و منیش سزاتان نادەم.)

7 یەزدان دەفەرموێت: (بەڵام گوێتان لێم نەگرت، بۆ ئەوەی بە دروستکراوەکانی دەستتان پەستم بکەن، بەخۆتان سزاتان بۆ سەر خۆتان هێنا.)

8 لەبەر ئەوە یەزدانی سوپاسالار ئەمە دەفەرموێت: (لەبەر ئەوەی ئێوە گوێتان لە قسەی من نەگرت،

9 ئەوەتا دەنێرم و هەموو خێڵەکانی باکوور کۆدەکەمەوە، هەروەها نەبوخودنەسری خزمەتکارم، پاشای بابل، جا دەیانهێنمە سەر ئەم خاکە و سەر دانیشتووانەکەی و سەر هەموو ئەو نەتەوانەی دەوروبەری. بە تەواوی قڕیان دەکەم[b] ، دەیانکەم بە مایەی تۆقین و تانە و تەشەر و وێرانییەکی هەتاهەتایی.

10 دەنگی بەزم و شادی، دەنگی بووک و زاوا، دەنگی دەستاڕ و ڕووناکی چرایان ناهێڵم.

11 هەموو ئەم خاکە دەبێتە وێرانەیەکی چۆڵ، ئەم نەتەوانەش حەفتا ساڵ خزمەتی پاشای بابل دەکەن.) ئەوە فەرمایشتی یەزدانە.

12 یەزدان دەفەرموێت: کە حەفتا ساڵەکە تەواو بوو، سزای پاشای بابل و ئەو نەتەوەیە دەدەم، لەسەر تاوانەکانیان، سزای خاکی بابلییەکانیش دەدەم و دەیکەمە چۆڵەوانییەکی هەتاهەتایی.

13 هەموو ئەوەی لەم سیپارەیەدا نووسراوە، ئەوەی یەرمیا سەبارەت بە هەموو ئەم نەتەوانە پێشبینی کرد، هەموو ئاگادارکردنەوەیەکی تێدا هاتووە کە سەبارەت بەو خاکە فەرموومە بەیرەوی دەکەم.

14 چونکە ئەوانیش دەبنە کۆیلەی زۆر نەتەوە و پاشای گەورە، بەگوێرەی کردەوە و کارەکانی خۆیان سزایان دەدەمەوە.)

### جامی تووڕەیی خودا

ئەوەی تا ئێستا تێی دەگەین ئەمەیە تەوراتی ئەسڵی موسا (ع) لای بنو اسرائیل نەبووە و لە سندوقی پەیمانداپە وە پاش مردنی موسا (ع) بنو اسرائیل بوون بە دوو مەملەکەت و دوو تەورات لەسەر بنەمای بت پەرستی نوسراوە . و ساڵی ٥٨٦ ی پێش لەدایك بوونی مسیح (ع) بابلیەکان بە سەرکردایەتی نبو خذ نصر هاتن فلسطینیان داگیر کرد . وە هەردووك مەملەکەتەکەیان ڕوخاند و تەنانەت خانووەکانیشیان و هەیکەلی سولەیمانیشیان ڕوخاند . وە هەموو کتێبەکانیشیان سوتاندن ، وە بنو ئیسرائیلیشیان برد بۆ بابل وە ١٠٠ ساڵ لە بابل مانەوە ،کەواتە بنو ئیسرائیل بەبێ کتێب و بە بێ پەرستگا بوون بۆ ماوەی ١٠٠ ساڵ . لەماوەی ئەم ١٠٠ ساڵەدا حاخامەکانی جولەکە جارێکی تر هەستانەوە بە نوسینی تەورات بەلام ئەم جارەیان بە ناوی ( تلمود ) نوسیان نەك کتێبی پیرۆزیان تەوراتی موسا . وە تلمودیش باسی عیبادات و جۆرەکانی و باسی کشت و کاڵ و نەخۆشییەکانی مرۆڤ و ئاژەڵ و چۆنێتیی چارەسەر کردنیان و عادات و تقالید و کلتوری جولەکە و لایەنەکانی تری ژیانی جولەکە دەکات . واتا بەس کتێبێکی ئاینی نییە وە ئەم تلمودەی بەر دەستمان ٢٠ مجلدە و هەر مجلدێکیش ١٠٠٠ لاپەڕەیە واتا ٢٠ هەزار لاپەڕەیە وە تلمود لە بابلەوە بوو بە سەرچاوە بۆ جولەکە تا ئێستامان کە ساڵی ٢٠١٥ یە . وە جولەکە و حاخامە کانیان ٩٩% پشت بە تلمود دەبەستن نەك تەورات . و تلمود جێگای تەوراتی

گرتوەتەوە بۆیان کە دەست نووسی خۆیانە و کتێبێکی ئاسمانی نییە . وە ١٠٠ ساڵ پاش ڕاپێچ کردنی جولەکە بۆ بابل فارسەکان بە سەرکردایەتیی کۆرش بابلیەکانیان ڕوخاند و ڕێگایان دا بە جولەکە بگەڕێنەوە بۆ فلسطین وە لە سەردەمی ارتحشستای کوڕی کۆرشدا فەرمانی بە عەزرا کرد کە بگەڕێتەوە بۆ فلسطین و هەیکەلی سلیمان بنیات بنێتەوە و جارێکی تر تەورات بنوسێتەوە کەواتە نوسینەوەی ئەم تەوراتەی بەردەستمان وەحیی خودا نییە . بەڵکو بە فەرمانی فارس نوسراوەتەوە بۆیە جارێکی تر تەورات نوسرایەوە لەسەر دەستی عەزرادا وەك لە **سفری عەزرا** بەشی ٧ دا نوسراوە خۆشتاب دەتوانن لێرەدا لە کتێبی پیرۆزدا بیخوێننەوە چۆن تەورات نوسرایەوە ؟

http://www.kitebipiroz.com/bible/ezr/7

.....................................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » عەزرا » بەشی ٧

## هاتنی عەزرا بۆ ئۆرشەلیم

**١-** پاش ئەم شتانە و لە سەردەمی پاشایەتی ئەرتەحشەستەی پاشای فارس، (عەزرا) کە کوڕی سەرایا کوڕی عەزەریا کوڕی حیلقیا

**2**-کوڕی شەلوم کوڕی سادۆق کوڕی ئەحیتوف

**٣**-کوڕی ئەمەریا کوڕی عەزەریا کوڕی مەرایۆت

**٤**-کوڕی زەرەحیا کوڕی عوزی کوڕی بوقی

**5** - کوڕی ئەبیشوەع کوڕی فینەحاس کوڕی ئەلعازاری کوڕی هارونی سەرۆك کاهین بوو

**٦**-ئەم عەزرایە لە بابلەوە سەرکەوت. مامۆستایەکی بە توانا بوو لە تەوراتی موسا، یەزدانی خودای ئیسرائیل پێی دابوو. پاشاش بەپێی ئەوەی یەزدانی خودای خۆی لەگەڵی بوو، هەموو ئەوەی داوای کردبوو پێی دابوو.

**٧**-هەندێك لە نەوەی ئیسرائیل و لە کاهین و لێڤی و گۆرانیبێژ و پاسەوان و کۆیلە تەرخانکراوەکان لەگەڵی بەرەو ئۆرشەلیم سەرکەوتن، لە ساڵی حەوتەمی ئەرتەحشەستەی پاشا.

**٨**-عەزرا لە مانگی پێنج لە ساڵی حەوتەمی پاشادا گەییشتە ئۆرشەلیم.

**٩**-لە مانگی یەکەوە دەستی پێکردبوو لە بابلەوە سەربکەوێت و لە یەکی مانگی پێنجدا گەییشتە ئۆرشەلیم، بەپێی ئەوەی دەستی چاکەی خوداکەی لەسەری بوو.

**١٠**-چونکە عەزرا خۆی تەرخان کردبوو بۆ خوێندنی تەوراتی یەزدان و کارکردن پێی، بۆ ئەوەی ئیسرائیل فێری فەرز و دادوەری بکات.

### نامەی ئەرتەحشەستەی پاشا بۆ عەزرا

**١١**-ئەمەش وێنەی ئەو نامەیەیە کە ئەرتەحشەستەی پاشا دایە عەزرای کاهین و مامۆستا، مامۆستای بابەتەکانی فەرمان و فەرزەکانی یەزدان بۆ ئیسرائیل:

**١٢**-لە ئەرتەحشەستەی پاشای پاشایانەوە،
بۆ عەزرای کاهین و مامۆستای تەوراتی خودای ئاسمان
پاش سڵاو:[a]

**١٣**-لەلایەن منەوە فەرمانێك دەرچووە کە هەر کەسێك لەناو پاشایەتییەکەی من لە گەلی ئیسرائیل و کاهین و لێڤییەکان بیەوێت لەگەڵ تۆ بگەڕێتەوە ئۆرشەلیم با بگەڕێتەوە.

**١٤**-تۆ لەلایەن پاشا و حەوت ڕاوێژکارەکەیەوە نێردراویت بۆ ئەوەی لە یەهودا و ئۆرشەلیم بکۆڵیتەوە، بەگوێرەی تەوراتی خوداکەت کە بە دەستتەوەیە،

**١٥**-هەروەها بۆ بارکردنی ئەو زێڕ و زیوانەی کە پاشا و ڕاوێژکارەکانی بەخشیویانە بە خودای ئیسرائیل، ئەوەی نشینگەکەی لە ئۆرشەلیمە.

**١٦**-لەگەڵ هەموو ئەو زێر و زیوەش کە لە هەرێمی بابل بە دەست دەکەوێت، لەگەڵ بەخشینە ئازادەکانی گەل و کاهینەکان کە دەیبەخشن بە پەرستگای خودای خۆیان، کە لە ئۆرشەلیمە.

**١٧**-دڵنیابە لەوەی بەم زیوە گا و بەران و بەرخی نێری لەگەڵ پێشکەشکراوی دانەوێڵە و شەراب بکڕیت و لەسەر قوربانگاکەی پەرستگای خوداتان کە لە ئۆرشەلیمە پێشکەشیان بکەیت.

**١٨**.-هەرچی خۆت و برا جولەکەکانت پێتان باش بوو بە پاشماوەی زێر و زیوەکە بیکەن، بەپێی خواستی خودای خۆتان بکەن.

**١٩**.-ئەو قاپوقاچاغەش کە بۆ خزمەتی پەرستگای خوداکەت پێت دەدرێت، لەبەردەم خودای ئۆرشەلیم دایبنێ.

**٢٠**.-پاشماوەی پێویستییەکانی پەرستگای خوداکەت کە بۆت ڕێك دەکەوێت بیدەیت، ئەوا لە گەنجینەکانی پاشاوە بیدە.

**٢١**-لە من، لە ئەرتەحشەستەی پاشاوە، فەرمان دەرچووە بۆ هەموو گەنجینەکانی هەرێمی ئەوبەری فورات کە هەرچی عەزرای کاهین و مامۆستای تەوراتی خودای ئاسمان داواتان لێ دەکات، با بە وردی جێبەجێ بکرێت،

.٢٢-زەیت و خوێش بەبێ سنوور [e]شەراب و سەد بەت [d]گەنم و سەد بەت [c]و سەد کۆر [b]هەتا سەد تالنت زیو

**٢٣**-هەرچی خودای ئاسمان فەرمانی پێداوە بە وردی بۆ پەرستگای خودای ئاسمان جێبەجێ بکرێت، چونکە بۆچی تووڕەیی لەسەر شانشینی پاشا و کوڕەکانی بێت؟

**٢٤**-هەروەها پێتان ڕادەگەیەنین کە هەموو کاهین و لێڤی و گۆرانیبێژ و دەرگاوان و کۆیلە تەرخانکراوەکان و خزمەتکارانی ئەم ماڵەی خودا، ڕێ نادرێت سەرانە و باج و گومرگیان لەسەر بێت.

**٢٥**-تۆش ئەی عەزرا، بەپێی دانایی خوداکەت کە بەدەستەوەیە، قازی و دادوەر دابنێ بۆ ئەوەی دادپەروەری بکەن بۆ هەموو ئەو گەلەی هەرێمی ئەوبەری فورات، لە هەموو ئەوانەی فێرکردنەکانی خودات دەزانن، ئەوانەش کە نایزانن، فێریان بکەن.

**٢٦**-هەر کەسێکیش کار بە فێرکردنەکانی خوداکەت و فێرکردنەکانی پاشا نەکات، با بە دڵنیاییەوە حوکمی بەسەردا بدرێت، بە سزای مردن یان دوورخستنەوە یان سزای دارایی یان زیندانی.)

**٢٧**-ستایش بۆ یەزدان، خودای باوباپیرانمان کە ئەم شتەی خستە دڵی پاشاوە بۆ شکۆدارکردنی ماڵی یەزدان، ئەوەی لە ئۆرشەلیمە.

**٢٨**-لەبەردەم پاشا و ڕاوێژکارەکانی و لەبەردەم هەموو کاربەدەستە تواناداەرکانی پاشا بە خۆشەویستییە نەگۆڕەکەی دایپۆشیم، منیش بەهۆی ئەو پشتگیرییەی یەزدانی خودام بەهێز بووم، جا لە ئیسرائیل ڕابەرەکانم کۆکردەوە تاوەکو لەگەڵم سەربکەون.)

---

**پرسیارە بێ وەڵامەکانمان** لێرەوە دەست پێ دەکات ؟ لە مەکە جولەکەی لێ نەبووە هەتا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوانەوە فێری ئاین بێت . وە قورئانیش ١٣ ساڵ لە مەکە دابەزی ئەگەر وەك سورەتەکان حسابی بۆ بکەین ٨٦ سورەتی لە مەکە دابەزیوە ٢٦ سورەت لە مەدینە یان ٤٤٧٥ ئایەت لە مەکە و ١٧١٦ ئایەت لە مەدینە دابەزیووە کەواتە لە کۆی قورئان ١٥% ی لە مەدینە دابەزیوە کە جولەکەی لێیە . وە لە سە دا پازدەش برێکی زۆری قورئان نییە و نابێت بە بەڵگە بۆ ئەوەی قورئان لە تەورات وەرگیراوە

دژە ئیسلامەکان دەڵێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوێندەوار بووە و لە کتێبەکانی جولەکەوە فێر بووە .لەم حاڵەدا قورئان خۆی دەبێت بە بەڵگە بۆ پوچەڵ کردنەوەی قورئان و ئاینی ئیسلام چونکە لە سورەتی العنكبوت ٤٨ دا دەفەرموێت : تۆ لەمەو پێش کتێبت نە خوێندوەتەوە و نەت نوسیووە . واتا پێش وەحی خوێندەوار نە بوویت . ئەی ئەگەر لە کتێب و سەرچاوەکانی جولەکەوە قورئانی وەر گرتبێت ئەو ئایەتە قورئان و بانگەشەی محمد (صلى الله عليه وسلم) بە درۆ دەخاتەوە و خەڵکی دەیان گوت ئاینی ئیسلام درۆیە و کابرا خوێندەوار بووە بەڵام ئەو ئایەتە دەڵێت نە خوێندەوار بووە ،پاشان کتێبی تەورات ٥٠٠ لاپەڕە دەبێت وە تلمودیش ٢٠ هەزار لاپەڕەیە ... ئادەی زەلامێکی ئاقڵ پێم بڵێت لەو زەمانەدا وەك ئێستا وەرەقە نە بووە ... ئادەی ٢٠٥٠٠ پێستەی

ئاژەڵ لە کوێدا دادەنرا ؟ وە چۆن دەتوانرا بخوێنرێتەوە ؟ هەرقەبارەی پێستەکان محمدی (صلى الله عليه وسلم) کەشف دەکرد کە لە جولەکەوە قورئانی وەرگرتووە !؟ پاشان زمانی جولەکە و سەرچاوەی کتێبی جولەکە عیبری بوە . ئەگەر جولەکە فێری قورئانیان بکردایە قورئان خۆی دەبوو بە بەڵگە بۆ پوچەڵ کردنەوەی قورئان چونکە لە سورەتی النحل ١٠٣ دا دەفەرموێت خەڵکی دەڵێن مرۆڤ ئەم قورئانەی فێردەکات بەڵام زمانی ئەوان غەیرە عەرەبییە بەڵام زمانی ئەم عەرەبیەکی ڕەوانە . ئەگەر سەرچاوەی قورئان تلمود و تەورات بوایە جولەکە ئەو ئایەتەیان بە درۆ نە دەخستەوە و بڵێن ئێمە فێرمان کردووە !؟ یان خەڵکی نەی دەبینی کە هات و چۆی جولەکە دەکات ؟ وە خەڵکی بە درۆیان نە دەخستەوە کە هەمیشە لای جولەکەیە و لەوانەوە فێری ئەم قورئانە بووە ؟

پاشان سورەتی **مائده** ١٥ بە ئاسانی دەی توانی بانگەشەی ئیسلام بە درۆ بخاتەوە چونکە دەفەرموێت ئەی ئەهلی کیتاب واتا جولەکە و مەسیحیەکان نێرراومان بۆ ناردون واتا محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەوانەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئێوە شاردوتانەتەوە لە کتێبەکانتاندا . وە ئەمەی محمد (صلى الله عليه وسلم) بۆی هێناون نور و کتێبێکی ڕوون و ئاشکرایە ...

بەڕێزان ئەگەر کەسێك یە ك تۆز ئەقڵی هەبێت . ئەگەر قورئان لە تەوراتەوە وەرگیرا بێت شتی بەو شێوەیە باس دەکات ؟ ئایا جولەکەکان و خەڵکیش بە درۆی ناخەنەوە بڵێن بابە سەرچاوەی قورئانەکەی جەنابت تەورات و تلمودە . کەچی پێمان دەڵێیت کتێبەکەتان تحریفە !؟ ئایا بەو ئایەتە حەیای ئیسلام و قورئانیان نەدەبرد و پوچەڵیاان نە دەکردەوە ؟ئایات و بەڵگە زۆرن کە دەبووە هۆکاری پوچەڵ کردنەوەی ئاینی ئیسلام و قورئان . بە ئایەتی ٨٢ ی سورەتی **النساء** کۆتایی پێ دەهێنم کە دەفەرموێت : ئەگەر ئەم قورئانە لە لایەن خوداوە نەبوایە جیاوازی و شتی دژ بەیەکی زۆری تێدا دەبوو .... ئەگەر قورئان لە تەورات و تلمودەوە وەرگیرایە طبعا خەڵکی گاڵتەیان بەم ئایەتە دەهات و دەیان گوت محمد (صلى الله عليه وسلم) شەو ڕۆژ لای جولەکەکانە و سەرچاوەی قورئانە کەی لە تەوات و تلمودەوە وەرگرتووە کەچی دەڵێت سەرچاوەم خودایە و لو خوداوە وەحیم بۆ دێت

بەڵێ بەڕێزان ئەوانەی دەڵێن قورئان لە کتێبە ئاسمانیەکانی ترەوە وەرگیراوە نەشارەزان لە کتێبە ئاسمانییەکان و لە مێژووش چونکە هەر بە ئایەتەکانی قورئان دەتوانرا قورئانەکە بە درۆ بخرێتەوە کە لە جولەکەو لە تەوراتەوە وەرگیراوە و بانگەشەی ئیسلام درۆیە . قورئان هێرش دەکاتە سەر اهل الكتاب کە کتێبەکانیان درۆیە و تحریف کراوە . ئەی بۆچی اهل الكتاب قورئانیان بە درۆ نە دەخستەوە و بڵێن ئێمە فێری قورئانی دەکەین و ئەو قسانەی قورئان درۆیە . ئەمەش بەڵگەکانمانە

## پرسیاره بێ وەلأمەكان ژماره :شەست

## ئایا قورئان هەڵەی كردوه و مریم خوشكی هارون بوو ؟

له ئایەتی ٢٨ ی سورەتی مریمدا خودای زانا دەفەرموێت : (**یا أخت هارون ما كان أبوك امرأ سوء وما كانت أمك بغیا**) . لێرەدا مریمی دایكی مەسیح (ع) ناو دەبات بە خوشكی هارون . بێدین و گاورەكان دەڵێن خودا نەی زانیوه كه مریم خوشكی هارون و موسا نییه و هەڵەی كردووه و مەریەمی بە خوشكی هارون له قەڵەم داوه له **قورئان دا**

بۆ ئەوەی بە جوانی له ئایەتی ٢٨ تێ بگەین دەبێت لەگەڵ سیاقی ئایەتەكاندا بڕۆین ئەگەرله ئایەتی ١٦ وه بیخوێنینەوه . باس لەوه دەكات چۆن مریم (ع) حامله بووه بە عیسا (ع) وه كاتێك منداڵەكەی بوه قەومەكەی بینیویانه . وه قەومەكەی واتا جولەكەكان لێی دەپرسن و پێی دەڵێن : ئەی خوشكی هارون تۆ باوكت پیاوێكی خراپ نەبوو دایكیشت لەش فرۆش نەبووه ئەم منداڵەت لەكوێ بوو ؟ كەواته ئەم ناونانه بە خوشكی هارون قسەی جولەكەیه و پرسیاری جولەكەیه له مریم وه قورئان وەك بەسەرهاتێك دەی گێڕێتەوه چی ڕووی داوه ؟ نەك وەسفی یان ناو نانی خودا بێت بۆ مریم پرسیاری گرنگ لێرەدایه : بۆچی جولەكه بە خوشكی موسا ناویان نەبرد و بە خوشكی هارون ناویان هێنا ؟ چونكه هارون یەكەم كاهینی جولەكه بوو .

وه له شەریعەتی تەوراتدا له سفری اللاوین ( ڕێنمایی كاهین ) بەشی ٢١ دەقی ١٠ دا نوسراوه : ئەگەركچی كاهین به لەشفرۆشی گلاو بوو، ئەوا باوكی گلاو كردووه، دەبێت كچەكه بە ئاگر بسوتێنرێت ... وه مریەمیش كچی عیمرانه و منداڵێكی بووه بە بێ باوك ئەگەرساغ بێتەوه ئەو منداڵه زۆڵه دەبێت مریم بسوتێندرێت. هەروەها لای جولەكه هارون بە سەرچاوەی فیتنه و دوبەرەكی دادەنرێت چونكه كاتێك موسا (ع) چوو قسه لەگەڵ خودادا بكات هارون گوێرەكەیەكی له ئاڵتون دروست كرد و گوتی ئەمه خودای ئێوەیه كاتێك موسا گەڕایەوه توڕه بوو گوتی ئەو كەسانه بكوژن كه گوێرەكەكەیان پەرستووه لەو ڕۆژەدا سێ هەزاركەسیان كوشت له جولەكه . وه ئەگەرساغ ببێتەوه ئەو منداڵەی مریەم باوكی كێیه ؟ ئەو كات شەڕ و فیتنەی گەوره ڕوو دەدات و خەڵكێكی زۆر دەكوژرێت . بۆیه جولەكه بە خوشكی هارون ناویان بردوه نەك خوشكی موسا ! خۆیان دەزانن چی دەڵێن و ساغ بونەوەی ئەو منداڵه باوكی كێیه كیشەی زۆری لێ دروست دەبێت . لەم لینكەش دەتوانن دڵنیابن له پەرستنی گوێرەكه له **سـفر الخـروج دەرچون ٣٢**

http://www.kitebipiroz.com/bible/exo/32

.............................................

بابەتی ناو لینکەکە

کتێبی پیرۆز » دەرچوون » بەشی ٣٢

## گوێرەکە زێرینە لەقاڵبدراوەکە

**١-**کاتێك گەل بینی موسا دواکەوت لە هاتنە خوارەوە لە کێوەکە، جا لەسەر هارون کۆبوونەوە و پێیان وت: (وەرە! چەند خوداوەندێکمان بۆ دروست بکە لەپێشمانەوە بڕۆن، چونکە ئەم موسایە، ئەو پیاوەی ئێمەی لە خاکی میسرەوە دەرهێنا نازانین چی لێهات).

**٢-**هارونیش پێی وتن: (ئەو گوارە زێرانەی لە گوێی ژن و کور و کچەکانتاندان لێی بکەنەوە و بۆ منی بهێنن).

**٣-**جا هەموو گەل ئەو گوارانەی لە گوێیان بوون لێیان کردنەوە و بۆ هارونیان هێنا.

٤-ئەویش لە دەستیانی وەرگرت و بە قەڵەم و چەکوش وێنەی کێشا و کردی بە گوێرەکەیەکی لەقاڵبدراو، جا وتیان: (ئەی ئیسرائیل، ئەمە خوداوەندەکەمانە، ئەوەی ئێمەی لە خاکی میسرەوە دەرهێنا ).

**٥-**کاتێك هارون ئەمەی بینی، قوربانگایەکی لەپێش گوێرەکەکە دروستکرد و بانگەوازی دا و وتی: (بەیانی جەژنە بۆ یەزدان >

٦-ئینجا بەیانی زوو هەڵستان و قوربانیسووتاندنیان سەرخست و قوربانیهاوبەشییان پێشکەشکرد، ئینجا گەل بۆ خواردن و خواردنەوە دانیشتن، پاشان هەڵستان بۆ ڕابواردن.

٧-جا یەزدان بە موسای فەرموو: (بڕۆ خوارەوە، چونکە گەلەکەت گەندەڵ بوو، ئەوەی لە خاکی میسرەوە هێناتە دەرەوە.

٨- زوو لایان دا لەو ڕێگایەی کە فەرمانم پێکردن، گوێرەکەیەکی لەقاڵبدراویان بۆ خۆیان دروستکردووە و کڕنۆشی بۆ دەبەن و قوربانی بۆ سەر دەبڕن و دەڵێن: "ئەی ئیسرائیل، ئەمە خوداوەندەکەمانە، ئەوەی ئێمەی لە خاکی میسرەوە دەرهێنا ).

٩- هەروەها یەزدان بە موسای فەرموو: (تەماشای ئەم گەلەم کرد و ئەوەتا گەلێکی کەللەڕەقن).

١٠-ئێستاش لێم گەڕێ با تووڕەییم بەسەریاندا بێتە جۆش و کۆتاییان پێ بهێنم، تۆش دەکەم بە گەلێکی مەزن.

١١- موساش لە یەزدان، خودای خۆی پاڕایەوە و وتی: یەزدان، بۆچی تووڕەییت بەسەر گەلەکەت دێتە جۆش، کە لە خاکی میسرەوە بە توانایەکی مەزن و دەستێکی بەهێزەوە دەرتهێنا؟

١٢- بۆچی میسرییەکان بڵێن: "بە نیازخراپی دەریهێنان هەتا لە کێوەکان بیانکوژێت و لەسەر ڕووی زەوی نەیانهێڵێت؟" جۆشی تووڕەییت دابمرکێنەوە و ئەو سزایە ڕەتبکەرەوە کە فەرمووت بەسەر گەلەکەتدا بیسەپێنیت.

١٣- ئیبراهیم و ئیسحاق و ئیسرائیلی خزمەتکارانت بەبیر بێتەوە کە بە گیانی خۆت سوێندت بۆیان خوارد و پێت فەرموون، نەوەکانتان زۆر دەکەم وەك ئەستێرەکانی ئاسمان و هەموو ئەم خاکەش کە باسم کرد، دەیدەم بە نەوەکانتان و دەبێتە موڵکیان بۆ هەتاهەتایە .

١٤- جا یەزدان پاشگەز بۆوە لەو کارەساتەی فەرمووی، کە ویستی بە گەلەکەی بکات.

١٥- جا موسا ڕووی وەرگێڕا و لە کێوەکە هاتە خوارەوە و هەردوو تەختەی شایەتییەکەش بە دەستیەوە بوو، ئەو تەختانەی لە هەردوو ڕووەکەی نووسرابوون، لەم لاو لەو لاوە نووسرابوون.

١٦- تەختەکان دەستکردی خودان و نووسینەکەش نووسینی خودایە لەسەر تەختەکان نەخشێنراوە.

١٧-کاتێك یەشوع گوێی لە دەنگی گەل بوو کە هاواریان دەکرد، بە موسای وت: (دەنگی جەنگە لە ئۆردوگاکە)!

١٨-ئەویش وتی:
(نە دەنگی هاواری سەرکەوتنە،
نە دەنگی هاواری دۆڕاندنە،
بەڵکو دەنگی گۆرانییە، ئەوەی گوێم لێیە.)

١٩- ئەوە بوو کاتێك لە ئۆردوگاکە نزیك کەوتەوە، چاوی بە گوێرەکە و سەما کەوت، جا تووڕەیی موسا جۆشا و هەردوو تەختەکەی لە دەستیەوە فڕێدا و لە خوار کێوەکە شکاندنی.

٢٠- ئینجا ئەو گوێرەکەیەی دروستیان کردبوو بردی و سووتاندی و هاڕی تا بوو بە تۆز و بەسەر ئاوەکەدا بەبای کرد و ئاوەکەی بە نەوەی ئیسرائیل خواردەوە.

**٢١-** موسا بە هارونی وت: (ئەم گەلە چییان لێکردوویت تا ئەو گوناهە گەورەیەیان بەسەر بهێنیت؟)

٢٢- هارونیش وتی: (با تووڕەیی گەورەم نەجۆشێت، خۆت ئەم گەلە دەناسیت کەوا لە خراپەدایە.

٢٣- پێیان وتم: "چەند خوداوەندێکمان بۆ دروست بکە لەپێشمانەوە بڕۆن، چونکە ئەم موسایە، ئەو پیاوەی ئێمەی لە خاکی میسرەوە دەرهێنا، نازانین چی لێهات".

٢٤- منیش پێم وتن: "کێ زێری هەیە با لێی بکاتەوە و بمداتێ: "جا فڕێم دایە ناو ئاگرەوە و ئەم گوێرەکەیەی لێ دەرچوو

٢٥- موسا بینی گەل بەرەڵا کراوە، چونکە هارون بەرەڵای کردبوون تا ببن بە گاڵتەجاڕ لەنێو بەرهەڵستکارانیان.

٢٦- ئینجا موسا لە دەروازەی ئۆردوگاکە وەستا و وتی: (کێ بۆ یەزدانە با بێتە لام.) جا هەموو نەوەی لێڤی لێی کۆبوونەوە.

٢٧- ئەویش پێی وتن: (یەزدان، خودای ئیسرائیل ئەمە دەفەرمووێت: "با هەریەکە شمشێرەکەی بکات بە لاڕانییەوە، دەروازە بە دەروازە بە ئۆردوگاکەدا تێپەڕن و بگەڕێنەوە، با هەریەکە بکوژێت، جا برای بێت یان هاوڕێ یان دراوسێ ).

٢٨- نەوەی لێڤیش بەم جۆرەیان کرد، وەك موسا وتی و ئەو ڕۆژە نزیکەی سێ هەزار پیاو لە گەل کەوتن.

٢٩- موسا وتی: (ئەمڕۆ ئێوە تەرخان کراون بۆ یەزدان، لەبەر ئەوەی ئێوە لە دژی کوڕ و براکانتان بوون، جا ئەمڕۆ بەرەکەتتان بەسەردا دەدات).

**٣٠-** ئەوە بوو بۆ بەیانی موسا بە گەلی وت: (ئێوە گوناهێکی گەورەتان کردووە، بەڵام ئێستا سەردەکەوم بۆ لای یەزدان، بەڵکو کەفارەتی گوناهەکەتان بکەم ).

٣١- جا موسا گەڕایەوە لای یەزدان و وتی: (ئای کە ئەم گەلە گوناهێکی گەورەی کرد و خوداوەندی زێڕیان بۆ خۆیان دروستکرد،

٣٢- ئێستاش لە گوناهیان خۆش بە، ئەگەر نا، لە پەڕتووکەکەی خۆت بمسڕەوە کە نووسیوتە)

**٣٣-** یەزدانیش بە موسای فەرموو: (ئەوەی گوناهی سەبارەت بە من کردبێت لە پەڕتووکی خۆم دەیسڕمەوە.

٣٤- ئێستاش بڕۆ ڕێبەری گەل بکە بۆ ئەو شوێنەی پێم وتیت، ئەوەتا فریشتەکەم لەپێشتەوە دەڕوات، بەڵام لە ڕۆژی بەسەرکردنەوەم گوناهەکانیان بەسەر دەکەمەوە(.

**٣٥-** ئیتر یەزدان گەلی تووشی دەرد کرد لەسەر ئەوەی لەگەڵ گوێرەکەکە کردیان کە هارون دروستی کردبوو.

........................................................

پاشان با بزانین لە ئەدەبیاتی جولەکەدا خەڵکی تریان بە ناوی خوشکی یان کوڕی یان نەوەی فلان بانگ کردووە ؟ لە ئینجیلی مەتا بەشی ٣ دەقی ٩ دا مەسیح (ع) قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات و ابراهیم (ع) بە باوکیان ناو دەبات . ئایا ابراهیم (ع) باوکی ئەو خەڵکە بووە کە لە زەمانی عیسادا ژیاون ؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر. وە نێوان ابراهیم و عیسا ١٨٠٠ ساڵ هەبووە . ئەمەش دەقەکەیە **متــا** ٣-٩ بیرمەکەنەوە بەخۆتان بڵێن: "ئیبراهیم باوکمانە." پێتان دەڵێم، خودا دەتوانێت لەم بەردانە نەوە بۆ ئیبراهیم دروست بکاتهەر **ئینجیلـی مـەتا** بەشی ١ دەقی ٢٠ ناوی یوسفی دارتاشی دەزگیرانی مریەم بە کوڕی داود دەبات . ئایا یوسف کوڕی داود بوو یان سلیمان کوڕی داود بوو ؟ هەروەها لە **ئینجیلـی لۆقـادا** بەشی ١٣ دەقی ١٦ دا ئافرەتێك شەیتان چوبوە ناو لەشیەوە مەسیح چاکی کردەوە جولەکەکان ڕەخنەیان لێگرت چۆن لە شەمەدا کار دەکات و خەڵکی چاك دەکاتەوە مسیحیش پێی گوتن ئەوەش کە کچی ئیبراهیمە و هەژدە ساڵە شەیتان بەستویەتییەوە، نەدەبوو لە ڕۆژی شەممەدا لەم بەندە ئازاد بێت ؟ خۆ ئەو کچە کچی ئیبراهیم نەبووە ! بۆچی مسیح بە کچی ابراهیم ناوی بردووە ؟هەروەها زۆر دەقی تر هەیە کە مسیح بانگی خەڵکی کردووە من دەقەکانتان بۆ دەنوسم . لە **ئینجیلــی لۆقــا** بەشی ١٩ دەقی ٩ دا مسیح زەکای باجگری بە کوڕی ئیبراهیم ناو بردووە . لە **ئینجیلی مەتا** ١٥ – ٢٢ دا ئافرەتێکی غەیرە جولەکە هاوار بۆ مسیح دەکات و بە کوڕی داود بانگی دەکات . هەر لە **متا** ٩ – ٢٧ دا دوو کوێر بانگی مسیح دەکەن و دەڵێن ئەی کوڕی داود چاکمان بکەرەوە . بۆیە بەڵگەکانیشمان لە ئینجیلەکان بۆ هێنانەوە هەتا مەسیحییەکان بزانن ئەو جۆرە بانگ کردنانە لە ئەدەبیاتی جولەکەدا ئاسایی بووە و ئەوەتا مسیحیان بە کوڕی داود ناو بردوە لە کاتێکدا سلیمان کوڕی داودە نەك مەسیح !؟ وە جولەکەش کاتێك بە مریەمیان گوتووە ئەی خوشکی هارون . چونکە مریم لە نەوەی لاوییەکان بووە و مریەمیان گەڕاندوەتەوە بۆ ئەسڵی ڕەچەڵەکی خۆی . چۆن مسیحیان گەڕاندوەتەوە بۆ کوڕی داود وە چۆن

مسیح خەڵكی سادەی گەڕاندوەتەوە بۆ ابراهیم و بە كوڕی ئیبراهیم ناوی بردوون . وە ئەو ئایەتە ی قورئانیش لە زمانی جولەكەوە قسە دەكات كە مریەمیان گەڕاندوەتەوە بۆ ئەسڵی ڕەچەڵەكی خۆی كە لەنەوەی هارونە و بە خوشكی هارون ناویان بردووە و خودای زاناش لە زمانی جولەكەوە لە قورئاندا ئەو حیوارەی بۆ گواستوینەتەوە .

**پرسیارە بێ وەلامەكانمان لێرەوە دەست پێ دەكات :** ئەو ئایەتە لە زمانی جولەكەوە قسە دەكات و بەسەر هاتەكە دەگێڕێتەوە یان قورئان باسی ڕەچەڵەكی مریەم دەكات ؟ خودا نەی زانیوە باو باپیرانی مریم كێیە ؟ یان ئەم **گاورانەی** ئێستا گێلن و شارەزای كتێبەكەی خۆیان نین ؟ وە نازانن كە مریم لە ڕەچەڵكی لاویەكانە و دەگەڕێتەوە بۆ نەوەی هارون ؟ بۆ ئەوەی ڕادەی نەزانیی مەسیحییەكانتان بۆ دەر بكەوێت لە كتێبەكانی خۆیان . ئەمە كۆتا بزمارە لە تابوتیان دەدەین و ڕەچەڵەكی مریەمی دایكی عیساتان بۆ ڕون دەكەینەوە بە گوێرەی كتێبەكانی خۆیان .

**لە سفر العدد ( سەرژمێری ) بەشی ٣٦ دەقی ٧ بۆ نۆدا نوسراوە**

میراتی نەوەی ئیسرائیل لە هۆزێكەوە بۆ هۆزێكی دیكە ناگوازرێتەوە، بەڵكو نەوەی ئیسرائیل هەریەكە پابەندی میراتی هۆزی باوكانی دەبێت هەر كچێكیش لە هۆزەكانی نەوەی ئیسرائیل میراتی وەرگرت ئەوا دەبێتە ژنی یەكێك لە خێڵی هۆزی باوك تا نەوەی ئیسرائیل هەریەكە ببێت بە میراتگری میراتی باوكانی جا هیچ میراتێك لە هۆزێكەوە بۆ هۆزێكی دیكە ناگوازرێتەوە، بەڵكو هۆزەكانی نەوەی ئیسرائیل هەریەكە پابەندی میراتی خۆی دەبێت

لەم دەقانە تێ دەگەین هەموو هۆزێكی نەوەی ئیسرائیل شوو بە هۆزی خۆی دەكات و كچیش دەبێت بە میرات گری نەوەی باوك و هۆزەكەی . كەواتە مریمی دایكی عیساش میرات گری هۆزی خۆیەتی . با ئێستا بزانین مریم لە هۆزی كێیە ؟ لە **ئینجیلی لۆقادا** ١- ٥ دا نوسراوە : لە سەردەمی هێرۆدسی پاشای یەهودیا، كاهینێك لە بەشی نەوەی ئەبیاهەبو ناوی زەكەریا بوو، ئەلیساباتی ژنیشی لە نەوەی هارون بوو .

ئەو دەقەی سەرەوە باسی سیدنا زكریای باوكی یەحیا دەكات علیهما السلام وە دەڵێت ژنەكەی زكریا كە ناوی الیسابات بوو لە نەوەی هارون بوو (ع) هەر هەمان بەش لە ئینجیلی لۆقا لە دەقی ٣٦ دا نوسراوە لو ١-٣٦ ئەوەتا ئەلیساباتی خزمیشت بەو پیریەی سكی بە كوڕێك هەیە . ئەوەی بە نەزۆك ناودەبرا لە شەشەم مانگیەتی. لێرەدا ئەو فریشتەیەی مزگێنی دەدات بە مریم (ع) پێی دەڵێت لات سەیر نەبێت كە تۆ شووت نەكردوە و منداڵت دەبێت !!؟ ئەوەتا الیساباتی خزمیشت كە نەزۆك بوو پیریش بو سكی ( ٦ ) مانگە . وە الیسابات لە نەوەی هارونە و مریمیش خزمی الیساباتە وە كچیش جێگری باوكێتی لە هۆزەكانی ئیسرائیل و هەموو كچێكیش شوو دەكات بە كوڕانی هۆزەكانی خۆیان بە گوێرەی تەورات. كەواتە زكریا و الیسابات و مریم علیهم السلام هەرسێكیان لە نەوەی هارونن .وەك لە سەریشەوە باسمان كرد لە ئەدەبیاتی جولەكەدا خەڵكی بە ناوی باپیرانیانەوە بانگ كراون . كەواتە كاتێك قورئان دەڵێت یا اخت هارون مەبەستی لەوە نییە مریم خوشكی هارون بوبێت . بەڵكو قورئان لەزمانی جولەكەوە بۆمان دەگێڕێتەوە مریمیان بانگ

كردووە بە گوێرەی هۆز و ڕەچەڵەكەكەی بەلام كێشە لەوەدایە كابرای مەسیحی سارەزای ئاینەكەی خۆی نییە و شارەزای ئەدەبیاتی جولەكە نیە و سارەزای ڕەچەڵەكی هۆزەكانی جولەكەش نییە . بەڵام كابرای جولەكە لەو سەردەمەدا و تا ئێستاش یەكتری دەناسن و دەزانن هەر تاكێكیان سەر بەچی هۆزێكن . وە قورئان هەڵەی نەكردووە !! بەڵكو تاكی مەسیحی گێلن و لە كتێبەكەی خۆیان شارەزا نین.

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە :** بۆچی جولەكەكانی مەدینە ئەو ئایەتەیان بە درۆ نەخستەوە ؟ خۆ ئەو سورەتە مەكییە . جولەكە دەی توانی بە ئاسانی قورئان پوچەڵ بكاتەوە و بڵێت مریم خوشكی هارون نەبووە . خەڵكیش زیاتر باوەڕیان بە جولەكە دەكرد . چونكە باسی جولەكە دەكات

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :شەست و یەك

## ئایا ڕوداوی فیل ڕاستە یان درۆیە ؟

لە قورئانی پیرۆزدا باسی ڕوداوی فیل كراوە و سورەتەكەش هەر بەناوی سورەتی **الفیلەوەیە** و پێك هاتووە لە ٥ ئایەت . دژە ئیسلامییەكان دەڵێن ئەو ڕوداوە لە مێژوودا باس نەكراوە و قورئان باسی شتێك دەكات ڕوی نەداوە و ئەو بەسەرهاتە ڕاست نییە . بۆ وەڵامی ئەم گومانەش دەبێت بگەڕێینەوە بۆ مەكە و بۆ كاتی دابەزینی ئەم سورەتە بزانین وا بووە یان نا ؟

ئەم ڕوداوە لە شیعری شاعیرانی جاهیلی پێش دابەزینی قورئاندا هەبووە وەك عبداللە بن الزعبري وە ابو القیس بن اسلت الانصاري وە طالب بن ابي طالب بن عبدالمطلب وە ابو الصلت بن ابي ربیعة الثقفي وە نفیل بن ربیعة الثقفي وە نفیل بن حبیب الخثعمي وە باپیرەی پێغەمبەریش (صلی اللە علیه وسلم) عبد المطلب شیعری گوتووە و خۆی لە ڕوداوەكەدا بەشدار بووە و لە شیعرەكەیدا دەڵێت

**لاهم إن المرء یمنع رحله فامنع رحالكم لا یغلبن صلیبهم ومحالهم أبداً محالك**

كەواتە خەڵكی مەكە ئاگاداری ئەو ڕوداوە بون و شیعریان پێدا هەڵداوە . پاشان سورەتی فیل مەكییە واتا لە مەكە دابەزیوە . ڕوداوەكەش لە مەكە بوە و خەڵكانێكی زۆر بینیویانە یان باو باپیرانیان بۆیان گێڕاو نەتەوە . ئەگەر ڕوداوەكە ڕاست نەبوایە ، ئەو سورەتە دەبوو بە مایەی پوچەڵ كردنەوەی قورئان و موشریكەكانی قورەیش دەیان گوت ئەوەتا محمد (صلی اللە علیه وسلم) درۆ دەكات و باسی ڕوداوێك دەكات ڕوی نەداوە

**پرسیاری بێ وەڵاممان ئەمەیە** .چی کاتێك بەدرۆ خستنەوەی ئەم ئایەتە کاریگەری دەبوو ؟ ١٤٠٠ ساڵ لەمەوپێش کە خەڵکی خۆیان لە مەکەدا دەهیان و ئاگاداری ڕوداوەکە بوون ؟ یان پاش ١٤٠٠ ساڵ پاش ڕوداوەکە کە کابرای بێدین ڕەخنە دەگرێت هیچ بەڵگەیەکی پێ نییە ؟ کامیان دەیان توانی ئاینی ئیسلام و قورئان پوچەڵ بکەنەوە کافرێکی قورەیشی کە خۆی لە ڕوداوەکان شارەزاتر بوو . یان کافرێکی نەزان پاش ١٤٠٠ ساڵ ئەو ڕوداوە بەدرۆ دەخاتەوە بێ بەڵگە !؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :شەست و دوو

## چی دەبێت ئەگەر هەموو قورئانەکان بسوتێنرێت ؟

دژە ئیسلامەکان بە حساب ڕەخنە دەگرن لەوەی سەرچاوەی قورئان نادیارە !؟ وە بۆچی عوسمانی کوڕ ی عەفان قورئانەکانی سوتاند !؟ وە چۆن دڵنیا بین لەوەی ئەو نوسینانەی لە زەمانی عوسماندا نوسراوە تەوە ڕاستە یان نا ؟ لە هەمان کاتیشدا خۆیان لە ئێمەی موسوڵمان باشتر دەزانن قورئان بە ٢٣ ساڵ دابەزیوە و هەموو صحابەکان قورئانیان لەبەر بووە . ئەگەر هەموو نوسخەکانیش بسوتێنرایە ئاسان بوو جارێکی تر بنوسرێتەوە

ئەگەر بێت لە ئێستادا واتا ساڵی ٢٠١٥ دا بێین هەموو قورئانەکان جارێکی تر بسوتێنینەوە . لە ئینتەرنێتدا بەهەمان شێوە بیسڕینەوە . ئایا دەتوانین جارێکی تر بینوسینەوە ؟ بۆ تەحەدای زیاتریش با لیژنەیەکی نێو دەوڵەتی پێك بهێنن بۆ نوسینەوەی . وە پەنا دەبەین بەس بە تەنها بە مرۆڤە نابیناکان کە عەرەب نین با ئەوان بیڵێن و لیژنەکە بی نوسێتەوە . ئایا هەمان قورئانی زەمانی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) دەست دەکەوێتەوە یان نا ؟

. **پرسیاری بێ وەڵاممان ئەمەیە** : ئایا کڵێسا دەتوانێت ئەم کارە بکات ؟ بە شەرتێك با ئەوان قەشەکانیان و پاپاکانیان بێن و بتوانن جارێکی تر کتێبی پیرۆز وەك خۆی بنوسنەوە ... ئەوە باسی خەڵکی عەوام و نا بیناکانیان ناکەم کە فڕیان بە کتێبەکەیانەوە نییە ؟ فەرموون پاپاکان و کڵێسا جیاجیا کانتان کۆ بکەنەوە و بتوانن جارێکی تر کتێبی پیرۆز بنوسنەوە ؟ ئادەی ناوی یە ك کەس یان یە ك قەشەمان پێ بڵێن بە درێژایی ٢٠٠٠ ساڵ حافزی کتێبی پیرۆز بوو بێت ؟

بەڵێ بەڕێزان دروست کردنی ئەم گومانە لە لایەن کڵێساوەیە چونکە خۆیان نازانن کتێبەکانیان لە کوێ و چۆن و کەی نوسیووە ؟ و تا ئێستاش نازانن نوسخەی ئەسڵی تەوراتی موسا لە کوێیە ؟ بۆیە دێن ئەم گومانانە دروست دەکەن لەسەر قورئان و ئاینی ئیسلامی مەزن .

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :شەست و سێ

## نوسخەی قورئانی یەمەن




دژە ئیسلامەکان دەڵێن قورئانێك دۆزراوەتەوە لە یەمەن بە پێچەوانەی ئەم قورئانەی بەردەستمانە وە وێنەیەك بڵاو دەکەنەوە وەك **سەرەوە دیارە** وە دەڵێن قورئان هەڵەی تێدایە و سەیری کۆن ترین نوسخەی قورئان بکەن کە ٩٠ ساڵ دوای مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوسراوەتەوە ژمارە ی ئایەتەکانی سورەتی **الاعراف** ١٦٥ ئایەتە . بەڵام لە نوسخەکانی ئێستای بەردەستماندا ژمارەی ئایەتە کانی سورەتی **الاعراف** ٢٠٦ ئایەتە . بۆ زانینی ئەم گومانە دەبێت لە پێشدا بزانین ئەم نوسخەیە کەی دۆزراوەتەوە و کێ پشکنینی بۆ کردووە ؟

Puin Ger خێرد پوین ڕۆژهەڵات ناسێکی المانییە لە ساڵی ١٩٤٠ لەدایك بووە و شارەزایە لە بواری دەست نووسە کۆنەکانی قورئان دا . وە لە ساڵی ١٩٧٢ دا بە فەرمانی حکومەتی یەمەنی هەستا بە پشکنین بۆ دەقە نوسراوە کۆنەکانی قورئان کە لە یەمەندا هەبوو . وە خێرد دەڵێت ئەم قورئانانەی ئێستا هەمان قورئان نییە کە لە زەمانی محمد دا (صلى الله عليه وسلم) هەبووە . ئەمە ئەسڵی ئەو گومانەیە دەربارەی نوسخەی قورئان ی یەمەن وە ناوی ڕۆژهەڵات ناسەکەم وەك خۆی نوسیووە خۆشتان دەتوانن بەدواداچوونی بۆ بکەن

پاش ئەوەی سەرچاوەی ئەو کەسە و ساڵی پشکنینەکەیمان زانی . دەتوانین خۆمان بگەڕێین و لە ماڵ پەڕ و سەرچاوە ئەڵمانییە ئەسڵییەکان بگەڕێین و ڕاست و دروستیی ئەوەمان بۆ دەربکەوێت ئایا سورەتی **الاعراف** ١٦٥ ئایەت بووە یان **٢٠٦** ئایەت ؟ بە

ووردی سەیری وێنەکە بکەن لە سەری سەرەوە بە کۆتا ئایەتی سورەتی سورەتی الانعام دەست پێ دەکات کە دەکاتە ئایەتی ١٦٥ ی سورەتی **الانعامی** تێدا نوسراوە **( و هو الذي جعلكم خلائف الارض و رفع بعضكم فوق بعض درجات ليبلوكم فيما اتاكم ان ربك سريع العقاب و انه لغفور رحيم) .**

پاشان نوسراوە : سورة الاعراف مائة و خمسون و ستون اية واتا سورەتی **الاعراف** ١٦٥ ئایەتە . نوسینی ناو ژمارەی ئایەتەکان بە بسم الله الرحمن الرحيم دەست پێ دەکات وە پاشان نوسراوە( **المص كتاب انزل اليك فلا يكن في صدرك حرج منه)** هەتا کۆتایی ئایەتەکانی تر . هەر ئەو وێنەیەی خۆیان بڵاوی دەکەنەوە شاهیدی دەدات بۆ ئەوەی ئەو لاپەڕەیە کۆتایی سورەتی **الانعام** و سەرەتای سورەتی **الاعرافە** وە کەس ناتوانێت نکوڵی لەو ڕاستییە بکات و وێنەکەی خۆیان شاهیدە کە کۆتایی **الانعام** و سەرەتای **الاعرافە** . وە لەم نوسخەیەی ئێستای بەر دەستیشماندا هەر بەهەمان شێوەیە دوای سورەتی **الانعام** سورەتی **الاعراف** دێت . وە ژمارەی ئایەتەکانی **الاعراف** ١٦٥ ئایەتە و ژمارەی ئایەتەکانی **الانعام** ٢٠٦ ئایەتە .

وە لێرەدا دوو ئیحتیمال هەیە.

**یەکەمیان** : ئەگەر لەو نوسخە کۆنانەدا لە کۆتایی سورەتەکاندا ناو ژمارەی ئایەتەکان نوسرا بێت کەواتە یارییان تەنها بە ناوەکە کردووە و سورەتی الانعامەکەیان بە فۆتۆشۆپ گۆڕیوە لە انعامەوە بۆ اعراف چونکە ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی **الانعام** ١٦٥ دانەیە

**دووەمیان** : ئەگەر وەك ئەم نوسخانەی ئێستای بەردەستمان نوسخە کۆنەکانیش لە سەرەتادا ناوی سورە و ژمارەی ئایەتەکانی نوسرا بێت . ئەو کات کاکی فۆتۆشۆپ لێرەدا بەس ژمارەی ١٦٥ ئایەتەکانی الانعام ی هەڵ گرتووە و لە جێگای الاعرافدا دای ناوە

**پرسیاری بێ وەڵامی ئێمەش ئەوەیە** : ئەگەر ڕاست دەکەن فەرمون لە سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە ئەو سورەتی اعرافەمان بە کاملی بۆ بهێنن کە دەڵێن ١٦٥ ئایەتە نەك ٢٠٦ ئایەت ؟ یان کۆتایی سورەتی الاعراف و سەرەتای سورەتی الانفالمان بۆ بهێنن بۆ ئەوەی بزانین ڕاست دەکەن یان چەواشەکاری دەکەن ؟

دڵنیاشم کە ناتوانن بهێنن !! چونکە ئەگەر هەبوایە دەمێك بوو داتان نا بوو . فەرموون چاوەڕێی سەرچاوە ی باوەڕ پێکراوین نەك کۆپی و پەیستی سایدەکان هەروەها ئەو دژە ئیسلامانەی پۆست دەکەن و دەڵێن سورەتی الاعراف ١٦٥ ئایەت بووە نەك ٢٠٦ ئایەت سەیر بکەن هیچیان هیچ بەڵگەیەك دانانێن بەس دەنووسن برۆ لە گوگڵ بگەڕێ و بنوسە نوسخەی قورئانی یەمەن . ئەوەی مایەی گاڵتەجارپە هیچ بەڵگەیەك دانانێن و دەڵێن برۆ بگەڕێ !؟

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :شەست و چوار

## المغضوب علیهم کێن ؟




ڕەخنە لە قورئان دەگرن و دەڵێن چۆن دەبێت خودا غەزەب و قینی هەبێت بەرامبەرگەلێك وەك لە ئایەتی ٧ ی **سورەتی فاتیحەدا** دەفەرموێت ( **غیر المغضوب علیهم** ) وە مەبەستی لە جولەکەیە کە خودا لێیان توڕەیە !! بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم گومانە پێویستیمان بە تەوراتە و بە کتێبی خۆیانە ، بۆ ئەوەی بزانین چییان کردووە ؟ وە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی شارەزای تەورات نین بۆیە ناتوانن جولەکە هەڵ سەنگێنن لە دیدی کتێب و سەرچاوەکانی خۆیانەوە . هەوڵم داوە زۆر کورتی بکەمەوە بۆ ئەوەی بێ تاقەت نەبن وە خەڵکی تاقەتی خوێندنەوەیان نییە .

پێشەکی با لە باپیری گەورەوە دەست پێ بکەین کە ابراهیمە (ع) لە **سفر التکوین** بەشی ١٢ دەقی ١٢ بۆ ١٤ دەڵێن ابراهیم (ع) بازرگانیی بە سارای ژنیەوە کردووە و بە هۆی سارایەوە جێگای خۆیی کردۆتەوە لە میسر. وە سارای ژنی ابراهیم لای فیرعەون بووە چونکە زۆر جوان بووە بۆیە فیرعەونیش مەڕ و ماڵات و پارەی زۆری پێ بەخشیوە .

هەروەها لە **سفر التکوین** بەشی ١٩ دەقی ٣٠ بۆ ٣٨ دا دەڵێن لوط (ع) لەگەڵ هەردووك کچەکەیدا زینای کردووە و منداڵی لێیان بووە . وە جولەکە ڕقیان لە هەر پێغەمبەر و پیاو چاکێك بوو بێت دەیدەنە پاڵ نەوە ی ئەو دوو کچەی نوح بن عمی و موئاب . وە هەموو پێغەمبەر و پیاو چاکەکانی جولەکە ئەگەر بە قسەی جولەکەی نەکردبێت لە کتێبەکەیاندا یان موئابییە یان بن عمییە و

منداڵی زینایە پاشان دەڵێن یعقوب ئیسرائیل (ع) باوکی هەمووانە بەڵام لە **سـفر التكـوين** بەشی ٣٥ دەقی ٢٢ دا دەڵێن رائوبین کە یەکێکە لە کورەکانی یعقوب (ع) چووە لەگەڵ کەنیزەیەکی یعقوبدا نوستووە و زینای کردووە کەنیزەکە ناوی بلهەیە و ئەگەر یعقوب و رائوبین منداڵیان لێی ببێت ئەو منداڵە دەکاتی چیی یعقوب و رائوبین خۆتان حەلی ئەو کێشەیە بکەن . پاشان ناوی یهود لە یهودا یان ( یهوذا ) وە هاتووە کە کورە گەورەی یعقوبە (ع) ئەم یهودایە هاتووە لەگەڵ بوکەکەی خۆیدا ( ثامار ) نوستووە و منداڵی لێ بووە . ئەم نەوەی جولەکەیەی ئێستا دەی بینن و پێیان دەڵێن یهود لە پشت و نەوەی ثامار و یهودان سەیری **سـفر التكـوين** ٣٨ بکەن .

لە **سفر الخـروج** بەشی ٦ دەقی ٢٠ دا نوسراوە عمرام کە دەکاتە باوکی موسا (ع) خوشکی باوکی خۆیی هێناوە واتا پوری خۆیی هێناوە کە ناوی شکیمە و لە شکیم موسا و هارونی بووە . بە شەرتێك لە **سـفر اللاويـن** بەشی ١٨ دەقی ١٢ و ١٣ دا دەڵێت لەگەڵ خوشکی باوك و دایکت جوت مەبە چونکە پورتە

لە **سـفری سـاموێلی** ٢ بەشی ١١ دا نوسراوە : داود (ع) لە سەربانی کۆشکەکەیەوە سەیری ماڵێکی کرد ئافرەتێکی جوان لە حەوشەدا خۆی دەشت ناوی بتشبع بوو . داود ناردی بە شوێنیدا و جوت بوو لەگەڵیدا و سکی پڕ بوو . پاشان داود مێردی ئافرەتەکەی کوشت لە جەنگدا گوتی لە پشتەوە بیکوژن بۆ ئەوەی بتشبع بۆ من بێت . پاشان لە بەشی ١٢ دا نوسراوە خودا سزای داودی دا . گوتی مادام چوویت لەگەڵ ژنی خەڵکیدا نوستوویت تۆڵەت لێ دەکەمەوە دەبێت ژنەکانت بە ڕۆژی نیوەڕۆ ڕیز بکرێت و خەڵکی بە ئاشکرا سکسیان لەگەڵدا بکەن . خۆش خودا و خۆش پێغەمبەر !!؟ ئەگەر ئەمە خودا و پێغەمبەرەکەی بن دەبێت گەلەکەیان چۆن بن ؟ هەروەها کاتێك داود پیر دەبێت بە هیچ شتێك گەرمی نابێتەوە دەچن کچێکی پاکیزەی بۆ دەهێنن بۆ ئەوەی لە باخەڵیدا بنوێت و داود گەرم بکاتەوە .

سەیری **سفر الملوكی** یەك بەشی ١ دەقی ١ بۆ ٣ دا نوسراوە لە هەمووی خۆشتر دەڵێن داود جوت نەبووە لەگەڵی ! ئێ باشە بۆچی ئەو کچەتان بۆ هێنا ؟

لە سفری **الملوك** یەك بەشی ١١ دا نوسراوە سلیمان لە کۆتایی ژیانیدا وازی لە خودا پەرستی هێناوە و شوێن هەوا و ئارەزوی ژنەکانی کەوتووە و بت و صنەمی بۆ دروست کردوون و شوێن خودای بت پەرستەکان کەوتووە و دوای هەوا و ئارەزوی ناوگەڵی کەوتووە . و وازی لە خوداهێناوە .

بابەتەکەم بەم دەقەی **سـفری هوشـع** بەشی ٤ دەقی ١٤ تەواو دەکەم خودا دەڵێت کچەکانتان سزا نادەم کە لەشفرۆشی دەکەن و بوکەکانیشتان کە داوێن پیسی دەکەن چونکە پیاوەکان خۆیان دەچنە پاڵ لەش فرۆشەکان لەگەڵ لەشفرۆشەکان و دەچنە نزرگەکان و قوربانی سەردەبڕن وە کتێبی تەورات پڕە لە ڕوداوی جنسی و سیکسی کە خوشك لەگەڵ برادا سکس دەکات و

زۆر بابەتی تریش . وە لە تەوراتدا هیچ پێغەمبەرێك پیرۆز نییە و هەر هەموویان تاوان بار و گوناح بارن . پاشان جولەکە زۆر عەزێتی موسایان داوە (ع) تەنانەت موسا لە دواساتەکانی ژیانیدا فەرمان دەکات تەورات بخەنە صندوق عەهدەوە و نایدات بە دەست جولەکە چونکە دەڵێت دوای مردنم خراپەکاریی زۆر دەکەن وە تەنانەت خوداش لێیان ڕازی نییە .

دەتوانن سەیری **سفر التثنية** ( دوا وتاری موسا ) بەشی ٣١ دەقی ١٤ بۆ ٢٩ بکەن وە دوای مردنی داود و سلیمان علیهما السلام جولەکە بون بە دوو بەشەوە ( یهودا ) و ( سامرة ) وە هەردووك بەشەکەیان بتیان دەپەرست .

سەیری سفری **الملـوك الاول** پاشایانی یەکەم بکەن بەشی ١٢ دەقی ٢٥ بۆ ٣٣ . وە سفری **اشـعياء و ارميـا** و شینەکانی ئیرمییا زۆر بە جوانی و بە ڕوونی باسی ئەوە دەکات چۆن جولەکە گومڕا بوون و دوای بت پەرستی کەوتوون بۆیە خوداش وەك سزایەك ئاشور و بابلی و کلدانییەکان دەنێرێت ڕاپێچیان بکەن و شارەکانیان بسوتێنن و ماڵ و موڵکیان ببەن . چونکە دوای خودا ناکەون و دوای بت پەرستی دەکەون

بەڕێزان وەك کورد دەڵێت ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت . بۆ ئەوەی بابەتەکە دور و درێژ نەبێت لێرەدا دەوەستم . وەك بینیتان جولەکە پیرۆزییان نە بۆ خودا داناوە و نە بۆ پێغەمبەرەکانی بە گوێرەی کتێبەکانی خۆیان . وە هەمیشە لە ڕێگای خودا پەرستی دەرچوون و خودایان توڕە کردووە و خوداش سزای داون بۆیە تا ئێستاش دەبینن لەلای دیواری گریان ( حائط المبكى ) دەگرین لە بيت المقدس بۆ ئەوەی جارێکی تر شکۆ و گەورەییان بۆ بگەڕێتەوە چونکە زۆر سەرپێچیی خودایان کردووە بەلام هەتا ئاخر زەمانیش بگرین تازە هیچ فریایان ناکەوێت چونکە خۆیان دەزانن بە گوێرەی کتێبەکانی خۆیان چەند جار و چۆن سەرپێچیی خودایان کردوووە و خوداش لێیان توڕەیە . ئایا هیچ کەسێك هەیە چیتر ڕەخنە لە قورئان بگرێت و بلێت بۆچی بە جولەکە دەڵێت ( مغضوب عليهم ) بۆ زانیاریی زیاتر و شارەزابون زیاتر لە بت پەرستیی جولەکە و توڕەبونی خودا لێیان کلیکی ئەم لینکە بکەن و بە سەرچاوە و دەقەکانی خۆیان جولەکە ببینن لە مێژوودا خودا هەر لێیان توڕە بووە چونکە خودایان نەپەرستووە و بتیان پەرستووە

ttp://st-takla.org/Full-Free-Coptic-Books/FreeCopticBooks-002-Holy-Arabic-Bible-Dictionary/14_SAD/SAD_078_02.html

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : چیتر خەڵکی نە شارەزا ڕەخنە لە قورئان و ( غير المغضوب ) عليهم نەگرێت وە با بچێت تەورات بخوێنێتەوە و پێمان بلێت کەی لە چی زەمانێکدا جولەکە ڕاست و دروست بوون و خودا لێیان ڕازی بووە ؟ وەك تەحەداش بۆتان فەرموون ئەمەش لینکی کتێبی پیرۆزە و بە بەڵگە بۆمان بسەلمێنن خودا لە جولەکە ڕازی بووە !؟

http://www.kitebipiroz.com/bible

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :شەست و پێنج

## و لا الضالين کێن ؟




ڕەخنە لە سورەتی **فاتحــة** دەگرن و دەڵێن بۆچی گاورەکانی بە ضال ناو بردووە و لە کۆتایی سورەتی فاتیحەدا نوسراوە (**و لا الضـالين**)؟ لە کاتێکدا هەرقورئان خۆی بە اهل الکتاب ناوی بردوون و مەسیحیە کانیش خاوەنی ئینجیلن . بۆچی قورئان بە گومڕا ناویان دەبات ؟ بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی خۆیان واتا کتێبی پیرۆز. بۆ ئەوەی باشتر لە کتێبی پیرۆز تێ بگەن چییە و چەند بەشە تکایە کلیک ئەم لینکە بکەن

https://www.facebook.com/KtbyPyrzChyyh/photos/pb.331331173624739.-2207520000.1425378070./598078026950051/?type=3&theater

**بابەتی ناو لینکەکە**

..........................................

## کتێبی پیرۆز چییە ؟

دەمانەوێت لێرەدا بە کورت ترین و پوخت ترین شێوە تێتان بگەیێنین . ئەم کتێبە چیە و چەند بەشە هەتا ئێوەی بەڕێزیش زانیاریتان هەبێت دەربارەی . چونکە لە قورئاندا زۆر باسی اهل الکتاب دەکات . بەڵام موسوڵمانێکی زۆر کەم دەزانێت ئەو کتابە چییە . فەرموون لێرە ئەو زانیاریە وەر بگرن .

تـــــــــەورات و ئینجیـــــــــــل دوو كتێـــــــــــبن بـــــــــە هـــــــــــەردوكیان دەگوترێــــــــــت كتێبـــــــــی پیـــــــــــرۆز وە هەریەكە و لە چەند سفرێك پێك هاتووە ( **سفر یەعنی كتێب** ) وە كۆی هەموو سفرەكان لە هەردوك كتێبەكەدا دەكاتە (٦٦) كتێب بەم شێوەیەی خوارەوەیە

**یەكــەمیان** : تەورات پێك هاتووە لە ٣٩ سفر ... ٥ سفری یەكەمیان تەواراتی موسای پێ دەڵێن كە ئەمە ناوەكانێتی ( التكوين ، الخروج ، اللاوين ، العدد ، التثنية )

(Genesis - Exodus - Leviticus - Numbers – Deuteronomy)

## بۆیە ناوەكانیمان بە كوردی بۆ نە نوسیون . چونكە نوسخە كوردیەكە ناوەكانی و دەقەكانیشی جێگیر نییە و بە ئارەزوی خۆیان دەیان گۆڕن و یارییان پێ دەكەن !؟

وە باقي ( ٣٤ ) كتێبەكەی تریان یان سفرەكانی تریان نوسینی خودا نییە و تەورات نییە واتا لە ڕێگای ڕۆحەوە یان روح القدسەوە نوسراوەتەوە . بە حساب روح القدس هاتۆتە ناو لاشەی ئەو پێغەمبەرەوە و كاتێك هەر قسە و هەر ڕەفتارێكی كرد بێت بە فەرمانی ڕۆحەكە كردوێتی، كەاوتە بەو مفهوم و تێگەیشتنەی ئێمەی موسوڵمان كاتێك دەڵێین تەورات . واتا ئەو ڤێنج كتێبەی سەرەوە ئەو تەوراتەیە كە بۆ موسا (ع) دابەزیوە كە ئەویش قسەی زۆری لەسەرە لێرەدا باسی ناكەین !!؟ . باقیاتی ( ٣٤ ) كتێب و سفرەكانی تر . تەوراتی موسا (ع) نییە . وە جولەكە و گاورەكانیش كۆكن لەسەر ئەو بۆچونە . بۆیە ئاگاداربن كاتێك لەگەڵ جولەكەیەك یان گاورێك مناقشە دەكەن ، باش بزانن كە تەوراتی اسڵی **پێنج** سفری یەكەمە .

**دووەمیان** : ئینجیل . كە لای هەمووان زانراوە و ناسراوە ٤ دانەن كە پێك هاتون لە ئینجیلی (مەتا و مرقص و لوقا و یوحنا) لەگەڵ كتێبێكی تر بە ناوی ( سفر اعمال الرسل ) باس لە سەرەتای دامەزراندنی كڵێسا دەكات .

لەگەڵ كرداری ١٢ هاوەڵەكەی بە حساب مسیح (ع) هەتا هەڵكشانی مسیح (ع) بۆ ئاسمان . ئەم سفرەش نوسەرەكەی نە ناسراوە !! هەندێك دەڵێن لۆقا نوسیوێتی لە ساڵی ٦٠ ی پاش هاتنی مسیحدا (ع) وە زۆر لە لێكۆڵەرەوە كان دەڵێن لە نێوان ساڵی (٨٠ بۆ ١٥٠ ) دا نوسراوە !؟ وە لەگەڵ (١٤ )نامەی ئاسایی كەسێكە بە ناوی پۆڵصەوە كراوە بە ئینجیل .. نامەی ئاساییە هی زەلامێكە ناردوێتی بۆ برادەرانی و كردویانە بە ئینجیل وە لەو نامانەدا داوا دەكات بۆ نموونە شتی لە بیر چووە لەگەڵ خۆیاندا بۆی بهێنن ! یان دەچێت بۆ جێگایەك و داوایان لێ دەكات جێگای حەوانەوەی بۆ دابین بكەن ! ئایا ئەوە وەحیی خودایە !؟ هەروەها لە هەر هەمووی سەیرتر سەر ئەو (١٤ ) نامەیە نێرراوە بۆ كێ ؟ هەر هەموویان نە ناسراون ! بۆ نموونە نوسراوە بۆ ڕۆما بۆ فلیمۆن و كۆلۆسی و ... هتد .

هەروەها (٧) نامەی تریش هەیە بە حساب بۆ جولەکەکان نێردراون لێرە و لەوێ . ئەمانەش نە نوسەرە کانی ناسراون و نە ئەو کەسانە و ئەو شوێنانەش کە بۆیان ناردون.

لەگەڵ کۆتا کتێبیان کە بە ناوی ( رؤیا یوحنا اللاهوتی ) ئەمەش بە هەمان شێوە کەس نازانێت کێ و کەی نوسراون ؟ خۆشتان دەتوانن بەدواداچونیان بۆ بکەن وە دڵنیا بىن کە نوسەری ئەم ئینجیلانە هیچیان ناسراو نین کەواتە انجیل پێك هاتووە لە ٤ **انجیل** و ١٤ **نامەی پۆڵص** و ٧ نامەی تر لەگەڵ کتێبێك . هەمووی دەکاتە ( ٢٧) کتێب یان بەش یان اصحاح.

............... بۆ ئەوەی رادەی گومڕی ئەم گاورانە بزانین دەبێت یەکەم پرسیارمان ئەمە بێت

**مسیح (ع) بۆچی هات و کوا شەریعەت و کتێبەکەی ؟**

لە هەر کەسێك بپرسین دەربارەی کتێبی مسیحییەکان پێمان دەڵێن ئینجیلی متا و لوقا و مرقس و یوحنا بەلام ئاگاداری کرداری نێراوان ( اعمال الرسل ) وە ١٤ نامەی ئاسایی کەسێك نوسیویتی ناوی پۆلصە وە ٧ نامەی تریش لێرە و لەوێ کە بۆ جولەکەکان نێرراون وە کۆتا کتێبیشیان کە پێی دەڵێن رؤیا یوحنا اللاهوتي . وە کۆی ئەم کتێبانە کە ٢٧ دانەیە پێی دەڵێن پەیمانی نوێ ئێمەش دەڵێین ئینجیل. نوسەری ئەم ٢٧ کتێبە کێن ؟ هەمویان نەناسراون !! بە تەنها پۆلص ناسراوە چونکە ناسنامەی رۆمانیی هەبووە و یەکێکیش بووە لە دوژمنە سەر سەختەکانی مەسیحییەکان و ئازاری داون پاشان بە حساب بوە بە ئیماندار. ئینجیلەکان نوسراوە ئینجیل بەگوێرەی متا بەگوێرەی مرقس بە گوێرەی لۆقا بە گوێرەی یوحنا . بە ڵام لە نوسخە کوردیەکەدا بەگوێرەکەیان لا بردووە و لە نوسخەکانی تردا لانەبراوە . کەواتە ئەو ضوار ئینجیلە هی مسیح (ع) نییە و بەگوێرەی دید و بۆچوونی ئەو ضوار نوسەرە نەناسراوە نوسراون پاشان پەیمانی تازە چی تێدا نوسراوە ؟ ( هیچ ) چونکە هیچ شەریعەت و یاسا و ڕێسایەکی تێدا نییە . وە ئەگەر قەشەیەك یان کڵێسایەك یان کەسێکی ئیمانداری مەسیحی بیەوێت هەر شەرعێك بزانێت دەبێت بگەڕێتەوە بۆ پەیمانی کۆن و لەوێ دەری بهێنێت نەك لە پەیمانی تازە .

**پرسیارمان** ئەمەیە : ئەی کەواتە مسیح (ع) بۆچی هات و چی پێ راگەیاندن ؟ گاڵتەجارییەکە لێرەدایە : کاتێك ئێمە رەخنە لە کتێبی پیرۆز دەگرین مەسیحیەکان ڕەخنەکانی پەیمانی کۆن ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن ئەوە پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە و ئێمە پەیمانی تازەمان هەیە_منیش دەڵێم باشە بۆچی ئێوەش پەیمانی کۆن لە کڵێساکاندا لانابەن ؟ بۆچی کاری پێ دەکەن ؟ وە ئەگەر پەیمانی کۆن لە کتێبی پیرۆز لابەرین . پەیمانی تازەش دەبێت فڕێ بدرێت چونکە هیچ شەریعەتێك و یاسا و ڕێسایەکی تێدا نییە

لە هەمووی سەیرتر نوسەرانی پەیمانی تازە هیچیان قوتابیی مسیح (ع) نەبوون و هیچ کامیان یەکێك نەبووە لە ١٢ قوتابییەکانی مسیح وە ٦٠ ساڵ دوای مسیح هاتون . لەسەر چی بنەمایەك ئەم ئینجیلانە یان نوسیوەتەوە ؟ **پرسیاری گرنگیش ئەوەیە** : کوا ئینجیلی مەسیح کوا شەریعەت و فێرکردنەکانی مەسیح ؟ پاشان مەسیح (ع) بۆ کێ هاتوە ؟ بە گوێرەی ئینجیلی مەتا بەشی ١٥ دەقی ٢١ بۆ ٢٨ نوسراوە ئافرەتێکی کەنعانی واتا غەیرە جولەکە منداڵەکەی رۆحی پیسی تێدا بووە . هاواری لە مسیح کردوە یار مەتیی

بـدات و ڕۆحی پیس لـە منداڵەکـەی دەربکات_مسـیح وەڵامی نەداوەتـەوە پاشـان قوتابییـەکانی گوتویانـە وەڵامی بـدەرەوە بـا هێنـدە بەدوامانـدا ڕا نـەکات و هـاوار نـەکات مەسـیح پێی گوتـوون : من تـەنها بـۆ مـەڕە ونبووەکانی ماڵی ئیسـرائیل نێردراوم . پاشـان ئافرەتەکە خۆی کردووە بە سـەگ بۆ ئەوەی مسیح یارمەتیی بدات . ئینجا مسیح یارمەتیی داوە.

ئەمەش لینکی ئەو یارمەتی و خۆ بەسەگ کردنەیە

http://www.kitebipiroz.com/bible/mat/15

.............................................

**بابەتی ناو لینکەکە**

بەشی ١٥ » مەتا » کتێبی پیرۆز

ئینجیلی مەتا بەشی ١٥ دەقی ٢١ بۆ ٢٨ نوسراوە

**باوەڕی ژنێکی کەنعانی**

21 عیسا لەوێ ڕۆییشت و چووە ناوچەکانی سور و سەیدا.

22 ژنێکی کەنعانی خەڵکی دەوروبەری ئەوێ، دەرچوو و هاواری کرد: (گەورەم، کوڕی داود، بەزەییت پێمدا بێتەوە! کچەکەم بە خراپی ڕۆحیپیسی تێدایە.)

23 بەڵام عیسا بە وشەیەکیش وەڵامی نەدایەوە. قوتابییەکانی هاتنە پێشی و تکایان لێی کرد: (بەڕێی بکە، وا بەدوامانەوە هاوار دەکات.)

24 وەڵامی دایەوە: (من تەنها بۆ مەڕە ونبووەکانی ماڵی ئیسرائیل نێردراوم.)

25 بەڵام ژنەکە هات، کڕنۆشی بۆ برد و وتی: (گەورەم یارمەتیم بدە!)

26 وەڵامی دایەوە: (ناشێت نانی منداڵان ببردرێت و فڕێبدرێت بۆ سەگ.)

27 ژنەکە وتی: (ڕاستە گەورەم، بەڵام سەگیش ئەو پەلکەنانە دەخوات کە لە خوانی گەورەکانی دەکەوێت.)

28 ئینجا عیسا وەڵامی دایەوە: (خانم، باوەڕی تۆ بەهێزە! ئەوەی داوای دەکەیت با بۆت بێت.) لەو کاتەوە کچەکەش چاکبۆوە.

..................................................................

پاش ئەم ڕون کردنەوە کورتە **پرسیاری بێ وەڵامەمان ئەمانەیە** : بۆچی ئەو وەسفەی قورئان خراپە یان نا تەواوە کە پێیان دەڵێت و لا الضالین لە کاتێکدا ئەمانە خاوەنی هیچ کتێبێك نین . ئینجیلی عیسا بونی نییە نوسەرانی پەیمانی تازە نادیار و نە ناسراون . ئینجیلەکان هیچ شەریعەتێکی تێدا نییە . مەسیح نێرراوە بۆ جولەکە گومڕاکان واتا بانگەوازەکەی جیهانی نییە . کەواتە بۆچی کەسێك کە غەیرە جولەکە ببێت بە مسیحی ؟ کەواتە ئەم گاورانە شوێن چی کەوتوون.

ئەمەش لینکی یەکێك لەو نامانەیە کە پۆلس ناردوێتی بزانن ئایا ئەمە وەحیی خودایە یان قسەی گیرفانە ؟

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/a.1506091856276336.1073741827.1506090639609791/1623660731186114/?type=1&theater

.........................................

**بایەتی ناو لینکەکە**

پۆلس کابرایەك بو دوای هەڵ کسانەوەی مسیح بۆ ئاسمان ئەم پۆلصە دژی مەسیحییەکان بو دەیگرتن و دەی خستنە بەندینخانەوە و ئازاری دەدان و دەی کوشتن . پاشان لە بیت المقدسەوە ڕۆشت بۆ دمشق بۆ ئەوەی مەسیحییەکانی ئەوێش ئازار بدات . لە ڕێگا مەسیح دەبینێت و بە حساب باوەڕ بە مسیح دەهێنێت وە ١٤ نامەی ئاسایی دەنوسێت لە ژیانیدا وە ئێستا ئەو نامانەی پۆلص بووە بە بناغەی ئیمانی کڵێساکانی جیهان و پێی دەڵێن پۆلصی پێغەمبەر ئەوەی سەیرە و گرنگە ئەوەیە ئەم کابرایە نامەی ئاسایی نوسیوە وەك من و تۆ . کەچی کڵێساکان دەڵێن ئەم نامانە وەحی خودایە . بۆ نمونە لە نامەی دوهەمی پۆلص بۆ تیمۆساوس بەشی ٤ دەقی ٩ بۆ ٢٢ دا نوسراوە کۆشش بکە زوو بێیتە لام چونکە دیماس بەجێیهێشتم ئەم جیهانە خۆشویست و چوە سالۆنیکی کریسکینیش بۆ گەلاتیا و تیتۆس بۆ دەلماتیا بە تەنها لۆقام لەلایە مەرقۆس لەگەڵ خۆت بهێنە چونکە بۆ من سوودبەخشە بۆ خزمەتکردن تیخیکۆسم ناردووە بۆ ئەفەسۆس کاتێ هاتی ئەو عەبایەی لە ترۆیاس لای کارپۆس بەجێم هێشت لەگەڵ خۆتی بهێنە تایبەت دەستنوسەکان ئەسکەندەری مسگەر زۆر خراپەی لەگەڵ کردم خوداوەند تۆڵەی لێدەکاتەوە لەسەر کردارەکانی خۆتی لێ بپارێزە، چونکە زۆر بەرهەڵستی پەیامەکەمانی کرد لە بەرگری یەکەمم کەس لەگەڵم نەهات، بەڵکو هەموو بەجێیان هێشتم لەسەریان هەژمارد نەکرێت بەڵام خوداوەند لەگەڵم وەستا و بەهێزی کردم، تاکو بە منەوە جاڕدانەکە بە تەواوی بدرێت، تاکو هەموو گەلان ببیستن. ئیتر لە دەمی شێر دەرباز بووم خوداوەند لە هەموو خراپەیەکی دادێت دەربازم دەکات و رزگارم دەکات بۆ شانشینە ئاسمانییەکەی. بۆ ئەوە شکۆی هەتاهەتایە! ئامین سڵاو لە پریسکیلا و ئەکیلا و خێزانی ئۆنیسیفۆرۆس بکە ئەراستۆس لە کۆرنسۆس مایەوە، بەڵام تروفیمۆس بە نەخۆشی لە میلیتۆس بەجێم هێشت کۆشش بکە پێش زستان بێی. یوبۆلۆس و پودیس و لینۆس و کلاودیا و هەموو خوشکان و برایان سڵاوت لێدەکەن بەرێزان خۆتان حوکم بدەن ئایا ئەمە وەحی خودایە ؟ ئەگەر وەحی خودایە چی شەریعەتێك و چی یاسا و ڕێسایەکی تێدایە ؟ ئێستا گاورێکیشمان لێ پەیدا دەبێت و دەڵێت ئێوە لێی تێ ناگەن ئەوانە هەمووی رەمزن و تەفسیری رۆحییان هەیە و ئێوەی موسوڵمان لە تەفسیری ژمارەکان تێ ناگەن و لاهوت و ناسوت لێك جودا ناکەنەوە و قسەی زلی تریش لەم جۆرە.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :شەست و شەش

## ئایەتی حوشتر بچێت بە کونی دەرزیدا لە ئینجیل وەرگیراوە ؟







دژە ئیسلامەکان و بە تایبەتی گاورەکان دەڵێن قورئان ئایەتی ٤٠ ی سورەتی **الاعرافی** لە ئینجیلی مەتاوە وەرگرتووە . چونکە لە هەردوکیاندا نوسراوە مرۆڤ ناچێتە بەهەشتەوە هەتا وشتر نەچێت بەناو کونی دەرزیدا . پێش ئەوەی وەڵامی ئەم گومانە بدەینەوە بە وتەیەکی جوانی شێخ احمد دیدات دەست پێ دەکەین لە وەڵامی بەراورد کردنی ئەم دوو دەقەدا گوتبووی : وەك ئەوە وایە بڵێین پەنیر و دەباشیر وەك یەکن !؟

با ئێستا بزانین دەقەکان وەك خۆی چی دەڵێن

ئەو دەقەی ئینجیل لە **ئینجیلی مەتا** بەشی ١٩ دەق ١٦ بۆ ٢٤دا بە ناونیشانی گەنجە دەوڵەمەندەکە وە نوسراوە . هەروەها لە مەرقۆس ١٠دەق ١٧ هەتا ٢٥ وە **لۆقا** ١٨ دەق ١٨ بۆ ٢٥ دا نوسراوە_ئینجا یەکێك هاتە لای و وتی مامۆستا چ چاکەیەك بکەم تاکو ژیانی هەتاهەتاییم هەبێت؟ پێی گوت بۆچی لەبارەی چاکەوە پرسیارم لێ دەکەیت؟ تەنها یەکێك چاکە بەڵام ئەگەر دەتەوێت بچیتە ناو ژیانەوە ڕاسپاردەکان بەجێ بگەیەنە پێی گوت کامیان .

ئەوەی لەم دەقانە تێ دەگەین کەسێك هاتووە بۆ لای مسیح (ع) وە پرسیاری لێ کردووە چی چاکەیەك بکەم دەتوانم ژیانی تا هەتایم دەست بکەوێت ؟ با بزانین مسیح چیی وەلام داوەتەوە ؟عیساش گوتی مەکوژە، داوێنپیسی مەکە، مەدزە، شایەتی درۆ مەدە، ڕێزی دایك و باوکت بگرە ونزیکە کەت وەك خۆت خۆش بووێ گەنجەکەش گوت ئەمانەم هەمووی کردووە، ئیتر لە چیم کەمە؟عیسا پێی گوت ئەگەر دەتەوێت تەواو بیت برۆ سامانەکانت بفرۆشە و بیدە هەژاران ئیتر گەنجینەیەکت لە ئاسماندا دەبێت و وەرە دوام بکەوە بەڵام گەنجەکە کە ئەم وشەیەی بیست بە دڵ تەنگییەوە ڕۆشت چونکە سامانێکی زۆری هەبوو کەواتە ئەو گەنجە بە مانای کەلیمە گەنجێکی ئیماندار و پیاو چاك و بە تەقوا بووە و خودا چیی گوتووە ئەو جێ بەجێی کردووە . هەمو ئاینێکی ئاسمانیش ئەو کارانەی دەوێت کە مسیح بە گەنجەکەی گوتوە مەسیحیش خۆی شاهیدە کە ئەو گەنجە کەسێکی صالحە . بەڵام مەسیح داوای لێ کردووە سامانەکەی بفرۆشێت و بیدات بە هەژاران و شوێن مسیح بکەوێت بەلام گەنجەکە ڕەتی کردوەتەوە چوبکە زۆر دەوڵەمەند بووە .

با بزانین چیی تر ڕوی داوە و مسیح چیی گوتوە ؟عیساش بە قوتابییەکانی گوت : ڕاستیتان پێ دەڵێم دەوڵەمەند بە سەختی دەچێتە ناو شانشینی ئاسمانەوە دیسان پێتان دەڵێم ئاسانترە وشترێك لە کونی دەرزیەکەوە بچێتە ژوورەوە لەوەی دەوڵەمەندێك بچێتە ناو شانشینی خودا

وەك بینیتان لەسەرەوە لە ئاینی مسیحیدا خەڵکی دەوڵەمەند ناچنە بەهەشتەوە ئەگەر زۆر کەسێکی باش و گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی خوداش بێت . چونکە دەقەکان دەڵێن گەنجەکە زۆر پابەند بووە بە ڕێگای خوداوە بەڵام چونکە دەستی لە سامانەکەی هەڵ نەگرتووە . ناچێتە بەهەشتەوە هەتا **ووشتر نەچێت بە کونی دەرزیدا** !؟ ئەمەش زوڵمێکی مەزنە مەسیح و کڵێسا لە خەڵکی دەوڵەمەندی دەکەن و دەیانەوێت پارە و پولەکانی ئاودیو بکەن و بەهەشتی پێ بفرۆشن لە کاتێکدا کابرا ئیماندارێکی پابەندە بە بناغەی ئاینەکەیەوە . ئەمەش لینکی ئەو دەقانەیە لە **ئینجیلی مەتا**

http://www.kitebipiroz.com/bible/mat/19/24#v24

بابەتی ناو لینکەکە

کتێبی پیرۆز » مەتا » بەشی ١٩

**گەنجە دەوڵەمەندەکە**

16 ئینجا یەکێك هاتە لای و وتی: (مامۆستا، چ چاکەیەك بکەم تاکو ژیانی هەتاهەتاییم هەبێت؟)

17 پێی فەرموو: (بۆچی لەبارەی چاکەوە پرسیارم لێ دەکەیت؟ تەنها یەکێك چاکە. بەڵام ئەگەر دەتەوێت بچیتە ناو ژیانەوە، ڕاسپاردەکان بەجێبگەیەنە.)

18 پێی‌ووت: (کامیان؟)
عیساش فەرمووی: [مەکوژە، داوێنپیسی مەکە، مەدزە، شایەتی درۆ مەدە،

19 ڕێزی دایك و باوکت بگرە][e] و [نزیکەکەت وەك خۆت خۆش‌بووێ.][f]

20 گەنجەکەش پێی‌ووت: (ئەمانەم هەمووی کردووە، ئیتر لە چیم کەمە؟)

21 عیسا پێی فەرموو: (ئەگەر دەتەوێت تەواو بیت، بڕۆ سامانەکانت بفرۆشە و بیدە هەژاران، ئیتر گەنجینەیەکت لە ئاسماندا دەبێت و وەرە دوام بکەوە.)

22 بەڵام گەنجەکە کە ئەم وشەیەی بیست، بە دڵتەنگییەوە ڕۆیشت، چونکە سامانێکی زۆری هەبوو.

23 عیساش بە قوتابییەکانی فەرموو: (ڕاستیتان پێ دەڵێم: دەوڵەمەند بە سەختی دەچێتە ناو شانشینی ئاسمانەوە.

24 دیسان پێتان دەڵێم: ئاسانترە وشترێك لە کونی دەرزیەکەوە بچێتە ژوورەوە لەوەی دەوڵەمەندێك بچێتە ناو شانشینی خودا.)

25 قوتابییەکان کە گوێیان لەمە بوو زۆر سەرسام بوون، وتیان: (کەواتە کێ دەتوانێت ڕزگاری بێت؟)

26 عیساش سەیری کردن و پێی فەرموون: (ئەمە بۆ مرۆڤ مەحاڵە، بەڵام لەلای خودا هەموو شتێك دەبێت.)

27 ئینجا پەترۆس وەڵامی دایەوە و پێی‌ووت: (ئەوەتا ئێمە وازمان لە هەموو شتێك هێناوە و دوات کەوتووین، ئێمە چیمان بۆ دەبێت؟)

28 عیساش پێی فەرموون: (ڕاستیتان پێ دەڵێم، لە نوێبوونەوەدا، کاتێ کوڕی مرۆڤ لەسەر تەختی شکۆی خۆی دادەنیشێت، ئێوەش کە دوام کەوتوون لەسەر دوازدە تەخت دادەنیشن و دوازدە هۆزەکەی ئیسرائیل حوکم دەدەن.

29 هەر کەسێکیش لەبەر ناوی من، ماڵ یان برا یان خوشك یان دایك یان باوك یان منداڵ یان کێڵگەی بەجێ‌هێشتووە، سەد ئەوەندە وەردەگرێتەوە و ژیانی هەتاهەتاییش بە میرات وەردەگرێت.

30 زۆر لە یەکەمینەکان دەبنە دواهەمین، دواهەمینەکانیش یەکەمین.)

..................................................................................

ئێستا با بێینە سەر ئایەتی ٤٠ ی سورەتی **الاعراف** دەفەرموێت ( **ان الذین کذبوا بایاتنا و استکبروا عنها لا تفتح لهم ابواب السماء و لا یدخلون الجنة حتی یلج الجمل في سم الخیاط**) . بە کوردی واتا ئەو کەسانەی ئایاتی خودا بە درۆ دەخەنەوە و خۆیان بە زل دەزانن لە ئاستی خودادا و پشت دەکەنە خودا ناچنە بەهەشتەوە هەتا حوشتر نەچێت بە کونی دەرزیدا.

وە لە قورئاندا باسی خەڵکانێك کراوە دژی خودا و ئایەتەکانی خودا بن و دژایەتی ئاینی خودا بکەن ناچنە بەهەشتەوە . بەڵام لە ئینجیلەکاندا ئەو کەسانە ئیماندار وون و دژایەتی خودایان نەکردووە !؟ بەڵکو پابەندیش بوون بە منهجی خوداوە تاوانیان ئەوەیە دەوڵەمەندن بۆیە ناچنە بەهەشتەوە .

**پرسیاری بێ وەڵامان ئەمەیە**

بۆچی لە ئاینی کڵێسادا دەوڵەمەند ناچێتە بەهەشتەوە ؟ ئایا ئەم ئایەتە بۆ دزی و گیرفان بڕینی خەڵکی دەوڵەمەندی مەسیحییەکان نییە ؟ بۆ ئەوەی پارەکانیان لێ بدرزن و لێ بستێنن ؟ کابرا دەوڵەمەندە و لە هەمان کاتیشدا کەسێکی باشە و پابەندە بە ئاینەکەیەوە .

تۆ بۆچی بەناوی خوداوە دەبیت بە جەردە و موڵك و ماڵ و سامانی لێ دەستێنیت ؟ئەو ئایەتەی قورئان کوا وەك ئەو دەقەی ئینجیلە

؟ کوا قورئان باسی دەوڵەمەندی و فەقیری دەکات ؟ وە ئەو ئایەتەی قورئان باسی خەڵکانێك دەکات دژایەتیی خودا دەکەن بەڵام ئەو دەقەی ئینجیل کابرا دژایەتی ی خودا ناکات بەلام نوسەرانی ئینجیل دەیانەوێت گیرفانی دەوڵەمەندەکان ببڕن وە حاشا لله مسیح (ع) قەت قسەی وا ناکات و خودا و مسیحیش چاویان لە پارە و گیرفانی کەس نییە

کۆتا پرسیاریشمان بۆتان ئەمەیە **سیَ** ئینجیل باسی ئەو بەسەر هاتەی کردووە هەر یەکەیان بە جۆرێك باسی کردوە : لە ئینجیلی مەتادا گەنجێك پرسیار دەکات لە ئینجیلی لۆقادا سەرۆکێك پرسیار دەکات لە ئینجیلی مرقسدا پیاوێك بووە کورێکی گەنج نە بووە دەتوانن پێمان بڵێن بۆچی هەر یەکەیان بە جۆرێکی جیاواز باسیان کردووە ؟

---

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :شەست وحەوت

## مسجد الاقصی کەی دروست کرا ؟

گاور و جولەکەکان ڕەخنە لە ئایەتی ١ ی **ســـورەتی الاســـراء** دەگرن کە دەفەرموێت (سبحان الذي اسرى بعبده ليلا من المسجد الحرام الى المسجد الاقصى) . وە دەڵێن ئەو ئایەتە هەڵەیە و ئەو کاتە کوا لە بیت المقدس مسجد الاقصی بوونی نە بووە !! وە پاش مردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بڵاو بونەوەی ئاینی ئیسلام ئەو مزگەوتە دروست کراوە . **بـۆ وەلآمـی ئـەم گومانــە دەڵێین** مسجد لەسەر وەزنی مفعل هاتووە وە ئەسڵی مسجد لە سجدوە هاتووە . بە مانایەکی ڕوون تر ئێستا کاتێك بە کوردی دەڵێین مسجد یەکسەر دەڵێین مزگەوت وە لێرەدا ناوی مسجدەکە بزر دەبێت و نازانین مسجد مانای چییە ؟ مسجد واتا شوێنی سوجدە بردن . وە مسجد ناو نییە بەڵکو بە هەموو جێگەیەك دەگوترێت سوجدەی تێدا ببرێت بۆ خودا و لەسەر وەزنی ( مفعل ) ە بۆ نمونە مطعم واتا شوێنی خواردن دروست کردن معمل واتا شوێنی کار کردن مذبح شوێنی سەربڕینی ئاژەڵ وە هەر شتێك لەسەر وەزنی مفعل بێت واتا شوێنی ئەو شتە  وە کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چووە بۆ بیت المقدس چووە بۆ هەیکەلە ڕوخاوەکەی سلیمان (ع) وە لەو کاتەدا هەیکەلەکە ڕوخا بوو بەڵام دیوار و ئاسەوارەکانی مابوون . وە لە جێگای هەیکەلەکەدا بینا و خانوی نوێ دروست نەکرا بووەوە هەتا خەڵکی جێگای هەیکەلەکە نەزانێت . وە پاش هاتنی ئیسلام هەمان شوێن کرا بەم مسجد الاقصایەی ئێستا . وە اقصی لە زمانی عەرەبیدا واتا دوور . وە بيت المقدسیش بە نیسبەت مەکەوە دوور بووە . بۆیە بە مسجد الاقصی ناو براوە واتا جێگای سوجدە بردنە دوورەکە.

لێرەدا ئەم **پرسیارە بێ وەلامە** سەر هەڵ دەدات : ئایا هەیکەلی سولەیمان جێگای سوجدە بردن نەبوو ؟ ئایا پێغەمبەران و ئیمانداران لەو هەیکەلەدا خودا پەرستیان نەدەکرد و سوجدەیان بۆ خودا نەدەبرد ؟ کاتێك بە مسجد ناو براوە واتا شوێنی سوجدە

بردن . ئەگەر هەیکەل جێگای سوجدە بردن نییە بۆ خودا دەتوانن ڕەخنە بگرن و بڵێن ئەو ئایەتەی قورئان راست نییە . بەڵگەیەکی ترمان بۆ سەلماندنی ووشەی مسجد واتا شوێنی سوجدە بردن و پەرستنی خودایە ئایەتی ٢١ ی سورەتی **الکهفە** . کاتێك خەڵکی اصحاب الکهف دەدۆزنەوە ئەو کاتە ئاینی ئیسلام و ئیسرا و میعراج بونی نەبووە و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە دایك نەبووە . لە قورئاندا دەفەرموێت لنتخذن علیهم مسجدا . واتا خەڵکەکە دەڵێن جێگای اصحاب الکهف دەکەین بە شوێنی خودا پەرستی و سوجدە بردن . ئایا دەکرێت ڕەخنە بگرین و بڵێین زەمانی اصحاب الکهف ئیسلام نە بووە کەچی لە قورئاندا نوسراوە لەو زەمانەدا مزگەوتیان بۆ اصحاب الکهف دروست کردووە ؟هەروەها اقصى واتا دوور . مسجد الاقصى واتا شوێنی سوجدە بردنە دورەکە . چونکە بیت المقدس لە مەکەوە دور بووە . و لە قورئاندا لە سورەتی القصص ٢٠ وە لە یاسین ٢٠ دا هاتووە : و **(جاء من اقصى المدینة رجل یسعى** )واتا کابرایەك دور لە شارەکەوە هات . وە لە سورەتی مریم ٢٢ دا هاتووە : **(فحملته فانتبذت به مکانا قصیا** )واتا کاتێك مریم حاملە بوو بە عیسا (ع) چوو بۆ شوێنێکی دوور لە خەڵکی . بۆ ئەوەی بزانین ئایا جولەکە سوجدە دەبەن بۆ خودا یان نا ؟ سەیری ئەم ڤیدیۆیە بکەن . جولەکە چۆن نوێژ دەکات و سوجدە دەبەن بۆ خودا وە لە هەیکەلی سولەیماندا هەمان شت سوجدەیان دەبرد بۆ خودا .

https://www.facebook.com/video.php?v=1569316213319326

..................................................................

**بابەتی ناو لینکەکە**

**هەمان فیدۆیەکە ئێمە کردومانە بە وێنە**



بۆیە ناو بردنی مسجد الاقصی بە مانای مزگەوتی اقصی نایەت . بەڵکو بە مانای شوێنی سوجدە بردنی دور دێت بەڵام بە کوردی بە مسجد دەڵێین مزگەوت . بۆیە کاتێك دەڵێن مسجد الاقصی سەرمان لێ تێك دەچێت و دەڵێین خۆ ئەو زەمانە مزگەوت نە بووە !؟ چۆن قورئان باسی مزگەوتی کردووە ؟

---

## پرسیارە بێ وەلاّمەکان ژمارە :شەست وهەشت

## ئاینە ئاسمانییەکان لە بابلی و ئاشوریە کانەوە وەرگیراون ؟



دژە ئاینەکان دەڵێن تەورات و قورئان لە ئاینە کۆنەکانی وەك بابلی و ئاشورییەکانەوە وەرگیراون چونکە ئەو چیرۆکانەی تەورات و قورئان لە ئەفسانەی ئاینی گەلە کۆنەکاندا هەیە و هەمان شێوە باسی خلق و دروست بوونی دونیا و گەردونیان کردووە. بەلام ئەوەی بێدینەکان و خەڵکی عەوامیش نای زانن ئەوەیە کە مێژوی نوسین دەگەڕێتەوە بۆ ( ٥٠٠٠) ساڵ . مەبەست لە مێژوی نوسین نوسینی پیتە ئیتر ئەو پیتانە بە هێما بێت یان بزماری بێت یان هیرۆگلۆفی بێت یان ... هتد . وە لێرەدا باس لە وێنە ناکەین چونکە وێنە نوسین نییە

وە ئەو( ٥ ) هەزار ساڵە دەگەڕێتەوە بۆ بابلییەکان نەك یۆنان و قەومەکانی تر. خۆشتان دەتوانن بگەڕێن بە دوای مێژوی نوسیندا بۆ دڵنیایی زیاتر لێرەدا ئەم پرسیارە سەر هەڵ دەدات : ئایا پێش ئەو ( ٥ ) هەزار ساڵە مرۆڤ هەبووە یان نە بووە ؟ ئەگەر هەبووە لە کوێ بوون ؟ وە ئایا نوسینیان زانیووە یان نا ؟ کابرای بێدین دەڵێت (١٣ ) ملیار ساڵە تەقینەوەی مەزن ڕوی داوە و تەمەنی مرۆڤ (١) ملیۆن ساڵە لەسەر زەوی . لەهەمان کاتیشدا بێ ئاگایە لە ( ٩٩٥ )هەزار ساڵ . بەس تەنها ( ٥ ) هەزار ساڵ لای دیارە ئێمە وەك دیندار جولەکە و مەسیحی و موسوڵمان دەڵێین . پێش شارستانیەتی بابلی تۆفانی نوح ڕوی داوە و خەڵکی نەماون بەس

نوح و ئەو کۆمەڵەی لەگەڵیدا بوون ماون پاش تۆفانەکە ئەو خەڵکە زیادیان کردوە و سەرەتای سارستانیەت بە بابلیەکان دەستی پێ کردووە . طبعا پێش نوحیش پێغەمبەرانی تر هەبوون هەتا ئادەم و حەوا علیهم السلام .

وە شتێکی ئاساییە دوای تۆفانی نوح خەڵکی ئیمان دار بوون و نەوەی نوح و ئەو کۆمەڵە بوون کە رزگاریان بووە هەتا زیادیان کردووە و شارستانیەتی بابلییان پێکەوە ناوە ،ئەگەر ئەو چیرۆکانەی تەورات و قورئان لای ئاشوریەکان و بابلییەکانیش هەبێت وە دەست کاری کرابێ و تێکەڵ بە بیر و باوەڕ و خودای بابلی و ئاشوریەکان کرا بێت . لە نوح و ئەو کۆمەڵەی لەگەڵیدا بوون بیستراون یان نوسراون و بە مروری زەمان ئاینەکەی نوح و نەوەکانی گۆڕراوە و تێکەڵی ئەفسانەکان بووە کەواتە پێش بابلی و ئاشوریەکان . ئادەم و حەوا هەبوون نەوەیان زیادی کردووە ، نەوەکانیان گومڕا بوون خودا پێغەمبەری بۆ ناردوون . هەر باش نەبوون کۆتا پێغەمبەریان نوح بووە . هەر باش نەبوون بە تۆفان هەموو بێدینەکان نەماون وە چاخێکی نوێی ئیمان داران دەستی پێ کردوەتەوە . پاشان بەرەو بێ دینی ڕۆشتوون هەتا لە زەمانی ئاشوری و بابلییەکاندا جارێکی تر خوداوەندیان دروست کردوەتەوە و پەرستویانە . وە ئاینە ڕاستەکەی نوح و شوێن کەوتوا نیان گۆڕیوە و لەگەڵ خوداوەندەکانی خۆیان تێکەلاویان کردووە . بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر لە ئەفسانە کۆنەکاندا باسی ڕوداو یان باسی چۆنێتیی دروست بوونی گەردوون یان هەر شتێکی تر کرا بێت . چونکە پێش بابلی و ئاشوریەکان پەیامی خودا و پەیام بەران هەبووە و لە کتێبەکانیاندا یان بە شفهی بە خەڵکیان ڕا گەیاندووە خودا کێیە و گەردوون چۆن دروست بووە وە خودا و منهجی خودا لە ئادەمەوە هەتا کۆتا مرۆڤ لە ئاخر زەماندا هەر یە ك خودایە و باسی چۆنێتیی درووست بوونی گەردون و ڕوداوەکانی هەر بە یە ك شێوە دەکات و گۆڕان کاریی تێدا نییە و ئاساییە ئەگەر هەمان ڕوداو لە ئەفسانەکاندا و لە تەورات و قورئانیشدا وەك یەك بن بەلام ئەوەی ئاسای نییە . ڕادەی نەزانی و نە خوێندەواریی کاکی بێدینە وە ئاگای لە مێژو نییە کە ٥٠٠٠ ساڵە نوسین هەیە و ئەو نوسینانەی پێ گەیشتوە . وە بێ ئاگایە لە مێژوی پێش نوسین و بە ئارەزوی خۆی و بە ئەقڵی خۆی شیکاری بۆ ئاین دەکات.

**پرســـیاری بـــێ وەلامــی** ئێمەش ئەمەیە : پێش بابلی و ئاشوریەکان چی هەبوو ؟ ئایا دەتوانیت پێمان بڵێیت یان بۆمان بسەلمێنیت پێش مێژوی نوسین کێ هەبوو ؟ لە کوێ دەژیان چییان دەکرد ؟ تکایە قسەی هیچ و گیرفان مەکەن و باسی مرۆڤی ئەشکەوت و کۆمۆنی سەرەتایی و زەمانی بەستەڵەك مەکەن . چونکە مرۆڤ هێندە گەمژە نەبووە نەزانێت خانویەك بۆ خۆی دروست بکات و تێیدا بژی . هەموو ئاژەڵ و باڵندەیەك دەزانێت شوێنێکی حەسانەوە بۆخۆی دروست بکات و هەموو قاعیدەیەکیش شازی تێدایە ئێمەی ئیماندا دەڵێین ئەو چیرۆکانەی لە ئەفسانەکاندا هەیە لە نوح و نەوەکانی دوای ئەوەوە وەرگیراون ئادەی ئێوە پێمان بڵێن ئەو ڕوداوانە لە کێوە وەرگیراون ؟ ئایا شارستانی پێش بابلی و ئاشوریەکان هەبووە ؟ ئەگەر هەبووە کێ بوون ؟ ئەگەر نەبووە !! کەواتە جەنابت ئاگاداری ( ٥٠٠٠) ساڵیت لەسەر ژیانی سەر زەوی .

دەتوانن سەیری ئەم پرسیارە بێ وەلامەش بکەن دەربارەی نوح و ئاژەڵەکانی نوح و مێژووە جوگرافیا ی ٧٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا

پرسیارە بێ وەڵامەکان (١٦) **بگەرێنەوە لاپەرە (٤١)**

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :شەست نۆ

## تەورات و ئینجیل کێ و کەی و چۆن تحریف کرا ؟

**لە کوردوستان رێکخراوە تبشیرییەکان واتا ئەوانەی خەڵك دەکەن بە مەسیحی هەمیشە ئەم پرسیارە لە خەڵکی دەکەن : کتێبی پیرۆز واتا تەورات و ئینجیل یان پەیمانی کۆن و پەیمانی تازە . کەی تحریف کرا و کێ تحریفی کرد و چۆن تحریف کرا ؟** لەبەر ئەوەی موسوڵمانی کورد بە عام بە بانگ خواز و موسوڵمانی عەوامەوە شارەزایان لە کتێبی پیرۆز نییە و کاریان نە کردوە لەو بووارەدا . نازانن و ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە ، بۆیە منیش لەم نوسینە دا بە بەڵگەی خۆیان وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دەدەمەوە

کاتێك دەڵێن تەورات واتا ؟( ٥ ) **سفر** یان کتێبی یەکەمی پەیمانی کۆن ئەویش سفر التکوین ( پەیدابون ) سفر الخروج ( دەرچون ) سفر اللاوین ( رێنمایی کاهینی ) سفر العدد ( سەرژمێری ) سفر التثنیة ( دوا وتاری موسا ) ئەم (٥ ) سفرە پێی دەڵێن تەوراتی موسا و بناغەی ئاینی جولەکەیە . باقیاتی سفرەکانی ترکە( ٣٤) کتێبن تەورات نین بەڵکو کتێبی پێغەمبەرانی دوای موسان علیهم السلام . وە ئەم کتێبانە هەر هەمووی لە رێگای وەحیەوە نە نوسراون بەڵکو دەڵێن رۆحی پیرۆز واتا جبرائیل هاتوەتە ناو لەشی ئەو پێغەمبەرانە و چی کرد بێت و گوت بێت فەرمانی خودا بووە،کەواتە پەیمانی کۆن (٣٩ )کتێبن بە تەنها ( ٥ ) کتێبی یەکەمیان وەحیی خودایە کە پێی دەڵێن تەوراتی موسا . **هەر وەکوو پێشتر باسمان کردبوو** ، با بزانین تەوراتی موسا لە کوێیە بە گوێرەی دەقەکانی خۆیان ؟

نوسخەی ئەسڵیی تەورات بوونی نییە .چونکە کاتێك موسا (ع) لە سەرە مەرگدا بو خودا پێی فەرموو قەومە کەت دوای خۆت سەرپێچیی خودا دەکەون و بت پەرستی دەکەن و دژایەتی خودا دەکەن . بۆیە موساش فەرمووی تەورات بخەنە ناو ( صندوق العهد سندوق پەیمان ) بەو شێوەیە تەوراتی ئەسڵی لای

جولەکـە نـەما بـۆ زانیـاریی زیـاتر سـەیری **سـفر التثنیـة** ( دوا وتـاری موسـا ) بەشـی ٣١ دەقی ١٤ بـۆ ٢٩ بکەن ئەمەش لینکەکەیەتی

http://www.kitebipiroz.com/bible/deu/31/26#v26

..........................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » دواوتاری موسا » بەشی ٣١

### پێشبینی یاخیبوونی ئیسرائیل

14 یەزدان بە موسای فەرموو: (ئەوەتا ڕۆژانت لە مردن نزیك بۆتەوە، یەشوع بانگ بکە و لەناو چادری چاوپێکەوتندا بوەستن تا ئەرکی پێ بسپێرم.) جا موسا و یەشوع چوون و لەناو چادری چاوپێکەوتندا وەستان.

15 ئینجا یەزدان لە ستوونی هەورێك دەرکەوت و ستوونی هەورەکە لە دەروازەی چادرەکە وەستا.

16 یەزدان بە موسای فەرموو: (ئەوەتا تۆ لەگەڵ باوباپیرانت سەردەنێیتەوە، جا ئەم گەلە هەڵدەستن و لەشفرۆشی[c] دەکەن لەگەڵ خوداوەندە بێگانەکان لەو خاکەی ئەوان دەچنە ناوی لەنێویان و وازم لێ دەهێنن و ئەو پەیمانەم دەشکێنن کە لەگەڵیان بەستوومە.

17 ئیتر لەو ڕۆژەدا تووڕەییم بەسەریاندا گڕ دەگرێت و وازیان لێ دەهێنم و ڕووی خۆم لێیان دەشارمەوە و دەبنە نێچیر و تووشی زۆر ناخۆشی و بەڵا دەبن، هەتا ئەوەی لەو ڕۆژەدا دەڵێن: "ئایا لەبەر ئەوە تووشی ئەو بەڵایانە بووین چونکە خودا لەگەڵمان نییە؟"

18 منیش لەو ڕۆژەدا ڕووی خۆم دەشارمەوە لەبەر هەموو ئەو خراپەیەی کەوا کردیان و کە دوای خودای دیکە کەوتن.

19 (ئێستاش ئەم سروودە بۆ خۆتان بنووسن و نەوەی ئیسرائیلیشی پێ فێر بکەن، بیخەنە دەمیانەوە تا بۆ من ببێتە شایەت بەسەر نەوەی ئیسرائیلەوە،

20 چونکە من دەیانبەمە ناو ئەو خاکەی سوێندم بۆ باوباپیرانیان خوارد، ئەوەی شیر و هەنگوینی لێ دەڕژێت، جا دەخۆن و تێر دەبن و قەڵەو دەبن و ئینجا دوای خودای دیکە دەکەون و دەیپەرستن و پشتم لێ دەکەن و پەیمانەکەم دەشکێنن.

21 جا کاتێك تووشی بەڵا و ناخۆشی دەبن، ئەم سروودە وەك شایەت وەڵامیان دەداتەوە، چونکە لە دەمی نەوەکەیان لەبیر ناکرێت، من دەزانم ئەوان ئەمڕۆ بیر لە چی دەکەنەوە، بەر لەوەی بیانبەمە ناو ئەو خاکەوە وەك سوێندم بۆ خواردن.)

22 جا موسا لەو ڕۆژەدا ئەم سروودەی نووسی و نەوەی ئیسرائیلیشی پێ فێرکرد.

23 ئینجا یەزدان فەرمانی بە یەشوعی کوڕی نون کرد و فەرمووی: (بەهێزبە و ئازابە، چونکە تۆ نەوەی ئیسرائیل دەبەیتە ناو ئەو خاکەی لەسەری سوێندم بۆیان خوارد و منیش لەگەڵت دەبم.)

24 دوای ئەوەی موسا بە تەواوی لە نووسینی وشەکانی ئەم فێرکردنە بووەوە لە پەرتووکێك،

25 فەرمانی بە لێڤییەکانی هەڵگرانی سندوقی پەیمانی یەزدان کرد و وتی:

26 (ئەم پەرتووکەی تەورات ببەن و لە تەنیشت سندوقی پەیمانی یەزدانی خوداتان داینێن، هەتا وەك شایەتی بەسەرتانەوە لەوێ بێت.

27 چونکە من یاخیبوون و کەللەڕەقیتان دەزانم، ئەوەتا من ئەمڕۆ هێشتا زیندووم لەگەڵتاندا و ئێوەش بەربەرەکانێی یەزدان دەکەن، جا باشە دوای مردنم چی دەکەن!

28 هەموو پیرانی هۆزەکان و کوێخاکانتانم بۆ کۆبکەنەوە، تا ئەم وشانەیان بەگوێدا بدەم، ئاسمان و زەوی بکەم بە شایەت بەسەریانەوە،

29 چونکە دەزانم ئێوە دوای مردنم بە تەواوی گەندەڵ دەبن و لەو ڕێگایە لادەدەن کە فەرمانم پێ کردوون. لە ڕۆژانی ئاییندەدا تووشی خراپە دەبن، چونکە لە بەرامبەر یەزدان خراپە دەکەن، بەو بتانە کە بەدەستی خۆتان دروستتان کرد پەستی بکەن.)

..........................................

پاش مردنی سولەیمان (ع) جولەکە بوون بە دوو بەشەوە مەملەکەتی سامیرە و یهوذا و هەر یەکەیان کتێبی پیرۆزی خۆیی هەبوو . وە هەردووك لایان خەریکی بت پەرستی بوون و لە ڕێگای خودا لایان دا وە خودا لە ڕێگای پێغەمبەر ئیرمیاوە پێیان دەڵێت مادام ئێوە

پشتتان کردوەتە خودا و بت دەپەرستن بابلیەکانتان بۆ دەنێرم بۆ ئەوەی زەویی فلسطین لە بت پەرستی پاك بکەمەوە ( بڕوانە **سفری ارمیا** بەشی ٢٥ دەق ١ بۆ ١٤ ) ...ساڵی ٥٨٦ ی پێش لەدایك بونی مسیح (ع) بابلیەکان بە سەرکردایەتی نبوخذ نصر هاتن فلسطین یان داگیرکرد . هەردوك مەملەکەتەکەیان ڕوخاند و تەنانەت خانووەکانیشیان و هەیکەلی سولەیمانیشیان ڕوخاند . وە هەموو کتێبەکانیشیان سوتاندن وە بنو ئیسرائیلیشیاان برد بۆ بابل وە ١٠٠ ساڵ لە بابل مانەوە لە ماوەی ئەو ١٠٠ ساڵەدا جولەکە هیچ پەرستگا و هیچ کتێبێکی نەبو . پاشان فارسەکان بە سەرکرادەیە تیی کۆرش مەملەکەتی بابل یان ڕوخاند و فەرمانیان کرد بە جولەکە کێ دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ فلسطین با بگەڕێتەوە . کەسێك هەبوو بە ناوی ( عەزرا ) پیاوی مەلیکی فارس بوو وە لە دیوانی مەلیك کاری دەکرد و لە بابل لە دایك بووە و کەسێکی ئاینی نییە و لە بابلیش هیچ کتێب و پەرستگایەکیان نەبووە هەتا عەزرا فێری ئاینی جولەکە ببێت . لە سەردەمی ارتحشستای کوڕی کۆرشدا فەرمانی بە عەزرا کرد کە بگەڕێتەوە بۆ فلسطین و هەیکەلی سلیمان بنیات بنێتەوە و جارێکی تر تەورات بنوسێتەوە کەواتە نوسینەوەی ئەم تەوراتەی بەر دەستمان وەحیی خودا نییە . بەڵکو بە فەرمانی فارس نوسراوەتەوە بۆیە جارێکی تر تەورات نوسرایەوە لەسەر دەستی عەزرادا وەك لە **سفری عەزرا** بەشی ٧ دا نوسراوە خۆشتان دەتوانن لێرەدا لە کتێبی پیرۆزدا بیخوێننەوە چۆن تەورات نوسرایەوە ؟

http://www.kitebipiroz.com/bible/ezr/7

..............................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » عەزرا » بەشی ٧

### هاتنی عەزرا بۆ ئۆرشەلیم

1 پاش ئەم شتانە و لە سەردەمی پاشایەتی ئەرتەحشەستەی پاشای فارس، (عەزرا) کە کوڕی سەرایا کوڕی عەزەریا کوڕی حیلقیا

2 کوڕی شەلوم کوڕی سادۆق کوڕی ئەحیتوڤ

3 کوڕی ئەمەریا کوڕی عەزەریا کوڕی مەرایۆت

4 کوڕی زەرەحیا کوڕی عوزی کوڕی بوقی

5 کوڕی ئەبیشوەع کوڕی فینەحاس کوڕی ئەلعازاری کوڕی هارونی سەرۆك کاهین بوو - -

6 ئەم عەزرایە لە بابلەوە سەرکەوت. مامۆستایەکی بە توانا بوو لە تەوراتی موسا، یەزدانی خودای ئیسرائیل پێی دابوو. پاشاش بەپێی ئەوەی یەزدانی خودای خۆی لەگەڵی بوو، هەموو ئەوەی داوای کردبوو پێی دابوو.

7 هەندێك لە نەوەی ئیسرائیل و لە کاهین و لێڤی و گۆرانیبێژ و پاسەوان و کۆیلە تەرخانکراوەکان لەگەڵی بەرەو ئۆرشەلیم سەرکەوتن، لە ساڵی حەوتەمی ئەرتەحشەستەی پاشا.

8 عەزرا لە مانگی پێنج لە ساڵی حەوتەمی پاشادا گەیشتە ئۆرشەلیم.

9 لە مانگی یەکەوە دەستی پێکردبوو لە بابلەوە سەربکەوێت و لە یەکی مانگی پێنجدا گەیشتە ئۆرشەلیم، بەپێی ئەوەی دەستی چاکەی خوداکەی لەسەری بوو.

10 چونکە عەزرا خۆی تەرخان کردبوو بۆ خوێندنی تەوراتی یەزدان و کارکردن پێی، بۆ ئەوەی ئیسرائیل فێری فەرز و دادوەری بکات.

**نامەی ئەرتەحشەستەی پاشا بۆ عەزرا**

11 ئەمەش وێنەی ئەو نامەیەیە کە ئەرتەحشەستەی پاشا دایە عەزرای کاهین و مامۆستا، مامۆستای بابەتەکانی فەرمان و فەرزەکانی یەزدان بۆ ئیسرائیل:

12 لە ئەرتەحشەستەی پاشای پاشایانەوە،
بۆ عەزرای کاهین و مامۆستای تەوراتی خودای ئاسمان
پاش سڵاو:[a]

13 لەلایەن منەوە فەرمانێك دەرچووە کە هەر کەسێك لەناو پاشایەتییەکەی من لە گەلی ئیسرائیل و کاهین و لێڤییەکان بیەوێت لەگەڵ تۆ بگەڕێتەوە ئۆرشەلیم با بگەڕێتەوە.

14 تۆ لەلایەن پاشا و حەوت ڕاوێژکارەکەیەوە نێردراویت بۆ ئەوەی لە یەهودا و ئۆرشەلیم بکۆڵیتەوە، بەگوێرەی تەوراتی خوداکەت کە بە دەستتەوەیە،

15 هەروەها بۆ بارکردنی ئەو زێر و زیوانەی کە پاشا و ڕاوێژکارەکانی بەخشیویانە بە خودای ئیسرائیل، ئەوەی نشینگەکەی لە ئۆرشەلیمە.

16 لەگەڵ هەموو ئەو زێر و زیوەش کە لە هەرێمی بابل بە دەستت دەکەوێت، لەگەڵ بەخشینە ئازادەکانی گەل و کاهینەکان کە دەیبەخشن بە پەرستگای خودای خۆیان، کە لە ئۆرشەلیمە.

17 دڵنیابە لەوەی بەم زیوە گا و بەران و بەرخی نێری لەگەڵ پێشکەشکراوی دانەوێڵە و شەراب بکڕیت و لەسەر قوربانگاکەی پەرستگای خوداتان کە لە ئۆرشەلیمە پێشکەشیان بکەیت.

18 هەرچی خۆت و برا جولەکەکانت پێتان باش بوو بە پاشماوەی زێر و زیوەکە بیکەن، بەپێی خواستی خودای خۆتان بکەن.

19 ئەو قاپوقاچاغەش کە بۆ خزمەتی پەرستگای خوداکەت پێت دەدرێت، لەبەردەم خودای ئۆرشەلیم داینێ.

20 پاشماوەی پێویستییەکانی پەرستگای خوداکەت کە بۆت ڕێك دەکەوێت بیدەیت، ئەوا لە گەنجینەکانی پاشاوە بیدە.

21 لە من، لە ئەرتەحشەستەی پاشاوە، فەرمان دەرچووە بۆ هەموو گەنجینەکانی هەرێمی ئەوبەری فورات کە هەرچی عەزرای کاهین و مامۆستای تەوراتی خودای ئاسمان داواتان لێ دەکات، با بە وردی جێبەجێ بکرێت،

22 هەتا سەد تالنت زیو[b] و سەد کۆر[c] گەنم و سەد بەت[d] شەراب و سەد بەت[e] زەیت و خوێش بەبێ سنوور.

23 هەرچی خودای ئاسمان فەرمانی پێداوە بە وردی بۆ پەرستگای خودای ئاسمان جێبەجێ بکرێت، چونکە بۆچی تووڕەیی لەسەر شانشینی پاشا و کوڕەکانی بێت؟

24 هەروەها پێتان ڕادەگەیەنین کە هەموو کاهین و لێڤی و گۆرانیبێژ و دەرگاوان و کۆیلە تەرخانکراوەکان و خزمەتکارانی ئەم ماڵەی خودا، ڕێ نادرێت سەرانە و باج و گومرگیان لەسەر بێت.

25 تۆش ئەی عەزرا، بەپێی دانایی خوداکەت کە بەدەستەوەیە، قازی و دادوەر دابنێ بۆ ئەوەی دادپەروەری بکەن بۆ هەموو ئەو گەلەی هەرێمی ئەوبەری فورات، لە هەموو ئەوانەی فێرکردنەکانی خودات دەزانن، ئەوانەش کە نایزانن، فێریان بکەن.

27 چونکە من یاخیبوون و کەللەڕەقیتان دەزانم، ئەوەتا من ئەمڕۆ هێشتا زیندووم لەگەڵتاندا و ئێوەش بەربەرەکانێی یەزدان دەکەن، جا باشە دوای مردنم چی دەکەن!

28 هەموو پیرانی هۆزەکان و کوێخاکانتانم بۆ کۆبکەنەوە، تا ئەم وشانەیان بەگوێدا بدەم، ئاسمان و زەوی بکەم بە شایەت بەسەریانەوە،

29 چونکە دەزانم ئێوە دوای مردنم بە تەواوی گەندەڵ دەبن و لەو ڕێگایە لادەدەن کە فەرمانم پێ کردوون. لە ڕۆژانی ئاییندەدا تووشی خراپە دەبن، چونکە لە بەرامبەر یەزدان خراپە دەکەن، بەو بتانە کە بەدەستی خۆتان دروستتان کرد پەستی بکەن.)

.................................................................

با ئێستا بێینە سەر وەڵامی ئەو سێ پرسیارەی **یەکەمان** : کاتێك ئەو کەسانەی خەڵکی دەکەن بە مەسیحی لێتان دەپرسن کەی کتێبی پیرۆز دەست کاری کرا ؟ ئێوەش لێیان بپرسن : ئەی تەوراتی موسا و نوسخە ی ئەسڵی تەورات لە کوێیە ؟ وە بە دەقی کتێبەکەی خۆیان بۆیان بسەلمێنن کە تەوراتی موسا بوونی نییە و خودا و موساش متمانەیان بە جولەکە نە کردووە ئەو کتێبەیان بخاتە بەردەست . چونکە خودا دەیزانی کە دەست کاریی دەکەن بۆیە گەڕاندیانەوە بۆ صندوق العهد. بە گوێرەی تەفسیرەکانی کتێبی پیرۆز و نوسەرانی مێژوو دەڵێن عەزرا ساڵی ٤٥٨ ی پێش هاتنی مسیح گەڕاوەتەوە بۆ قودس و لەوێ بە فەرمانی مەلیکی فارس جارێکی تر کتێبی پیرۆزی نوسیوەتەوە کەواتە ساڵی ٤٥٨ کتێبی پیرۆز نوسراوەتەوە لە لایەن عەزراوە بە فەرمانی پاشای فارس پاش (١٠٠) ساڵ دابڕان لە عیبادەت و پەرستگا . وە ئەم کتێبە پیرۆزەی بەردەستمان بە تایبەتی ٣٩ سفری پەیمانی کۆن . نوسخە

ئەسڵییەکی لە سندوقی عهددایە و ئەم نوسخەیەی بەردەستیشمان دەست نوسی عەزرایە بە فەرمانی پاشا ی فارس نوسراوەتەوە نەك فەرمانی خودا وە عەزراش پێغەمبەر نەبووە لای خوداوە بەڵکو نێرراوی پاشای فارس بووە بە نیسبەت پەیمانی تازەشەوە کە ئێمە پێی دەڵێین ئینجیل پێك هاتووە لە ٤ ئینجیلی مەتا و مرقس و لوقا و یوحنا لەگەڵ کتێبی اعمال الرسل وە ١٤ نامەی پۆلس وە ٨ نامەی تر و سفر رؤیا یوحنا کە هەموی دەکاتە ٥ کتێب و ٢٢ نامە . هیچیان ئینجیل نین و هەر هەموویان دوای مسیح (ع) بە ٦٠ ساڵ نوسراونە تەوە و هیچ کام لە نوسەرەکانی ناسراو نین و هیچیان قوتابیی مەسیح نەبوون . وە پەیمانی تازە هیچ شەرعێکی تێدا نییە و دەبێت مەسیحییەکان بۆ هەموو شەرعێك بگەڕێنەوە بۆ پەیمانی کۆن واتا کتێبەکەی عەزرا و هیچ کڵێسایەك ناتوانێت واز لە پەیمانی کۆن بهێنێت و وەلای نێت چونکە ئینجیل هیچی تێدا نییە

**پرسیاری بێ وەلامی ئەم جارەمان جیاواز و ناوازەیە .** چونکە وەلامە بۆ خوشك و برا موسوڵمانەکانمان بۆ چەواشە کاری و بۆ ئەو پرسیارەی مەسیحییەکان دەی کەن بە حساب وەڵامی نییە . ئەوە بە سەرچاوە ی خۆیان بۆمان سەلماندن کەی و کێ و چۆن دەست کاریی کتێبی پیرۆز کراوە ؟ وە سەلماندمان کتێبەکە یان نەك تحریف کراوە بەڵکو دەست نوسی عەزرا و پۆلس و متا و مرقس و لوقا و یوحنایە نەك وەحیی خودا بێت .

---

## پرسیارە بێ وەلاّمەکان ژمارە :حەفتا

## ئایا پێغەمبەر (د.خ) نامەی بۆ کڵێسا نوسیوە ؟



دەڵێت ئەم نامەیە پێغەمبەر (د.خ) ناردویتی بۆ کڵێسای کاترینی پیرۆز لە میسر و واژۆی کردووە . طبعا ئەم نامەیە هیچ ئەسڵ و ئەساسێکی نییە و دوورە لە ڕاستییەوە ،

بۆ ئەوەی نا ڕاستیی ئەم نامەیەتان بۆ بسەلمێنین

**یەکەم** : لە میسردا ئەو کاتە هیچ کڵێسایەك نە بووە بە ناوی کاترینەوە بەڵکو کڵێسای سات کاترین لە اسکندریە ساڵی ١٨٥٢ لە لایەن محمد علی پاشای والیی عوسمانیەکان دروست کرا کە دووکڵێسا بوو لە ساڵی ١٦٣٢ دا دروست کرا بوون جێگای ڕاهیبەکان بوون . تێکدران و محمد علی پاشا دروستی کردەوە و ناوی لێنرا کڵێسای ست کاترین . وە لێرەدا ئەوە هەڵەیە بڵێین کڵێسای کاترین هەبووە . وە ئەسڵی ئەو کڵێسایە کڵێسا نییە بەڵکو دەیرە . دەیریش هەمیشە لە شوێنی چۆڵەوانی و دور لە خەڵکیدا دروست دەکرێت ڕەبەنەکان تێیدا خودا پەرستی دەکەن . وە ئەو دەیرەش ناوی دەیری ست یان سات کاترینە . واتا کاترینی پیرۆز

**دووە م** :ئەم ست کاترینە بە حساب لە ساڵی ٣٠٧ دا تەمەنی ١٨ ساڵان بوە ئیمپراتۆری ڕۆم مکسیمیانوس لە سەری داوە و کوشتویەتی . وە ٥٠٠ ساڵ دوای کوشتنی ڕاهیبێك یان ڕەبەندێك بینیی کۆمەڵێك فریشتە لە سینا لاشەیەکیان پێیە و بە هێواشی لەسەر شاخێك دایان نا . ڕاهیبەکەش ڕای کرد بۆ سەر شاخەکە و بینیی لاشەی ست کاترینە کە لە خەویدا بینی بوی .. لاشەکەی برد بۆ کڵێسای موسا پاشان لاشەکەی گواستەوە بۆ دەیری جوستنیان . وە لەو کاتەوە ناوی دەیری جوستنیان گۆڕرا بۆ دەیری ست کاترین

کەواتە لە ساڵی ٨٠٧ وە دەیری ست کاترین هەیە و پێش ئەو بەروارە کڵێسا یان دەیری ست کاترین بونی نە بووە !! بەڵکو ناوی دەیری جوستینیان بووە . وە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم ساڵی ٦٣٢ وەفاتی کردوە واتا ئەو دەیرە ٤٥٧ ساڵ دوای مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بە دەیری ست کاترین ناو نراوە . هەروەها ئەوەی زانراوە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لە ژيانیدا نـۆ نامەی ناردووە و نامەکانیشن ناسراون بۆ کێێ ناردووە . لە ساڵی ٦٣١ دا بووە واتا ساڵێك پێش مردنی بووە . وە هەرکەس دەیەوێت بە دوای زانیاریـــــدا بگـــــەڕێت بـــــەدوای کڵێســـــای کاترینـــــدا لـــــە میســـــر بـــــا لـــــە گوگـــــڵ بنوســـــێت

Saint Catherines Monastery

بەڵام تکاتان لێ دەکەم واز لە یەکەم زانیاریی سەرەوە بهێنن کە ویکیپیدیایە و لە سەرچاوە ئەسڵییەکان بگەڕێن کە کڵێساکانە بە تایبەتی کڵێسای قبطییەکان وە ئەوان شارەزاترن لە مێژوی خۆیان . ئەوەی مایەی گاڵتە جاڕییە وێنەی ٢ دەست لە نامەکەدایە گوایا ئاماژەیە بۆ ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بە دەستی خۆی ئەم بەڵێن نامەیەی مۆر کردووە . بە ڕاستی مایەی شەرمەزارییە ئەو قسانە بکرێت ،

چونکە هەموو بەڵگەنامە و گرێ بەستێك بە دەست مۆر دەکرێت وە بونی ئەم دوو دەستە لە بەڵگەنامەیەکدا کە بە دەستی خۆی مۆرکراوە هی هەرکەسێك بێت وەك گاڵتە پێکردنە بەو کەسە چونکە مۆر و ئیمزا هەر بە دەست دەکرێت خۆ بە دەم و گوێچکە و قاچ ناکرێت پاشان لە نامەکەدا وێنەی مزگەوتێکی تێدایە و برادەرێك گوتی لەو زەمانەدا نامەکان لۆگۆیان هەبووە و بە لۆگۆی

مزگەوت نێرراوە . ئەمەش گاڵتە جارییەکی ترە چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) مۆری تایبەتیی خۆیی هەبووە و بۆچی ئەم نامەیە هیچ مۆرێکی پێوە نییە !؟.

**پرسیاری بێ وەڵاممان ئەمەیە** : ئەم جۆرە قسە و بڵاو کراوانە چی خزمەتێك بە ئاینی ئیسلام دەگەیێنێت ؟ وە زانیاریی هەڵە و چەواشەکاری خزمەتی کێ دەکات ؟ وە ئەو مامۆستا بەڕێزانە بۆچی خۆیان ماندوو ناکەن و بەدوای زانیاریدا بگەڕێن ؟ لە هەمووی گرنگ تر ئەو نامەیە لە مێژە لە ئینترنێتدا هەیە و خۆتان دەتوانن بگەڕێن و بزانن کە زۆر لە سایدەکان بڵاویان کردووەتەوە ..

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :حەفتاو یەك

## جەند ئایەتی قتل و کوشتن لە قورئاندا هەیە

ئاستی نەشارەزایی دژە ئیسلامەکان بزانن چۆن خەڵکی چەواشە دەکەن لە نێوان ووشەی قاتلوهم = جەنگیان لەگەڵ بکەن !؟ وە اقتلوهم = بیان کوژن !؟

1. وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿البقرة: ١٩٠﴾

﴿البقرة: ١٩١﴾ ﴿البقرة: ١٩٣﴾ ﴿البقرة: ٢١٧﴾ ﴿البقرة: ٢٤٤﴾ ، ﴿البقرة: ٢٤٦﴾

﴿آل عمران: ١٣﴾ ﴿آل عمران: ١١١﴾ ﴿آل عمران: ١٤٦﴾ ﴿آل عمران: ١٦٧﴾

﴿آل عمران: ١٩٥﴾ ﴿النساء: ٧٤﴾ ﴿النساء: ٧٥﴾ ﴿النساء: ٧٦﴾ ﴿النساء: ٨٤﴾ ﴿النساء: ٩٠﴾ ﴿المائدة: ٢٤﴾ ﴿التوبة: ١٢﴾ ﴿التوبة: ١٣﴾ ﴿التوبة: ١٤﴾

﴿التوبة: ٢٩﴾ ﴿التوبة: ٣٠﴾ ﴿التوبة: ٣٦﴾ ﴿التوبة: ٨٣﴾ ﴿التوبة: ١١١﴾ ﴿التوبة: ١٢٣﴾ ﴿الحج: ٣٩﴾ ﴿الأحزاب: ٢٠﴾ ﴿الفتح: ١٦﴾ ﴿الفتح: ٢٢﴾ ﴿الحجرات: ٩﴾

﴿الحديد: ١٠﴾ ﴿الحشر: ١٤﴾ ﴿الممتحنة: ٨﴾ ﴿الممتحنة: ٩﴾ ﴿الصف: ٤﴾ ﴿المنافقون: ٤﴾ ﴿المزمل: ٢٠﴾

لە هەمو قورئاندا 3 ئایەت دەڵێت بیان کوژن البقرة 191 النساء 89 و 91 وەك لێرەدا دەیان بینن

1. وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُمْ مِنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِنْ قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿البقرة: ١٩١﴾

2. وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً فَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ حَتَّى يُهَاجِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿النساء: ٨٩﴾

3. سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَنْ يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوا إِلَى الْفِتْنَةِ أُرْكِسُوا فِيهَا فَإِنْ لَمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُولَئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا مُبِينًا ﴿النساء: ٩١﴾

دژە ئیسلامەکان هەمیشە تاوان بارمان دەکەن بەوەی قورئان کتێبێکی خوێناوییە و فەرمان بە کوشتن دەکات .

هەمیشە جەماعەتی کۆپی و پەیست یەك ڕیز ئایەت دا دەنێن بە بەڵگە بۆ ئەوەی قورئان دەڵێت بیان کوژن و بەرامبەر لەناو بەرن و ئاینی ئیسلام ئاینی شمشێر و کوشتنە

بـەڵام كێشـەكە لەوەدایـە ئێمـەی موسـوڵمان و ئـەوانیش جیـاوازیی نێـوان ( قـاتلوا ) وە ( اقتلـوا ) نـازانین بۆیـە هـەردووك لامـان تـێ دەكـەوین و دەكەوینـە مناقشـەی دوور و درێـژی بـێ هـودەوە . بـەڵام ئەگـەر زانیمـان كـە لـە قورئانـدا وشـەی ( قـاتلوا ) ٥٢ جـار هـاتووە لـە ٣٩ ئایەتـدا !! وە ووشـەی ( اقتلـوا ) ٤ جـار هـاتووە لـە ٣ ئایەتـدا وەك لـە وێنـەكـەدا دەبینـن و نـاوی سـورەتەكان و ژمـارەی ئایەتەكانیشـمان بـۆ دانـاون . ئێسـتا بـۆ ئـەوەی ئـەو گومانـە پوچـەڵ بێتـەوە جیـاوازیی نێـوان ئـەو ئایەتانەتان بۆ دەكەین

( قـاتلوا ) واتـا جـەنگ بكـەن بـەڵام ( اقتلـوا ) واتـا بیـان كـوژن . وە هـەردووك لامـان لێـرەدا دەكەوینـە هەڵـەوە چونكـە ئایەتـەكانی جـەنگ بكـەن ٥٢ دانەیـە كاتێـك دا دەنرێـت لـە كتێبێـك یـان مـاڵ پـەڕێك یـان پۆسـتێكدا ئێمـە بـە لا شـعوری دەڕۆیـن بـۆ كوشـتن . بـەڵام ئایەتەكـە باسـی كوشـتن ناكـات ، بـەڵكو باسـی جـەنگ كـردن دەكـات وە هـەر ئایـەتێكیش لـەو ٥٢ ئایەتـە لـەناو خۆیـدا وەڵامـی خـۆیی تێدایـە . ئەگـەر ماناكـەی تـەواو نـەبوو ئایـاتی پـێش و پاشـی لەگەڵیـدا دابنـێن یـان بخوێننەوە.

دەبینین باسی حوكمی شەڕ كردن دەكات و لێرەدا كات نابێت باسی هەر ٥٢ ئایەتەكە بكەین . بەڵام هەر هەمووی دەڵێت بجەنگن نەك بكوژن .وە لە كاتی جەنگیشدا لە كۆن و ئێستاشدا یاسا و ڕێسای خۆیان هەبووە . پاش جەنگ ئەو یاسا و ڕێسایانە تطبیق نەكراوە !! یان ئەو جێگایانەی شەڕی تێدا نییە ئەو یاسایانە نای گرێتەوە . قورئانیش بەهەمان شێوە باسی یاساكانی شەڕی كردووە وە زۆربەی زۆری ئایەتەكانی قورئان دەڵێت بجەنگن كاتێك ئەوان هێرش دەكەن یان پێمان دەڵێت لە كاتی جەنگدا چی بكەین ؟ ئەگەر ئێستا بێینە سەر باسی ئەو **چوار** ئایەتەی كە دەڵێت ( اقتلوهم ) واتا بیان كوژن . ئایەتی **البقرة** ١٩١ دا ئایەتی پێش ئەو دەڵێت بجەنگن لەپێناوی خودادا لەگەڵ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵ دەكەن وە دەست درێژی مەكەن چونكە خودا دەست درێژی كاری خۆش ناوێت . پاشان ئایەتی ١٩١ دەڵێت بیان كوژن لە هەر جێگایەك بینیتانن . كەواتە كوشتنەكە لە كاتی شەڕدایە و لە كاتێكدایە كە بەرامبەر هێرش دەهێنێت و دە جەنگێت . وە خودا دەڵێت ئێوە دەست درێژی مەكەن . واتا بەرامبەر هێرشی هێناوە و دەیەوێت بمان كوژێت . ئێمەش دەجەنگین و شەڕ دەكەین بەلام ئەگەر بەرامبەر هێرش نەكات ئێمەش هێرش ناكەین و نایان كوژین چونكە خودا دەست درێژ كاری خۆش ناوێت . وە دەست درێژیەكە لە بەرامبەرەوەیە نەك لە ئێمەی موسوڵمانەوە بۆ ئەوەی بابەتەكە دوور و درێژ نەبێت خۆتان دەتوانن بگەڕێن و حوكمەكانی ( قاتلوهم ) وە ( اقتلوهم ) بدۆزنەوە و تێ بگەن لەوەی هەموو یتاكێك و هۆزێك و كۆمەڵێك و دەوڵەتێك لە جیهاندا لە كۆن و نوێدا هیچ كامیان بەوە ڕازی نابن هێرش یان تەعەدایان بكرێتە سەر. بەڵكو كاتێك هێرشیان بۆ دەكرێت بەرامبەریش هێرشیان بۆ دەكاتەوە و پارێزگاری لەخۆی دەكات دوژمنانی ئیسلام ئەو پارێزگاری لەخۆ كردنە بۆ ئیسلام بە ڕەوا نابینن وە كردویانە بە بەڵگە بەسەرمانە وە ئێمەی موسوڵمان بكوژین و قورئانەكەمان پڕە لە ئایەتی بیان

كوژن بەڵام ئایەتەكان ناڵێن بیان كوژن بەڵكو دەڵێت بجەنگن كاتێك دەست درێژی دەكرێتە سەرتان . یان پێمان دەڵێت لە كاتی شەڕدا چی بكەین بەڵێ بەڕێزان هیوادارم لەمەودوا ئێوەش هۆشیار بن و فەرقی نێوان ( قاتل ) وە ( اقتل ) یان ( قاتلوهم ) وە ( اقتلوهم ) بكەن و بتوانن بوهتان و درۆی دژە ئیسلامەكان پوچەڵ بكەنەوە و چیتر كاتی خۆتان نەكوژن بە مناقشەی بێ سودەوە .

ئەسڵی ئەو گومانە لێرەدایە كە لەگەڵ سیاقی ئایەتەكاندا بڕۆن و پاش و پێشەكەی بخوێننەوە . ئەو كات فهت الذي كفر

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە :** ئادەی ئێستا پێمان بڵێن چەند ئایەتی كوشتن لە قورئاندا هەیە ؟ بەڵام تكایە پاش و پێشی ئایەتەكانیش دا بنێن و خەڵكی چەواشە مەكەن .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :حەفتاو دوو

## ئایا ئافرەت ناقص العقلە ؟

يا معشرَ النِّساءِ ! تصدَّقْن وأَكْثِرْن الاستغفارَ . فإني رأيتُكنَّ أكثرَ أهلِ النار . فقالت امرأةٌ منهن ، جَزْلَةٌ : وما لنا يا رسولَ اللهِ أكثرُ أهلِ النارِ قال : تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ . وتَكْفُرْنَ العشيرَ . وما رأيتُ من ناقصات عقلٍ ودينٍ أغْلَبَ لذي لُبّ منكنَّ . قالت : يا رسولَ اللهِ ! وما نقصانُ العقلِ والدّين ؟ قال : أما نقصانُ العقلِ فشهادةُ امرأتَين تَعدلُ شهادةَ رجلٍ . فهذا نقصانُ العقلِ . وتَمكثُ الليالي ما تُصلّي . وتُفطِرُ في رمضانَ فهذا نقصانُ الدّين الراوي : عبدالله بن عمر المحدث : مسلم المصدر : صحيح مسلم الصفحة أو الرقم: 79 خلاصة حكم المحدث : صحيح

دەقی حەدیسی ناقصات عقل و دین

والجَزِيلُ: العظيمُ.
وعطاءٌ جَزْلٌ وجَزِيلٌ، والجمع جِزالٌ.وأَجْزَلْتُ له منا لعطاء، أي أكثَرتُ.وفلانٌ جَزْلُ الرأي.
وامرأةٌ جَزْلةٌ بيِّنة الجزالة، إذا كانت ذاتَ رأي.واللفظ الجَزْلُ: خلاف الركيك.والجَزْلُ

ماناى وشەی جزلة لە فەرهەنگەكان

ورجل جَزْل الرأْي وامرأَة جَزْلة بيِّنة الجَزالة: جَيِّدة الرأْي.
وما أَبْيَنَ الجَزالة فيه أَي جَوْدَة الرأْي.
وفي حديث مَوْعظة النساء: قالت امرأَة منهن جَزْلة أَي تامَّة الخَلْق؛ قال: ويجوز أَن تكون ذاتَ كلام جَزْل أَي قَوِيّ شديد.
واللفظ الجَزْل: خلاف الرَّكِيك.
ورَجُل جَزْل: ثَقِفٌ عاقل أَصيل الرَّأْي، والأُنثى جَزْلة وجَزْلاء. قال ابن سيده: وليست الأَخيرة بثَبت.
والجَزْلة من النساء: العَظِيمةُ العَجِيزة، والاسم من ذلك كلّه الجَزَالة.

دژە ئیسلامەكان ڕەخنەمان لێ دەگرن دەڵێن پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) وەسفی ئافرەتی كردووە بە بێ ئەقڵ وە هەمیشە دەنوسن ( ناقصات عقل ) وە حەدیسەكە بە تەواوەتی ناڵێن وەك خۆی . خەڵكانی موسوڵمانی نەزانیش هەیە نازانن وەڵامیان بدەنەوە دەڵێن ئەو حەدیسە زەعیفە ! بەڵام ئەو حەدیسە زەعیف نیە بەڵكو صحیحە ١٠٠% وە هیچكام لە محدسەكان

نەیان گوتووە لاوازە و هەر کەس بڵێت لاوازە دڵنیابن هیچ لە ئیسلام و لە حەدیسیش نازانێت . بۆ ڕون کردنەوەی ئەم گومانە دەبێت حەدیسەکە وەك خۆی باس بکەین و دەق حەدیسەکەم لە وێنەکەدا بۆ داناون ،ئەم قسەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)) لە کاتی جەژندا بووە . پاش خوطبە چووە بۆ لای ژنان بە تایبەتی ویستویەتی دڵیان خۆش بکات بەهۆی جەژنەوە . خۆشتان دەزانن جەژن لە هەموو ئاین و کلتورێکدا واتا دڵ خۆشی خەڵکی ، معقول نییە لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)) بە ژنان بڵێت ئێوە بێ ئەقڵ و کاڵ فامن !؟ پاشان هەر لە حەدیسەکەدا خۆی وەڵامی گومانەکەی تێدایە وەك بۆتان ڕون دەکەینەوە : پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)) بە ژنەکانی گوتووە ئەی ژنان خێر بکەن و استغفار زۆر بکەن چونکە ئێوە زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن ! ئەمە خۆی ئامۆژگارییە بۆیان و خۆ ئامادە کردنە بۆ ڕۆژی قیامەت کە چی بکەن بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە دۆزەخ . ئەگەر ژن بێ ئەقڵ بێت و کاڵ فام بێت دەبێت گوێی بۆ ڕا بگرێت و بڵێت ڕاست دەکەیت و هیچ نەڵێن !! بەڵام لە حەدیسەکەدا نوسراوە ( فقالت امراة منهن جزلة ) ئافرەتێکی ( جزلة ) گوتی . لێرەدا ئەم وشەیە گومانی ناقصات ئەقڵی دژە ئیسلامەکان پوچەڵ دەکاتەوە . چونکە جزلة لە جزل وەرگیراوە واتا ئافرەتێکی کامڵی بە سەلیقەی قسەزانی خاوەن بیر وڕای موسەقەفی بەتوانا کە خەڵکی گوێ بۆ قسەکانی ڕا دەگرن وە جزل پێچەوانەی خەڵکی نەزان و بێ ئاگا و قسە نەزانە چی ژن بێت چی پیاو بێت . دەڵێن امراة **جزلة** یان رجل **جزل** وە زۆرمان وشەی جزیلمان بیسووە کاتێك سوپاسی کەسێك دەکرێت دەڵێن ( شكرا جزيلا ) واتا نازانیت چۆن سوپاسی بکەیت هێندە چاکەی کردوە ناتوانیت چاکەکەی بدەیتەوە . لێرەشدا دەڵێت امراة جزلة واتا هێندە زیرەك و بە توانایا هەموو کەس گوێێ بۆ ڕا دەگرێت و بە قسەی دەکەن . ئایا پاش ئەمە کەس دەتوانێت بڵێت پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیە و سلم )بە ئافرەت دەڵێت ناقصات عقل لە کاتێکدا ئافرەتێکی دانا و زانا و قسە زان وەڵامی داوەتەوە ؟

مانای جزلةشمان لە وێنەکەدا داناوە و خۆشتان دەتوانن بەدوای ئەو وشەیەدا بگەڕێن لە فەرهەنگەکاندا !؟ ئەمەش بەڵگەیە بۆ دوو شت

**یەکەمیان** ئافرەت لە ئیسلامدا سەرکوت نەکراوە دەمی دابخات و هیچ نەڵێت و بەس بەڵێ بکات ، وە ئەو ئافرەتە قسەی کردووە . و پرسیاری کردووە بۆچی پێیان دەڵێت ئێوە ناقصات عقلن ؟ وە پرسیاری تریشی کردووە .

**دووەمیان** ئافرەتەکە دانا و زانا بووە و بەو شێوەیە وەسف کراوە نەك بە ناقص العقل . وە لێرەدا لەم حەدیسەدا ئەم ئافرەتە دانایە پرسیار دەکات دەڵێت بۆچی ئێمە زۆرترین خەڵکی دۆزەخین ؟پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)) لە وەڵامدا دەڵێت : لەعنەت زۆر دەکەن و لە مێردەکانتان ڕازی نین ! وە پاشان باسی ناقصات عقل دەکات و دەفەرموێت ( و ما رايت من ناقصات عقل و دين اغلب لذي لب مكين ) واتا کەسم نە بینیووە وەك ئێوە بتوانێت یاری بە ئەقڵی پیاوی خاوەن دەسەڵات و دانا و زانا و تێگەیشتوو بکات !؟ ئەمەش مانای ئەوەیە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)) سەرسام بووە بە توانای ئافرەت کە دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر پیاودا و هەموو پیاوێکیش نا بەڵکو پیاوێك کە ( ذات لب مكين ) واتا دەسەڵاتدار و زانا و تێ گەیشتوو بێت نەك پیاوێکی ئاسایی . وە لێرەدا

ئافرەتەکە ناڵێت یا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بۆچی ئێمە ناقص العقلين ؟ چونکە تێ دەگات ئەوە وەسفە بۆیان نەك بە کەم زانین !؟ ئافرەتەکە زانا و دانایە دەپرسێت نوقسانیی ئەقڵ و ئاینی ئێمە چییە ؟پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) دەفەرموێت : نوقسانیی ئەقڵتان ئەوەیە شایەتیی دوانتان بە **یەك** کەس حسابە وە نوقسانیی ئاینتان ئەوەیە . شەوانە دەمێننەوە شەونوێژ ناکەن و لە ڕەمەزاندا بەڕۆژو نابن لەبەر سوڕی مانگانە . چیتر ئافرەتەکە پرسیاری لێ ناکات . چونکە دەزانێت شایەتیی دووئافرەت بە **یەك** کەس حسابە بە تەنها لە مەسەلەی قەرز و پارەدایە نەك هەموو شایەتییەك . وە بۆ ئەوەیان لەسەری نارۆم دەتوانن سەیری وەڵامی ئەو گومانەش بکەن

**لە پرسیاری بێ وەڵامی( ٥٥) دا وەڵاممان داوەتەوە لە لا پەرە (١٠٤) دا .**

لەم حەدیسەدا ئەم شتانە بەدی دەکرێت : ئەم حەدیسە صحیحە و لاواز نییە . و بەڵگەیە بۆ دانای و زانایی ئافرەت نەك بۆ بێ ئەقڵیی چونکە ئافرەتێکی جزلة گفت و گۆی لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) کردووە خاڵ بە خاڵیش پرسیاری لێ کردووە . پاشان ئافرەتەکە و هاوڕێکانی هیچیان ڕەخنەیان نە گرتووە لە ناقصات العقل وە ڕازی بون بەو وەسفە . چونکە خۆیان عەرەبییان باش زانیوە و تێ گەیشتون پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك سەرساممییەك پێیان وەسفی کردون کە دەتوانن زاڵ ببن بەسەر بە دەسەڵات ترین و زیرەك ترین پیاودا . بەلام نەزانیی دژە ئیسلامیەکان لەوەدایە هیچیان بەقەدەر ئەو ئافرەتە زیرەك نەبوون کە پرسیارەکانی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردووە وە لەوە تێ نەگەیشتوون ئەگەر ئەو حەدیسە بەڵگە بێت بۆ ناقصات العقل و کاڵ فامی ئافرەت چۆن دەتوانن زاڵ ببن بەسەر پیاوێکی زانای خاوەن دەسەڵاتدا ؟ گێلێتی و نەزانی دژە ئیسلام لێرەدا بە ڕونی دەر دەکەوێت . بۆ ئەوەی جوان تر و ڕون تر مانای ئەو حەدیسەمان بۆ دەر بکەوێت دەچینە لای جریری شاعر کە لە ساڵی ٣٣ ی هیجریدا لەدایك بووە لە شیعرێکیدا وەسفی ئافرەت دەکات کە چۆن مەزن ترین و داناترین پیاو دەدەن بە زەویدا جریریش هەر بە ( ذا اللب ) وەسفی پیاوی دانا دەکات چۆن ئافرەت بەسەریدا زاڵ دەبێت ؟و شیعرەکە بە کوردی دەڵێت : زۆران دەگرن لەگەڵ خەڵکی زیرەکی بە تواناندا تەنانەت لە جوڵەشی دەخەن لە کاتێکدا لاواز ترین خەڵقی خودان

**يصرعن ذا اللب حتى لا حراك به ... و هن اضعف خلق الله انسانا**

لەو دێڕە شیعرە و لەو حەدیسە بۆمان دەر دەکەوێت کە وەسفی ناقصات العقل بۆ بەرز ڕاگرتنی ئافرەتە و زاڵ بونێتی بەسەر پیاودا نەك بە پێچەوانەوە کە دژە دینەکان

**وە پرسیاری بێ وەڵامان ئەمەیە:** بۆچی کافرانی قورەیش و منافقەکان ئەم هەلەیان نە قۆستەوە و دژایەتیی ئاینی ئیسلامی پێ بکەن و بڵێن : ئەوە شوێنی چی کەوتون ژن و کچەکانتان هەر هەموویان ناقص العقلن و کەر و بێ ئەقڵ و نەفامن و هەموویان لە جەهەنەمدان لە کاتێکدا خەڵکی موسوڵمان هەوڵ دەدات بۆ بەهەشت و دور بێت لە دۆزەخ . وە ئەو حەدیسە باشترین

بەهانەیە بۆ ئەوەی خەڵکی پێ دورخەنەوە لە ئاینی ئیسلام و بڵێن هەوڵی چی دەدەن ئێوە زۆرینەتان دەچێتە جهنمەوە هێندە بێ ئەقڵ و ناقص العقلن شوێن چی کەوتوون کێ زیاتر سوود مەند دەبوو لەوەی ڕەخنە بگرێت لە ئیسلام کافرێکی قورەیشی کە دەیەوێت ئاینێك پوچەڵ بکاتەوە تازەیە . یان دژە دینێکی نە خوێندەوار پاش ١٤٠٠ ساڵ دەیەوێت پوچەڵی بکاتەوە . کاریگەریی کامیان زیاترە کافری قورەیشی یان کافری جاهل لە ساڵی ٢٠١٥ دا ؟

**کۆتا پرسیاری بێ وەڵامیشم ئەمەیە** : ئافرەت لە ئیسلامدا ناقص العقل نییە بەڵکو تۆ ناقص العقلیت و ڕوداوەکان بە ئارەزووی خۆت هەڵ دەسەنگێنیت لە زەمانی کۆمپیوتەردا کۆپی و پەیست دەکەیت بەبێ ئەوەی شارەزا بیت لە مێژوو وە لە زمانی عەرەبی . چونکە ئەگەر بەم تێگەیشتنەی جەنابت بێت دەبوایە ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش ئاینی ئیسلام نەمایە چونکە ئافرەتی بە دۆزەخی و بێ ئەقڵی داوە لەقەڵەم و ئەو دوو بەهانەیەش بەس بو بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئاینی ئیسلام و بنە بڕ کردنی .

------

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :حەفتا و سێ

## کێ شەیتانی گومرا کرد ؟

سورة الأحقاف

وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا ۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّـهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّـهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ ۚ أُولَـٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾

پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە اسلامەکان

سورة الجن

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّـهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّـهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّـهُ أَحَدًا ﴿٧﴾

پرسیارێکی تری دژە ئیسلامەکان وەك لە وێنەکەدا دەی بینن وە ئەوان ئەم پرسیارانە دەوروژێنن : شەیتان یەکێك بووە لە فریشتەکان و حسابی فریشتەی بۆ کراوە بۆ لەناو هەموویاندا شەیتان قسەی خوای ڕەت کردەوە؟ ئایا کێ گومڕای کرد ؟ چۆن ئێمە شەیتان هەڵەی پێ کردین ئەی شەیتان خۆی کێ هەڵەی پێ کردوو ئەو تەکەبوریەی هەست پێکرد لە خۆیدا ؟

بۆچی لەناو ئەو هەموو فریشتەیەدا بەم ئەم سەرپێچی کرد بۆچی فریشتەکانی تروەسوەسە نەچووە ناو مێشکیان؟خوا دەڵێت کاتێک مەلایکەتەکانمان کۆکردەوە کە سوجدە بەرن بۆ ئادەم بەس ئیبلیس سەرپێچی کرد ئەمە مانای چیە؟ ئایە تاوانی ئیبلیس بۆ کڕنوش نەبردنی بۆ ئادەم هێندە گەورە بوو کە ئەو هەموو چاکەی بسڕێتەوە کە بستێک ئەرز نەماوە عیبادەت و شوکرانەی خوای تیا نەکردبێت؟

ئەگەر دیقەتی پرسیارەکانیان بدەن لە دوو تەوەردایە .

**یەکەمیان**: باسی ئەوە دەکات ئایا لە لوحی محفوظدا نوسراوە شەیتان وا بکات ؟ وە خوداش ئەم کارەی پێ کرد چونکە لوحی المحفوظدا نوسراوە .

**دووەمیان** : کاتێك ئێمە سەرپێچی دەکەین دەڵێین شەیتان پێی کردین ئەی شەیتان کێ پێی کرد ؟ خۆ ئەو خۆی شەیتانە کەواتە بە هەموو جۆرێك دەیانەوێت تاوانەکە بەرنەوە بۆ لای خودا و خودا ئەو کارەی بە ابلیس کردووە ئەمەیە ئەسڵی پرسیئارەکە لای ئەوان

پێش هەموو شتێك دەبێت بزانین ابلیس جنە و مەلایکەت نییە . بە گوێرەی ئایتی ٥٠ ی سورەتی **الکهف** ( **الا ابلیس کان من الجن** ) بەڵام بەرز بۆتەوە بۆ پلەی مەلایکەت وە جیاوازیی نێوان جن و فریشتە ئەوەیە فریشتە سەرپێچی ناکات سەیری ئایەتی ٦ ی سورەتی **التحریم** بکە . ئەو فەرمانانەی پێی دەکرێت جێ بە جێی دەکات . کەواتە جن سەرپێچی دەکات وە مخلوقێکن خۆیان ئازادن چی دەکەن وەك مرۆڤ وان دەتوانن فەرمانی خودا جێ بە جێ بکەن وە دەتوانن پشت گوێێ بخەن یان ئەو کارە نەکەن . ئێستا با بزانین کێ ئەو کارەی بە ابلیس کرد ؟کاتێك کێشەیەك دروست دەبێت پاش لێکۆڵینەوە و بە گوێرەی بەڵگەکان دەزانرێت کێ کارەکەی کردووە بەڵگەکانی ئێمەش ئایەتەکانی قورئانە . کاتێك ئیبلیس سوجدەی نەبرد !! ئایا خودا گوتی باشە منیش ئەوەم دەویست و بە دوای بەهانەیەدا دەگەڕا یان لیکۆڵینەوەی کرد ؟لە سورەتی **الاعراف** ١٢ دا خودا فەرموی : بۆ سوجدەت نەبرد ؟ ابلیس گوتی من لە ئادەم باشترم من لە ئاگر خلق کراوم ئەو لە قوڕ ... لە سورەتی **الحجر** ٣٢ و ٣٣ دا بە هەمان شێوە پرسیاری لێ دەکرێت ابلیس دەڵێت : سوجدە نابەم بۆ مرۆڤێك لە قوڕی سورەکراوە دروست کرا بێت لە سورەتی **الاسراء** ٦١ دا بە هەمان شێوە پرسیاری لێ دەکرێت ؟ ابلیس دەڵێت چۆن کڕنوش بۆ شتێك دەبەم بە قوڕ دروست کرا بێت ؟؟ لە سورەتی ( **ص** ) ٧٤ بۆ ٧٦ پرسیاری لێ دەکرێت . ابلیس دەڵێت من لەو باشترم من لە ئاگر دروست کراوم ئادەم لە قوڕ . کەواتە لە ( ٥ ) شوێندا وەك بینیتان لێکۆڵینەوە لەگەڵ ابلیسدا کراوە . بۆچی ئەو کارە ی کردووە یان پاڵ نەری چی بووە و کێ ئەو کارەی پێ کردووە ؟

لە هەر ( ٥ )شوێنەکە دا ابلیس خۆی لەو بە باشتر زانیووە و خۆی بەر پرسیاریی کارەکەی خستوەتە ئەستۆی خۆی . وە لە دادگاشدا هەمیشە دادوەر دەپرسێت ئایا تۆ تاوان باریت ؟ وە بە گوێرەی وەڵامی تاوان بارەکە دادوەرەکە حوکم دەدات . وە ابلیسیش دوای هەموو پرسیارێك تاوانەکەی خۆیی گرتوەتە ئەستۆ و خۆیی بە تاوان بار داناوە ، واتا کارەکە خۆی کردوێتی . وە دەی توانی پەشیمان

بێتەوە یان سوجدە بەرێت و کارەکان لە دەست خۆیدا بوە و هیچ کاریگەرییەکی لەسەر نەبووە !؟ بەم شێوەیە گومانی پرسیاری کەیان پوچەڵ کرایەوە، کاتێکیش دەڵێن لە لوح المحفوظدا نوسراوە دەبێت شەیتان ئەو کارە بکات وە خوداش ئەو کارەی پێ کردووە . ئەو قسەیە راست نییە و خودای داد پەروەر لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردوە و لێی پرسیووە بۆ ئەو کارەی کردووە ؟ پاشان سزای داوە و دەری کردووە لە ڕەحمەتی خۆی .

ئێستا دێینە سەر بەشی دووەمی ئەم پرسیارە .

کێ وەسوەسەی خستە دڵی یان مێشکی ابلیسەوە ؟ کێشە لەوەدایە دژە دین تێ نەگەیشتووە لە ئاین و وا دەزانێت مرۆڤ لە دایك دەبێت هەتا دەمرێت کارەکا نی بۆ نوسراوە و دەبێت وەك ڕۆبۆتێك قورمیش کرا بێت وە خودا شەیتانی بۆ دروست کردووە بۆ ئەوەی لە خشتەی بەرێت ئەمیش وەك گەمژە رازییە بە قەدەری خودا و کابرای بێدینیش ئاقڵە و دەزانێت ئەمانە هەمووی شانۆگەرییە و پشتی کردۆتە ئەو خودایەی ئەم سیناریۆیەی داناوە وەك گوتمان ابلیس جنۆکەیە و لە ئاگر دروست کراوە و ئەوانیش وەك مرۆڤن و لێ پرسینەوەیان هەیە . و جنی باوەڕدار و بێ باوەڕ و باش و خراپیان هەیە . سەیری وێنەکە بکەن ئەو ئایەتانەی تێدایە دەربارەی جن و باوەڕ هێنانیان بە خودا و لێ پرسینەوەیان. کاتێك دژەدین دەڵێت کێ وەسوەسەی خستە دڵی شەیتانەوە ؟ دەڵێین کەس نەی خست و کاری خۆی بوو ...

جارێکی تر دەپرسنەوە ئەی کێ وەسوەسە دەخاتە دڵی مرۆڤەوە ؟ هەر دەڵێین کاری مرۆڤەکە خۆیەتی و هیچ پەیوەندیی نە بە شەیتانەکان و نە بە ئیبلیسەوە نییە !! ئەی بەڵگە چییە بۆ ئەم قسانە !!؟؟

بە یەك تەحەدا و شایەتییەك بابەتەکە کۆتایی پێ دەهێنم:

**یەکەمیان** : لە سورەتی **الاسراء** ٦١ بۆ ٦٥ دا هاتووە : کاتێك ئیبلیس سوجدە نابات و خودای باڵا دەست دەری دەکات لە ڕەحمەتی خۆی ، ئیبلیس داوا دەکات هەتا ئاخر زەمان بهێڵێتەوە و زۆرینەی عەبدەکانی خودا لە خشتە بەرێت . خودای باڵا دەستیش دەفەرموێت برۆ لە هەموو ڕێگاکانەوە بۆیان و چیت پێ دەکرێت بیکە وە توانات نییە بەسەر بەندەکانمدا هەر یەکێکیان پەنا بۆ خودا بەرێت تۆ ناتوانیت لە خشتە ی بەریت . کەواتە لێرەدا مرۆڤەکە خۆی دەور دەبینێت نەك وەسوەسەی شەیتانەکان ، شەیتان با هەر وەسوەسە بکات ناتوانێت هیچ مرۆڤێك لە خشتە بەرێت ئیمان دار بێت . وە شەیتانیش کەس لە خشتەی نە برد بوو ئەگەر ئیمانی بە خودای خۆی هەبوایە سەر پێچیی نە دەکرد . وە مرۆڤ و جن هەردوکیان بە دەست خۆیانە سەرپێچی بکەن یان نەی کەن !؟ وە دەتوانن سەیری ئەم لینکە بکەن بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی سەرپێچی ئایا بە دەست مرۆڤە یان خودا لە چارەی نوسیووە ؟

https://www.facebook.com/1553401181577496/photos/pb.1553401181577496.-2207520000.1436072349./1585039178413696/?type=3&theater

.................................................................

**بابەتی ناو لینکەکە**

تاوانی مرۆڤ چییە کە خودا هەمو شتێکی لە چارە نوسی بێت

بەڕێزم 1 جار بیر بکەرەوە خودای زانا تۆی خلق کردوە و ئازادیی داویتێ وە بیر و هۆشی داویتێ خۆت دەتوانیت ژیانی خۆت بەڕێوە بەریت تۆش ئەو ئازادییە بقۆزەرەوە پێش ئەوەی کار لە کار بترازێ وە ژیان بەجێ بهێڵیت و ئەو کات هیچ شتێك دادت نادات غەیری کارەکانت ئەبێت چۆن لە ژیاندا من و تۆ و گشت خەڵکی بە گوێرەی کارەکانمان مامەڵەمان لەگەڵ دەکرێت و دەناسرێین . لای خوداش هەمان شێوەیە بۆچی لە ژیاندا خۆمان دەپارێزین و دەمانەوێت کەسێکی ڕاست و دروست بین لە هەموو جێگایەك و نامانەوێت سزا بدرێین ؟؟ بۆچی کار بۆ دوای مردنیشمان نەکەین خۆ ئەوەی ئێمە دەمانەوێت ڕاست و دروستییە لە ژیاندا . وە ئەوەی نییە و کەمە لە ژیانماندا بیر و باوەڕەکەیە با هەوڵ بۆ ئەوەشیان بدەین

لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ﴿البقرة: ٢٨٦﴾

2. وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿التوبة: ١٠٥﴾

. إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿الإنسان: ٣﴾

وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿الكهف: ٢٩﴾

1. الْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿غافر: ١٧﴾

2. الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿النحل: ٣٢﴾



پرسیارێك هەیە خەڵکی دەی کات دەڵێن ئەگەرئێمە لە لوحی محفوظدا و لە سکی دایکماندا بین و هەموو شتێك لە چارەمان نوسرا بێت کەواتە تاوانی ئێمە چییە سەرپێچی دەکەین ؟ وە تاوانمان چییە خودا لە دوا ڕۆژدا سزامان دەدات ؟ خۆ ئەو کردارانە بۆمان نوسراوە دەبێت توشمان بێت چونکە الله بۆی نوسیوین پێشەکی دەڵێین : کاتێك مرۆڤ لە خەو هەڵ دەستێت و دەچێتە دەرەوە لە کاری ڕۆأێکیدا ئەو کارانەی دەیکات ئایا بە بە دەست خۆیەتی و بە ئارەزوی خۆیەتی یان بە ئارەزوی خودایە ؟ بۆ نموونە سەیارە یان خانوو یان هەرشتێکی ترکە دەی کرێت . کێ ڕەنگ و جۆر و برەکەی بۆ دیاری دەکات ؟ تەنانەت کاتیك کیلۆیەك میوە دەکرێت ئایا خۆی هەڵی دەبژێرێت یان خاوەن دوکانەکە ؟ کاتێك تورە دەبێت یان کارێکی باش یان خراپ دەکات کێ پێی دەکات ئایا خودا فریشتەیەك دەنێرێت ئەو کارانەی پێ بکات یان خۆی دەیان کات ؟ من وەلامی ئەو پرسیارانە نادەمەوە خۆتان وەلام بدەنەوە لە بەرامبەریشدا زۆر شت لە ژیاندا بە دەست خۆمان نییە : کەی و لە کوێ لە دایك دەبین و دەمرین وە کەی و چۆن نەخۆش دەبین یان کاتێك تۆ لەسەرجادە دەڕۆیت سەیارەیەك دێت لەو هەمو خەڵکەدا بەس لە تۆ دەدات و لە کابرای تەنیشتت نادات وە زۆر ڕوداوی تر بە دەست خۆمان نییە. لێرەدا بە جوانی لە ( قضاء و قدر ) کە کوردی خۆمان پێی دەڵێت قەزا و قەدەرتێ دەگەین . قضی

واتا بڕیاری داوە یان بڕیار دراوە . وە ووشەی قازیش کە پێی دەڵێین دادوەر هەمان شێوەیە کاتێك قازی یان دادوەر بڕیاری کۆتایی دەر دەکات ئیتر کابرا سزای خۆی وەر دەگرێت وە ( قدر ) کە کوردی خۆمان بە هەڵە بە چارەنوس ڕاڤەی دەکات واتە کاتەکەی دیاری کراوە . کەواتە قەزا و قەدەر واتا ئەو ڕوداوە یان ئەو کارە ساتە پێش وەخت دانراوە بەلام لەو کاتەدا ڕوو دەدات . ئەمە دەمان باتەوە بۆ سەرەتای بابەتەکەمان کە خودا لەمەو پێش ڕوداوەکانی دیاری کردووە و نوسیوێتی و دەزانێت چی ڕوو دەدات بەلام کاتی ڕوداوەکان ئەو کاتە دێت کە لێمان ڕو دەدات.

**ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ پرسیاری یەکەم کە وەلامم نەدایەوە** : ئایا کار و باری ڕۆژانەمان کێ دەی کات وە هەڵ بژاردنی کارەکانمان وەك کڕین و فرۆشتن و هەمو لایەنەکانی تری ژیان بە دەست خەڵکییە یان خودا بەزۆر پێمان دەکات یان ئێمە بە دەست خۆمان و هەڵ بژاردنی خۆمانە ؟ وە ئایا خەڵکی چوار دەورمان وەك خێزانەکەمان و دراوسێ و دراوسێ دوکانمان و یان هاوڕێیانمان لە کار و ئەوانەی دەیان ناسین . ئێمە چۆن هەڵ دەسەنگێنن ؟ طبعا بەو کار و کردارانەی ڕۆژانە دەیکەین لەگەڵیاندا و کەسێك بە دز و ئەوی تر بە پیاو کوژ و ئەوی تر بە ساختەچی و ئەوی تر بە سەر ڕاست و ئەوی تر بە کوڕی باش و ... هتد دەناسرێن

بۆچی ؟ چونکە کارەکانیان وەسفە و ناسینە بۆ کەسایەتیەکانیان و کارەکانیش بە دەست خۆیانە . هەموو کەس دەتوانێت باش یان خراپ بێت . بۆیە دەبینین کاتێك دوو کەس شەڕ دەکەن یان عاجز دەبن پاش شەڕە کە دەبن بە خۆشەویست ترین دوو کەس چونکە هەر یەکەیان هەوڵ دەدات هێندە باش بێت بەرامبەرەکەی وا هەست کات خەتای ئەو بووە شەڕ و عاجزیان بووە وە خەڵکانێکی باشمان بینیوە خراپ بون خەڵکانێکی خراپیشمان بینیوە خراپ بوون . کەواتە هەڵس و کەوتی ڕۆژانەی مرۆڤ بەدەست خۆیەتی . وە خودای زاناش هیچ شتێکی پێ ناکات و هیچ شتێکیشی لێ داوا ناکات و بەسەریدا نا سەپێنێت کە خۆی نەی کات بەڵگەشمان ئایەتی ٢٨٦ ی سورەتی **البقرەیە** دەفەرموێت : خودا هیچ شتێك بە هیچ کەسێك ناکات و ناڵێت کە لە توانایدا نە بێت ئەو شتە باشانەی دەیکات دەست کەوتی خۆیەتی و خراپەکانیشی لەسەر حساب دەکرێت کەواتە خوای گەورە لە ژیانتدا بە گوێرەی کاری ڕۆژانەی خۆت حساب و کیتابت لەگەڵ دەکات . وە هەروەها چوار دەوریشت بە هەمان شێوە بە گوێرەی کارەکانت دەت ناسن هەروەها لە سورەتی **التوبة** ١٠٥ دا دەفەرموێت : پێیان بڵێ کار بکەن خودا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) و ئیمان دارەکان کارەکانتان دەبینن . پاشان دەمرن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا و پێتان دەڵێت چیتان کردووە !؟ کەواتە خودای داد پەروەر لەسەر کارەکانتان محاسەبەتان دەکات کە کردوتانە لە دنیادا خەڵکیش دەتان بینن ئێوە چی دەکەن ؟ ئادەی پێم بڵێن ئایا لە دنیاشدا بە هەمان شێوە چوار دەورەکەت بە گوێرەی کارە کانت مامەڵەت لەگەڵ ناکەن ؟ کەواتە خودا بۆی نە نوسیوبت تۆ خراپ بیت یان بێدین یان هەر شتێك بیت بەڵکو بە گوێرەی کارەکانت ڕۆژی دوایی حسابت لەگەڵ دەکات

هەروەها لە سورەتی **الانسان** ٣ دا دەفەرموێت : ئێمە ڕێنماییمان کردووە بەوەی پێغەمبەران و کتێبمان بۆ ناردوون . وە کابرا خۆی یان کفر دەکات یان سوپاس گوزار دەبێت . ئەوەیان بە دەست کەسەکەیە کام ڕێگەیەیان هەڵ دەبژێرێت وە خودا ڕێنماییەکانی

ناردووە هەروەها لە سورەتی **الكهف** ٢٩ دا دەفەرموێت ئێوە حەق بڵێن لە لای خوداوە هەرکەس بیەوێت باوەڕ دەهێنێت و هەر کەس بیەوێت کفر دەکات باوەڕ نا هێنێت وە باوەڕ هێنان و کفر کردن بە دست مرۆڤەکە خۆیەتی . ئایاتی تر زۆرن بەلام ئەمەندە بەسە بۆ ئەوەی تێ بگەن خوداش لە قورئاندا لەسەرکاری ڕۆژانەتان حسابتان لەگەڵ دەکات . با ئێستا بزانین لە ڕۆژی دوایدا پێوەر چییە ؟

لە سورەتی **غافر** ١٧ دا باسی ڕۆژی حساب دەکات و پێوەری ئەو ڕۆژە کارەکانی خۆمانە کە کردومانە و دەفەرموێت : ئەمڕۆ هەر کەس بە گوێرەی ئەو کارانەی کردوێتی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت وە ئەمڕۆ زوڵم لە کەس ناکرێت . منیش دەڵێم ئەی ئەگەر خودا هەمو شتێکی لە جارە نوسی بێتین بۆچی بە گوێرە ی کارەکانمان حسابمان لەگەڵ دەکرێت ؟ ئەی ئەگەر بە تێگەیشتنی دژە دین بێت خودا دەفەرموێت ( **لا ظلم اليوم** ) کابرای نە خوێندەواری کافری قورەیشی زۆر لەم کافرە خوێندەوارانەی سەردەمی عەولەمە زیرەك تر بووە لە ئایەتەکان و قضاء و قدر تێگەیشتووە . چونکە کابرای کافری پێش ١٤٠٠ ساڵ لەمەوپێش دەیتوانی هەموو قورئان پوچەڵ بکاتەوە بەوەی دەی گوت ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) بۆچی خوداکەت دەڵێت ( **لا ظلم اليوم** ) کەچی زوڵمان لێ دەکات لە کاتێکدا لە چارەمان نوسراوە کافر بین . ئەی کوا داد پەروەریی خوداکەت ؟ هەروەها لە سورەتی **النحل** ٣٢ دا دەفەرموێت : بچنە ناو بەهەشتەوە بۆ ئەو کارانەی کردوتانە . کەواتە خودای گەورە ئەو ئازادیە ڕەهایەی داوە بە تۆ کە داوای دەکەیت و ئازاد و سەربەستی کردوویت چی دەکەیت بەلام تۆ ناتەوێت وە خودا لە چارەی کەسی نە نوسیووە بەهەشتی بێت یا جهنمی بێت یان ڕۆژانە چی بکات بەڵکو خودای زانا دەزانێت تۆ چی دەکەیت و چۆن ژیان دەگوزەرێنیت هەتا دەمرێت وە دەزانێت تۆ کەسێکی باشیت یان خراپیت و بە چی شێوەیەك کار دەکەیت ؟ ئەوەی لە لوح المحفوظدا نوسراوە عیلم و زانینی خودای کە دەزانێت ئێمە بەرەو چی ئاقارێك دەڕۆین بە گوێرەی کارەکانمان نەك ئیجبارمان بکات بەوەی باشە و خراپە بکەین باشترین نمونەش ابو لهب ئایەتی لەسەر دابەزیوە کە دەچێتە دۆزەخەوە بەلام ابو لهب لەسەر کارەکانی هەر بەردەوام بوو پاش ١٠ ساڵ لە دابەزینی ئەو ئایەتە مرد و هەر ئیمانی نەهێنا . خۆ ئەگەر ابو لهب ئیمانی بهێنایە قورئان و ئاینی ئیسلام پوچەڵ دەبووەوە ، بەڵام کابرا کافرێکی سەر سەخت بووە و ئیمانی هەر نەهێنا خودا دەزانێت ئیمان ناهێنێت بەلام بۆی نە نوسیووە ئیمان نەهێنێت بەڵکو دەزانێت هەتا دەمرێت ئیمان ناهێنێت . هەروەها خودا بۆ ئێمەی نە نوسیووە کە کەسێکی باش بین یان خراپ بین . بەڵکو کاری ڕۆژانەی خۆمان ئەو باشی و خراپەیە دیاری دەکات لای خەڵکی و لای خوداش . وە لە ژیانیشدا لای خەڵکی لەسەر جۆری کارەکانت مامەڵەت لەگەڵ دەکرێت ئەگەر مرۆڤ هێندە ژیر و دادپەروەر بێت و بە گوێرەی کارەکانمان مامەڵەمان لەگەڵدا بکات بۆچی خودای خالق لەوان ژیرتر و دادپەروەر تر نەبێت و بە گوێرەی کارەکانمان مامەڵەمان لەگەڵ نەکات و لە چارەمان بنوسێت کەسێکی خراپ یان دۆزەخی بین. وە چی لۆژیکێك لە من و ملیارەها خەڵکی تردایە هێندە گەمژە بین شوێن خودایەك بکەوین لە چارەمانی نوسی بێت ئێمە وەك ڕۆبۆت بژین و خودا بۆی نوسیوین و دەبێت ڕازی بین بەوەی بۆمان نوسراوە ؟ بەڵام تۆ لەگەڵ ئاینی هیندۆسیدا لێت تیك چووە .

چونکه ئەوان باوەڕیان بەوەیە ئەو مرۆڤە خودا لە چارە ی نوسیوە بەو شێوەیە بژی و دەبێت منداڵەکانیشی بەو شێوەیە بژین بەڕێزم یە ك جار بیر بکەرەوە خودای زانا تۆی خلق کردوە و ئازادیی داویتێ وە بیر و هۆشی داویتێ خۆت دەتوانیت ژیانی خۆت بەڕێوە بەریت تۆش ئەو ئازادییە بقۆزەرەوە پێش ئەوەی کار لە کار بترازێ وە ژیان بەجێ بهێڵیت و ئەو کات هیچ شتێك دادت نادات غەیری کارەکانت نەبێت چۆن لە ژیاندا من و تۆ و گشت خەڵکی بە گوێرەی کارەکانمان مامەڵەمان لەگەڵ دەکرێت و دەناسرێین . لای خوداش هەمان شێوەیە بۆچی لە ژیاندا خۆمان دەپارێزین و دەمانەوێت کەسێکی راست و دروست بین لە هەموو جێگایەك و نامانەوێت سزا بدرێین !؟ بۆچی کار بۆ دوای مردنیشمان نەکەین خۆ ئەوەی ئێمە دەمانەوێت راست و دروستییە لە ژیاندا . وە ئەوەی نییە و کەمە لە ژیانماندا بیر و باوەڕەکەیە با هەوڵ بۆ ئەوەشیان بدەین ئەگەر دەڵێیت ژیانی پاش مردن بونی نییە . هەمووومان دەمرین و ئەو ژیانەش دەبینین

.....................................................................................................................

**دووەمیان** : شایەتیی ابلیس خۆیەتی لە ئایەتی ٤٠ ی سورەتی **الحجر** و ئایەتی ٨٣ ی سورەتی ( **ص** ) دا کاتێك ابلیس داوای مانەوە دەکات هەتا ئاخر زەمان و خودای باڵا دەستیش ڕێگای پێ دەدات وەك لە خاڵی یوکەمدا باسمان کرد . ابلیسیش دەڵێت خەڵکانێکی زۆر گومڕا دەکەم ( بێجگە لە عەبدە دڵسۆزە کانت )

ئەمە گەورەترین و جوانترین شایەتییە بۆ دادپەروەریی خودا لە لایەن تاوانبارێکی وەك ابلیسەوە و خۆی دان بە تاوانەکەی خۆیدا دەنێت و ئەگەر ئیبلیس خۆی دڵسۆز بوایە و سەرپێچی نەکردایە خودا لە ڕەحمەتی خۆی دەری نەدەکرد ئیبلیس خۆشی ئەو راستییە دەزانێت بۆیە ناتوانێت هیچ عەبدێکی دڵسۆزی خودا لە خشتە بەرێت کە سەر پێچیی فەرمانەکانی خودا نەکات !؟ وە جنیش و مرۆڤیش بە رادەی گوێ گرتنیان بۆ فەرمانەکانی خودا دەچنە ڕەحمەتی خوداوە و لە ڕەحمەتیشی دەردەچن وە پەیوەندیی نییە بە وەسوەسەوە بەڵکو پەیوەندی بە سەرپێچی یەوەیە و ابلیس سەر پێچیی کرد نەك کەسێك وەسوەسە بخاتە دڵیەوە . هەموو مرۆڤێکیش ئەگەر سەر پێچی بکات لە خودا یان دەسەڵاتی دنیا و سەر زەوی و دەوڵەت پێویستی بە وەسوەسە نیە بەڵکو ڕادەی دڵسۆزیەکەی بۆ خودا یان بۆ دەوڵەت و خاك و نیشتیمانەکەی یان بۆ هەر کارێکی تر دەور دەبینێت وە ئەگەر کەسەکە دڵسۆز بێت هەمو دنیا وەسوەسەی بۆ بکات دەست لە یەك ڕکات نوێژی هەڵ ناگرێت یان ناتوانن لە شوێنی کارەکەی خیانەتی پێ بکەن ئەگەر دڵسۆز بێت بۆ خاك و نیشتیمانەکەی

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە**

ئایا کاتێك کەسێك خیانەت دەکات لە هەر شتێك بێت ئایا بەزۆر پێی دەکەن یان بە ڕەزامەندیی کەسەکەیە ؟ ئەگەر کەسەکە دڵسۆز و مەبدەئی بێت هەمو دنیا ناتوانێت کارێکی پێ بکات . بەلام بە پێچەوانەوە بێت دەتوانن هە موو کارێکی پێ بکەن ئایا ئیبلیسیش لە لایەن خوداوە ئیجبار کرا سەرپێچی بکات ؟ ئەگەر دەڵێن : بەڵێ. بەڵگەتان چییە ؟ ئەگەر ئیجباریش نەکراوە کەواتە

بـــــــە ئیـــــــرادە و تێگەیشـــــــتن و ئـــــــەقڵی خـــــــۆی ئـــــــەو کـــــــارەی کـــــــردووە .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :حەفتا و چوار

## خالدی کوری ولید چۆن کوردوستانی داگیر کرد ؟




دژە ئیسلامەکان دەڵێن خالیدی کوڕی وەلید و سوپاکەی کوردوستانیان داگیرکرد و خەڵکێکی زۆریان کوشت و ژنی کوردیان بە کەنیزە گرت . منیش لەم نوسینەدا بە بەڵگەوە پێیان دەڵێم خالیدی کوڕی وەلید لە کوێ و کەی و لەگەڵ کێدا شەڕی کرد ؟ ئادەی کوا جەماعەتی دژە ئیسلامی کۆپی و پەیست با پێم بڵێن ئەم ناوچانەی خالید شەڕی لێ کردووە دەکەوێتە کوێی کوردوستان و ئەم سەرکردانە سەر بە چی هۆزێکی کوردی بوون ؟لە محرمی ساڵی ١٢ ی هیجریدا لە کاظمة شەڕی ذات السلاسل ڕوی دا . کاظمة لە کوێی کوردوستانە ؟ پاشان قەڵای الأُبلّة یان فتح کرد . ئەم قەڵایە لە کوێیە ؟ پاشان بەرەو ڕۆژهەلاتی دیجلە ڕۆشتن و لە المزار شەریان لەگەڵ قارن رد کە سوپایەکی لە مدائینەوە هێنا بوو . المذار و مدائن لە کوێن ؟ قارن سەر بە کام هۆزی کورد بوو ؟ پاشان سوپایەك لە ئێرانەوە بە سەرکردایەتی بهمن هات و سوپایەك لە ناوەڕاستی عیراقەوە بە سەرکردا یەتی ئەندەرزەغەر ڕویان کردە ( ولجة ) خالد مزاری جێهێشت و ڕوی کردە ولجة و بەسەر اندرزغر دا سەرکەوت . پێم بڵێن اندرزغر کوڕی کێ بوو ولجة

لە کوێی کوردوستان بوو ؟پاشان سوپای فارس و سوپای عەربە مەسیحیەکان کە ژمارەیاان ١٠٠ هەزارکەس دەبوو ڕویان کردە أُلَّیس . وە لەوێدا هێندە خەڵکی کوژرا جۆگەیەکی لێ بوو ناو نرا جۆگەی خوێن . ئادەی پێم بڵێن أُلَّیس و جۆگەی خوێن لە کوێی کوردوستانە ؟ پاشان بەرەو شاری أَمْغِیشیا ڕۆشتن و بەبێ شەڕ گرتیان . شاری امغیشیا لە کوێی کوردوستانە ؟ پاشان خالد ڕۆشت بەرەو ( حیرة ) آزَاذِبە سەرکردەی فارس کوڕەکەی نارد بۆ ( مقر ) بۆ ئەوەی ڕێگری لە سوپای ئیسلام بکات بەڵام موسوڵمانەکان لەو شەڕەشدا سەرکەوتن و حیرەیان گرت . پێم بڵێن حیرة و مقر لە کوێی کوردوستانن و ئازاذیبە کوڕی چی هۆزێکی کورد بوو ؟پاش **سێ** مانگ خالد بەرەو دومة الجندل ڕۆشت وە انباری فتح کرد پاشان توشی سوپایەکی یەك گرتوی عربی و فارس بوو بە سەرکردەی عوقەی کوڕی عوقە لە عین التمر لەو شەڕەشدا سەرکەوت لە ناوچە ی الرمالیة و عین التمری گرت ئینجا بەرەو دومة الجندل ڕۆشت و ماوەی نێوان حیرە و دومة الجندل (٥٠٠) کیلۆمەترە . پاش ئەوەی دومة الجندلی فتح کرد خالد عین التمر مایەوە و فارسەکان زانییان خالد لە حیرە نەماوە هاتنەوە چەند ناوچەیەکیان گرت . جارێکی تر سوپای موسوڵمانەکان بە سەرکردایەتیی قعقاع لە حصید فارسیان شکان و فارسەکانیش لە خنافس هەڵهاتن کە نزیك بوو لە حصید،پاشان سوپای ئیسلامی بەرەو المُصَیّخ ڕۆشتن و ئەوێشیان فتح کرد لە شعبانی ساڵی (١٢) دا و هاتن بەرەو باشور وە الثني والزُّمَیْل یان فتح کرد کە سوپای فارس و عەرەب و مەسیحیەکانی لێ بوو . پاشان هاتن بەرەو زەویی ( الرباط ) کە سنوری ڕۆم بوو ئەو ناوچەیە بەدەست فارسەوە نە بوو . ٨٠٠ کیلۆ مەتر لە حیرەوە دور بو ئەوە کۆتا خاڵی عیراقی ئەوسا بوو بە دەست ڕۆمەوە بوو ڕۆمەکان هەڵ هات بوون و رباطیان بە بێ شەڕ فتح کرد سوپای ئیسلامی لە رباط مایەوە . سوپای فارس و ڕۆم و عەرەبە مەسیحییەکان کۆ بونەوە لە سوپاکەی خالد بدەن لە موقعة الفراض وە ئەو شەڕە بە شەڕی فراض ناسراوە و موسوڵمانەکان بەسەر هەر **سێ** سوپاکەدا سەرکەوتن . پاشان خالد چوو بۆ حەج لە مانگی ذو الحجەدا و کەس لە سوپاکەشی نەی زانی کە چووە بۆ حەج و تەنانەت پرسی بە ابو بکری صدیقیش نە کرد بوو !! ؟ .

پاش ئەوەی گەڕایەوە فەرمان دەرکرا خالد بچێت بۆ شام و ڕوو بە ڕوی سوپای ڕۆم ببێتەوە . کەواتە هەر مێژوو نوسێك بڵێت خالدی کوڕی وەلید هاتوەتە کوردوستانەوە ڕاست نیە ؟ چونکە شەڕەکان ناسراون لە مێژوودا و هەر هەمووی لە کەناری دیجلە بووە نەك فورات ! وە لە ساڵی ١٣ ی هیجریەوە خالد چوو بۆ شام ئەگەر دەڵێن خالد هاتۆتە کوردوستانەوە بڵێن ساڵی چەند هاتوەتە کوردوستانەوە ؟

ئەوەی گرنگە لەم فتوحاتانەدا یەکەم جارە لە مێژوودا سوپایەك بتوانێت ئیمپراتۆریەتی فارس بشکێنێت و زیرەکیی پلانەکە لەوەدا بوو کە لە باشورەوە هێرشیان بۆ فارس بردووە نەك لە باکورەوە !؟ وەهەموو شەڕ و هێرشەکان بۆ سەر وڵاتی فارس لە مێژودا لە باکورەوە بووە چونکە ئاسان تر بووە و باشوری عراق هەموی زەلکاو زۆنگاو هۆڕ بووە . فارس تصوری نە کردوە لەوێوە هێرشی بۆ بکرێت وە دانایی ئەو پلانەش هی ابو بکری صدیق بووە . بۆیە ئەو پلانە هەموو ئەو قسانە بە درۆ دەخاتەوە کە دەڵێت سوپای ئیسلامی بە سەرکردایەتیی خالیدی کوڕی وەلید هاتۆتە کوردوستانەوە .

**پرسیاری بێ وەڵاممان ئەمانەیە** : ئادەی کاکی کۆپی و پەیست پێم بڵێ ئەو ناوچانەی لە سەرەوە نوسراوە دەکەوێتە کوێی کوردوستان و کام سەرکردەی کورد سەرکردەی ئەو شەڕانەی کرد ؟ و دەوڵەتی کوردی لەو زەمانەدا کێ سەرۆکی بوو ؟

ئایا ساڵی ١٢ ی هیجری دەوڵەتی کوردی هەبوو یان کورد لەژێر دەسەڵاتی فارس و ڕۆمدا بوون ؟ وە ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە کوردیان دەچەوساندەوە و کورد پێی خۆش بوو لە چەوساندنەوە ڕزگاری بوو وە ئازاد بوو بە هاتنە ناو ئیسلامەوە. بەڵام کاکی خۆر پەرست و ئاگر پەرستی زەردەشتی مێژوو دەشێوێنێت چونکە شوێن کەوتەی مەجوسی ئاگر پەرستی فارسک و فارس نەمان و ئەوانیش ئاگر پەرستییان نەما .. بۆیە دژی ئیسلام و سوپای ئیسلامن شین بۆ ئیمپراتۆریەتی فارسی مەجوسی دەکەن . بەڕێزان ئەوانە هەموو شەڕەکانی خالیدی کوڕی وەلیدە لە عیراق و ناوی شەڕەکانیشمان بۆ داناون خۆتان دەتوانن لە گوگڵ بگەڕێن و دڵنیا بن لە شەڕەکان لەگەڵ فارس و ڕۆمدا کراون و کوردی داماو هیچ دەسەڵاتێکی نە بووە و ژێر دەستەی فارس و ڕۆم بوون و هیچ سوپایەکیان نەبووە و هیچ دەوڵەتێکیشیان نەبووە و فتوحاتی ئیسلامی لە باشوری عیراقە وە دەستی پێ کردووە نەك لە باکور ،پاشان کە بەرەو باکور هاتو بەرەو شام ڕۆشتوون بە کەناری دیجلەدا نەك فورات . چونکە ئاوەدانی و شارەکانی نوسیومانە هەمووی لە کەناری دیجلە بوون نەك لە فورات و ئەو کاتە کوردوستان چۆڵەوانی بوە و شاری مەزنی لێ نەبووە !؟ ئایا دوای ئەم ڕون کردنەوەیە هیچ کەس دەتوانێت بڵێت ئیسلام بە سەرکردایەتیی **خالیدی کوری وەلید** هاتووە کوردوستانی بە زۆری شمشێر داگیر کردووە ؟ ئەگەر دەڵێن بەڵێ فەرموو بەڵگە بهێنن لە سەرچاوە ی باوەڕ پێکراوەوە . پێمان بڵێن شەڕەکە لە کوێ بوو ژمارەی سوپای کوردی چەند بوون سەر کردەی کوردەکان کێ بوو ؟ سەر بە کام دەوڵەت یان میر نشینی کوردی بوو ؟ چەند کەس تێیدا کوژرا ؟

**وێنەی پۆستەکە سنوری فارس و ڕۆمی تێدایە و سوپاکەی خالید لە کوێوە ڕۆشتوە و ناوی ئەو شارانەی سەرەوەی تێدایە . ئادەی کاکی کۆپی و پەیست پێم بڵێ کوردوستان لە کوێدایە ؟ ئەمنت لێ دیارە ؟**

ئاگاداریش بە سەرچاوەم بۆ دا نەنێت بڵێت ( الواقدي ) لە کتێبەکەیدا وا دەڵێت پێشەکی برۆ بزانە واقدی کێیە ؟ و ئایا سەرچاوەکانی باوەڕ پێکراوە یان بە درۆزن ناسراوە ؟ لەو شارەی کە تێیدایت زانکۆی تێدایە برۆ بۆ بەشی مێژوو لە مامۆستای زانکۆکەی بپرسە ئەگەر لێکۆڵینەوەیەك بکرێت و سەرچاوە کانی واقدی بێت ئایا ئەو لێکۆڵینەوەیە وەر دەگیرێت یان کابرای لێکۆڵەرەوە سفر وەر دەگرێت

**بـــــــــۆ ناســـــــــینی الواقــــــــــدي کلیکـــــــــــی ئـــــــــەم لینکـــــــــــە بکـــــــــــە؟**

http://bzavpress.com/Detail.aspx?id=11167&LinkID=19

..............................................................

**بابەتی ناو لینك**

**واقیدی مێژوونوس بووە**

واقیدی کێیە ..؟

واقیدی یەکێکە لە بازرگانەکانی شاری مەدینە .. ئەم پیاوە بە کەسێکی دانا و رۆشنبیرێکی گەورەی سەردەمی خۆی ناسراو بووە .. ئەم پیاوە ناوی ئەبوعەبودوڵلای محمدی کوڕی عومەرە ساڵی ١٣٠ ك٠ لەدایك بووە ٢٠٧ ك٠ کۆچی کردوە رەحمەتی خوای لێبێت.. لەسەردەمی ئەم پیاوەدا شتێك نەبووە ناوی مێژوونوس بێت، تەنانەت بە گەبەریش کە یەکەم مێژوونوس بووە نەوتراوە مێژوونوس لەساڵی ٢٢٤ك٠ لە دایك بووە ٣١٠ وەفاتی کردوە.. گەبەری

پێش گەبەری خەڵکانی تر هەبوون هەوڵیان داوە بەڵام نەیانتوانیوە سەردی مێژووی بەدی بهێنن و ناوی بنێن مێژوو (التاريخ)، بە هەموویان ووتراوە" القصاصين" واتا ئەو کەسانەی کە چیرۆك دەگێڕنەوە.. لەناو ئەهلی زانستو عولەمایاندا بەچاوێکی کەم تەماشای ئەم قصاصینە کراوە، تا کۆتایی سەدەی نۆیەمی کۆچی.. بە هەموو مێژوو نوسانی ئیسلام ووتراوە قصاصین ، تەنها ئەو مێژوونوسەی...ئەگەر قورئان و فەرموده و عەقیدەی لەبەر نەبوایە واتا وەك مەتن و وەك نوسینیش بەهیچ شێوەیەك مێژووی لێوەرنەدەگیرا، چونکە لە ناوئیسلامدا گێرانەوەی مێژوو بە "موعەن عەنیە" واتا بەرِشتیە ، ئەوکەسەی کە دەیگێڕێتەوە دەبێت خاوەن سەند بێت.

لە ساڵی ٨٨٠ك٠ کەسێك بەناوی ئیمامی "ساخاوی" بۆ ئەوەی ئیتر کەس گاڵتەو زەمی مێژوو نەکاتو بە چاوی سوك تەماشای نەکەن کتێبێکی نوسی بەناوی .. (الإعلان بالتوبيخ لمن ذمّ أهل التاريخ.)..

هیوام وایە ئەم پێشەکییە ئەوەندە بێت کە ئێوەی خوێنەر تێبگەیەنم کە مێژوو لەم سەدەنەی دوایدا گرنگی پێدراوە.. پێشتر لەناو ئیسلامدا مێژوو گرنگ نەبووە وەك گێرانەوەی سەری بێسەنەد، کە ئەمەش بۆ خۆی زانستێکە لە ئیسلامدا پێدەوترێت (عيلم الرجال) واتا زانستی پیاو ناسی کە تەنها ئیسلام خاوەنیەتی و داهێناوە، ئەگەر تەماشای مێژوەکانی ئیسلام بکەیت کە گرنگی پێدراو هەمووی بەسەندەوە قسەکان هاتووە لە گەبەریەوە تا جەلالدینی ئەسیوگی.. دوای ئەویش لە نوێکانی سەدەی ١١ و١٢ بەهەمانشیوەی رشتەو سەندە<

دەتانهێنمەوە بۆ لای واقیدی - رەحمەتی خوای لێبێت- ئەم پیاوە ١٠٠،٠٠٠درهەمی لەشاری مەدینە قەرز کرد بوو بۆ کڕینی گەنم .. بەهەحاڵ درێژەی نادەمێ و بەرشکست بوو ، هیچ پارەی نەماو قەرزارێکی زۆر بوو.. رایکرد بۆ شاری بەغداد لەوێ مایەوە دەستی کرد بە گێرانەوەی چیرۆك و فەرمودە ، قسەی ناو مەجلیس و خۆی نزیك کردوە لە بەرمەکیەکان کە وەزارەتی هارونە رەشیدیان بەدەست بوو ..

هاوڕێیەتی پەیدا کرد لەگەڵ "خالید کوڕی بەرمەك" لە شاری بەغداد وبووە خۆشەویستی چەند جار لە مەجلیسی هاروندا - رەحمەتی خوای لێبێت- دانیشت وچەند بەسەرهاتێکی گێرایەوە، هارون بانگکردو پێگووت سەندەی ئەم قسانە لە کێوە دەهێنیت ؟ -ئەویش ووتی خۆم دایدنم بۆ خۆشکردنی مەجلیسی ئێوەیە، بەڵام لەڕاستشدا خۆم بەوکارە دڵخۆش نیم ، ژیانی خۆی باسدەکات بۆ هارونە رەشید و - هارونیش دڵی بۆ دەسوتێو ڕێزی لێدەگرێت لەبەر ئەوە خەڵکی شاری مەدینەی پێغەمبەری خوادایەو - صلی الله علیه وسلم- هەموو پارەکانی بۆ ئەداتەوە دەزانێت کەسێکی باشە ماوەیەك دریکاتە قازی ناوچەیەك لە نزیك شاری بەغداد و دوای ئەوە وەفات دەکات..

بەرەمیەکان کە ئەوەدەمە لە شیعەی تالیبینیەکان و مەجوسەکانی ئێران نزیك دبنەوە دژی هارونەرەشید، دەست دەکەن بە نوسینی فەرمودەو گێڕانەوەی ریواتەی بەناوی ئەم واقیدیە فەقیرەوە.. ئەوکەسەی کە بەناوی واقیدی دەنوسێت ناوی .. ئیبراهیمی کوڕی محمدی کوڕی یەحیاییە!..

واقیدی بۆ خۆی پیاوێکی بەرێزی دینداری خاوەن زانست بووە ، بەڵام زاناو تایبەتمەند نەبووە لە بوارێکدا وەك زانایانی ئیسلامی بناسرێت..

جا هەرکتێبێك باسدەکەن بوونی نەماوە دەڵێن واقیدی نوسیویەتی.. بۆ زانیاری هەموو لایەك واقیدی تەنها یەك پەرتوکی ئێستا هەیە دەست دەکەوێت.. ئەویش باسی فتوحاتو شەرکردنە بەناوی "التاریخ و المغازی" .. باقی پەرتوکەکانی تری دەڵێن هەیبوو کەس نازانێت لە کوێیە.. واتا هەر قسەیە..

بەڵام ئێستا لە نوسەری عەرەب و کورد و فارسی عەلمانی رقن کە مێژوو دەنوسن یەکسەر دەڵێن واقیدی سەرچاوەمە، کوا سەندەکەی خۆشی نازانێت چۆن هاتووە، بەڵام ئیتر خۆش دێت بەدەستەوە..! لەڕاستیشدا هیچ بنەمایەکی زانستی نیە، تەنها قسەی گیرفانە.

زانایان چی دەڵێن لەبارەیەوە کۆڕایی زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعە .. ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، بەڵام دەڵێن قسەکانی هەمووی درۆیەو درۆزن بووە..،

بۆ دەڵێن درۆزن بووە..!؟

لەسەر بنەمای ئەو هەموو قسەیەی کە بەدەمیەوە هەڵبستراوە، ٣٠ هەزار فەرمودەی ڕیوایەت کردوە لە پێغەمبەروە هەمووی درۆ و چەواشەکاری بووە!.. جا بەدەم پێغەمبەروە صلى الله علیەی وسلم درۆ بکات داخۆ گێڕانەوەی مێژووەکەی چی بێت!.. لەو زانیانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، بوخاری ، موسلیم، ٦ فەرمودەوانە ڕاستەکە، ئیمامی زەهەبی، ئبن کەسیر، ئیبن حەجەری ئەسقەلانی..هتد..

بێجگە "ئیبنوماجە" کە ئەو ریوایەتی لێوەرگرتوە..

بەهەر حاڵ هەموو زانایانی فەرمودە لەسەر ئەوە کۆکن کە پیاوێکی درۆزنە... لە پەراوێز هەندێك نمونە دادەنێم لە قسەی زانایان*.. ئەی عەلمانی کورد چۆن ئەو هەموو مێژوونوسە هەیە تەنها واقیدی وەردەگرێت؟ .. وەرەن بە دەستە دزیەکەیان ئاشکرا بکەین!.. مولحیدەکان و عەلمانیە رقنەکان بە گشتی کە باسی فتوحاتی ئیسلامی دەکرێت پەنا دەبن بۆ کتێبێك، بەناوی "کوردستان و ئاینی ئیسلام" لە ساڵی ١٩٧٠ ز.لە بەغداد لە چاپدراوە.. نوسەرەکەی کەسێکە خەڵکی شاری کۆیە بەناوی (مەلا رەئوفی سەلیم حەوێزی) کە ئاشکرا بوو دوای ٢٥ ساڵ ئەو مەلا ڕەئوفە ئەم کتێبەی دزیوە کردویەتی بەناوی خۆیەوە، بە کتێبێك دەستنوس گوایە واقیدی نوسیویەتی بەناوی .. فتوح سواد العراق لە عەرەبیەوە وەرگێڕاوە بۆ فارسی، وەرگێرەکەی ناوی مەلا عەبدولعزیز واعیزی سەردەشتیە، کەلە ڕاستیە ئەمیش هەر خەڵکی کۆییە چۆتە سەردەشت دانیشتوە..

پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئەی دەست نوسە عەرەبیەکە لەکوێیە ..؟

گوایە ئەم مەلا عەبولعەزیز واعیزیە سەردەشتیە؛ هاتۆتە ناوچەی مەرگە چۆتە لای مەلا عەبدولصەمەدی مەرگەیی و لە کتێبخانەکەی ئەودا دەستی کووتوە وەریگێڕاوتە سەر زمانی فارسی و دوای ئەم مەلا رەئوف سەلیم حەوێزیە کردویەتی بەناوی خۆی ووتویەتی خۆمم نوسیوە لەکاتێکدا تەنها ناوی کتێبەکەی گۆڕیوە..

دوای لێکۆڵینەوە گەڕان دەرکەوت ئەم کتێبە مافی بەسەر واقیدیەوە نیە ، سێ کەس نوسیویەتی ناویان (مەلا سەعیدی سنەیی و حوزنی موکریانی و میجەرسۆن) حوزنی موکریانو میجەر سۆن تارادەیەك ناسراون .. مەلا سەعید ئەوەی پێبڵێن مەلای نەیکردوە

ماوەیەك بۆ فێڵ دەبێتە مەلاو لەسەرەتای سەدەی ٢٠دا دەچێتە سوید و دەبێتە دکتۆرو پاشان دەبێتە گاور و کچی قەشە شمعونی دەخوازیت و ناوی خۆی دەگۆڕێت بۆ میرزا سەعیدی سەنەیی.. ئینجا ئەو شیعرەی هورمزگانیش هەر ئەم نوسیویەتیو گوایە سەردەمی زەدەشتیەکان نوسراوە، ئەم سێ کەسە و ئەو دوو هاورێیەتر کە خەڵکی کۆیە بوون هەمویان پیاوی ئینگلیز بوون وبۆ دژایەتی ئیسلام نوسیویانە.. ئەوەی لەو کتێبەدا هەمووی قسەی بێمعناو درۆ دەلەسەیە.. هەندێك لە درۆکان من لێرەدا ئاشکرای دەکەم

..

لە کتێبی کوردو ئاینی ئیسلامدادەڵێت: ئەبوعوبێدەی جەراح هاتۆتە کوردستان بە جهاد شەهیدی بووە ئافرەتی کوردیان بە سەبیا بردوە!..

ئەبو عوبێدەی جەراح لە شام وەفاتی کردوە، بەنەخۆشی تاعون لەهەمان کتێبدا دەڵێت: خالیدی کوڕی وەلید هاتە کوردستان و ڕووباری خوین دروست کرد خالیدی کوڕی وەلید نەهاتۆتە کوردستان نەیدیوە بەچاو و لە شام وەفاتی کردوە لەسەر جێگا دەڵێت قەقعقا لە کوردستاندا جیهادی کوردوە لەوێ کوژراوە.. ئەویش لە شام بەدەردی خوای وەفاتی کردوە. ناوی هەندێك هاوەڵی هێناوە کە گوایە هاتونەتە کوردستان ، لەکاتێکدا زۆربەیان لە جەنگی بەدرو ئوحودا شەهید بوون ناوی هەندێك شاری بردوە کە هەمووی ٢٠٠ ساڵە دروست بووە،!.

بۆ نمونە شاری بانە ناوەکەی ناگاتە ٣٠٠ ساڵ..

یان شاری سابڵاخ باس دەکات کە هەمووی ١٠٠ ساڵە پێدویترێت سابڵاخ..

نای شاری واهێناوە بێجگە هەولێرو کەرکوك لەڕاستیدا ناوەکان تورکیەو عوسمانیەکان دروستیان کردوە.. بەهەر حاڵ ئەوە تەنها بۆ بەدۆرخستنەوەی بوو، ئەو کتێبە مافی بە سەر ڕاستی یەوە نیە.

..........................................................................................

ئاگادار بە ئەم قسە یەشمان بۆ دامەنێ ؟ **سرية سلمة بن قيس الاشجعي** - چونکە وەڵامی ئەوەشمان داوەتەوە **بجۆ سەیری وەڵامی پرسیاری ژمارە (٤٦) بکە لا پەرە (٩١)**

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :حەفتا وپێنج

## فتوحاتی ئیسلام چەند کوردی کوشت ؟




موسوڵمانی بەڕێز ئەم بابەتە زۆر گرنگە چونکە ڕۆژانە دژە ئیسلامەکان بە تایبەتی ئاگر پەرستەکان دەڵێن کورد بە زۆری شمشێر بووە بە موسوڵمان و سوپای ئیسلام کوردوستانی وێران کردوە و تاڵان کردووە . چەند بەڵگەیەکیش دا دەنێن و دەڵێن ئەوە سەرچاوە کانی خۆتان وا دەڵێن . بەو سەرچاوانە دەم کوتتان دەکەن بەلام ئێمە هاتوون خۆیان و سەرچاوەکانیانمان بۆ شیکار کردون و درۆ و دەلەسەکانیانمان بۆ دەر خستوون ئێمەش هەمان سەرچاوەکانی ئەوانمان داناوەتەوە لە خوارەوە بە لینکی سەرچاوە کانیشەوە بۆ ئەوەی نەگەڕێن بە دوایدا . وەك خۆی بۆتان ترجمە دەکەین چونکە زۆرتان عربی نازانن ! ئەوەی گرنگە پێشەکی بیزانین ئەمانەیەکە دەڵێن کوردوستان کابرا بە ئەقڵی ئێستا سەیری دەکات وادەزانێت حکومەتی هەرێم هەیە و ئەم هەموو سار و شارۆچکانەی ئێستا هەبووە ؟ بەلام دەبێت بزانین کوردوستان پێش ١٤٠٠ ساڵ چەند شار بووە و سنوری لە کوێ بووە و کێ حوکم ڕانیی کردووە ؟ ئەو کات دوو دەسەڵاتی زۆر مەزن هەبووە فارس و ڕۆم سنوری نێوان فارس و ڕۆم روباری دیجلە بووە . واتا لە موصلەوە بەرەو ئێران دەوڵەتی فارس بووە . و لە موصلەوە بەرەو سوریا دەسەڵاتی ڕۆم بووە . و ئەو کاتە کورد بە گوێرەی شوێنی جوگرافی یان ژێر دەستەی فارس بووە یان ڕۆم بووە.

لە **پرسیاری بێ وەلامی (٧٤) دا** ڕونمان کردەوە سوپای ئیسلامی بە کەناری دیجلەدا هاتووە . واتا بەرەو کوردوستان نەهاتووە . لەم بەشەدا باسی کوردوستان دەکەین وە ئەو شەڕەی زەردەشتییەکان و شوێن کەوتووانی فارسی ئاگر پەرست زۆر دەی وروژێنن شەڕی شارەزورە . **پرسیاری بێ وەلامی ئێمە** ئەمەیە پێش ١٤٠٠ ساڵ ناوچەی شارەزور چەند شاری کوردیی لێ بوو ؟ ژمارەی دانیشتوانیان چەند بوو کێ حوکم ڕانیی دەکرد سەرکردەی ئەو شەڕەی شارەزوری کوردەکان کێ بوو ؟ چەند کەس کوژرا ؟ ئایا کوردەکان بەرگریان

لە شارەکانی خۆیان دەکرد یان بە فەرمانی ئیمپراتۆری فارس شەڕیان کردووە ؟ وەك چۆن صدام حسێن جاش و مستشاری کوردی هەبوو شەڕیان بۆ دەکرد ؟ئەگەر کورد شەڕی بۆ خۆی کردوە ؟ ناوی ئەو شارانە بنوسن لە موصلەوە هەتا شارەزور یان لە پشتی شارەزورەوە هەتا هەمەدانیش تەرح بێت بۆتان . با ئێستا بچین بۆ سەرچاوەکانیان لە پێشدا بە شەڕی شارەزور دەست پێ دەکەین وە زۆر سەرچاوەتان بۆ دا دەنێن لەسەر شەڕی شارەزور لە طبري و ابن الاثير و ... هتد . بەلام هەر هەمووی یە ك چیرۆکە بۆیە دانەیەکتان بۆ ترجمە دەکەین و هەر کەس بڵێت وا نیە با بێت بۆمان ڕاست بکاتەوە و سەرچاوەکانی تریشمان لە خوارەوە بۆ داناون ئەگەر خۆتان بتانەوێ بە دوادا چوونی بۆ بکەن .

شەڕی شارەزور .... ابو رجائی حلوانی لە باوکیەوە بۆی گێڕامەوە کە ئەوانیش پیاوە پیرەکانی شارەزور بۆیان گێراوەتەوە دەڵێن : شارەزور و صامغان و دراباذ عتبەی کوڕی فرقد فتحی کردن . لەگەڵ خەڵکی صامغان و دراباذ صولحی کرد جزیە بدەن و لەگەڵ کورد شەڕی کرد لە شارەزور و زۆری لێ کوشتن . وە عتبة نامەیە کی بۆ عمری کوڕی خطاب نوسی دەڵێت من فتوحاتەکەم گەیشتوەتە ئازەربایجان . عومەریش موصل و چوار دەوریی دا بە هرثمە ی کوڕی عجرفە و کردی بە والی موصل . وە هەریەك لە صامغان و دراباذ و شارەزور ساڵانە تەنها ٢٠٠ درهەمیان دەدا بە ولایەتی موصل وەك خەراج . هەموو سەرچاوە مێژوی یەکان بەس ئەوەندە یان نوسیوە لەسەر شەڕی شارەزور بەلام کاتێك دەبینین کاکی کوردە بە ئارەزوو ی خۆی ترش و خوێ دەکات . با ئێستا شیکارییەکی بۆ بکەین ؟

صامغان و دراباذ کەوتونەتە هەرێمی خوراسانی ئەو کاتەوە کە دەکاتە لای همدان وە شارەزوریش لە پشت سلێمانییە . ئەم سوپایە لە موصلەوە چووە بۆ ئازربایجان و فتحی کردوە بەس لە شارەزور شەڕی کردووە ، شەڕەکەش زۆر گەورە نەبووە بە بەڵگەی ئەوەی باسی نەکراوە سەرکردەی کورد کێ بووە ؟ چەند کەسیان لێ کوژراوە و کێ کراوە بە والیی شارەزور ؟ دیارە ئەو ناوچەیە هیچ شارێکی لێ نەبووە و گوند نشین بوون لێرە و لەوێ . هیچ سوپایەکیش لە جهاندا هەڤی گوند نشینیان نە بووە !! هەروەها گەیشتونەتە ئازربایجان کە ڕوسیایە .... ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو ناوچانە تا ئازربایجان چۆڵەوانی بووە . پاشان ئەم سوپایە لە کاتێکدا ڕۆشتووە لە باکورەوە فارس تێك شکێندراوە لە شەڕی قادسیة دا و فارس هێزی کەمی ماوە لێرە و لەوێ و ئەم کوردانەی کۆ کردوەتەوە لە ناوچەکانی کوردوستان و شەڕی پێ کردون . ئێستا بگەڕێنەوە بۆ پرسیارە بێ وەلامەکانی سەرەوەمان دەزانن کورد شەڕی بۆ فارس کردوە نەك بەرگری لە شار و خەڵکی خۆی بکات چونکە هیچ شار و ئاوەدانیەك لە شارەزوردا بوونی نە بووە لەو زەمانەدا !؟

وە ئەو ناوچانە ئاوەدانیی لێ نەبووە چونکە سەرچاوەکان دەڵێن هەریەك لە صامغان و دراباذ و شارە زور ساڵانە یەکی ٢٠٠ درهەمیان داوە بە دەوڵەت وە ٢٠٠ درهەم خەراج بۆ ساڵێك هیچ نییە و زۆر کەمە . با ئێستا بزانین صامغان لە کوێیە ؟ بە گوێرەی کتێبی معجم ما استعجم من اسماء البلاد و المواضع دا دەڵێت هەموو جارێك ناوی شارەزور و دراباذ و صامغان پێکەوە دێت وە سەر بە

ناوچە شاخاویەکانە بەڵام بەشێك نییە لێی وە صامغان و ري لە خوراسان نزیکن . هەروەها دژە ئیسلامەکان دەڵێن طبریش لە کتێبی تاریخ **الرسل و الملوك** دا و ابن کثیر لە **البدایة و النهایەدا** باسی دەکات دەڵێت کورد کوژراوە لە فسا و دار ابجرد . ئەویش هەر ئەو کوردانە بوون کە لەگەڵ سوپای فارسدا بوون لە ناوچەی ئەهوازدا کوژراون وە ئەهواز و فسا هیچ کوردوستان نییە و ئەو کوردانەش کە کوژراون سەرباز بوون لە سوپای فارسدا و لە پێناو کوردوستاندا نەکوژراون بەڵێ ئازیزان هەر کەس دەڵێت فتوحاتی ئیسلامی کوردی کوشتووە درۆ دەکات چونکە کورد لەو زەمانە دا لە ژێر دەستی فارسی ئاگر پەرستدا بووە . کابرای کوردەی داماو یان سەرباز بووە یان بە زۆر و بە شەق بردویانە شەڕیان پێ کردووە یان سەرۆك هۆزەکەی جاشی فارس بووە و خەڵکی ناوچەکەی بۆ شەڕ بردووە ؟ بەڵگەشمان ئەوەیە لە سەرەوە باسمان کرد بە چاوی ئێستا سەیری ڕوداوەکان مەکە بەڵکو بە چاوی ١٤٠٠ ساڵ و بە نەخشە و جوگرافیا و دەسەڵاتی ئەو کات سەیر بکە و خوێندنەوەت بۆ ڕوداوە کان هەبێت و پێمان بڵێن کورد سوپای هەبووە ؟ بەرەنگاریی لە چی شارێك کردووە ؟ شەڕەکانی بۆ خۆی کردوە یان بۆ فارس بووە ؟وە لە ئێستاشدا ئەوانەی دژی ئیسلامن و مێژوو تێك دەدەن هەر پاشماوەی فارسی ئاگر پەرستەکانن و بە ناوی کورد و کوردایەتی و ئەسڵی کوردەوە داکۆکی لە باپیرانیان دەکەن کە فارسی ئاگر پەرستن و کوردایەتیمان پێ دەفرۆشن بەلام وەك بینیتان کورد شەڕی بۆ فارس کردوە . وە ئێستاش هەمان فارسی ئاگر پەرست داکۆکی لە فارس دەکاتەوە بە ناوی کوردایەتی و ئاگر پەرستنەوە . فەرموون ئەوەش هەموو ئەو سەرچاوانەیە کە پێتان دەفرۆشن بە ناوی مێژووەوە گوایا ئیسلام کوردی قەتڵ و عام کردووە خۆتان بیخوێننەوە. ئەو سەرچاوانە زۆر بە کورتی و بە یە ك ووشە باسی کوردیان کردووە . بەلام کاکی فارسی ئاگر پەرستی بەناو کورد لێتان دەکات بە مجلدێکی ١٠٠٠ لاپەڕەیی لینکەکانمان بۆ داناون هیوادارم ئێوەش چاو کراوە بن کاتێك بەڵگەتان بۆ دا دەنێن باش بیخوێننەوە و دوای وردە کاریەکان بکەون . بۆ ئەوەی بتوانن گومانی ئەو بەچکە فارسانە پوچەڵ بکەنەوە هەروەها ئێوەش وەلامتان پێ بێت و هەر بە سەرچاوەکانی خۆیان بە درۆیان بخەنەوە . ئیتر با بەس بێت کابرا بە ناوی کورد و کوردایەتییەوە داکۆکی لە فارس نەکات و ئاگر فرۆشیمان پێ بفرۆشێت

ابن الاثیر، الکامل في التاریخ. جـ ٢، ص. ٤١٧، ٤١٨: ذکر فتح شهرزور والصامغان
http://shamela.ws/browse.php/book-12221/page-322

النویري، نهایة الأرب في فنون الأدب. دار الکتب والوثائق القومیة، القاهرة. الطبعة الأولی، ١٤٢٣ هـ. جـ ١٩، ص. ٢٧٦
http://shamela.ws/browse.php/book-10283#page-6822

یاقوت، معجم البلدان. دار صادر، بیروت. الطبعة الثانیة، ١٩٩٥.جـ ٣، ص. ٣٧٥
http://shamela.ws/browse.php/book-23735#page-1449

الطبري، تاریخ الرسل والملوك. ج. ٤، ص. ١٧٨، ١٧٩: ذکر فتح فسا ودارابجرد
http://shamela.ws/browse.php/book-9783#page-2069

ابن کثیر، البدایة والنهایة. جـ ٧، ص. ١٤٦، ١٤٧، ١٤٨
http://arabic.tebyan.net/index.aspx?PageSize=1&PageIndex=144&LANGUAGE=2&BOOKID&٢٥١٧٤=PID=31143

ناوچەی صامغان لە کوێیە ؟
http://shamela.ws/browse.php/book-11802#page-709

## پرسیارە بێ وەلآمەكان ژمارە :حەفتا و شەش

## یەك شتی خراپی ئیسلامم پێ بڵێن ؟

دژە ئیسلام فێر بووە دەڵێن ئادەی یەك شتی جوانی ئیسلامم پێ بڵێن ؟ ئەم پرسیارە هەڵەیە چونكە جوانی بۆ منهج و پەیڕەو پرۆگرام بەکار نا هێنرێت ! بەڵکو باش و خراپی بۆ هەموو منهجێك بەکار دە هێنرێت وە لێرەدا پرسیارەکە دەگۆڕین و دەڵێین : ئادەی یەك شتی خراپی ئیسلامم پێ بڵێ ؟ با من و تۆ گفت و گۆی لەسەر بکەین بەڵام بە زمانی عەرەبی چونکە بناغەی ئیسلام قورئان و حەدیسی صحیحە وە هەردووکیان بە زمانی عەرەبین . چونکە تۆ کاتێك ئەو پرسیارە دەکەیت و هیچ شتێکی ئیسلام بە باش یان جوان نابینیت دەبێت شارەزاش بیت لەو دینە ؟

هیچ کەس کوردایەتیمان پێ نەفرۆشێت و بڵێت بە کوردی گفت و گۆ دەکەم . چونکە کاتێك مناقشەی کیمیا دەکەیت دەبێت بە ڕەمزەکان قسە بکەیت . چونکە ناکرێت تۆ باسی H2o بۆ من بکەیت منیش بڵێم هەمان شتت بۆ دروست دەکەم لە Co2 ئەو کات کابرا دەزانێت من شارەزانیم لە کیمیا و قسەی گێرفانم دەکەم.

بۆیە کاتێك باسی هەر منهجێك دەکەیت دەبێت بە زمانی ئەو منهجە قسە بکەیت و ڕەخنە بگریت. كێ دەیەوێت مناقەشەمان بکات با پێوەری گفت و گۆمان با دور بێت لە تەفسیرەکانی قورئان بەڵکو لەسەر دەقەکە بێت چۆن نوسراوە و چۆن دابەزیووە و با هەردووك لامان سەرچاوەکانمان بۆ ڕاڤە کردن معجم بێت نەك قاموس یان ترجمەی گوگڵ یان ترجمەی زمانەکانی تر بۆ عەرەبی . فەرموو ئەگەر لە خۆتدا ڕا دەبینیت و شارەزایت و دراسەی ئیسلامت کردوە و ڕەخنەی لێ دەگریت وەرە پێشەوە . کوردایەتیشمان پێ مەفرۆشە تۆ ڕەخنە لە قورئان و حەدیس دەگریت هەردوکیان بە عەرەبییە بۆیە دەبێت بە عربی گفت و گۆ بکەیت .

وە بژی کورد و کوردوستان و هەموو سەرۆکەکانی **چوار** پارچەکەمان هەتا ئەم کاتەی تێیدا دەژیین . بژی **پێشمەرگە** و سەری شۆڕی هەموو عەرەبێکی شۆڤێ و هەر کەسێك دژی کوردە لەژێر پێڵاوی پێشمەرگەدایە لە هەر جێیەك بێت .

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :حەفتا و حەفت

## کێ دەتوانێت خودامان نیشان بدات ؟




ئینکاریی و ڕەت کردنەوەی خودا لە مێژە هەیە و سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ زەمانی نوح (ع) بۆیە خودا خەڵکی نەهێشت و جارێکی تر بەردەوامیی دا بە ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی لە ڕێگای نوح و ئەو چەند ئیماندارەی لەگەڵیدا ڕزگاریان بوو . بۆیە ماوەی نێوان ئادەم و هەتا زۆربوونی مرۆڤایەتی لە پاش تۆفانی نوح بزرە و نازانین چی ڕوی داوە سەرچاوەشمان بۆ زانینی ئەو مێژووە کتێبە ئاسمانیە کانە !؟ پاش تۆفانی نوحیش ئەوەی لای ئێمە ناسراوە بە شارستانیی بابلیەکانە بە ٨٠٠٠ ساڵ تخمین دەکرێت وە مێژوی نوسینیش بە ٥٠٠٠ ساڵ تخمین دەکرێت ( واتا نوسینی پیت کە دۆزراونەتەوە ) ؟

ئەوەی دژە ئاینەکان ڕەتی دەکەنەوە ئەوەیە : دەڵێن تەورات و قورئان کتێبەکانیان لە ئەفسانەی بابلیەکان وەرگرتووە . لە هەمان کاتدا بێ ئاگان لە پێش بابلیەکان ئادەم و نوح و پێغەمبەرانی تر هەبووە و نەوەی نوح جارێکی تر سەرزەویی ئاوەدان کردوەتەوە و ئەو زانیاریانەی گەیاندووە بە بابلیەکان و پاشان بڵاو بوەتەوە بۆ دونیا . ئەوەی دژە دینەکان نایزانن ئەوەیە خۆیان هەڵ واسیووە بە یۆنان و شارستانیەتی یۆناندا بەڵام بێ ئاگان هەموو شارستانیەتی ڕۆژئاوا و ئەوروپا لە یۆنانەوە وەر گیراوە ، یۆنانیش لە هۆمەر یان هۆمیرۆس وەری گرتووە

هۆمەریش کابرایەکی کوێری نا بینای هەقایەت خوانی یۆنانی بوە بە دەمی ( شفهی ) ڕوداوەکانی باس کردوە و ڕوداوەکان پشتا و پێشی گێڕاوەتەوە . و تخمین دەکرێت ساڵانی ٨٥٠ پێش لە دایك بونی مسیح (ع) لە یۆنان بو بێت .کەواتە

یۆنـان و ئـاوەدانیی یۆنـان ٢٠٠٠ سـاڵ پـاش تۆفـانی نـوح ناسـراوە و شارسـتانی بابلیـەکان پـێش ئـەوان بـووە . کەواتـە ئێسـتا دوو سـەرچاوەمان هەیـە بـۆ زانینی زانیـاری بـابلی و یۆنانیـەکان کـە دەکاتـە ٨٠٠٠ سـاڵ لەمـەو پـێش . وە هـیچ کـەس زانیـاریی نییە دەربارەی پێش ئەو ٨٠٠٠ ساڵە !؟

کەواتـە چـۆن ڕەقـەم لـێ دەدەن بـۆ تەقینـەوەی مـەزن و پەرەسـەندن بـە ١٣ ملیـار سـاڵ دەیخـەملێنن و ژیـانی یەکـەم بونـەوەریش بـە ملیۆنـەها سـاڵ حسـاب دەکـەن ؟ لـە هـەمان کاتیشـدا کـابرا شـارەزای ئـەم ٨٠٠٠ سـاڵە نییـە چی گـوزەراوە و ژیـان چـۆن بـووە ؟ بـە ئـارەزوی خـۆی ئـاین و ژیانـت بـۆ لێـك دەداتـەوە بـە خورافـات و ئەفسـانە ی کـۆن و خـەڵکی نـەزان و جاهیـل . خۆشـی بـە دانـا و زانـا دەزانێـت . لـە کاتێکـدا بابلیـەکان بـە بـێ مـاتۆڕی ئـاو کارەبـا باخچـە هـەڵ واسـراوەکانیان دروسـت کـردووە هـیچ زانـا و تکنلۆجیـا و ئـەقڵێك ناتوانێـت لـە ئێسـتادا بـێ کارەبـا و بـێ مـاتۆڕ ئـاو هەڵـدات بـۆ یـە ك مـەتر بـەرزایی !؟. کەواتـە تـۆ چـۆن خـودا دەناسـیت ئەگـەر دینـدار ئەگـەر بێـدینیت ؟ ئایـا هـیچ شـارەزایت هەیـە لـە ژیـان و خـودا پەرسـتنی پـێش خـۆت ؟ ئایا دەزانیـت خـودا کێیـە و چـۆن بـووە ؟ وشـەی خـودا یـان ( رب ) واتـا خـاوەن یـان بەخێوکـەر. کـاتی خـۆی هـەموو باوکێـك یـان بـرا گەورەیـەك لـە ماڵـدا خـودا بـوە و هـەموو ماڵێـك خودایـەکی بتیشـی هـەبووە . هـەمو گـەڕەکێك و گونـدێك و شـارێك چەنـدەها بتیـان هـەبووە و بتێکـی گـەورە سـەرگەورەی بتـەکانیان بـووە و هـەموو بتـەکانی ئـەو وڵاتـەش چەنـد بتێکـی گـەورەیان بـووە لـە پایتـەخت و بتی مـەزنیش سـەر گـەورەی هـەمو بتـەکانی دەوڵـەت بـووە و سـەرۆکی دەوڵـەتیش خـودای هـەمویان بـووە.... سـالانە کەرنـەڤاڵی تایبـەت کـراوە نوێنـەر لـە هـەمو وڵات دەچـوون بـۆ پایتـەخت خـودای مـەزن واتـا سـەرۆکی دەوڵـەت و بتـی مـەزنی دەوڵـەت لـە پێشـەوە دەڕۆشـتن و بتـەکانی تـر بـە دوایانـدا دەڕۆشـتن . وە پشـتیوانیی خۆیـان بـۆ سـەرۆکی دەوڵـەت دەر دەبـڕی بۆیـە ئێسـتاش کاتێـك کرنڤاڵـەکان دەبینـین لـە جیهانـدا خـەڵکی بـەرگ و دەم و چـاو و بوکەڵـەی سـەیریان پێیـە خۆشـیان نـازانن ئەمـە چییـە ؟ دەڵـێن کلتـورە بـەڵام ئـەوە ئـەو کەرنـە ڤاڵـە بـت پەرسـتیانەیە تـا ئێسـتاش مـاوە لـەناو خەڵکیـدا مانـای ئەوەیـە پشـت گیریی خـودا دەکـەن کـە دەکاتـە ئیمپراتـۆر یـان پادشـای ئـەو دەوڵەتـە

.بۆیـە لـەو زەمانانـەدا خـەڵکی زیـرەك و بـە توانـا بـە نـاوی فیلسـوفەکانەوە دەیـان ویسـت خـەڵکی هۆشـیار بکەنـە وە ئـەو هـەموو خودایـە درۆیـە و وازی لـێ بهێـنن وە پێغەمبـەرانیش هـاتوون ڕێنمـایی خـەڵکییان کـردوە دوور بکەونـەوە لـەو جـۆرە کارانـە و خـودا و خـودا پەرسـتی بـەو شـێوەیە هەڵەیـە کەواتـە کاتێـك تـۆ دەڵێیـت سـقراط یـان افلاطـون یـان ... هتـد خودایـان ڕەت کردوەتەوە . ئادەی پێم بڵێ کام خودایەیان ڕەت کردوەتەوە و لەو زەمانەدا چەند خودا هەبووە ؟

بۆیە کاتێك خودای **رب العالمین** پێغەمبەرانی دەنارد خەڵکی داوایان لێ دەکرد موعجیزەیان نیشان بدات هەتا بزانن خودای ڕاست کامە یە !؟ جاران خەڵکی نە خوێندەوار بوون بۆیە پەیامی پێغەمبەران شفهی و بە دەم بووە . بەڵام خودا خۆی دەزانێت دنیا بەرەو پێش دەچێت بۆیە کتێبی نارد بۆ پێغەمبەران بۆ ئەوەی پەیامێکی خودایی بمێنێتەوە و خەڵکی شوێنی بکەون. لەگەڵ ئەوەشدا

جۆرێکی تازەی بێدین هاتە کایەوە کە تەمەنی ١٠٠ ساڵ دەبێت . ئەویش تەقینەوەی مەزن و ئیڤلوشنە : کە دەڵێن گەردون لە خۆیەوە دروست بووە لە ماوەی ١٣ ملیار ساڵدا . وە یەکەم مرۆڤیش لە خانەیەکەوە دروست بووە خانەکەش پەرەی سەندووە و بونەوەری لەسەر زەوی لێ دروست بووە ،ئەم جۆرە بێدینە مۆدرێنە بوونی دروست کەر ڕەت دەکاتەوە و باوەڕی بە شتێك هەیە دەستی لێ بدات و بی بینێت . خوداش یەکێکە لەو شتانەی کە ڕەتی دەکاتەوە و بە خورافاتی دا دەنێت ، ئەگەر پرسیاری لێ بکرێت هیچ شارەزای ژیان و خەڵکی پێش خۆی نییە !؟ وا دەزانێت دنیا هەر بەم شێوەیە بوە و کارەبا و ئینتەرنێت و هۆکارەکانی هات و چۆ هەبووە و توانا و ئاستی بیر کردنەوەی هێندە تەسکە ناتوانێت تصور و پێش بینیی ساڵانی ١٩٠٠ بکات . لە هەمان کاتدا خۆی باوەڕی بە خورافات و خەیاڵ پڵاویی ١٣ ملیار و ملاین ساڵ هەیە بۆ دروست بوونی گەردون و مرۆڤ . لە هەمووی خورافات و سەیر تر ئەوەیە باوەڕی بەوە هەیە گەردون و بونەوەرەکانیش لە خۆیەوە دروست بووە ،ئەگەر لێی بپرسین ئادەی بنێشتێك یان کۆکا کۆلایەکمان بۆ دروست بکە لە هیچەوە دەڵێت ئەوە مستحیلە بەڵام ئەو گەردونە و بونەوەرەکانی مستحیل نییە و لە خۆیەوە دروست بووە ؟ پرسیاری سەرەکیمان ئەمانەیە : کاتێك دەڵێیت خوداکان درۆیە و ئەفسانەیە و دروست کراوی مرۆڤن . ئایا جەنابت تا چەند شارەزایت لەو خودایانە و لە چی سەردەمێکدا ژیاون و چەند خودا هەبووە ؟ و فەرقی چییە لەگەڵ خودای قورئاندا و پێوەری تۆ چییە بۆ هەڵ سەنگاندنیان و تا چەند شارەزایت لەو خودا خورافیانەی لە ئەفسانەی بابلی و یۆنانیەکاندا هەیە ؟ وە چۆن ئەو خودایانە جودا دەکەیتەوە لەگەڵ خودای تەورات و ئینجیل و قورئاندا ؟؟

فەرموو وەرە پێشەوە ئەو خودایانەمان پێ بڵێ کە ئەفسانەن و بەراوردی بکەین لەگەڵ الله ی قورئاندا ئەو کات تۆ خودای خۆتمان نیشان بدە و ئێمەش الله ت نیشان بدەین !؟ یان کاتێك دەڵێیت دنیا بێ دروست کەر دروست بووە فەرموو جەنابت گەردونێکمان بێ درووست کەر بۆ دروست بکە با ئێمەش واز لە الله بهێنین و تۆ یان منهجەکەت دەکەین بە خودای خۆمان . ئەگەر دەڵێیت : ئەی کێ خودای دروست کردووە ؟ وەڵامەکەی ئاسانە . خودا بتوانێت ئەو گەردونە و ئەو هەمووو بونەوەرە دروست بکات کەواتە هێندە بە توانایە پێویست ناکات دروست کەری هەبێت ؟ئادەی جەنابت توانای خۆتمان نیشان بدە تلفۆنێکی مۆدێل کۆن یان خانەیەکی سەرەتایمان بۆ دروست بکە و لەو خانەیە مێشولەیەکمان لێی دروست بکە یان هەر شتێکی تر !؟ ئەو کات تۆش دەبیت بە بنیات نەر و دەتوانیت لە هیچ شتی زیاتریش دروست بکەیت و خەڵکیش شوێنت بکەوێت ... خودا بە کارەکانی و بە بەرهەمەکانی دەبینرێت و دەناسرێت . فەرموو ئێوەش وەرنە پێشەوە بزانین کار و بەرهەمی جەنابتان چییە با بتان ناسین ؟ یان بیگ بانگێکمان بۆ بکەن و زەوییەکمان بۆ دابین بکەن یان خانەیەکی زیندومان بۆ دروست بکەن و بونەوەری لێ دروست بکەن ؟ یان بیگ بنگ و یەکەم بونەورمان نیشان بدەن ؟

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :حەفتا و هەشت

## مێشولەی مێ

کاتێك باسی مێشولە دەکرێت هەمووومان فکرمان دەچێت بۆ پێوەدانەکەی چەند ناخۆش و ئێزعاجە شەوان لە شیرینی خەوندا پێوەمان دەدات و ئێزعاجمان دەکات خودای زانا لە ئایەتی ٢٦ ی البقرەدا دەفەرموێت ( **إن الله لا يستحيي أن يضرب مثلا ما بعوضة فما فوقها** )لێرەدا دیقەت بدەن ووشەی مێشولە بە ( مێ ) ناو براوە . خۆ مێشولە نێریشی هەیە بۆچی نە نوسراوە ( بعوض ) بەڵكو نوسراوە ( بعوضة ) !؟

چونکە ئەو مێشولەیەی پێوەمان دەدات مێیەکەیە نەك نێرەکە !؟ وە مێیەکە پێویستی بە خوێنی مرۆڤە بۆ ئەوەی خواردنی لێ وەر بگرێت بۆ گەراکانی ناو سکی ئەگەر قورئانی مەزن لە نوسینی محمد ( صلى الله عليه وسلم ) بوایە بەو ورد بینییە ووشەکانی دا دەڕشت ؟ یان خودایە کێ خالقی زانا ئەم قورئانەی دبەزاندوە و ئەو ڕاستیانەمان پێ دەڵێت ؟

**پرسیاری بێ وەلامیشمان** ئەمەیە بۆچی مێشولە بە مێ نوسراوە نەك بە نێر ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :حەفتا ونۆ

## ئایا ئەمە سوکایەتییە کاتێك دەڵێم ئافرەتی قژ زەردی گەمژەی احمقی کەری نەزانی ... هتد ؟

لە لای خۆمان خەڵکی بە گشتی معجبن بە ئافرەتی قژ زەردی چاو شینی سور و سپی بەڵام لە ڕۆژ ئاوا ئەم جۆرە ئافرەتانە بە گەمژە ناسراون تەنانەت کاتێك خۆیان هەڵە دەکەن دەڵێن قژ زەردین لێمان مەگرن هەڵەمان کرد چونکە گەمژەین . خۆشتان دەتوانن لە

گوگڵ بگەڕێن و بنوسن blonde dumb یان blonde stupid

..........................................................

بلۆند واتا ئافرەتی قژ زەرد

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمەیە** : بۆچی دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە ڕۆژئاوا ناگرن سوکایەتی بە ئافرەتی قژ زەرد دەکات و بە کەر و گەمژە و نەزان وەسفیان دەکات ؟ لە گوگڵ بگەڕێن و هەموو جۆرە نەزانی و گەمژەی و کەرێتی و حماقاتێك بنووسن و لەگەڵیدا بنووسن بلۆند بزانن لە یوتوب و گوگڵ چەند سوکایەتی تان بۆ دەهێنێت ؟

ئادەی کوان دادوەرەکانی مافی ئافرەت بۆچی ڕەخنە لە ڕۆژئاوای علمانی ناگرن ؟ تکایە هەرکەس زانیاریی نییە با لە خۆیەوە شت نە نوسێت . چونکە ئەو شتە شتێکی باوە لە ڕۆژئاوادا و تەنانەت ئافرەتە قژزەردەکان خۆیان شەرم ناکەن کە شتێکی نە شیاوو دەکەن خۆیان و چوار دەورەکەشیان پێی دەڵێن قژزەردی گەمژە یان احمق یان ... هتد وە ئاساییە لە لایان

تۆی کورد بە ناوی ئەتایست و ڕێزی ئافرەتەوە مەبە بە محامی و دادوەریان !؟ یان هەرفێرن لە بە ڕاست و چەپدا بە گژ ئاینی ئیسلامی مەزندا بچن و هیچ زانیاریەکتان نیە لە دەرەوەی ٤ دیواری ماڵی خۆتان ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :هەشتا

## بۆچی خودا باسی فڕۆکەی نە کردوە لە قورئاندا ؟








دەڵێن قورئان بۆچی باسی فڕۆکەی نەکردووە ؟ وەك لە وێنەی پۆستەکەدا دەیبینن . یان باسی زۆر شتی تریش دەکەن بۆچی قورئان باسی نە کردووە ؟ وە دەڵێن مادام قورئان کتێبی خودایە دەبوایە باسی هەموو شتێکی تێدا بکرایە ئەوەی سەیرە ڕادەی تێگەیشتن و نەزانی و بیر کردنەوەی دژە ئیسلامەکانە لە چاخی تکنلۆجیا و ئینتەرنێتدا! بۆ نموونە ئێستا هەموو کۆمپیوترمان لەبەر دەستدایە بە دوای هەر شتێکدا بگەڕێین زانیارییەکی زۆرمان بۆ دێنێت وە ئەگەر ئەو زانیاریانە بکەین بە کتێب ئایا چەند لاپەڕە دەر

دەچێت ؟ وە بوارەکانی ژیان زۆرن ئەو هەموو شتە بکەین بە کتێب ئایا ئەو کتێبە دەزانرێت سەرەتا و کۆتاییەکەی لە کوێدایە ؟ و چەندت دەوێت هەتا بیخوێنیتەوە و لێی تێ بگەیت ؟

بۆ نموونە ئاینی هیندۆسی ( فیداکان ) (٨٠٠ )مجلدە واتا ( ٨٠٠ ) کتێبی( ١٠٠٠ )لاپەڕەیی . ئاینی بودیزم (٥٦) مجلدە واتا (٥٦٠٠٠ )لاپەڕە . ئایا ژیانی مرۆڤ بەشی ئەوە دەکات ئەو هەمو لاپەڕانە بخوێنێتەوە و پاشان بڕیار بدات ئەو ئاینە ڕاستە یان نا ؟ وە چۆن فریا دەکەوێت خۆی ڕاست بکاتەوە لە کاتێکدا بگاتە کۆتایی لێکۆڵینەوە کانی و بۆی دەر بکەوێت ئەو شتانە ڕاست نییە و درۆیە و چۆن فریا دەکەوێت بیر و باوەڕی خۆی ڕاست بکاتەوە ؟ لێرەدا ئاستی نە خوێندەواری و نە شارەزایی ئەو دژە ئاینەمان بۆ دەر دەکەوێت کە خۆی ناتوانێت بە ئاسانی لە گوگڵدا سەرچاوەیەك بە تێر و تەسەلی بدۆزێتەوە !! لە هەمان کاتدا پێمان دەڵێت بۆچی قورئان هەمو شتێکی تێدا نە نوسراوە ؟ ئەگەر بە قسە و جۆری بیر کردنەوەی ئەو بێت دەبوایە قورئان چەند مجلد بوایە ؟ تێبینی : مجلدێك واتا( ١٠٠٠) لاپەڕە

تکایە کەس حساب و کتابم بۆ نەکات و بڵێت خوێندنەوەی کتێب ئاساییە !!؟ چونکە خوێندنەوەی ڕۆمان یان مێژوو یان هەر کتێبێکی تر ئاساییە و دەتوانرێت بخوێنرێتەوە . بەڵام کتێبی زانستی و ئاینی دەبێت بە تێگەیشتنەوە بخوێنرێتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسە بتوانێت خزمەت بکات و هەڵە نەکات بۆ نموونە لە بواری فیزیا یان کیمیا یان پزیشکیدا ناکرێت (٨٠٠ )مجلد بخوێنرێت چونکە کابرا ناتوانێت هەر هەموی تاقی بکاتەوە و لێی تێ بگات و پاشان خزمەتی پێ بکات . لە بواری ئاینیشدا هەر هەمان شێوەیە نابێت (٨٠٠ )مجلد دراسە بکرێت و تەمەنی مرۆڤ هێندە زۆر نیە بتوانێت لێکۆڵینەوەی لێ بکات و ڕاستی و دروستی و حوکمەکانی لێ دەر بهێنێت و فێر ببێت و کاری پێ بکات

پاشان با وای دا بنێین خودا لەو ئایەتەدا بی فەرموایە (**و حملنا بني ادم في البر و البحر و الجو**) . ئەو کات فڕۆکە نەبووە پێم بڵێن چۆن بتوانرایە فڕۆکە بگەێنینە تێگەیشتن و ئەقڵی مرۆڤێك لە هەر کوێیەکی جیهان بێت و گرنگ نیە هەر ئاینێکی هەبێت بۆ نموونە ئەگەر ١٥٠ ساڵ لەمەوبەر باس بکرایە کەسێك دەتوانێت لە امریکاوە قسە بکات لەگەڵ عیراقدا خەڵکی گاڵتەیان پێ دەکرد بەڵام لەگەڵ داهێنانی تلفۆندا ساڵی ١٨٧٤ ئەو شتە ئاسی یە بو لای خەڵکی بەڵام پێش ئەو بەرواره شتێکی ئاستەم بوو خەڵك بڕوایان نەدەکرد هەروەها بۆ هەموو داهێنان و شتە نوێ کانی تریش هەمان شێوەیە و زەحمەتە باسی شتێك بکرێت لە داهاتودا دێت و خەڵکی بەکاری دەهێنن وەك تلفزیۆن و فڕۆکە و انترنێت و ... هتد

**باسەکە بە مارکۆ پۆلۆ کۆتای پێ دەهێنم کە سێ** کەس بوون دوو برا و کوڕی یەکێك لە براکان بوە . لە کۆتای ساڵانی ١٢٩٥ دا کە بە چاخی زێڕینی بندقیة ( ڤینیسیا ) ی ئیتالی ناسراوە لە پێشکەوتندا ئەو **سێ** کەسە خۆیان کرد بە شاردا و داوایان کرد جێگەیان بکەنەوە ؟ چونکە خۆیان خەڵکی ئەو شارە بوون بەڵام بۆ ماوەی (٢٦) ساڵە ڤینیسیایان جێ هێشتوە و ڕۆشتوون بۆ ڕۆژهەڵات و گەڕۆك بوون .وە توشی کێشەی زۆر بوون و بیابانیان بینیووە و دز هاتوەتە سەر ڕێگایان و **چوار** جار چونەتە ناو وڵاتێکەوە شورایەکی

مەزنی هەبووە ناوی صینە و خەڵكی بە بەرد ئاگر دەكەنەوە ( مەخسەدیان لە خەڵوزی بەردینە ) وە خەڵكی لە بری ئاڵتون پارەی كاغەز بەكار دەهێنن بۆ مامەڵە و كڕین و فرۆشتن ، و الحاصل ئەوان باسی ئەو شتانەیان بۆ دەكردن كە بینیویانە . بەڵام خەڵكی ڤینیسیا چونكە نەیان بینیووە و نەیان زانیوە چییە ؟ ئەقڵیان نەی بڕیووە ئەو شوێنانە هەبن و ئەو شتە سەیرانە هەبن لە دنیادا بۆیە ناویان لێ ناون سێ درۆزنەكە . وە ماركۆ كە كوڕی یەكێك لە دوو براكە بووە ناویان لێ ناوە ماركۆی ملیۆنە درۆ چونكە لە گێڕانەوەكانیدا ژمارەی زۆر دەگووت... وە پاش مردنی ماركۆ خەڵكی شاری ڤینیسیا جل و بەرگی مهرجیان لەبەر دەكرد . مهرج لای خۆمان پێی دەڵێن قەرەقۆز وەك لە وێنەكەدا دەیبینن ئەو قەرە قۆزانە دەهاتن لە بۆنە و ئاهەنگەكاندا گاڵتەیان بە قسەكانی ماركۆ پۆلۆ دەكرد و بە سەر گوزشتەكانیان كە چییان بینیووە ؟ وەبینین و چیرۆكەكانیان بۆ دەكردن بە گاڵتە جاڕی و نوكتە بۆ ئەوەی خەڵكی بە درۆكانی ماركۆ پۆلۆ پێ بكەنن و ئاهەنگەكانیان بەسەر بەرن . ٧٠٠ ساڵ لەمەوپێش سێ كەس شتی ڕاستییان بینیووە و گێڕاویا نەتەوە خەڵكی تصوری نە كردوە و بە درۆزن داونی لە قەڵەم لە كاتێكدا ئەو شتانە ڕاستییە و بینراوە ئەی باشە ئەگەر باسی شتێك بكرێت كە نازانرێت چییە و بڵێن لە دوا ڕۆژدا دێتە ئاراوە دەبێت خەڵكی چۆن ئەو هەواڵە وەر بگرن ؟ وە چۆن باوەڕی پێ بكەن ؟ وە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو هەواڵە یان ئەو شتە بكەن ؟

بۆیە هەمیشە ئاستی ئەقڵ و تێگەیشتنی دژە ئیسلام زۆر لە بوارێكی كورتدا كار دەكات ! بێ ئاگایە لە رابردوو بە ئەقڵی ٢٠١٥ بیر دەكاتەوە و ڕەخنە دەگرێت و لە هەموی سەیر تر هەر بە ئەقڵی ٢٠١٥ ش ژیانی پێش خۆی دەبینێت و لەو دیدەوە سەیری ١٠٠٠ ساڵ لەمەو پێش یان زیاتر دەكات و وا دەزانێت سوپر ماركێت هەبووە و قوتابخانە هەبووە و كچ زانكۆی تەواو كردوە ئینجا شوی كردوە و ... هتد .

وە ئا لێرەدا بەم جۆرە كەسانە دەگوترێت نە خوێندەوار چونكە خوێندنەوەی نییە بۆ ڕوداوەكان و بێ ئاگایە لە ڕابردوو . لە ئێستاشدا خۆی ماندوو ناكات بە دوای زانیاریدا بگەڕێت و كۆپی و پەیستە حەیاتەكە كارەكانی بۆ ڕایی دەكات.

بەڕێزان خۆشتان دەتوانن بە دوای زانیاریدا بگەڕێن دەربارەی ماركۆ پۆلۆ باشترین سەرچاوەش كتێبی قصة الحضارةیە لینكەكەیم بۆ داناون كاتێك دەی كەنەوە لە سەرەوە ژمارەی لاپەڕەكە بنوسن ١٣٠٨ وە لاپەڕە ١٣٠٨ بۆ ١٣١٧ بخوێننەوە . بۆ زانیاریتان ئەم كتێبە باشترین كتێبی جیهانە لە بواری مێژودا و زانیارییەكانی باوەڕ پێكراون لە هەموو زانكۆ جیهانیەكاندا و ١٦ مجلدە . هیوادارم هەر كەس ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگرێت بە پێ خاوسی تێ نەكەوێت تۆزێك زانیاریی هەبێت و توانای بیر كردنەوە و تێ گەیشتنی هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت كاتێك ڕەخنەیەك دەگرێت بتوانێت گفت و گۆ لەسەر ڕەخنەكەشی بكات !؟

http://www.civilizationstory.com

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :**هەشتاو یەك**

### لجنة تحت ظلال السيوف




دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئاینی ئیسلام ئاینی کوشتن و بڕینە و حەدیسێکیان کردووە بە بەڵگە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەکاندایە . وە حەدیسەکەش صحیحە وەك لە وێنەی پۆستە کەدا دەیبینن ، بەڵام ئەوەی ناصحیحە کابرای دژە ئیسلام وەك کاری هەموو جارێکی دەقەکان دەبڕن و پاش و پێشی دانانێن هەتا بە تەواوەتی لە دەقەکە تێ بگەین بزانین چی تێدا نوسراوە ؟ با لە پێشدا بزانین ئەم حەدیسە کەی و لە کوێ گوتراوە و ئایا کاتێك گوتراوە موسوڵمانەکان هێرشیان کردوە یان هێرشیان بۆ هێناون ؟

**یەکەم** : ئەم حەدیسە لە شەڕی خندق یان احزابدا گوتراوە . **دووەم** : دوژمنانی ئیسلام کۆ بونەتەوە و هێرشیان کردوەتە سەر موسوڵمانە کان نەك موسوڵمانەکان هێرشیان بۆ بکەن و بڵێن بەهەشت لەژێر سێ بەری شمشێرەکاندایە بۆ ئەوەی ببێت بە پاساوێك بۆ موسوڵمانەکان و هێرش بکەن بەڵکو بە پێچەوانەوە دەڵێت بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەکاندایە هەر کەس بکوژرێت دەچێتە بەهەشتەوە چونکە ئەوان هێرشیان هێناوە دەبێت موسوڵمانیش پارێزگاری لە خۆی بکات . ئەگەر یەکێك بێتە سەر

ماڵەكەت و بزانیت دەت كوژێت و ماڵەكەشت دەبات ئایا تۆ بێ دەنگ دەبیت ؟وە ئەم حەدیسە باسی سەبر و خۆ ڕاگری موسوڵمانان دەكات بەرامبەر دەست درێژی كاران و پێیان دەڵێت ئەگەر ئەوان دەست درێژیان كرد ئێوەش بەرگری بكەن ئەگەر كشانەوە ئێوەش بوەستن و دەست درێژیان مەكەنە سەر . بەڵگەشمان بۆ ئەو قسەیە ئایەتی ١٩٠ ی سورەتی **البقرەیە** دەفەرموێت( **وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا إن الله لا يحب المعتدين** ). بەڵگەیەكی تریشمان بۆ قسەكانمان هەر خودی حەدیسەكە خۆیەتی كە كاكی دژە ئیسلام پاش و پێشەكەیی بڕیووە ، با ئێستا ئەو پاش و پێشەشی بخوێنینەوە بزانین دەڵێت ئیسلام بۆ شمشێر وەشاندن هاتووە ؟ یان دەڵێت شەڕ بكەن بۆ بەهەشت چونكە لەژێر سێبەری شمشێرەكاندایە ؟ یان دەڵێت هەر كەس بە شمشێرەكەی بەرگری بكات شمشێرەكەی دەبێت بە سێبەرێك بۆ ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە ؟ سەرەتای حەدیسەكە دەفەرموێت

........ **لەو كاتانەدا كە موسوڵمانان بەرەنگاری دوژمن دەبونەوە پێغەمبەر** (صلى الله عليه وسلم) **دەوەستا هەتا خۆر دەردەكەوت و دەی فەرموو : ئەی خەڵكینە ئاوات مەخوازن بۆ ئەوەی ڕوبەڕووی دوژمن ببنەوە . و اسالوا الله العافية واتا داوا لە خودا بكەن بتان پارێزێت لە فیتنە و خۆتان و سەر و ماڵتان پارێزراو بكات . وە ئەگەر ڕوبە ڕویان بونەوە سەبر بگرن .** كاكی دژە دین تا ئێرای پەڕاندووە و نای نوسێت وە دوای ئەو قسانە ئینجا دەفەرموێت : وە بزانن كە بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەكاندایە.
وەك دەبینن دەقی حەدیسەكەمان بۆ كردن بە كوردی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش ئەوەی باسی سێبەری شمشێرە كان بكات دەفەرموێت ئاوات مەخوازن شەڕ بكەن و ڕوبەڕووی دوژمن ببنەوە . بەڕێزان بەس بە خۆتان دەڵێم ئایا پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) لەو حەدیسەدا دەڵێت بڕۆن شەڕ بكەن ؟ یان دەڵێت خۆتان بپارێزن ؟وە داوای ئەوە لە خودا بكەن خۆتان و سەر و ماڵتان پارێزراو بێت و توشی شەڕ نەبن . وە ئەگەر توشی شەڕیش بوون سەبرتان هەبێت و خۆڕاگر بن . چونكە ئەگەر بكوژرێن ئێوە لەسەر حەقن و بەهەشت بۆ ئەوانەیە لە سایەی شمشێرەكانیاندا دەكوژرێن بۆ بەرگری كردن وە ئەمەیە مانای بەهەشت لە ژێر سێبەر ی شمشێرەكاندایە واتا بەرگری كردن و سەبر گرتن نەك هێرش بردن و تاڵان كردن وەك دژە دینەكان ئەم حەدیسەیان كردووە بە گومانێك بۆ خەڵكی عەوام كاكی دژە دین بە ئارەزوی خۆی حەدیس و ئایەتەكان دەبڕێت و دەی كات بە وێنەیەك بڵاوی دەكاتەوە . جەماعەتی كۆپی و پەیستیش بڵاوی دەكەنەوە بێ ئەوەی بزانن حەدیسەكە چی دەڵێت و پاش و پێشی چیە و هەر ناش زانێت شەڕی احزاب چییە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو قسەیەی تێدا كردوە . ژمارەی موسوڵمان( ٣٠٠ ) كەس بوون زیاتر لە دە هەزار دژە دین بۆیان كۆ بونەتەوە و هاتونەتە سەریان . لە ناو مەدینە و لە چوار دەوریشی جولەكەی بنو قريظة پشتیان لە موسوڵمانان گرتووە و خیانەتیان لێكردن و پشتگیری كافرەكانیان كردوە ،لەو كاتە ناخۆشەدا هەر قەومێك بووایە خۆی تسلیم دەكرد بە (٣٠٠) كەسەوە چۆن دەتوانیت بەرامبەر (١٠) هەزار كەس و جولەكەی خاین لە پشتەوە بوەستیت . پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موعجیزەیەكی مەزنی نیشان داوین كە دەفەرمووێت ئاواتەخوازی ڕوبەڕوو بونەوە مەبن لەگەڵ دوژمندا و داوا لە خودا

بکەن پارێزراوتان بکات . وە هەر کەس بکوژرێت شهیدە و دەچێتە بەهەشتەوە ، ئەوە بوو خودای تعالی پشتی موسوڵمانانی گرت و سەری خستن بەسەر کافر و جولەکەکانیشدا بەبێ شەڕ و خوێن ڕشتن . کاکی دژە دینیش دێت دەڵێت بۆچی بنو قریظەیان لە مدینە دەرکرد بەڵام نە شارەزایە و نازانێت کە موسوڵمانان (٣٠٠) کەس بون زیاد لە (١٠ ) هەزار کافر هاتون بۆیان و کاکی جولەکەش لە پشتەوە خیانەتی لێ کردون . بۆ ئەوەی بابەتەکە دوور و درێژ نەبێت خۆتان بگەڕێن بە دوای زانیاری دەربارەی شەڕی احزاب یان خندق . وە ئەوەی ئەم گومانانە دروست دەکات کڵێسایە و بەڵام کڵێسا خۆی گێل دەکات لەوەی کاتێك مسیح (ع) پێش ئەوەی بە حسابی ئەوان ببرێت بۆ لە خاچ دان داوا لە شوێن کەوتوانی دەکات سەر و ماڵیان بفرۆشن بەس بچن شمشێر بکڕن . وە ئەوە کۆتا وەسێتی مەسیح ئاینی ئاشتی بووە شمشێر کرین وەك لە ئینجیلی **لۆقا** بەشی ٢٢ – ٣٦ دا نوسراوە

فەرموون بەڵام ئێستا ئەوەی جزدانی هەیە با بیبات تورەکەش ئەوەش کە نییەتی با جلەکانی بفرۆشێت و شمشێرێك بکڕێت .

قوتابیەکانیشی وەڵامیان داوەتەوە گەورەم ئەوە دوو شمشێرمان لایە ئەویش گوتویەتی بەسە .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :هەشتاودوو

## ئایا پێغەمبەر (د.خ) دەوڵەمەند یان ملیۆنێر بووە ؟

ئایا پێغەمبەر (د.خ) دەوڵەمەند یان ملیۆنێر بووە ؟

الإمام تاج الدين السبكي يؤكد نقلاً عن والده

الإمام الفقيه تقي الدِّين السبكي

ثــراء النبي ﷺ وغنـــــاه المـفـــرط

(وأحفظُ أنَّ الشَّيخ الإمام ﵀ أقام من مجلسه من قال: "كان النَّبيُّ ﷺ فقيراً" قياماً صعباً، وكاد يسطو به، وما نجَّاه منه إلا أنَّه استتابه واستسلمه.
كان ﵀ يشدِّد النَّكير على من يعتقد ذلك، والحقُّ معه، فإنَّ مَن جاءت إليه مفاتيح خزائن الأرض وكان قادراً على تناول ما فيها كلَّ لحظة كيف يوصَف بالعَدم؟! ونحن لو وجدنا مَن معه مالٌ جزيل في صندوق من جوانب بيته لوَسَمناه بسمَةَ الغناء المفرط، مع العلم بأنَّه قد يُسرَق أو تغتاله غوائل الزَّمان فيصبح فقيراً، فكيف لا يُسمَّى مَن خزائن الأرض بالنِّسبة إليه أقرب من الصُّندوق إلى صاحب البيت، وهي في يده بحيث لا تتغيَّر، بل هو آمنٌ عليها بخلاف صاحب الصُّندوق، فما كان ﷺ فقيراً من المَال قطُّ، ولا مسكيناً).
[طبقات الشافعية الكبرى]

ئەم وێنەیەی دەستە چەپ وێنەی دژە دینەکانە ئەمەی ئێمە دەینوسین ئەسڵیەکەیە ئەو بڕگانەی دژە ئیسلامەکان بڕیویانە بە شین بۆتان دەنوسین

و سماعي مرات كثيرات من الشيخ الامام الوالد رحمه الله هو معتقدي انه صلى الله عليه و سلم لم يكن فقيرا قط و لا كانت حالته حالة الفقراء بل كان اغنى الناس بالله و كان الله تعالى قد كفاه امر دنياه في نفسه و عياله و معاشه

و احفظ ان شيخ الامام رحمه الله اقام من مجلسه من قال كان النبي صلى الله عليه و سلم فقيرا قياما صعبا و كاد يسطو به و ما نجاه منه الا انه استتابه و استسلمه

و كان رحمه الله يقول في قوله صلى الله عليه و سلم اللهم احيني مسكينا ان المراد به استكانة القلب لا المسكنة التي هي ان يجد ما لا يقع موقعا من كفايته و ذكر ذلك في باب الوصية من شرح المنهاج و سمعته منه كذا و كذا مرات لا احصي عددا

ئەمەش بەشە گرنگ و کۆتاییەکەیە کە بڕیویانە

نعم كَانَ أعظم النَّاس جوارا إِلَى ربه وخضوعا لَهُ وأشدهم فى أظهار الافتقار إِلَيْهِ والتمسكن بَين يَدَيْهِ

دژە ئیسلامەکان پۆستێك دەکەن وە تێیدا دەڵێن گوایا پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم) دەوڵەمەند بوە یان ملیۆنێر بووە . وە وێنەی ئەوانمان داناوە وەك خۆی .

دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئیمامی شافعی لە کتێبی طبقات الشافعی الکبرادا وای گوتووە وەك لە خواری وێنەکەدا دەبینن ئاماژە بە سەرچاوەکەی دراوە .

ئێستا با شیکاریی بۆ بکەین وە ئێوەش شارەزا بن ئەو دژە ئیسلامانە چۆن چەواشە کاریتان لەگەڵ دەکەن و سەرتان لێ تێك دەدەن !؟ کتێبی طبقات الشافعی لە نوسینی ئیمامی شافعی نییە بەڵکو لە نوسینی أبو **نصر تاج الدين عبد الوهّاب بن علي بن عبد الكافي السبكيه** لە ساڵی ١٣٢٧ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٣٧٠ کۆچی دوایی کردوە بەلام ئیمامی شافعی لە ساڵی ٧٦٧ لە دایك بووە و لە ٨٢٠ وەفاتی کردوە .کەواتە ئەو قسەیە هی ئیمامی شافعی نییە بەڵکو هی ئیمام السبکییە کە کتێبی طبقاتی سافعیی نوسیوە .

بەڵگەشمان هەر پۆستەکەی خۆیانە لە سەری سەرەوە نوسراوە **الامام تاج الدين السبكي** لە زمانی باوکیەوە تقي الدين السبكی بۆمان دەگێڕێتەوە بۆیە داواکارم ئێوەش ورد بین بن لە درۆ و چەواشەکاریی دژە ئیسلامەکان چونکە زۆر بێ شەرمانە و بە گێلانە درۆتان بۆ دەکەن و دەڵێن شافعی وا دەڵێت بەلام شافعی وای نە گوتووە پاشان ئەمە نە حەدیسە و نە دەقی قورئانە !؟ بەڵکو گێڕانەوەی تاج الدين السبكییە کە چی بینیووە لە مەجلیسی باوکیدا واتا تقریبا ٧٠٠ و قسور ساڵ دوای هاتنی ئیسلام کەسێك ڕوداوێك دەگێڕێتەوە بینیوێتی لە مجلسی باوکیدا ڕووی داوە .

بێ دین و دژە ئیسلامی بێ ویژدان بەوەشەوە نەوەستاون هاتوون ئەو ڕوداوە یان بڕیووە تەنانەت لە نقل کردنیشدا ڕاست گۆ نین و ئەمە نە حەدیسە و نە دەقی قورئانە .

گێڕانەوەی ڕوداوێکە هاتوون بڕیویانە و ئەوەیان بلاو کردوەتەوە کە ببێتە هۆی پشێوی و سەرلێ تێکدانی موسوڵمانی عەوامی داماو وەك دەبینن لە وێنەکەدا و لێرەدا بۆتان ڕون دەکەینەوە . سەرەتا پێشەکیی ڕوداوە کەیان بڕیووە و دایان نەناوە عەرەبیەکەیمان لە وێنەکە داناوە و ئەمەش ترجمەکەیەتی بە کوردی

. ( زۆر جار لە باوکمم بیستووە بە ڕەحمەت بێت دەی گوت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قەت فەقیر نە بووە و حاڵیشی وەك حاڵی فەقیرەکان نەبووە بەڵکو دەوڵەمەند ترین کەس بووە بەوەی خودا لە دڵیدا بووە وە خودای تعالی لە بەشی دونیای هێندەی پێدا بوو کە بەشی بژێویی خۆی و ژیانی منداڵەکانی بکات لە وێنەکەدا ئەوەیان نە نوسیووە .

کە مەبەست لەوە بووە السبکی باسی دەکات دەڵێت فەقیری فەقیریی ماڵ و دنیا نیە بەڵکو فەقیری ئەوەیە خودا نە ناسیت و چەند خودا بناسیت هێندە دەوڵەمەندیت و پێغەمبەریش دەوڵەمەند ترین کەس بووە بەوەی خودای ناسیووە دژە ئیسلامەکان نوسراوە لە دوای ئەو بڕینەوە ئەمەیان نوسیووە و دایان ناوە هەروەها باوکم بە ڕەحمەت بێت هەمو کەسێکی لە کۆڕ و مەجلیسەکەی دەر دەکرد ئەگەر بی گوتایە پێغەمبەر فەقیر بووە تا دەگەشتە ئەو ڕادەیەی لە دەستی ڕزگاری نەدەبوو هەتا پەشیمان نەبوایەتەوە لە قسەکەی و داوای لێبوردنی نەکردایە پاشان دژە دینەکان هاتوون ئەمەشیان بڕیووە لە وێنەکەدا بە **شین** نوسیومانە بۆتان لە دوای ئەو قسەیەوە ئەمەیان دا نەناوە کە دەڵێت.

باوکم بە ڕەحمەت بێت دەربارەی ئەو وتەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەیگوت اللهم احيني مسكينا مەبەستی لە دڵنیای و سەبوریی دڵ بوە نەك مەبەستی لەوە بێت هیچ شتێکی نەبێت بتوانێت پێی بژی و ژیانی خۆی پێ بەڕێوە بەرێت . وە باوکیشم ئەو شتەی باس کردووە لە خانەی وەسیەتدا لە کتێبی شرح المنهاج دا وە زۆر جار ئەو قسەیەم لێ بیستووە)

بەڕێزان وەك دەبینن ئەم بێ ویژدانانە لەم دوو پارچەیەی بڕیویانە باسی ئەوە دەکات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەوڵە مەند بووە بەوەی خودای ناسیووە و لە هەموو کەسێك دەوڵەمەند تر بوە . و هەمیشە دڵی پڕ بووە لە دڵنیای و هێور بووە . واتا ئەم ڕوداوە باسی فەقیریی پارە و ماڵ ناکات . پاشان دژە ئیسلامەکان ئەمەیان داناوە کە کۆتایی ڕوداوەکەیە و دەڵێت

باوکم بە ڕەحمەت بێت دژی ئەوانە بووە کە وایان بیر دەکردەوە وە حەقیشی بوو وا بێت چونکە ئەگەر کەسێك کلیکی خەزێنەکانی زەویی لا بێت دەتوانێت هەموو کاتێك هەر شتێکی بوێت بیبات بۆ خۆی ئەو کەسە چۆن وەسف دەکریت بە نەبوو !؟ یان ئەگەر کەسێك پارەیەکی زۆری هەبێت لە سندوقێکدا بێت لە ماڵەکەیدا پێی دەڵێین زۆر دەوڵەمەندە لەوانەشە دزی بکات یان چەرخی زەمانە بسوڕێت و کابرا فەقیر ببێت و پارە و ماڵەکەی نەمێنێت . کەواتە چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناو نەبرێت ئەو کەسەی خاوەنی سندوقە پارەکەیە و لەبەر دەستیدایە لە کاتێکدا موڵکی ناو سندوقەکە ناگۆڕرێت ( واتا کەم ناکات ) بەڵکو ئەمینیشە ( واتا دزی ناکات ) بە پێچەوانری خاوەن سندوقەکەوە کە پارەکەی نامێنێت و دزیش دەکات

بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەت هەژار نە بووە . دژە ئیسلامەکان تا ئێرەیان داناوە و پاش ئەمەشیان بڕیووە . ئەوەی سەرەوە کە ترجەمەمان کرد مەبەستی لەوەیە مەسەلی لێداوە بە کەسێك هەموو موڵکی جیهانی لەبەر دەستدا بێت دەتوانێت هەمو کاتێك چیی بوێت لێی دەر بهێنێت نمونەیەکی تری هێناوەتەوە دەڵێت کەسێکی دەوڵەمەند سندوقێك پارەی هەبێت پێی دەڵێن دەوڵەمەندە . وە ئەو کەسە لەوانەیە دزی بکات یان پارەکەی لە دەست بدات .

بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەمین بووە نە دزیی کردوە و نە داهاتی سندوقەکەی لە دەست داوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەت هەژار و مسکین نە بووە. دژە ئیسلام ئەم فەقیر نەبوەی کردوە بە بەڵگە . لە کاتێکدا نمونەیە و باسی دەکات نەك

باسی ژیانی بكات وە لە هەمووی گرنگ تر ئەم بەشەی كۆتاییە كە ئەوان بڕیویانە وەڵامی گومانەكە دەداتەوە چونكە ڕودا وەكە لە بەشی كۆتاییدا دەڵێت

بەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەزنترین كەس بوە لە مل كەچی و نزیكی لە خوداوە و لە گشت كەس زیاتر هەژاری و بێداریی خۆی نیشان داوە بۆ خودا . بەڕێزان وەك دەبینن باسی هەژاری و نەبونی و بێ داری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەكات بەرامبەر بە خودا نەك باسی فەقیری و دەوڵەمەندیی پارە بكات !؟ بەلام دژە ئیسلامی بێ ویژدان لە سێ شوێندا دەقی ڕوداوەكەی بڕیووە و ئەوەتان نیسان دەدات كە خۆی دەیەوێت بۆ ئەوەی گومان بخاتە دڵی ئێوەوە بەرامبەر بە ئاینی ئیسلامی مەزن

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمانەیە** : كوا ئیمامی شافعی وا دەڵێت ؟ ئەمە ڕا و بۆچونی ئیمامێكە ٧٠٠ ساڵ دوای مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باس كراوە . وە نموونەیە بۆ هەژاریی عەبدەكانی خودا بەرامبەر خودا نەك بوونی پارە بێت یان باسی ژیان نامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بكات !؟ كاكی دژە دین بۆچی لە سێ شوێندا بەسەرهاتەكەی بڕیووە ؟ بە تایبەتی لە كۆتاییەكەیدا كە بە ڕوونی باسی دەكات مەبەستی لە هەژارییە بەرامبەر بە خودا و موڵك و سامانی خودا نەك موڵك و سامانی سەر زەوی و مرۆڤەكان ؟

هیوادارم ئێوەی موسوڵمانیش تۆزێك خۆتان ماندوو بكەن و كاتێك دژە ئیسلام سەرچاوەتان بۆ دا دەنێت یەكسەر بە بێ زانیاری وەلام نەدەنەوە خۆتان و ئاینەكەشتان ئیحراج بكەن وە ببن بە گاڵتە چیی دژە ئیسلامەكان . بەڵكو بە دوای زانیاریدا بگەڕێن و خۆتان چەكدار بكەن بە گەڕان بە دوای ئەسڵی ئەو بەڵگەیەی دژە دیندا . وە دڵنیابن هەموو بەڵگەكانی دژە ئیسلامەكان بڕینی تێدایە . ئێوە متمانە بە سەر چاوەی دژە دین مەكەن بەڵكو خۆتان بگەڕێن و سەرچاوە ئەسڵیەكە بدۆزنەوە دەتوانن ئەو كات كابرای بێ ویژدانی درۆزنی دژە ئیسلام ئیحراج بكەن

فەرموون ئەمەش سەرچاوەی ئەو ڕوداوەیە لە كتێبی طبقات السافعيدا . وە ئەگەر لینكەكە ڕوداوەكەی نە دایتێ !؟ لە خواری خوارەوە نوسراوە جزء صفحة یەكەم خانە بنوسن سێ تەنیشتی بنوسن ١٣٤ واتا بەشی ٣ لاپەڕە ١٣٤

http://shamela.ws/browse.php/book-6739#page-808

## پرسیارە بێ وەلآمەکان ژمارە :هەشتاوسێ

## بۆچی خودا لە قورئاندا باسی دایناصۆری نەکردووە ؟







دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە قورئان دەگرن و دەڵێن بۆچی باسی دایناصۆری نەکردووە ؟ و ئایا کاتێك تۆفانی نوح ڕویدا نوح دایناصۆری خستە کەشتییەکەیەوە یان جێگای نەبووە ئەویش جێی هێشتن لەسەر زەوی ئەوانیش فەوتان ؟ئەم پرسیارانەی بێدینەکان دەیکەن گورزێکی بەهێزە لە خۆیانی دەدەن چونکە ڕادەی نەزانی و تێنەگەیشتنی خۆیان دەردەخات وە بۆ ئێمەی موسوڵمان دەر دەکەوێت ڕەخنەی بێدینەکان هی خۆیان نییە!؟ بەڵکو ئەمانە ڕەخنەی کڵێسان و ئەمانیش کۆپی و پەیستی دەکەن . بۆ ڕون کردنەوەی زیاتر با لە پێشدا بە ئەقڵی خۆیان قسە بکەین و بزانین بیردۆزی پەرەسەندنی **داروین** چی دەڵێت ؟

65ملیۆن ساڵە دایناصۆر نەماوە . وە ٢ ملیۆن و نیو ساڵە جنسەکان دروست بووە کە ئەوان پێی دەڵێنHomo و یەکێك لەو جنسانە مرۆڤە و تەمەنی دروستبوونی مرۆڤ دەگەڕێننەوە بۆ ٢٠٠ هەزار ساڵ لەمەوبەر واتا مرۆڤ ٦٤ ملیۆن ٨٠٠ هەزار ساڵ دوای نەمانی دایناصۆر دروست بووە . کاکی بێدینی نەزان خودا باسی چیت بۆ بکات لە کاتێکدا بە پێوەرەکانی خۆت کاتێك مرۆڤ دروست بوە دایناصۆرە کان نەماون ؟نوح (ع) دایناصۆر چۆن بخاتە ناو گەمیەکەی لە کاتێکدا دایناصۆر بوونی نەبووە ؟

لێرەدا ئاستی نەزانیی بێدینەکانمان بۆ دەر دەکەوێت کە بێ ئاگان لە منهج و پەیرەو پرۆگرامی خۆشیان وە ئەم نەزانی و بێ ئاگاییەیەی کاکی بێدین دەمان بات بۆ لایەکی تر کە شاراوەیە لە زۆربەی خەڵکی ئەویش ئەمەیە کە کاکی ملحد یان بێدین یان دژە ئیسلام ئەم ڕەخنانە لە قورئان و ئاینی مەزنی ئیسلام دەگرێت هیچی ڕەخنەی خۆی نییە !؟ بەڵکو لە پێگە مەسیحییەکان وەری دەگرێت و کۆپی و

پەیستیان دەکات بە حساب ڕەخنەی لە ئاینی ئیسلامی مەزن گرتووە . بەلام نازانێت هەرچەند ڕەخنە بگرێت پاشەڵی خۆی هەڵ دەماڵێت و ئاستی نەزانیی خۆی دەردەخات وەك لە سەرەوە ڕونمان کردەوە بۆتان بە گوێرەی سەرجاوەکانی خۆیان کەواتە ئەم دژە دینانە ئەم گومانانە لە کوێوە وەر دەگرن ؟ وەك باسمان کرد لە کڵێساوە وەری دەگرن چونکە ڕەخنەیان زۆر لێ گیراوە لەسەر ئەوەی باسی ئاژەڵی سەیر کراوە بۆ نموونە لە پەیمانی کۆندا **سفری ایوب** بەشی ٤٠ دەق ١٥ دا نوسراوە سەیری(بەهێمۆت ) بکە کە لەگەڵ تۆ دروستم کرد وەك مانگا گیا دەخوات

ئەمەش دەقەکانە لە کتێبەکەی خۆیاندا لە ١٥ بۆ ٢٤ بیخوێنەوە کلیکی ئەم لینکە بکەن

http://www.kitebipiroz.com/bible/job/40

........................................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » ئەیوب » بەشی ٤٠ ......

15 سەیری(بەهێمۆت)[a] بکە،
کە لەگەڵ تۆ دروستم کرد
وەک مانگا گیا دەخوات.
16 ئەوەتا هێزەکەی لە کەمەریدایە و
تواناکەی لە ماسوولکەکانی سکیدایە.
17 کلکی وەک داری ئورز شۆڕ دەکاتەوە؛
ماسوولکەکانی ڕانی یەکیان تەنیوە.
18 ئێسکەکانی بۆریی بڕۆنزن،
چوارپەلی لوولەی ئاسنن.
19 ئەو سەرەتای کارەکانی خودایە،
نابەزێت تەنها بە دەستی دروستکەرەکەی نەبێت.
20 چیاکان سەوزایی بۆ دەردەخەن و
هەموو ئاژەڵی کێوی لەتەنیشتی یاری دەکەن.
21 لە ژێر درەختەکانی لۆتس[b] ڕادەکشێت،
خۆی دەشارێتەوە لە نێو قامیشی زۆنگەکاندا.
22 درەختەکانی لۆتس بە سێبەرەکانیان دایدەپۆشن؛
شۆڕەبیی کەنار جۆگەکان دەوری دەدەن.
23 ئەگەر ئاوی ڕووبار هەڵبستێت یان ڕووباری ئوردونیش تەووژم بۆ دەمی بهێنێت،
ئەو دڵنیایە و ترسی لێ نانیشێت.
24 ئایا کەس دەتوانێت ڕوو بە ڕووی ڕاوی بکات،
یان بە تەڵە بیگرێت و لووتی کون بکات؟

هەروەها باسی لویاثان کراوە لە سفری اشعیاء ٢٧ – ١ دا و نوسراوە لەو ڕۆژەدا یەزدان بە شمشێرە ڕەق و گەورە و بەهێزەکەی سزای لویاثان دەدات کە مارە هەڵ هاتووە کەیە لویاثان مارە پێچ خواردووەکەیە وە ئەژدیهای دەریاش دەکوژێت

هەروەها باسی ئاژەڵی خورافیی تری زۆر سەیر سەیر کراوە لە کتێبی پیرۆزدا و ڕەخنەیان لێ گیراوە چۆن ئەو ئاژەڵە سەیرە خورافییانە لە کتێبی پیرۆزدا باس کراوە ؟ مەسیحییەکانیش ئەو پرسیارە دەکەن بۆچی لە قورئاندا باسی دایناصۆر نەکراوە ؟ خۆشتان دەتوانن لە گوگڵ بنوسن (Mythical animals in the Bible)یان بە فۆنتی عربی بنوسن( الحيوانات الخرافية في الكتاب المقدس)

وە لە بەشی وێنەكاندا بنوسن وێنەی سەیر سەیرتان بۆ دەهێنێت كە تەورات باسی كردووە . كابرای ملحد دێت گومانی ئەو مەسیحییانە بڵاو دەكاتەوە و دەڵێت بۆچی باسی دایناصۆر نەكراوە ؟ بە شەرتێك داینا صۆر هیچ كەس نەی بینیوە و نازانێت چییە ؟ هەتا ساڵی ١٦٧٧ یەكەم هەیكەلی داینا صور دۆزرایەوە لە جیهاندا . كەس نەی دەزانی دایناصۆر چییە ؟ و هەتا ئێستاش ئێمە نازانین دیناصور چییە و كەی هەبووە و كاریان چی بووە و ئایا درندەبون ماڵی بوون ؟ زیانیان هەبووە سودیان هەبووە ؟ وە لە هیچ كتێبێكیشدا باس نەكراون و ئەگەر قورئانیش باسی بكردایە هیچ لە مەوزوعەكان نە دەگۆڕرا . چونكە خەڵكی وەك ئێمە بۆ ماوەی ١٤٠٠ ساڵ دەبوو بە مشت و مڕیان دەبێت دایناصور چی بێت وە چۆن ژیا بێت و چۆن ... هتد ؟ پرسیاری تر سەری هەڵ دەدا كە نە سودی هەیە و نە زیانی هەیە بۆ مرۆڤ . وە ئێستاش ئێمە دەزانین دایناصۆر چییە ؟ لە ڕێگای ئێسكەكانیانەوە دەزانین ئەگینا باقیاتی زانیارییەكانی تر لەسەری احتمالاتی زانایانە و دانراوە و ئێمەش نازانین دایناصۆر چی بوە !؟ ئەوكەسەی سود مەندە لە دایناصور منداڵانن خۆشحاڵ دەبن بە فلیمەكانی و افلام كارتۆنەكانی

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : كاكی بێدین كاتێك تۆ شوێن ایڤلوشن دەكەویت پێمان بڵێ ئایا زەمانی نوح (ع) دایناصور هەبووە یان نەبووە ؟ئەگەر دایناصور لە قورئاندا باس بكرایە چیی لە ئیمانی تۆ دەگۆڕی ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :هەشتاوچوار

## بۆچی شمپازی نازانێت دۆڵمە دروست بكات ؟



برادەرانی پەرەسەندن دەڵێن ئەسڵی جیناتی مرۆڤ زۆر لە شمپازی یەوە نزیكە وە معتزلە دەڵێت مرۆڤ و شامپازی ئامۆزاین پسمامین كورە مامین پرسیاری بێ وەلاممان ئەمەیە بۆچی شمپازی یان هەر مەیمونێكی تر نازانێت و ناتوانێت خواردن بكوڵێنێت و لێی

بنێت وەك مرۆڤ ؟ وە ئەگەر مرۆڤ زۆربەی جینات و کار و هەڵس و کەوتی لە مەیمونەوە وەرگرت بێتبۆچی مرۆڤ فێری خواردن دروست کردن بو بە ئاگر ئەوان تا ئێستا ناتوانن سڵقاوێکی گەرمیش بۆ خۆیان دروست بکەن . کەس بۆمان نە نوسێت مەیمون سەوزە دەخوات . خۆ مرۆڤیش زۆرن بەس سەوزە دەخۆن و گۆشت ناخۆن و سەوزەکەشت زۆر جوان بۆ دەکوڵێنن و دەیخۆن.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :هەشتا و پێنج

## ئایا قورئان لە زەبورەوە وەرگیراوە ؟

**دژە ئیسلامەکان بە تایبەتی گاورەکان دەڵێن قورئان لە کتێبی داودەوە وەرگیراوە ( زەبور ) بەڵام پێش ئەوەی وەڵامیان بدەینەوە با زەبوری داودتان پێ بناسێنین بە گوێرەی سەرچاوەکانی خۆیان**

1. إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿النساء: ١٦٣﴾
2. وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَىٰ بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿الإسراء: ٥٥﴾
3. وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿الأنبياء: ١٠٥﴾

1. فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَاءُوا بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَالْكِتَابِ الْمُنِيرِ ﴿آل عمران: ١٨٤﴾
2. بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿النحل: ٤٤﴾
3. آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّىٰ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّىٰ إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿الكهف: ٩٦﴾
4. فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿المؤمنون: ٥٣﴾
5. وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ ﴿الشعراء: ١٩٦﴾
6. وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالزُّبُرِ وَبِالْكِتَابِ الْمُنِيرِ ﴿فاطر: ٢٥﴾
7. أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ ﴿القمر: ٤٣﴾
8. وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ ﴿القمر: ٥٢﴾



**پرسیارە بێ وەڵامەکان**
**بۆ هەموو دژە**
**ئیسلامەکان**

دژە ئیسلامەکان بە تایبەتی گاورەکان دەڵێن قورئان لە کتێبی داودەوە وەرگیراوە ( زەبور ) بەڵام پێش ئەوەی وەڵامیان بدەینەوە با زەبوری داودتان پێ بناسێنین بە گوێرەی سەرچاوەکانی خۆیان .

لە کتێبی پیرۆزدا هیچ شتێك نییە بە ناوی زەبورەوە !؟ بەڵکو بە مزمور یان مزامیر ناو براووە بەڵام لە نوسخە کوردییەکەیکڵێسای مسیحی کورد زماندا ناوەکەیان گۆڕیوە و لە مزامیرەوە ترجمەیان کردووە بۆ زەبورەکان وە جولەکە پێی دەڵێن تهلیم واتا تسبیحة. وە لە نوسخە عربیەکە دا بە مزامیر نوسراوە. وە لە ئینگلیزیەکەشدا نوسراوە (Psalms)

ووشەی مزمار واتا زوڕنا یان شمشاڵ یان جوزەلە . وە ئەو مزامیرانەی لە کتێبی پیرۆزدا هەیە هۆنراوە ی ئاینیە دەگوترێت لەگەڵ دەنگی زوڕنا و جوزەلە یان ئامێری تردا بۆ سوپاس گوزاریی و تسبیحاتی خودا . وە ئەم جۆرە گۆرانییانە پێش داودیش هەبووە وەك لە **سفر الخروج** ١٥ سرودی موسا و مریم . هەروەها لە **سفر القضاة دادوەران** ٥ دا سرودی دبوورە هەیە وە لە **سفری ساموێلی دوهەمدا** بەشی ١ سرودی لاواندنەوەی داود بۆ شاول هەیە . بەڵام لە پەیمانی کۆندا کتێبێکیان بە تەواوەتی ناوناوە **سفر المزامیر** بە حساب ئەم سرودانە داود گوتویەتی وە ئەم سفرە یان کتێبە پێك هاتووە لە ١٥١ بەش یان سرود بە ئیعترافی خۆیان دەڵێن لەوانەیە ٧٤ سرودی هی داود بێت . واتا لە نیوە کەمتریشی هی داودە . وە کراوە بە ٥ بەشەوە ٤١ سرودی سەرەتا ٣٧ دانەی هی داودە ٤ دانەی پێی دەڵێن سرودە هەتیوەکان چونکە نوسەرەکانی نە ناسراون ئەویش بەشی ١ و ٢ و ١٠ و ٣٣ یە بەشی دوهەمیش ٣١ سروودە واتا لە سرودی ٤٢ هەتا ٧٢ تەنها ١٨ دانەی هی داودە ٧ دانەیان هی نەوەی قۆرحە و ١ دانەی هی ئاسافە و ٤ دانەشیان هەتیون نەزانراوە کێ نوسیونی ؟؟ بەشی سێهەمیان ١٧ سرودە لە بەشی ٧٣ بۆ ٨٩ یە تەنها ١ سرودی هی داودە بەشی چوارهەمیان ١٧ سرودە واتا لە ٩٠ بۆ ١٠٦ تەنها ٢ سرودی هی داودە ١٠١ و ١٠٣ وە سرودێکی هی موسایە . ئەوەی جێگای پرسیارە سرودی ژمارە نەوەدە بۆچی سرودی موسا پەڕیوەتە زەمانی داود ؟ لەمەشیان ١٤ سرودیان هەتیون و نازانرێت کێ نوسیونی !!؟ بەشی پێنجهەمیش ٤٤ سرودە لە ١٠٧ بۆ کۆتایی تەنها ١٥ سرودی هی داودە . وە ٣٠ دانەیان هەتیون و کەس نازانێت کێ نوسیوێتی ؟ سفری مزامیر ٥٢ سرودی لە ١٥١ سرود نوسەرەکانی نە ناسراون و پێیان دەڵێن ( سرودە هەتیوەکان ) چونکە باوکیان نە ناسراون . کەواتە ٧٣ دانەی هی داودە ١٥١-٧٣ = ٧٨ دانەیان هی داود نییە . وە لەو ٧٨ دانەیەش ٥٢ یان هەتیون وە ٢٦ دانەیان هی کەسانی ترن . کەواتە ٦٠% ی مزامیرەکان لەم کتێبە پیرۆزەی ئێستای بەردەستماندا هی داود نییە بە ئیعترافی خۆیان .

ئەمیش لینکی کڵێسایە ئەو زانیاریانە مان پشت ڕاست دەکاتەوە

http://st-takla.org/Full-Free-Coptic-Books/FreeCopticBooks-002-Holy-Arabic-Bible-Dictionary/11_Z/Z_46.html

هەروەها ووشەی سەیری تێدایە وەك ( سلاه ) کە لە هیچ کام لە نوسخەکاندا ترجمە نەکراوە و خۆشیان نازانن مانای چییە ؟ دەڵێن واتا بەرزکردنەوەی دەنگی سرود بێژ و مۆسیقاکە . یان واتا سوجدە بردن بۆ خودا کاتێك دەنگی بوق و مۆسیقاکان بەرز دەکرێتەوە . یان وەستان لە سرود گوتن و خەڵکی لەو کاتەدا بێ دەنگ دەبن و بەس گوێ لە مۆسیقاکە دەگرن بۆ زاخاوی مێشك . بە هەر حاڵ خۆشیان نازانن تفسیری چییە بۆیە لە هەموو نوسخەکاندا وەك خۆی نوسیویانەتەوە ( سلاه ) بە بێ ترجمە !!؟ بەڵگەی دژە دینەکان بۆ ئەوەی قورئان لە مزمورەوە وەرگیراوە ئەم دەقەی مزموری ٣٧ دەقی ١١ یە کە تێیدا نوسراوە اما الودعاء فیرثون الارض ویتلذذون في کثرة السلامة . بە کوردی واتا بەڵام ڕۆح سوکەکان دەبن بە میرات گری خاکەکە و خۆشی لە زۆری ئاشتی

دەبینن وە دەڵێن لە ئایەتی ١٠٥ ی سورة الانبیائدا نوسراوە (**و لقد کتبنا في الزبور من بعد الذکر ان الارض یرثها عبادي الصالحون**) . هەربە شێوەیەکی ئاسایی و بێ ترجمە و تفسیر سەیری ئەو دوو دەقە بکەن نە لە دوور و نە لە نزیك لە یەکتری ناچن عەبدە ساڵحەکان و ڕۆح سوکەکان دەبنە میرات گری زەویەکە واتا زەویەکە دیاری کراوە زەوییەکی تایبەتە نەك هەموو سەر زەوی ؟ بەڵام لە قورئاندا دەڵێت هەموو زەوی زبور واتا پارچەیەك لە شتێك وە بە کۆ پێی دەڵێن ( زبر ) لە سورەتی **المؤمنین** ٥٣ دا دەفەرموێت( **فتقطعوا امرهم بینهم زبرا**) واتا بوون بە چەند پارچەیەکەوە . هەروەها لە سورەتی **الكهف** ٩٦ دا ذو القرنین دەڵێت (**اتوني زبر الحدید**) واتا پارچە ئاسنەکانم بۆ بهێنن . هەروەها زەبور بەس بۆ داود نە هاتووە لە سورەتی **القمر** ١٨٤ دا دەفەرموێت (**فان کذبوك فقد کذب رسل من قبلك جاؤوا بالبینات و الزبر**) . واتا نێرراوانی پێش تۆش پارچەیان لە کتێبەکان بۆ هاتوە با ئێستا بزانین خودا چیی داوە بە داود ؟ لە سورەتی **الاسراء** ٥٥ دا دەفەرموێت (**و اتینا داود زبورا** ). دیقەت بدەن ئایەتەکە بە بێ ( ال التعریفه ) ناڵێت الزبور . دەڵێت زبورا واتا بەشێك لە کتێب نەك هەموو کتێبەکان . وە سەیری سورەتی **الشعراء** ١٩٦ بکەین دەفەرموێت (**و انه لفي زبر الاولین** ). باسی قورئان دەکات دەڵێت لە بەش بەشی کتێبەکانی پێش تۆدا هەیە . بەڵام هیچیان کتێب نین بەڵکو بەشێکن لە کتێب .

بەڵام قورئان کتێبە چونکە لە سورەتی **المائدة** ٤٨ دا دەفەرموێت

( وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمانەیە** : بە چی حسابێك دەڵێن ئەم ١٥١ سرودە زەبورن لە کاتێکدا بە ناوی زەبور نەهاتووە لە کتێبی پیرۆزدا ؟ چۆن قورئان لە سرودەوە وەر دەگیرێت ؟ خۆ مزامیرەکان هیچ شەریعەتێکی تێدا نییە هەر هەمووی گۆرانی و سرود و نزا و پاڕانەوەیە !! پاشان چۆن بزانین ئەم ١٥١ سرودە هی داودن لە کاتێکدا ٧٨ دانەیان هی داود نییە !؟ وە بەڵگە چییە ئەو ٧٣ سرودەی بە حسابی خۆتان دەڵێن هی داودە ... کێ دەڵێت هی داودە لە کاتێکدا ٦٠% ی سرودەکان هەتیوون ؟ پاشان ناوی زبور یان زبر لە کتێبی پیرۆزدا بوونی نییە

سەیری وێنەکە بکەن لە ٦ ئایەتدا باسی ( زبر ) واتا زەبورەکان دەکات : ال **عمران** ١٨٤ وە **النحل** ٤٤ وە **الشعراء** ١٩٦ وە **فاطر** ٢٥ وە **القمر ٤٣** و ٥٢ وە هەر هەموویان بە کۆن و دەڵێت زەبورمان بۆ پێغەمبەرانی پێش ئێوەش ناردووە بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر قورئانیش ئایاتی تێدا بێت لە زەبورەکانی واتا بەشێك لە کتێبەکانی پێش قورئاندا نوسرا بێت چونکە هەر هەموو پێغەمبەران و کتێبەکانیان و بەشێك لە کتێبەکانیان سەرچاوەیان یە ك خودایە وە ئەوە نابێت بە ڕەخنە بۆ قورئان

کۆتا پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە : فەرموون بۆمان بسەلمێنن زەبور لە کتێبی پیرۆزدا باس کراوە یان پێمان بڵێن چی دەقێك دەڵێت داود زەبوری هەبوە ؟ یان زەبور یان زبر بە مانای کتێبەکان یان بەشێك لە کتێبمان بۆ دەر بهێنن لە کتێبی پیرۆزدا . ئەگەر نەتان توانی و ناش توانن زەبورمان بۆ بهێنن لە کتێبی پیرۆزدا دڵنیاش بن ئەو گومانەتان وەك ژیانتان پوچەڵە و بە فەزڵی خودا ئەم گومانەشمان پوچەڵ کردنەوە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :هەشتا و شەش

## پینە و پەڕۆی ئیسلامیەکان چییە ؟

# پینە و پەڕۆی ئیسلامیەکان چییە

ئایا دەکرێت ڕەخنە لە کیمیا و پێکهاتە کیمیاییەکان بگریت لە کاتێکدا تۆ دوکانی کۆنە فرۆشیت هەیە و هیچ لە کیمیا نازانیت بۆچی یەکێك قسەیەك یان بوختانێکت بۆ بکات واز نا هێنیت و داوای بەڵگە دەکەیت هەتا ڕاستیەکان ڕون ببێتەوە ؟ ئەی بۆچی ئێمە پینە و پەڕۆ بکەین بۆ بوختان و نە شارەزاییەکانی جەنابت دەر بارەی ئاینی ئیسلام ی مەزن ؟ کێ خۆی زۆر بە شارەزا دەزانێت و دەڵێت ئیسلام پینە و پەڕۆ دەکات با بێت و ڕو بە ڕو بونەوەیەك بکەین بزانین ئێمە پینە و پەڕۆ دەکەین یان تۆ چەواشەکاری دەکەیت ؟ وە رازی نیت بەوەی ڕاستییەکان ببینیت ؟

پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان







ئاینی مەزنی ئیسلام دژی زۆرن وە ئەم دوژمنانە هەر هەموویان ڕەخنە لەم شاخە لوتکە بەرزە دەگرن و هیچیان ناتوانن بگەنە دامێنیشی . بەڵگەشمان ئەوەیە ١٤٠٠ ساڵە لە برەو زیاد بوندایە و لوتکەکەی بەرزتر و سەخت تر دەبێت کێشەی دژە ئیسلامەکانیش لەوەدایە سەرچاوەی ڕەخنەکانیان هەر سەرچاوە کانی خۆمانە و هیچ سەرچاوەیەکی خۆیان نییە پشتی پێ ببەستن بە درێژایی ١٤٠٠ ساڵ وە فێڵ و مەکریان لەوەدایە سەرجاوەکانمان دەبڕن و ئەو بەشەی دەکەن بە ڕەخنە کە خۆیان دەیانەوێت و بڵاوی دەکەنەوە . وەك ئەوە وایە لە هەر کتێبێك یان کتابێکی فەرمانگەیەك بڕگەیەك یان دێڕێك وەر بگریت و باقیاتەکەی دەر

نەخەیت بەو شێوەیە ئەو لاپەڕەیە لەو کتێبە مانای نابێت ئەگەر پاش و پێشی لاپەڕەکە نەخوێندرێتەوە یان ئەو بڕیارە لەو فەرمانگەیە بەشێکی وەر بگریت و باقیاتەکەی نە خوێندرێتەوە ئەو فەرمان بەرە کارەکەت بۆ ناکات و دەڵێت بەڕێزم هەمووی بخوێنەوە دێڕی دوای ئەوە نوسروە شمولی تۆ ناکات . دژە ئیسلامە کانیش بە هەمان شێوە یاری بە سەرچاوەکانمان دەکات و دەڵێت ئاینی ئیسلامم پوچەڵ کردەوە . داماو تۆ خۆت هەڵ دەخەڵەتێنیت و یاری بە هزری خۆت دەکەیت و ئەگەر ڕاست دەکەیت حەدیسەکە یان ئایەتەکە هەمووی دا بنێ وە پاش و پێشەکەشی دا بنێ بزانین هەمان مانای تۆ دەبەخشێت ؟ یان وەك منداڵ یاری بە لم دەکەیت و منداڵێك پێی پێدا بنێت خانووە لمیەکەت تێك دەچێت یان نا ؟ کاتێکیش ئێمە ڕون کردنەوە دەدەین و سیاقی ئایەتەکان یان حەدیسەکە بە تەواوی دەخوێنینەوە بۆیان ئەو کات تاوان بارمان دەکەن بەوەی ئێمە پینە و پەڕۆ دەکەین . ئەی بۆچی دان بە ڕاستیەکاندا نا نێیت و هەست بە درۆ و چەواشەکارییەکانت بکەیت و پەشیمان بیتەوە لەو درۆ و چەواشەکارییانەی کردوتە ؟ کاتێك ڕوداوێك ڕوو دەدات ئێمە هەر یەکە و لە ئاستی خۆمانەوە شیکاریی بۆ دەکەین کەسمان نازانین چۆن ڕوی داوە و کێ کردوێتی !؟ بەلام کاتێك پۆلیس یان ئاسایش دێت و بە دوادا چونی بۆ دەکات دەزانێت کێ و چۆن کردوێتی . ئایا ئاسایش و پۆلیس پینە و پەڕۆ دەکەن یان سارەزا و بەدواداچون بۆ ڕوداوەکە دەکەن و بە گوێرەی بەڵگەکان ڕاستیەکان دەدزۆزنەوە ؟ کاتێك کەسێك قسەیەك بە دەم تۆ یان خێزانت یان خوشکت دەکات یان تاوان بارت دەکات بە شتێك . هەڵوێستی تۆ چی دەبێت ؟ ئایا بێ دەنگ دەبیت یان بە دوای قسەکەدا دەڕۆیت ؟ وە بە گوێرەی قسە و بەڵگەکان کە لەسەرت کراوە بەدواداچوون دەکەیت ؟ ئەگەر بەرامبەرەکەت تاوان بارت بکات بڵێت تۆ پینە و پەڕۆ دەکەیت . ئایا بێ دەنگ دەبیت یان دەچیتە جاویەوە و داوای ڕاستیەکانی لێ دەکەیت و بۆ تۆ و بۆ خەڵکیی بسەلمێنێت ئەو ڕاستە ؟

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمەیە** : بۆچی دەبێت ئیمە پینە و پەڕۆ بکەین لە کاتێکدا تۆ سەرچاوەکانمان تێك دەدەیت و دەی بڕیت و بە ئارەزوی خۆت شیکاریی بۆ دەکەیت ؟ ئایا حەقی خۆمان نییە ئێمەش بڵێین ئادەی کاکی چەواشە کار بێزەحمەت بەڵگەیەکمان بۆ بهێنە ؟ئایا پینە و پەڕۆ دەکەین کاتێك دەڵێین ئادەی حەدیسەکە بە تەواوەتی بخوێنەوە و خۆشت بۆمان راڤە بکە بزانین ئەو مانایە دەبەخشێت کە تۆ دەهۆڵی بۆ لێ دەدەیت ؟ ئایا حەقی خۆمان نیە بڵێین ئادەی کاکی برا وەرە پێمان بڵێ فلان ڕستە یان فلان ووشە مانای چییە ؟ لە کاتێکدا تۆ عەرەبی نازانیت و ناتوانیت ڕاڤە ی بکەیت یان **پێنج** دەقە بە عەرەبی قسە بکەیت ڕەخنە لە چی دەگریت ؟ئایا دەکرێت ڕەخنە لە کیمیا و پێکهاتە کیمیاییەکان بگریت لە کاتیکدا تۆ دوکانی کۆنە فرۆشیت هەیە و هیچ لە کیمیا نازانیت . بۆچی یەکیك قسەیەك یان بوختانێکت بۆ بکات واز نا هێنیت و داوای بەڵگە دەکەیت هەتا ڕاستیەکان ڕون ببێتەوە ؟؟ئەی بۆچی ئێمە پینە و پەڕۆ بکەین بۆ درۆ و بوختان و نە شارەزاییەکانی جەنابت دەربارەی ئاینی ئیسلامی مەزن ؟ ئادەی کێ خۆی زۆر بە شارەزا دەزانێت و دەڵێت ئیسلام پینە و پەڕۆ دەکات با بێت و ڕوو بە ڕوو بونەوەیەك بکەین بزانین ئێمە پینە و پەڕۆ دەکەین یان تۆ چەواشەکاری دەکەیت ؟ وە رازی نیت بەوەی ڕاستییەکان ببینیت ؟ئایا مایەی شەرمەزاری نییە بۆ بەرامبەرەکەت

كاتێك ئەو كەسە بە درۆ دەخەیتەوە كە بوختانی بۆ كردویت یان قسەی بۆ خۆت یان بۆ یەكیك لە خێزانەكەت هەڵ بەستووە ؟ئایا مایەی سەر بەرزی و ژیری و لۆژیك و تێگەیشتن نییە . كاتێك تۆ ڕەخنەیەك لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگریت و بەرامبەرەكەت بۆت ڕوون دەكاتەوە لە كوێدا كەوتویتە هەڵەووە !؟ تۆش دان بە ڕاستیە كاندا بنێیت و بە خۆتدا بچیتەوە . بەلام تۆ بۆ ئەوەی شكستی خۆت بشاریتەوە دەڵێیت پینە و پەڕۆكانتان تەواو نابێت ئەی بۆچی بەوە ڕازی نابیت كابرای بەرامبەرت پێت بڵێت پینە و پەڕۆ دەكەیت كاتیك تۆ بە دوای ئەو قسەیەدا دەڕۆیت كە بۆت هەڵ بەستراوە ؟

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :هەشتا و حەوت

## اقرا مانای چییە ؟

وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿الأعراف: ٢٠٤﴾
فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿النحل: ٩٨﴾
5. وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَابًا مَسْتُورًا ﴿الإسراء: ٤٥﴾

بەشی یەكەم باسی خوێندنەوەی قورئان دەكات لە كاتێكدا خەڵكێكی زۆر نابینان یان نەخوێندەوارن نازانن كتێب و ووشە چییە ؟

بەشی دوهەم باسی ڕۆژی دوایی دەكات و خەڵكی نەخوێندەوار چۆن سجلی اعمالیان دەخوێننەوە ؟

بەشی سێیەم باسی خوێندنەوەی جبریل و پێغەمبەر (د.خ) دەكات ئایا كتێبیان پێ بووە ؟

اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿الإسراء: ١٤﴾
6. يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَأُولَٰئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَابَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿الإسراء: ٧١﴾

سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنْسَىٰ ﴿الأعلى: ٦﴾
فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ﴿القيامة: ١٨﴾
وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنْزِيلًا ﴿الإسراء: ١٠٦﴾

دژە ئیسلامەكان دەڵێن ئەگەر پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) نە خوێندەوار بووە بۆچی جبریل پێی گوتوە اقرا واتا بخوێنەوە ؟ جبرائیل چی كتێبێكی داوە بە پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەتا لێی بخوێنێتەوە ؟ بەڵام نە شارەزای و نەزانیی دژە ئیسلامەكان لە زمانی عەرەبیدا وا دەكات بە هەڵە لە قسەكان تێ بگەن . چونكە زانینی و راڤە كردنی هەر ووشەیەك لە هەر زمانێكدا بێت دەبێت بگەڕێینەوە بۆ فەرهەنگە گەورە و باوەڕ پێ كراوەكانی ئەو زمانە وە وشەی ( قرأ ) واتا ( جَمَعْتُهُ وضَمَمْتُ بعضَه إلى

بعض ) بە کوردی واتا کۆ کردنەوە و دانانی بەشەکانی پێکەوە . خۆشتان دەتوانن لە معجمی عەرەبیدا بگەڕێن بۆ مانای اقرا بەس تکایە کەس قاموسی کلماتم بۆ دا نەنێت بڕۆن لە معجمدا ماناکەی دەربهێنن

وە خوێندنەوەش لە زمانی عەرەبیدا واتا گوتنی شتێك و پاشان هەموی پێکەوە کۆ بکرێتەوە و لێك بدرێت وە پێویست ناکات کەسەکە خوێندەوار بێت . کاتێکیش جبریل پێی گوتووە اقرا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ شتێکی لا کۆ نەبوەتەوە هەتا بتوانێت بە بە جبریلی بڵێت بۆیە پێی گوتووە ما انا بقارئ واتا هیچم لا کۆ نەبووە هەتا بە تۆی بڵێم .

هەروەها قراءة بە مانای گەیاندنی قسەیەك لە لایەن کەسێمەوە بۆ کەسێکی تر لە ڕێگای کەسێکی ناوەندە وە بۆ نمونە دەڵێن ( فلان يقرئك السلام ) واتا فڵان سەلامت لێ دەکات . ئەگەر بە قسە و تێگەیشتن و راڤەی دژە ئیسلام بێت دەبێت ئەو سەلامە لە نوسینێکدا بێت . بەلام لەبەرکتێ نییە و گەیاندنی سەلامە.

هەروەها قراءة بە مانای تلاوة دێت . قراءة القران تلاوة القران شەرت نییە لەبەرکتێبێك بخوێنرێت چونکە چەندەها مەلای نابینامان هەیە هەرکتێبیشیان نە بینیووە و خوێندەوار نین هەموو قورئانت بۆ دە خوێنن لەبەر وە پێیان دەڵێن ( القارئ فلانى کوڕی فڵان )

کەواتە ئێستا قراءة و تلاوة مان هەیە . خوێندنەوەش دوو جۆرن یان دەبێت کابرا خوێندەوار بێت و لەسەر کتێبێك بیخوێنێتەوە ! یان بۆی بخوێننەوە پێی دەڵێن تلاوة . ئەو کەسەش کە دەیخوێنێتەوە یان ئەو کەسەی بۆی دەخوێنێتەوە پێی دەڵێن ( قارئ ) وە جبريل قاریئ پێغەمبەر بوە عليهما السلام . هەروەها لە ئایەتی ١٢١ ی بقرەدا دەفەرموێت (**الذين أتيناهم الكتاب يتلونه حق تلاوته**) . لێرەدا باسی اهل الكتاب دەکات خۆ ئەو زەمانە ئەوانیش زۆرینەیان نەخوێندەوار بوون و کتێبەکانی خۆشیان بە جوانی لەبەر بووە و خوێندویانە گرنگ ئەوەیە ووشەکان وەك خۆی بڵێنەوە ،هەروەها عەرەب دەڵێن قرات الفقه على يد شيخ فلان واتا وانەی فقە لای فڵان شێخ فێر بووم وە قراءة بە مانای فێربونیش دێت . هەروەها دەڵێن قرات عين فلان واتا چاویم خوێندەوە زانیم کاری خراپ دەکات خۆ چاو کتێب نییە بخوێنرێتەوە ؟ یان دەڵێن دڵیم خوێندەوە یان دەفتەری سنگمت بۆ بکەمە ئینجا بیخوێنە وە دەزانیت چی لە دڵمدایە . وە خوێندنەوە شەرت نیە هەر لە کتێب بێت . بۆ نموونە با هەر ئایەتەکانی قورئان بکەین بە بەڵگە بۆ قسەکانمان وە سەیری وێنە کە بکەن ئایەتەکانمان بۆ داناوون

**لە بەشی یەکەمی وێنەکەدا : ئایەتی ٢٠٤ ی الاعراف وە ٩٨ ی النحل وە ٤٥ ی** الاسرائدا باسی خوێندنە وەی قورئان دەکات قرئ وە دوو جار قرات . ئەگەر قورئان خوێنرا گوێی لێبگرن ئەگەر قورئانت خوێند پەنا بەرە بۆ خودا ئەگەر قورئانت خوێند بەربەست لە نێوان تۆ و بێ باوەڕاندا دادەنێین .... خۆ کاتی صحابەکان هیچیان خوێندەوار نەبوون سەیری چی کتێبێکیان دەکرد

دەیان خوێندەوە زۆر خەڵکی تریش لە باو باپیرانمان خوێندەوار نین و نوێژ دەکەن و قورئانیش دەخوێنن زۆر نا بینا قورئان دەخوێنێت هیچ کتێبێکیشی لا نیە

**لـە بەشــی دووەمــی وێنەکــەدا** : ئایەتی ١٤ و ٧١ ی **الاسرائدا** باسی ڕۆژی دوایی و حساب دەکات کاتێك خەڵکی ملفی کارەکانیان دەدرێتە دەست و دەڵێت ئەوە کارەکانتە بیخوێنەوە کارەکانی خۆت شایەتیت لەسەر دەدەن . خۆ خەڵکانێکی زۆر نە خوێندەوارن چۆن سجلی اعمالیان دەخوێننەوە ؟ یان کابرا خۆی دەزانێت چیی کردووە و خوێندنەوە بۆ کارەکانی دەکات و کارەکانی دێتەوە بیری و هەموی کۆ دەکاتەوە و لەپاڵ یەکتریدا دای دەنێت وەك لە سەرەوە باسمان کرد مانای اقرا واتا جَمَعْتُه وضَمَمْتُ بعضَه إلى بعض

**لـە بەشــی سـێەمی وێنەکـەدا** : سورەتی **الاعلى** ٦ دەفەرموێت بۆت دەخوێنینەوە لە بیری مەکە وە سورەتی **القيامة** ١٨ دا دەفەرموێت ئەگەر خوێندمانەوە گوێمان لێ بگرە یان شوێن ئایەتەکان بکەوە . ئایا جبریل کتێبی پێ بوو بۆی دەخوێندەوە ؟

هەروەها لە سورەتی **الاسراء** ١٠٦ دا دەفەرموێت : قورئانێك ڕوونمان کردوەتەوە بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی بخوێنیتەوە . ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کتێبی پێ بوو بۆی دەخوێندنەوە یان لەسەر کتێب قورئانی بۆ دەخوێندن ؟ خۆ ئەو نەخوێندەوار بووە؟.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :هەشتا و هەشت

## ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە خۆر گیران ترساوە

### ڕۆژگیران لە ئیسلامدا چییە ؟

ئەمەیان حەدیسی خسوفە گومانی لێ دروست کراوە

خُسفت الشمسُ، فقام النبيُّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ فزعًا، يخشى أن تكون الساعةُ، فأتى المسجدَ، فصلى بأطولِ قيامٍ وركوعٍ وسجودٍ رأيتُه قطُّ يفعله، وقال : هذه الآياتُ التي يرسلها اللهُ، لا تكون لموتِ أحدٍ، ولا لحياتِه، ولكن يخوف اللهُ بها عبادَه، فإذا رأيتم شيئًا من ذلك، فافزعوا إلى ذكرِه ودعائِه واستغفارِه . الراوي : أبو موسى الأشعري عبدالله بن قيس / المحدث : البخاري / المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم: 1059 خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

ئەمەیان حەدیسی کسوفە

انكسَفَتِ الشمسُ يومَ ماتَ إبراهيمُ ، فقال الناسُ : انكَسَفَتْ لموتِ إبراهيمَ . فقال رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم : إن الشمسَ والقمرَ آيتان من آياتِ اللهِ ، لا ينكَسِفان لموتِ أحدٍ ولا لحياته ، فإذا رأيتموهما فادعوا اللهَ وصلُّوا حتى يَنْجَلِيَ . الراوي : المغيرة بن شعبة / المحدث : البخاري / المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم: 1060 / خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

ئەم بەشەی خوارەوە ڕاڤەی ووشەی ( فزع ) ە

ويقال: فلان مَفْزَعةٌ، بالهاء، يستوي فيه التذكير والتأنيث إذا كان يُفْزَعُ منه.
وفَزِعَ إليه: لَجَأَ، فهو مَفْزَعٌ لمن فَزِعَ إليه أي مَلْجأٌ لمن التَجَأَ إليه.
وفي حديث الكسوف: فافْزَعُوا إلى الصلاة أي الجَؤُوا إليها واستَعِينُوا بها على دَفْعِ الأَمر الحادث.
وتقول: فَزِعْتُ إليك وفَزِعْتُ مِنْكَ ولا تقل فَزِعْتُكَ.
والمَفْزَعُ والمَفْزَعةُ: الملجأُ، وقيل: المفزع المستغاث به، والمفزعة الذي يُفزع من أجله، فرقوا

وفلان مَفْزَعُ الناس وامرأة مَفْزَعٌ وهم مَفْزَعٌ: معناه إذا دَهَمَنا أمر فَزِعْنا إليه أي لَجَأْنا إليه واستغثنا به.
والفَزَعُ أيضاً: الإغاثة؛ قال رسول الله، صلى الله عليه وسلم للأنصار: إنكم لتكثرون عند الفَزَع وتَقِلُّونَ عند الطمَع أي تكثرون عند الإغاثة

دژە ئیسلامەکان دەڵێن محمد (صلى الله عليه و سلم ) نەی زانیوە ڕۆژگیران چییە و لێی ترساوە . وە ئێستا خەڵکی دەزانێت ڕۆژ گیران چییە و کەی ڕوو دەدات بۆچی لێی بترسین ؟ سەرەتا باسی زانینی ڕۆژگیران دەکەین خەڵکی زۆر پێش هاتنی ئیسلام زانیویانە ڕۆژ گیران چییە و کەی ڕوو دەدات وە حسابی فلك ناسییان زۆر پێش هاتنی ئیسلام زانیوە . چونکە جاران ڕۆژژمێر و حسابات نە بووە بۆیە خەڵکی بە هۆی فەلەك ناسیەوە کاتی کشتوکاڵەکانیان و سەفەرەکانیان و زۆر شتی تریشیان بەهۆی ئەستێرە ناسی و عیلمی فەلەکەوە زانیوە . هەروەها هیچ دەقێکیش نییە لە ئاینی مەزنی ئیسلامدا ڕۆژ و مانگ گیران ڕەت بکاتەوە بۆیە لەسەر زانینی ڕۆژگیران ناڕۆین و ڕۆژگیران خەڵکی زۆر لە مێژە زانیویانە وە بۆ ترسی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لێرەدا دوو خاڵ ڕون دەکەینەوە بۆ ئەوەی ئێوەش شارەزای چۆنێتیی ئاستی چەواشەکاریی دژە ئیسلامەکان ببن

**یەکەمیان** حەدیسەکە وەك لە وێنەکەدا دەبینن صحيحه و نوسراوە فقام النبي (صلى الله عليه و سلم) فزعا ئەمان هاتون بە ترسان ڕاڤەیان کردووە . بەڵام ئەگەر لە معجمی عربیدا بگەڕێین فزع واتا پەنای بردووە بۆ !؟ وە کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بینیویتی ڕۆژگیراوە پەنای بردوە بۆ نوێژ نەك لە ڕۆژگیران ترسا بێت وە لە زمانی عەرەبیدا بە ( ملجآ ) دەڵێن مفزع واتا ئەو شوێنەی خەڵکی پەنای بۆ دەبەن لە ناخۆشیدا دەتوانن سەیری وێنەکە بکەن ڕاڤەکەیمان داناوە لە معجمی عربییەوە ئەمەش لینکی گەورەترین معجمی عربیە و خۆشتان دەتوانن بە دوادا چوونی بۆ بکەن

http://www.baheth.info/index.jsp

**خاڵی دووەمیان** کە لە هەمووی گرنگ ترە ئەویش ووشەی ( خسوف و کسوفه ) ووشەکە بە گشتی بۆ مانگ و بۆ ڕۆژیش بەکار دەهێنرێت پێکەوە . وە کاتێك بە زمانی غەیرە عەرەبی ڕاڤە دەکرێت دەڵێن مانگ یان ڕۆژگیران لە هەموو زمانێکدا بە گیران ڕاڤە دەکرێت ، بەڵام فەرقی زۆر هەیە لە نێوان خسوف و کسوفدا خسوف لە خسفەوە هاتووە واتا ڕۆچوون و دیار نەمان . کاتێك شتێك دەچێت بە ناخی زەویدا و چیتر ئێمە ناتوانین بی بینن پێی دەڵێن خسف چونکە ئەو شتە چوەتە ناخی زەویەوە و لای ئێمە دیار نییە و نا بینرێت وە . لە قورئاندا ٨ جار باسی خسف کراوە لە سورەتی **النحـــل** ٤٥ و **الاسـســـراء** ٦٨ دا و **القصـــص** ٨١ و ٨٢ و **العنكبوت** ٤٠ و **سبآ** ٩ و **القيامة** ٨

وە کسوف لە کسفەوە هاتووە کسف واتا پارچەیەك لە شتێك وە هەروەها لە زمانی عەرەبی بە پینە دەڵێن کسف چونکە پارچەیەکە لە قوماشێك . وە لە پێنج شوێندا باسی کسف کراووە لە سورەتی **الاسـراء** ٩٢ و **الشـعراء** ١٨٧ و **الـروم** ٤٨ و **سـبآ** ٩ و **الطـور** ٤٤ . پاش ئەوەی مانای خسف و کسفمان زانی . ئێستا بە باشتر و ڕونتر لە مانای ڕۆژ و مانگ گیران دەگەین . وەك گوتمان بۆ هەردووکیان خسف و کسف بەکار دەهێنرێت و کێشە نییە . بەلام ئەوەی زیاتر بەکار دەهێنرێت ووشەی خسف بۆ مانگ بەکار دەهێنرێت وە ووشەی کسف بۆ ڕۆژ بەکار دەهێنرێت . هۆکارەکەشی نێر و مێیە و لە هەمووی گرنگ تریش ئەمەیە.

مانگ لە شەودا هەڵ دێت و کاتێك دەگیرێت تاریك دەبێت واتا ئاسمان خۆی تاریکە و مانگەکەش تاریك دەبێت وە دیار نامێنێت لەبەر چاومان . وە ئەگەر مانگ بە تەواوەتی نەگیرێت و بەشێکی یان پارچەیەکی بگیرێت و بتوانین ڕۆشناییەکەی ببینین پێی دەگوترێت کسف یان کسوف القمر. **بەڵام** کاتێك ڕۆژ بگیرێت هەر چۆنێك بگیرێت چونکە تیشکەکەی بەهێزە ئێمە دەتوانین ببینین و دنیا تاریك نابێت پێی دەڵێن کسف یان کسوف الشمس . بەڵام کاتێك بە تەواوەتی بگیرێت و لەبەر جاومان دیار نەمێنێت و دنیا تاریك ببێت و ڕۆژەکە بشاررێتەوە پێی دەڵێن خسف . وەك چۆن لە سەرەوە باسمان کرد شتێك بچێت بە ناخی زەویدا لێمان دیار نەمێنێت پێی دەڵێن خسف . وە ئەو جۆرە ڕۆژ گیرانانەش کە ڕۆژەکە دیار نامێنێت و دنیا تاریك دەبێت پێی دەڵێن خسف

وە ئەو گومانەش کە دروست کراوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیة و سلم) ترساوە یان نەیزانیوە ڕۆژ گیران چییە ؟ خسف بووە دەقی حەدیسەکەش وەك لە وێنەی پۆستەکەدا دەیبینن دەڵێت خسف الشمس واتا بە تەواوەتی ڕۆژ دیار نەماوە و تاریك بووە . پێغەمبەریش (صلی الله علیە و سلم) چووە بۆ مزگەوت و خەڵکیی کۆ کردوە تەوە و نوێژیان کردووە . وای زانیووە قیامەت هەڵ دەستێت پاش ئەوەی ڕۆژ گیرانەکە لا چووە فەرموو یەتی ئەم جۆرە نیشانانە واتا ڕۆژ گیران یەکێکە لە نیشانە ی خودا و ڕوو نادات لەبەر مردن یان لە دایك بونی کەسێك . بەڵکو خودا بەندەکانیی پێ دەترسێنێت . ئەگەر شتی واتان بینی ( **فافزعوا الی ذکره و استغفاره** ) واتا پەنا بەرن بۆ زیکر و استغفاری خودا . وە فزع ئەگەر بە مانای ترس بێت دەبێت ڕاڤە بکرێت بەوەی بترسن بۆ زیکر و استغفاری خودا و ئەمەش هەڵەیە کەواتە فزع بە مانای ترس نایەت . کەواتە ئەم ترسەیان لە کوێوە هێنا ؟ ئەگەر دیقەت بدەن لە حەدیسەکە دا دەفەرموێت **( و لکن یخوف الله بها عباده** ) واتا ( خسف ) خودا عەبدەکانی پێ دەترسێنێت لێرەدا ئاگا دار بن دەفەرموێت ( خسف ) خودا عەبدەکانی پێ دەترسێنێت . وە دەقی حەدیسەکەش دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) وای زانیوە قیامەتە . هەموومان دەزانین یەکێك لە نیشانەکانی ئاخر زەمان لە سورەتی **التكوير** ١ دا دەفەرموێت ( **اذا الشمس كورت** ) واتا ئەگەر ڕۆژ ڕۆشنایی نەما و دیار نەما ئەوە نیشانەیە بۆ ئاخر زەمان

وەك لە سەرەوە باسمان کرد خسف واتا دیار نەمان و بزر بوون . وە ئەو کاتەش ڕۆژ دیار نەماوە و بزر بووە و دنیا تاریك بووە و ئەو ئایەتەی سورەتی تکویریش بەڵگەیە بۆ ئاخر زەمان . وە ئەگەر ئێستاش ڕۆژ بەو شێوەیە بگیرێ و سەر زەوی تاریك بکات دڵنیا بن بێدین و ملحدەکان لە موسوڵمانەکان زیاتر دەترسن وە حەدیسەکەش دەفەرموێت ئەوە نیشانەیە بۆ ئاخر زەمان و ترسانی عەبدەکان بۆ گەڕانەوە بۆ لای خودا . کەواتە ترسی پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) لەوە نەبووە نەزانێت خۆر گیران چیە ؟ یان نەی زانی بێت خۆر گیران چییە ؟ بەڵگەشمان حەدیسێکی ترە لە وێنەی پۆستەکەدا دانراوە دەفەرموێت انکسفت الشمس . دیقەت بدەن لێرەدا ( کسفە ) نەك ( خسف ) واتە پارچەیەك یان تۆزێك لە ڕۆژ گیرا ئەو ڕۆژەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) مرد . خەڵکی دەیان گوت بۆیە ڕۆژ گیرا چونکە ابراهیم مردووە پێغەمبەریش (صلی الله علیة و سلم) فەرمووی مانگ و ڕۆژ دوو نیشانەی خودان واتا ڕۆژانە دەیان بینین هەڵ دێن و ئاوا دەبن . ناگیرێن بۆ مردن و لە دایك بوونی هیچ کەسێك ئەگەر بینیتان گیران دوعا

بکەن هەتا بەردەبێت . دیقەتی هەردوك حەدیسەکە بدەن لە هەردوکیاندا باسی ئەوە دەکات ناگیرێن بۆ مردن و لە دایك بوونی کەسێك . بەلام لە خسوفەکەدا کە دنیا تاریك بووە دەڵێت خودا عەبدەکانی پێ دەترسێنێت وەك باسمان کرد نەمانی ڕۆشنایی ڕۆژ عەلامەتی ئاخرزەمانە بەلام لە حەدیسی دوهەمیاندا کە ( کسوفە ) ناڵێت خودا عەبدەکانی پێ دەترسێنێت . خۆ لە هەردوك حاڵە تەکەدا ڕۆژ گیراوە . ئەگەر بڵێین دژە دین ڕاست دەکات و پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ترساووە ؟ بۆچی لە کسوف نە ترساوە و بۆچی لە خسوف ترساوە ؟ خۆ دەبوایە لە کسوفیش بترسایە ؟

پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە : ئایا فزع بە مانای ترس دێت ؟ ئەگەر بە مانای ترس دێت ئایا **فافزعوا الى ذكر الله و دعائه** مانای چیە ؟ ئەگەر بە گوێرەی ڕاڤە وتێگەیشتنی ئێوە بێت واتا بترسن لە ناو هێنان و دوعا کردن بۆ خودا ؟ ئایا ئەو ڕاڤە کردنە هیچ مانایەك دەبەخشێت ؟ بۆچی لە خسوفدا باسی ترسی کردووە و لە کسوفدا باسی ترسی نە کردووە ؟ بۆچی نوێژی خسوف جیاوازە لە نوێژی کسوف ؟ بۆچی کاتێك مانگ دەگیرێت هیچ نوێژێکی بۆ ناکرێت ؟ بەلام بۆ ڕۆژگیران نوێژ دەکرێت ؟ ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بترسایە لە مانگ و ڕۆژ گیران و نەی زانیایە چییە ؟ بۆچی لە کاتی مانگ گیرانیشدا نە دەترسا ؟ بۆچی لە حەدیسی کسوفدا باسی مانگ و ڕۆژی پێکەوە کردووە ؟ بەڵام لە حەدیسی خسوفدا بەس باسی ڕۆژی کردووە ؟ چونکە خسوف یەکێکە لە ئایەت و نیشانەکانی ئاخرزەمان وەك لە سەرەوە باسمان کرد.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :هەشتا و نۆ

## فیرعەون و میز و ناسا

مرۆڤ بە گشتی میز دەکات و کارێکی ئاساییە لە لامان . بەڵام کەسمان بیرمان لەوە نە کردوەتەوە : ئایا ئەگەر لە سەرزەوی دەرچین میز دەکەین وە کاریگەری ئەو میزە چیی دەبێت لەسەرلاشەمان وە چۆن ئاومان دەست دەکەوێت بیخۆینەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر میز بکەینەوە ؟ ملحد و بێدینەکان دەڵێن زانست پێش کەوتوە و پێویستیمان بە خودا نیە !! لەگەڵ ئەوەشدا فەخر و شانازی بە ناساوە دەکەن کە دەتوانێت بچێتە دەرەوەی زەوی . بەڵام لە بێدین ئەوەی لە یاد کردوە کاتێك دەچن بۆ وێستگەی میر ی ئاسمانی ئەو کەشتیەوانانە پێویستییان بە ئاوە بۆ خواردنەوە و میزەکەیان زیانیانیان لێ دەدات ئەم بابەتە بۆ ئەوە نیە بڵێین ناسا کاری باشی نەکردوە یان کارەکانی وەلا بنێین . بەڵکو بۆ هەڵ سەنگاندن ی هزر و ڕادەی تێگەیشتنی ملحدە . وە ئێستا ناسا خەریکە لە میزی ئەو کەشتیەوانانە جارێکی تر ئاو دروست بکاتەوە بۆ خواردنەوەی کەشتییەوانەکان . بۆ ئەوەی لەسەرزەویەوە ئاو لەگەڵ خۆیان نەبەن بۆ دەرەوەی زەوی. وە ناسا دەڵێت هەر کەشتییەوانێك بۆ ماوەی ساڵێك ٧٣٠ لیتر عەرەق لەش و میز سەرف دەکات دوور لە زەوی .

كێشە لەوەدایە كاتێك دەیانەوێت عارەق لەش بكەنەوە بە ئاو لەسەر زەوی ٨٥% ی دەبێت بە ئاوی خواردنەوە بەلام لە دەرەوەی زەوی ٧٥% ی دەبێت بە ئاو پاشان لە دەرەوەی زەوی كالیسۆم لە ئێسقانی كەشتیەوانەكاندا كەم دەكات و نەیان دەزانی بۆچی و چۆن كالیسۆم نامێنێت لە لەشیاندا پاش ئەوەی بیریان كردەوە میز و حارەق كەشتیەوانەكان بكەنەوە بە ئاوی خواردنەوە بۆیان دەر كەوتوە كالیسیۆمەكە لەگەڵ میزەكەیاندا دەر دەچێتە دەرەوەی لەشیان وە میزی مرۆڤ لەسەر زەوی جیاوازە لە میزی مرۆڤ لە دەرەوەی زەوی

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵ دەدات میزی كەشتیەوانی ئاسمان پەیوەندیی چییە بە فیرعەونەوە ؟ كاتێك موسا (ع) چوو بۆ لای فیرعەون فیرعەون خی بە خودا دەزانی خاوەنی دەسەڵات بوو . پرسیی ئەی خودای ئێوە كێیە ؟ موساش فەرمووی( **ربنا الذي اعطى كل شئ خلقه ثم هدى** ) وەك لە سورەتی **طه** ٤٩ و ٥٠ دا نوسراوە

لێرەدا زیرەكی و دانایی موسامان (ع) بۆ دەر دەكەوێت . نەی گوت خودایە لە ئاسمانە بەڵكو ڕێگای دا بە فیرعەون بیر بكاتەوە بۆ ئەوەی بگاتە خودا و بزانێت كێیە ؟ پێی گوت خودای ئێمە هەموو شتێكی خلق كرد و ڕێگای نیشان دا چی بكات و چۆن بەردەوام بێت .وە خلقیش دوو مانای دەبەخشێت واتا دروست كردنی شتێك لە هیچ و بە بێ كەرەستە كە ئەویش بەس كاری خودایە و خودا دەتوانێت بیكات . وە نە فیرعەون و نە گیچ كەسێك دەتوانێت هیچ شتێك خلق بكات بە بێ كەرەستەی سەرەتایی ، وە ئەگەر فیرعەون خوا بێت دەتوانێت خلق بكات بەڵام نەی توانیوە خلق بكات . وە لەم زەمانەشماندا خەڵكی دەڵێت من خودای خۆمم بەڵام هیچیان ناتوانن هیچ شتێك خلق بكەن بەڵام فیرعەون و بێدینی ئێستا دەتوانن شت دروست بكەن . لە كاتێكدا كەرەستەیان لا بێت بێ كەرەستە ناتوانن هیچ شتێك دروست بكەن .

كەواتە نە فیرعەون خودا بووە و نە ملحدی ئێستاش دەتوانن ببن بە خالق. مانای دوهەمی خلقیش درۆ و بوختانە و درۆ و بوختان هەمو كەس دەتوانێت لە هیچ درووستی بكات وە لە سورەتی **العنكبوت** ١٧ دا كاتێك باسی موشریكەكان دەكات دەفەرموێت ئێوە بت دروست دەكەن (**و تخلقون افكا** ). واتا درۆ و بوختان بە دەم ئەو بت و خوداوەندانەوە دەكەن و چیرۆكیان بۆ هەڵ دەبەستن بۆ ئەوەی خەڵكی دواتان بكەوێت و ئەو بتانە بپەرستن. وە خۆشتان دەزانن ئەو هەموو بتە كراوە بۆ فیرعەونەكان و ئەو هەموو چیرۆكە خەیاڵاویانەیان بۆ هەڵ بەستراوە . بێدینی ئێستاش بە هەموو شێوەیەك دێت افك و درۆ و بوهتان هەڵ دەبەستێت بۆ ئەوەی بە حسابی خۆی ئاینی ئیسلامی مەزن پوچەڵ بكاتەوە بە بڕینی ئایەت و دەقەكان و مێژوی ئیسلام....

ئەم خاڵە زۆر گرنگە كە دەست پێكی بانگەشەی موسایە (ع) بۆ فیرعەون و فیرعەونەكانی دوای خۆی كە بزانن خالق كێیە و چییە ؟ و ئایا دەتوانن ببن بە خالق و خلق بكەن ؟ وە لە سیاقی قسەكانیدا دەڵێت **ثم هدى** . واتیا پاش ئەوەی خودا خلقی كرد ڕێگای نیشان دات چی بكات ؟

سەیری باڵندە بکەن لە کاتی گەرمیان و کوێستاندا ماسیەکان کاتێك لە زەریاکاندا لە باشور بۆ باکور یان بە پێچەوانەوە کۆچ دەکەن و گەرا دا دەنێن بۆ ساڵی دوایی بەچکەکان خۆیان دەگەڕێنەوە . سەیری هەموو مخلوقێك بکەین کاری تایبەتیی خۆی هەیە و دەزانێت چی دەکات و بوونی هەر مخلوقێك گرنگە بۆ بەر دەوامیی ژیان وە هەموو پارچەیەکی لاشەی مرۆڤیش کارەکانی دیاری کراوە

بە هەر حاڵ ئەگەر لەسەر باسی خلق و چۆنێتیی کار کردنی بڕۆین قەت تەواو نابین هێندە زۆرن وە ئەگەر فیرعەون ئاقڵ بووایە لە ڕێگای چۆنێتیی کار کردن و بەردەوامیی بونەوەرەکانەوە . خالق یان خودای دەناسی و دەیزانی کە ئەو خودا نییە و بیری دەکردەوە ئێستاش بە هەمان شێوە خەڵکی ئینکاریی وجودی خالق دەکات یان دەڵێت من خۆم خودای خۆمم وە سەر سامە بە تکنلۆجیا و باسی هێز و دەسەڵاتی ناسا دەکات . لە کاتێکدا ناسا دەتوانێت ٤٠٠ کیلۆ متر لە زەوی دوور بکەوێتەوە و وێستگەیەك دا بنێت مرۆڤ بۆی بچێت . بەڵام ناتوانێت سادە ترین هۆکاری ژیانیان بۆ دابین بکات کە ئاوی خواردنەوەیە و بیر لەوە دەکاتەوە میز و عارەقی خۆیان بۆ بکاتەوە بە ئاو . وە کاکی بێدینیش خودایەتیی خۆی لە ڕێگا ی ناساوە ڕەت دەکاتەوە .

لە کاتێکدا ئەو هەموو شتە وردەکارییە لە چوار دەوریدا دەبینێت اوتوماتیکی کارەکانی خۆیان دەکەن و ژیان بەڕێوە دەبەن بەلام دەست کردی مرۆڤ توانیوێتی ٤٠٠ کم لە زەوی دور بکەوێتەوە حسابی میز و پاشەڕۆی نە کرد لە بری ئەوەی ئاوی سازگاریان پێ ببەخشێت میزی خۆیان دەداتێ بیخۆنەوە لە کاتێکدا خودای زانا ئەو هەمو نیعمەتەی داوەتێ بوونی خودا ڕەت دەکاتەوە و لەبەر کاری مرۆڤ خودا ڕەت دەکاتەوە .

تێبینی ئەم بەراوردە بۆ ڕەت کردنەوەی ناسا و کارەکانی ناسا نییە !؟ بەڵکو بۆ تێگەیشتنی ئاستی بیر کردنەوەی ملحدە بۆ ناسینی خلق و خالق،فیرعەون لە موسا (ع) تێ نەگەیشت وە ئاستی بیر کردنەوەی فراوان نە بو بیر بکاتەوە لە بونەوەرەکان و چۆنێتیی کار کردنیان . ئێستاش لە زەمانی عەولەمەدا کاکی بێدین هەر لە بونەوەرەکان تێ نەگەیشتن چۆن بەو وردەکاری و ڕێك و پێکیە خلق کراون و کارەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن و دەڵێن بە سودفە یان لە خۆیەوە درووست بووە

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمەیە** : فەرموون ئێوەی زانست خواز کە خودا ڕەت دەکەنەوە بە زانست و ناسا ئێوە بە سودفە یان لە هیچەوە ئاو بەرن بۆ ئەو کەشتیەوانانە یان مەهێڵن کالیسیۆم لە لەشیان کەم بکات ؟ وە یارمەتیی ناسا بدەن . ئەگەر نەتان توانی ئەو کارە بکەن ئەو کات بیر لەوە بکەرەوە چۆن ئەم گەردونە لە هیچەوە دێتە بوون ؟ **ڕێز و ستایشی تایبەتم هەیە بۆ ناسا هەر لە فەڕاشێکەوە هەتا باڵا ترین کەس** کە لەوێ کار دەکەن و شایانی هەموو ڕێزێکن وە ئەمەش لینکی ئەو هەواڵەی ناسایە باس دەکات چۆن میزی خۆیان بۆ دەکەن بە ئاو چونکە لە دەرەوەی زەوی ئاو نییە و کاتێکیش دەبینین کەشتیە وانەکان دەگەڕێنەوە ناتوانن بڕۆن چونکە کالیسیۆم لە ئێسکیاندا نا مێنێت بەڵکو ئەم برادەرانەی ئیفلوشن و تەقینەوەی مەزن بە سودفە یان لە هیچەوە بتوانن

چارە سەری ئەو دوو کێشەیەمان بۆ بکەن ، وە کارەکەش زۆر گران نییە وێستگەی میر ٤٠٠ کیلۆ مەتر دورە لێمانەوە

http://www.bbc.com/arabic/scienceandtech/2015/06/١٥٠٦٠٨_vert_fut_drinking_water_problem_in_space

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نۆ وەد

## پێشێل کردنی مافی ئافرەت لە صینی شیوعی و توکی بن باڵ



دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگرن کە زوڵم لە ئافرەت دەکات . ئیتر ئەمان چییان لە ئافرەت دەوێت خۆشیان نازانن ؟ وە نازانن بۆچی ڕەخنە لە ئیسلام و مافی ئافرەت دەگرن ؟

ئەوەی جێگای پرسیارە : بۆچی لە وڵاتێکی مەزنی وەك صینی شیوعی دەبێت ئافرەت مافی نە بێت ؟ بۆچی ئافرەت داوای یەکسانی نێوان ژن و پیاو بکات ؟ بۆچی داوای وەستانی توند و تیژیی ناو خێزان بکات ؟ بۆچی جیاوازیی نێوان ژن و پیاو بکرێت و ئەو جیاوازییە بە دوو فاقی وەسف بکرێت بەوەی حەقی ژن دەخورێت هەر بۆیە شاومیلی کە کچێکی ٢٥ ساڵی صینییە لە کۆ برکێیەکدا لە ڕێگای ئینترنێتەوە ڕای گەیاندووە نا ڕەزایی خۆیان دەر ببڕن بەوەی توکی بن باڵیان نەتاشن و بە وێنە بڵاوی بکەنەوە .

وە دەڵێن ئێمەی ئافرەت دەبێت خۆمان بڕیار بدەین چی دەکەین و چی هەڵ دەبژێرین ؟ خۆشمان بڕیار دەدەین چی باشە بۆ لاشەمان نەك بەرامبەرمان !؟

وە پرسیاریان لە **خاتو شاو** کردووە بۆچی لە توکی بن باڵەوە دەستتان بە نا ڕەزاییەکان کردووە ؟

ئەویش دەڵێت : من دەمەوێت بە کۆمەڵگای را بگەێنم دەبێت یەکسانی هەبێت لە نێوان نێر و مێدا وە ڕۆژی چوار شەمە واتا ١٧ ی ٦ ی ٢٠١٥ کۆتا مەوعیدە و ٦ ئافرەت هەڵ دەبژێرن لەوانەی وێنەی بن باڵی خۆیان ناردووە و دیارییان پێ دەدرێت کە پێك هاتووە لە کۆندۆم و یاریی جنسی بۆ زەووق هەستان و تەوالێتێکی ژنانە کە دەتوانن بە پێوە میزی تێدا بکەن .

**پرسیاری بێ وەڵامی ئێمەش ئەمەیە :** بۆچی لە دەوڵەتێکی شیوعیی خودا نە ناسدا مافی ئافرەت نییە و داوای یەکسانی دەکەن ؟ خۆ لە صین یاسا و ڕێسای ئیسلام نییە و هەر ناش زانن چییە ؟ لە صین بە ناوی چییەوە مافی ئافرەت پێ شێل دەکرێت ؟ یان کاکی

بێدین و سیستمی بێدینی لە جیهاندا داوای بەرەڵایی دەکات بە ناوی مافی ئافرەتەوە ؟ خۆ لە صین کەس لەچك ناکاتە سەری و جلی شۆڕ و فراوان لەبەر ناکەن ؟یان سروشتی مرۆڤ لە جیهاندا بەو شێوەیەیە پیاو پیاوە و ئافرەت ئافرەتە و دەبێت هەر یەکەیان سنوری خۆی بزانێت بەڵام بە ناوی ئازادی و مافی ئافرەتەوە . ئافرەتی داماو وا لێ دەکەن ببێت بە کاڵایەك بە دەست هەمووانەوە ...

gallery-china-armpit-hair-gender-equality/entertainment/2015/06/11/http://arabic.cnn.com

..................................................

**بابەتی ناو لینك**

**أتلانتا، الولايات المتحدة الأمريكية (CNN)-- الموضة هذا الصيف لا تتعلق بحمية غذائية أو موضة للأزياء، بل بعض النساء بدأن بحملة لإطالة شعر آباطهن بل وتلوينه أيضاً.**

إذ نشرت المغنية مادونا صورة لها بشعر أباطها على حسابها بانستغرام في مارس/آذار الماضي معلقة : "شعر طويل .. ولن أهتم بتاتاً."

كما قامت الناشطة شاو ميلي، ٢٥ عاماً، ببدء مسابقة للتصوير الفوتوغرافي تظهر فيها الفتيات شعر آباطهن في الموقع الصيني للتواصل الاجتماعي "Weibo".

وشاركت عشرات النساء في المسابقة، من بينهن خمس ناشطات، اعتقلن لفترة وجيزة في مارس/آذار الماضي خلال مشاركتهم بمظاهرة للمطالبة بالمساواة.

وتتضمن المسابقة إرسال المشاركات صور "سيلفي" وهن يرفعن أذرعهن بفخر، وقالت تشاو في مقابلة مع CNN إنه: "يتوجب أن يعود القرار للنساء لمعرفة ما هو الأنسب لأجسادهن،" مضيفة: "يمكن للمرأة أن تحلق شعر إبطها أو تفعل ما تريد، طالما هذا نابع من رغبتها وليس تحت الضغط الناجم عن الصورة النمطية."

وسيتم اختيار ست فائزات من المسابقة التي تنتهي الأربعاء، وتتضمن الجوائز واقيات ذكرية وألعاب جنسية ومبولة تمكن النساء من التبول وقوفاً.

وتقول تشاو: "يسألني الكثيرون حول السبب من إحداث ضجة حول موضوع الشعر، وأن هنالك الكثير من المواضيع الأخرى المهمة التي يجب توفير حل لها، مثل العنف الأسري والاعتداءات الجنسية، لكن من وجهة نظري فهذه المواضيع كلها مهمة، وتتضمن الصراع المحتدم للمساواة بين الجنسين."

كما ظهرت نجمة مسلسل "Girls"، جيميما كيرك في حفل توزيع جوائز مجلس مصممي الأزياء الأمريكيين ملتقطة صورة لشعر إبطها، لتنشر حديثاً صورة للممثلة صوفيا لورين بشعر إبط كثيف بصورة بالأبيض والأسود، معلقة عبر حسابه بتويتر: "لقد سئمت من الحديث عن شعر الإبط، هل يمكننا التوقف الآن؟"

وهذه ليست المرة الأولى التي تظهر فيها نجمة بهذا الشكل ، إذ حضرت النجمة جوليا روبرتس العرض الأول لفيلم "Notting Hill" عام ١٩٩٩ بفستان سهرة أحمر وبشعر إبط ظاهر.

وتقول شاو إن التغطية الإعلامية لشعر آباط الممثلات "مقرفة"، وكأنهم يقولون "إنه يجب على النساء ألا يحظين بالشعر أو عليهن أن يشعرن بالعار تجاهه."

## پرسیارە بێ وەلأمەكان ژمارە :نۆ وەد و یەك

## ئاستی شارەزایی بێدین و بارانی سوێر




یەکێکی تر لە گومانەکانی کڵێسا کە بێدینەکان وەك ببغا دەی لێنەوە لە سورەتی **واقعة** ٦٨ بۆ ٧٠ دا باس کراووە دەفەرموێت ئەو ئاوەی دەی خۆنەوە لە هەورەکان دا دەبەزێت ئێوە دای دەبەزێنن یان ئێمە ؟ ئەگەر بمانەوێت سوێری دەکەین . وە دژە دینەکان دەڵێن محمد (صلى الله عليه وسلم) نەی زانیووە باران لە هەڵمی ئاو دروست دەبێت و هەڵمیش قەت سوێر نابێت ئەوەی مایەی گاڵتە جارِیە لەم گومانەدا ئەوەیە ئەو کەسانەی بابەتی گومانەکان لە سەرچاوەکانی کڵێساوە دەدزن و وەری دەگێڕن بۆ کوردی بە ناوی زانست و زانست خوازەوە رەخنە دەگرن . نە شارەزایی خۆیان نیشان دەدەن لە لایەنی زانستی و زمانەوانیشەوە و دەکەونە هەڵەی زەقەوە کە کۆپی و پەیستەکەیان دەر دەخات

**یەکەم** : ئەو ئایەتە ناڵێت ئاوی باران سوێرە . بەڵکو دەڵێت دەتوانین سوێری بکەین وە لێرەدا رادەی نە شارەزایی بەرامبەرمان بۆ دەر دەخات لە لایەنی زانستییەوە چونکە ئایەتەکە دەڵێت ئەو ئاوەی لە بارانەوە دا دەبەزێت شیرینە نەك سوێرە !؟ وە ئاوی باران سوێر نابێت بەڵکو بە شیرینی دێتە خوارەوە

**دووەمیان** : نە شارەزایی بەرامبەرە لە زمانی عەرەبیدا و ئاگاداری ( لام التوكيد ) نییە واتا کاتێك پیتی ( ل ) دەچێتە سەر ( لو ) کە وەڵامە دڵنیا دەبێت کە ئەو کارە دەکرێت بۆ نموونە : ئایەتەکانی ٦٣ و ٦٤ و ٦٥ پێش ئایەتی دابەزینی باران لە هەور دەفەرموێت

**(افرايتم ما تحرثون اانتم تزرعونه ام نحن الزارعون لو نشاء لجعلناه حطاما)**

لێرەدا دیقەت بدەن دەفەرموێت **( لو نشاء لجعلناه حطاما )** واتا گەر بمانەوێت هەمووی خراپ دەکەین کە نەتوانن بیخۆن . بەڵام لە ئاوی بارانەکەدا دەفەرموێت ( **لو نشاء جعلناه اجاجا** ) دیقەت بدەن لە بارینی باران لە هەورەکانەوە ناڵێت ( لجعلناه ) لامەکەی لا براوە نوسراوە ( جعلناه ) بەڵام لە زرعات و کشتووکاڵەکەدا دەڵێت ( لجعلناه ) وە لە دابەزینی ئاو بۆ سەر زەوی لامی تەوکیدە کە نەهاتووە !؟ توکیدیش شێوازێکی زمانەوانییە کاتێك لە ڕستەیەکدا بەکار دەهێنرێت ئەو کەسەی گوێی لە ڕستەکە دەبێت دڵنیا دەبێت کە ئەو شتە ڕاستە یان ڕوو نادات و هەمو دوو دڵییەك بنە بڕ دەکات .

هەر ڕستەیەکیش لامی توکیدی تێدا بوو واتا ئەو شتە ڕوو دەدات بەڵام لە گۆڕینی ئاوی باران بۆ سوێر بە بێ لامی توکیدە واتا ڕوو نادات ( جعلناه اجاجا ) ئەگەر بنوسرایە ( لجعلناه اجاجا ) ئەو کات گومانی کڵێسا ڕاست دەر دەچوو

بۆ ڕون کردنەوەی زیاتر هەر هەمان سورەتی ٦٥ دەفەرموێت ( **لو نشاء لجعلناه حطاما** ) واتا گەر بمانەوێت زرعاتەکانتان تێك دەدەین . بۆ نموونە دەبینین بە کولە یان بە لافاو زرعات نامێنێت یان بە هەورە بروسکە زرعات دەسوتێت وە بۆ زۆر شێوەی تر بەڵام بۆ ئاوەکە بە هیچ شێوەیەك سوێر نابێت . چونکە ئاو واتا ژیان نەك بەس بۆ مرۆڤ بەڵکو بۆ ملیارەها بونەوەری تریش بۆیە ئاوی باران قەت سوێر نا بێت بەلام ئەگەر خودا بیەوێت سوێری دەکات

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : خودای پەروەردگار بە ڕەحم و بەزەییە و ئاومان لێ سوێر ناکات و ژیانمان لێ تێك نادات بەلام مرۆڤە چاو چنۆکە بە دوکەڵی کارگەکانی هەورەکانمان لێ پیس دەکات و دەبێتە هۆکاری بارینی بارانی ترشەڵۆك الامطار الحمضية

Acid rain

هەر هەورێکیش بەو دوکەڵانە ژەهراوی بێت بارەنەکەی دەبێتە هۆکاری کوشتنی بونەوەر و سەوزایی و کشت و کاڵ و زۆر زیانی تر کە ساڵانە بە ملیۆنەها دۆلار زیان بە خەڵکی دەگەیێنێت کاکی بێدین کە باسی زانستمان بۆ دەکەیت . ئەوە ئێمە سەلماندمان کە قەت ئاوی باران سوێر نابێت ئیللا ئەگەر خودا بیەوێت

فەرموو بەو زانستەی پێوەی دەنازیت ئەو بارانە ترشە لۆکانەمان بۆ مەهێڵە و با بارانی ژەهراوی نەبارێت ؟ ئەگەر نەت توانی ئەو کێشەیە حەل بکەیت دەڵێم بیر بکەرەوە لە ئاستی زانیارییەکانت و بزانە کامەیان ڕاستە شوێن ڕاستییەکان بکەوە نەك کۆپی و پەیست !؟ چونکە خودا ئاومان لێ سوێر ناکات بەڵام زانستەکەی تۆ ئاومان لێ سوێر دەکات لە کاتێکدا ئێوە بە ناوی زانستەوە دەڵێن

دەتوانین هەور دروست بکەین ئەی بۆچی لەو ناوچانەی کارگەیان تێدایە و دوکەڵی ژەهراوی تێکەڵ هەور دەکەن جەنابت کەش و هەواکەی پاك ناکەیتەوە ؟

بۆ ئەوەی بارانی ژەهراوی نەبارێت ؟ یان ئێوەی زانست باز بەو هەورە دەست کردانە باران نا بارێنن بۆ ئەوەی پێویستتان بە هەوری الله نە بێت و کێشەی ژەهراوی کردنی هەوریش حەل بکەن ؟ ئەگەر زمانی عەرەبی نازانیت و جیاوازیی نێوان ( جعلناه ) و ( لجعلناه ) ناکەیت و نازانیت لامی توکید چییە ؟ چۆن ڕەخنە دەگریت ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نەوەد و دوو

## ئایا منداڵی زینا دەچێتە بەهەشت ؟

| |
|---|
| 1 - لا يدخلُ الجنّةَ ولدُ زنية الراوي : عبدالله بن عمرو \| المحدث : ابن خزيمة \| المصدر : التوحيد الصفحة أو الرقم: 864/2 خلاصة حكم المحدث : [فيه] جابان مجهول |
| 2 - لا يدخلُ الجنّةَ ولدُ زنية ولا منّانٌ ولا عاقٌّ ولا مُدمنُ خمرٍ الراوي : عبد الله بن عمرو \| المحدث : ابن حبان \| المصدر : صحيح ابن حبان الصفحة أو الرقم: 3383 \| خلاصة حكم المحدث : أخرجه في صحيحه |
| 3 - لا يدخلُ الجنّةَ ولدُ زنية الراوي : أبو هريرة \| المحدث : السخاوي \| المصدر : الأجوبة المرضية الصفحة أو الرقم: 1/96 خلاصة حكم المحدث : إسناده صحيح وله متابعة |
| 5 - لا يدخلُ الجنّةَ ولدُ زنية الراوي : أبو هريرة \| المحدث : ملا علي قاري \| المصدر : الأسرار المرفوعة الصفحة أو الرقم: 370 خلاصة حكم المحدث : قيل لا أصل له أو بأصله موضوع |
| 7 - لا يدخلُ الجنةَ عاقٌّ ، و لا منّانٌ ، و لا مُدمنُ خمرٍ ، و لا ولدُ زنية الراوي : عبدالله بن عمرو \| المحدث : الألباني المصدر : السلسلة الصحيحة الصفحة أو الرقم: 673 \| خلاصة حكم المحدث : حسن لغيره |
| 8 - لا يدخلُ الجنّةَ أربعةٌ : مدمنُ خمرٍ ، ولا عاقٌّ والديْه ، ولا منّانٌ ، ولا ولدُ زنْية الراوي : عبدالله بن عمرو \| المحدث : ابن الجوزي المصدر : موضوعات ابن الجوزي الصفحة أو الرقم: 3/326 \| خلاصة حكم المحدث : ليس يصح |
| 11 - لا يدخلُ الجنّةَ عاقٌّ ، ولا مُدمنُ خمرٍ ، ولا منّانٌ ، ولا ولدُ زنية الراوي : عبدالله بن عمرو \| المحدث : أحمد شاكر المصدر : مسند أحمد الصفحة أو الرقم: 15/235 \| خلاصة حكم المحدث : إسناده صحيح |

حەدیسـێك هەیـە وەك لـە وێنەکـەدا دامـان نـاوە دەڵێـت : منـداڵی زینـا ناچێتـە بەهەشـتەوە . وە دژە دینـیش دەڵـێن باشـە ئـەو منداڵـە تـاوانی چییـە ؟ خـۆ ئـەو تـاوانی نـە کـردوە دایـك و بـاوکی تاوانیـان کـردووە بـۆچی منداڵەکـە تـاوانی ئـەوان هـەڵ بگرێت و نەچێتە بەهەشتەوە ؟

من و موسوڵمانان و هەموو جیهان هاوڕاین و دەڵێین بۆچی منداڵێك تاوانی نە كردبێت تاوان بار بكرێت بە تاوانی دایك و باوكی و نەتوانێت بچێتە بەهەشتەوە ، ئەمەش داد پەروەری نییە .

وە بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە دەچینە خزمەتی قورئان

لە سورەتی **الانعام** ١٦٥ دا دەفەرموێت : **(و لا تكسب كل نفس الا ما عليها و لا تزر وازرة وزر اخرى)** واتا هەموو كەسێك ئەو شتانە بە دەست دەهێنێت كە كردوێتی و تاوانی كەس نا درێت بە ملی كەسدا . هەروەها لە سورەتی **البقرة** ٢٨٥ دا دە فەرموێت : **(لها ما كسبت و عليها ما اكتسبت )**. لێرەدا ئاماژە بە زانیارییەكی گرنگ دەدەین ئەویش وشەی كسب و اكتسب كە هەردوكیان لە ( كسب ) هاتووە . كاتێك كەسێك دەڵێت كاسپی دەكەم لای خۆمان هەر هەمان وشەی عەرەبیە (كسب) واتا كەسێك دەچێتە دەرەوە بۆ كارێك شتێك پەیدا بكات بۆ بژێوی ژیانی وە پێی دەڵێن كاسبە واتا پەیدا كەرە ...

لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێت **(لها ما كسبت و عليها ما اكتسبت)** . واتا ئەوانەی هەیە كە دەستی كەوتووە و ئەوانەی لە سەرە كە دەستی كەوتووە . ئەگەر كەسانێك عەرەبی نەزانن ئەو دێرە و ئەو راڤەیە سەیرە لە لایان . بەڵام لە زمانی عربیدا ( كسب ) بۆ كاری خێر دێت و لەگەڵ كاری خێردا باس دەكرێت ، بەڵام **اكتسب** بۆ كاری شەڕ و خراپەكاری باس دەكرێت . وە ئەگەر ئێستا ئایەتەكە ڕاڤە بكەین لها ما كسبت و عليها ما اكتسبت . واتا ئەو شتە باشانە بە دەست دەهێنێت كە كردوێتی و ئەو شتە خراپانەی كە كردوێتی لە سەری حساب دەكرێت.

بە گوێرەی هەردووك ئایەتی **الانعام** ١٦٥ و **البقرة** ٢٨٥ مرۆڤ لای خودا بە گوێرەی كارەكانی مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت نەك بە گوێرەی كارەكانی دایك و باوكی یان كەسێكی تر چونكە تاوانی كەس ناچێتە ملی كەس . وە قورئانیش پێش حەدیسەكانە و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو كەسێك شارەزا تر بووە لە قورئاندا و ئەو حوكمانە ی قورئان دەزانێت و قەت قسەیەكی لەو جۆرە ناكات .

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئەو حەدیسە بە چەند جۆرێك باس كراوە وەك لە وێنەی پۆستەكەدا دەی بینن بەڵام هیچیان ڕاست نین . فەرموون پێمان بڵێن لە كوێدا نوسراوە ئەو حەدیسە صحيحە و ئەمەش لینكی الدرر السنية كە هەموو حەدیسەكانی تێدایە

http://www.dorar.net/hadith

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :نەوەد و سێ

## پەرستنی بەردە رەشەکە لە ئیسلامدا

وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِ
عَالِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَٰذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا
عَاكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ
كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ
أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ
الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَاللَّهِ
لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾
فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا مَن
فَعَلَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى
يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَىٰ أَعْيُنِ النَّاسِ
لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوا أَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ
﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ
﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوا إِلَىٰ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنتُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ
نُكِسُوا عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ
أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ

عن عمر رضي الله عنه

إني أعلم أنك حجر لا تضر ولا تنفع ولولا أني رأيت
النبي صلى الله عليه وسلم يقبلك ما قبلتك

صحيح البخاري ـ كتاب الحج ـ باب ما ذكر في الحجر الأسود



دژە ئیسلامەکان دەڵێن موسوڵمان بەردێکی ڕەش دەپەرستن و بە چوار دەوریدا دەسوڕێنەوە کەچی خۆشیان بە خەڵکی تر دەڵێن بت پەرست و بەرد پەرست لە کاتێکدا بنەمای ئاینەکەی خۆیان پەرستنی بەردێکی ڕەشە لە کەعبەدا وە ڕوی تێ دەکەن بۆ نوێژەکانیان و ساڵانە بە ملیۆنەها کەس دەچێت بۆ زیارەتی

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم گومانە دەبێت لە پێشدا بزانین عیبادەت چییە ؟ عیبادەت لە هەمو دنیادا لە کۆن و نوێدا دوو جۆرە

**یەکەمیان** : ئەو شتە با بڵێین بت بێت بەرد بێت کەسێك بێت یان ... هتد . کە دەپەرسترێت دەبێت خودا بێت وە داوای شتی لێ بکرێت و خەڵکی بچن بۆ لای بۆ ئەوەی داوای لێ بکەن کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکات

دووەمیان : دەبێت ئەو شتە یان بەردە یان بتە یان ئەو کەسە یان ... هتد . دەبێت ناوەندێك بێت لە نێوان مرۆڤ و خودادا و خەڵکی بچن لە ڕێگای ئەو شتەوە داوا لە خودا بکەن بۆ ئەوەی کارەکانیان بۆ بکات یان بە دەنگیانەوە بێت

ئادەی کوان ئەوانەی دەڵێن موسوڵمان بەردە ڕەشەکە دەپەرستن ؟

ئایا هیچ دەقێك هەیە بڵێت ئەو بەردە خودایە یان ناوەندە لە نێوان مرۆڤ و خودادا ؟

بێگومان نەخێر وە هیچ دەقێکی لەو شێوەیە نییە . لە هەمووی گرنگ تر عەرەب لە دورگەی عەرەبیدا هەموو شتێکی پەرستووە . تاقە شت کە نەی پەرست بێت ئەو بەردە ڕەشە بووە .

زۆر ڕێزیشیان لەو بەردە ڕەشە گرتووە بەڵام قەت نەیان پەرستووە چونکە پاشماوەی ئیبراهیم بووە علیە السلام . کاتێك کەعبە ڕوخا و جارێکی تر بنیاتیان نایەوە هەر هەموو هۆزەکانی عەرەب بوو بە ناکۆکییان کامیان ئەو بەردە بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی هێندە پیرۆز بووە لە لایان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیان پەرستووە و ئەو بەردە خودا نە بووە و داوای هیچی لێ نەکراوە وە خوداش لە هەمان ئایەتدا بت پەرستەکان بر درۆزن و کافر ناو دەبات و دەڵێت ئەوەی دەی کەن شیرکە خودا پەرستی نییە .

پرسیاری ئەقڵ ئەمەیە ئەگەر موسوڵمانەکان ئەو بەردە ڕەشەیان بپەرستایە ؟ ئایا کافرەکانی قورەیش نەیان دەتوانی ئەو ئایەتە و هەموو منهجی ئیسلام پوچەڵ بکەنەوە و دەیان گوت ڤئێمە و ئێوە فەرقمان نییە ئێمە لەو بەردە بتێك دروست دەکەین و دەی پەرستین ئێوە خودی بەردەکە دەپەرستن وە بە دڵنیاییەوە ئاینی ئیسلام و قورئان پوچەڵ دەکرایەوە و هەتا موشرکێك باوەڕی بە قورئان و ئیسلام دەهێنە (١٠٠٠) دژا یەتییان دەکرد چونکە داوایان لێ دەکات واز لەو بتانە بهێنن کە ئاینی باوك و باپیرانیانە بۆ خودایەکی تر کە بەردێکی ڕەشە وە هەر قورئان خۆی دەی توانی خۆی بە درۆ بخاتەوە چونکە لە سورەتی **یونس** ١٨ دا دەفەرموێت

( **ويعبدون من دون الله ما لا يضرهم ولا ينفعهم ويقولون هؤلاء شفعاؤنا عند الله** ) واتا کافرەکان شتێك دەپەرستن لە غەیری خودا نە زیانی بۆیان هەیە و نە قازانجیش وە دەڵێن ئەوانە ناوەندی ئێمەیە لای خودا و شەفاعەتمان بۆ دەکات . ئەی کابرای موشریکی قورەیشی ئەقڵی پێ نە دەشکا بڵێت کاکی من جارێ خۆت واز لە پەرستنی ئەو بەردە ڕەشە بهێنە ئەو کات داوا لە من بکە واز لە بت پەرستی بهێنم

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئایا هیچ دەقێك یان حەدیسێك هەیە بڵێت ئەو بەردە بپەرستن یان داوای شتی لێ بکەن یان با ناوەند بێت لە نێوان ئێوە و خودادا ؟

گرنگ ترین شتی ئەو بەردە ڕەشەش لێرەدایە کە ئەو بەردە ڕەشە ئیبراهیم (ع) دای ناوە و ئیبراهیمیش (ع) یەکەم بت شکێن بووە بۆ خودا لە جیهاندا کە نە ترساوە و بتەکانی نمرودی شکاندووە لە سورەتی **الانبياء** ٥١ بۆ ٦٦ باس کراوە کە چۆن بە بوێری ئەو بتانەی شکاندوە و تێی گەیاندوون کە بەرد قازانج و زەرەری نییە بۆچی دەی پەرستن ؟ ئایا معقولە ئیبراهیم (ع) خۆی ماڵێك بۆ خودا دروست بکات و بەردێکی ڕەشی تێدا دا نێت و بڵێت بی پەرستن ؟ ئەگەر موسوڵمانەکان بەردە ڕەشەکەیان بپەرستایە ؟ ئایا کافرەکانی قورەیش ئەو ئایەتانەی سورەتی انبياء و شکاندنی بتەکانی ئیبراهیمیان بە درۆ نە دەخستەوە ؟ مەبەستی لەوە بووە خەڵکانێکی زۆر هاتونەتە ناو ئیسلامەوە بۆ ئەوەی تێ بگەن کە ماچ کردنی ئەو بەردە ڕەشە بەشێك نییە لە مەراسیمی حەج و عیبادەت و خەڵکی

بزانن ئەو بەردە هیچ پیرۆزییەکی نییە . بەڵام خەڵکانی جاهیل و نە شارەزا تا ئێستاش ملی خۆیان دەشکێنن بۆ ئەو بەردە ڕەشە لە کاتی حەج و عومرەدا

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئەگەر موسوڵمان ئەو بەردە ڕەشەی بپەرستایە بۆچی توشی کێشە دەبوو لەگەڵ موشریکەکانی قورەیشدا ؟ ئەوان بتی خۆیان هەبوو موسوڵمانیش بەردی خۆیی هەبوو دەی پەرست و نە پێویستییان بە هیجرە و نە ئەشکەنجەدانی خەڵکی هەبوو نە غزوەی بەدر و نە ئوحد و نە هیچ کێشەیەکی تر ڕوی نە دەدا ؟ کاکی کۆپی و پەیست بێ زەحمەت یە ك تۆز بیر بکەرەوە و کاتێك ڕەخنەش دەگریت با هیچ نەبێت خۆشت شتێك شارەزا بیت و ئاگاداری ڕوداوەکان بیت . چونکە زۆر ئیحراجە کاتێك پۆستێکی لەم شێوەیە دەبینیت و ناتوانیت وەلامی بدەیتەوە

یان هەست دەکەیت ئاستی زانیاری و تێگەیشتن و خوێندنەوەت بۆ ڕوداوەکان زۆر کورت و کەمن . هیوادارم لەو کاتەدا بیر بکەیتەوە و پرسیارێك لە خۆت بکەیت : بۆچی دژایەتیی ئاینی ئیسلامی مەزن دەکەیت ؟ و کاتێکیش دژایەتیی دەکەیت بۆچی بە نە شارەزایی دژایەتیی دەکەیت ؟ وە کاتێکیش مردیت و ڕاستییەکانت بینی وەلامت چی دەبێت ؟ ئەو کات ناتوانی بە هیچ شێوەیەك داکۆکی لە خۆت بکەیت هەتا لە ژیاندایت بە چاوی ئەقڵ و هزر سەیری ڕوداوەکان بکە نەك بە چاوی ئاسایی کۆپی و پەیست و توتی ئاسا بە دوای خەڵکی تردا بخوێنیت

---

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :نەوەد و چوار

## پێوەری دژە ئیسلام چیە بۆ ڕەت کردنەوەی حەدیسەکان ؟

دژە ئیسلامەکان ڕەخنەمان لێ دەگرن و دەڵێن : ئیسلامەکان هەر حەدیسێکیان بە دڵ نە بێت یان نەزانن وەڵامی بدەنەوە دەڵێن ئەو حەدیسە ڕاست نییە یان لاوازە یان هۆکارێکی بۆ دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی لەو کێشەیە قورتار بن . وە ئەو دژە ئیسلامانەی حەدیسەکان ڕەت دەکەنەوە بە پلەی یەکەم موسوڵمانن و لەگەڵماندا لە مزگەوت نوێژ دەکەن و کەناڵی ئاسمانیی خۆیان هەیە پێیان دەڵێن معتزلة و ئەمانە باوەڕیان بە هیچ حەدیسێك نییە و تەنانەت ئێستا گەیشتونەتە ئاستێك کتێب و تەفسیرەکانیش ڕەت دەکەنەوە کەواتە ..

ئەگەر حەدیسەکان و تەفسیرەکانی قورئان و کتێبی زانایانی ئیسلام ڕەت بکەینەوە و لای بدەین لە ئاینی ئیسلام ٨٠% ی ئاینمان ڕەت کردوەتەوە . وەك ئەوان لە کەناڵەکانیاندا بانگەشەی بۆ دەکەن وە ٢٠% ی ئاین کە ماوەتەوە بەس کتێبی قورئانەکەیە . قورئانیش بە بێ تفسیر و کتێبەکانی فقە هیچ نییە و هەموو کەس دەتوانێت بە ئارەزوی خۆی ڕاڤەی بۆ

بکـات یـەك تـۆز شـارەزای زمـانی عـەرەبی بێـت . بـەو شـێوەیە قورئـانیش ئـاوەڕوت دەکـەن و وەك کتێبێکی ئاسـایی لێ دێـت بـا وای دا بنێـین بـە قسـەی معتزلـەکان بکـەین و هـەموو تەفسـیرو کتێبـە ئیسـلامیەکان و حەدیسـەکان بسـوتێنین ئـەو کـات قورئانەکە بەس بە حوکمی ( تلاوة ) واتا خوێندنەوە دەمێنێتەوە ....

کـاکی معتزلی دێـت راڤـەی دەکـات بۆمـان پـاش ٢٥ سـاڵی تـر جـارێکی تـر راڤـە دەکرێتـەوە . و دوو جـاری تـر راڤـە دەکرێتـەوە و لە ماوەی ١٠٠ ساڵدا قورئان و ئاینی ئیسلامیش نامێنێت وە ئەمەیە ئامانجی معتزلة بۆ نەهێشتنی ئاینی ئیسلام.

کەواتە دوژمنی یەکەم و دژە ئیسلامی گەورەی ئاینی ئیسلامی مەزن معتزلەن کە دەیان بینن لە تۆڕی ئینتەرنێت و کەناڵەکانی را گەیاندن بە ناوی دوکتۆر و زانا و ڕۆشنبیر و پسپۆڕ لە بواری ئایندا و ... هتد . وە کابرای بێدین یان مەسیحی یان هەر دژە ئیسلامێکی تر سەرچاوەی ڕەخنەکانی لە حەدیسەکان و کتێبە ئیسلامییە کان معتزلەکانن . وە پێوەری معتزلەش بە تەنها ئەقڵێتی بۆ ڕەت کردنەوەی حەدیسەکان ئێمەی موسوڵمانیش پێوەری تایبەتی خۆمانمان هەیە بۆ ئەو حەدیسانە .

بۆ نموونە کاتێك باسی حەدیسێك دەکرێت ئەو حەدیسە شیکاری و وردە کاریی بۆ کراوە و لە بێژنگ دراوە بۆ نموونە یەکێك لەو کەسانەی کە ئەو حەدیسەیان گێڕاراوەتەوە درۆزن بوە یان نە ناسراو بوە یان لەو کاتەدا پیر بووە و خەڵەفاوە یان ... هتد . وە یان ئەو حەدیسە لە زاری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) نە گێڕراوەتەوە بەڵکو بەسەر هاتێکە و کەسێك بینیوێتی گێڕاوێتیەوە . وە پلەی ڕاستی یان لاوازی یان هەر کێشەیەکی تر لە حەدیسەکاندا هەبێت هۆکاری ڕەت کردنەوەی ئەو حەدیسە زانراوە و نوسراوە . بە هیچ حەدیسێك ناڵێین ڕاستە یان لاوازە ئیللا هۆکارەکەی بە جوانی ڕون کراوەتەوە و بە دوادا چوونی بۆ کراوە.

ئێستا با **پرسیارە بێ وەلامەکەمان** لە ئێوە بکەین : ئێمە پێوەری خۆمانمان هەیە بۆ وەرگرتن و ڕەت کردنەوەی حەدیسەکان . فەرموو ئێوەش پێمان بڵێن پێوەری ئێوە چییە بۆ وەر نەگرتنی ئەو حەدیسانە ؟ یان کام لە زانایانی ئێوە هەستاوە بە لێکۆڵینەوە لە بواری حەدیسەکاندا و بێت ئێمە بە درۆ بخاتەوە ؟ یان بۆچی لە ماوەی ١٤٠٠ ساڵدا هیچ کام لە ئێوەی دژە ئیسلام هەڵ نەستاوە بە لێکۆڵینەوە لەو حەدیسانە وە بە گوێرەی پێوەری کات و خەڵکەکان کە حەدیسەکانیان گێڕا وەتەوە لێکۆڵینەوە بکات وپێمان بڵێت فڵان حەدیس لاواز نییە یان درۆ نییە و ڕاستە لەبەر ئەم هۆکارانە کە فڵان زانامان دەڵێت ئەو کەسە لەو زەمانەدا نە ژیاوە یان ئەو کەسە لەو کاتەدا پیر بوە و نەی توانیوە قسە بکات یان ... هتد

وە بۆمان ڕوون بکەنەوە و بنوسن ئەمەش بەڵگە و لێکۆڵینەوەی زانایانی ئێمەیە و بخاری و مسلم ڕاست گۆ نەبوون بە گوێرەی ئەم پێوەرانە یان ئەم بەڵگانە ... ئەگەر کەستان نییە لەو بوارەدا ؟ وە کەسیشتان لێ پەیدا نا بێت لەو بوارەدا ؟ دەبێت پابەند بن بە پلەی حەدیسەکان چۆن هاتووە . ئەگەر پابەندیش نابن و ڕەتی دەکەنەوە ، فەرموون سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی خۆتانمان بۆ بهێنن بەڵکو ئێوە ڕاست بن !!

ئایا دەتوانن ئەوە بكەن ؟ یان ئەم پرسیارەش بێ وەڵام دەمێنێتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت !!!

خوشك و برایانی بەڕێزم ئاگادارتان دەكەمەوە زۆر وریا بن لەم معتزلانە !؟ چونكە معتزلة ١٣٠٠ ساڵە هەیە و زانا و خەڵكی باشیان تێدا بووە و پابەند بوون بە ئاینی ئیسلامەوە و دژایەتیی دوژمنانی ئیسلامیان كردوە و كەس نەی زانیوە كێ معتزلەیە و كێ موسوڵمانە ؟

خەڵكانێكی بە ویژدان و خاوەن هزر بوون مل كەچ بوون لەبەر دەم قورئان و سونەتدا و كاتێك حەدیسێك یان حوكمێكی شەرعیان ڕەت كرد بێتەوە گوێیان لە بەرامبەر گرتووە و گفت و گۆیان كردوە و لەگەڵ بەرامبەردا ڕو بە ڕوو بونەوەیان كردووە بەلام معتزلەكانی ئێستا و لەم زەمانەدا گەورەترین دژه ئیسلامن و لەگەڵ بێدین و مەسیحی و جولەكەدا فەرقیان نییە و لە هەموو خاڵێكدا كۆكن لەگەڵ دژه ئیسلامەكان بۆ لێدانی ئاینی ئیسلام و لاواز كردنی و نەهێشتنی ئاینی ئیسلام و هەڵ كێشانی لە ڕەگ و ڕیشەوە ...

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە دەتوانین لەگەڵ بێ دینێك یان هەر دژه ئیسلامێكی تردا كۆك بین بەڵام لەگەڵ معتزلەیەكدا ناتوانین كۆك بین تەنانەت لە یە ك خاڵیشداوە سەره گەورەكانیان لە پشت كۆمپیوتەر یان كەناڵێكی تلفزیۆن یان یوتوبدا خۆیان شاردوەتەوە و نایەن دیبێتێك بكەن . تەنانەت ئاستی نەزانی و تێ نەگەیشتنیان لە ئاستێكدایە ٩٩% یان عربی نازانن و ئاینی ئیسلامی مەزن و سەرچاوەكانی ڕەت دەكەنەوە .

وە هەندێكیان پەیدا بوون دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كاری ئەوە بووە قورئانەكەی گەیاندووە و كاری تەواو بووە و پێویست ناكات شوێن حەدیس و سونەتەكانی بكەوین من ئامانج و هەوڵی معتزلەتان بۆ دەنووسم و خۆتان بەراوردی بكەن لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا بزانن هەردووكیان **یەك** داواكاری و **یەك** ئامانجیان هەیە یان نا؟ معتزلة ئەمانەی دەوێت

١- هەموو ئاینی ئیسلام بە ئەقڵ و تێگەیشتنی سەردەمی خۆی بگونجێنێت

٢ - باوەڕیان بە هەموو حەدیسەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نییە

٣ - باوەڕیان بە كتێبەكانی تفسیری قورئان و كتێبە فقهییەكان نییە

٤ - قورئانیش بە گوێرەی ئەقڵ و تێگەیشتنی خۆیان ڕاڤە دەكەن

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نەوەد و پێنج

## حیجابی ئافرەتی کۆیلە

دژە ئیسلام فتواکەی شێخ عثیمینیان بڕیوە و هێندەیان نوسیوە کە بە شین دیاریمان کردوە و خەتی سورمان بە ژێردا هێناوە . ئەوی تریان نە نوسیوە وەك لە وێنەکەا دەی بینن وە ئێمەش ڕاڤەمان کردوە بۆ کوردی

السلف إماءهم كانت كاشفات الصدور !
قال ابن تيمية فى الفتاوى
أن الحجاب إنما أمر به الحرائر دون الإماء
العلامة العثيمين ،
قال في شرحه الممتع على زاد المستقنع
الأمة - ولو بالغة - وهي المملوكة، فعورتها من السرة إلى الركبة، فلو صلت الأمة مكشوفة البدن ما عدا ما بين السرة والركبة، فصلاتها صحيحة
السرة
لكنهم يحرصون على النقاب منعا للفتنة ! :( :(

وزاد العلامة العثيمين الأمرَ إيضاحا ونحنُ ننقل كلامه بطوله لنفاسته وسهولة عبارته، قال في شرحه الممتع على زاد المستقنع:الأَمَة - ولو بالغة - وهي المملوكة، فعورتها من السُّرَّة إلى الرُّكبة، فلو صلت الأَمَة مكشوفة البدن ما عدا ما بين السُّرَّة والرُّكبة، فصلاتها صحيحة، لأنَّها سترت ما يجب عليها سَتْرُه في الصَّلاة. وأما في باب النَّظر: فقد ذكر الفقهاءُ رحمهم الله تعالى أن عورة الأَمَة أيضاً ما بين السُّرَّة والرُّكبة، ولكن شيخ الإسلام رحمه الله في باب النَّظر عارض هذه المسألة، كما عارضها ابن حزم في باب النَّظر، وفي باب الصَّلاة، وقال: إن الأمة كالحُرَّة؛ لأنَّ الطَّبيعة واحدة والخِلْقَة واحدة، والرِّقّ وصف عارض خارج عن حقيقتها وماهيَّتها، ولا دليلَ على التَّفريق بينها وبين الحُرَّة.

وقال شيخ الإسلام ابن تيمية : إنَّ الإماء في عهد الرسول عليه الصَّلاة والسَّلام، وإن كُنَّ لا يحتجبن كالحرائر؛ لأن الفتنة بهنَّ أقل، فَهُنَّ يُشبِهنَ القواعدَ من النِّساء اللاتي لا يرجون نكاحاً، قال تعالى فيهن:{ فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ } (النور: من الآية60)، يقول: وأما الإماء التركيَّات الحِسَان الوجوه، فهذا لا يمكن أبداً أن يَكُنَّ كالإماء في عهد الرسول عليه الصَّلاة والسَّلام، ويجب عليها أن تستر كلَّ بدنها عن النَّظر، في باب النَّظر. وعلَّل ذلك بتعليل جيِّدٍ مقبولٍ، فقال: إن المقصود من الحجاب هو ستر ما يُخاف منه الفتنة بخلاف الصَّلاة، ولهذا يجب على الإنسان أن يستتر في الصَّلاة، ولو كان خالياً في مكان لا يطّلع عليه إلا الله. لكن في باب النَّظر إنما يجب التَّستر حيث ينظر الناس. قال: فالعِلَّة في هذا غير العِلَّة في ذاك، فالعِلَّة في النَّظر: خوف الفتنة، ولا فرق في هذا بين النِّساء الحرائر والنِّساء الإماء. وقوله صحيح بلا شك، وهو الذي يجب المصير إليه. انتهى.

دژە ئیسلامەکان ئەم پرسیارە زۆر دەکەن و دەی ڵێنەوە بۆچی ئافرەتی کۆیلە لە ئیسلامدا حیجاب ناکات ؟

وەڵام : ئافرەتی کۆیلە لەچك ناکات لەبەر دوو هۆکار.

**یەکەمیان** : چونکە زۆر کار دەکات و هەڵ دەسورێت و لەچکەکە بۆی دەبێت بە مایەی زەحمەت .

**دووەمیان** : بۆ ئەوەی ئافرەتی کۆیلە لە ئافرەتی ئازاد جودا بکرێتەوە .

بەڵام زانایانی پێشین دەڵێن نەخێر دەبێت ئافرەتی کۆیلەش وەك ئافرەتی ئازاد لەچك بکات . چونکە ئەو ئافرەتانەی کاتی خۆی لەچکیان نە دەکرد لەناو صحابەکاندا و سلفی صالحدا هەڵس و کەوتیان دەکرد و ئەوانیش زۆر پابەند بوون بە ئایاتەکانی قورئانەوە (**قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم** ) وە سەیری ئافرەتانیان نەدەکرد . بەڵام پاش ئەوەی ئاین زیاتر بڵاو بووەوە و خەڵکی زۆر هاتنە ناو ئیسلامەوە خەڵکی ئیمانیان لاواز بوو . وەك هاوەڵان و پێشین پابەند نەمان بە ئاینەوە بۆیە دەبێت ئافرەتی کۆیلەش لەچك بکات . چونکە فیتنە زۆر بوە و زەمانی هاوەڵان و پێشین فیتنە نەبوو وە زۆربەی زانایان لەسەر ئەم رایە کۆکن بەڵام دژە ئیسلامەکان وەك

کاری ڕۆژانەیان هاتوون فەتوایەکی شێخ عثیمینیان داناوە و دەڵێن ابن تیمیەش هەمان شت دەڵێت وەك لە وێنەی پۆستەکەدا دەبینن . نوسراوە عەورەتی ئافرەتی کۆیلە وەك پیاوە لە ناوکیەوە بۆ سەر ئەژنۆی وە بە قسەی ئەوان بێت کۆیلەکان بە سنگ و مەمکی ڕوتی گەڕاون .بە شەرتێك هیچ کۆمەڵگایەك ١٠٠٠ ساڵ لەبەوبەر ئافرەتیان بەو شێوەیەنەگەڕاوە . تەنانەت ئێستاش کە ئافرەت ئازادە و بە هەموو جۆرێك خۆیان ڕوت دەکەنەوە لە بازاڕەکاندا هیچیان بە سنگ و مەمکی ڕووت ناگەڕێن و تەنانەت لەسەر کەناری دەریاکانیش بە سنگی ڕووت ناگەڕێن مەگەر تاك و تەرا لێرە و لەوێ ئەو کارانە بکەن لە قەراخی دەریا یان لەو قەراخ دەریایانە ئەو کارە دەکەن کە تەنها تایبەتە بە خەڵکی ڕوت و قوت کە ژن و پیاو هیچیان لەبەردا نیە و ئەوانەش خەڵکانێکی کەمن هێندە بێ شەرمن بە ڕووت و قوتی بگەڕێن

ئێستا با بێینە سەر فەتواکەی ابن عثیمین کە ئەوان بڕیویانە . ئێمە بە کاملی دای دەنێین و بۆتان ترجمە دەکەین وە دەڵێت عەورەتی ئافرەتی کۆیلە لە ناوکیەوە هەتا ئەژنۆیەتی وەك پیاو وە ئەگەر نوێژ بکات بەو شێوەیە نوێژەکەی قبوڵە . وە زانایانیش هەمان شت دەڵێن بەڵام شێخ الاسلام ابن تیمیة و ابن حزم پێچەوانەی ئەم بۆچونەن !! وە دەڵێن ئافرەتی کۆیلە وەك ئافرتی ئازادە جیاوازییان نییە و ابن تیمیة دەڵێت هەرچەندە ئافرەتی کۆیلە لە زەمانی پێغەمبە ردا (صلی الله علیه وسلم) وەك ئافرەتی ئازاد لەچکی نەدەکرد . چونکە لەو زەمانەدا خەڵکی وەك ئێستا نەبوون و سەیری ئەو ئافرەتا نەیان دەکرد وەك ئەو پیرێژنانەی کەس سەیریان ناکات وە حسابی ئەو ئافرەتانەیان بۆ دەکردن کە لە ئایەتی ٦٠ ی سورەتی **النوردا** باس کراون ( **فلیس علیهن جناح ان یضعن ثیابهن غیر متبرجات بزینة** ). وە ابن تیمیة دەڵێت بەلام ئەم ئافرەتە جوانە تورکانەی ئێستا وەك ئافرەتانی زەمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نییە و خەڵکەکەش وەك هاوەلان نین بۆیە دەبێت ئافرەتی کۆیلە لەشی دا پۆشێت و وەك ئافرەتی ئازاد لەچك بکات تەنانەت لە کاتی نوێژیش دا دەبێت خۆی دا بپۆشێت . چونکە زەمان و خەڵکی و ڕادەی ئیمانی خەڵکی گۆڕاوە و وەك پێشین نین وە شێخ عثیمین دەڵێت قسەکەی شیخ الاسلام تەواوە و دەبێت شوێن ئەمەیان بکەوین .

واتا شێخ عثیمین دەڵێت قسەی ابن تیمیة تەواوە و نابێت ئافرەتی کۆیلە لەچك نەکات وە دەبێت بیکات کەواتە کاتێك باسی لەچکی ئافرەتی کۆیلە دەکرێت زەمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئافرەتی کۆیلە لەچکی نە دەکرد . بەڵام دوای ئەوان ئافرەتی کۆیلە دەبوایە لەچکی بکردایە چونکە خەڵکی و بار و دۆخەکان گۆڕراون وەك لە سەرەوە باسمان کرد وە عەورەتی ئافرەتی کۆیلە وەك پیاو بووە لە ناوکیەوە بۆ سەر ئەژنۆی بەڵام هیچ ئافرەتێکی کۆیلە بەو شێوەیە نەسوڕاوەتەوە و کاری نە کردوە بەلام وەك حوکمێکی شەرعی حسابی پیاویان بۆ ئافرەتی کۆیلە کردووە و گرنگ نە بووە لە لایان وە ئافرەتی کۆیلە بۆی نەبووە ناوکی هەتا ئەژنۆی دیار بێت و بێتە ناو خەڵکییەوە واتا دەی توانی نوێژ بکات بەو شێوەیە بەڵام بۆی نەبووە بەو شێوەیە بچێتە دەرەوە . خۆشتان دەزانن ئافرەتی کۆیلە لە ماڵ دەر نەچووە و ئەگەر نوێژی کرد بێت نوێژیش بە تەنیا دەکات وە جایز بووە لە ناوکی هەتا ئەژنۆی داپۆشراو بێت لە کاتی

نوێژدا . ئەمەش ڕوخسەتێکە بۆی ئەگینا هیچ پیاوێك بەو شێوەیە نوێژ ناکات بۆچی ئافرەت بەو شێوەیە نوێژ بکات !؟ وە جایز نییە پیاو شانی ڕووت بێت نوێژ بکات کەواتە ئافرەتیش هەمان شتە و هەر کەس موسوڵمان بێت و نوێژ کەر بێت ئەوە دەزانێت.

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : یە ك بەڵگەمان بۆ بهێنن ئافرەتی کۆیلە لە زەمانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) یان دوای ئەو بە ڕووتی گەڕا بێت و سنگ و مەمکی بە دەرەوە بێت و بەس شتێکی لەبەردا بێت ناوکی هەتا ئەژنۆی دا پۆشی بێت . وێنە دا مە **هێنَن** لە زەمانی فۆتۆ شۆپدا بەڵکو بەڵگەی نوسینمان بۆ بهێنە لە سەر چاوە ئیسلامییەکان نەك قسەی ڕۆژ هەلات ناسەکان .

.ئەمەش سەرچاوەی فەتواکەی ابن عثیمین و قسەکەی شیخ الاسلامە کە دژە ئیسلامەکان بڕیویانە و ئێمە بە کاملی لەسەرەوە بۆمان ترجمە کردون بۆ کوردی

Id=114264&Option=FatwaId&index.php?page=showfatwa/fatwa/http://fatwa.islamweb.net

.........................................

**بابەتی ناو لینك**

**السؤال**

ما هو الراجح في حد عورة الأمة؟ وهل عورتها من السرة للركبة لجميع الناس حتى في الشارع مثلا؟ و ما الدليل ؟ والأهم هل ورد عن السلف أن إماءهم كانت تسير كاشفة ؟ أم أنهن كانوا يمشون متسترات كالحرائر؟ وما التوجيه لجواز انكشافها على عكس الحرة مع أن علة التستر موجودة؟ وكلهن في النهاية نساء؟

**الإجابــة**

فجواب هذا السؤال المهم ينبني أولاً على تصور طبيعة المجتمع في عصر السلف، وأنه يختلفُ كثيراً عن المجتمع في زماننا وخاصة أن الرق لم يعد موجوداً.

ولما كانت الإماء تكثرُ إليهن الحاجة في الاستخدام وأمورِ المهنة، وكنّ مبتذلاتٍ بكثرة الذهاب والمجيء، وكان فرضُ الحجاب عليهن مما يشقُ مشقةً بالغة، كان من رحمة الله بعباده أنه لم يفرض عليهن الحجاب كما فرضه على الحرائر، ودليلُ ذلك النص واتفاق السلف.

قال شيخ الإسلام في الفتاوى: قوله قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن} الآية، دليلٌ على أن الحجاب إنما أمر به الحرائر دون الإماء. لأنه خص أزواجه وبناته، ولم يقل وما ملكت يمينك وإمائك وإماء أزواجك وبناتك. ثم قال: {ونساء المؤمنين}. والإماء لم يدخلن في نساء المؤمنين، كما لم يدخلن في قوله {نسائهن ما ملكت أيمانهن} حتى عطف عليه في آيتي النور والأحزاب....إلى أن قال: فهذا مع ما في الصحيح من أنه لما اصطفى صفية بنت حيى، وقالوا: إن حَجّبها فهي من أمهات المؤمنين، وإلا فهي مما ملكت يمينه، دَلّ على أن الحجاب كان مُختصّاً بالحرائر. وفي الحديث دليلٌ على أن أموّة المؤمنين لأزواجه دون سراريه. انتهى.

وقال كذلك: والحجابُ مختصٌّ بالحرائر دون الإماء، كما كانت سُنّةُ المؤمنين في زمن النبي وخلفائه: أن الحُرَّةَ تحتَجِبُ، والأَمَة تبرُز. وكان عمر إذا رأى أَمَةُ مُختَمِرة، ضرَبها وقال: أتتشبهين بالحرائر؟.انتهى

ولكن خالف في هذا أبو محمد بن حزم فذهب إلى أن عورة الأمة كعورة الحرة سواء بسواء ، وانتصر لذلك في المحلى وأطال النفس بما تحسنُ مراجعته منه، وتابعه على قوله بعض المعاصرين كالشيخ الألباني رحمه الله، وقد يبدو لكَ أن هذا القول أحوط ، لكن يرده رداً بينا ما جرت به السنة العملية في عصر السلف .

قال ابن قدامة رحمه الله في المغني: وصلاة الأمة مكشوفة الرأس جائزة هذا قول عامة أهل العلم . لا نعلم أحدا خالف في هذا إلا الحسن ، فإنه من بين أهل العلم أوجب عليها الخمار إذا تزوجت، أو اتخذها الرجل لنفسه، واستحب لها عطاء أن تقنع إذا صلت ، ولم يوجبه .
ولنا ، أن عمر رضي الله عنه ضرب أمة لآل أنس رآها متقنعة ، وقال: اكشفي رأسك، ولا تشبهي بالحرائر . وهذا يدل على أن هذا كان مشهورا بين الصحابة لا ينكر ، حتى أنكر عمر مخالفته كان ينهى الإماء عن التقنع . قال أبو قلابة : إن عمر بن الخطاب كان لا يدع أمة تقنع في خلافته، وقال : إنما القناع للحرائر . انتهى.

لكن يجبُ أن يقيد هذا القول بما إذا كانت الفتنة مأمونة، وأما إذا خيفت الفتنة ووجدت ذرائع الشر فيتحتمُ حينئذٍ سدها وأمرُ الإماء للحجاب دفعاً للفتنة وهذا من أعظم مقاصد الشريعة، وهذا كلامٌ جيد للعلامة ابن القيم رحمه الله بيّنَ فيه أن الأمةَ إذا خيفت الفتنة بانكشافها وجب عليها التستر قطعا، وعبارته: وأما تحريم النظر إلى العجوز الحرة الشوهاء القبيحة وإباحته إلى الأمة البارعة الجمال فكذب على الشارع ، فأين حرم الله هذا وأباح هذا ؟ والله سبحانه إنما قال : { قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم } لم يطلق الله ورسوله للأعين النظر إلى الإماء البارعات الجمال، وإذا خشي الفتنة بالنظر إلى الأمة حرم عليه بلا ريب، وإنما نشأت الشبهة أن الشارع شرع للحرائر أن يسترن وجوههن عن الأجانب، وأما الإماء فلم يوجب عليهن ذلك ، لكن هذا في إماء الاستخدام والابتذال ، وأما إماء التسري اللاتي جرت العادة بصونهن وحجبهن فأين أباح الله ورسوله لهن أن يكشفن وجوههن في الأسواق والطرقات ومجامع الناس وأذن للرجال في التمتع بالنظر إليهن؟ فهذا غلط محض على الشريعة ، وأكد هذا الغلط أن بعض الفقهاء، سمع قولهم: إن الحرة كلها عورة إلا وجهها وكفيها، وعورة الأمة ما لا يظهر غالبا كالبطن والظهر والساق؛ فظن أن ما يظهر غالبا حكمه حكم وجه الرجل، وهذا إنما هو في الصلاة لا في النظر، فإن العورة عورتان: عورة في النظر وعورة في الصلاة ، فالحرة لها أن تصلي مكشوفة الوجه والكفين، وليس لها أن تخرج فيالأسواق ومجامع الناس كذلك . انتهى من إعلام الموقعين.

وزاد العلامة العثيمين الأمرَ إيضاحا ونحنُ ننقل كلامه بطوله لنفاسته وسهولة عبارته، قال في شرحه الممتع على زاد المستقنع:الأَمَةُ - ولو بالغة - وهي المملوكة، فعورتها من السُّرَّة إلى الرُّكبة، فلو صلَّت الأَمَةُ مكشوفة البدن ما عدا ما بين السُّرَّة والرُّكبة، فصلاتها صحيحة، لأنَّها سترت ما يجب عليها سَتْرُه في الصَّلاة. وأما في باب النَّظر: فقد ذكر الفقهاءُ رحمهم الله تعالى أن عورة الأَمَة أيضاً ما بين السُّرَّة والرُّكبة، ولكن شيخ الإسلام رحمه الله في باب النَّظر عارض هذه المسألة، كما عارضها ابن حزم في باب النَّظر، وفي باب الصَّلاة، وقال: إن الأمة كالحُرَّة؛ لأن الطَّبيعة واحدة والخِلْقَة واحدة، والرِّقُّ وصف عارض خارج عن حقيقتها وماهيَّتها، ولا دليلَ على التَّفريق بينها وبين الحُرَّة.

وقال شيخ الإسلام ابن تيمية : إنَّ الإماء في عهد الرسول عليه الصَّلاة والسَّلام، وإن كُنَّ لا يحتجبن كالحرائر؛ لأن الفتنة بهنَّ أقلُّ، فَهُنَّ يُشبهنَ القواعدَ مـن النِّساء اللاتي لا يرجون نكاحاً، قـال تعالى فيهن:{ فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ } (النور: من الآية٦٠)، يقول: وأما الإماء التركيَّات الحِسَان الوجوه، فهذا لا يمكن أبداً أن يَكُنَّ كالإماء في عهد الرسول عليه الصَّلاة والسَّلام، ويجب عليها أن تستر كلَّ بدنها عن النَّظر، في باب النَّظر. وعلَّل ذلك بتعليل جيِّدٍ مقبولٍ، فقال: إن المقصود من الحجاب هو ستر ما يُخاف منه الفِتنة بخلاف الصَّلاة، ولهذا يجب على الإنسان أن يستتر في الصَّلاة، ولو كان خالياً في مكان لا يطَّلع عليه إلا الله. لكن في باب النَّظر إنما يجب التَّستر حيث ينظر الناس. قال: فالعِلَّة في هذا غير العِلَّة في ذاك، فالعِلَّة في النَّظر: خوف الفتنة، ولا فرق في هذا بين النِّساء الحرائر والنِّساء الإماء. وقوله صحيح بلا شكٍّ، وهو الذي يجب المصير إليه. انتهى.

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نەوەد و شەش

## ئازاد کردنی کۆیلە لە نێوان ئیسلامی مەزن و دژەکانیدا

1. وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿النساء: ٩٢﴾

2. لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿المائدة: ٨٩﴾

3. وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿المجادلة: ٣﴾



پرسیارە بێ وەڵامەکان
بۆ هەموو دژە
ئیسلامەکان




---

کاتی خۆی مرۆڤەکان هیچیان حسابی مرۆڤیان بۆ نەکراوە !؟ بەڵکو هەمیشە دوو چین هەبوون چینی کۆیلە و چینی گەورەکان . وە هەمیشە کەمینە لە خەڵکی بە ناوی ئاغا و دەرەبەگ و پادشا و ... هتد حوکمی زۆرینەیان کردوە و خەڵکی ژێر دەسەڵاتیان بە کەم و سوك و کۆیلە بینیووە و مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون وە ئەم یاسایە لە جیهانی کۆندا هەبووە بێ جیاوازی کات و شوێنەکان . وە سەرچاوەکانی کۆیلایەتی زۆر بوون لەوانەش چەند دانەیەکتان بۆ باس دەکەین بە کورتی....

لە کاتی جەنگدا هەر کەسێك بگیرایە دەکرا بە کۆیلە ، ئەگەر کەسێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر برۆ شتایە بە سەفەر و خەڵکی ناوچەکانی تر دەیان گرتن و دەیان کرد بە کۆیلە . ئەگەر یەکێك نەی توانیایە بژێویی ژیانی پەیدا بکات دەچوو بۆ لای سەرمایەدارێك لە بری نان خۆی یان منداڵێکی یان هەموو خێزانە کە دەبوون بە کۆیلەی ئەو کەسە . ئەگەر یەکێك قەرزار بوایە و نەی توانیایە بڕی قەرزەکەی بداتەوە دەبوو بە کۆیلەی خاوەن قەرزەکە هەتا قەرزەکەی دەدایەوە . وە زۆرڕێگای تریش هەبوو بۆ بە کۆیلە کردنی مرۆڤەکان ، بەڵام لە بەرامبەردا هیچ دەوڵەمەندێك و هیچ دەوڵەتێك و هیچ ئیمپراتۆرێك و هیچ دەسەڵاتێك یاسایەکی دەر نەکرد بۆ نەهێشتنی کۆیلە بەڵکو هەر هەموویان هەوڵیان دەدا زیاد کردنی کۆیلە و کۆیلایەتی وە لە هەمووی سەیر تر . ئەم تەوارتەی کە لەبەر دەستمان دایە و بە حساب کتێبێکی خوداییە هیچ دەقێکی تێدا نییە کۆیلایەتی نەهێڵێت یان قەدەغەی بکات . بەڵکو باسی ئەوە دەکات ئەگەر جولەکەیەك لەبەر هۆکار ی قەرز یان نەبوونی یان هەر شتێکی تر کە لەسەرەوەش باسمان کرد ببێت بە کۆیلەی جولەکەیەکی تر کابرای جولەکە ئازادی دەکات بەلام ئەگەر کۆیلەکە جولەکە نەبێت ئازاد ناکرێت هەتا کابرای کۆیلە سقەت نە بێت

واتا کوێر بێت یان شەل یان … هتد . ئەو کات کۆیلەکە ئازاد دەکرێت ، وە پاشان سیدنا مەسیحی کوڕی مەریەم (ع) هات لە ئینجیلەکاندا هیچ یاسایەکی دا نەنا بۆ بنە بڕکردن و ئازاد کردن و قەلاچۆ کردنی نەمانی کۆیلە !؟ وە چەند دەقێك هەیە لە **گەلاتیا** ٣ -٢٨ وە **کۆرنثۆسی** یەك ١٢-١٣ وە باسی کۆیلەیەکیش کراوە لە فلیمۆندا بە ناوی ( ئۆسیمۆس ) . بە هەر حاڵ ئەمانە هیچیان بەڵگە نین بۆ ئازاد کردنی کۆیلە چونکە کاتێك دەقەکانی پێشی دەخوێنیتەوە باسی ئازاد کردنی کۆیلە ناکات بە هیچ شێوەیەك . کەواتە کتێبی پیرۆزیش کە دەکاتە پەیمانی کۆن و پەیمانی تازە و ئێمە پێی دەڵێین تەورات و ئینجیل هیچیان باسی ئازاد کردنی کۆیلەیان نە کردووە ، ئێمە باسی ئەم نوسخەیەی ئێستا دەکەین کە لەبەر دەستماندایە چونکە نازانین نوسخە ئەسڵییەکان ئاماژەی بە کۆیلە کردووە یان نا !؟

پاشان ئاینی مەزنی ئیسلام هات و کەوت بەسەر میراتییەکی قورسی هەزارەها ساڵاندا کە خەڵکی کۆیلا یەتاین بە شتێکی ئاسایی وەرگرت بوو . وە هیچ کەس نە بیری لە ئازاد کردنی کۆیلە کرد بووەوە و نە هیچ یاسایەکی مرۆی یان ئاسمانییان لا بوو بۆ ئازاد کردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی . بۆیە ئاینی ئیسلامی مەزن نەی دەتوانی بە دەقێك یان بە حەدیسێك کۆیلایەتی ڕەت بکاتەوە لە کاتێکدا خەڵکێکی زۆر کار و کاسپییان لەسەر کۆیلە بووە ، یان کابرا کۆیلەیەکی زۆری کڕیوە و ئەگەر پێکەوە هەمویان ئازاد بکات بە گوێرەی دقێکی قورئان زیانێکی زۆر دەکات وە کێشەیەکی مەزن لە نێوان خاوەن کۆیلەکان و ئاینی ئیسلامدا ڕوو دەدات بۆیە نەهێشتنی کۆیلە بە زۆر قۆناغدا باس کراوە لە قورئان و سونەتدا و جوانترین و باشترین و ئاسان ترین جۆریشیان وەك لە سورەتی **المائدة** ٨٩ دا باسی ( اللغو في الايمان ) ئێمە هەمووان فێرین کاتێك قسە دەکەین دەڵێین وەڵا نازانم بە خودا نەم بینیوە یان … هتد. مەبەست لەوەیە خەڵکی سوێند دەخوات بە بێ ئەوەی مەبەستی لە سوێنەکە بێت . وە شتێکە مرۆڤ دەمی پێی ڕاهاتووە و خودا هیچی لەسەر حساب ناکات بەڵام ئەگەر ئەو سوێندەت خوارد و مەبەستت بوو شتەکە بکەیت پاشان نەت کرد . بۆ ئەوەی پاك بیتەوە لەو سوێند خواردنە کۆیلەیەك ڕزگار بکە بەڕێزان ئەم خاڵە زۆر گرنگە و پڕ مانایە بۆ خەڵکانێك ی خاوەن هزر و لۆژیك کە بیر بکەنەوە لە گەورەیی ئەم ئایەت و دەستورە بۆ ڕزگار کردنی کۆیلە . وە زۆر دەقی تریش هەیە بۆ ڕزگار کردنی کۆیلە وەك لە وێنە کەدا دەیبینن . وە ئاینی ئیسلامی مەزن لە ماوەی ١٤٠٠ ساڵدا کۆیلایەتیی نەهێشت وە یەکەم ئاین و یەکەم دەوڵەت بوو بۆ ئازاد کردنی کۆیلە . و پاش هاتنی ئیسلامیش لە ڕۆژ ئاوادا مرۆڤ هیچ سەنگێکی نە بوو !؟

دوو جۆر مرۆڤ هەبوون یان کۆیلە بوون یان گەورە و ئاغا و دەسەڵات داری کۆیلەکان بوون . وە هیچ شتێك یان یاسایەك نەبوو ناوی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بێت و خەڵکی لە ڕۆژ ئاوا کاریان دەکرد بۆ گەورەکانیان بۆیە لە ساڵی ١٩٤٨ دا نەتەوە یەك گرتووەکان یەکەم بڕاری مافی مرۆڤی دەرکرد . لەوانەیە تا ئێستا هیچ کام لە ئێوە بیری لەو ناوە نە کرد بێتەوە !؟ یاساکانی ( مافی مرۆڤ ) بۆچی ناو نراوە مافی مرۆڤ ؟ ئایا پێش ئەو کاتە مرۆڤەکان لە ڕۆژ ئاوا مافیان هەبووە ؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر مافیان نە بووە و بە مرۆڤیش حساب نەکراون . چونکە ئەگەر بە مرۆڤ حساب بکرانایە و مافیان هەبووایە . ئەو کات یاساکانیان ڕێك دەخست و شتی نوێیان

دەهێنایە کایەوە نەك یاسا دانێن بە ناوی مافی مرۆڤەوە و لە ساڵی چل و هەشتەوە حساب بۆ مرۆڤایەتیی مرۆڤ بکرێت و سی بەندی بۆ دا بنێن . وە خۆشتان دەتوانن بچن بۆ ماڵ پەڕی ڕەسمیی نەتەوە یەك گرتوەکان و ئەو سی خاڵە بزانن چییە ؟ وە بەراوردی بکەن لەگەڵ ئاینی ئیسلامی مەزندا کە ١٣٩٠ ساڵ پێش نەتەوە یەك گرتوەکان جوانترین و بەرزترین یاسای بۆ مرۆڤ داناوە . لە کاتێکدا ڕۆژئاوا حسابی مرۆڤی بۆ مرۆڤەکان نە کردووە هەتا ساڵی چل و هەشت . وە پاش جەنگی جیهانیی دووەم حسابیان بۆ هاوڵاتی کردوە وەك مرۆڤ . لەگەڵ ئەوەشدا هەر مرۆڤیان کردەوە بە کۆیلە جارێکی تر و ئەم جارە کۆیلایەتی بەردەوام بوو لە ژێر سایەی سەرمایە داری و جیهانی نوێ و مۆدە و تازەکاری و پێداویستییەکانی تاك لە جیهاندا و ئێستا ئەو کۆیلایە تییە کوردوستانی خۆشمانی گرتوەتەوەئەویش بە دابین کردنی ماڵ و شمەکی ناو ماڵ ئۆتۆمۆبێل و هەر شتێکی تر بتەوێت بە اقساط دەتوانیت بیهێنیت و دەبێت هەتا دەمریت بۆ چەند دوکانێك یان کۆمپانیایەك کار بکەیت . کۆیلایەتیی زەمانی عولمة و پێشکەوتن هەر هەمان کۆیلایەتیی کۆنە . جاران کابرای کۆیلە کاری دەکرد بۆ ئەوەی بتوانێت بژێویی ژیانی یان قەرزەکانی لە سەرێتی بیداتەوە. ئێستاش بە هەمان شێوە کۆیلەی بژێویی ژیانمانین بە دانەوەی اقساطی و شمەکانەی هێناومانە و دەبێت هەتا بمرین کۆیلە بین و قەرزەکانمان بدەینەوە و کار بۆ سەروتر لە خۆمان بکەین

_**پرسیاری بێ وەڵاممان ئەمانەیە** : پێمان بڵێن پێش ئیسلام و پاش ئیسلام کێ یەکەم کەس بووە کۆیلایەتیی قەدەغە و بنە بڕ کردووە ئەوانەی دەڵێن ئاینی ئیسلام خەڵك دەکات بە کۆیلە با بە بەڵگە پێمان بڵێن ئەگەر ئێستا خیلافەتی ئیسلامی سەری هەڵ دایەوە ئایا ئیسلام خەڵك دەکات بە کۆیلە ؟ ئەگەر دەڵێیت بەڵێ ... فەرموو بەڵگەمان بدەرێ بە ئایەت یان بە حەدیس

تکایە گەمژە مەبە و باسی **داعشمان** بۆ بکەیت . دەڵێم دەقم بدەرێ لە قورئان یان حەدیسی صحیح کە بڵێ ئاینی ئیسلام خەڵکی دەکات بە کۆیلە یان لە مێژودا وڵاتیان فتح کردوە و خەڵکییان کردووە بە کۆیلە_ئادەی دژە ئیسلام بڕۆ سەیرێکی مافەکانی مرۆڤی نەتەوە یەك گرتووەکان بکە و بەراوردی بکە لەگەڵ مافەکانی مرۆڤ لە ئاینی ئیسلامی مەزندا . بزانە کامیان بەرز تر و باشترە ؟ بۆچی یاسای مرۆڤت قبوڵە و یاسای خودات قبوڵ نییە ؟ ئادەی دژە ئیسلام و موسوڵمان هەردوکتان پێکەوە پێم بڵێن تاکەی ژیانتان بە کۆیلەیی دەبەنە سەر و کار دەکەن بۆ اقساطی شمەکەکانتان ؟ ئایا ئێوەش هەر کۆیلە نین ؟ ئایا چۆن دەتوانیت خۆت لەو کۆیلایەتییە ڕزگار بکەیت ؟ ئایا هەموو جیهان لە ئێستادا کۆیلەی چەند کۆمپانیایەك نین وە کاریان بۆ بکەن بۆ ئەوەی اقساطەکانیان بدەنەوە ؟

................

## ڕێگەکانی هەولی نەهێشتنی کۆیلایەتی لەئیسلام:

١)-وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ) (النساء : ٣٦)

واتە (خوای گەورە بە تەنها بپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن وە ڕەفتارتان جوان بی لەگەڵ دایك و باوکتان وە ئەو کۆیلانەی لە ژێر دەستتان دان

.(لەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان ئەکات چۆن لەگەل دایك باوك چاك ئەبێت ئاواش ئەبێت لەگەل کۆیلە چاك بیت ) خوای گەورە لەم ئایەتە گەورەکان فێرە ڕێزکردن ئەکات بەرامبەر چینی دووەم

٢)-أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهُمْ مِنْ لَبُوسِكُمْ، وَلا تُعَذِّبُوا خَلْقَ اللهِ

مسلم (١٦٦١)، وأحمد (٢١٥٢١)، والبخاري: الأدب المفرد ٧٦/١ واللفظ له

واتە:(لەو خۆراکە خۆراکیان بدەنێ کەخۆتان ئەیخۆن وە لەو جل وبەرگەیان بکەنە بەر کە خۆتان ئەیکەنە بەر وە دروستکراوی خودا سزا مەدەن و ئازاری مەدەن )

٣"-لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي وَأَمَتِي. كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللَّهِ، وَكُلُّ نِسَائِكُمْ إِمَاءُ اللَّهِ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: غُلاَمِي وَجَارِيَتِي، وَفَتَايَ وَفَتَاتِي"رواه البخاري (٢٤١٤)، ومسلم: (٢٢٤٩)

واتە:(هیچ کەسێك لەئیوە نەلێت کۆیلەکەم و بەندەکەم . هەموتان بەندەی خودان بەلکو بلێن کورەکەم و خزمەتکارەکەم و کچەکەم )

٤-وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ) [النساء : ٩٢)

واتە هەر موسوڵمانێک موسوڵمانێک بکوژی بە هەڵە ئەوە دەبێ(کویلەیەکی باوەردار ئازاد بکات) وە خوێنیش بدات بە کەس و کاری کوژراوەکە .

٥ -لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ .........أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ....) [المائدة : ٨٩] ئەمانەی سوێند ئەخۆن یەکێك لەکەفارەتەکانی ئەوەیە کۆیلەیەك رزگاربکات

٦) -وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (المجادلة : ٣)

ئەوانەی خێزانەکانیان بەدایکیان یان خوشکیان ئەشوبهێنن یەکێك لەکەفارەتەکانی ئەوەیە کۆیلە رزگار بکات

٧-وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ [النور : ٣٣]

واتە (ئەو کەسانەی کە دەیانەوەی خۆیان ئازاد بکەن (لە کۆیلەکانتان) ئەوە ئێوە لەگەڵیان ڕێک بکەون و ڕێگەیان بۆ ئاسان بکەن.

٨ -الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ) [البقرة : ١٧٧]

واتە( بەڵکو کرداری باش و چاک ئەوەیە کە بروات بە خوا و بە ڕۆژی دوایی .........ماڵ و سەروەت و سامانت ببەخشی لە پێناو (الرِّقَابِ) ڕزگار کردنی کۆیلە

٩"-مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً أَعْتَقَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهَا عُضْوًا مِنْ أَعْضَائِهِ مِنَ النَّارِ حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ"روه البخاري(٦٣٣٧)، مسلم (١٥٠٩)
واتە:(هەرکەس کۆیلەیك ئازاد بکات بەهەرئەندامیکی ئەم کۆیلەیە ئەندامیکی ئەم کەسە ئازاد ئەبێت لە ئاگر هەتا وای لێ یەت ئازاد ئەبێت لە ئاگر)

١٠-فَكُّ رَقَبَةٍ [البلد : ١٣] واتا (ڕزگار کردنی کۆیلەیە).

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نەوەد و حەوت

## بۆ باوەڕ دارانی بیگ بانگ

دەڵێن گەردون بە هۆکاری تەقینەوەی مەزن ( بیگ بانگ ) دروست بووە

پرسیاری ئەم جارەمان زۆر کورت و پوخت و پڕ مانایە

ئەو بەردە ی کە تەقییەوە و گەردونی دروست کرد . کێ دروستی کرد و کەی دروست کرا ؟

کێ بوە هۆکاری تەقینەوەی ئەو بەردە مەزنە و ئەم ئەستێرە و هەسارانەمان بۆ دروست بکات ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نەوەد و هەشت

## ئایا شەیتان بە ئەستێرە ڕەجم دەکرێت ؟

دژە ئیسلامەکان دەڵێن چۆن دەبێت شەیتانەکان بە ئەستێرە ڕەجم بکرێن و ئەستێرەیان تێ بگرن لە کاتێك دا دەیانەوێت لە ئاسمان گوێ بگرن بۆ ئەو فەرمانانەی بۆ فریشتەکان دەر دەچێت وە خوداش ئەستێرەیان تێ دەگرێت !؟ وە چۆن ئەو ئەستێرانە دەگرنە شەیتانەکان لە کاتێکدا ئەستێرە هەیە بە چەندەها جار لە قەبارەی زەوی گەورەترن ؟ وە ئایەتی ٥ ی سورەتی **الملکیان** کردوە بە بەڵگە دەفەرموێت **(انا زینا السماء الدنیا بمصابیح و جعلناها رجوما للشیاطین و اعتدنا لهم عذاب السعیر.)**

ئەگەر ئایەتەکە ڕاڤە بکەین بۆ کوردی دەڵێت ئاسمانی دنیامان ڕازاندوەتەوە بە چراکان وە کردومانە بە ڕەجم کەری شەیتانەکان . چراکان مەبەستی لە ئەستێرەکانە لە شەودا وەك چرا دەدرەوشێنەوە و دا دەگیر سێن . وە ئەگەر خودا ئەو ئەستێرانە بگرێتە شەیتانەکان و بیان سوتێنێت !! شەوانە وەك یاری بلیارد ئەو ئەستێرانە دەبن بە تۆپ و هیچیان لە جێگای خۆیان نا مێنن و یاری

دەکەن و بە دڵنیاییەوە زۆر لەمێژ بوو زەوی نە دەما و ئەستێرەیەکی هەر بەر دەکەوت . وە دڵنیا بن مەبەست لێرەدا ئەوە نییە ئەستێرە بگرێتە شەیتانەکان بەلام ئەو ئەستێرانە هۆکاری ڕەجمەکەن

بۆ ئەوەی زیاتر ئەو مانایەمان بۆ ڕوون ببێتەوە . ڕەجم کردنی ئەو شەیتانانە کە دەچن بەرەو ئاسمانی دنیا و گوێ دەگرن بزانن فەرمانی خودا چییە بۆ فریشتەکان لە ئایەتی **الحجر** ١٨ دا دەفەرموێت ئاسمانمان کردوە بەهەسارەکان و ڕازاندومانەتەوە بۆ ئەوانەی سەیری دەکەن وە پاراستومانە لە هەموو شەیتانێك ئیلا هەندێکیان نە بێت کە دەیەوێت شتێك ببیستێت ( **فاتبعه شهاب مبين** ) با لێرەدا باسی شهاب بکەین چییە ؟ شهاب واتا هەر ئاگرێك بلاو ببێتەوە ( نار ساطعة ) . بۆ ئەوەی جوانتر ماناکەی ڕون بێتەوە لە سورەتی **النمل** ٧ دا باسی موسا (ع) دەکات کاتێك ئاگرێك دەبینێت بە خێزانەکەی دەڵێت دەچم بۆ لای ئەو ئاگرە و ( **اتيكم بشهاب قبس** ) واتا لە سەر پارچە دارێك ئاگرێکتان بۆ دەهێنم . وە دیارە موسا (ع) ئەو شەوە هیچی پێ نەبووە ئاگری پێ بکاتەوە . بۆیە چووە لەو ئاگرە دارێکی ئاگراوی بهێنێت و ئاگری پێ بکاتەوە هەمیشە ئەگەر کەسێکیش دارێکی پێ بێت سەرەکەی ئاگری پێوە بێت و ڕێگا بکات بە شەودا لە تاریکیدا ئەو ئاگرە دوکەڵێك بە دوایدا دەڕوات و لە دورەوە دەبریسکێتەوە ئەوە پێی دەڵێن ( شهاب ) بە کلك دارە کساوەکانیش دەگوترێت ( شهب ) هەموو ئەستێرەکانیش ئاگر فڕێ دەدەن وە ئێمە لە ئاسماندا دەیان بینین وەك ئەوە وایە ئاگرێك بێت بەسەری دارێکەوە یان شقارتەیەك . چونکە ئاگر و ڕۆشنایی دەبینین وە شتێکیشی بە دواوە دەکشێت وەك کلك وە ئەو ئایەتانەی باسی ڕەجمی شەیتانەکان یان جن دەکات هەر هەموی دەڵێت ( شهاب ناڵێت کوكب یان نجم !؟ ) بە هەر حاڵ لە سورەتی **الحجر** ١٨ و **صافات** ١٠ دا دە فەرموێت ( **فاتبعه شهاب** ) واتا ئەو شەیتانانەی دەیانەوێت گوێ بگرن ئاگرێك شوێنیان دەکەوێت . ئایەتەکە ناڵێت نرمیهم بشهاب بەڵکو دەڵێت فاتبعه واتا شوێنی دەکەوێت . وە هیچ لە ئایەتەکان ناڵێت ئەو کلکدارانەیان تێ دەگرین بەڵکو دەڵێت شوێنی دەکەوێت ( اتبعه نەك ارمیه یان نرمیه ) ئەم خاڵە زۆر گرنگە ئاگاداری بن لە سورەتی **الجن** ٩ دا باسی ئەوە جنۆکانە دەکات کاتی خۆی دەچون بۆ ئاسمان و گوێیان دەگرت بەڵام ئەم شەوە ناتوانن هیچیان گوێ بگرن وە بە هەمان شیوە باسی شهاب کراوە و دەڵێت ( **يجد له شهابا رصدا** ) واتا هەر جنێك بیەوێت گوێ بگرێت ڕزگار بونی نییە و نیشانە و رەصەدی لێ دەگیرێت و دەسوتێنرێت

ئەگەر دیقەت بدەن لە ئایەتی١٨ ی **حجر** و ئایەتی ١٠ ی **صافاتدا** دەڵێت شهابەکە یان ئاگرەکە یان نیزکەکە شوێنی دەکەوێت وە احتماله لێ بدات و احتماله لێی نەدات . بەلام لە ئایەتی ٩ ی سورەتی **جندا** ١٠٠% لێ دەدات و رەصەدی بۆ گیراوە و رزگار بوونی نییە !؟ وە بەس تەنها ئەو شەوە هیچ کام لە جنەکان نەیان توانیوە گوێ بگرن و حتما سوتێنراون

وە ڕوون کردنەوەی ئەم گومانەی ئایەتی ٥ ی سورەتی **الملك** ( **و جعلناه رجوما للشياطين** ) لە ئەو **سێ** ئایەتەدایە کە لە سەرەوە باسمان کرد واتا شهابیاب تێ دەگیرێت نەك ئەستێرە !؟ وە ئایەتی ٥ ی سورەتی ملکیش بە هیچ شێوەیەك دیاریی نەکردووە چییان تێ دەگیرێت !؟ بەڵکو تێ گە رتنەکە لەو **سێ** ئایەتەی تردایە کە باسمان کرد .. وە لە وێنەی پۆستەکە ئایەتەکانمان دا ناوە . وە هیچ

کاتێك خودا ئەستێرە ناگرێتە شەیتانەکان بەڵکو کلك دارەکانن کە دەیان بینین لە ئاسماندا و دەکشێن وەك بینیتان خودای تعالی ئەستێرەیان تێ ناگرێت بەڵکو ( شهاب یان شهب ) یان تێ دەگرێت وە ئەو ئایەتەی ٥ ی سورەتی الملك کە ئەوان کردویانە بە بەڵگە بە هیچ شێوەیەك ناڵێت ئەستێرەیان تێ دەگرین .

**پرسیاری بۆ وەڵامان** ئایەتی ٨ ی سورەتی **صافاته** کە دەفەرموێت ( **لا یسمعون الی الملأ الاعلی و یقذفون من کل جانب**)_واتا کاتێك شەیتانەکان دێن گوێ بگرن ناتوانن گوێ بگرن و لە هەموو لایەك تێیان دەگرن ... دیقەت بدەن ناڵێت چیی تێ دەگرن ؟ باسی ئەستێرە ناکات وە باسی شهابیش ناکات . ئیتر کڵێسا ئەم قسەیەی لە کوێ هێناوە دەڵێت ئەستێرەیان تێ دەگرن ؟

**پرسیاری بێ وەڵامان ئەمەیە** : کام دەقە لە قورئان یان لە حەدیسدا دەڵێت ئەستێرە دەگرنە شەیتان و جنەکان ؟ فەرموو دەقەکەمان بۆ دا بنێن ؟_فەرموو کاکی زانست باز تۆش پێمان بڵێ هەوری ئۆرط چییە ؟ ئایا ئەستێرەن یان شهابن لە هەموو لایەکەوە دەهاوێژرێن ؟ بۆ زانیاری زیاتر خۆتان دەتوانن بگەڕێن بە دوای ئۆرطدا و لێرە بە انگلیزی ناوەکەیمان بۆ داناون (Oort cloud)

.........................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :نەوەد و نۆ

## گومانی دەست پەڕ بە دەستی منداڵ لە ڕەمەزاندا

بدائع الفوائد

لابن القیم الجوزیة

المجلد الأول

المجلد الثاني

المجلد الثالث

المجلد الرابع

المجلد الرابع

بدائع الفوائد

ابحث في الكتاب: مثانته

إلى الشغل بما برئت منه واحتمل أن يلزمه القضاء لأن الإطعام بدل إياس وقد تبينا ذهابه فأشبه المعتدة بالشهور لليأس إذا حاضت في أثنائها.

في الفصول روى عن أحمد في رجل خاف أن تنشق مثانته من الشبق أو تنشق انثياه لحبس الماء في زمن رمضان يستخرج الماء ولم يذكر بأي شيء يستخرجه قال: "وعندي أنه يستخرجه بما لا يفسد صوم غيره كاستمنائه بيده أو ببدن زوجته أو أمته غير الصائمة فإن كان له أمة طفلة أو صغيرة استمنى بيدها وكذلك الكافرة ويجوز وطؤها فيما دون الفرج فإن أراد الوطء في الفرج مع إمكان إخراج الماء بغيره فعندي أنه لا يجوز لأن الضرورة إذا رفعت حرام ما وراءها

[جزء / صفحة] 4 97 [الرقم]

دژە ئیسلامەکان گەڕاون و گومانیان لەسەر هەموو سەرچاوە ئیسلامییەکان دروست کردووە . بەڵام ئاینی ئیسلامی مەزن لوتکەی هێندە بەرزە ئەم گەندەلانە ناتوانن سەیری قەد پاڵەکەشی بکەن !؟ بەڵگە شمان زۆرن ئەگەر لە پەیجەکەماندا بگەڕێن چۆن گەندەڵی و سەر شۆڕیی ئەمانە دەر دەخەین بە ئاینی ئیسلامی مەزن وە هەروەها وەك كاری بێ شەرمانەی هەموو جارێکیان . ئەم جارەیان ئەو گومانە پوچەڵ دەکەینەوە کە تێیدا دەڵێن ئاینی ئیسلام ڕێگای داوە بەوەی پیاو دەسپەڕ بکات بە دەستی منداڵی بچکۆلە لە کاتێکدا بە ڕۆژو بێت وە بەڵگەشیان بۆ قسەکانیان کتێبی بدائع الفوائد ی **ابن قیم الجوزیة** بەشی ٤ لاپەڕە ٩٧ وەك لە وێنەکەدا دەی بینن ئەمەش سەرچاوەی کتێبەکەیە،

http://shamela.ws/browse.php/book-12003#page-871

ئەو دەقە بە کوردی : ابن قیم لە ئیمامی احمدی کوڕی حنبلەوە دەگێڕێتەوە . ئەگەر یەکێك زۆر جنسی بو وە ئاوی زۆر بوو لە کاتی ڕەمەزاندا و ترسی ئەوەی هەبوو میزەڵدانی یان گونی ئازار بدات و بیتەقێنێت وە نەی زانی چۆن ئەو تۆوە فڕێ بدات امام احمد دەڵێت لای من وا باشە ئەو کەسە ئەو تۆوە دەر بکات لە لەشی بە شەرتێك ڕۆژوی بەرامبەری بەتاڵ نەکاتەوە . وەك ئەوەی بە دەستی خۆی ئاوەکە بهێنێتەوە یان بیهێنێت بە لاشەی ژنەکەیدا یان کۆیلە کەیدا ئەگەر بە ڕۆژوو نەبن وە ئەگەر کچی کۆیلەی منداڵی هەبوو یان کۆیلەی کافر دەکرێت بە دەستی ئەوان ئاوەکەی بهێنێتەوە

لێرەدا ڕاڤەی ئەو دەقە بۆ کوردی تەواو بوو، کە دژە ئیسلامەکان دەڵێن لە ئیسلامدا دەکرێت زەوقت هەڵ بستێت و بە دەستی منداڵ ئاوت بهێنیتەوە . وەك بینیتان ئەو قسەیە هی ئیمام احمدی کوڕی حنبلە و ئیمام ابن قیم باسی دەکات وە لێرەدا باسی حوکمی شەرعیی کەسێك دەکات کە زۆر جنسی بێت و ئاوی زۆر بێت و نەتوانێت سەیتەرە بکات بەسەر خۆیدا لە ڕەمەزاندا_واتا باسی هەموو کەسێك ناکات !؟ بەڵکو باسی کەسانێکی دیاری کراو دەکات وە ئەو حوکمە بۆ هەموو خەڵك نییە وە بە مەرجە و مەرجەکانیشی ئەمانەیە

**یەکەم** : ئەگەر ئەو تۆوەی لە لەشیدایە دەری نەکات تووشی زیانی بکات و ئەو کەسە بخاتە حاڵەتی نەخۆشیی مەزن یان مردنەوە

**دووەم** : ئەو کارە دەکات کارێکی نا شەرعییە بەڵام بۆیە دەی کات بۆ ئەوەی توشی زیانی زیاتر نە بێت چونکە دەست پەڕ لە ئیسلامدا جایز نییە

**سێ یەم** : دەبێت ئاو هێنانەوەکەی بەم شێوانە بێت . بە دەستی زەکەری بجوڵێنێت هەتا تۆوەکە فڕێ دەدات . یان بهێنێت بە لاشەی ژنەکەیدا یان ئافرەتە کۆیلەکەیدا بە مەرجێك هیچیان بە ڕۆژو نەبن یان بە دەستی کچی کۆیلەی بچوك یان کافر ئاوەکە بهێنێتەوە نەك سەر جێیان لەگەڵدا بکات . وە دەبێت ئەو کەسە پاش ڕەمەزان ئەو ڕۆژە بە ڕۆژوو ببێت و بیگرێتەوە

دوژمنانی ئیسلام بە هەموو شێوەیەك گومان دەخەنە ناو دڵ و منهجی موسوڵمانەوە . بەڵام وەك دەبینن ئەو حوکمە حوکمێکی تایبەتە و بۆ کەسێکی تایبەتە و بۆ هەمو خەڵکی نییە و لەوانەیە هەتا ڕۆژی قیامەتیش کەس توشی حاڵەتێکی لەو جۆرە نەبێت بەلام ئەو کەسانەی کە شەرعیان داناوە هەموو احتمالێکیان داناوە . نەوەك کەسێکی لەو شێوەیە پەیدا بێت و بۆ ئەوەی توشی زخیان نەبێت حوکمی ئەو شتەیان لا بێت ئەو کەسە چۆن مامەڵە بکات . وە لە یاسا وازعییەکانی مرۆڤیشدا و لە دادگاکاندا هەمان شت هەیە . بەڵام لە دادگاکاندا حوکمی نوێ کاتێك دا دەنرێت ئەگەر ڕوداوێك ڕوو بدات_وە ئەوان ئەو یاسایەیان لا نەبێت یان یاساکە هەبێت و ئەو بەشەی تێدا نەبێت بۆی زیاد دەکەن . وە زانا یانی ئیسلام ئەقڵیان فراوان بووە و احتمالی ئەو حاڵەتەیان داناوە و دەڵێن ئەگەر ڕوی دا دەتوانێت بەم شێوەیە مامەڵە بکات . وە زۆر حوکمی شەرعیی تریش هەیە دانراوە و کاری پێ ناکرێت و بۆ کاتێك دانراوە ئەگەر شتێکی دەگمەنی لەو جۆرە ڕویدا ئەو کات کاری پێ دەکرێت . وەك ئەم حوکمەی ئێستا باسمان کرد وە دژە ئیسلامەکان هاتوون هەڵیان گێڕاوەتەوە

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمانەیە** : ئایا ئەو حوکمە بۆ هەموو کەسە یان تایبەتە ؟ ئایا حاڵەتی پیاوێك لەو جۆرە لەناو خەڵکیدا بە ڕێژەی چەند ڕوو دەدات ؟ ئایا ئەو حوکمە بۆ پاراستنی ژیان و تەندروستیی ئەو کەسەیە یان نا ؟ ئایا دەڵێت بە دەستی هەموو منداڵێك دەسپەڕ بکەن ؟_ئایا ئەگەر ئێستا کەسێکی لەو جۆرە پەیدا بو زۆر جنسی بو تۆوی زۆر بوو . ئافرەتی کۆیلە یان منداڵی کۆیلە هەیە یان ماوە ئەو کارەی لەگەڵدا بکات ؟ ئایا کاتی خۆی هەموو کەس کۆیلەی هەبووە هەتا ئەو کارە بکات ؟

بەڕێزان وەك بینیتان ئەوە حوکمێکی تایبەتە بۆ کەسێکی تایبەت بۆئەوەی نەخۆش نەبێت یان ئەو ئاوە زیادەیە توشی نەخۆشیی نەکات . وەك بینیتان لە ئێستادا ئەو حوکمە کاری پێ ناکرێت چونکە ئەگەر کۆیلە نەماوە و ئەگەر کابراش ژنی نەبێت یان ژنی هەبێت و بە ڕۆژو بێت ناتوانیت هیچ بکات ناچارە بە دەستی خۆی ئەو کارە بکات نەك بە دەستی منداڵێك

..........................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد

## ئەم ئایەتەی قورئان لە کوێی ئینجیلدا نوسراوە ؟

1. وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿الصف: ٦﴾

لە قورئاندا سورەتی **الصف** ٦ دا دەفەرموێت ( **وإذ قال عيسى ابن مريم يا بني إسرائيل إني رسول الله إليكم مصدقا لما بين يدي من التوراة ومبشرا برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد فلما جاءهم بالبينات قالوا هذا سحر مبين** )

لێرەدا قورئان لە زمانی عیسای کوڕی مریمەوە (ع) پێمان دەڵێت بە بنو ئیسرائیلی گوتووە پێغەمبەرێك دوای من دێتناوی احمدە واتا پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) مەسیحییەکانیش دەڵێن فەرموون ئەمە ئینجیل و پێمان بڵێن لە کوێدا ئەو ئایەتە نوسراوە ؟ وە ئەگەر هەر (٤) ئینجیلەکە بگەڕێین ئایەتی لەو شێوەیەی تێدا نا دۆزینەوە.

با ئێمەش ئینجیلەکانیان بگەڕێین بزانین چی تێدا نوسراوە ؟

لە ئینجیلی **یۆحنادا** بەشی ٢١ دەق ٢٥ دا کە دەکاتە کۆتا لاپەڕە و دێڕی ئینجیلی **یۆحنا** نوسیوێتی : زۆر شتی دیکە هەیە عیسا کردویەتی ئەگەر یەك لەدوای یەك بنوسرابایە وابزانم خودی جیهان جێگای ئەو پەڕتووکە نوسراوانەی تێدا نەدەبۆوە. لێرەدا **یوحنا** پێمان دەڵێت کە نەی توانیووە هەموو شتەکانی مەسیح بنوسێتەوە چونکە جێگای لە هەموو کتێبەکانی جیهاندا جێگای نە دەبووەوە ،هەر **یۆحنا** لە ئینجیلەکەیدا بە حسابی ئەوان باسی هەستانەوەی مسیح (ع) دەکات پاش لە خاچ دانی لە بەشی ٢٠ دەق ٣٠ نوسیوێتی : عیسا لەبەردەم قوتابییەکانی زۆر نیشانەی دیکەی کرد کە لەم پەڕتوکەدا نەنوسراوە. واتا مسیح پاش هەستانەوەی زۆر شتی تری کرد بەڵام لە ئینجیلدا نەیان نوسیوە .

لە ئینجیلی **لۆقا** بەشی ٤ دەق ٤٠ دا نوسراوە : ڕۆژ ئاوابوو، هەموو نەخۆشەکانیان هێنایە لای عیسا، بە نەخۆشی جۆراوجۆرەوە، ئەویش دەستی لەسەر هەریەکەیان دانا و چاکیکردنەوە ئەو نەخۆشانە چەند دانە بوون و جۆری نەخۆشیەکانیان چی بوو ؟ بۆچی نە نوسراوە ئینجیلی **مەرقۆس** بەشی ١ دەق ٢١ و ٢٢ دەڵێت مسیح (ع) چووە بۆ کفر ناحوم و شتی زۆر سەیری فێر دەکردن وە خەڵکی زۆر سەرسام بوون بەو شتانەی فێری دەکردن ئایا ئەو شتانە نوسراوە لە ئینجیلدا ؟ چی فێر کردن ؟ لە کوێدا نوسراوە ؟ هیچیان وەلامیان نیە و دیار نییە

ئینجیلی **لۆقا** بەشی ٢٤ دەق ١٣ هەتا ٢٧ باس دەکات کاتێك مسیح (ع) بە حساب لە خاچ هەستایەوە دوو کەسی بینی باسی لە خاچ دانەکەیان دەکرد وە مسیحیش ئەوسا دەستی پێکرد لە موسا و لە هەموو پێغە مبەرانەوە ئەو شتانەی دەربارەی خۆی بو لە هەموو نوسراوەکاندا بۆیان ڕوون بکاتەوە ..کوان ئەو هەموو بەسەرهاتانە لە موساوە هەتا عیسا (ع) لە کوێی ئینجیلەکاندا نوسراون ئەمانیش دیار نین

لە **اعمال الرسلدا** ( کردار ) بەشی ١ دەق ٣ دا باسی ئەوە دەکات مسیح (ع) پاش لە خاچ دانی زیندو بوەوە و بۆ ماوەی ٤٠ ڕۆژ لەناو قوتابیەکانیدا بوو باسی شا نشینی خودای بۆ دەکردن بەڵام نوسین و قسە و باسی شانشینی خودا لەو ٤٠ ڕۆژەدا دیار نییە و بزرە

لە كۆتا بەشی ئینجیلی **متا** ٢٨ وە كۆتا دێڕی ٢٠ دەڵێت پاش ئەوەی مسیح زیندو بوەوە و بۆ ماوەی ٤٠ ڕۆژ لە ناو قوتابیەكانیدا بوو پێی گوتن : برۆن ئەو شتانەی فێرم كردون بە هەموو نەتەوەكانی بڵێن. بەلام ئەم شتانەش لە ئینجیلی مەتادا دیار نیە و نە نوسراوە چییە فێری كردون

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئایا ئەو هەموو راستی و كارانە بۆچی نە نوسراوە لە ئینجیلدا ؟ ئایا ئینجیلەكەتان هەمو و شتێكی تێدا نوسراوە ؟ بێ گومان نەخێر بەڵگەشمان ئەو دەقانەی سەرەوەیە لە خودی ئینجیلە كەی خۆتانەوە . دەڵێت زۆربەی زۆری شتەكڤان نە نوسراوە و نە زانراوە .

فەرموو جەنابتان ئەو دەقانەمان بۆ بهێنە كە باسمان كرد یان ئینجیلی مەسیحمان بۆ بهێنە . نەك ئینجیلی متا و مرقۆس و لوقا و یوحنا . خۆ ئەو چوارە هیچیان قوتابیی مسیح (ع) نەبوون هەتا ئینجیل بنوسنەوە و ئەو وتەیەی مسیحیش بنوسنەوە كە دەڵێت ( **یاتي رسول من بعدي اسمە احمد**)كاكی گاور تۆ جارێ كتێبەكەی خۆت رێك بكەرەوە و بزانە چۆن ئەم ئینجیلانەت بە دەست گەیشتووە ؟

ئەو كات داوامان لێ بكە ئایەتی ٦ ی سورەتی **الصفت** بۆ بدۆزینەوە لە ئینجیلدا . كاكی گاور تۆ لە پێشدا بۆمان بسەلمێنە یە ك دانە لە نوسەرانی ئینجیل مسیحی كوڕی مریەمیان بینی بێت و ئینجیلەكانیان بە گوێرە ی ڕوداوەكان و ئەوانەی بیستویانە نوسیبێتیان ئەو كات داوای بەڵگە لە ئێمە بكە وە كۆتا پرسیاریشمان ئەوەیە تۆ بۆمان بسەلمێنە هەموو ئینجیلەكانت بە راستی و بە تەواوەتی بە دەست گەیشتوە ؟ یان قسە و قال و قیلە لەم لاو ئەولا و كۆتان كردوەتەوە ؟

بۆ راستیی قسەكانیشمان فەرموون ئەمە لینكی گەورەترین پاپاتانە انبا شنودة دەڵێت ئێمە ئینجیلەكانمان هەمووی پێ نەگەیشتووە و ئەوانەش لەبەر دەستماندایە قسەی لابەلایە لێرە و لەوێ . باوەڕ ناكەم چیتر ڕوت بێت داوای بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی احمدمان لێ بكەیت لە ئینجیلدا پاش ئەوەی حاڵی پاشەڵی ئینجیلەكەی خۆتت زانی

http://st-takla.org/Full-Free-Coptic-Books/His-Holiness-Pope-Shenouda-III-Books-Online-٣١/Lahout-Mokaran-1/Comparative-Theology-24-CH0-٢Tradition-02-Bible.html

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :سەد و یەك

## زەمانی یوسف (ع) پارە هەبوو ؟




---

دژە ئیسلامەکان دەڵێن کاتی خۆی پارە بوونی نە بووە و کڕین و فرۆشتن بە ئاڵ و گۆڕ بووە . ئیتر قورئان ئەم پارەیەی لە کوێ هێناوە کاتێك یوسفیان (ع) فرۆشتووە ؟ ئەم گومانەشیان لە ئایەتی ٢٠ ی سورەتی **یوسف** دروست کردووە کە دەفەرموێت ( **و شروه بثمن بخس دراهم معدودة** ) واتا فرۆشتیان بە نرخێکی زۆر کەمی هەرزان کە دەژمێررا.

دیقەتی وردەکاریی ئەو ئایەتە بکەن کاتێك دەفەرموێت دەژمێررا یان دیاری کراو !؟؟ خۆ هەموو شتێك و هەموو بڕە پارەیەك لە جیهاندا دەژمێررێت بۆچی خودای زانا ئەو بڕە پارەیەی بە ژمێرراو حساب کردوە ؟

بەڕێزان یە ك شت فێر بن دەربارەی دژە دین هەمیشە نەزانە و بە ئەقڵی ئەو کاتە بیر دەکاتەوە کە تێیدا دەژی نە ئاگای لە رابردووە و نە هزر و بیر کردنەوەی بۆ داهاتوو بەکار دەهێنێت ، هەمیشە لە یە ك ئاستدا چەقیووە و توانای تێگەیشتن و بیر کردنەوەی نییە . بۆیە هەمیشە بەرامبەری بە نەزان دەبینێت و لە قەڵە می دەدات و دەڵێت ئاین خەڵکی گەمژە دەکات . چونکە خۆی لەو کەشەدا دەژی وا دەزانێت چوار دەوریشی وەك خۆی وایە

جاران خەڵکی ژمارەیان نەزایووە و نە خوێندەوار بوون . بۆیە بە ژمارەی پەنجەکانی دەست و قاچیان حسابیان کردووە . بۆ نموونە هەردووك دەست ١٠ پەنجەن سەرو ١٠ گوتویانە دە و دوو دەو سێ دەو و چوار هەتا ٢٠ وە ئەم جۆرە ژماردنە تا ئێستاش ماوە لە هەموو جیهاندا. وە کاتێك ژمارەکان بووە بە ٢٠ کابرا نەی زانیوە ٢٠ یان ٣٠ یان ٤٠ وە هەتا ١٠٠ چییە . بۆیە پەتێکیان هێناوە و

هەر ١٠ دانە و گرێیەکیان لێ داوە و پێیان گوتووە گرێ کابرا چەند گرێ لە پەتەکەیدا بوو بێت زانیوێتی ئەوەندە دەبی هەیە . وە چەند دەیشی فرۆشت بێت ئەوەندە گرێی کردوەتەوە و زانیوێتی چەند دەبی ماوە بۆ فرۆشتن

Decadeیان العقد یان گرێ یەکێك بووە لە هەرە رێگا باشەکان بۆ حساب کردنی ناو بازاڕ و کڕین و فرۆشتن . وە ئەگەر بڕەکان لە پەنجەکانی دەست زیاتر بوایە بە کیلۆ یان رطل یان بە هەر حسابێکی تری ئەو کاتە حسابی بۆ دەکرا . ئەم پێشەکەشم بۆیە هێنایەوە لەبەر دوو هۆکار بوو

**یەکەمیان**: ئاستی هزر و تێگەیشتنی دژە ئیسلام بزانن کە بێ ئاگایە لە حساب کردن و لە مێژوو . هەروەها ویستم بە جوانی وردەکاریی ئەو ئایەتەتان بۆ روون بکەمەوە کە دەفەرموێت **دراهم معدودة** واتا دیاری کراو یان حساب کراو بە ئەقڵ و حسابی خەڵکی ئەو زەمانە

**دووەمیان**: بۆ ئەوەی بزانن لە هەموو زەمانێکدا پارە هەبووە بەڵام دژە ئیسلام گەمژەیی گەیشتوەتە ئاستێك بێ ئاگایە لە هەموو شتێك . چونکە سیدنا یوسف (ع) لە میسر فرۆشراوە و میسریش پێی دەڵێن ام الدنیا واتا دایکی جیهان وە فیرعەونەکان بۆ هەزاران ساڵ دەسەڵات دار و ئیمپراتۆر بون و سکەی پارەیان هەبووە. بۆ بەڵگەی زیاتر کە پارە لە زەمانی یوسفدا هەبووە دەقێکی تەورات دەکەین بە بەڵگە کە ابراهیم (ع) باپیرە گەورەی یوسفە پارچە زەوییەکی کڕیووە لە کەسێك ناوی **عفرونە** لە سفری **التكوين** پەیدابون ٢٣ دەقی ١٥ و ١٦ دا نوسراوە: گوێم لێ بگرە گەورەم، زەوییەکە بایی چوار سەد شاقل زیووە، بەڵام ئەوە لەنێوان من و تۆ چییە مردووە کەی خۆت بنێژە ئیبراهیمیش گوێی لە عەفرۆن گرت و لەبەرچاوی حیتییەکان ئەو بڕە زیوەی بۆ عەفرۆن کێشا. چوار سەد شاقل زیو، بەو کێشانەی لەلای بازرگانەکان باوبوو

تێبینی : ٤٠٠ شاقل نزیکەی ٤ کیلۆ و نیو زیو دەکات

Shekelیان شیکل

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : ئایا معقولە لە زەمانی ئیبراهیمدا (ع) پارە هەبوو بێت و مامەڵەیان پێوە کرد بێت بەڵام **سێ** نەوە دوای ئیبراهیم (ع) پارە نەبوبێت و خەڵکی بە شت گۆڕینەوە مامەڵەیان کرد بێت ؟ طبعا هەمووان دەڵێین معقول نییە شتی وا ڕوو بدات.... بەڵام هەموومان کۆکین و دەڵێین بێدین و دژە ئاینی ئیسلامی مەزن وەك لە سەرەوە باسم کرد ئەقڵێکی چەقیوی وەستاوی هەیە و بێ ئاگایە لە رابردوو . نەزانیشە بیر لە داهاتوو ناکاتەوە و هەمیشە دنیا بە چاوی ئێستا دەبینێت وە هەموو شتێك بە پێوەری ٢٠١٥ دەبینێت و لێك دەداتەوە . وە نازانێت کاتێك خودای زانا دەفەرموێت دراهم معدودة ئەقڵ و ئاستی ژمارەی ئەو کاتەمان بۆ باس دەکات کە زانیاریی ژمارە کردن دیاری کراو بووە و لە ژمارەی پەنجەکانی دەست و قاچ دەر نەچووە و سیدنا یوسف (ع) بە پارەیەکی زۆر کەم فرۆشراوە لە ٢٠ زیاتر نەبووە بەڵکو کەمتر بووە چونکە ئەگەر بڕە پارەکە زیاتر بووایە دەیان کێشا و ( معدود ) نە دەبوو واتا خەڵکی بتوانن بیژمێرن و بزانن چەندە

**کۆتا پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** فەرموو **یەك** بەڵگەمان بۆ بهێنن کە لە زەمانی یوسفدا فیرعەونەکان نەیان زانی بێت پارە چییە و بە پارە مامەڵکەیان نە کرد بێت ؟ ئەوە ئێمە سەلماندمان کە پارە زۆر پێش یوسف (ع) هەبووە . تۆش بۆمان بسەلمێنە کە نە بووە ؟

................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :سەد و دوو

## خودا پێغەمبەری (د.خ) نە پاراستووە و بە زەهر مردووە؟

ئەمەی خوارەوە ئەو ئایەتەیە کە دژە ئیسلامەکان بریویانە برراوەکە خەتی شینم بەژێردا هێناوە و ئەو بەشەی ئەوان بلاوی دەکەنەوە لە لاکێشەی سوردایە

يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾

ئەمە ئەو حەدیسەیە لە سەرە مەرگدا باسی ئەو زەهرەی کردووە صحيحە

يا عائشةُ ما أزالُ أجدُ ألمَ الطعامِ الذي أكلْتُ بخيبرَ ، فهذا أوانُ وجدتُّ انقطاعَ أبهَرِي مِنْ ذلكَ السُّمِّ

الراوي : عائشة أم المؤمنين | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الجامع | الصفحة أو الرقم: 7929 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

دژە ئیسلامەکان دەڵێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئافرەتێکی جولەکە زەهری بۆ کردووەتە قۆڵی بزنێکی برژاوە وە لە غەزوەی خەیبەردا . وە خواردویەتی و بەو زەهرە مردووە ، لە کاتێکدا لە قورئاندا سورەتی **المائدة** ٦٧ دا دەفەرموێت ( **و الله يعصمك من الناس** ) واتا خودا دەت پارێزێت لە خەڵکی . دژە ئیسلامەکان دەڵێن بۆچی خودا نەی پاراست لەو زەهرە و بەو زەهرە وەفاتی کرد ؟

بۆ وەڵامی ئەم چەواشەکارییە با لە زەهرەکەوە دەست پێ بکەین . لە کۆن و نوێدا زانراوە هەرکەس زەهری بدرێتێ بە گوێرەی رادەی بەهێزی و بێ هێزی و جۆری زەهرەکە ئەو کەسەی دەی خوات یان دەی خواتەوە دەمرێت و نا مێنێت . وە ئەو زەهرەی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئامادە کرا بوو زۆر بەهێز بو سەرەتا **بشر بن البراء بن معرور** دەستی بۆ گۆشتەکە برد و خواردی . پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستی بۆ برد کاتێك خستیە دەمیەوە یەکسەر فڕێی دایەوە گوتی ئەو ئێسقانە پێم دەڵێت گۆشتەکە زەهراوی کراوە . ئادەی ئەو کەسەم بۆ بهێنن ئەم گۆشتەی ئامادە کردووە !؟ ئافرەتێکی جولەکە هات گوتی من ئامادەم کردوە و زەهرم کردوە بەسەر دەستەکەیەوە زانیومە حەزت لە سەر دەستی حەیوانە . پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتی بۆچی وات کرد ؟ ئافرەتەکە گوتی بۆ ئەوەی بزانم تۆ

پێغەمبەریت یان نا ؟ ئەگەر پێغەمبەر بیت ئەوا دەزانیت خواردنی زەهراویت بۆ دانراوە و نای خۆیت وە ئەگەر پێغەمبەریش نەبیت . نازانیت چیت بۆ دانراوە خواردنە ژەهراویەكە دەخۆیت و دەمریت و لە كۆڵمان دەبیتەوە بەڵێ بەڕێزان ئەوصحابە بەڕێزە بشر دەست بەجێ مرد . بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم ) چونكە خواردنەكەی فرێ دایەوە نە مرد.

ئەم ڕوداوە كەی ڕویدا ؟ لە شەڕی خەیبەردا . شەڕی خەیبەر ساڵی چەند بوو ؟ ساڵی ٦ یان ٧ ی كۆچی بوو . پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم) كەی وەفاتی كرد ؟ ساڵی ١١ ی كۆچی . كەواتە ئەگەر شەڕی خەیبەر بە ساڵی ٧ ی كۆچی بخەملێنین هەتا وەفاتی ئازیزمان دەكاتە ٤ ساڵ بەڕێزان ئەم حسابی ٤ ساڵە لای خۆتان بە جیا دا بنێن چونكە لە كۆتایدا پێویستمان پێیەتی . وە ڕوداوی زەهر دەر خواردانی پێغەمبەری مەزن (صلى الله عليە وسلم ) خۆی لە خۆیدا موعجیزەیە بۆ پێغەمبەرایەتیی چونكە زانیی گۆشتەكە زەهری تێدایە وە ئەو زهراوی كردنە نەبووە هۆی مردنی

با ئێستا بێینە سەر باسی ئایەتەكە لە وێنەكەدا دەی بینن دەفەرموێت : ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم) ئەوەی لە خوداوە پیت دەگات بیگەیەنە بە خەلكی . ئەگەر وا نەكەیت واتا پەیامەكەیت نە گەیاندووە . وە خوداش لە خەڵكی دەت پارێزێت ( **و الله يعصمك من الناس)** دژە ئیسلامەكان لێرەدا زەهرەكەیان دەڕێژن لە كۆتایی ئایەتەكەدا دەڵێت ( **و الله يعصمك من الناس** ) دێن ئایەتەكە بە تەواوەتی نا نوسن بەس بەشی كۆتایی دا دەنێن وە لەگەڵ حەدیسی ژەهر خواردنەكەدا تێكە ڵاوی دەكەن . حەدیسی ژەهرەكەش وەك خۆی باس ناكەن . بۆیە موسوڵمانی عەوامی داماو سەری دنیای لێ دێتەوە یەك و نازانێت چۆن وەلامیان باتەوە. ئەگەر دیقەتی ئایەتەكە بدەن شەرتی خودا چییە بۆ پاراستنی پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليە وسلم) كە دژە ئیسلامەكان بڕیویانە ؟ دەڵێت پەیامەكەت بگەێنە و خەمت نە بێت خودا دەت پارێزێت لە خەڵكی . ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم) پەیامەكەی بە تەواوەتی گەیاند ؟ بەڵێ ... بەڵگە چییە ؟

سورەتی **المائدة** ٣ ( **اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا** ). كەواتە پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم) پەیامەكەیی گەیاندووە ئینجا وەفاتی كردوە . وە لە ژەهر خواردن و لە زۆر غەزوەی تردا خودا پاراستویەتی . ئەم دژە ئیسلامانە چۆن هاتون ئەم گومانەیان دروست كردووە ؟ حەدیسێكی صحيح هەیە لە وێنەكەدا دامان ناوە . دەڵێت ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم) وەفاتی كرد بە دایكمان عائشة ی گوتووە . تا ئێستا تامی ئەو خواردنە دەكەم لە دەممدا كە لە خەیبەر خواردم وە خەریكە شا دەماری دڵم دەپچڕێت لە كاریگەریی ئەو ژەهرە . ئەم قسەیە كەی كراوە ؟ (٤) ساڵ دوای خواردنی ژەهرەكە . لە كەیدا كراوە ؟ كاتی وەفات و سەرە مەرگی دا . پەیامەكەی تەواو گەیاندووە وەك لە ئایەتەكەدا باس كراوە ؟ بەڵێ

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمەیە** : بۆچی ئەو صەحابەیەی لەگەڵ پێغەمبەر بو (صلى الله عليە وسلم ) دەست بەجێ مرد هێندە ژەهرەكەی بەهێز بوو ؟ بۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم) ،(٤) ساڵ دوای ئەو ڕوداوە مرد ؟ ئایا هەردوكیان مرۆڤ نین ؟ ئایا

خودا پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) نە پاراست هەتا پەیامەکەی تەواو کرد ؟ ئایا لە ماوەی ئەو (٤) ساڵەدا هیچ جارێك نەخۆشی یان ئازاری بۆ هاتووە بەهۆی ئەو ژەهرەوە ؟ ئەگەر ئازاری بۆ هاتووە یان نەخۆش بووە بە هۆی ژەهرەکەوە **پێمان بڵێن** . ئەگەر بۆشی نە هاتووە دیارە ئەو ڕۆژەی ئەو ژەهرەی خواردوە زۆر ئازاری چەشتووە دایك و باوکم بە قوربانی بێت وە لە سەرە مەرگیشدا هەمان ئازاری بۆ هاتوەتەوە بۆیە لەو کاتەدا باسی ژەهرەکەی کردوەتەوە . ئەم تەحەدایە ش بۆ دژە ئیسلامەکان با وای دا بنێین ئەگەر هۆ کاری مردنەکەشی کاریگەریی ئەو ژەهرە بێت پاش( ٤) ساڵ. لەگەڵ ئایەتەکەدا دژ بە یەك نین چونکە دژە ئیسلامەکان ئەو بەشەیان لە ئایەتەکە قرتاندووە کە ئایەتەکە دەڵێت خودا دەت پارێزێت هەتا پەیامەکەی دەگەێنیت . وە بە هەموو پێوەرێك و بەڵگەی ئایەتی( الیوم اکملت لکم دینکم) . هەتا کاتی وەفاتی خودا پاراستوێتی . ئەگەر بە کاریگەریی ئەو زەهرەش مرد بێت زۆر ئاساییە چونکە محمد (صلی الله علیه وسلم ) مرۆڤ بووە وە زانایانیش دەڵێن ئەگەر بە کاریگەریی ئەو زەهرەش مرد بێت دیارە خودا ویستوێتی بە شەهیدی بی باتەوە بۆ لای خۆی چونکە پلە و پایەی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لای خودا زۆر بەرزە و دەفەرموێت عسى أن يبعثك ربك مقاما محمودا

---

## پرسیارە بێ وەلاٌمەکان ژمارە :سەد و سێ

## ئایا مرۆڤ سەلام لە خۆی دەکات ؟

لە قورئانی پیرۆزدا 49 جار ووشەی انفسکم هاتووە لە 45 ئایەتی پیرۆزدا ئەمانە چەند نمونەیەکین لە خوارەوە

لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ ﴿التوبة: ١٢٨﴾

أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ ﴿البقرة: ٤٤﴾

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ ﴿البقرة: ٥٤﴾

وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّـهِ ﴿البقرة: ١١٠﴾

12. فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ اللَّـهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ ﴿آل عمران: ٦١﴾

وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّـهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿النساء: ٢٩﴾

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّـهِ وَلَوْ عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ ﴿النساء: ١٣٥﴾

19. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ إِلَى اللَّـهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿المائدة: ١٠٥﴾

ڕەخنەی دژە دین لەم ئایەتەی خوارەوەیە 49 جار ووشەی انفسکم نوسراوە بەڵام ئەوان 48 ی نابینن

لَّيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا مِن بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَانِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَامِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَالِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَالَاتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّـهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّـهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾

کڵێسا و شیعە ڕەخنە لە ئایەتی ٦١ ی سورەتی النور دەگرن وە بێدینەکانیش کۆپی و پەیستی دەکەن ئایەتە کەشمان لە وێنەکەدا داناوە . وە دەڵێن بۆچی ناوی باوك و دایك و خاڵ و مام و ... هتد ی هێناوە ؟ بەس بنوسرایە خزمەکانتان بەس بو پاشان خواردن چییە باس دەکرێت لەو ئایەتەدا ؟ وە ئایەتەکە دەڵێت ( **فسلموا على انفسكم)واتا** ( واتا سڵاو لە خۆتان بکەن وە ئەوەش هەڵەیە چۆن مرۆڤ سلاو لە خۆی دەکات ؟

بۆ وەڵامی ئەم گومانانە دەڵێین ئایەتی ٦١ و هەردووك ئایەتی پێش خۆی کە دەکاتە ٥٩ و ٦٠ لە سورەتی **النور** باسی چۆنێتیی چونە ناو ماڵ دەکات . وە دەڵێت ئەگەر منداڵەکانتان باڵق بوون کاتێك دێنە ژورەوە بۆ لاتان با ئیزن وەر بگرن وە ئەو ئافرەتانەش کە دەکەونە تەمەنەوە چیتر ناتوانن منداڵیان ببێت دەتوانن لە ماڵی خۆیاندا جلەکانیان لەبەر بکەن وە لەم دوو ئایەتەدا فێری لە دەگادانمان دەکات وە ئیزن وەرگرتن پێش ئەوەی بچنە هەر ماڵێکەوە یان لە ماڵێکدا بوون لە ژورێکەوە بچنە ناو ژورێکی تر ئیزن وەر بگرن بە راستی ئەمە راقی ترین و جوانترین ئەدەب و ئەخلاقە لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر خەڵکی فێر بکرێت ئیزن وەر بگرن لە کاتێکدا ماڵەکان دیواری حەوشە و دەگایان نە بووە ئەگەر هەشیان بوبێت نزم بووە و هیچ نەبووە شنە بایەك دەرگاکەی کردوەتەوە . داوات لێ دەکات کە چویتە هەر ماڵێکەوە لە دەرگا بدە ئەگەر هەیان بوو ئەگەر نەیان بوو هاوار بکە و بزانە کەسی لێیە ؟ یان ڕێت پێ دەدەن بچیتە ناو ماڵەکە یان نا ؟ ئەم یاسا و ڕێسا جوانە ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش لە کام شارستانیەتی تردا هەبووە ؟

پاشان ئایەتی ٦١ بە چوار ووشەی ( حرج ) دەست پێ دەکات بۆ کوێر و شەل و نەخۆش و ئێمەش . وە دەڵێت هیچ ئیحراجیەکی تێدا نییە بۆ ئەو ٤ کەسە . کە نان بخۆن لە ماڵی خۆتان وە ماڵی دایکتان یان باوکتان یان ماڵی خوشکانتان یان براکانتان یان ماڵی مامتان یان خوشکی باوکتان واتا پورتان یان ماڵی خاڵتان یان خوشکی دایکتان واتا پورتان . یان ئەو ماڵانەی خاوەنەکەی کلیلی ماڵەکەی پێ داون یان ماڵی هاوڕێکانتان لێرەدا جارێکی تر دەڵێت هیچ ئیحراجییەکی تێدا نییە ئەگەر بە تەنها یان بە کۆمەڵ پێکەوە نان بخۆن . وەك دەبینن لێرەدا باسی ئادابی نان خواردن دەکات . بۆچی باسی نان خواردن دەکات ؟ چونکە لە کۆمەڵگای مەدینەدا دەیان گوت کوێر و شەل و نەخۆش داماون با بە جیا خواردن بخۆن بۆ ئەوەی هەست بە کەم و کوڕی نەکەن و بە ئارەزوی خۆیان نان بخۆن . ئەم ئایەتەش دابەزیوە دەڵێت هیچ ئیحراجییەکی تێدا نییە ئەگەر پێکەوە نان بخۆن بە کۆمەڵ یان بە جیا نان بخۆن وە سبب نزولی ئایەتەکە گومانەکە پوچەڵ دەکاتەوە

پاشان ئەوانەی ڕەخنە دەگرن دەڵێن بۆچی بە یە ك ووشە قورئان نەی گوتووە . خزمەکانتان ( اقاربكم ) وە پێویستی بە وردەکاری نەدەکرد . کێشەکە لە رادەی نەزانی و تێنە گەیشتنی بەرامبەردایە . چونکە کاتێك دەڵێن خزم خۆتان حسابی بکەن خزم چەند کەس دەگرێتەوە بۆ نموونە مام ئامۆزا ئامۆزازا وە چەندەها پشتی تریش هەر لەو مامە و لە خاڵ و لە خزمانی تر . بۆیە ووشەی خزم گشت گیرە و زۆر بڵاوە بەڵام ئایەتەکە ئەو کەسانەی دیاری کردووە کە هەمیشە هات و چۆی یەکتری دەکەن . وە زۆر خزم هەیە هەتا دەمریت نای بینی یان هەر نای ناسیت. پاشان ئایەتەکە دەفەرموێت ( **فاذا دخلتم بيوتا فسلموا على انفسكم** ) دژە ئیسلام دەڵێت

باشە کاتێك بچمە ماڵێکەوە چۆن سەلام لە خۆم بکەم ؟ یان ئەگەر ماڵەکە کەسی تێدا نەبوو چی بکەم سەلام لە خۆم بکەم؟ لێرەدا نەزانی و ڕق و کینەی دژە ئیسلام وەك ڕۆژی ڕوون دیارە کە ڕەخنە دەگرێت لە ڕق و حقدی بەرامبەر ئاینی ئیسلامی مەزن نەك لەبەر ئەوەی شارەزایە و لە شارەزایی خۆی ڕەخنە بگرێت بەڵکو دەزانێت ئەم ئاینە مەزنە ئەستێرەیەکی درەوشاوەیە و ئەمیش قەزەمە ناتوانێت بە هیچ شێوەیەك ڕۆشنایی ئەستێرەکە بکوژێنێتەوە بۆیە دێت گومان لەو ئەستێرە مەزنە دروست دەکات ئەگەر وای دابنێین گومانی دژە ئیسلامەکان ڕاستە !؟ وەك ئەوان ڕاڤەی دەکەن و دەبێت ئێمە سەلام لە خۆمان بکەین !؟ دەبوایە ئایەتەکە بەم شێوەیە بە تاك بنوسرایە ( **فاذا دخلت بیتا فسلم علی** **نفسك** ) واتا ئەگەر چویتە ماڵێکەوە سەلام لە خۆت بکە !؟ بەڵام ئایەتەکە نوسراوە ( **فاذا دخلتم بیوتا فسلموا علی** **انفسكم** ) واتا ئەگەر چونە ماڵانەوە سڵاو لە یەکتری بکەن . وا بزانم ئێستا هەمووان دەزانن دژە ئیسلامەکان چۆن و لە کوێدا یارییان بە ئایەتەکە کردووە و ئەمەش یەکێکی ترە لە نەخۆشی و نەزانیی دژە ئیسلامەکان . ئایەتەکە بە کۆیە و باسی ماڵی چۆڵ ناکات باسی ئەوە ناکات بڵێت سەلام لە خۆت بکە بەڵکو بە کۆیە دەڵێت سڵاو لە یەکتری بکەن

بۆ تەحەدای زیاتری دژە ئیسلامەکان و بۆ ئەوەی بزانن لە سەلام تێ نەگەیشتون ئێمە هەر دەتوانین سڵاو لە خۆشمان بکەین . کاتێك لە التحیاتدا دەڵێین ( السلام علینا و علی عباد الله الصالحین ) وە لە شوێنی قەرەباڵەخ و لە مزگەوتیشدا هەر دەتوانین بە هەمان سڵاو سەلام بکەین . ئەگەر دیقەت بدەن لە سڵاوی التحیاتیشدا هەر بە کۆیە و دەڵێین السلام علینا و علی عباد الله الصالحین ( علینا وە عباد الله ) هەردووکیان کۆیە و تاك نییە چونکە کاتێك موسوڵمان دەڵێت ( سلام علیکم ) داوای ئاشتی و هێمنی و بەر قەراری بۆ بەرامبەری دەکات وە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکە ئەو کەسە دەچێتە ماڵێکەوە کوێر و شەل و نەخۆشی تێدایە . دەبێت کەسەکە ئاشتی پەروەر بێت و سەلامەتی ئەو کەسانە ڕا بگرێت و تەعەدا نەکاتە سەر مافەکانیان وە کاتێك کەسێك متمانەی پێ دەکات و کلیلی ماڵەکەی دەداتێ دەبێت خاوەنی ئەو متمانەیە بێت و دزیی لێ نەکات و ئاشتی و ئاسایشی ماڵەکەی بپارێزێت چونکە کوێر و شەل و نەخۆشی تێدایە و ناتوانن ڕێگریت لێ بکەن کاتێك تۆ خراپەکاری دەکریت ؟پاشان کاتێك تۆ دەچیتە ماڵێکەوە کوێر یان نەخۆشی لێیە چوزانێت تۆ لەو ماڵەدایت بەس کاتێك سلاوی لێ دەکەیت کابرای کوێرە هەست بە بوونی تۆ دەکات و لەوانەیە داواکاری هەبێت و داوات لێ بکات تۆ بۆی جێ بە جێ بکەیت . وە کاتێك ئەگەر بچیتە ماڵێکیشەوە کەسی تێدا نەبێت خۆ شێت نەبویت سەلام بکەیت و کەس جوابت نەداتەوە ؟ یان سەلام لە خۆت بکەیت !!

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئەو ئایەتەی ئەمان دەڵێن دەبێت سەلام لە خۆت بکەیت ( **فسلموا علی انفسكم** ) بە کۆیە و بە تاك نییە . بەچی پێوەرێك ئەو بە تاك ڕاڤەی کردووە و دەڵێت سلاو لە خۆت بکە ؟ لە کاتێکدا ووشەکە کۆیە و دەڵێت ( سلموا علی انفسكم )

هەردووکیان کۆن سڵاوەکە و خۆشتان هەروەها وشەی انفسكم 49جار لە قورئاندا هاتووە لە ٤٥ ئایەتدا . ئایا مانای خۆت دێت یان خۆتان یان لەناو خۆتاندا ؟

فەرموون ئەمەش لینکی هەر ٤٥ ئایەتەکەیە

http://tanzil.net/#search/quran/انفسکم

**کۆتا پرسیاریشمان ئەمەیە** کوا ئایەتەکە دەڵێت ئەگەر چویتە ماڵێکەوە چۆڵ بوو کەسی تێدا نە بو سلاو لە خۆت بکە ؟ چونکە ئایەتەکە دەڵێت ئەگەر چونە ماڵێکەوە کلیلەکەیتان پێ بوو . ناڵێت ماڵێکی چۆڵ چونکە تۆ کلیلی ماڵێکت پێیە و لەوانەیە بچیت دەرمان بدەیت بە نەخۆشێك لەو ماڵەدا ، یان کاریان بۆ دەکەیت و لەناو ماڵەکەدا کوێرێکی تێدایە و خزمەتی دەکەیت وە یان ... هتد

............................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەلاّمەکان ژمارە :سەد و چوار

## ئیسلام لە کوێ و لەگەڵ کێ بە شمشێر بڵاو بووەوە ؟




هەر چیەك هەڵ دەستێت دەڵێت ئیسلام بە شمشێر بڵاو بوەتەوە بە بێ ئەوەی ئاگای لە مێژو بێت یان هیچ لە جوگرافیای کۆن و نوێ بزانێت وە بە ئەقڵی ٢٠١٥ بیر دەکاتەوە و دونیا دەبینێت ؟ من وەك موسوڵمان پێت دەڵێم بەڵێ بە شمشێر بلاو بوەتەوە . فەرموو تۆش وەلاّمی ئەم پرسیارانەم بدەرەوە ؟!؟

ئایا دەزانیت ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پیش دوو هێز حوکمی دەکرد ؟ فارس و ڕۆم بوون . ئایا دەزانیت سوپای ئیسلام لەگەڵ کێدا شمشێری وەشاندووە ؟ ئایا ئەوەش موعجیزە و سەرکەوتنێکی خودای نییە کۆمەڵێك خەڵکی عەوام هیچ ئەزموون و مەشقێکی سەربازیان نە کردوە لە گەڵ دوو سوپای مەشق پێکراوی هەزارە ها ساڵەدا بجەنگن و بیان بەزێنن ئایا سوپای ئیسلامی لەگەڵ خەڵکی عەوام و ڕەش و ڕوتی ئەو ولاتانەدا جەنگاوە ؟ ئایا کاتێك سوپاکانی فارس و ڕۆم ڕایان کردووە ، سوپای ئیسلامی بە شمشێر کەوتوەتە خەڵکەکە و کوشتویەتی ؟ فارس و ڕۆم بە هەزاران ساڵ حوکمی ئەو ناوچانەیان کردووە کە لە ژێر دەسەلاتیاندا بووە .

ئەی بۆچی دوای ڕوخانی ئەو دوو ئیمپراتۆرەدا خەڵکەکە ئیسلامیان بای کۆت نەکرد ؟ ئەی بۆچی خەڵکەکە ئاینی ئیسلام یان قبوڵ کرد ؟ بۆچی شارستانیەت و کلتور و ئاینی هەزارەها ساڵی فارس و ڕۆم لە جیهانی کۆندا سڕرایەوە و هیچ ئاسەوارێکیان نەما و ئاینی ئیسلامی مەزن جێگای گرتەوە ؟

ئایا ئەو خەڵکە بە زەبری شمشێر ئاینی ئیسلامیان قبوڵ کرد یان پاش ئەوەی حوکمی زوڵم و زۆرداریی فارس و ڕۆمیان بینی و حوکمی عەدل و داد پەروەری و بەزەی و یەکسانیی ئیسلامیان بینی . ئینجا تێ گەیشتن ژیان مانای چییە و لەمەو پێش چۆن ژیاون و هیچ مافێکیان نە بووە هەر هەمویان کۆیلە بوون و بەروبومی کار و ژیانیانی خۆیان و منداڵیان هی گەورەکانیان بووە و ئیمپراتۆ ری فارس و ڕۆم تاکە دوو کەس بوون خودایان بوون بە ناوی خودایەتیەوە هەموو مافەکانی ژیانیان لێ زەوت کردون . بەلام کاتێك ئیسلامی مەزن هاتە ناویان گوتی مرۆڤ خودا نییە و ئێوە ئازادن بڕۆن بۆ خۆتان بژین و بۆ خۆتان کار بکەن و کەس دەست ناهێنێتە ڕێگاتان پێم بڵێن ئیسلام بە شمشێرەوە چوەتە ناو چی ماڵێکەوە لە جیهاندا و بە زۆر بیان ترسێنێت و شمشێر بخاتە سەر ملیان بڵێت نەبن بە موسوڵمان سەرتان دەبڕین لە کاتێکدا کابرای موسوڵمان پابەندە بەئایەتی.

**(لا اكراه في الدين)** وە قەت ناچێتە ناو هیچ ماڵێکەوە بەبێ ئیزن چونکە پابەندە بە ئایەتی ٢٧ ی سورەتی **النورەوە** کە دەفەرموێت :

**(يا ايها الذين امنوا لا تدخلوا بيوتا غير بيوتكم عتى تستانسوا)**.

سەیری وێنەکە بکە و ئەو نەخشەیەی تێیدایە هی جیهانی کۆنە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر . ڕەنگی زەرد ئیمپراتۆریەتی فارسە و ڕەنگی مۆریش ئیمپراتۆریەتی ڕۆمە .

جیهانی ئەو کاتە دوو کەس حوکمیان دەکرد کیسرای پادشای فارس وە هرقل پادشای ڕۆم .ئایا ئەوە دەزانیت ئەگەر ئەو دوو کەسە موسوڵمان بونایە هیچ شەڕ و فتوحاتێك ڕووی نە دەدا ؟ ئایا ئەوە بە خەیاڵتدا هاتووە ژیان و مردنی جیهانی کۆن بە دەست دوو کەس بووە ؟ ئایا ئەوە دەزانێت کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نامەی بۆ هەردووکیان نارد بەڵام هیچیان ڕازی نەبوون بە ئاشتی ؟ئایا سوپای ئیسلام لەگەڵ گەل و خەڵکی سیڤیل و مەدەنیی ئەو کاتەدا جەنگاوە یان لەگەڵ سوپای دوو کەس دا ؟

ئایا پاش جەنگەکان سوپای ئیسلامی چی ڕەشە کوژیەکی کردووە لە نێوان ئەو گەلانەدا ؟ بۆچی ئێستا هیچ پەرستگا و هیچ کۆڕ و کۆمەڵێکی فارس یان ڕۆمان نابینین نەك لە جیهانی ئیسلامیدا بەڵکو لە ڕۆژ ئاواشدا ؟چونکە فارس و ڕۆم و هەموو سارستانییە

کۆنەکان خاوەنی هیچ منهج و پرۆگرامێك نەبوون بۆ خەڵکی و بۆ جیهان بەڵکو هەمو هەوڵیان بۆ داگیر کردنی زەویی زیاتر بووە بۆ ئەوەی باری ئابوریی پادشا و دەسەڵات دارەکانیان زیاد بکەن و باج و خەراج و پارەی زیاتر بێتە ناو خەزێنەکانیان بەلام ئاینی ئیسلامی مەزن خاوەنی منهج و پرۆگرام بوو بۆ خەڵکی و بۆ ژیان بۆیە هەموو شارستانی و یاسا و ڕێساکانی پێش خۆیی سرِیەوە و خەڵکی یاسای ئیسلامیان بینی و لەگەڵ یاسای ڕۆم و فارسدا بەراوردیان کرد

ئیسلامی مەزن ژیانی بۆ دەستە بەر کردن و لە حوکمی دوو کەسەوە بەرەو حوکمی یە ك کەس بردنی کە الله یە و الله ش لە ڕێگای قورئان و سونەتەوە مافەکانی پاراستن و چیتر خەڵکی کاری نەدەکرد بۆ پڕ کردن ی گیرفانی دەسەلات دار بەڵکو کابرا بۆخۆی کاری دەکرد بۆ ئەوەی زەوی ئاوەدان بکاتەوە لە دنیادا بە شێوەیەك ڕەزامەندیی خوداش بە دەست بهێنێت وە لێرەدا گەورەیی ئایەتی **فتحمان** بۆ دەردەکەوێت کە دەفەرموێت( **و رايت الناس يدخلون في دين الله افواجا**) ئەمەش یەکێکی ترە لە موعجیزەکانی قورئانی مەزن ئەگەر سەیری نەخشەکە بکەن بۆتان دەر دەکەوێت ئاینی ئیسلامی مەزن بە خواست و ئارەزوی تاکەکان خۆیان بڵاو بوەتەوە و هەڵیان بژاردووە نەك بە شمشێر چوبێتە ماڵەکانیانەوە .

کێ بەڵگەی هەیە بۆمان بهێنێت ئاینی ئیسلام جەنگی لەگەڵ گەلێك یان کۆمەڵێك خەڵکدا کردووە با دای بنێت بۆمان . ئاینی ئیسلامی مەزن جەنگی لەگەڵ دوو کەسدا کردووە و شمشێری ڕو بەڕوی دووکەس بەکار هێناوە کیسرا و هیرقلە نەك هەموو جیهان تکایە کە س **نەڵێ** خالیدی کوڕی وەلید هاتووە کوردی کوشتووە سریەی قیس الاشجعي وە ڕیزێك سەرجاوەی کۆپی و پەیست هەیە دای دەنێن لەسەر کورد کوشتن هیچیان ڕاست نین .

.................................................................................

**سەیری ئەم وەلأمانە بکەن**

پرسیارە بێ وەڵامەکان ٧٤ خالدی کوڕی ولید چۆن کوردوستانی داگیر کرد ؟ **لاپەرە** (١٥٨)

پرسیارە بێ وەڵامەکان ٧٥ فتوحاتی ئیسلام چەند کوردی کوشت ؟ **لاپەرە**(١٦٥)

پرسیارە بێ وەڵامەکان ٤٦ سلمة بن قيس الاشجعی کێیە ؟ **لاپەرە**(٩١)

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پێنج

### جەمسەری باکور و کاتی ڕۆژو شکاندن




وەك دەزانن ساڵانە کاتی ڕەمەزان هەرایەکی زۆر دەکرێت لەسەر بەرۆژو بوون لە ناوچە قوتبیەکاندا . وە ئەم ساڵ ئیبداعیان کردوە و بە ڤئدیۆش رون کردنەوەیان داووە . بە حسابی خۆیان خەڵکی گەمژەن و تێ ناگەن لە مەسەلەی شەو رۆژ لە ناوچە قوتبیەکاندا . بەلام گەمژەیی لەوەدایە ئەو کەسانە بە جاوی ٢٠١٥ سەیری دنیا دەکەن و بێ ئاگان لە هەموو جۆرە زانیارییەك.

فەرموون ئاستی نەزانیی ئەو کەسانە بزانن بە بەڵگەوە . وە تحدای هەر هەموو بێدین و دژە ئیسلامەکان دەکەم وە معتزلەکانیش بتوانن یە ك زانیاریم لەم زانیاریانە بە درۆ بخەنەوە یان ئاگایان لەم رواداو مێژوانە بوو بێت !؟ وە ئێستا پاش خوێندنەوەی ئەم زانیاریانە ئینجا هەست دەکەن چەند بە نەزانی و کاڵ فامی و کەمیی زانیارییەوە رەخنە دەگرن .

فەرموون لەگەڵ بابەتەکە

(إراتوستینس) زانایی ڕیازیات و جوگرافیای گەورەی یۆنانی کە لە لیبیا لە دایك بووە لە ساڵی ٢٧٦ ی پێش هاتنی مەسیح (ع) وە لە ساڵی ١٩٤ کۆچی کردووە لە اسکندریة . گەڕاوە و لە اسکتلنداوە بەرەو نەرویج چووە و هیچ ئاوەدانیی لێ نە بینیووە هەروەها نەرویج هیچ ناو شوێنێکی نە بووە لە مێژودا چونکە سارد بووە و خەڵکی نەی توانیوە لێی بژی تەنانەت سویدیش ئاوەدانیی تێدا نە بووە . بەڵکو خەڵکی لە دانمارك ژیاون چونکە دانمارك گەرم تر بووە و غاباتی کەمتر بووە و ناوی دانیمارکیش لە دان میکلاتییەوە هاتووە (Dan Mikillati .)واتا نیشتەجێی دان . کە یەکێك بووە لە پادشا کۆنەکان یەکەم جار لەو ناوچەیە نیشتە جێ بووە و ئێستا پێی دەڵێن ولاتی دان ی مارك . هەروەها وڵاتی سویدیش لەسەر ناوی ئەو هۆزانە هاتووە کە ناویان سوین بووە . و حوکمی ئەو ناوجانەیان کردووە و ناوی نەرویجیش واتا ڕێگا بەرەو باکور .

کاتێك خەڵکی کۆن ویستویانە بچن بەرەو باکوری زەوی ئەم وشکانیەیان هاتوەتە بەردەم و هەر تەواو نەبوە هێندە زۆر بووە . پاشان محیط هاتوەتە بەردەمیان و نەیان توانیوە محیطەکەش ببڕن ناویان لێ ناوە ڕێگای باکور وڵاتی نەرویج لە ساڵی ٨٠٠ دا پێك هات بوو لە ٣١ میر نشینی بچوك دوور بوون لە یەکتریەوە وە ساڵی ٨٥٠ Halfdan the Black هەلفدانی ڕەش کە یەکێك بوو لە شازادەکان لە شاری ترۆندهێیم Trondheim سوپایەکی ساز کرد و لە ماوەی ١٠ ساڵدا هەموو میر نشینەکانی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی و تۆرندهێمی کرد بە پایتەختی نەرویج و یەکەم جار وڵاتی نەرویج لە ساڵی ٨٥٠ دا دروست بوە واتا ٣٠٠ ساڵ دوای هاتنی ئیسلام ولاتی نەرویج دروست بووە Olft Tryggvsson یەکێکە لە پادشاکانی نەرویج لە ساڵی ٩٩٥ دا بوو بە مەسیحی بۆیە فەرمانی دەر کرد هەموو پەرستگای بت پەرستەکانی ڕوخاند و ئاینی مەسیحیی بڵاو کردەوە .

بەڕێزان ولاتانی اسکندنافیا بەهۆی بڵاو بونەوەی ئاینی مەسیحی و ئاینی بت پەرستی کە ئاینی ئەسڵییان بووە توشی زۆر شەڕ و کێشمە بوون . وە دەبوایە غاباتەکانیان ببڕیایە بۆ ئەوەی شوێنی زرعات و نیشتەجێ بۆ خۆیان دروست بکەن وە زۆر شەڕ و ناخۆشییان لە نێواندا هەبوو هەتا ساڵی ١٢٦٦ شاری ستۆکهۆڵمیان دروست کرد و ئیرل بیرگر نیزامی کۆیلەی نەهێشت هەتا ساڵی ١٥٢٥ کەس لە جیهاندا نەی دەزانی باکوری نەرویج چی لێیە ؟ هەتا دیبلۆماسیەکی ڕوسی بە ناوی دیمیتری جیراسیموف لەو ساڵەدا لە ڕوسیاوە بە محیطی میجمدی شمالیدا ڕۆشت و ئەو ڕێگای دۆزییەوە و کەس لەو ناوە نە دەژیا وە نەرویج هەمیشە وڵاتێك بوە یان سەر بە دانمارك بووە یان بە سوید هەتا لە ساڵی ١٩٠٥ لە سوید جودا بوەوە وئەو کات بوو بە دەوڵەت وە تا ئەو کاتەش موسوڵمانی تێدا نە ژیاوە . موسولمانیش لە ساڵانی هەشتاکانەوە چوون بەرەو نەرویج ئەویش لەبەر ئەوەی مافی پەنابەریی پێداون . واتا بە درێژایی ١٤٠٠ ساڵ موسوڵمان لەو ولاتەدا بونی نە بووە !؟

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمانەیە** : کاکی ملحد و کاکی **معتزلە** بابەتەکەمان زۆر کورت کردوەتەوە . ئایا ئێوە ئەم زانیاریانەتان دەزانی ؟ئایا ئەگەر قورئان یان محمد (صلى الله عليه وسلم) باسی کاتەکانی ڕۆژوو شکاندنی بکردایە . بۆ کێی باس بکردایە ؟ خۆ

هەتا ساڵی هەشتاکان موسوڵمان لەو وڵاتە نەبوون بە تایبەتی لە بەشی باکورەکەی . وە ئێستاش لە بەشی باکورەکەی یان شوێنی گەشت و گوزاری لێیە یان بنکەی لێکۆڵینەوەی زانستیی لێیە و موسوڵمانی لێ نییە لەوانەیە بڵێن کتێبەکانی فقهی ئیسلامی پڕە لە ئیحتیمالاتی فیقهی دەبوایە باسی ڕۆژو شکاندنی قوتبەکانی بکردایە !؟

وەڵام : کاتێك زانایانی ئیسلام ئیحتیماله فیقهییەکان دا دەنێن کە شتەکان بونیان هەبێت لە حوکمی زینادا ئەگەر کەسێك زینا لەگەڵ خوشکی یان دایکی یان کچی یان ... هتد ، بکات وە زانایانی ئیسلام لە هەموو حوکمێکدا ئیحتیمالاتیان داناوە . چونکە ئەو شتانە بونیان هەیە و لەوانەیە ڕوو بدات

وە ئەو برادەرە بە حساب ئەو ڤیدیۆیرەی گرتووە . خۆی بێدینە و بە ڕۆژو نابێت . ئیتر ئەم بارە بارەی لە چییە ؟ وە ئەو ناوچەیەی ئەو ڤیدیۆکەی لێ گرتووە و کابرای ملحد دەڵێت ناوی لۆفتۆنە بەم شێوەیە دەنوسرێت (lofoten,Norway)

**لینکی فیدیویەکە**

https://www.facebook.com/video.php?v=1593765464207734&set=vb.1553401181577496&type=2&theater

**بابەتی ناو لینك**

**ئێمەش لە وێنەکە دا ڕوونکردنەوەمان داوە کابرا سەعاتەکە تصیور دەکاات کە سەعات ١١:٥٩دەقەیە هەر ڕۆژە پاشان دوای دە بێتە سەعات ١٢:٠٠هەر وەکو خۆیەتی دەتوانن سەیری وێنەکە بکەیت**

...........................

هەمووتان کۆمپیوتەرتان لەبەر دەستە و ئەوەی نوسیومە کۆپی و پەیستی بکەن و لە گوگڵ ماپس دای بنێن وە بە زومەکە نزیکی بکەنەوە بیخەنە سەر سەتەلایت . بزانن ئەو ناوچانە هیچی ئاوەدانیی لێیە ؟ وە هەر هەمووی کوخ و ئوتێل و شوێنە بۆ گەشت و گوزار پاشان با پێمان بڵێن ژمارەی موسوڵمانان چەندە لە ناوچە قوتبییەکان ؟ وە ئایا ئاینی ئیسلامی مەزن چارەی بۆ ئەو فەرقی سەعاتە کردووە یان نا ؟ وە هەتا ساڵی ٨٠٠ ی زاینیش نەرویجییەکان خۆیان نەیان زانیووە باکوریان چیی لێیە ؟ ئیتر ئیسلام حوکمی ڕۆژوو بۆ کێ دابنێت ؟ هەتا ساڵی ١٥٢٥ هیچ ڕێگایەك نە بووە بیان گەێنێتە باکوور ئیتر حوکمی ڕۆژو بۆ کێ دا بنێن ؟

ئەگەر حوکمی ڕۆژوش هەبووایە کاکی ملحدی گەمژە ئەو کاتە دەی گوت سەیری ئەو ئیسلامە گەمژەیە بکەن دەڵێت لەو ناوچانە بم شێوەیە بەڕۆژو بن . خۆ ئەو ناوچانە کەسی لێ ناژی ئەم حوکمە چییە دایان ناوە ؟

## پرسیارە بێ وەلاَمەکان ژمارە :سەد و شەش

## کەی ڕۆحی پیرۆز هاتە ناو لەشی ؟ بەشی یەك

کاتێك دەڵێن سەرۆکی دەوڵەت یان پادشا یان مەلیك واتا هەموو دەسەڵاتەکانی لە دەستە وە خۆی دەتوانێت وەزیرەکان دا بنێت و لایان بەرێت . وە هەمیشە خوارتر لە خۆی پێویستی بەوە . نەك ئەو پێویستی لە خوارتر لە خۆی بێت وە ئێمەی مرۆڤیش وا را هاتووین بە گوێرەی ئەو شتانەی دەی زانین حوکم بدەین . کاتێك دەڵێن خودا واتا گەورەترین و بەرزترین دەسەڵات . وە هەموو شتێك لە ژێر خوداوە پێویستی بە خودایە نەك خودا پێویستی بەوان بێت ؟ئەگەر خودا پێویستی بە فریشتەیەك یان ئەستێرەیەك یان مرۆڤێك بێت . کەواتە ئەو خودایە خودا نییە و خاوەنی دەسەڵات نییە چونکە نوقسانە و دەبێت لە ڕێگای یاریدە دەرێکەوە خۆی کامل بکات !؟ کاتێکیش گاورەکان دەڵێن مەسیح (ع) خودایە . کەواتە دەبێت مەسیح پێویستی بە هیچ شتێك نەبێت وخۆی بتوابێت هەموو کارەکانی بکات لە تەورات و لە ئینجیلیشدا هەردوکیان باوەڕیان بە وەحی نییە . وەحی واتا خودا فریشتەیەك بنێرێت بۆ لای پەیامبەرێك وە فریشتەکە فەرمانەکانی خودا بەو پێغەمبەرە بڵێت . بەلاَم جولەکە و مەسیحیەکان باوەڕیان بەوە هەیە کاتێك کەسێك دەبێت بە پێغەمبەر رۆحی پیرۆز دێتە لاشەی ئەو کەسەوە رۆحی پیرۆزیش جبریلە (ع) وە ئیتر ئەو کەسە کە دەبێت بە پێغەمبەر قسە کردن و هەڵس و کەوت و هەموو ژیانی لە ڕێگای رۆحەکەوە دەبێت وە چی بڵێت و چی بکات کەسەکە نای کات بەڵکو ڕۆحی پیرۆز دەی کات وە هەمیشە ڕۆحی پیرۆزیش بە فەرمانی خودا دەچێتە لاشەی خەڵکیەوە . ئەگەر وای دابنێین مەسیح (ع) خودایە چی پێویستییەکی بە ڕۆحی پیرۆزە بێتە لاشەیەوە ؟

**پرسیاری بێ وەلامان ئەمەیە**: خودا مەزن ترە یان ڕۆحی پیرۆز ؟ ئەگەر خودا مەزن ترە بۆچی لەگەڵ ئەو ڕۆحەدا ئاوێتە بوون و یەکی گرت ؟ ئایا کاتێك ڕۆحی پیرۆز دەچێتە لاشەی کەسێکەوە ئەو کەسە نەخۆش دەبێت دەڕشێتەوە خۆی پیس دەکات . ئایا ڕۆحکەش بە هەمان دۆخدا تێ دەپەڕێت ؟ عیسا (ع) پیسایی دەکرد و میزی دەکرد ئایا رۆحی پیرۆزیش پیسایی دەکرد ؟

عیسا (ع) بە حسابی ئەوان لە خاچ درا و بۆ ماوەی سێ رۆژ مرد . ئایا رۆحی پیرۆزیش مرد ؟

**کۆتا پرسیاریشمان ئەمەیە** : بۆچی کاتێك گاورەکان ناتوانن وەڵامی پرسیارێك بدەنەوە . دەڵێن : دەبێت ڕۆحی پیرۆز بێتە ناو لەشتەوە ئینجا ئەو شتە دەزانیت یان فێری دەبیت یان هەستی پێ دەکەیت ؟ ئایا ئێوەی شوێن کەوتووی کڵێساش هەر پێغەمبەرن ؟ ئەگەر دەڵێن نەخێر. کەواتە بۆچی ڕۆحی پیرۆز دێتە لاشەی ئێوەشەوە ؟پاشان کاتێك داواتان لێ دەکەین ئێمە چی بکەین بۆ ئەوەی ڕۆحی پیرۆز بێتە لەشمانەوە ؟ ئێوە هیچ دەقێکتان پێ نییە بۆ ئێمە و هیچ وەلامێکتان پێ نییە چۆن بتوانین ئێمەش ئەو تەجروبە ئیمانییە ببینین و ڕۆحی پیرۆز بێتە لا شەمانەوە ؟ئایا بڵاو بونەوەی ئاین یان هەر بیر و باوەڕێکی تر لە ڕێگای ڕۆحیانەتەوەیە یان لە ڕێگای منهجەوەیە و هەمان قسە بوذییەکان دەی کەن بە ناوی یۆگا و ڕۆحیانەتەوە دەچن بەرەو ئاسمان . دەروێشەکان و شێخانی

تەریقەتیش لە ئیسلامدا هەمان قسە دەكەنەوە و لە ڕێگای ڕۆح و ڕۆحیانەتەوە دەگەن بە حقیقەت و لەگەڵ خودادا ئاوێتە دەبن پێی دەڵێن ( وحدة الوجود ) !؟

ئایا ئەمانە ڕۆحی پیرۆزە و لای خوداوەیە یان جن و شەیتانەكانە یاری بە ناختان دەكات ؟ ئەگەر دەڵێن نەخێر ئەمانە جبریلە و ڕۆحی خودایە فەرموون پێمان بڵێن ئێمە چی بكەین بۆ ئەوەی ئەو ڕۆحە بێتە ناخمانەوە ؟ چونكە هەر شتێك لە لایەن خوداوە بێت بۆ هەموانە نەك بۆ چەند كەسێك ؟

تێبینی : ڤیدیۆیە كە نمونەیەكە لە هەزارەها نموونە لە یوتوبدا هەیە بە حساب جوبرائیلی فریشتە چووە تە ناو ئەو ئیماندارەوە خۆشتان دەتوانن لە یوتوب بگەڕێن بە دوای ڕۆحی پیرۆز لەناو گیانی ئیمانداراادا لە كڵێسا شتی سەیر و سەمەرە دەبینن كە جنۆكەیە دەچێتە ناو لەشیانەوە وەك چۆن جن دەچێتە لەشی دەروێشەكانەوە

**ئەمەش لینكی فیدیۆیەكە**

https://www.facebook.com/video.php?v=1598018747115739&set=vb.1553401181577496&type=2&theater

.....................................................................................................................................................................

## پرسیاره بێ وەڵامەكان ژمارە :سەد و حەوت

## كەی ڕۆحی پیرۆز هاتە ناو لەشی ؟ بەشی دوو

گاورەكان دەڵێن مەسیح ڕۆحی پیرۆزی تێدا بووە .

هەروەها هەموو پێغەمبەرانی پێش عیساش ڕۆحی پیرۆزیان تێدا بووە . پاشان ئەگەر ڕۆحی پیرۆز بچێتە كەسێكەوە و ئاوێتە بن . كاتێك كەسەكە تاوانێك دەكات كامیان كردویانە ڕۆحەكە یان كەسەكە ؟ كەسەكە نەخۆش دەبێت دەرشێتەوە پیسایی دەكات غازاتی لێ دەردەچێت برسی دەبێت بێ تاقەت دەبێت . لەو حاڵەتانەدا ڕۆحەكە چی لێ دێت ؟ ئایا ئەویش تاوانەكان دەكات یان نا ؟ یان یەكێكیان ئەوی تریان بلۆك دەكات وەك فیسبوك ؟

بۆ ئەوەی باشتر تێ بگەن ئێستا باسی سێ نمونەتان بۆ دەكەین كە پێغەمبەر بوون و ڕۆحی پیرۆزیان تێدا بووە و سەركێشییان كردووە

**نموونەی یەكەمیان :** لە سفر **الخروج** ( دەرچون ) بەشی ٣٢ دا دەقی ١ بۆ ٦ دەڵێت هارونی برای موسا علیهما السلام گوێرەكەیەكی ئاڵتونیی دروست كردوە و گوتویەتی هەتا موسا دێتەوە ئەم خودایە بپەرستن . لە دەقی ٢٨ دا دەڵێت كاتێك موسا (ع) گەڕایەوە و ئەوەی بینی فەرمانی كرد ئەوانەی گوێرەكە ئاڵتونیەكان نەپەرستووە ئەوانە بكەژن كە گوێرەكەكەیان پەرستووە و لەو ڕۆژەدا ٣٠٠٠ كەسیان لێ كوشتن . وە لە دەقی ٣٥ دا نوسراوە : خوداش گەلی ئیسرائیلی توشی دەرد كرد .

لێرەدا ئەم پرسیارە بێ وەلامانە سەرهەڵ دەدات

هاروون پێغەمبەرە و ڕۆحی پیرۆزی تێدایە . هاروون و ڕۆحی پیرۆزکامیان تاوان بارن ؟ وە بۆچی ڕۆحی خودا ڕازی بوو هارون خودایەکی گوێرەکە بۆ بنو اسرائیل دروست بکات ؟ بۆچی هارونیشیان نەکوشت کە هۆکاری ئەو کارە بوو ؟ ئەگەر هارونیان بکوشتایە ئایا ڕۆحی پیرۆزیش دەمرد ؟ بۆچی یەزدان سزای ڕۆحی پیرۆزیشی نەدا کە ڕێگر نەبووە لەو سەرپێچییە ؟

**نمونەی دووەمیان** : داود (ع) زینا دەکات وە لەگەڵ ژنی سەرکردەیەکی خۆیدا جوت دەبێت وە لەو زینا یە سولەیمانی (ع) دەبێت وە پاشان بە فێڵ و پلانێکی گڵاو مێردی ژنەکە دەکوژێت . واتا قتل و زینای کردووە ، لێرەدا دەوری ڕۆحی پیرۆز چی بوو ؟ ئایا ئەویش زینا و قەتلی کرد . ئایا بەشدار بوو لەو پلانە گڵاوەدا ؟ بۆ ئەم ڕوداوەش سەیری سفری **صموئیل الثاني** ( ساموێلی دوو ) بەشی ١١ بکەن . وە کاتێکیش داود (ع) ئەم کارەی کردووە ڕۆحی پیرۆزی تێدا بووە بەڵگەشمان هەرکتێبی پیرۆزخۆیەتی چونکە داود (ع) لە **مزموری** ٥١ – ١١ دا پاش زینا و قەتلەکە دەڵێت لە بەرچاوی خۆت دەرم مەکە ڕۆحی پیرۆزی خۆتم لێ مەستێنەوە ؟ ئەمەش بەڵگەیە کاتێك ئەو کارانەی کردووە ڕۆحەکەش لەگەڵیدا بەشدار بووە . چونکە داود داوا لە خودا دەکات ڕۆحی پیرۆزی لێ نەسێنێتەوە !!؟

نموونەی سێیەمیان : لە سفری ( **ال.لوك الاول** ) پاشایانی یەکەمدا بەشی ١١ دەقی ٤ بۆ ١١ باسی ئەوە دەکات سلیمان (ع) لەبەر خاتری ژنەکانی وازی لە خودا هێناوە شوێن خودای ژنەکانی کەوت و بوو بە بت پەرست . ئادەی پێم بڵێن دەوری روح القدس چی بوو ئایا ئەویش بوو بە بت پەرست ؟ خۆ سلیمان بە کافری و بت پەرستی مرد بە گوێرەی کتێبی پیرۆز. ئەی ڕۆحی خوداش کافر و بت پەرستە ؟ ئەو ڕۆحە بۆچی وای نەکرد سلیمان بت نەپەرستێت و خودا بپەرستێت ؟

با ئێستا بچین بۆ پەیمانی نوێ بزانین ئەو چی دەڵێت دەربارەی ڕۆحی پیرۆز ؟

لە ئینجیلی **لۆقادا** بەشی ١ دەقی ١٥ دا باسی یوحنا المعمدان ( کە ئێمە پێی دەڵێین یحیا ی کوڕی زکریا ) دەکات و دەڵێت لە سکی دایکیەوە ڕۆحی پیرۆزی تێدایە و پڕ دەبێت لە ڕۆحی پیرۆز لە ئینجیلی مەتا ١٠ دەقی ٢٠ دا مەسیح (ع) قوتابییەکانی دەنێرێت بۆ ئەوەی بانگەشەی ئاین بکەن وە پێیان دەڵێت ڕۆحی خودا دێتە لاشەتانەوە و ئێوە قسە ناکەن بەڵکو ڕۆحی خودا قسە دەکات وە نوسراوە ئەو کەسەی قسە دەکات قوتابییەکانی مسیح نین بەڵکو ڕۆحی باوکیانە قسە دەکات وەك دەبینن بە بەڵگەی دەقەکانی ئینجیلیش دەڵێت یوحنای معمدان و قوتابییەکانی مسیحیش ڕۆحی خودا یان تێدا بووە . کەواتە روحی خودا بەس لە مسیحدا نە بووە !!؟ مادام ڕۆحی پیرۆز بەس لە مەسیحدا (ع) نە بووە و دەچیتە هەموو کەسێکەوە. کەواتە سودی ڕۆحی پیرۆز چییە کە دەهێڵێت ئەو کەسە سەرپێچیی خودا بکات و زینا بکات و خەڵکی بکوژێت و ببێت بە بت پەرست و . نەتوانێت بەرگری لە مەسیح بکات لە خاچ نەدرێت وە ڕێگا بدات بە شەیتان ( ٤٠ ) شەو مەسیح تاقی بکاتەوە . ئەمە چۆن ڕۆحێکی پیرۆزە شەیتان ( ٤٠ ) ڕۆژ تاقیی بکاتەوە پاشان کاتێك مسیح نانی دەخوارد یان دەچوو بۆ چۆڵەوانی بۆ پیسایی کردن یان غازاتی هەبوو یان نەخۆش دەبوو . ئەو شتانە لە ڕۆحی خوداشدا ڕوی دەدا ؟ یان کاتێك شەیتان مەسیحی تاقی کردەوە خودا و ڕۆحی خوداشی تاقی کردەوە ؟ یان کاتێك

بردیان بۆ خاچ تفیان تێ دەکرد و قسەیان پێ دەگوت قسەیان بە کامیان دەگووت ؟ یان کاتێك بە قامچی لێیان دا و ئازاریان دەدا . ئازاری رۆحی خوداشیان دا ؟ ئەمە چۆن خودا یەکە رازی بێت بەو هەموو ئیهانەیە ؟.

**کۆتا پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : کێ سەرکێشیەکەی کردووە ؟ وە بۆچی ئەو رۆحە کە رۆحی خودایە هێشتویەتی ئەو تاوانە بکەن ؟ وە کە کردویانە کامیان تاوان بارن رۆحەکە یان مرۆڤەکە ؟ یان هەردوکیان ؟ ئەگەر بڵێن پۆلص دەڵێت کەسەکە تاوانەکەی کردوە !! کەواتە دەوری ئەو رۆحە چی بوو کە نەبو بە بەربەست بۆ ئەوەی ئەو کەسە ئەو تاوانە نەکات ؟ وە چۆن بزانین هەموو کارەکانی تر کە کردویەتی راستن لە کاتێکدا رۆحی تێدا بوە و تاوانی کردوە ؟ بۆچی کارەکانی تری لێ وەر بگرین ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشت

## لە کوێدا نوسراوە پێغەمبەرێك لە دوای من دێت ناوی احمدە ؟

14 لذلك يقال في كتاب حروب الرب واهب في سوفة واودية ارنون 15 ومصب الاودية الذي مال الى مسكن عار واستند الى تخم مواب 16 ومن هناك الى بئر.وهي البئر حيث قال الرب لموسى اجمع الشعب فاعطيهم ماء. 17 حينئذ ترنم اسرائيل بهذا النشيد.اصعدي ايتها البئر اجيبوا لها. 18 بئر حفرها رؤساء حفرها شرفاء الشعب بصولجان بعصيهم.ومن البرية الى متانة 19 ومن متانة الى نحليئيل ومن

14 لەبەر ئەوە [پەڕتووکی جەنگەکانی یەزدان[c]) دەڵێت:
(...(واهێڤ) لە (سوفە) و شیوەکانی،
ئەرنۆن و
15 نشێوی شیوەکان،
ئەوەی تا نشینگەی (عار) شۆڕ بۆتەوە،
پشتی بە سنووری مۆئابەوە داوە.)










As-Saff : Column | سورة الصف | 6 | 5169

وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ

And when Jesus son of Mary said: O Children of Israel! Lo! I am the messenger of Allah unto you, confirming that which was (revealed) before me in the Torah, and bringing good tidings of a messenger who cometh after me, whose name is the Praised One. Yet when he hath come unto them with clear proofs, they say: This is mere magic.

گاورەکان پێمان دەڵێن لە کوێ لە کتێبی پیرۆزدا نوسراوە کە عیسا (ع) بڵێت پێغەمبەرێك لە دوای من دێت ناوی احمدە ؟ چونکە لە ئایەتی ٦ ی سورەتی **الصفدا** دەفەرموێت : **(و اذ قال عیسی ابن مریم یا بني اسرائیل اني رسول الله الیکم مصدقا لما بین یدي من التوراة و مبشرا برسول یاتي من بعدي اسمه احمد)** وە ئەگەر ئێمە بێێن کتێبی پیرۆز بخوێنینەوە هەردوك بەشەکەی ئەوەی تێدا نە نوسراوە و ئەو مزگێنیەی تێدا نییە و ئەوان راست دەکەن لە بەرامبەریشدا گومان لای ئێمەی موسوڵمان دروست دەبێت و گومان دەکەین لەوەی عیسا (ع) شتی وای نە گوتووە و ئەو مزگێنیەی نەداوە !! بەڵام خودا لە قورئاندا راست دەفەرموێت و عیسا (ع) وای گوتووە . کەواتە بۆچی لە ئینجیلدا ئەو مزگێنیەی تێدا نییە ؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەبێت بگەڕێینەوە بۆ کتێبی پیرۆز چونکە عیسا (ع) وای گوتووە لە ئایەتەکەی قورئاندا دەفەرموێت عیسا (ع) دەڵێت ئەی نەوەی ئیسرائیل من هاتوم ڕاستیی تەوراتتان بۆ دەسەلمێنم وە مزگێنیتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك دوای من دێت ناوی احمدە ،کەواتە دەبێت ئێمە لە پێشدا لە تەوراتدا بگەڕێین . چونکە مەسیحییەکانیش بەبێ تەورات ئاینەکەیان هیچ نییە وە مسیحیش هاتووە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت تەورات ڕاستە . وە هیچ کڵێسایەکیش ناتوانێت واز لە تەورات بهێنێت و بەس بە ئینجیل حوکم بکات .

بەڵام ئەوەی سەیرە لە تەوراتدا ٢٥ کتێب بزر بووە و دیار نییە بە بەڵگەی دەقەکانی تەورات خۆی . وە ئەگەر ئێستا لەم کتێبە پیرۆزەی بەر دەستماندا بگەڕێین ئەو ٢٥ سفرە یان کتێبە بزر بووە

بۆ ئەوەی بابەتەکە دوور و درێژ نە بێت ئێستا باسی یەك دانە لەو کتێبە بزر بوانە دەکەین فەرموون ئەمەش یەکێك لەو ٢٥ کتێبە بزر بووەیە : لە سفر **العدد** بەشی ٢١ دەق ١٤ هەتا ٢٠ دا نوسراوە لەبەر ئەوە (پەڕتووکی جەنگەکانی یەزدان ) دەڵێت واهف لە سوفە و شیوەکانی ئەرنون بۆ ئەوەی لەم دەقە تێ بگەن . ئەم دەقە باسی ئەوە دەکات کاتێك بنو ئیسرائیل لە میسر دەرچوون هاتن بۆ ئەو شوێنانە خۆتان دەتوانن بیخوێننەوە لە ١٤ هەتا ٢٠ وە خودا لەو ناوچانە جێ نشینی کردن و ئاوی پێدان بۆیە ئەوانیش سرودیان گوت بۆ ئەو ئاوە و ئەو بەخششەی خودا . ئەم شتانەش لە کوێدا نوسراوە ؟ لە ( سفر حروب الرب واتا پەرتوك یان کتێبی جەنگەکانی یەزدان ) ئێ باشە ئێستا هەموو تەورات و کتێبی پیرۆز بگەڕێ ئەو کتێبەی تێدا نییە . کوا ئەو کتێبە ؟

بە شەرتێك ئەو کتێبە یان ئەو سفرە دەبێت کتێبێکی زۆر مەزن بێت . چونکە باسی جەنگەکانی یەزدان دەکات وە چۆن موسا و بنی اسرائیل سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە ؟ لە هەمووی گرنگ تر ئەم کتێبە پیرۆزەی بەر دەستمان باسی کتێبی جەنگەکانی یەزدان دەکات و ناوی شوێنەکان دەهێنێت و چۆن خودا ئاوی پێداون و سرود بڵێن بۆ ئەو ئاوە . بەڵام کتێبەکە بزرە و دیار نییە !! ئێمە چۆن بزانین ئەم دەقانەی سفر **العدد** ٢١ لە دەق ١٤ هەتا ٢٠ ڕاستە ؟ لە کاتێکدا ئەو کتێبە بزرە و دیار نییە ؟ وە چۆن نوسەرانی کتێبی پیرۆز ٧ دەقیان لە کتێبی جەنگەکانی یەزدانەوە وەر گرتوە و لەم کتێبەی ئێستای بەر دەستماندا داناوە لە کاتێکدا ئەو پەرتوکە دیار نییە ؟ بەهەمان شێوە ٢٤ پەرتوکی تر لە کتێبی پیرۆزدا باس کراوە و لەم کتێبەی ئێستا لەبەر دەستماندایە دەقیان لێوە وەر گرتووە بەڵام لەم کتێبە پیرۆزەی ئێستای بەر دەستماندا بوونیان نییە و بزرە ..

ئێمەش پرسیار دەکەین : ئەی بۆچی نابێت ئایەتی ٦ ی سورەتی الصف کە دەڵێت پێغەمبەرێك لە دوای من دێت ناوی **احمدە** لە یەکێك لەو٢٥ سفرە یان کتێبەدا نە نوسرا بێت کە بزر بووە ؟ ئەگەر ٢٥ کتێب بە ئیعترافی خۆتان بزر بوبێت ناوی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) یان ئایەتێك چۆن بە ئاسانی بزر نابێت یان خۆتان بزری بکەن ؟ ئەگەر بشڵێن عیسا (ع) وای گوتووە نەك تەورات وە دەبێت ئەو دەقەی ٦ ی سورەتی **الصف** لە ئینجیلدا هەبێت نەك تەورات !!؟ لێرەشدا دەڵێین بێ زەحمەت ئینجیلی عیسامان بۆ بهێنن ؟ چونکە ئەم ئینجیلانەی بەر دەستمان لێی نوسراوە ئینجیل بە گوێرەی **متا** و **مرقس** و **لۆقا** و **یوحنا** . هیچیان لێی نە نوسراوە

ئینجیل بە گوێرەی عیسا یان یسوع یان مسیح . فەرموون ئینجیلی عیسامان نیشان بدەن لە کوێیە و کێ نوسیویەتی ؟ وە کەی نوسراوە ؟ گاورەکان لە گرتنی ڕەخنەی هاتنی ناوی احمد لە ئینجیلدا کەوتونەتە هەڵەیەکی گەورەترەوە ئەویش ئەمەیە ئەوان شوێن پەیمانی کۆن کەوتوون وە پەیمانی کۆنیش ٢٤ کتێبی تێدا بزرە . کەواتە بۆ ناچن بە دوای ئەو ٢٥ کتێبە بزرەدا بگەڕێن وە ئاینەکەیان کامل بکەن ؟ ئایا گاورەکان دەتوانن ئەو ٢٥ کتێبەمان بۆ بهێنن کە ئەم کتێبەی ئێستا دەقی لێوە وەرگرتون و بزرە و دیار نییە ؟ دڵنیاشم ناتوانن نەك٢٥ بەڵکو ١ لاپەڕەش لەو ٢٥ کتێبە بهێنن . کەواتە چۆن داوا لە ئێمەی موسوڵمان دەکەن ئەو ئایەتەتان بۆ بهێنین کە دەڵێت( **و مبشرا برسول ياتي من بعدي اسمه احمد** )؟

---

## پرسیارە بێ وەلاٌمەکان ژمارە :سەد و نۆ

## مانگ و ئەستێرەی سەر مزگەوتەکان



يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَىٰ وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا وَاتَّقُوا اللَّـهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿البقرة: ١٨٩﴾

فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَـٰذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ ﴿الأنعام: ٧٧﴾

أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّـهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَن يُهِنِ اللَّـهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّـهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴿الحج: ١٨﴾

وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّـهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿فصلت: ٣٧﴾

وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴿الرحمن: ٦﴾

ڕەخنە دەگرن و دەڵێن ئیسلام مانگ و ئەستێرە دادەنێت لەسەر منارە و گومەزی مزگەوتەکانی وە مانگ و ئەستێرە دەپەرستن وەك گەلانی پێش ئیسلام وە ئەو مانگ و ئەستێرەیەیان لە سۆمەریەکان و بابلیەکان و کافرەکانی قورەیش و ... هتد وەرگرتووە و ئەوانیش پەرستویانە .

لەم باسەدا ناچینە سەر ئەسڵی مانگ و ئەستێرە لە گەلانی پێش ئیسلامدا و ئایا ئیسلام لە کامیانی وەر گرتووە و دەلالاتی ئەو مانگ و ئەستێرە یە چییە ؟ بەڵکو بە دەقەکانی قورئانی مەزن وە لاٌمیان دەدەینەوە چونکە لە قورئاندا یە ك جار بە کۆ ناوی مانگ هاتووە ( الاهلة ) لە ئایەتی ١٨٩ ی سورەتی **البقرة** دا وە باسی ئەوە دەکات مانگ بۆ دیاری کردنی کاتەکانی ساڵ و ڕۆژە و لەگەڵ دیاری کردنی بۆنەکانە وە ٢٥ جار بە تاك ناوی هاتووە بە ( **القمر** ) لە سورەتی **فصلت** ٣٧ دا خودا فەرمانمان پێ دەکات سوجدە بۆ مانگ و ڕۆژ نەبەین بەڵکو سوجدە بۆ خودا ببەین کە خەلقی کردون . لە سورەتی **الحج** ١٨ دا دەڵێت هەموو دنیا و زۆربەی خەڵکی و

مانگیش سوجدە بۆ خودا دەبەن واتا گوێ ڕایەڵی خودان لە سورەتی الانعام ٧٧ دا باسی ابراهیم (ع) دەکات کاتێك دەچێتە لای قەومێکی بت پەرست وە بۆ ئەوەی ئەو قەومە باوەڕ بە خودا بهێنن ابراهیم (ع) کاتێك دەبێت بەشەو بینی مانگ دەدرەوشێتەوە . گوتی ئەو مانگە خودامە سەیر کەن چەند جوانە . بەڵام کاتێك ڕۆژ بووەوە و مانگ دیار نەما گوتی نەخێر ئەوە خودا نیە و خودا نابێت دیار نەمێنێت وە ئەگەر خودا ڕێگای راستم نیسان نەدات منیش گومڕا دەبم هەروەها لە سورەتی **الرحمن** ٦ دا دەفەرموێت ئەستێرە و دار سوجدە دەبەن واتا مل کەچی خودان لێرەدا دیقەت بدەن ئەو ئایەتانەی باسی مانگ دەکات هەموویان باس لەوە دەکەن مانگ مخلوقێکی خودایە و نەك خودایە . وە ئایەتەکان دەڵێن سوجدە مەبەن بۆ مانگ و ئەستێرە بەڵکو سوجدە بەرن بۆ ئەو الله کە مانگی دروست کردوە . ئەگەر ئاینی ئیسلام مانگی بە گەورە بزانیایە حتما ئەو ئایەتانەی تێدا باس نە دەکرا و دەی گوت مانگ و ئەستیرە بپەرستن و سوجدەی بۆ بەرن پاشان ئەگەر موسوڵمان مانگ و ئەستێرە بپەرستن وە مانگ و ئەستێرە یەکێك بێت لە هیماکانی ئیسلام دەبوایە لەسەر کەعبە ئەو مانگ و ئەستێرەیە هەبوایە . بۆچی لەوێ ئەو هێمایە نییە ؟ خۆ موسوڵمان هەموی ڕوو دەکاتە کەعبە و باشترین شوێن بۆ ئەو مانگ و ئەستێرەیە کەعبەیە نەك مزگەوتەکان !؟

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمەیە** : ئەگەر وای دا بنێین دژە ئیسلامەکان راست دەکەن و ئەستێرە و مانگیان لە قەومە کۆنەکان وەر گرتووە . وە هەمان خودای مانگیش لە دورگەی عەرەبیدا هەبووە : کەواتە بۆچی کێشەیان هەبووە لەگەڵ بت پەرستەکانی قورەیشدا ؟ وە چی پێویستییان بە کۆچ کردن هەبوو لە مەکە ؟ پاسان بۆچی ئەو ئایەتانە هەیە لە قورئاندا دەڵێت سوجدە مەبەن بۆ مانگ و ئەستێرە ؟ دەبوایە ئەو ئایەتانە لە قورئاندا نەبوایە ! چونکە دژی مانگ و ئەستێرە پەرستنە

ناوی یە ك مزگەوتمان بۆ بهێنن کە مانگ و ئەستێرەی لەسەر دانرا بێت .... لەو ڕۆژەی یەکەم ئایەتی قورئان دابەزی هەتا ساڵی ١٣٢ ی هیجری و نەمانی خیلافەتی ئەمەوی . بە درێژایی ١٣٢ ساڵی یەکەمی ئاینی ئیسلام بە بەڵگەوە ناوی یە ك مزگەوتمان پێ بڵێن مانگ و ئەستێرەی لەسەر بو بێت . ئەگەر نەشت توانی بەڵگەمان بۆ بهێنیت تکایە بە خۆتدا بچۆروە و بزانە بۆچی چەواشەکاری دەکەیت و دژایەتیی ئاینی ئیسلامی مەزن دەکەیت بێ بەڵگە!!

---

## پرسیارە بیٚ وەڵامەکان ژمارە :سەد و دە

## ناوی الله لە اللات وەرگیراوە کە بتێك بووە ؟

| | |
|---|---|
| ماناى وشەى اللات تحدا ى هەموو جیهان دەكەم ووشەى اللاتم بۆ بهێنێت | لت (مقاييس اللغة)<br>اللام والتاء كلمةٌ واحدة. يقال: لَتَّ السَّويق بالسَّمْن يلُتُّه لَتّاً، والفاعل لاتٌّ.<br>وذُكر عن ابن الأعرابيّ: لُتَّ فلانٌ بفلانٍ، إذا قُرِن به. فإن صح فهو من باب الإبدال، التاء مبدَلة من زاء. |

دژە ئیسلامەکان دەڵێن ناوی ( الله ) ی ئیسلام لە ( اللات ) ی بتی قورەیشەوە وەرگیراوە . بۆ وەلام دانەوەی ئەم گومانە با پێشەکی بزانین لەسەر لات چی گوتراوە لە مێژودا ؟ دەڵێن گوایا لەوەوە وەرگیرا وە چۆن شتێك شەڕ لە شتێك دوور دەخاتەوە ( لاتە یلیتە ) . دەڵێن بە مانای لول کردنی شت دێت ( لویت الشئ ) وە دەڵێن ناوی مێینەی ( الله ) یە وە هیرودوتی مێژونوسی ڕۆمانی لە ساڵانی ٤٠٠ ی پێش هاتنی مەسیح (ع) ژیاوە دەڵێت : ئەم خودایە اللات پێیان دەگوت الیتا واتا گوڵی ئاسمانی

اللات لە لای عەرەبیش بتێك بووە لای ( ثقیف ) پەرستراوە دەڵێن کابرایەك بووە لەسەر بەردێك دانیشتوە ڕۆن و شیری فرۆشتوە بە حاجییەکان کاتی خۆی . وە دەڵێن لات لە ( یلت السویق للحجاج ) واتا کابرایە ك بووە دانەوێڵەی دەهێنا و دەی کوتا و دەی کرد بە هەویر و لەگەڵ کونجیدا تێکەڵی دەکرد و دەی برژاند بۆ حاجیەکان لەسەر بەردێك وە بەردەکە بە بەردی لات ناسرا بوو . چونکە ئەو کارەی لەسەر دەکرد وە کاتێك کابراکە مرد مەیتی نە بووە و عمرو بن لحي بە خەڵکەکەی گوتووە کابرا نەمردووە بەڵکو چوەتە ناو بەردەکەوە ئیتر خەڵکی پەرستویانە وە ئەوەش دەڵێن کە لات خودایەکی مێینەی ئاسمان بوە وەك لە سەرەوە باسمان کرد کە هیرودوت باسی کردوە و لە هۆکاری کۆچ کردنی خەڵکی لە سوریاوە ئەو ناوەش هاتووە بۆ دورگەی عەرەبی . بە هەر حاڵ ئەم لاتە کە ناوەکەی لە ( لت السویق ) هاتووە واتا شێلانی هەویر وا دیارە پیاو چاکێك بوە خزمەتی حاجییەکانی کردووە چونکە خەڵکیش دەچوون بۆ حەج بۆ طائف ئەمیش نانی بۆ دروست کردوون وە دەڵێن ناو صرمة بن غنم بووە و بەهۆی کارەکەیەوە ناویان ناوە لات لە زمانی عەرەبیشدا هەر شتێك بناسرێت یان ناسراو بێت ( ال التعریف ) ی دەچێتە سەر وە ( لات ) دەبێت بە ( اللات ) شەدە دەچێتە سەر لامەکە واتا ئەو کەسەی هەویرەکەی دەشێلا. ئەگەر باسی لایەنی زمانەوانیش بکەین هەمووتان کۆمپیوتەرتان لەبەر دەستدایە و فەرموو بگەڕێن بۆ مانای ناوی اللات یان لات بزانن چیتان دەست دەکەوێت ؟ بە دڵنیاییەوە هیچ مانایەکتان دست ناکەوێت لە ووشەی ( لت ) کە لە وێنەکەدا دامان ناوە واتا شێلانی هەویر ( لت السویق یلته لتا ) وە بگەڕێن بۆ ووشەی الله بزانن چیتان دەست دەکەوێت ؟ بەو شێوەیە ئەم گومانە لە لایەنی زمانەوانیەوە پوچەڵ دەکرێتەوە و شێلانی هەویر و ( الله ) کە مانای خودایە زۆر جیاوازییان هەیە و قەت ناتوانرێت الله و اللات بەراورد بکرێت بە هیچ شێوەیەك چونکە شێلانی هەویر زۆر دورە لە خودایەتیەوە لە هەموو ئاینە مرۆی و ئاسمانیەکاندا هەر هەمووتان لە قورئاندا بگەڕێن بۆ ووشەی ( الله ) ٢٦٦٩ جار ناوی هاتووە لە ١٨٤٢ ئایەتدا . ئەگەر ناوی الله لە ( اللات ) وەر بگیرایە ئایا کافرەکانی قورەیش نەیان دەتوانی ئاینی ئیسلام بەو ناوی ( الله ) یە پوچەڵ بکەنەوە و بڵێن ئێوە الله دەپەرستن هی ئێمەیە بردوتانە ؟ وە ووشەی الله شتێك نییە بشارێتەوە و کافرەکان نەزانن چییە یان یە ك جار ناوی هات بێت بەڵکو ڕۆژانە ناوی دەهات و کافرەکانیان بانگەشە دەکرد باوەڕ بە الله بهێنن ... کافری قورەیش نەزان و گێل بوو . نەی دەزانی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڵێت اللات ناوی خودای ئێمەیە تۆ گۆڕیوتە بۆ الله بۆچی دوای الله بکەوم دوای اللات دەکەوم بەو شێوەیە دەیان توانی ئاینی ئیسلام پوچەڵ بکەنەوە ... بەلام کافری ئێستا زانایە و دەیەوێت ناوی الله مان بۆ

شیکاری بکات لە اللات وەرگیراوە . هەر قورئانی مەزن خۆی وەڵامی ئەم فەریکە کافرانەی ٢٠١٥ و کافرانی قورەیشیش دەداتەوە . لە سورەتی **النجم** ١٩ بۆ ٢٣ دەفەرموێت

**( أفرأيتم اللات والعزى ومناة الثالثة الأخرى ألكم الذكر وله الأنثى تلك إذا قسمة ضيزى إن هي إلا أسماء سميتموها أنتم وآباؤكم ما أنزل الله بها من سلطان)**

واتا ئایا لات و عوزاتان نە بینیووە یان نە ناسیووە ؟ بۆچی ئێوە خۆتان حەز دەکەن کوڕتان ببێت بەڵام خوداکانتان بە مێ ناو دەبەن مەبەستی لەوەیە کافرانی قورەیش بە خوداکانی خۆیان دەگوت مێیەن وە بە اللاتیان دەگوت خودای مێیە لێرەدا قورئان لۆمەیان دەکات و دەڵێت ( اللات ) بۆچی بە مێ ناو دەبەن لە کاتێکدا خۆشتان دەزانن اللات بەردە و نە نێرە و نە مێیە دەڵێن خودای مێیە . کەچی ڕقیشتان لە مێیە و کاتیك کچتان دەبێت زیندە بەچاڵی دەکەن . بەلام رازین خوداکەتان مێ بێت . ئەوە کارێکی خوار و خێچە .... ئەی بۆچی کافرانی قورەیش قورئانیان پوچەڵ نەکردەوە و بڵێن خۆ ناوی الله کەی ئێوش لە اللاتە مێیە کەی ئێمەوە وەر گیراوە ئیتر بۆچی ڕخنەمان لێ دەگرن ؟

باسەکەشم بەم ڕوداوە کەمەر شکێنە کۆتای پێ دەهێنم کە موعتەزیلە عەدنانیەکان و لە عەدنان بەرەو خوارەوە تێی کەوتون و بێدینەکانیش هەمان ڕەخنەی معتزلة ی جاهیل دەگرنەوە . وە دەڵێن بۆچی ابو بکری صدیق گوتویەتی ( اعضض یان امصص ببضر اللات ) واتا بڕۆ قیتکە یان میتکەی اللات بمژە یانژ بگەزە . بۆئەوەی لەو قسەیە تێ بگەن

.....................................

سەیری **پرسیارە بێ وەڵامەکان ٤٤ بکە لا پەرە (٨٩)**

.................................

**برسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئەو قسەیەی ابوبکری صدیق بە سەرگەورەی هۆزی ثقیفي گوت کە عروة ی کوڕی مسعودە و ئەوانیش ( اللات ) یان دەپەرست لە سوڵحی حودەیبیەدا کە هەمو هۆزە کافرە کانی قورەیش لەوێ کۆ بوبونەوە . نە دەبووە هۆی پوچەڵ کردنەوەی ئاینی ئیسلام ؟ ئایا عروة ئەقڵی بەوە نە دەشکا بڵێت ئاوەرن گوێ لەمانە بگرن بە ئێمە دەڵێن خوداکەتان مێیە و برۆن گاز لە فیتکەی بگرن کەچی خۆشیان ناوی ( الله ) یان لە ( اللات ) ی ئێمەوە وەر گرتووە !؟ ئایا ئەوە باشترین گورز نەبوو لە ئیسلام بوەشێنرێت ؟ وە سوڵح لەگەڵ موسوڵمانەکان نەکەن و سوڵحی حودەیبیە و ئاینی ئیسلامیشی پێ پوچەڵ بکەنەوە ؟ یان کاکی دژە ئیسلام لە ساڵی ٢٠١٥ دا دێت بە ئەقڵی ژەنگاویی خۆی دەیەوێت ئاینی مەزنی ئیسلام پوچەڵ بکاتەوە . بۆیە ئێمەش بە فەزڵی خودا بە گومانێکی کۆنی موعتەزلەی دوژمنانی ئیسلام کە دەڵێن اخلاقی سەحابەکان بە تایبەتی ابوبکری صدیق هێندە نزمە لەبەر دەم پێغەمبەردا (صلى الله علية وسلم) دەڵێن ( اعضض ببضر اللات ) ئەو گومانە پوچەڵ دەکەینەوە ناوی الله لە اللاتەوە وەرگیرا بێت

**کۆتا پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** . ئەگەر ناوی الله لە اللاتەوە وەر گیرا بێت بۆچی موسوڵمانان کێشەیان بۆ دروست دەبوو لەگەڵ بت پەرستەکاندا ؟ خۆ اللات گەورەترین بتی قورەیش بوو موسوڵمان و بت پەرست پێکەوە دەیان پەرست ئەو بە ناوی الله وە ئەویش بە ناوی اللاتەوە

.........................................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و یانزە

## بۆچی ئێسکی ئادەم و حەوا نە دۆزراوەتەوە ؟

| A | B | C | D | E | F | G |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Aachenosaurus | Bagaceratops | Caenagnathasia | Daanosaurus | Edmontonia | Fabrosaurus - | Galtonia |
| Aardonyx | Bagaraatan | Caenagnathus | Dacentrurus | Edmontosaurus | Falcarius | Galveosaurus |
| "Abdallahsaurus | Bahariasaurus | Calamosaurus | "Dachongosaurus | Efraasia | "Fenestrosaurus | Galvesaurus |
| Abelisaurus | Bainoceratops | Calamospondylus | Daemonosaurus | Einiosaurus | Ferganasaurus | Gannansaurus |
| Abrictosaurus | "Bakesaurus | "Calamospondylus | Dahalokely | Ekrixinatosaurus | Ferganastegos | "Gansutitan" |
| Abrosaurus | Balaur | Calamosaurus | Dakosaurus | Elachistosuchus | Ferganocephale | Ganzhousaurus |
| Abydosaurus | Balochisaurus | Callovosaurus | Dakotadon | Elaltitan | Frenguellisaurus | Gargoyleosaurus |
| Acanthopholis | Bambiraptor | Camarasaurus | "Damalasaurus | Elaphrosaurus | Fruitadens | Garudimimus |
| Achelousaurus | Banji | Camarillasaurus | Dandakosaurus | Elmisaurus | Fukuiraptor | Gasosaurus |
| Acheroraptor | Baotianmansauru | Camelotia | Danubiosaurus | Elopteryx | Fukuisaurus | Gasparinisaura |
| Achillesaurus | Barapasaurus | Camposaurus | "Daptosaurus | Elosaurus | Fukuititan | Gastonia |
| Achillobator | Barilium | "Camptonotus" | Darwinsaurus[6] | Elrhazosaurus | Fulengia | "Gavinosaurus |
| Acristavus | Barosaurus | Camptosaurus | Dashanpusaurus | "Elvisaurus" | Fulgurotherium | Geminiraptor |
| Acrocanthosaurus | Barrosasaurus | "Campylodon" | Daspletosaurus | Emausaurus | "Fusinasus | Genusaurus |
| Acrotholus | Barsboldia | Campylodoniscus | Dasygnathoides | Embasaurus | Fusuisaurus | Genyodectes |
| Actiosaurus | Baryonyx | Canardia | "Dasygnathus | Enigmosaurus | "Futabasaurus' | Geranosaurus |
| Adamantisaurus | "Bashunosaurus | "Capitalsaurus | Datanglong | Eoabelisaurus | plesiosaur Futabasaurus | Gideonmantellia |
| Adasaurus | Basutodon | Carcharodontosaurus | Datousaurus | Eobrontosaurus - | Futalognkosaurus | Giganotosaurus |
| Adelolophus | Bathygnathus | Cardiodon | Daurosaurus | Eocarcharia | | Gigantoraptor |
| Adeopapposaurus | Batyrosaurus[5] | Carnotaurus | Daxiatitan | Eoceratops | | Gigantosaurus |
| Aegyptosaurus | Baurutitan | Caseosaurus | Deinocheirus | Eocursor | | "Gigantosaurus |
| Aeolosaurus | "Bayosaurus | Cathartesaura | Deinodon | Eodromaeus | | Gigantoscelus |
| Aepisaurus | Becklespinax | Cathetosaurus | Deinonychus | "Eohadrosaurus' | | Gigantspinosaurus |

بێدینەکان پرسیارێکی زۆر هەزەلی و سەیر دەکەن کە بەڵگەیە بۆ کورت بینی و نە شارەزاییان لە هەموو بوارێکی زانین و زانست و زانیاریدا وە دەڵێن : بۆچی ئێسکی ئەو دایناصۆرانە دەدۆزرێتەوە بۆچی تا ئێستا ئیسکی ئادەم و حەوا نە دۆزراوەتەوە !؟

با ئێستا بە زمانی خۆیان قسە بکەین : ئێوەش ئەم رودا و ژمارانە لە مێشکتاندا لەبەر بکەن چونکە لە کۆتایدا پێویستیمان پێی دەبێت چونکە ئەوان دەڵێن تەمەنی دایناصۆرەکان دەگەڕێتەوە بۆ ٦٥ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر واتا ٦٥ ملیۆن ساڵە داینا صۆر نەماوە .

وە ژمارەی ئەو دایناصۆرانەی تا ئێستا دۆزراونەتەوە و ناویان بۆ داناون ١٣٧١ دانەیە وە ناوی هەندێکیمان لە وێنە کەدا بۆ نوسیوون وە باقیاتی تری ناوەکان لەم لینکەی خوارەوەدایە خۆتان دەتوانن کلیك بکەنە سەر هەر ناوێك جۆری دایناصۆرەکە و شوێنی ژیانی و هەموو زانیاریەکانی ترتان دەداتێ

https://en.wikipedia.org/wiki/List_of_dinosaur_genera

جنسەکان ٢،٥ ساڵە دروست بووە و یەکێك لەو جنسانە مرۆڤە وHomo بە گوێرەی پەرەسەندنی داروین و تەمەنی دروستبوونی مرۆڤ دەگەڕێننەوە بۆ ٢٠٠ هەزار ساڵ لەمەوبەر وە هەر لێکۆڵینەوەکانی خۆیان دەڵێت کۆنترین ئێسکی مرۆڤ لە ائیوپیا دۆزراوەتەوە ناویان ناوە ئاردی تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ ٤،٤ ملیۆن ساڵ لەمەو پێش . لێرەدا لێکۆڵینوەکانی خۆیان سەر هەڵدان و دروست بوونی جنسەکان بە درۆ دەخاتەوە چونکە دەڵێت ئاردی ٢ ملیۆن و ١٠٠ هەزار ساڵ پێش سەرهەڵدانی جنسەکان هەبووە

1،4 = 1،5 – 4،2

وە بیردۆزی پەرەسەندن دەڵێت ٢٠٠ هەزار ساڵە مرۆڤ دروست بووە بەلام ئاردی ٤،٤ ملیۆن ساڵ لەمەو پێش هەبووە ٤،٤ – ٢٠٠،٠٠٠ = ٤،٢٠٠ وە لێرەشدا ئاردی هەر داروین بە درۆ دەخاتەوە و دەڵێت ٤ نلیۆن و ٢٠٠ هەزار ساڵ پێش یەکەم مرۆڤ مرۆڤی تر هەبووە وەك دەبینن لێرەدا دوو زانیاریی هەڵەی زەق بەدی دەکەین کە جەماعەتی هیچ و دنیا لە خۆیەوە دروست بووە دەڵێن جنسەکان ٢،٥ ساڵ لەمەو پێش دروست بووە و مرۆڤیش ٢٠٠ هەزار ساڵە دروست بووە . هەر زانست و لێکۆڵینەوەکانی خۆیان ئەو دوو زانیارییە بە درۆ دەخاتەوە لە ڕێگای ئاردییەوە

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : کاکی ملحد یان بێدین یان زانست باز . بێرەحمەت جارێ جەنابت وەرە ئەو زانیاریانەی سەرەوەمان بۆ پشتت ڕاست بکەرەوە بزانین کەی مرۆڤ هەبووە ؟ ئەو کات بە دوای ئێسکی ئادەم و حەوادا بگەڕێ ؟

کاکی زانست باز جەنابت ئاگات لە سەرچاوەکانی خۆتان نییە و سەر و موش تیل دەکەیت و بە دوای ئەسڵی ئادەم و حەوادا دەگەڕێیت بەلام یە ك شەبەقی گەورە لە خۆتدا هەیە و هەستت پێ نە کردوە و نازانیت زانستەکەت دەڵێت ٤،٤ ملیۆن ساڵە یان ٢،٥ ملیۆن ساڵە یان ٢٠٠ هەزار ساڵە مرۆڤ هەیە ؟ کام زانست و زانیاریەیان تەواوە ؟ بە چیدا بزانین ٦٥ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر ديناصۆر هەبووە کێ دەڵێت کەمتر یان زیاتر نییە ؟ چونکە ئەو پێوەرانەی بۆ مرۆڤ بەکار هێنرا ڕاست دەر نەچوو بە دڵنیاییەوە ئەو پێوەرانەی بۆ داینا صۆریش بەکار هێنراوە هەمان پێوەرن بۆ مرۆڤ بەکار هێنراوە بۆیە ئەو ٦٥ ملیۆن ساڵەش جێگای گومانە ؟ کاکی زانست باز ئایا بیرت لەوەش کردوەتەوە یان شەلم کوێرم بە ناوی زانستەوە شوێن ئەو زانیاریەش کەوتویت ؟

پرسیاری دووەممان بە گوێرەی سەرچاوەکانی خۆتان ١٣٧١ جۆر داینا صۆر دۆزراوەتەوە . ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی ملیۆنەها داینا صۆری تر هەبووە . و نەك بەس ئەو ژمارەیە هەبوو بێت و نەما بێت بەلام ئەوەی تا ئێستا دۆزراوەتەوە ئەو ١٣٧١ جۆرەیە وە شتێکی زۆر ئاساییە لە ملیۆنەها شت یان بونەوەر ١٣٧١ دانەی بدۆزرێتەوە . بەلام ئادەم و حەوا دوو نەفەر یان دوو کەس بوون . چۆن بدۆزرێنەوە ؟ یەك پرسیاری لۆژیکیش بۆ جەنابت : کاتێك باسی داینا صۆر دەکەیت باسی شتێك دەکەیت نەماوە و ئاساییە بدۆزرێتەوە بەلام کاتێك باسی مرۆڤ دەکەیت مرۆڤ ماوە و شتێك نییە نەما بێت و بدۆزرێتەوە ؟ مرۆڤ لەناو نەچووە بەڵکو زیادی کردوە . من و تۆش نموونەی ئەو زیاد کردنەین . کاکی زانست باز ئایا جۆری ئێسکەکانی داینا صۆر و مرۆڤ وەك یەکن ؟هەتا ئادەم و حەوا ئێسکەکانیان بمێنێت و بدۆزرێتەوە ؟ با وای دا بنێین ئێسکی ئادەم و حەوا دۆزرایەوە پێوەری تۆ چییە بۆ ئەوەی بزانیت ئەوە

ئێسکی ئادەم و حەوایە ؟ وە چۆن باوەڕت پێ بکەم لێکۆڵینەوە ی زانستیی جەنابت تەواوە لە کاتێکدا ئاردی لە اثیوپیا هەموو بیردۆزەکانی تۆی پوچەڵ کردەوە ؟

**کۆتا پرسیاریشم ئەوەیە** : کێ دەڵێت ئێسکی ئادەم و حەوا لە جەمسەری بەستەڵەکی باکور یان باشور نییە ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد ودوانزە

## سەری پەنجەکان لە نێوان مرۆڤ و خودا

دژە ئیسلامەکان دەڵێن قورئان محمد (صلى الله عليه وسلم) نوسیویتیەوە . ئێمەش دەڵێین لە سورەتی **القیامة** ١ بۆ ٦ دا خودای زانا باسی زیندوو بونەوە و ڕۆژی قیامەت دەکات وە دەڵێت خەڵکانی بێ باوەڕ لایان سەیرە چۆن دەتوانرێت مرۆڤ زیندوو بکرێتەوە جارێکی تر ؟ وە چۆن ئەو ئێسکانە کۆ دەکرێتەوە پاش ئەوەی دەبێت بە خۆڵ ؟ خودای زانا وەڵام دەداتەوە دەفەرموێت نەك مرۆڤەکە و ئێسکەکانی بەڵکو دەتوانین سەری پەنجەکانیشی وەك خۆی دروست بکەینەوە . خۆشتان دەزانن نەخشەی سەری پەنجەکانی هیچ کەس لە کەسێکی تر ناچێت

ئەگەر دیقەت بدەن ئایەتەکە زۆر بە وردەکاری و بە دیقەت دەفەرموێت ( نسوي بنانه ) ناڵێت نصنع بنانه یان نقلد بنانه یان نعمل مثله یان ... هتد ، بەڵکو دەفەرموێت ( نسوي ) واتا ١٠٠% وەك خۆی دروستی بکەینەوە

دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئینجا ئەوە چییە ؟ خۆ صینی و فیرعەونییەکان باسی نەخشەی سەری پەنجەیان کردووە قورئانیش لەوانەوە وەری گرتووە . ئێمەش ئەگەر بڵێین و وای دا بنێین ئێوە ڕاست دەکەن و قورئان نەخشەی سەری پەنجەی لە گەلانی پێش خۆی وەرگرتووە فەرموو بە سەرچاوە بۆمان بهێنن ئەو گەلانە لەچی بوارێکدا باسی نەخشەی سەری پەنجەیان کردووە ؟ بۆچی بوارێك

بەکاریان هێناوە ؟ چۆن سودیان لێ وەرگرتووە لە دادگاکاندا یان هەر بوارێکی تردا بێت چونکە ئەو گەلانە خوێندەوار بوون وەك قورەیش نەخوێندەوار نە بوون.. لەبەرامبەریشدا : قورئان لە سورەتی قیامەتدا باسی کردووە کردوێتی بە بەڵگە بۆ ئەوەی خودا دەتوانێت نەك ئێسقان و گۆشت و کەسەکە جارێکی تر بنیات بنێتەوە . بەڵکو نەخشەی سەری پەنجەکانیشی بنیات دەنێتەوە هەموو تەفسیرە ئیسلامیەکانیش بگەڕێ هیچیان نەیان زانیوە باسی نەخشەی سەری پەنجە دەکات فەرموو جەنابی دژە دین پێمان بڵێ ئەو گەلانە چۆن و بۆچی باسی نەخشەی سەری پەنجەیان کردووە ؟ چونکە هیچ کەس نەی زانیوە نەخشی سەری پەنجە چییە ؟

هەتا ساڵی ١٨٢٣ زانرا کە نەخشەی سەری پەنجەی کەسیك بۆ کەسێك جیاوازیی هەیە وە لە دوای ئەو ساڵەوە هەتا ساڵی ١٨٩٣ لێکۆڵینەوکان کران و لە ساڵی ١٨٩٣ دا نەخشەکان خرانە سەر کاغەز و وەك بەڵگە بەکار دەهێنران لە فەرمانگەی پۆلیسدا موعجیزە قورئانیەکە لێرەدایە : هەتا ساڵی ١٨٢٣ هیچ کەس دەرکی بە گرنگیی نەخشەی سەری پەنجە نەکرد بوو . بەلام خودای زانا چونکە خۆی خالقە و بنیات نەری مرۆڤە دەزانێت چیی دروست کردوە و دەزانێت سەری پەنجەی کەس لە کەس ناچێت بۆیە بۆ جارێکی تر ژیانەوە و دروست کردنەوەی مرۆڤ ناوی سەری پەنجەی هێناوە و کردوێتی بە بەڵگە بۆ دروست کردنەوەی مرۆڤ جارێکی تر . وە ئەو زانیارییە ورد و گرنگە بەس خالق دەی زانێت نەك مخلوق

لایەکی تری ئەو موعجیزەیەش ئەوەیە ئەگەر قورئان لە زەمانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) شیکاریی تەواو بکرایەئێستا وەك کتێبێکی ئاسایی دەبوو . بەڵام موعجیزەی قورئان و **پرسیاری بێ وەلامەمان ئەوەیە**، بۆچی خودای زانا بۆ زیندوو بونەوە باسی نەخشی سەری پەنجەی کردووە ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد وسیانزە

## کوشتنی مورتەد لە ئیسلامدا



کڵێسا ڕەخنە دەگرێت دەڵێت ئاینی مەسیحی ئاینی ڕەحمەتە و ئاینی ئیسلام ئاینی کوشتنە و هەر کەس لە دینەکەیان هەڵ گەڕێتەوە دەی کوژن وە حوکمی مورتەد کوشتنە . بێدینەکانیش بە دوای ئەواندا کۆپی و پەیست دەکەن بەبێ ئەوەی بزانن مورتەد کێیە و کەی و بۆچی دەکوژرێت ؟

پێش هەموو شتێك دەبێت بزانین ردة مانای چییە ؟ ردة واتاپشت کردنە شت یان منهج وە بەو کەسەی پشت دەکاتە ئەو منهجە پێی دەڵێن موردتەد . وەك چۆن کەسێك سەر بە حیزبێك یان لایەنێکە ئەو لاینە جێ دەهێڵێت . وە بە گوێرەی کەسەکە و توانای کەسەکە ئەو حیزبە یان ئەو لایەنە حسابی بۆ دەکات کە جێی هێشتووە بۆ نموونە ئەگەر کەسەکە کەسێکی ئاسایی یان لایەنگرێك یان ئەندامێکی ئاسایی بێت هیچ کاریگەریەکی نییە بۆ ئەو حیزبەی جێی هێشتووە . بەلام ئەگەر کەسێکی شارەزا بێت وە پۆستێکی هەبوو بێت و بە گوێرە ی بەرز و نزمیی پۆستەکەی حسابی بۆ دەکرێت کاتێك ئەو کەسە دژایەتیی ئەو حیزبە یان ئەو لایەنە یان ئەو دەوڵەتە بکات کە پشتی تێ کردووە و جێی هێشتوە و مورتەد بووە . بە دڵنیاییەوە ئەو لایەن و دەوڵەتە ڕازی نابێت بە دژایەتیی ئەو ئەندامەی وە دەی کوژێت و ئەوە یاسایەکی ستاندەردی جیهانیە لە کۆن و نوێدا ئاینی ئیسلامیش بە هەمان شێوەیە و ئاینێك نییە کابرا بەس خەریکی خودا پەرستی بێت !؟ بەڵکو ئاینی ئیسلام نیزامی دەوڵەتە کاتێك کەسێك پشتی تێ دەکات و دەبێت بە مورتەد بە گوێرەی کەسە کە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت . کابرا دەڵێت پشت دەکەمە ئیسلام لە ماڵی خۆمدا دا دەنیشم هیچ ناکوژرێت بەڵام کەسەکە خاوەن پۆستێکی مەزنە یان زانایەکی ئیسلامە دێت دژایەتیی ئیسلام دەکات و خەڵکی هان دەدات بۆ ئەوەی دژایەتیی ئیسلام بکات . ئەو کات لەگەڵی دا دەنیشن وتووێژ و گفت و گۆ دەکرێت و بزانرێت هۆکاری پشت کردنە ئیسلامەکەی چییە ؟ وە پاش ئەوەی زانیان ناگەنە هیچ ئاکامێك ئەو کات دەکوژرێت یان کەسێك مورتەد بووە بەڵام هیچ چالاکییەکی نییە و کەس نازانێت ئەو کەسە مورتەدە بۆچی بکوژرێت ؟ بە هەموو حاڵەتەکان هەر کەس مورتەد بێت لە ئیسلامدا دادگایی دەکرێت و بە جلسات لەگەڵی دادەنیشن وە ئەگەر هەر زانیان کەسەکە ناگەڕێتەوە ئەو کات دەکوژرێت باشترین نمونەش

حەلاجە (٩) ساڵ دادگای دەکرا و کابرا ئازاد بوو لە ماڵی خۆیدا بوو هات و چۆشی دەکرد پاش (٩) ساڵەکە ئینجا کوژرا . واتا ئاینی ئیسلام ئاینێکی همجی نیە بڵێن فلان مورتەدە یەکسەر بێن لە ملی بدەن ! بەڵکو ئامۆژگاری و دانیشتن و لێکۆڵینەوە هەیە و بزانرێت هۆکارەکەی چییە ؟ و لەوانەیە کابرای مورتەد هەڵە بێت و بە چەند دانیشتنێك هەست بە هەڵەکەی بکات و بگەڕێتەوە خاڵێکی زۆر گرنگیش هەیە : زۆر کەس بەس بە تەسکەرە موسوڵمانە و نازانێت ئاینی ئیسلام چییە ؟ وە دژایەتیی ئیسلام دەکات . ئایا ئەو کەسە مورتەدە ؟ هیچ زانیاریەکی نییە دەربارەی ئاینی ئیسلام وەك توتی شت دەڵێتەوە بە تایبەتی لەم زەمانەی ئێستاماندا . ئێمە دەتوانین بەچی حوکمێك پێی بڵێین مورتەد ؟ لە کاتێکدا هیچ زانیاریەکی نییە . وە ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی هەبێت و ئەو کەسانە کۆ بکاتەوە و وانەیان بۆ دا بنێت کابرا ئیمان بهێنێت و تێ بگات لە ئاینی ئیسلام بەڵام کابرا بە ئارەزوی خۆی ڕەخنە دەگرێت و هیچ لە ئیسلام نازانێت مورتەدییەکەی لە کوێدایە ؟ئەم حەدیسە دەهێننەوە بە بەڵگە بۆ کوشتنی مرتد ( **من بدل دینه فاقتلوه** ) واتا هەر کەس

دینەکەی گۆڕی بیکوژن . زۆر جار دین گۆڕین بۆ فێڵ و پشێوی و ئاشوبە وەك خودای زانا لە سورەتی ال **عمران** ٧٢ دا دەفەرموێت کۆمەڵێک لە اهلی کتاب واتا جولەکە دەیان گوت بەیانیان موسوڵمانەکانتان بینی بڵێن ئیمە ئیمانمان هێناوە و بووین بە موسوڵمان بەلام ئێواران پەشیمان ببنەوە بۆ ئەوەی گومان بخەنە دڵیانەوە و موسوڵمانەکان ئیمانیان لاواز ببێت ئایا ئەمانە پشێوی دروست ناکەن و فیتنە ناخەنە ناو کۆمەڵگای ئیسلامییەوە ؟ ئایا هیچ دەوڵەت و لایەن و حیزبێك ڕازی دەبێت خەڵکانی لەو جۆرە لە ناویاندا هەبێت ؟ ئایا ئەو کەسانە سایانی کوشتن نین هەموو ڕۆژێك پشێوی بخەنە ناو کۆمەڵگاوە ؟

عبداللە ی کوڕی سرح کە برای شیریی عوسمانی کوڕی عفانە کاتبی وەحی بو ولە ئیسلام هەڵ گەڕایەوە چووە ناو کافرەکانی قورەیش لە مەکە و مورتەد بوو . بەڵام عوسمانی کوڕی عەفان شەفاعەتی بۆ کرد وە لێی خۆش بوون و نەیان کوشت. کابرایەکی ئەعرابی واتا دەشتەکیی عەرەب هات بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) بوو بە موسوڵمان کە چووە دەرەوە بۆ ناو بازاڕ پێچ بە سکیدا هات و سکی دەئێشا . کابرا نەزان بوو گوتی بۆیە نەخۆش کەوتم ئیسلام شومە . گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) گوتی واز لە ئیسلام دەهێنم چونکە بۆ من شوم بو نەخۆش کەوتم . پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) بۆچی نەی کوشت ؟ خۆ کابرا مورتەد بوو هەموو سەرچاوە ئیسلامییەکان دەڵێن مورتەد دەبێت بکوژرێت و لەسەر ئەوە کۆکن بەلام ابو حنیفة دەڵێت ئافرەتی مورتەد ناکوژرێت . لێیان پرسی بۆچی ؟ گوتی چونکە ئافرەتی مورتەد شەڕکەر نییە . کەواتە لەمە تێ دەگەین مورتەد هەموو کاتێك ناکوژرێت وە دەبێت مورتەدەکە شەڕکەر بێت و سڕایەتیی ئیسلام بکات و زیانی هەبێت . ئەگینا ناکوژرێت وەك کابرای ئیعرابی کە پێچ بە سکیدا هات و پەشیمان بووەوە نەکوژرا . عبداللەی کوڕی سرح یەکێك بوو لەوانەی وەحیی دەنوسییەوە هێندە مورتەد بوو دەی گوت قسەکانی محمد (صلی اللە علیه وسلم) قسەی مرۆڤە وە من خۆم کاتبی وەحی بووم قسەی منیشی تێدایە قورئان . بەلام کاتێك تۆبەی کرد نەکوژرا و ئەو سەحابیە بەڕێزە بوو کە افریقای فتح کرد .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە**: کێ مورتەدە ؟ و کەی دەکوژرێت ؟ ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی هەبێت و هەر کەسێك بڵێت فڵان مورتەدە . ئایا یەکسەر دەکوژرێت ؟ ئەگەر دەڵێن بەڵێ بەڵگەتان چییە ؟ ئایا چەند جۆر مورتەد هەیە ؟ بۆچی کەسێك خیانەت لە حیزبێك یان دەوڵەتێك بکات دەی کوژن ؟ بەلام خیانەت لە منهجی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلام بکات نابێت بکوژرێت ؟ بۆچی بۆ ئەو ڕەوایە و بۆ ئیسلام نارەوایە ؟

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان بۆ کڵێسا ئەمەیە** : بۆچی لە منهج و کتێبی پیرۆزدا ڕەوایە مورتەد بکوژرێت و بۆ منهجی قورئان نارەوایە مورتەد بکوژێت ؟ فەرموون خۆتان بەڵگەکان بەچاوی خۆتان ببینن وە خۆتان حوکم بدەن بزانن ئاینی ئیسلامی مەزن تەنانەت لە کوشتنی مورتەددا ڕەحم و بەزەیی هەیە و یەکسەر کابرا ناکوژێت بەڵکو لێکۆڵینەوەی لێ دەکات و لەگەڵیدا دا دەنشێت و گفت و گۆ دەکات هەتا دەگاتە خاڵێك دڵنیا دەبێت ئەو کەسە ناگەڕێتەوە ئینجا دەکوژرێت وە ئەگەر کابرا تۆبە بکات ناکوژرێت بەلام لە هیچ

سیستمێکی مرۆی و ئاینیدا ئەو جۆرە لێکۆڵینەوەیە نییە کە ئاینی ڕەحمەت و بەزەیی ئاینی ئیسلامی مەزن هەیەتی بەرامبەر خیانەت کاردا و سەیری ئەم دەقانەی تەوراتیش بکەن بۆ بەڵگە بۆ قسەکانمان

لە سفر **التثنية** ( دوا وتاری موسا ) بەشی ١٣ دەق ٦ بۆ ١٠ دەڵێت دەبێت مورتەد ڕەجم بکرێت ئەگەر کوڕت بێت یان برات یان باوك یان هەر کەسێکی نزیکت بێت دەبێت خۆت یەکەم جار ڕەجمی بکەیت وە بەزەیت پێدا نەیەتەوە پاشان گەل ڕەجمی بکات هەتا دەمرێت . ئەمەش سەرچاوەی ئەو دەقانەیە

http://www.kitebipiroz.com/bible/deu/13

.............................................

بابەتی ناو لینك

کتێبی پیرۆز » دواوتاری موسا » بەشی ١٣

6 ئەگەر براکەت، کوڕی دایکت، یان کوڕەکەت یان کچەکەت، یان ژنەکەی باوەشت، یان هاوڕێکەت کەوا وەك خۆتە بە نهێنی لەبن گوێت خوێندی و وتی، (دەڕۆین و خودای دیکە دەپەرستین،) ئەو خوداوەندانەی کەوا نە تۆ و نە باوباپیرانت نەیانناسیوە،

7 لە خوداوەندەکانی ئەو گەلانەی دەوروبەرت، ئەوانەی لێتەوە نزیکن یاخود دوورن لەمبەری زەوی تا ئەوبەری،

8 لەگەڵی ڕەزامەند مەبە و گوێی لێ مەگرە و دڵت پێی نەسووتێت و دەستی لێ مەپارێزە و بۆی مەپۆشە،

9 بەڵکو بێگومان دەیکوژیت، یەکەم جار دەستی تۆ لەسەری دەبێت بۆ کوشتنی ئینجا لە کۆتاییدا دەستی هەموو گەل،

10 بەردبارانی دەکەیت تا دەمرێت، چونکە ویستی لە یەزدانی خودات لات بدات کە لە خاکی میسر لەماڵی کۆیلەیی دەریهێنایت،

هەر هەمان **سفری التثنية** ( دوا وتاری موسا ) بەشی ١٧ دەق ٢ بۆ ٧ دەڵێت هەر کەسێك غەیری خودای پەرست دەبرێت بۆ لای دەروازەی شار و ڕەجم دەکرێت هەتا دەمرێت . ئەمەش ئەو دەقانەیە لە خودی کتێبەکەی خۆیانەوە

http://www.kitebipiroz.com/bible/deu/17

.............................................

بابەتی ناو لینك

کتێبی پیرۆز » دواوتاری موسا » بەشی ١٧

2 ئەگەر لەنێوتاندا، لە یەکێك لە شارۆچکەکانتان کەوا یەزدانی خوداتان پێتانی دەدات، پیاوێك یان ئافرەتێك بینرایەوە خراپە لەبەرچاوی یەزدانی خوداتان دەکات، بە شکاندنی پەیمانەکەی و

3 دەڕوات و خودای دیکە دەپەرستێت و کڕنۆشی بۆ دەبات، یان بۆ خۆر یان بۆ مانگ یان بۆ هەر یەکێك لە ئەستێرەکانی ئاسمان، ئەو شتەی کە فەرمانم پێی نەداوە.

4 جا پێتان ڕاگەیەنرا و بیستتان و باش لێتان کۆڵییەوە و تاوانبارکردنەکە ڕاست بوو و بێگومان ئەو کارە قێزەوەنە لە ئیسرائیلدا کرابوو،

5 ئەوا ئەو پیاوە یان ئەو ئافرەتەی ئەو بەدکارییەی کردووە، دەری بکەن بۆ لای دەروازەی شارەکەتان و بەردبارانی بکەن تا دەمرێت.

6 ئەوەی بکوژرێت لەسەر زاری دوو شایەت یا سێ شایەت دەکوژرێت، نابێت لەسەر زاری یەك شایەت بکوژرێت.

7 یەکەم جار دەستی شایەتەکانی بەسەرەوە دەبێت بۆ کوشتنی پاشان دەستی هەموو گەل، جا خراپەکە لەنێو خۆتان دادەماڵن.

ئیلیا یەکێکە لە پێغەمبەرانی بنو ئیسرائیل ٤٥٠ مورتەدی لە ڕۆژێکدا سەر بڕیوە .

# کتێبی پیرۆز و حروب الردة




گاورەکان ڕەخنە لە اسلام دەگرن و دەڵێن ئەگەر ابو بکری صدیق حروب الردة ی نەکردایە اسلام نەدەما و اسلام بە شەڕی ردة ماوەتەوە و بڵاو بووەتەوە بەڵام کتێبەکەی خۆشیان هەمان حرب الردة ی کردووە و ایلیا ( الیاس ) کە یەکێکە لە پێغەمبەرانی بنو اسرائیل لە زەمانی خۆیدا هاتوە پێغەمبەرانی **بعلی** کۆ کردۆتەوە کە ژمارەیان ٤٥٠ کەس بووە و هەر هەموویانی سەر بڕیوە بعلیش یەکێکە لە خودا کۆنەکان نێر و مێی هەبووە خەڵکی دوای کەوتوون و خودای جنس بووە . لە زەمانی ایلیادا زۆربەی زۆری بنو اسرائیل شوێن **بعل** کەوتون بۆیە ایلیا هاتووە پێغەمبەرەکانیی سەر بڕیووە ، بەو شێوەیە بنو اسرائیل گەڕاونەتەوە بۆ پەرستنی خودا . وە بعل لە قورئانیشدا باس کراوە لە سورەتی الصافات ١٢٣ هەتا ١٣٢

وە خۆشتان دەتوانن لەو زانیارییە دڵنیا بن کە لە تەورات دا سفر **الملوك** الاول بەشی ١٨ دا باس کراوە لە دێری ٤٠ دا دەڵێت ایلیا ٤٥٠ پێغەمبەرەکەی بعلی سەر بڕی لە دۆڵی کرملدا وە بنو اسرائیل هەر هەموو یان تۆبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ لای خودا . کاکی گاور ڕەخنە لە اسلام دەگرێت و ڕەخنە لە حروب الردة دەگرێت و کەچی کتێبەکەی خۆشی حروب الردة ی تێدایە

ئەمەش لینکی سفر **الملوك** الاول ١٨ یە بە زمانی کوردی و دەتوانن وردەکاریی ئەو حرب الردەیەی بنو اسرائیل بخوێننەوە

............................................

http://www.kitebipiroz.com/bible/1ki/18

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » پاشایان ١ » بەشی ١٨

### ئەلیاس لە کێوی کارمەل

16 ئینجا عۆبەدیا چووە لای ئەحاڤ و پێی ڕاگەیاند، ئەحاڤیش چووە لای ئەلیاس.

17 کاتێك ئەحاڤ ئەلیاسی بینی، پێی وت: (ئەوە تۆی، ئەی تێکدەری ئیسرائیل؟)

18 ئەلیاسیش وتی: (من ئیسرائیلم تێکنەداوە، بەڵکو تۆ و ماڵی باوکت ئەمەتان کردووە، بە وازهێنانتان لە فەرمانەکانی یەزدان و ملکەچبوونتان بۆ بەعلەکان.

19 ئێستاش بنێرە و لە کێوی (کارمەل) هەموو ئیسرائیلم لێ کۆبکەوە، هەروەها چوار سەد و پەنجا پێغەمبەرەکەی بەعل و چوار سەد پێغەمبەرەکەی ئەشێراش، کە لەسەر خوانەکەی ئیزابێل نان دەخۆن.)

20 جا ئەحاڤ بەدوای هەموو نەوەی ئیسرائیلیدا نارد، هەموو پێغەمبەرەکانی لە کێوی کارمەل کۆکردەوە.

21 ئەلیاسیش لە هەموو گەل چووە پێشەوە و وتی: (هەتا کەی لەنێوان ئەم دووانەدا دوو دڵ دەبن؟ ئەگەر یەزدان خودایە دوای بکەون، ئەگەر بەعلیش خودایە دوای ئەو بکەون.)
بەڵام گەل بە یەك وشەش وەڵامیان نەدایەوە.

22 پاشان ئەلیاس بە گەلی وت: (بە تەنها من بە پێغەمبەری یەزدان ماومەتەوە، پێغەمبەرەکانی بەعلیش چوار سەد و پەنجا پیاون.

23 دوو جوانەگامان[a] بدەنێ، با ئەوان گایەك بۆ خۆیان هەڵبژێرن و لەتی بکەن و لەسەر تەختەدارەکان دایبنێن، بەڵام با ئاگری تێبەر نەدەن. منیش گایەکەی دیکە بەو جۆرە لێ دەکەم و لەسەر تەختەدارەکان دایدەنێم و ئاگری تێبەر نادەم.

24 ئینجا بە ناوی خوداوەندی خۆتانەوە بپاڕێنەوە و منیش بە ناوی یەزدانەوە دەپاڕێمەوە. ئەو خودایەی کە بە ئاگر وەڵام دەداتەوە، ئەو خودایە.)
هەموو گەل وەڵامیان دایەوە و وتیان: (قسەیەکی جوانە.)

25 ئینجا ئەلیاس بە پێغەمبەرەکانی بەعلی وت: (جوانەگایەك بۆ خۆتان هەڵبژێرن و یەکەم جار ئێوە ئامادەی بکەن لەبەر ئەوەی ئێوە زۆرترن، بە ناوی خوداوەندەکەشتانەوە بپاڕێنەوە، بەڵام ئاگری تێبەر مەدەن.)

26 ئیتر ئەوان ئەو جوانەگایەیان برد کە پێیان درابوو، ئامادەیان کرد.
لە بەیانییەوە هەتا نیوەڕۆ بە ناوی بەعلەوە پاڕانەوە و وتیان: (ئەی بەعل، وەڵاممان بدەرەوە!) بەڵام کوا دەنگ و کوا وەڵام.
هەروەها بە دەوری ئەو قوربانگایەدا هەڵدەبەزینەوە کە دروستیان کردبوو.

27 لە نیوەڕۆدا ئەلیاس دەستیکرد بە گاڵتەپێکردنیان و وتی: (قاییمتر هاوار بکەن! ئەو خوداوەندە! لەوانەیە داڵغەی لێدا بێت، چوویێتە سەر ئاو، لە گەشت بێت، لەوانەیە نوستبێت و دەبێت بەئاگا بهێنرێتەوە.)

28 ئەوانیش بە دەنگی بەرز هاواریان کرد، وەك پیشەی خۆیان بە شمشێر و ڕم لە خۆیان دا، هەتا خوێنیان لێ چۆڕایەوە.

29 کاتێك عەسر داهات هەتا کاتی قوربانی ئێوارە[b] پێشبینییان کرد، بەڵام کوا دەنگ و کوا وەڵام و کوا گوێگر؟

30 ئەلیاس بە هەموو گەلی وت: (وەرنە پێشەوە بۆ لام.) ئەوانیش لێی چوونە پێشەوە. ئینجا قوربانگا وێرانکراوەکەی یەزدانی چاککردەوە.

31 پاشان ئەلیاس دوازدە بەردی برد، هێندەی ژمارەی هۆزەکانی نەوەی یاقوب کەوا فەرمایشتی یەزدانی بۆ هاتبوو، پێی فەرمووبوو: (ناوت ئیسرائیل دەبێت.)

32 لەو بەردانە قوربانگایەکی بە ناوی یەزدان بنیاد نا و لە دەوری قوربانگاکە ئاوەڕۆیەکی دروستکرد کە جێگای دوو پێوانە[c] تۆوی تێدا دەبۆوە.

33 ئینجا تەختەدارەکانی ڕێکخست و جوانەگاکەی لەتوپەت کرد و لەسەر تەختەدارەکان دایانا. ئینجا وتی: (چوار گۆزە ئاو پڕ بکەن و بەسەر قوربانییەکە و بەسەر دارەکانیدا بکەن.)

34 وتی: (دووبارەی بکەنەوە.) دووبارەیان کردەوە.
وتی: (سێ بارەی بکەنەوە.) سێ بارەیان کردەوە.

35 جا ئاو لە دەوری قوربانگاکە ڕۆیشت و ئاوەڕۆکەش پڕ بوو لە ئاو.

36 لە کاتی پێشکەشکردنی قوربانی، ئەلیاسی پێغەمبەر هاتە پێشەوە و وتی: (ئەی یەزدان، خودای ئیبراهیم و ئیسحاق و ئیسرائیل، ئەمڕۆ با بزانرێت کە تۆ لە ئیسرائیل خودایت، منیش بەندەی تۆم و بە فەرمایشتی تۆ هەموو ئەم کارانەم کردووە.

37 ئەی یەزدان، وەڵامم بدەرەوە، وەڵامم بدەرەوە، با ئەم گەلە بزانن کە تۆ یەزدانی خودایت، تۆ دڵیان بەرەو لای خۆت ڕادەکێشیت.)

38 ئینجا ئاگری یەزدان کەوتە خوارەوە، قوربانی و تەختەدار و بەرد و خۆڵەکەی خوارد، ئاوی ناو ئاوەڕۆکەشی وشك کرد.

39 کاتێك هەموو گەل ئەوەیان بینی، بە ڕوودا کەوتن و وتیان: (یەزدان خودایە، یەزدان خودایە!)

40 ئینجا ئەلیاس پێی وتن: (پێغەمبەرەکانی بەعل بگرن و مەهێڵن پیاوێکیان لێ دەرباز بێت.) ئەوانیش گرتیانن، ئەلیاس بردنییە خوارەوە بۆ دۆڵی قیشۆن و لەوێ سەری برین.

41 پاشان ئەلیاس بە ئەحاڤی وت: (بڕۆ بخۆ و بخۆوە، چونکە دەنگی بارانێکی زۆر دێت.)

42 جا ئەحاڤ چوو بخوات و بخواتەوە، بەڵام ئەلیاس سەرکەوتە سەر لووتکەی کارمەل، چەمایەوە سەر زەوی و دەموچاوی خستە نێو ئەژنۆکانییەوە.

43 بە خزمەتکارەکەی وت: (هەستە، ڕووەو دەریا بڕوانە.) ئەویش هەڵستا و ڕووەو دەریا ڕوانی و وتی: (هیچ نییە.)
ئەلیاسیش حەوت جار وتی: (دیسان تەماشا بکەوە.)

44 لە جاری حەوتەم وتی: (ئەوەتا پەڵە هەورێکی بچووک کە هێندەی لەپی دەستێك دەبێت لە دەریاوە بەرز دەبێتەوە.) ئینجا ئەلیاس وتی: (بڕۆ بە ئەحاڤ بڵێ: "گالیسکەکەت ئامادە بکە و بڕۆ خوارەوە با بارانەکە ڕێت لێ نەگرێت.)

45 ئاسمان لەم لاوە بۆ ئەو لا بە هەور و باڕەشداگیرا و بارانێکی زۆر باری، ئەحاڤ سوار بوو و چووە یەزرەعیل.

46 هێزی یەزدان بۆ ئەلیاس هات، ناوقەدی بەست و لەبەردەم ئەحاڤەوە ڕایکرد، هەتا گەیشتە یەزرەعیل.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد وچواردە

## گەرمای سەر زەوی و ئاگری جهنم

كنَّا مع النَّبيِّ ـصلى الله عليه وسلمـ فأرادَ المؤذِّنُ أنْ يؤذِّنَ الظُّهرَ فقال : " أَبْرِدْ " ثُمَّ أرادَ أنْ يؤذِّنَ فقال : "أبرد " مرتينِ أو ثلاثًا حتى رأينا فَيْءَ التلولِ ، ثمَّ قال : إنَّ شِدَّةَ الحرِّ من فيحِ جهنَّمَ ، فإذا اشتدَّ الحرُّ فأبرِدوا بالصَّلاةِ

الراوي : أبو ذر الغفاري | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح أبي داود الصفحة أو الرقم: 401 | خلاصة حكم المحدث : صحيح






ئەوەی سەرەوە خەتی قاوەیی بە ژێردا هێنراوە ئەوەیە کە بڕراوە

ببینن ئەم حەدیسە لە بەشی کاتە کانی نوێژ کردندا هاتووە

دژە ئیسلام بە تەنها بەشی کۆتای داناوە پێش ئەوەی قرتاندوە لە بەشی سەرێ قرتاوەکەمان داناوە

دژە ئیسلامەکان دەڵێن محمد (صلى الله عليه وسلم) دەڵێت هۆکاری گەرمای سەرزەوی ئاگری جهنمە . وەك لە وێنەکەدا دەیبینن .

ئێمەش هەمان وێنەمان بۆ داناونەتەوە . پێش ئەوەی وەڵامی ئەم چەواشەیە بدەینەوە دەمەوێت یە ك شت فێربن کە زۆر گرنگە ئەویش ئەوەیە هەموو دژە ئیسلامەکان سەرچاوەکان دەبڕن ئەگەر ئایەت بێت یان حەدیس بێت . ئەوان بە تەنها ئەو بەشە دا دەنێن کە خۆیان دەیانەوێت . بۆیە زۆربەی موسوڵمان دەکەوێتە داویانەوە بۆیە هەمیشە سەیری سەرچاوەکان بکەن و خۆتان بگەڕێن بۆ ئەسڵی سەرچاوەکە و بە تەواوی بیخوێننەوە بەو شێوەیە گومانەکە پوچەڵ دەبێتەوە.

سەیر بکەن لێرەشدا کاکی دژە ئیسلام بەشی کۆتایی حەدیسەکەی داناوە بەڵام من هەموو حەدیسەکەم داناوە و ئەو بەشەی چەواشەکارەکە بڕیوێتی بە ڕەنگی قاوەی خەتم بە ژێردا هێناوە . خاڵێکی تریش زۆر گرنگە : هەمیشە بزانن لە چی بەشێکدا ئەو حەدیسە یان ڕوداوە باس کراوە ؟ بۆ نموونە ئەم حەدیسە لە بەشی کاتەکانی نوێژ کردندا هاتووە ... ئەگەر ئێمەی موسوڵمان ئەم

پرسیارە لە خۆمان و لە دژە ئیسلامەکانیش بکەین : ئایا کاتەکانی نوێژ کردن چی پەیوەندی هەیە بە ئاگری جهنم و گەرمای سەر زەویەوە ؟ ٥٠% ی گومانەکە پوچەڵ دەکرێتەوە . ئەمەش دەکەین بە پرسیارێکی بێ وەلام لە کۆتایدا

ئێستا با بێینە سەر حەدیسەکە بە ئەقڵی بێدین و دژە ئیسلام ڕاڤەی دەکەین دەفەرموێت : لەگەڵ پێغەمبەردا بوین (صلی الله علیه وسلم) بانگ دەرەکە ویستی بانگی نیوەڕۆ بدات . پێغەمبەر (صلی الله علیة وسلم) گوتی ساردی بکەرەوە پاش کەمێکی تر ویستی بانگ بدات هەم دیسان فەرمووی ساردی بکەرەوە وا بزانم دوو یان **سێ** جار گوتی سارد ی بکەرەوە هەتا سێبەری تەپۆڵکەکانمان بینی پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گوتی گەرمای زۆر و گڕە لە کاتی نیوەڕۆدا لە بلاو بونەوەی گڕی جهنمە . ئەگەر گڕە و گەرمای زۆر هەبوو نوێژەکان سارد بکەنەوە ئەگەر هەر کەس عربی باش نەزانێت بەو شێوەیەی سەرەوە ڕاڤەی دەکات بۆ کوردی یان بۆ هەر زمانێکی تر بێت . وە دژە ئیسلامەکانیش ئاستی تێگەیشتن و شارەزاییان بۆ دەقە عەرەبییەکان تێگەیشتن و لێکدانەوەی ڕوکەشە وەك لە سەرەوە باسمان کرد چونکە نوێژ دۆ و ماستاو نییە سارد بکرێتەوە . بەڵکو حەدیسەکە دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوین بانگ دەرەکە ویستی بانگ بدات پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی گوت ڕاوەستە با دنیا فێنك بکات ئەو کات نوێژ دەکەین دوو جار یان سێ جار ویستی بانگ بدات . هەر پێی دەگوت ڕاوەستە با فێنك بکات ئەو کات نوێژ دەکەین هەتا سێبەری تەپۆڵکەکانمان بینی پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گوتی گەرمای زۆر و گڕە لە کاتی نیوەڕۆدا لە بلاو بونەوەی گڕی جهنمە ئەگەر گڕە و گەرمای زۆر هەبوو نوێژەکەتان دوا بخەن هەتا فێنك دەکات جاران خەڵکی حسابی سەعاتیان بە سێبەر دەکرد وە ئەگەر کابرا سێبەری خۆی یان چوار دەوری نە بینیایە دەیزانی بیوەڕۆیە . چونکە خۆر دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسمان و سێبەر نامێنێت . وردە وردە گەرما نامێنێت و دنیا بەرەو عەسر دەڕوات وە فێنك دەبێت . وە دەقی حەدیسەکەش دەڵێت نوێژمان دواخست هەتا سێبەری تەپۆڵکەکانمان بینی واتا دنیا فێنکی کردوە و سێبەریان بینیوە ئینجا نوێژیان کردووە کاکی دژە ئیسلام هاتووە ئەم پێشەکیی حەدیسەی بڕیوە و بەس بەشی کۆتاییەکەی داناوە درۆ و چەواشە کاری دەکات چونکە ئەو حدیسە وەك کابرای دژە ئیسلام خۆی ئاماژەی پێداوە لە وێنەی پۆستەکەیدا لە کتێبی کاتەکانی نوێژدا نوسراوەواتا ئەو حەدیسە پەیوەندیی بە کاتی نوێژەوە هەیە و کاکی دژە ئیسلام بە نەزانیی خۆی تێ کەوتووە چونکە حەدیسەکە باسی کاتی نوێژ دەکات و بە تایبەتی نوێژی نیوەڕۆ لە هاوین و کاتی گەرمادا نەك نوێژەکانی تر و لە وەرزکانی تری ساڵدا

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نموونەی گەرمای نیوەڕوانی بە گەرمای دۆزەخ شوبهاندووە نەك بڵێت هۆکاری گەرمای سەر زەوی دۆزەخە . وە نمونەمان زۆرە لەو بارەیەوە حەدیسێکی تر هەیە دەڵێت ئەگەر خۆر ڕێك لەسەر سەرت بوو نوێژ کورت بکەرەوە چونکە لەو کاتەدا جهنم گەرم دەکرێت. خۆ لەو کاتەدا جهنم گەرم ناکرێت و جهنم هەر گەرمە بەڵام شوبهاندنە بە کاتی گەرماکە . هەروەها حەدیسێکی تر هەیە دەڵێت : کاتێك دنیا سارد دەبێت جهنم هەناسە هەڵ دەمژێت وە کاتێك دنیا زۆر گەرم دەبێت جهنم هەناسە

دەدەتەوە . ئەم حەدیسەش تشبیهە بە گەرمی و ساردیی جهنم نەك هی سەرزەوی لەوانەیە لاتان سەیر بێت دۆزەخ سەرماشی تێدایە

دەتوانن بچن بۆ ئایەتی ( ص ٥٧ ) وە ( **النبا** ٢٤ و ٢٥ ) باسی غساق دەكات كە ساردیی جهینمە .

كۆتا بەڵگەی كەمەر شكێنیشمان هەر حەدیسێكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت ( **إن الحمى من فيح جهنم فأبردوها بالماء)** واتا كاتێك كەسێك نەخۆش دەبێت و پلەی گەرمای بەرز دەبێتەوە بە ئاو فێبكی بكەنەوە چونكە تا و بەرزبونەوەی پلەی گەرمای لەش لە گڕی دۆزەخەوەیە لە كۆن و نوێشدا هیچ كەسێك هێندە گەمژە نەبووە بە لەرز و تا بڵێت خەتای گەرمای جهنمە بەڵكو تێ دەگەین كە پلەی لەش هێندە گەرم دەبێت ئەو هەموو ئازارە دەچێژین . دەبێت گەرمیی دۆزەخ چەند زۆر بێت و چەند ناخۆش بێت ؟ بۆیە دەبێت كار بۆ ئەوە بكەین خۆمانی لێ لا بدەین ئەمەش تشبیهە تای لەش بە ئاگری دۆزەخ تشبیە دەكرێت بۆ ئەوەی خۆمانی لێ لا بدەین نەك هۆكاری تای لەش دۆزەخ بێت یان هۆكاری گەرمای نیوەڕۆ و سەرمای زستان دۆزەخ بێت

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : ئایا ناكرێت ژێر زەوی دۆزەخی تێدا بێت وە هەر زەوی خۆی دۆزەخ بێت ؟ ئایا ناكرێت ئەو ئاگر و بوركانانە هی دۆزەخ بێت ؟ ئایا هیچ لێكۆڵینەوەیەكی زابستی هەیە توانی بێتی ئەم سەر بۆ ئەو سەری زەویمان بۆ كون بكات و بزانین ناخی زەوی چیی تێدایە ؟

كۆتا پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە : ئایا دۆزەخ لە كوێیە ؟ ئەگەر دەڵێیت من بێدینم باوەڕم بە دۆزەخ نییە . كەواتە نابێت ڕەخنەشی لێ بگریت . كاتێك ڕەخنە لە شتێك دەگریت واتا سەرقاڵی كردویت و بە دوادا چونی بۆ دەكەیت

.............................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :سەد وپانزە

## ئاینی ئیسلام دەڵێت ئافرەت كەر و بزن و سەگە ؟

الحمد لله بە بەردێك 2 كێشكەمان پێكا ویستم وەڵامی گومانی ئافرەت سەگی ڕەش و كەرە بدەمەوە بەڵام گومانی ئافرەت بزنە بو بە بەڵگە بۆ هەردوكیان

إذا قامَ أحدُكُمْ يصلِّي فإنَّهُ يَستُرُهُ إذا كان بين يديْهِ مثلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ ، فإذا لمْ يكنْ بين يديْهِ مثلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فإنَّهُ يَقْطَعُ صَلاتَهُ الحِمارُ و المرأةُ و الكَلْبُ الأَسْوَدُ قيل ما بالُ الكَلْبِ الأَسْوَدِ مِنَ الكَلْبِ الأَحْمَرِ ؟ قال : الكَلْبُ الأَسْوَدُ شَيْطَانٌ

الراوي : أبو ذر الغفاري | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الجامع

الصفحة أو الرقم: 719 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

ئەو حەدیسە كە بە حسابی معتزلة و دژەدین دەڵێن ئافرەت سەگی ڕەش و كەرە

العنزة واتا ڕمی بچوك یان كورت

ئەو حەدیسەی بە حسابی معتزلە و دژە ئیسلامەكان دەڵێن ئافرەت بزنە

شَهِدْتُ النَّبيَّ بالبطحاء ، وأخرجَ بلالٌ فضلَ وضوئِهِ فابتدرَهُ النَّاسُ فَنِلْتُ منهُ شيئًا وركَزتُ العنزة فصلى بالناسِ والحمر والكلاب والمراة يمرّونَ بينَ يَديهِ

الراوي : وهب بن عبدالله السوائي أبو جحيفة | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح النسائي

الصفحة أو الرقم: 137 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

زۆرمان بیستووە لە معتزلة و دژە ئیسلامەکانەوە دەڵێن ئافرەت لە ئیسلامدا وەك سەگی ڕەش و کەر و بزن سەیر دەکرێت وە بەڵگەشیان ئەو دوو حەدیسەیە کە لە وێنەکەدا دەی بینن و هەردوکیشیان صحیحن ، بەلام ئەوەی صحیح نییە تێگەیشتنی دژە ئیسلامە بۆ دەقەکان . چونکە حەدیسی **یەکەمیان** دەڵێت :

ئەگەر ویستتان نوێژ بکەن شتێك دا بنێن لە بە ر دەمتاندا با باڵێك دور بێت لێتانەوە . چونکە ئەگەر شت دا نەنێن لەپێش خۆتان ئەو کات ئەگەر گوێدرێژ یان ئافرەت یان سەگی ڕەش لەبەر نوێژەکەتان تێپەڕی نوێژە کەتان دەبڕرێت هەر کەس نوێژ بکات دەزانێت دەبێت ئەو کەسەی نوێژ دەکات سەیری جێگای سوجدەکەی بکات نەك سەیری دور بکات و کاتێکیش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەڵێت شتێك لەبەر دەم خۆتان دا بنێن وە مەسافەکەی دیاری کردووە بە باڵێك واتا تقريبا مەترێك دوور بێت لە شوێنی سوجدەکەت ئەم حساب و کیتابەش بۆ ناو ماڵ و مزگەوت نییە . بەڵکو بۆ دەرەوەیە یان لە دەشتدا یان لە سەفەردا **رمێك** لە پێش خۆت دا دەنێیت چونکە حەدیسەکە باسی کەر و سەگی ڕەش و ئافرەت دەکات وە ئەوانە یان هەر شتێکی تر لە دەرەوەی ماڵ و مزگەوتەکانن وای دا بنێن بە زەمانی ئێستا لێکی بدەینەوە کابرایەکی دوکاندار لە یەکێك لە مۆڵەکانی کوردوستاندا نوێژ دەکات و هەتا نوێژەکەی تەواو دەکات چەند کچێکی جوان بە بەردەمیدا تێ دەپەڕێت ئایا ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی ئەو کەسە داڵغەی لای ئافرەتەکان بێت کە بە بەردەمیدا تێ دەپەڕن ؟

پاشان ئەو حەدیسە باسی نوێژ بڕین دەکات نەك باسی ئەوەی ئافرەت وەك سەگی ڕەش و گوێ درێژ وایە بەڵکو کابرای نوێژ دەکات کاتێك دەبینێت خانمێك بە لەنجەو لار بە بەردەمیدا تێ دەپەڕێت داڵغەی لای نوێژەکە نا مێنێت بەڵکو سەیری ئافرەتەکە دەکات ئەگەر کابرا زۆر جنسی بێت لەوانەیە خۆشی پیس بکات لە بینینی ئەو ئافرەتە . بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت شتێك دانێن لەبەر دەمتاندا . وە ئەو شتەی کە دا دەنرێت شتی بەرز دابنرێت باشترە هەر لە تیرێکەوە بۆ ڕمێکی ٤ مەتری دەکرێت دابنرێت

وە زۆر حەدیس هەیە باس لەوە دەکات کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژی کردووە ڕمێکی بچکۆلەیان لە بەردەمیدا چەقاندوە و ئیتر نوێژی جەماعەتی پێ کردوون . وە هەر شتێك لە پشتی ڕمەکە بچوکەکەوە ڕۆشت بێت ئاسای بووە و نوێژەکەی پێ نەبڕیون

ئەوەی مایەی پێکەنینە بە ئە قلی معتزلة و دژە ئیسلامەکان ئەوەیە ئەو حەدیسە بە نەزانی ڕاڤە دەکەن وە ووشەی ( العنزة ) ی تێدا باس کراوە . یەکێك لە ناوەکانی ڕمی بچکۆلە العنزەیە بەلام ئەم شارەزایانەی بواری زمانی عەرەبی هەر بە بزن ڕاڤەیان کردووە وە ترجمەیان کردووە دەڵێن ژن و کەر و سەگ لە پشتی بزنەوە دەڕۆن یان دەڕۆشتن. وە خۆشتان بگەڕێن حەدیسی زۆر هەیە لەسەر نوێژ و ( عنزة ) وە دانەیەکمان لە وێنەکەدا بۆ داناوون.

وە هەموو حەدیسەکان دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نوێژی جەماعەتی پێ کردوین و ( عنزة ) واتا ڕمێکی بچوکمان چەقاندووە . پاشان ئافرەت و سەگ و گوێ درێژ و هەر شتێك بە پێشماندا ڕۆشتوو و نوێژە کەمان نەبڕیووە .

ئێستا ئاستی نەزانی و نە شارەزایی بەرامبەرمان دەزانن تا چی ئاستێکە ؟ عنزة ئەگەر بزن بێت چۆن دەچەقێندرێت ؟ پاشان ئەگەر بە تێگەیشتنی ئەوان بێت حەدیسەکە دەڵێت نوێژمان کرد و بزن و سەگ و ئافرەت و کەر بە دوای یەکدا ڕۆشتن . ئەمە هیچ مانایەك نا بەخشێت وە هیچ لۆژیکێکی تێدا نییە کەواتە ئەم حەدیسەی دووەم گومانی هەردووك حەدیسەکە تر پوچەڵ دەکاتەوە . . .

کە دەڵێن لە ئیسلامدا ئافرەت وەك سەگی ڕەش و کەر وایە . چونکە حەدیسی **یەکەمیان** باسی نوێژ دەکات

حەدیسی **دووەمیش** باسی نوێژ دەکات وە لە هیچ کام لە حەدیسەکاندا ئافرەتی نە چواندوە بە سەگی ڕەش یان بە کەر وە حەدیسی دووەم بە جوانی ڕونی کردوەتەوە ئەگەر شتێکی بەرز دا بنێیت لە بەردەمتدا ئەوە نوێژەکەشت نا بڕرێت ئەگەر ١٠٠٠ ئافرەتیش بە بەر دەمتدا ڕێ بکات . بەلام کاکی دژە ئیسلام وا دەزانێت عنزة بەس بە مانای بزن دێت کاتی خۆی عەرەب کە سەفەری دەکرد ( عنزة ) واتا ڕمێکی بچوکی کورتی لەگەڵ خۆی دەبرد کەشکۆ ڵەکەی پێدا دەکرد و ڕێی دەکرد . بەو شێوەیە کەشکۆڵەکەی پێدا هەڵ دەواسی کە نان و خواردن و پێدا ویستیەکانی تێدا بوو . ئەگەر توشی دڕندەیەك یان شەڕ ببوایە لەگەڵ خەڵکی تردا دەی توانی بەو ڕمە بچوکە شەڕ بکات و خۆی بپارێزێت

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئایا هیچ کام لەو حەدیسانە تشبیهی ئافرەت دەکات بە سەگی ڕەش و کەر و بزن ؟ ئەگەر دەڵێیت بەڵێ : فەرموو یە ك حەدیسمان بۆ بهێنە با لاوازیش بێت یان درۆش بێت ئێمە قبوڵمانە ئایا هیچ حەدیسێك دەڵێت ئافرەت بزنە ؟ یان جەنابت هیچ نازانیت و جیاوازیی نێوان خطاب و حطاب ناکەیت ؟ ئادەی بەهەمان شێوە یە ك حەدیسمان بۆ بهێنە با هەڵ بەستراویش بێت بڵێت ئافرەت بزنە ؟

**پرسیاری کۆتایشمان ئەمەیە:** وە حوکمی نوێژ دەزانیت چییە ؟ وە هەردووك حەدیسەکەش باسی حوکمی نوێژ دەکات کە کەس بە بەر دەمتدا تێ نەپەڕێت و بۆشی دیاری کردویت شتێك لەبەر دەمتدا دابنێ یان بچەقێنە کاکی معتزلة تۆ بۆچی دژایەتیی خودا و منهجی خودا دەکەیت لە کاتێکدا لە ئێمە باشتر دەزانیت بزن نا چەقێنرێت وە هیچ کام لەو حەدیسانە ناڵێت ئافرەت وەك سەگی ڕەش و کەر و بزنە .... بەڵکو دەڵێت نوێژ دەبڕێ .

پاشان بۆچی کاتێك شتێك دا بنرێت لە بەردەمی ئیمام یان نوێژکەرەکەدا ئیتر نوێژەکە نا بڕرێت ؟ وە حەدیس دووەم گومان و چەواشەکاریی ئێوەی بەناو دیندار و موسوڵمانی معتزلة و دژە ئیسلامەکانیش پوچەڵ دەکاتەوە چونکە کاتێك شتێکت دانا لە بەردەم تدا دەبێت بە سنورێك بۆ کەسەکە و لە دورەوە دەی بینێت و دور دەکەوێتەوە لە تۆ . بەو شێوەیە ئەگەر سەگی ڕەش و کەر و ئافرەتیش بە بەردەمتدا تێ بپەڕن نوێژەکەت لێی کەم نا بێتەوە .

# پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد وشانزە

## فریشتە ئافرەت بە لەعنەت دەکات

إذا دعا الرجلُ امرأتَه إلى فراشِه فأبَتْ ، فبات غضبانَ عليها ، لعنتها الملائكةُ حتى تُصبحَ .

الراوي : أبو هريرة | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري

الصفحة أو الرقم: 3237 | خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

دژە ئیسلامەکان دەڵێن پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) ئافرەتی بە لعنت کردوە و سوکایەتی پێکردووە چونکە دەڵێت ئەگەر پیاوێك داوای سەر جێی لە هاوسەرەکەی بکات و هاوسەرەکەی بە قسەی بەکات فریشتەکان ئەو ئافرەتە بە لەعنەت دەکەن هەتا بەیانی رۆژ دەبێتەوە حەدیسەکەش صحیحە و ئێمەش لە وێنەکەدا دەقی حەدیسەکەمان بۆ داناوون . بۆ وەلامی ئەم چەواشەکاریەش دەڵێین

ئەم حەدیسە پێش هەموو شتێك لە پێگەی ئافرەت بەرز دەکاتەوە نەك کەمی بکاتەوە !؟ چونکە هەموو باش دەزانین هەمیشە پیاو پێویستی بە ئافرەتە وە لە هەموو ئاژەڵ و باڵندەکانیشدا هەمیشە نێر شوێن مێ دەکەوێت و پێویستی پێیەتی وە هەمیشە نێر تنازل بۆ مێ دەکات . ئایا نێر داماو گهوناه نیە داوای حەقێکی ڕەوای خۆیی لێ بکات ؟ئەویش سەرجێیە لە خێزانی خۆی و دایکی منداڵانی . بە شەرتێك دایکی منداڵان نەخۆش نەبێت و نا ساغ نەبێت و هیچ کێشەیەکی نەبێت

ئەم حەدیسە جارێکی تر مایەی ڕێز و تقدیرە بۆ ئافرەت و زیاتر پێگەی بەرز دەکاتەوە . چونکە ئاستی نزمیی پیاو نیشان دەدات بەرامبەر ئافرەت و هەمیشە نێر پێویستی بە مێیە و داوای سەر جێی لێ دەکات و ئافرەت هێندە نفسی بەرزە ئەگەر ١٠٠ ساڵ ژنی پیاوێك بێت بۆ جارێکیش داوای سەر جێی لە پیاوەکە ناکات بۆیە دەبینین هەتا مردن پیاوەکە ماستاو دەکات و داوای سەرجێی دەکات نەك ئافرەتەکە . ئەمەش خاڵێکی لاوازی پیاوە و خاڵێکی بەهێزی ئافرەتە و قورس ترین چەکی دەستی ئافرەتە بەکاری دەهێنێت بەرامبەر بە پیاو ئەگەر چەند رۆژێك ئەو کردارە بەردەوام بێت و ئافرەتەکە سەرجێی نەکات . ئەو کات کابرای داماو لەوانەیە توشی زینا و جۆرەها تاوان ببێت . ئایا کێ بەر پرسیارە لە سەرپێچیی ئەو پیاوە ؟ ئایا ئەو چەکە ی ئافرەتەکە بەکاری هێناوە نەبووەتە هۆی ئەوەی کابرا بگەرێ بە دوای بەدیلێکدا ؟ دژە ئیسلامەکان خاڵێکی تریش دەوروژێنن دەڵێن ئەی باشە ئەگەر ئافرەتێك داوای سەرجێی لەگەڵ پیاوە کەی کرد و پیاوەکە ڕازی نەبوو ئایا فریشتەکان پیاوەکە بە لعنت دەکەن ؟

بەڵێ فریشتە پیاوەکە بە لعنت دەکەن چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت (النساء شقائق الرجال )واتا ئافرەتان هاوشێوەی پیاوانن . چۆن میوەیەك لە ناوەڕاستدا دەکرێت بە دوو کەرتەوە هیچ لایەکیان جیاواز نییە و هەردووك لایان لە هەموو

سیفاتێکدا وەك یەکن . ژن و پیاویش هەمان شێوەیە ئایەتی ٢٢٨ ی سورەتی **البقرة** دەفەرموێت : (**لهن مثل الذي عليهن بالمعروف**) . واتا هەر حەقێکی پیاو لە سەر ژن هەیە بە هەمان شێوە هەمان حەقی ژن لەسەر پیاو هەیە . بە گوێرەی ئەو حەدیسە و ئەو ئایەتە تێ دەگەین ئەگەر ژن بە لەعنەت بکرێت لەسەر سەر جێی ئەوا پیاویش بە هەمان شێوەیە بە لەعنەت دەکرێت . بەلام وەك باسمان کرد هەمیشە نێر شوێن مێ دەکەوێت و کاری پێیەتی نەك مێ شوێن نێر بکەوێت و سیلاحی مەزنیش لای ئافرەتە وەك حەیا و حورمەت و دان بە خۆدا گرتن بۆ سەر جێی بەڵام پیاو هیچ سیلاحێکی نییە و هەمیشە تەسلیم دەبێت بەرامبەر ئافرەت بەڵام کاتێك ئافرەتەکە بەهۆی نەخۆشییەك یان هەر کێشەیەکی ترەوە نەی توانی سەرجێی بکات ئەو کات ئاساییە چونکە هۆکاری هەیە

---

## پرسیارە بێ وەلاّمەکان ژمارە :سەد وحەڤدە

## ئافرەت بۆی نییە سەر بەرزکاتەوە لە ئاستی پیاودا




دژە ئیسلامەکان دەڵێن محمدی ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) دەڵێت ئافرەت نابێت سەری بەرز بکاتەوە هەتا پیاوان دا دەنیشین دەبێت سەری شۆڕ بکات و مل کەچی پیاوان بێت . وە بەڵگەشیان حەدیسێکی صحیحە دەفەرموێت : (**و يقال للنساء لا ترفعن رؤوسكن حتى يستوي الرجال جلوسا**) . هەمیشە دژە ئیسلام بۆ ئەو شتانە دەڵێن فەرموو ئەوە لە صحیحی بوخاریدایە و سەرچاوەی خۆتانە و قسەی ئێمە نییە پێغەمبەرەکەی خۆتان (صلى الله عليه وسلم) وا دەڵێت بەڵام ئەوەی مایەی گاڵتە جارییە ئەم

دژە ئیسلامانە هەموو جارێك دەقەکان دەبڕن و ئەو بەشە دەڵێن کە خزمەتی درۆ و چەواشەکارییە کانیان دەکات . وە حەدیسەکە بە تەواوەتی دا نانێن .

وە ئەسڵی حەدیسە .... کە لە وێنەکەدا داناوە و ڕاڤەی دەکەین بۆتان بە کوردی

حەدیسەکە دەڵێت : پیاوەکان نوێژیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك منداڵ گرێیان دەدا لە پشتە ماڵەکانیان .

وە کاکی دژە ئیسلام ئەمە دا نانێت لەگەڵ ڕەخنەکەیدا بەڵکو کۆتایی حەدیسەکە دا دەنێت

جاران خەڵکی هەژار بوون جلیان نەبووە یان کەسەکە یە ك دەست جلی هەبووە . جلی عەرەبیش کاتی خۆی یان یە ك پارچە بووە یان دوو پارچە بووە و لە شێوەی لاکێشەدا بووە . ئەگەر کابرا یە ك پارچە جلی هەبووبێت لە خۆیەوە پێچاوە لە ناوکیەوە بۆ سەر قاچەکانی وە ئەگەر دوو پارچە جلی هەبوبێت پارچەی دووەمیشی لە سەر رانی پێچاوە حەدیسەکەش دەڵێت هەرکەسێك یە ك پارچە جلی هەیە با کاتی نوێژ کردن گرێیەکی لێ بدات و لە ملی ببەستێت ، چونکە نابێت نوێژ بکرێت و سەر شان ڕوت بێت . بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وای گوتووە حسابی ئەوەی کردووە نەوەك کاتێك ئەوانە دەچونە سوجدە هەندێکیان لە پشتەوە ناو گەڵیان دەر بکەوێت

ئەو کات ژن و پیاو پێکەوە نوێژیان دەکرد و ژنان لە پشتەوە نوێژیان دەکرد و هیچ بەربەست و دیوار نەبوو لە نێوانیاندا بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت لە کاتی سەر بەرزکردنەوە لە سوجدەدا با ژنەکان دوای پیاوەکان سەریان بەرز بکەنەوە ئەمەیە مەبەست و ناوەڕۆکی حەدیسەکە . نەك بڵێت ئافرەت نابێت سەر بەرز بکاتەوە لە ئاستی پیاودا وەك دژە ئیسلامەکان دەهۆڵێ بۆ دەکوتن.

کاتی خۆی خەڵکی داماو بێ پارە بوون و دەستێك جلیان هەبووە و تەنانەت لە کوردوستانی لای خۆشمان کاتێك ئافرەت شووی دەکرد یەکەم قسەیان ئەوە بووە دوو دەست جل بۆ ئافرەتەکە بکرێت بۆ ئەوەی ئەگەر دانەیەکیان پیس بوو شوشتی ئەوی تریان لەبەر بکات وە زۆر ئافرەت هەبووە هەتا مردووە هەر ئەو دوو دەستە جلەی هەبووە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد وهەژدە

## ئافرەت شەیتانە ؟

إنَّ المرأةَ تُقبِلُ في صورةِ شيطانٍ ، وتُدبِرُ في صورةِ شيطانٍ ، فإذا رأى أحدُكُم امرأةً أعجبَتْهُ فليأتِ أهلَهُ ، فإنَّ ذلكَ يرُدُّ ما في نفسِه

الراوي : جابر بن عبدالله | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الجامع ـ الصفحة أو الرقم: 1940 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

دژە ئیسلامەکان دەڵێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئافرەتی بە شەیتان وەسف کردوە و دەڵێت ئافرەت دێت و دەڕوات و ڕێ دەکات وەك شەیتان . وە ئەوان حەدیسەکە تا ئێرە دا دەنێن و تەواوی ناکەن ، بۆیە ئێمە تەواوی دەکەین و دوای ئەوەی دەڵێت وەك شەیتان دێن و دەچن دەفەرموێت : ئەگەر هەر کەسێکتان ئافرەتێکی بینی و دڵی بۆی لێیدا یان معجب بوو بە ئافرەتەکە با بچێت لەگەڵ خێزانەکەی جووت ببێت بەو شێوەیە ئارەزووەکەی نامێنێت و حەزەکەی تێر دەکات وا بزانم گەمژەییە ئەگەر زیاتر لەسەر ئەم حەدیسە بڕۆین چونکە ئەگەر حەدیسەکە هەر هەمووی پێکەوە بخوێنرێتەوە ئەو گومانە لا دەچێت کە دەڵێت ئافرەت دێت و دەڕوات بە بەردەمتاندا وەك شەیتان ،،، وە ئەگەر حەدیسەکە تەواو بکرێت دەڵێت ئەگەر ئافرەت بە بەردەمتاندا تێ پەڕی و زە وقتان هەستا بچن بۆ ماڵەوە بۆ لای خێزانەکانتان و ئەو زەوقەکە لەگەڵ خێزانەکانتاندا بکوژن نەك شوێن زینا و شەرەفی خەڵکی تر بکەون

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەوەیە** : تاکەی دژە ئیسلام بە نا داد پروەری و فێڵ و ساختەچێتی بانگەشە بۆ ئیسلام دەکات ؟ وە بۆچی هەموو جارێك دەقەکان دەبڕن و ناتوانن بە تەواوی دەقەکان دا بنێن و دەبن بە مایەی چەواشەکاری بۆ هاوبیرانیان پرسیاری بێ وەلامیشمان بۆ کڵێسایە کە سەرچاوەی هەموو گومانەکانە لە ئاینی ئیسلامی مەزن و ئەوانن کە ئەم گومانانە بڵاو دەکەنەوە و دەی بڕن و کاکی بێدینیش کۆپی و پەیستی دەکات . بە کڵێسا دەڵێین ئەوە پێغەمبەری ئیسلام نییە(صلى الله عليه وسلم) بڵێت ئافرەت شەیتانە ؟ وەك لە سەرەوە ڕونمان کردەوە و پاش بڕینەکە شمان بۆ دانان ئەوە کتێبە بە ناو پیرۆزەکەی ئێوەیە ئافرەت بە سەرچاوەی شەڕ و خراپەکاری ناو دەبات کاتێك زەکەریا ی پێغەمبەر فریشتەیەك ئافرەتێکی نیشان دەدات لە سەبەتەیەکدایە و پێی دەڵێت ئەمە تاوانی هەموو زەویە و ئافرەتە و سەرچاوەی خراپەکارییە پاشان بە قوڕقوشم سەری سەبەتەکە دا دەخرێت و پاشان دوو ژنی تر باڵیان هەیە وەك باڵی حاجی لەق لەق سەبەتەکە دەبەن و دەڕۆن . وە ئێمەی موسوڵمان وەك ئێوە چەواشە کاری ناکەین دەقەکانتان ببڕین بەڵکو دەقەکان وەك خۆی بۆ خوێنەر دا دەبەزێنین

فەرموون ئەمە سفری **زەکەریا** بەش٥ دەق ٥ بۆ ١١ بخوێننەوە کە ئافرەت بە خراپەکار ناو دەبرێت لە تەوراتدا

http://www.kitebipiroz.com/bible/zec/5

**بابەتی ناو لینك**

**ژنێك لەنێو سەبەتێك**

5 پاشان ئەو فریشتەیەی قسەی لەگەڵ دەکردم، هاتە پێشەوە و پێی وتم: (چاوت هەڵبڕە و ببینە ئەوە چییە دەردەکەوێت.)

6 لێم پرسی: (ئەوە چییە؟)
وەڵامی دامەوە: (ئەوە ئەو سەبەتەیەیە کە دەردەکەوێت.) هەروەها وتی: (ئەمەش تاوانەکەیانە کە لە هەموو زەوییە.)

7 ئیتر قەپاغە قوڕقوشمەکە هەڵگیرا، ژنێکم بینی لەناو سەبەتەکە دانیشتبوو.

8 وتی: (ئەمە خراپەکارییە.) ئینجا بۆ ناوەڕاستی سەبەتەکە پاڵی پێوەنا و قەپاغە قوڕقوشمەکەی خستە سەر دەمی.

9 ئینجا چاوم هەڵبڕی و بینیم لەبەردەمم دوو ژن هاتنە دەرەوە و با لە باڵەکانیان دەدات. باڵەکانیان وەك باڵی حاجیلەقلەق بوو، ئینجا سەبەتەکەیان بۆ نێوان زەوی و ئاسمان بەرزکردەوە.

10 لەو فریشتەیەم پرسی کە قسەی لەگەڵ دەکردم: (سەبەتەکە بۆ کوێ دەبەن؟)

11 ئەویش وتی: (بۆ ئەوەی لە خاکی بابل ماڵێکی بۆ بنیاد بنێن و کە ئامادە بوو لەوێ لە شوێنی خۆی دادەنرێت.)

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :سەد ونۆزده

## ئایا ئافرەت سەرچاوەی فیتنه و ئاژاوه و ئاشوبن ؟

وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّـهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿الأنفال: ٢٨﴾

كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿الأنبياء: ٣٥﴾

ما تَرَكتُ بَعدي فِتنَةً أضرَّ على الرجالِ منَ النساءِ

الراوي : أسامة بن زيد | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم: 5096 | خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

فتن (لسان العرب)

الأَزهري وغيره: جِماعُ معنى الفِتْنة الابتلاء والامْتِحانُ والاختبار، وأَصلها مأْخوذ من قولك فَتَنْتُ الفضة والذهب إِذا أَذبتهما بالنار لتميز الرديء من الجيِّدِ، وفي الصحاح: إِذا أَدخلته النار لتنظر ما جَوْدَتُه، ودينار مَفْتُون.

والفَتْنُ الإِحْراقُ، ومن هذا قوله عز وجل: يومَ هم على النارِ يُفْتَنُونَ؛ أَي يُحْرَقون بالنار. ويسمى الصائغ الفَتَّان، وكذلك الشيطان، ومن هذا قيل للحجارة السُّود التي كأَنها أُحْرِقَتْ بالنار: الفَتِينُ، وقيل في قوله: يومَ هُمْ على النار يُفْتَنُونَ، قال: يُقَرَّرُونَ والله بذنوبهم. ووَرِقٌ فَتِينٌ أَي فضَّة مُحْرَقَة. ابن الأَعرابي: الفِتْنة الاختبار، والفِتْنة المِحْنة، والفِتْنة المال، والفِتْنة الأَوْلادُ، والفِتْنة الكُفْرٌ، والفِتْنةُ اختلافُ الناس بالآراء، والفِتْنةُ الإحراق بالنار؛ وقيل: الفِتْنة في التأْويل الظُّلْم. يقال: فلان مَفْتُونٌ بطلب الدنيا قد غَلا في طلبها. ابن سيده: الفِتْنة الخِبْرَةُ.

پرسیارە بێ وەڵامەکان



دژه ئیسلامه‌كان ده‌ڵێن پێغه‌مبه‌ری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) ده‌ڵێت ئافره‌ت مایه‌ی ئاژاوه و ئاشوبه و به‌ڵگه‌شیان بۆ قسه‌كه‌یان حه‌دیسێكی صحیحه ده‌فه‌رموێت : هیچ شتێكم جێ نه‌هێشتوه له دوای خۆم زیانی زیاتری هه‌بێت بۆ پیاوان فیتنه‌ی ئافره‌ته ده‌قی حه‌دیسه‌كه‌شمان له وێنه‌كه‌دا داناوه . با له پێشدا بزانین مانای ( فتنة ) چییه ؟ وه بۆ زانینی مانای هه‌ر ووشه‌ك له هه‌ر زمانێكدا پێویستیمان به قاموسی ئه‌و زمانه هه‌یه . وه باشترین قاموسیش **الباحث العربيه** كه ٥ معجمى گه‌وره‌ی پێكه‌وه تێدایه و له گه‌رانه‌كه‌دا بنوسن ( فتن )

http://www.baheth.info/index.jsp

فتنة به‌م مانایانه دێت : تاقی كردنه‌وه - سوتاندن به ئاگر – ناخۆشی – ماڵی دنیا – پاره - منداڵ – كفر كردن – جیاوازیی بیر و را - زوڵم – خیبره و ئه‌زموون – موعجیب بوونی كافر به كفر كردن – موعجیب بوون به شتێك – ئه‌گه‌ر كه‌سێك به‌هۆی شتێكی خراپه‌وه خۆی و سه‌ر و ماڵی له ده‌ست بدات – ئه‌گه‌ر زۆر معجب بیت به شتێك و شێت بیت بۆی – ئه‌گه‌ر بته‌وێت زینا له‌گه‌ڵ ئافره‌تێك بكه‌یت – گومڕای و تاوان – ڕزگاربوون له شتێك – تاوان باركردن - لادان له‌سه‌ر شتێك – ئابڕو چوون – سزا دان به ئازار

پاش ئەوەی ماناکانیمان زانی دەبێت ئەوەش بزانین کە لە هەر جێگایەك مانای تایبەتیی خۆیی هەیە و لە قورئاندا ٣٦ جار باوی فتنة هاتووە لە ٣٦ ئایەتدا . وە لە هەر جێگایەکدا بە گوێرەی ڕستەکە ماناکەی دەگۆڕێت وە بە گشتی ( فتنة ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای تاقی کردنەوە دێت .

وە هەموو تاقی کردنەوە یەکیش لە هەر بوارێکدا بێت یان باشە یان خراپە یان سەر کەوتوە یان سەر ناکەوێت . یان دەر دەچێت یان دەر ناچێت یان ... هتد . واتا تاقی کردنەوە دوو لایەنە باش و خراپە . بۆیە کاتێك دەبینین لە کوردەواریدا دەڵێن فلان فیتنەیە چونکە قسە دێنێت و دەبات وە ئەگەر ئەو کەسەی گوێ لە فیتنەکە دەگرێت ئاقڵ بێت و قسەکە و بابەتەکەی بۆی دەگێڕنەوە بە ئاقلانە وەری بگرێت تووشی هیچ نابێت . ئەگەر ئاقڵیش نەبێت خێرا تورە دەبێت و کێشەی گەورە دروست دەکات . کەواتە دەوری کابرای فیتنە لای بەرامبەرە و دەتوانێت بە ئاقڵی خۆی نەهێڵێت ئەو قسەیەی بۆی هاتووە گەورەی بکات وە دەشتوانێت پیاوی تێدا بکوژرێت واتا هەموو فیتنەیەك بە باش و بە خراپ دەشکێتەوە دەق حەدیسەکەش ڕوون و ڕاشکاوە دەفەرموێت ئافرەت فیتنەیە بەسەر پیاوانەوە . واتا ئافرەت فیتنە نییە بۆ هەموو شتێك وەك دژە ئیسلامەکان دەهۆڵێ بۆ دەکوتن . چونکە ئەگەر ئافرەت مایەی ئاشوب و شەڕ بێت دەبێت لە هەموو بوارێکدا کێشە دروست بکات

بـەلام دەقەکـە دەڵێـت فیتنــەی پیــاوانن . خۆشــتان دەزانــن هــەموو پیاوێـك چەنـد ئاقـڵ و چەنـد زانـا بێـت ئـافرەت زۆر بـە ئاسـانی دەتوانێـت یـاریی پـێ بکـات . وە ئـافرەت باشـتر لـەم قسـەیە تـێ دەگـات و دەزانێـت چـۆن یـاری بـە پیـاوان بکـات وە چـۆنی بوێـت بـەو شـێوەیە هـەڵی بسـوڕێنێت و چـی بوێـت پێـی بکـات و لـە خشـتەی بـەرێت وە مەبەسـتی فیتنەکـە ئەمەیـە نـەك شـەڕ و ئـاژاوە و ئاشـوب بێـت . وە دەتوانرێـت لـە ڕێگـای ئافرەتـەوە هـەموو کارێـك بکرێـت و پیـاوی خـاوەن دەسـەلاتیش لـە خشـتە ببـرێن بـە سـازدانی شـەوانی سـور و گـۆرانی و سـەما . پیـاوی ئـاقڵیش ئـەو پیـاوە یـە نەکەوێتـە ئـەو فیتنەیـەوە و خـۆی ڕزگـار بکات لەو تاقی کردنەوەیە

پێویسـت ناکـات زۆر لەسـەر چـۆنێتی لـە خشـتە بردنـی پیـاوان بـڕۆین لـە لایـەن ئافرەتـەوە ! چونکـە خـەڵکی ئاقـل و سـارەزا ئـەو شـتانە بـاش دەزانـن و ئـافرەتیش خـۆی شـارەزاترە لـە سروشـتی خـۆی کـە چەنـد بـە توانایـە بـۆ لـە خشـتە بردنـی پیـاوان وە دەزگـا سـیخوڕییەکان و دەوڵەتییـەکان زۆر ئـافرەت بـەکار دەهێـنن بـۆ مـەرامی خۆیـان وە ئـەوەی سـەر لـەم کارانـە دەر ناکـات کـابرای مێـرد منداڵـە ئـایفۆنێکی پێیـە و قسـەی زل دەکـات بۆیـە وەلامـی قسـەی زل و بـێ بەڵگـە نادەینـەوە . چونکـە دەبێـت بەرامبەر بزانێت فتنة مانای چییە و بۆچی ئەو شتە یان ئەو کەسە بە فتنة ناو دەبرێت ؟

بۆ نموونە لە سورەتی انفال ٢٨ دا پارە و منداڵ بە ( فتنة ) ناو براوە . ئایا پارەی کەسێك لەگەڵ جەرگیدا ئاشوب و ئاژاوەیە یان کابرا بەهۆی ئەو پارە و منداڵەیەوە توشی جۆرەها تاقی کردنەوە دەبێت لە ژیاندا ؟ یان لە سورەتی **الانبیاء** ٣٥ دا دەفەرموێت هەموو کەسێك دەبێت بمرێت توشی خێر و شەڕ دەبن بۆ ئەوەی تاقی بکرێنەوە . ئایا فتنة لێەدا مانای ئاژاوەیە ؟

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : کێ زۆر خۆی بە شارەزا دا دەنێت با مانای ( فتنة ) مان بۆ بهێنێت لەو قاموسانەی سەرەوە کە دامان ناوە یان هەر قاموسێکی تر بێت ( بڵێت فتنة واتا ئاشوب و شەڕ ) !؟

**کۆتا پرسیاریشمان ئەمەیە** : فەرموو بەڕێز ( النساء لەگەڵ الفتنة ) مان بۆ بخەرە جملەوە و ڕستەیەکی لێ دروست بکە بە زمانی عەرەبی بڵێت ئافرەت مایەی ئاشوب و ئاژاوە و شەڕە ... ئەگەر نەشت توانی یە ك جملەمان بۆ دا بنێیت ئەوە باك ئەپێکی خۆت و زانیاریەکانت بکە و تێ بگە کە هیچت نەزانیوە و زانیارییەکانت کۆپی و پەیستە

.........................................................................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد وبیست

## ئافرەت عەورەتە مانای چییە ؟

یا أیها الذین آمنوا لیستأذنکم الذین ملکت أیمانکم والذین لم یبلغوا الحلم منکم ثلاث مرات من قبل صلاة الفجر وحین تضعون ثیابکم من الظهیرة ومن بعد صلاة العشاء ثلاث عورات لکم لیس علیکم ولا علیهم جناح بعدهن طوافون علیکم بعضکم علی بعض کذلك یبین اللـه لکم الآیات واللـه علیم حکیم ﴿النور: ٥٨﴾

وإذ قالت طائفة منهم یا أهل یثرب لا مقام لکم فارجعوا ویستأذن فریق منهم النبي یقولون إن بیوتنا عورة وما هي بعورة إن یریدون إلا فرارا ﴿الأحزاب: ١٣﴾

وقل للمؤمنات یغضضن من أبصارهن ویحفظن فروجهن ولا یبدین زینتهن إلا ما ظهر منها ولیضربن بخمرهن علی جیوبهن ولا یبدین زینتهن إلا لبعولتهن أو آبائهن أو آباء بعولتهن أو أبنائهن أو أبناء بعولتهن أو إخوانهن أو بني إخوانهن أو بني أخواتهن أو نسائهن أو ما ملکت أیمانهن أو التابعین غیر أولي الإربة من الرجال أو الطفل الذین لم یظهروا علی عورات النساء ولا یضربن بأرجلهن لیعلم ما یخفین من زینتهن وتوبوا إلی اللـه جمیعا أیه المؤمنون لعلکم تفلحون ﴿النور: ٣١﴾

المرأةُ عورةٌ فإذا خرجتْ استشرفَها الشیطانُ وأقربُ ما تکونُ من وجهِ ربِّها وهي في قعرِ بیتِها

الراوي : عبدالله بن مسعود | المحدث : ابن القطان | المصدر : أحکام النظر – الصفحة أو الرقم: 137 | خلاصة حکم المحدث : صحیح

دژە ئیسلام دەڵێت : پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم) ئافرەتی بە عەیب و عار و شورەیی ناو بردووە و پێی دەڵێت ئافرەت ( عەورە ) یە . بەڵگەشیان بۆ ئەم قسەیەیان حەدیسێکی صحیحە لە وێنەی پۆستەکەدا دانراوە دەفەرموێت : ئافرەت عەورەتە ئەگەر بچێتە دەرەوە دەبینرێت و ( استشرفها الشیطان ) واتا دەکەوێتە فیتنەوە و پیاوان دەی بینن و مشت و مڕ دروست دەبێت لە نێوان ژن و پیاودا و دەبێتە هۆی کاری خراپ لە نێوانیاندا باشترین شت بۆ ئەوەی نزیك بێت لە خودای خۆی ناو ماڵی خۆیەتی

پاش ئەوەی ترجمەمان کرد بۆ کوردی . با بێینە سەر کرۆکی باسەکە ئەویش ( عورة ) یە چونکە دژە ئیسلامەکان ڕەخنەکەیان لەو وشەیەیە و دەڵێن ئافرەت عەورەیە وە عەورەتیش بەمانای مایەی شەرمە زاری و سەر شۆڕی دێت و بنابێت تێکەلاوی خەڵکی ببێت عەورەت لە زمانی عەرەبیدا واتا کەلێن لە هەمو شتێکدا . بۆ نموونە سنوری نێوان دوو دەوڵەت ئەو کەلێنانە ی کە خەڵکی دەتوانێت تێیدا دزە بکات پێی دەڵێن ( عورة ) وە هەر شتێك و هەر شوێنێك کەلێنی تێدا بوو وە توانییان لەو لایەوە یان لەو کونەوە دزە بکەن ئەو کەلێنە پێی دەڵێن ( عورة )

باشترین نموونە ئایەتی ١٣ ی سورەتی **الاحزابە** دەفەرمویت : خەڵکی طائف بە موسوڵمانەکانیان گوت ( بیوتنا عورة ) ئەگەر بە لێکدانەوە و تێگەیشتنی کاکی دژە ئیسلام بێت دەبێت بڵێین خانوو یان ماڵ عەورەتە و مایەی سەرشۆڕی و شەرمەزارییە ئایا دەکرێت بڵێین ماڵ و خانو عەورەتن و نابێت تێکەلاوی خەڵك بکەن ؟ یان ئەو ئایەتە مانای ئەوەیە پیاوەکانمان لە ماڵەوە نییە و کەلێن هەیە لە ناو ماڵەکانماندا بەوەی پیاوی تێدا نییە هەموو کەس دەتوانێت بێتە ناو ماڵمان و شتمان بدزێت و چی بوێت بیکات

لە ئایەتی ٥٨ ی سورەتی **النوردا** باسی سێ عەورە دەکات . پاش نوێژی بەیانی و کاتی نیوەڕۆ و پاش نوێژی شەو واتا عیشا بە گوێرەی تێگەیشتنی دژە ئیسلام بێت دەبێت بڵێین سێ شەرمەزاری پاش نوێژی بەیانی و کاتی نیوەڕۆ و پاش نوێژی خەوتنان.

یان ئایەتەکە دەڵێت لەو سێ کاتەدا خەڵکی نوستوون وە کەس نازانێت جلیان لەبەردایە یان نا ؟ یان چی دەکەن وە ئەو کاتانە کاتی ئیسراحەتن و کابرا ئیسراحەتی خۆی وەر دەگرێت کاتێك دەچیت بۆ لای داوای ئیزن بکە و لەو کەلێنەوە بۆی مەچۆ کە بێ ئاگایە یان نوستووە بە ئاگای مەهێنە ئەو کەلێنانە چییە دەبێتە هۆکاری سەیر کردن و تەماع تێکردنیان ؟ ئەوەیە کاتیك بە ڕوتی بچنە دەرەوە و جلی تەسکیان لەبەردا بێت سنگ و سمت و ڕانیان دەر بخەن . کاتێك ئافرەت گوێ نەداتە جل و بەرگی هەموو لاشەی کەلێنە و لەو کەلێنەشەوە ١٠٠٠ مشتەری لێ پەیدا دەبێت بۆ سەر جێی !

وە دەقی حەدیسەکەش زۆر ڕوون و سادە و ڕاشکاوە دەڵێت ( فاذا خرجت ) واتا کاتیك لە ماڵ دەر دەچێت و خەڵکی دەی بینێت . وە نیوەی دووەمی حەدیسەکەش دەڵێت : نزیک ترین شوێن بۆی لە خوداوە ناو ماڵی خۆیەتی . ئەوەی لەم حەدیسە تێ دەگەین دەڵێت کاتیك ئافرەت دەچێتە دەرەوە با پۆشتە بێت بۆ ئەوەی پیاوان ڕێگای لێ نەگرن وە ئەگەر کاری زەروری نەبێت نەچێتە دەرەوە و کاتێکیش دەچێتە دەرەوە با پۆشتە بێت . خۆ ناکرێت ڕێگا لە ئافرەت بگیرێت نەچێتە دەرەوە . خۆ کاتی خۆی ئافرەت دەچوو بۆ سەردانی ماڵی باوك و کەس و کاری یان بۆ تەعزیە و خۆشی و هن هێنان و پیرۆزبایی منداڵ بون و ... هتد وە ئێستاش لەم زەمانەی ئێستاماندا ئەگەر دەوڵەتی خیلافە هەبێت بە دڵنیاییەوە پێویستیی بە ئافرەت دەبێت بۆ کار و باری فەرمانگەکان وە بۆ خوێندن لە قوتابخانەکان و بۆ هەموو بوارەکانی ژیان . وە ئەم حەدیسە فەرمان دەکات کاتێك دەچنە دەرەوە پۆشتە بن وە ناڵێت دەبێت لە ماڵەوە دابنیشن و نەچنە دەرەوە بەڵکو دەڵێت لە ماڵەوە پارێزراو تر دەبێت وە دەقی حەدیسەکەش لەبەر چاوتاندایە

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەوەیە:** ئادەی بە گوێرەی لایەنی زمانەوانی یان ئایاتی قورئان یان حەدیسەکان یان هەر لایەنێکی تر بێت بۆمان بسەلمێنن ( عورة ) واتا شەرمەزاری و سەر شۆڕی ؟ وە هەتا دەمرن ناتوانن ئەوە بسەلمێنن یان ( المراة عورة ) بیخە ڕستەیەکەوە بە زمانی عەرەبی ئەو مانایە ببەخشێت ئافرەت مایەی سەر شۆڕی و شەرمەزارییە ؟ ئەگەر نەت توانی یە ك سەرجاوەمان بۆ بهێنیت بڵێت لە ئیسلامدا ئافرەت عەورەیە بە مانای سەرشۆڕی و شەرمەزاری دێت یە ك جار بیر بکەرەوە کە لەچی هەڵ وێستێک دایت ئەوەتا لە دنیادا ناتوانیت وەڵامی کەسێك بدەیتەوە لەسەر نوسینێك لە ئینتەرنێتدا کە نای بینیت . ئایا وەلامت چی دەبێت ڕۆژی زیندوو بونەوە بەرامبەر خودا لەسەر درۆ و بوختان کردنت بە شتێك خۆت نازانیت ماناکەی چییە ؟

کاکی دژە ئیسلام بە گوێرەی راڤە و تێگەیشتنی تۆ بێت کە دەڵێیت ئافرەت عەورەیە . بێزەحمەت ئەمانە شمان بۆ راڤە بکە بزانین مانای چییە ؟؟ . **عورة الشمس** ئایا مانای سەرشۆڕیی خۆرە – **عورة الجبال** ئایا مانای سەرشۆڕیی چیاکانە – **عورة الثغور** ئایا مانیا سەرشۆڕیی سنورەکانە ؟ئەگەر ئەو مانایانەش نا بەخشێت کەواتە بیر بکەرەوە کە زانیارییەکانت وەك بیر و بۆچونەکەت سفرە و چەواشە کاری مەکە بۆ ئاینی ئیسلامی مەزن وە هەروەها واز لە کۆپی و پەیست بهێنە بۆیە بە ناوگەڵیی ژن و پیاو دە وترێت ( عورة ) چونکە هەموو کەس دای دەپۆشێت و لای شەرمە دەری بخات و کاتێك بە دەرەوە دەبێت و کەسەکە دەزانێت ئەو شوێنەی بە دەرەوەیە ئەو کەلێنە دەگرێت و دای دەخات وە لاشەی ئافرەتیش هەر هەمووی ( عورە ) یە چونکە بە دەرکەوتنی هەموو شوێنێکی زەوقی پیاو دەروژێنێت تەنانەت ئەگەر رووتیش نەبێت وە جلی تەسکی لەبەردا بێت و لاشەی دەربخات هەر زەوق ی پیاوان دەوروژێنێت کاتێك دەڵێن ئافرەت عەورەتە واتا وروژێنەرە نەك مایەی سەر شۆڕیی و عەیبە و سوکایەتی بێت !؟

---

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد وبیست ویەك

### پیاو پلەیەك لە ئافرەت بەرزترە

1. وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلَاحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿البقرة: ٢٢٨﴾

2. لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿النساء: ٩٥﴾

3. الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللَّهِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿التوبة: ٢٠﴾

4. وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿الحديد: ١٠﴾

ڕەخنە لە ئاینی مەزنی ئیسلام دەگرن دەڵێن لە قورئاندا لە ئایەتی ٢٢٨ ی سورەتی **البقرەدا** نوسراوە **(و للرجال عليهن درجة)** . ئەوان راڤەی دەکەن بەوەی فەزڵی پیاو دراوە بەسەر ئافرەتدا و پیاو پلەیەك لە ئافرەت بەرزترە یان سەروترە و ئەمەش زوڵمە لە ئافرەت دەکرێت طبعا هەرکەس شارەزا بێت لە ڕەخنە و گومانی دژە ئیسلامەکان دەزانێت دەقەکان دەبڕن . وە ئەم ئایەتە بە هەمان شێوە بڕاوە و پێشەکەی دا نانێن . کە باسی تەلاق دان دەکات و حوکمی تەلاق دان چییە ؟ چونکە لە پێش ئیسلامدا ئافرەت حسابی بۆ نەکراوە لە هیچ کۆمەڵگاکاندا وەك کاڵا مامەڵەی لەگەڵدا کراوە و پیاو بە ئارەزوی خۆی ژنی هێناوە و تەڵاقی داوە و بۆ گەڕانەوەی بۆ لای مێردەکەی دوای تەڵاق جۆرەها یاسای قورس و گرانیان داناوە . وە ئاینی ئیسلامی مەزن هاتووە ئەو یاسایانەی هەمووی پوچەڵ کردوەتەوە کەواتە ئەو ئایەتە لە بەرژەوەندیی ئافرەتە و پێگەی ئافرەتی بەرز کردوەتوە و یەکسانی کردووە بە پیاو چونکە ئایەتەکە پاش ڕون کردنەوەی حوکمی تەڵاق دەڵێت : **(و لهن مثل الذي عليهن بالمعروف** ). واتا ئافرەتانیش وەك پیاوان حەقیان هەیە ( **بالمعروف** ) معروفیش واتا بە گوێرەی عورف وە هەموو قسەیەکی جوان و کارێکی باش و ڕەوشت بەرزییەك لەگەڵ بەرامبەردا پێی دەڵێن ( معروف ) . چونکە پێش هاتنی ئیسلام هەموو یاسا و عورف لە ساڵحی پیاو بوو . ئافرەت هیچ دەسەلات و یاسایەکی لە پشت نەبوو بەلام قورئان هات و حەدی دانا بۆ ئەو یاسایانە و پێی گوتن چۆن ئێوە بە ئارەزوی خۆتان یاسا دادەنێن بۆ خۆتان مافی ئافرەت پێشێل دەکەن ؟ئەوە هەڵەیە و ئافرەت وەك ئێوە مرۆڤە دەبێت ئەویش وەك ئێوە هاوتا بێت بە معروف مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن ( **و لهن مثل الذي عليهن بالمعروف** ) کەواتە هەنگاوی یەکەم یاساکانی هاوتا کردەوە بە گوێرەی عورفی خۆیان چونکە معروف دژی منکرە وە ئەوەی زانراوە و متعارفە لەناو خەڵکیدا دەبێت ئەوە بکرێت چۆن پێت ناخۆشە وەك پیاو زوڵمت لێ بکرێت دەبێت بەو شێوەیەش زوڵم لە ئافرەت نەکەیت و ئەویش وەك تۆ مافی هەبێت چونکە هەردووکتان مرۆڤن وە ئەوە عورف و زانینە کە هەردوکتان هاوتا بن کە ئافرتیش وەك تۆ بێت ئەوە عورف نییە تۆ زوڵمی لێ بکەیت و کەی بتەوێت ژنت بێت و کەی بتەوێت بەرەڵای بکەیت وە دەبێت هەردووکتان یەکسان بن لە هەموو شتێکدا نەك تەنها لە تەڵاقدا **( و لهن مثل الذي عليهن بالمعروف)** هەموو مرۆڤێکیش حەزی لە معروفە ئەگەر دیندار بێت یان بێدین بێت !؟ وە هەمیشە دەیەوێت کاری باشە بکات و خەڵکی بە باشە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و بە کەسێکی باش دەر بکەوێت بۆیە بە دەم و چاویش دەڵێن ( عرف ) چونکە کەسەکە لە ڕێی دەم و جاویەوە دەبینرێت هەروەها کارە باشەکانیش پێی دەڵێن معروف وە خراپیش منکرە . کەواتە چیت پێ خۆشە بۆخۆت دەبێت بۆ ژنەکەشت پێت خۆش بێت و چیت پێ نبۆ خۆت دەبێت بۆ ژنەکەت پێت ناخۆش بێت و یەکسان و هاوتا بن لە هەموو مامەڵەیەکدا ئەمەش هەنگاوێکی گرنگە خەڵکی بیر بکاتەوە ئافرەتیش وەك پیاوە لە مافەکانیدا . لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش : ئەگەر قورئانێك ئافرەت یەکسان بکات بە پیاو بە گوێرەی عورفی تاکەکان و پێیان بڵێت ژن وەك ئێوەیە بۆچی یاسا لە بەرژەوەندیی پیاو دادەنێن و حساب بۆ ژنەکانتان ناکەن ؟ئایا ئەو قورئانە پیاو بەرز دەکاتەوە دەرجەیەك بەسەر ئافرەتدا ؟ ئینجا دێتە سەر ئەو

بەشەی دژە ئیسلام دەی برێت و دەفەرموێت ( **و للرجال علیهن درجة** ) با لیرەدا بوەستین بزانین لە چەند شوێنی تردا باسی درجة کراوە لە قورئاندا ؟ پاشان دێینەوە سەر ئەم ئایەتە کە کرۆکی باسەکەیە

لە سورەتی **النساء** ٩٥ دا باسی ئەو کەسانە دەکات کە دەتوانن جیهاد بکەن بەلام نایکەن خودا دەفەرموێت فەزڵی موجاهیدەکان دەرەجەیەك زیاتر دراوە بەسەر ئەوانی تردا دیقەت بدەن دەڵێت( **فضل الله المجاهدین علی القاعدین درجة** )وە لێرەدا بە جوانی دیارە مجاهد پلەیەك لەسەر خەڵکی ترەوەیە

لە سورەتی **التوبة** ٢٠ دا دەفەرموێت : ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و جیهادیان کردووە بەرزترین پلەیان هەیە لای خودا **( اعظم درجة )**

لە سورەتی **الحدید** ١٠ دا باسی ئەوانە دەکات پێش فتحی مەکە پارەیان سەرف کردوە و جەنگاون بەرز ترین پلەیان هەیە لای خودا **( اعظم درجة)**

وەك بینیتان لە **سیَ** ئایەتدا باسی درجة کراوە دوانیان بە بەرزترین دەرجە و دانەیەکیان یە ك درجة فەزڵی زیاترە . بەڵام لە سورەتی **النساء** ٢٢٨ دا کە دژە ئیسلامەکان گومانیان لەسەر دروست کردووە ناڵێت اعظم درجة یان ناڵێت فضل الرجال علی النساء درجة بەڵکو دەڵێت ( و للرجال علیهن درجة ) پاش ئەوەی لە پێشەوە باسمان کرد قورئان لە هەمان ئایەتدا ئافرەت و پیاوی یەکسان کردوە بە گوێرەی عورف . هەر مباشر لە دوای ئەوە دەفەرموێت پیاوان یە ك پلە ی تریشیان لەسەر ئافرەتانە ( علیهن ) واتا لەسەر پیاوەکەیە و دەبێت بیکات ئەویش ( قوامة ) یە کە لە ئایەتی ٣٤ ی **النسائدا** هاتووە . قوامەش واتا هەستان بە کاروبار و ئیدارەی ماڵ و منداڵ وەك دەبینین پیاوان ماڵ و منداڵ بەخێو دەکەن و بەڕێوەی دەبەن . وە بەو شێوەیە ئایەتی (**و للرجال علیهن درجة**) لە بەرژەوەندیی ئافرەتە و دژی پیاوە بەوەی دەبێت پیاوەکە هەموو شتێك بۆ ئەو ئافرەتە و ماڵەکەی دابین بکات . وە ابن عباس دەڵێت لە دوای ئەوەی ئەو ئایەتە دابەزی منیش خۆم جوان دەکرد بۆ خێزانەکەم چونکە خودا دەفەرموێت ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف . چونکە فەرمانمان پێ دەکات ئەوانیش وەك ئێمە مافیان هەیە چۆب پیاو حەز دەکات ئافرەت خۆی بۆ جوان بکات منیش خۆمی بۆ جوان دەکەم و خۆم دەگۆڕم وەك ئەو لەوانەیە کەسێك بپرسێت بڵێت خۆ ئێستا و لە کاتی خۆشیدا ئافرەت هەبووە بە توانا بووە و ئەو قەوامە ی هەبووە و توانیویێتی ماڵ و منداڵ بەخێو بکات و مێردەکەشی هیچ دەورێکی نە بووە و ئێستاش زۆر لەو پیاوانە هەیە کە بێ دەسەلاتە و ژنەکە ئیدارەی ماڵ دەدات ئەم ئایەتە ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف بەهەمان شێوە وەلام دەداتەوە و ئیسپاتی دەکات ئاینی ئیسلام مەزن ترین یاسای داناوە بۆ مرۆڤ و بۆ ئافرەت چونکە ئافرەت و پیاوی یەکسان کردوە و کاتێك پیاوەکە نەتوانێت قوامەی هەبێت ئافرەتەکە جێگای ئەو دەگرێتەوە بۆ ئیدارەی ماڵ ئادەی کێ دەتوانێت پێم بڵێت چی یاسا و چی ئاینێك هێندە مەزنە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر بەو شێوەیە مامەڵە ی لەگەڵ ئافرەتدا کرد بێت ؟ و ژن و پیاوی یەکسان کرد بێت لە حقوق و واجباتدا ؟

بە راستی هەر چۆن بیر لەم ئایەتە بکەینەوە( **ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف** ). گەورەی و مەزنیی ئاینی ئیسلاممان بۆ دەر دەکەوێت کە داوا دەکات چی بۆ پیاوە دەبێت بۆ ئافرەتیش بێت وە لە دوای ئەوەشەوە دەڵێت ئەی پیاو تۆ یە ك پلەی تریشت لەسەرە دەبێت ماڵ و پێداویستیەکانی و ماڵ و سەرچاوەی رزق و بژێویی ئەو ژنە پەیدا بکەیت هەتا دەمریت.

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئایا ئەو ئایەتە و للرجال علیهن درجة لە بەرزەوەندیی پیاوە یان ژن ؟ ئایا ئافرەت لە ئاینی ئیسلامدا بەهۆی ئەو دەرجەیەوە هەتا دەمرێت لە ماڵی خۆیدا وەك شاژن دەژی یان نا ؟ئەو ئافرەتانەی شویان کردوە و کار دەکەن لەگەڵ مێردەکانیان وە کەسیان نییە منداڵەکانیان لا جێ بهێڵن باشتر لە مانای ئەو پلەیە تێ دەگەن و دەزانن‌ئەو پلەیە پە بەرژەوەندیی ئافرەتە و لە زیانی پیاوە و خودای زانا پلەیەك ئافرەتی بەرز کردوەتەوە بەسەر پیاودا نەك وەك دژە ئیسلام دەهۆڵی بۆ دەکوتێت و دەڵێت خودا پیاوی پلەیەك بەرز کردوەتەوە بەسەر ئافرەتدا .

---

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :سەد وبیست ودوو

## ئەسپ و ئافرەت و خانوو شومن

1 الشؤمُ في الدارِ والمرأةِ والفرسِ الراوي : عبدالله بن عمر | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم
الصفحة أو الرقم: 2225 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

2 ذكروا الشُّؤْمَ عند النبيّ صلى الله عليه وسلم ، فقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم: إن كان الشُّؤْمُ في شيءٍ ففي الدارِ، والمرأةِ، والفَرَسِ
الراوي : عبدالله بن عمر | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم: 5094 | خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

3 لا عدوى ولا طِيَرَةَ وإنما الشؤمُ في ثلاثة : المرأةُ والفرسُ والدارُ الراوي : عبدالله بن عمر | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم
الصفحة أو الرقم: 2225 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

4 أربعٌ من السعادةِ : المرأةُ الصالحةُ ، و المسكنُ الواسعُ ، و الجارُ الصالحُ ، و المركبُ الهنيءُ وأربعٌ من الشقاءِ : المرأةَ السوءُ
و الجارَ السوءُ ، و المركبَ السوءُ ، و المسكنَ السوءُ
الراوي : سعد بن أبي وقاص | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الجامع الصفحة أو الرقم: 887 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

دژە ئیسلامەکان دەڵێن پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) دەڵێت سێ شت شومن ئافرەت و خانوو و ئەسپ وە بۆچی ئافرەت دەبێت شوم بێت یان مایەی شومی بێت لە ئیسلامدا ؟ ئەوەی دژە ئیسلام دەی کات بە بەڵگە حەدیسی ژمارە **یەکە** لە **وێنەکە** دا دانراوە . ئەو حەدیسەش صحیحە و لاواز نییە !؟ بەلام ئەوەی لاوازە فێڵ و چەواشەکاریی دژە ئیسلامە چونکە هەموو حەدیسێك بە چەند شێوەیەك گێڕراوەتەوە . ئەوان ئەو حەدیسەیان دا دەنێن کە خزمەتی چەواشە کارییەکەیان دەکات . وە ئێمەی موسوڵمانیش تەمبەڵێن و بە دوای سەرجاوەکاندا ناگەرێین و بزانین بە شێوەی تر ئەو حەدیسە هاتووە یان نا ؟

ئەگەر بچین بۆ لای حەدیسی **دووەم** دەڵێت : باسی شومێتییان کرد لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەویش گوتی ئەگەر شومی ( هەبێت ) لە خانوو و ئافرەت و ئەسپدایە . لێرەدا جوان دیقەت بدەن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت ( ئەگەر شومی هەبێت ) واتا ١٠٠% ناڵێت شومی هەیە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی شومێتی لە ئیسلامدا بونی نییە

لە حەدیسی **سێەمدا**: زۆر بە جوانی ئەو ئەگەرە ڕون دەکاتەوە و دەفەرموێت : (**لا عدوى و لا طيرة** )!؟ لا عدوى واتا هیچ شتێك شتێك ناگوێزێتەوە بۆ شتێکی تر ڕون تر واتا هیچ شتێك نابێت بە هۆکاری ئەوەی شتی تر خراپ بکات و کارەسات دروست بکات . لێیان پرسی باشە ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر حوشترێکی نەخۆش بێتە ناو ڕەوە حوشترەکانمانەوە و ئەوانی تریش نەخۆش بخات ؟. ئەویش فەرمووی : کێ ئەوەی یەکەمی نەخۆش خست ؟ واتا هۆکاری بڵاو بونەوەی نەخۆشیەکە حوشتر ی یەکەم بووە ئەگینا ئەگەر حوشتری یەکەم نەچوایەتە ناویانەوە ئەوانی تریش نەخۆش نە دەکەوتن و هۆکاری بڵاو بونەوەی نەخۆشیەکە یەکەم بووە چووە بۆ دووەم و سێهەم و ... هتد و **لا طيرة** واتا هەر شتێك مرۆڤ بیبینێت یان بی بیستێت یان ناسراو بێت یان زانراو بێت لەناو خەڵکیدا کە دەبێتە مایەی شومی . بۆ نموونە دەڵێن کونەپەپو شومە لە هەر جێگایەك بخوێنێت شومی ڕوی تێ دەکات ، یان فلان شت ببینیت خراپە و شومە . ئەوانە هیچیان ڕاست نییە و هیچ شتێك نابێت بە مایەی شومی.

لە بەشی **دووەمی** حەدیسەکەدا دەڵێت شومی لە ئافرەت و ئەسپ و خانودایە . ئەوەی لەم حەدیسە تێی دەگەین هۆکاری گواستنەوەی نەخۆشی یەکەم نەخۆشە و دەبێتە هۆکاری بڵاو بونەوەی لەناو ئەوانی تردا وە هیچ شتێکیش شووم نییە . کەواتە بۆچی ناوی خانوو ئەسپ و ئافرەتی هێناوە ؟

لە حەدیسی چوارەمدا وەلاممان دەست دەکەوێت دەفەرموێت : چوار شت مایەی خۆش بەختییە ئافرەتی باش ( صالحة ) وە خانوی گەورە و فراوان وە دراوسێ ( جیران ) ی باش و هەر شتێکی باش وسواری ببیت وەك ئەسپ و گوێ درێژ و هێستر و سەیارە و ... هتد

چونکە ووشەی ( المركب ) عامە و مەبەست لە هەر شتێکە سواری ببیت . بە باشی بڕوات و ئازا و چالاك بێت و خێرا بێت و ... هتد

چوار شتیش دەبێتە هۆکاری ئەزیەت دان و ناخۆشی و ئیزعاجی : ئافرەتی خراپ و دراوسێ ( جیران ) ی خراپ و هەرشتێکی خراپ کە سواری ببیت و خانووی خراپ

وا بزانم ئێستا ڕوون و ئاشکرایە بۆچی خانوو ئەسپ و ئافرەت دەبنە مایەی شومی !؟ چیتر ڕون کردنەوە ی ناوێت و حەدیسی چوارەم ئەو شومیەی بە جوانی ڕون کردوەتەوە چی جۆرە ئافرەت و ئەسپ و خانویەك مایەی شومییە. وە ووشەی ( الشؤم ) بە مانای شومی نایەت بە مانای ڕەش بینی و ئیزعاجی و بێزاری دێت کە هەمیشە بە خراپی و ڕەش بینی سەیری بکەیت وە هۆکارەکەشیمان لە سەرەوە ڕون کردەوە ئەگەر یەکێك ئەو **سێ** شتەی پێکەوە هەبێت هەمیشە ڕەش بینە ، وە ئەگەر دوانیانی هەبێت هەمیشە لەو شتە ڕەش بینە وە ئەگەر یەکێکیانی هەبێت هەمیشە لەو شتە ڕەش بینە

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : کێ رازییە ئەمانەی هەبێت ؟ ئافرەتێکی خراپ ژنی بێت و سەیارەیە کی خراپ و شکاو یان ئەسپێکی هیلاکی نەخۆش و خانویەکی بچکۆلەی کۆنی رزیوی ناخۆشی هەبێت ؟ ئایا ئەو کەسە هیچ خۆشی لە ژیان دەبینێت ئایا هەمیشە شەڕ لەگەڵ سێبەری خۆی ناکات ؟ ئایا هەموو شتێك لە دنیادا بە شومی نا بینێت ؟

پرسیاری کەمەر شکێنیشمان بۆ یەکەم کەس ئەم ڕەخنەیەی گرتووە لە ئیسلام کە معتزلە ی دژە ئیسلامن ئەمەیە : ئادەی بە گوێرەی قورئان ( چونکە ئێوە باوەڕتان بە حەدیس نییە ) یە ك ئایەتمان بۆ بهێنە بلێت ئاینی ئیسلامی مەزن باوەڕی بە شومی هەیە یان چی شتێك شومە لە قورئاندا ؟ وە ئایا ئاینی ئیسلامی مەزن دەڵێت باش و خراپ لای خوداوەیە و بە ئیزنی خودایە ؟ یان قورئان دەڵێت هۆکاری باش و خراپی شومێتیی شمەکە یان مرۆڤە یان هەر شتێکی ترە ؟ یە ك بەڵگەمان بۆ بهێنن لەسەر شومێتی یان ئیسلام باوەڕی بە شومێتی هەر شتێك هەبێت ؟

نیوەی دووەمی پرسیاری کەمەر شکێنیشمان بۆ دژە ئیسلامەکانە هەر هەموویان ئێوەش یارمەتیی برا معتزلەکانتان بدەن و یە ك حەدیسمان بۆ بهێنن بلێت شومێتی هەیە لە ئاینی ئیسلامی مەزندا ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد وبیست وسێ

## ژن و سەرۆك و ئەقڵی بێدین




دژە ئیسلامەکان وێنەی ١٨ ئافرەت دا دەنێن وەك لە وێنەکەدا دەیبینن . وە لە بەرامبەریشدا حەدیسێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا دەنێن دەفەرموێت( **لن يفلح قوم ولوا امرهم امراة** ). واتا هیچ قەومێك سەرکەوتوو نابێت ئافرەتێك بکەن بە سەر پەرشتیاری خۆیان واتا بیکەن بە سەرۆکی خۆیان .

ئەوانیش ئەو ڕاستیە دەزانن بەڵام دژە ئیسلام بە هەوای نەفسی خۆی و بۆ دژایەتیی ئیسلام ئەم جۆرە شتانە بڵاو دەکاتەوە . وە مەبەستی حەدیسەکە لەوەدایە ئەگەر هەر میلەتێك سەرقاڵی کشتووکاڵ بن و لایەنی سەربازی و چەك داری و جیهاد وەلا نێن و بەس کشتووکاڵ بکەن ئەو میلەتە زەلیل دبن و کاتێك ولاتێکی تر یان گەلێکی تر داگیریان بکات بە ئاسانی دەتوانێت وڵاتەکە داگیر بکات و ئەو کات دەبێت کابرای جوتیار زەلیل و ژێر دەستەی داگیر کەر بێت و باج و سەرانەی کارەکانیشی بدات بە داگیر کەرەکە بەڵام ئەگەر گەلێك لەگەڵ کشت و کاڵیشدا لایەنی سەربازیشی بەهێز بێت ئەو کات قەت زەلیل نا بێت وە ناکرێت گەلێك هەر هەموبان خەریکی کشتووکاڵ بن یان هەر هەمویان سەرباز بن . بۆیە هەردوو لاینەکە پێویستن بۆ وڵات

باشترین نموونەش لە ئێستادا امریکا و ئەو وڵاتانەیە کە لە لایەنی سەربازیدا بەهێزن بە ئارەزوی خۆیان وڵات داگیر دەکەن و یاسا و ڕێسایان بۆ هەموو جیهان داناوە . ئەگەر وڵاتێکی کشتووکاڵی بونایە ئەوان لاواز دەبوون و وڵاتانی تر یاسایان بۆ امریکا و ولاتانی تری سەربازی دا دەنا ،وە ئەو ڕەخنەیەی دژە ئیسلام هیچ نییە و چەواشەکارییە بۆ خۆی نەك بۆ موسوڵمانان . چونکە ئاینی ئیسلامی مەزن بە تەنها ئاین نییە بەڵکو نیزامی دەوڵەتیشە و دەوڵەتیش لە کۆن و نوێدا پێك هاتووە لە کشت و کاڵ و وەبەرهێنان و لایەنی سەربازی وە هەر لایەکیان نەبێت دەوڵەتەکە بێ هێز دەبێت و ناکرێت کشت و کاڵ وەلا بنرێت و نەکرێت چونکە برسێتی و نەبوونی ڕوو دەکاتە ئەو وڵاتە بۆیە زۆر لەسەر چەواشە کاریی دژە ئیسلام نارۆین و گومانە کەی هیچ نییە و بەڵگەیە بۆ کاڵ فامی و نەزانیی لە دنیا و لە دەوڵەتیش هەروەها حەدیسیشمان زۆرە لەسەر چاندن و کشت و کاڵ لەوانەش پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەفەرموێت ئەگەر موسوڵمانێك شتێك بچێنێت و هەر کەسێك ( کافر بێت یان موسوڵمان بێت ) یان باڵدارێك یان ئاژەڵێك لە بەری ئەو شتە بخوات بە صدقە و بە چاکە بۆی دەنوسرێت هەروەها دەفەرموێت ئەگەر زانیتان ئاخر زەمانە و نەمامێکتان بە دەستەوەیە نەمامەکە بچێنن و چاندنی نەمامەکە بەجێ مەهێڵن لە ترسی ئەوەی ئاخر زەمانە

پاشان کشتووکاڵ هێندە گرنگە خودای باڵا دەست لە سورەتی **الواقعة** ٦٤ دا دەفەرموێت : (**اانتم تزرعونه ام نحن الزارعون** )؟ کاتێك باسی چاندن دەکات ئەو چاندنە دەگەڕێنێتەوە بۆ زاتی خۆی و دەفەرموێت ئایا ئەو شتانەی دەی چێنن ئێوە دەی چێنن یان من مەبەستی لەوەیە تۆ بەس ئەوەت لەسەرە کارەکە بکەیت و تۆوەکە دا بنێیت ئیتر بارینی باران و زیاد کردن و پێگەیشتنی بەر و بومەکەت کاری خودایە

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە :** ئایا پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) ئەو ئایەتەی نە دەزانی کە خودا فەزڵی چاندنی گەڕانوەتەوە بۆ زاتی بەرز و پاك و بێ گەردی خۆی ؟ ئایا چەندەها حەدیسی ترمان نیە باسی چاندن و سودی چاندن و کشت و کاڵ و کار کردن دەکات ؟ ئەی ئەگەر ئەو ئایەت و حەدیسانە هەیە چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم ) دژی کشت و کاڵ دوەستێت ؟ وە چۆن دەوڵەت بنیات دەنێت و کشتوو کاڵ وەلا دەنێت ؟

## پرسیارە بێ وەلامەكان ژمارە :سەد و سی وشەش

### شوێنی ڕەجم كردنی شەیتان لە مەكەپەیوەندیی بە ماسۆنیەتەوە هەیە ؟













هەڵەیەك هەیە تەنانەت موسوڵمانیشی تێ دەكەوێت بە تایبەتی ئەو موسوڵمانانەی باوەڕیان بە خورافاتی ماسۆنیەت و یەك چاوەكەی دەجال هەیە . وە بێدینەكانیش بە عام هەمان هەڵە دەكەن .

هەڵەكەش ئەوەیە دەڵێن لە كەعبە و لە ماڵی خودا هێمای شەیتانیان داناوە بۆ ڕەجم كردن و ئەو هێمایە هی ماسۆنیەتە یان هی شەیتان پەرستەكانە !!

من لێرەدا باسی ماسۆنیەت و شەیتان پەرستەكان ناكەم باسەكەشم دەربارەی شەیتان پەرستی نیە !!؟ بەڵكو باسی ( مسلة ) دەكەین وەك لە وێنەكەدا دەیبینن . مسلة پێك هاتووە لە بەردێكی نوك تیژ وە لە زۆر شوێن دەبینرێت بە تایبەتی لە وڵاتە اوروپیەكان و ئەو وڵاتانەی شارستانیی كۆنیان تێدایە وەك مصر و عراق و زۆر شوێنی تر . وە هەر كەسێك لە نزیكەوە مسلةیەكی بینی بێت دەبینێت نەخشی لەسەرە و ئەو نەخشانەش نوسینی ئەو زەمانەن كە ئەو مسلةیەی تێدا دروست كراوە

وە كاتی خۆی كاری ئەو مسلانەش ئەوە بووە یاسا و ڕێسای ئەو زەمانەی ئەو وڵاتەی تێدا نوسراوە بۆ ئەوەی لەبەر چاوی خەڵكی بێت وە یان كەسێكی غەریب هاتە ئەو ولاتەوە شارەزای یاسای ئەو وڵاتە بێت وە ئێستاش دەبینین لە فیسبوكدا زۆربەی گروپەكان یاسای گروپەكەیانیان لە سەری سەرەوە داناوە بۆ شارەزایی ئەو كەسانەیە كە دێنە گروپەكەوە هەتا سەر پێچی نەكەن . وە ئەگەر ئەم

فیسبوکە جاران هەبوایە هەر گروپێك مسلةیەکی بۆخۆی دروست دەكرد بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان وێنەی ژمارە ( ١ ) ی مسلةی حامورابیە لە عێراق کە ٢٨٢ مادەی قانونی ئەو زەمانەی تێدا نوسراوە بۆ لایەنی کشتوکاڵ و یاساکانی دزی و کوشتن و تاوان و لایەنی کۆمەڵایەتی و ... هتد .

هەروەها لە شارستانیەتی فیرعەونەکانیشدا مسلة هەبووە و هەر فیرعەونێك مسلةیەك یان چەند مسلةیەکی تایبەتیی خۆیی هەبووە و باسی حوکمەکەی و زەمانی حوکمەکەی و جۆری حوکمەکەیی تێدا کراوە ، وە لەبەر ئەوەی هەموو فیرعەونێك خۆی بە خودا زانیووە مسلةکان لە پەرستگاکاندا دانراون و ماوەی حوکمی ئەو خودایەی تێدا نوسراوە لەگەڵ ڕەچەڵکی خوداییەکەی کە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ خودای ڕۆژ وە یاسای هەر فیرعەونێکیش یاسای خودایی ئەو کاتە بووە ، بۆیە لە مسلة فیرعەونیەکاندا زیاتر لایەنی ئاینیی تێدا بەدی دەکرێت چونکە خاوەن مەسەلەکان خودا بوون وە یاساکانیان بەناوی خوداوە نوسیوەتەوە . بەلام لای حامورابی دەوڵەتی مدنی بووە یاساکانی مدنی بووە وە لەبەر ئەوەی هەموو فیرعەونێك خۆی بە خودا زانیووە مسلةکان لە پەرستگاکاندا دانراون و ماوەی حوکمی ئەو خودایەی تێدا نوسراوە لەگەڵ ڕەچەڵکی خوداییەکەی کە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ خودای ڕۆژ وە یاسای هەر فیرعەونێکیش یاسای خودایی ئەو کاتە بووە ، بۆیە لە مسلة فیرعەونیەکاندا زیاتر لایەنی ئاینیی تێدا بەدی دەکرێت چونکە خاوەن مەسەلەکان خودا بوون وە یاساکانیان بەناوی خوداوە نوسیوەتەوە .

بەلام لای حامورابی دەوڵەتی مدنی بووە یاساکانی مدنی بووە وە کاتێك شوێنی ڕەجمی شەیتان دەبینین لە کعبة هەمان شێوەی مسلةی هەیە . بەلام مسلة نییە !؟ چونکە مسلة دەبێت نوسینی لەسەر بێت و تێیدا بنوسرێت ئەو مسلةیە باسی چی دەکات ؟بەلام ئەو شوێنی شەیتان ڕەجم کردنە هیچ نوسینێك و هیچ یاسایەکی لەسەر نە نوسراوە !! بەڵکو وەك بەرزاییەك دانراوە بۆ ئەوەی خەڵکی پی بینێت . وە هیچ پەیوەندیی نییە بە مسلةوە بەڵام وەختی خۆی کە لە شێوەی مسلة دروست کراوە ئەمانیش وەك خۆی هێشتویانەتەوە و دەست کاریان نەکردوە بەلام پاش زۆر بوونی خەڵك و چونیان بۆ حەج حرمی مەككیان فراوان تر کرد ئەو هێما کۆنەیان لابرد و بە شێوەیەکی پان و فراوان دروستیان کرد وەك لە وێنەی ژمارە (٤ ) دا دەی بینن لە شێوەی کەشتییەکدا یە . وە ئەگەر ئەو شوێنە کۆنەی شەیتان ڕەجم کردن مسلة بووایە یان پەیوەندیی بە مسلةوە بووایە بە دڵ نیاییەوە وەك خۆی دروستیان دەکردەوە بە شێوەی مسلة و نوسینەکانی سەریشیان وەك خۆی دەنوسییەوە.

بۆیە شوێنی ڕەجم کردنی شەیتان لە کعبة نە پەیوەندیی بە شەیتان و شەیتان پەرستەوە هەیە ؟ و نە پەیوەندی بە مسلةوە هەیە ؟ و نە پەیوەند یی بە ماسۆنیەتەوە هەیە !؟ بەڵکو ئەو کەسانەی ئەو جۆرە شتانە بلاو دەکەنەوە . هیچ زانیاریان نیە دەربارەی مسلة و ماسۆنیەت و شەیتان پەرستنەوە .

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :سەد و سی وحەوت

## گۆڕینی قیبلە لە بیت المقدس بۆ مەکە

سَيَقُولُ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ مَا وَلَّاهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ۗ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾

دژە ئیسلام هەمیشە ئەو بەشە دا دەنێت کە خۆی دەیەوێت و گومانی لێ بڵاو بکاتەوە لە کۆی 9 ئایەت بەس ئەو بەشەی کردوە بە گومان بە ڕەنگی شین دیاریمان کردوە



پرسیاره بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

دژە ئیسلام ڕەخنە لە ئایەتی ١٤٣ ی سورەتی **البقرە** دەگرێت و دەڵێن محمد (صلى الله عليه وسلم) بە ئارەزووی خۆی قیبلەی داناوە و گۆڕیویتی . چونکە لەو ئایەتەدا دەڵێت قیبلەمان گۆڕیووە بۆ ئەوەی بزانین کێ شوێن محمد دەکەوێت و کێ لێی هەڵ دەگەڕێتەوە (صلى الله عليه وسلم) ئایا خودا خودا عیلمی غەیب نازانێت ؟ ئایا خودا نازنێت کێ شوێن محمد(صلى الله عليه وسلم) دەکەوێت و کێ لێیهەڵ دەگەڕێتەوە ؟ ئەگەر خودا هەمو شت دەزانێت پێویستیی بەوە چییە بزانێت کێ دوای دەکەوێت و کێ پشتی تێ دەکات ؟ وە لێرەدا ڕەخنەی دژە ئیسلام تەواو دەبێت و ئێمەش لە وەلامدا دەڵێین بەڵێ خودا زانایە و ئاگاداری هەموو شتێکە و دەزانێت چی ڕو دەدات و چی دەبێت بەڵام خودای زانا کار و باری دونیا و دینی داوەتە دەستی خەڵکی خۆی وە بە ئازادیی ڕەها هەڵ بژێرن چییان دەوێت و چی دەکەن وەك لە ئایەتی ٢٩ ی سورەتی **الکهف** و زۆر ئایەتی تردا دەفەرموێت (**فمن شاء فليؤمن و من شاء فاليكفر**) واتا کێ دەیەوێت با ئیمان بهێنێت و کێ دەیەوێت با کفر بکات . کەواتا هەموو ڕوداوەکان لای خەڵکییە و خەڵکەکە دەتوانن ئیمان بهێنن و دەتوانن هەڵ بگەڕێنەوە و لێرەدا ئەو ڕوداوە بۆ خەڵکەکەیە نەك بۆ خودا !؟ وە ئایا خەڵکەکە شوێن محمد (صلى الله عليه وسلم) دەکەون یان پشتی تێ دەکەن ؟

وە زانین و ناسینی خەڵکی ئیماندار بە نیسبەت محمدەوە (صلى الله عليه وسلم) یە نەك بە نیسبەت خوداوە ؟ دژە ئیسلامیش هەمیشە ئایەتەکان دەبڕێت و بەس ئەو بەشە دا دەنێت کە خۆی دەیەوێت و لە وێنەکە دا بە شین بۆمان دیاری کردوون وە ئەگەر

ئێستا ئایەتەکە بە تەواوی و ئایەتکانی پاش و پێشی بخوێنینەوە . ئاستی نەزانی و رق و کینەی دوژمنانی ئیسلام بە ڕونی دەبینین . چونکە دژە ئیسلام هەمیشە ئاستی ئەقڵ و بیر کردنەوەی سنوردارە و بە گوێرەی ئەو سات و کاتە ڕوداوەکان دەبینێت کە تێیدا دەژی وە نازانێت ئەو کاتە مشرکەکانی قورەیش هەبوون جولەکە هەبوون منافقەکان هەبوون وە لە هەمووی گرنگ تر ئاینی ئیسلام ئاین و ئایدیایەکی تازە بووە خەڵکی نەیان زانووە چییە و بە ئاسانی لەلایەن دژەکانیان و بەرامبەرەوە لە خشتە دەبران وە ئایەتی پێش ئەو واتا ١٤٢ دەفەرموێت ( **سيقول السفهاء من الناس** ) خەڵکە سفیهەکان دەڵێن . وە سفیە واتا کەسانێك کە نەزانن و توانای بیر کردنەوەیان نییە خێرا توڕە دەبن و خێرا سارد دەبنەوە و خێرا بڕیار دەر دەکەن و خێرا پەشیمان دەبنەوە واتا خەڵکانی گەمژە بە هەموو پێوەرێك . وە دیقەت بدەن ئایەتەکە دەفەرموێت من الناس واتا خەڵکی بە عام وەك لە سەرەوە باسمان کرد ئەوانەش کە تازە بوون بە اسلام دەچنە ئەو بازنەیەوە . ئەو خەڵکە گەمژانە دەڵێن : (ما ولاهم عن قبلتهم التي كانوا عليها) ؟

واتا بۆچی ڕووی خۆیان وەرگێڕا لەو قیبلەیەی کە ڕویان تێ دەکرد ؟ لێرەوە فیتنەکە دروست دەبێت و خەڵکەکە دەبن بە چەندەها بەشەوە و هەر یەکێك لە ئاوازێك دەخوێنێت و ئەو کات دەر دەکەوێت کێ ئیمانداری راستە و کێ سفیهە و نەزانە و پشت دەکاتە ئیسلام وە خودا دەفەرموێت (**و لله المشرق و المغرب** ) هەموو لایەك هەر هی خودایە و خودا خۆی دەزانێت خەڵکی بۆچی لایەك ئاڕاستە دەکات . وەڵامی ئەو گومانە لێرەدایە کە سفیهەکان ئەقڵیان پێی ناشکێت !؟ کاتێك ئاینی ئیسلام بۆ یەکەم جار بڵاوبووەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەکە بۆ ئەگەر ڕویان بکردایەتە کەعبە پڕ بوو لە بت ئەو کات هەڵوێستی ئیسلام لاواز دەبوو چونکە بت پەرستەکانیش ڕویان دەکردە کعبە وە ئاینی ئیسلام لە بت پەرستی جودا نەدەکرایەوە و خەڵك دەیان گوت فەرق بت پەرستی و ئیسلام چییە ؟ هەردووکیان بۆ بتەکانی ناو کەعبە نوێژ دەکەن و ڕوی تێ دەکە ن وە کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیجرەی کرد بۆ مەدینە عەرەبی هۆزی اوس و خزرجی لێ بوو ئەوانیش بت پەرست بوون و ڕێژی زۆری جولەکەیان دەگرت چونکە اهلی کتاب بوون . ئەگەر لە سەرەتای هیجرەدا قیبلە بگۆڕرایە هەمان کێشە دروست دەبووەوە اوس و خزرج نەیان دەزانی ئاینی ئیسلام چییە ؟ بەڵام پاش دوو ساڵ کە خەڵکی زانییان ئاینی ئیسلام چییە وە قیبلە گۆڕرا ئاسای بوو لە لایان چونکە زانییان جولەکە چیە و ئاینی تازە چییە و جیاوازیی نێوانیان زانی بۆیە دەبینین هەر هەمان ئایەت دەفەرموێت( **و كذلك جعلناكم امة وسطا لتكونوا شهداء على الناس** ). ئێستا جولەکە و اوس و خزرجیش دەزانن ئیسلام چییە ؟ بۆیە هەڵبژاردن لای خۆیانە و دەبێت لایەکیان هەڵ بژێرن لەم ناوەندەدا . ئینجا دێتە سەر باسی گومانی سفیهەکان کە تا ئێرەیان بڕیووە و گومانەکەیان دروست کردووە کە کرۆکی ئەم نوسینەیە و لە سەرەتادا بۆمان نوسیوون . وە ئێستا خوێنەر تێ دەگات کێ شوێن ئیسلام دەکەوێت و کێ پشتی تێ دەکات و بۆچی ئەو تاقی کردنەوەیە ڕووی دا لە مەدینە ؟ با بزانین خەڵکەکە چۆن ئەو هەواڵەیان وەر گرتووە ؟ ئەمەش لە دوای بڕینی کابرای سفیهە هەر ئایەتەکە خۆی دەفەرموێت : (**و ان كانت لكبيرة الا على الذين هدى الله** )باسی ئەو کەسانە دەکەن کە خودا هیدایەتی داون و باوەڕیان بە اسلام هەیە ئەمە بە کارێکی گەورە و مەزن دا دەنێن و دەبێت شوێنی بکەون بەڵام جولەکە و

مونافیقەکان دەیان گوت ئەم ئاینە تازەیە چییە هەر ڕۆژە و ڕوو لە شوێنێك دەکات ؟ موشریکەکان دەیان گوت ئاینی محمد (صلی الله علیه وسلم) گەڕاوەتەوە سەر ئەسڵی باو باپیرانی و ڕویان کردوەتەوە مەکە وە زۆر قسە و باسی تریش وە لەم نێوانەدا ئیمانداری ڕاست و دروست دەر دەکەوێت وە دەزانن کێ شوێن خودا کەوتووە و کێ ئیمانی لاوازە و ئەم ئاینە جێ دەهێڵێت ؟ وە مەبەستەکە ئێستا ڕوونە و ئەو گومانە پوچەڵ کرایەوە کە سفیهەکان لە کۆن و ئێستادا دەی وروژێنن . چونکە خودا خۆی دەزانێت پاش چەند ساڵێکی تر بتەکانی مەکە تێك دەشکێنرێت وە ماڵی خودا هەتا ئاخر زەمان پاك دەکرێتەوە لە بت وە جولەکەش بەرەو کەمی و نەمان دەچن بەڵام منافق و سفیهەکان هەتا ڕۆژی حەشر دەمێنن و گومان بڵاو دەکەنەوە و بە ئیزنی خودا خەڵکانی ئیمان داریش لە کۆن و نوێدا هەر هەن و دەنێن بۆ ئەوەی گومانی ئەو سفیهانە پوچەڵ بکەنەوە پاشان ئایەتی ١٤٣ ی دوای ئەو دەفەرموێت ئەهلی کتاب دەزانن ئەو قیبلە گۆڕینە حەقە و لە لای خودا وەیە . بۆ زانینی ئەو ڕاستیەش دەبێت بچین بۆ ئینجیلی **یوحنا** بەشی ٤ باسی ئەوە دەکات مسیح (ع) لە یهودیاوە دەڕوات بەرەو جلیل وە لە ڕێگا تینوی دەبێت لای بیری یعقوب (ع) کە داوێتی بە سامریەکان داوای ئاو لە ژنێکی سامری دەکات وە ژنەکە دەزانێت ئەو جولەکەیە لای سەیرە داوای ئاوی لێ دەکات !؟ پاشان ژنەکە بۆی دەر دەکەوێت ئەمە پێغەمبەرە . لە دەق ٢٠ دا پرسیاری لێ دەکات و دەڵێت باوکانمان ڕویان کردوەتە ئەم شاخە نوێژ یان کردووە بەڵام ئێوەی جولەکە دەڵێن ڕوو بکەنە بیت المقدس ( اورشلیم) مەسیحیش (ع) وەڵامی دەداتەوە دەڵێت : ڕۆژێك دا دێت بۆ نوێژ کردن ڕو ناکەنە ئەم شاخە و ئورشەلیم وە ئەمە بەڵگەی حاشا هەڵ نەگرە کە ئەو قیبلەیەی بیت المقدس دەگۆڕێت بە مەکە ، بۆ زانیاریی زیاتر کلیکی ئەم لینکە بکەن و گۆڕینی قیبلە لە دەق ٢٠ و ٢١ دا نوسراوە لە زاری مەسیحەو (ع)

http://www.kitebipiroz.com/bible/jhn/4

..................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » یۆحەنا » بەشی ٤

20 باوکانمان لەسەر ئەم شاخە پەرستنیان کردووە، بەڵام ئێوە دەڵێن ئۆرشەلیم[d] ئەو شوێنەیە کە پێویستە پەرستنی لێ بکرێت.)

21 عیسا پێی فەرموو: (خانم، باوەڕم پێ بکە، کاتی دێت ئێوە نە لەسەر ئەم شاخە و نە لە ئۆرشەلیم باوکەکە[e] دەپەرستن.

......................................

بۆ ئەوەی بابەتەکە دوور و درێژ نەبێت دەڵێین باسی گۆڕینی قیبلە لە سورەتی **البقرەدا** ٩ ئایەتە لە ١٤٢ هەتا ١٥٠ یە . بەڵام دژە ئیسلام دێت بەس بەشێکی ئایەتی ١٤٣ وەر دەگرێت وە بەو شێوەیە شیکاریی بۆ دەکات کە منافقەکان کاتی خۆی لە مەدینە گومانیان لێ دروست دەکرد بەڵام پاش ١٤٠٠ ساڵ حیکمەت و جوانیی ووشەی ( السفهاء ) مان جارێکی تر بۆ ڕوون دەبێتەوە چونکە خەڵکانی سفیە بەس لایەك دەبینن و شیکاریی بۆ دەکەن و بێ ئاگان لەوەی ١٤٠٠ ساڵ لەمەو بەر ئاینەکە تازە بووە و گۆڕینی قیبلە باس و خواستی زۆری لە خۆی گرتووە و خەڵکیش لە هەموو ڕوداوێکدا ڕای جیاوازیان هەیە و دەبن بە چەند بەش و گروپ و

لایەنێکەوە . وە لە هەموو ڕوداوێکدا ڕوو دەدات لایەن گران و دژی لێ پیدا دەبێت ئیتر گرنگ نیە ڕوداوەکە چییە ؟ ئاینییە یان سیاسییە یان خێزانییە یان ... هتد . وە هەموو ڕوداوێکیش لای مرۆڤەکانە خۆیان دەتوانن باشی بکەن یان بەرەو خراپی بەرن خودای باڵا دەستیش مرۆڤی ئازاد کردوە خۆی بڕیارەکان وەر بگرێت وە پاش هێمن بونەوەی ڕوداوەکان لە لای خودا و لای خەڵکیش دەر دەکەوێت کێ دڵسۆزە و کێ پشتی لەو لایەنە کردووە .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : کاکی سفیە پاش ١٤٠٠ ساڵ وروژاندنی ئەم گومانە چی سودێکی بۆ تۆ دەبێت ؟ لە کاتێکدا لە سەرەتای ئیسلامدا و لە یەکەم ڕۆژی گۆڕینی قیبلەدا نە توانرا ئەم ئاینە مەزنە پوچەڵ بکرێتەوە . ئێستا پاش ١٤٠٠ ساڵ تۆ دەتەوێت ئاینی ئیسلامی مەزن پوچەڵ بکەیتەوە ؟ بە ڕاستی بلاغە و وەسفی قورئان لە بن نایەت و ئەم ئایەتە : (**سيقول السفهاء من الناس ما ولاهم عن قبلتهم التي كانوا عليها**) دەڵێی ئێستا دابەزیووە ؟ و خەڵکی سفیهیش هەتا ئاخر زەمان دەمێنێت کە بە بێ لێك دانەو و شارەزایی ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگرێت

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و سی وهەشت

## قورئان بە عەرەبییە بۆ ئەوەی ئاقڵ بن ؟

وشەی تعقلون 24 جار لە قورئاندا هاتووە

Search: تعقلون | page 1 of 2 | 24 results in 24

1. أتأمرون الناس بالبر وتنسون أنفسكم وأنتم تتلون الكتاب أفلا تعقلون ﴿البقرة: ٤٤﴾
2. فقلنا اضربوه ببعضها كذلك يحيي الله الموتى ويريكم آياته لعلكم تعقلون ﴿البقرة: ٧٣﴾
3. وإذا لقوا الذين آمنوا قالوا آمنا وإذا خلا بعضهم إلى بعض قالوا أتحدثونهم بما فتح الله عليكم ليحاجوكم به عند ربكم أفلا تعقلون ﴿البقرة: ٧٦﴾
4. كذلك يبين الله لكم آياته لعلكم تعقلون ﴿البقرة: ٢٤٢﴾
5. يا أهل الكتاب لم تحاجون في إبراهيم وما أنزلت التوراة والإنجيل إلا من بعده أفلا تعقلون ﴿آل عمران: ٦٥﴾
6. يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا بطانة من دونكم لا يألونكم خبالا ودوا ما عنتم قد بدت البغضاء من أفواههم وما تخفي صدورهم أكبر قد بينا لكم الآيات إن كنتم تعقلون ﴿آل عمران: ١١٨﴾

وشەی یعقلون 22 جار لە قورئاندا هاتوە

arch: يعقلون | page 1 of 2 | 22 results in 22

1. إن في خلق السماوات والأرض واختلاف الليل والنهار والفلك التي تجري في البحر بما ينفع الناس وما أنزل الله من السماء من ماء فأحيا به الأرض بعد موتها وبث فيها من كل دابة وتصريف الرياح والسحاب المسخر بين السماء والأرض لآيات لقوم يعقلون ﴿البقرة: ١٦٤﴾
2. وإذا قيل لهم اتبعوا ما أنزل الله قالوا بل نتبع ما ألفينا عليه آباءنا أولو كان آباؤهم لا يعقلون شيئا ولا يهتدون ﴿البقرة: ١٧٠﴾
3. ومثل الذين كفروا كمثل الذي ينعق بما لا يسمع إلا دعاء ونداء صم بكم عمي فهم لا يعقلون ﴿البقرة: ١٧١﴾
4. وإذا ناديتم إلى الصلاة اتخذوها هزوا ولعبا ذلك بأنهم قوم لا يعقلون ﴿المائدة: ٥٨﴾
5. ما جعل الله من بحيرة ولا سائبة ولا وصيلة ولا حام ولكن الذين كفروا يفترون على الله الكذب وأكثرهم لا يعقلون ﴿المائدة: ١٠٣﴾

ئەگەر بتانەوێت ئاستی تێگەیشتن و بیر کردنەوە و زانیاریی دژە ئیسلامەکان بزانن وە بۆ تا هەتایە پێیان پێ بکەنن . ئەم جارەیان باسی گومانیك دەکەین کە دەبێت بە پێوەر بۆ ئاستی نەزانی و تێ نە گەیشتنی دژە ئیسلامەکان ئەویش ئایەتی ٢ ی سورەتی **یوسفە** دەفەرموێت : **(انا انزلناه قرانا عربیا لعلکم تعقلون)** .

دژە ئیسلام ڕاڤەی دەکەن و دەڵێن محمد (صلی الله علیه وسلم) یان خودا لەم ئایەتەدا دەڵێت ئێمە قورئانمان بە عربی دابەزاندووە بۆ ئەوەی ئاقڵ بن . وە جاران عەرەب بێ ئەقڵ بوون وە هەر کەسێکیش شوێن ئەم قورئانە بکەوێت بێ ئەقڵە

با دەست پێکمان بۆ وەڵامی ئەم گومانە لە ووشەی عقڵەوە بێت چونکە کاتێك بە زمانی کوردی یان هەر زمانێکی تر دەڵێین ئەقڵ هیچ مانایەك نابەخشێت ؟ چونکە ئەم ووشەیە عەرەبییە ئێمە بەکاری دەهێنین بۆیە دەبێت بە گوێرەی سەرچاوە عەرەبیەکە بزانین عقل مانای چییە ؟لە زمانی عەرەبیدا هەموو وشەیەك سەرچاوەی هەیە و لەسەر وەزنی ( فعل ) وە وشەی عقل عقل لە خۆی سەرچاوەیە و ( یعقل و عقال و معقل و معقول و ... هتد ) لە عقلەوە سەرچاوەیان وەر گرتووە با بزانین عقل مانای چییە ؟عقل بە مانای بەربەست و حبس کردن دێت وە بۆیە بە ئینسان دەڵێن عقلی هەیە چونکە دەی بەستێتەوە و ڕێگریی لێ دەکات کە بکەوێتە تاوانەوە . هەروەها پێشی دەڵێن ( حجر ) واتا سجن کردن چونکە سجنی دەکات و دەستی بەسەردا دەگرێت بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەڵەوە . هەروەها پێی دەڵێن ( نهیة ) واتا نهی لێ دەکات شتی خراپ بکات وە پێێ دەڵێن ( معقل ) واتا پەنای بۆ دەبات بۆ هەموو کارەکانی کاتێك دەڵێن فلان عاقلە واتا ڕا و بۆچونە کانی کۆ دەکاتەوە ئینجا قسە دەکات یان بڕیار دەدات . لە کوردەواریی خۆشماندا دەڵێن قسە بجووە ئینجا بیکە . هەروەها کاتێك ضوار پەلی ئاژەڵێك دەبەسترێتەوە بۆ ئەوەی سەر ببڕێت دەڵێن یعقل البعیر یان الشاة یان ... هتد.

کابرای عاقلیش قسەکانی یان کار و بارەکانی و باش و خراپەکان پێکەوە دەبستێتەوە ئینجا قسە دەکات یان ئەو کارە دەکات واتا هەڵەشە نییە و پاش بیر کردنەوە و تێگەیشتن ئینجا بڕیار دەدات یان قسە دەکات کاتێکیش دەڵێین ( معقول یان ئەو شتە معقولە ؟ ) واتا ئەو بابەتانە پێکەوە نا بەسترێتەوە و گرێ نادرێت و پەیوەندییان بە یەکەوە نیە بۆیە لامان نا معقولە و باوەڕی پێ ناکەین چونکە هەر چۆنێك بیری لێ بکەینەوە ئەو بابەتانە یەك ناگرنەوە یان ڕاست نین بۆیە لامان معقول نییە !؟ بە هەر حاڵ وشەی عقل واتا بەستنەوە و هەر کەسێکیش بابەتەکان یان قسەکان یان هەڵس و کەوتەکان پێکەوە ببەسێتەوە پێی دەڵێن عاقل چونکە لە شتەکان تێ گەیشتوە و ڕوداوەکانی پێکەوە بەستوەتەوە .

پاش ئەوەی مانای ( عقل ) مان زانی چییە با ئێستا بێینە سەر باسی تعقلون کە لەسەر وەزنی ( تفعلون ) واتا شتێك بکەن وە ( فعل و تفعلون ) کردارە و عامە بەڵام بە گوێرەی وشەکە کردارەکە دەگۆڕێت بۆیە لە زمانی عەرەبیدا هەموو وشەکان ئەسڵ و تصریفیان هەیە وە لێرەدا وشەی ( عقل و تعقلون ) بە واتای لێك دانەوە و تێگەیشتن و بەراورد کردن دێت . وە ئایا بیر کردنەوە و بەراورد کردن

کاری مرۆڤی ئاقڵە یان نەزانە ؟ ئایا کەسانی خاوەن هزر کە ڕوداوەکان پێکەوە گرێ دەدات کەسانێکی بێ ئەقڵن یان کەسانێکی ئاقڵ و خاوەن ڕێزن ؟بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان هەر خودی قورئان خۆیەتی .

ووشەی ( تعقلون ) ..(٢٤)جار لە قورئاندا ناوی هاتووە .

هەروەها ( يعقلون ) ...(٢٢) جار ناوی هاتووە کۆی هەردووکیان دەکاتە (٤٦) جار .

هەمووتان قورئان تان لەبەر دستدایە بە انترنێت یان بە کتێب فەرموون هەمو ئەو (٤٦ )جارە سەیر بکەن بزانن بۆ بەراورد کردنی دوو شت هاتووە یان نا ؟ بۆ ئەوە هاتووە کە مرۆڤ بیر بکاتەوە و باش و خراپ لێك جودا بکاتەوە و خۆی باشەکە هەڵ بژێرێت یان نا ؟ من بە یەك نمونەیان کۆتای بەم باسە دەهێنم خۆشتان بە دوای ٤٥ دانەکەی تردا بگەڕێن.

مادام دژە ئیسلامەکان ڕەخنەیان لە ئایەتی دووی ( تعقلون ) ی سورەتی **یوسفە** . هەر هەمان سورەتیان بۆ باس دەکەم ئایەتی ١٠٩ دەفەرموێت : ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەو پێغەمبەرانەی پێش یۆ ناردومانن هەر هەموویان پیاو بوون واتا مەلایکەت و جن نە بوون و خەڵکی ئاسایی بوون چونکە قورەیشیەکان دەیان گوت دەبێت پێغەمبەر مەلایکەت بێت یان مەلایکەتی لەگەڵدا بێت یان دەیان گوت چۆن دەبێت پێغەمبەر وەك مرۆڤی ئاسایی بێت یان ... هتد ،

پاشان دەفەرموێت ئەی ئەمانە خۆیان ناگەڕێن و سەفەر ناکەن بۆ بازرگانی و ئایا نا بیستن و نازانن لەو شوێنانەی بۆی دەچن بەسەرهاتی ئومەتەکانی پێش خۆیان نابیستن چییان لێ هاتووە و چییان بەسەر هاتووە ؟ ئایا هەڵ بژاردنی دنیایەکی ئەبەدیی تا هەتایی باشتر نییە ؟واتا کاتێك ئەوان سەفەر دەکەن و هەواڵی کافرانی پێش خۆیان دزانن بۆچی باوەڕ ناهێنن و ژیانێکی تا هەتای بۆ خۆیان هەڵ بژێرن ؟ وە لە کۆتایدا دەفەرموێت ( **افلا تعقلون** ) ؟

کاکی دژە ئیسلام ئەو (افلا تعقلون) مان بە ( ئاقڵ بن ) بۆ ڕاڤە دەکات . لە کاتێکدا دەقی ئایەتەکە باس لەوە دەکات بیر بکەنەوە و هەڵ بژێرن کامیان باشترە ؟ وە هەموو ( ٤٥ )دەقەکەی تریش بە هەمان شێوەیە باس لەوە دەکات خەڵکی بیر بکەنەوە و لە شتەکان تێ بگەن وە بزانن کامەیان باشە و باشەکەیان هەڵ بژێرن . نەك وەك دژە ئیسلام کە دەڵێت ئاقڵ بن یان کەرن یان نەزانن .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە**: کاکی دژە ئیسلام تۆ کەی ئاقڵ دەبیت ؟ وە بە نەزانی و گەمژەیی خۆت ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگریت ؟ لە کاتێکدا توانای بیر کردنەوە و گەڕانت نییە بزانیت تعقلون مانای چییە و چەند جار هاتووە لە قورئاندا ؟

**کۆتا پرسیاریشمان ئەمەیە** : فەرموو بە زمانی عەرەبی و بە گوێرەی سەرچاوە عەرەبییەکان بۆمان بسەلمێنە ( تعقلون ) واتا ئاقڵ بن بۆ کار ئاسانیش فەرموو ئەمە ( ٦) معجمی مەزنی عەرەبی بە سەرچاوە پێمان بڵێ تعقلون واتا ئاقڵ بن یان کەرن یان نە زانن !؟

http://www.baheth.info/index.jsp

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :سەد و سی ونۆ

## ئایا ئیسلام هاتوه بۆ کەنیزه و تێرکردنی ناو گەڵ

وربٰاع فإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة أو ما ملكت أيمانكم ذلك أدنى ألا تعولوا ﴿النساء: ٣﴾

والمحصنات من النساء إلا ما ملكت أيمانكم كتاب الله عليكم ﴿النساء: ٢٤﴾

3. ومن لم يستطع منكم طولا أن ينكح المحصنات المؤمنات فمن ما ملكت أيمانكم من فتياتكم المؤمنات ﴿النساء: ٢٥﴾

والمساكين والجار ذي القربى والجار الجنب والصاحب بالجنب وابن السبيل وما ملكت أيمانكم إن الله لا يحب من كان مختالا فخورا ﴿النساء: ٣٦﴾

5. والله فضل بعضكم على بعض في الرزق فما الذين فضلوا برادي رزقهم على ما ملكت أيمانهم فهم فيه سواء أفبنعمة الله يجحدون ﴿النحل: ٧١﴾

6. إلا على أزواجهم أو ما ملكت أيمانهم فإنهم غير ملومين ﴿المؤمنون: ٦﴾

أو ما ملكت أيمانهن أو التابعين غير أولي الإربة من الرجال ﴿النور: ٣١﴾

8. وليستعفف الذين لا يجدون نكاحا حتى يغنيهم الله من فضله والذين يبتغون الكتاب مما ملكت أيمانكم فكاتبوهم إن علمتم فيهم خيرا ﴿النور: ٣٣﴾

9. يا أيها الذين آمنوا ليستأذنكم الذين ملكت أيمانكم ﴿النور: ٥٨﴾

ضرب لكم مثلا من أنفسكم هل لكم من ما ملكت أيمانكم من شركاء ﴿الروم: ٢٨﴾

يا أيها النبي إنا أحللنا لك أزواجك اللاتي آتيت أجورهن وما ملكت يمينك وما ملكت أيمانهم لكيلا يكون عليك حرج وكان الله غفورا رحيما ﴿الأحزاب: ٥٠﴾

13. لا يحل لك النساء من بعد ولا أن تبدل بهن من أزواج ولو أعجبك حسنهن إلا ما ملكت يمينك وكان الله على كل شيء رقيبا ﴿الأحزاب: ٥٢﴾

14. لا جناح عليهن في آبائهن ولا أبنائهن ولا إخوانهن ولا أبناء إخوانهن ولا أبناء أخواتهن ولا نسائهن ولا ما ملكت أيمانهن واتقين الله إن الله كان على كل شيء شهيدا ﴿الأحزاب: ٥٥﴾

15. إلا على أزواجهم أو ما ملكت أيمانهم فإنهم غير ملومين ﴿المعارج: ٣٠﴾



دژه ئیسلامەکان شەو ڕۆژ ڕەخنه له ئاینی مەزنی ئیسلام دەگه رن و دەڵێن ئاینێکه هەوڵ دەدات بۆ تێر کردنی ناو گەڵی پیاوان و خەریکی گرتنی ئافرەت و کەنیزه و ملك اليمين بوون بۆ ئەوەی جنسیان لەگەڵدا بکەن وه بەڵگەشیان ١٤ ئایەته باسی ملكات اليمين دەکات . ئایەتەکانمان له وێنەکەدا بۆ داناون وشەی **ملك اليمين** واتا عەبد یان کۆیله بۆ ژن و پیاو بەکار دەهێنرێت واتا بەس بۆ ژن بەکار ناهێنرێت وەك دژه ئیسلامەکان ڕاڤەی دەکەن . بەڵگەشمان ئایەتی ٣١ ی سورەتی **النوره** باسی ئەوه دەکات ئافرەت چۆن خۆی داپۆشێت وه نوسراوه ( او ما ملكت ايمانهن ) وه ملك اليمين پێش ئیسلام هەبووه لەناو عەرەبیش و هەمو قەومەکانی تریشدا بەڵام ئیسلام هات بنه بڕی کرد نەك بیکات به یاسایەك !! چونکه پێش ئیسلام له زۆر ڕێگاوه خەڵکی دەکران به کۆیله و ملك اليمين وەك له کاتی شەڕدا یان لەبری قەرز کابرا منداڵێکی یان خۆی یان خێزانەکەی دەبوون به کۆیلەی خاوەن قەرزەکه یان سەفەری دەکرد له ڕێگا دەگیرا به کۆیله وه زۆر شێوەی تریش هەبوو . بەلام ئیسلام هات ئەم کۆیلایەتیەی نەهێشت و بەس ئەوانەی له جەنگدا دەگیران دەکران به کۆیله پیاوەکان دەکران به ئەسیر و پاشان به گوێرەی ڕێك کەوتنی نێوان هەردوك سوپا ئەو ئەسیرانه مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا وه ئەو ئافرەتانەی که لەگەڵ سوپاکەدا بوون ئەوانەش کراون به ملك اليمين . وه ئافرەته شەڕکەرەکانیش ئەوەی له شەڕدا نه کوژرابێت کراون به ملك اليمين . له یەکێك له غزوەکاندا بینییان خەڵك کۆ بونەتەوه پێغەمبەر (د.خ) کەسێکی نارد بزانێت چی ڕوی داوه ؟ کەسەکه هاتەوه گوتی کۆ بونەتەوه له ئافرەتێك کوژراوه . پێغەمبەر (د.خ) کەسەکەی ناردەوه بۆ لای

قەرەباڵەخیەکە و فەرمانی دا بە خالدی کوڕی ولید : (لا يقتلن امرأة ولا عسيفا ( عسيفا )) واتا ئەو ژنانە مەکوژن کە شەڕکەر نین و لەناو سوپاکەدان بۆ خزمەت گوزاری ئەو ئافرەتانە کراون بە ملك اليمين و جارية کە لە سوپادا کاریان کردوە یان شەڕکەر بون . واتا هەر ئافرەتێك لەگەڵ سوپادا نە بو بێت نەکراوە بە جارية یان کەنیزە یان ملك اليمين . بەڵگەشمان فتوحاتی ئیسلامییە سوپای ئیسلامی لە هیچ کام لە شارە کانی فتحیان دەکرد کچ و ژنیان نە بردووە لە دەوڵەتی فارس و عیراق و شام و میسر و مغرب . هەر کەس دەڵێت ئافرەتیان لە ناو شارەکان بردووە با بەڵگە بهێنێت ناوی شەڕەکە و شارەکە و ساڵەکەیمان بۆ بنوسێت و ئەمەش **پرسیارێکی بێ وەڵامە** ؟

ئەو ١٤ ئایەتەی باسی ملكات اليمين دەکات پێش فتوحاتی ئیسلامی دابەزیوە و ئەو کاتە کۆیلە زۆر بووە لە دورگەی عەرەبی وە خەڵکانێکی زۆریش بوون بە موسوڵمان کۆیلەیان هەبووە و پارەیان پێداوە و کڕیو یانە ئەو ئایەتانە حوکمی ئەو کۆیلانە ڕون دەکاتەوە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت چۆن ڕزگار بکرێن لە کۆیلایەتی وە ئەو دوو ئایەتەی دژە ئیسلامەکان کردویانە بە بەڵگە بەسەر کۆیلایەتیی ئافرەتەوە ئایەتی ٢٤ و ٢٥ ی سورەتی (**النساء**)ە کە دەفەرموێت **( اتوهن اجورهن )** ئەوان ڕاڤەی دەکەن و دەڵێن لەگەڵ ئافرەتە کۆیلەکاندا سیکس و سەر جێیان لەگەڵدا بکەن و پارەیان بدەنێ لە بەرامبەردا بەڵام ئەو دوو ئایەتە مانای ئەوەیە مارەیان بکەن بۆ ئەوەی لە کۆیلایەتی ڕزگاریان ببێت و بن بە دایکی منداڵەکانتان . بەڵگەشمان بۆ ئەو قسەیە سورەتی **المائدة** ٥ و **الاحزاب** ٥٠ و **الممتحنة** ١٠ لە هەر( ٣) ئایەتەکەدا باسی ئەوە دەکات ژن هێنان دەبێت مارەیی بدرێتێ و نوسراوە **(اتيت يان اتيتمهن اجورهن)** . ئایا لە ئاینی ئیسلام دا یان لە هیچ ئاینێکی تردا پیاو سەر جێی لەگەڵ خێزانەکەیدا دەکات و پارەی بداتێ ؟

بەم شێوەیە دژە ئیسلامەکان لە نەزانییان یان بە عمدی یاری بە ئایەتەکان دەکەن چونکە ئایەتەکان دەڵێن مارەییان بدەنێ و ببێت بە ژنتان بە ڕەسمی و لە کۆتی کۆیلایەتی دەریان بکەن . نەك سیکسیان لەگەڵ بکەن و لە بەرامبەردا پارەیان بدرێتێ !! هەر کەس وا دەڵێت با بەڵگەمان بۆ بهێنێت لە فقهی ئیسلامدا کە مرۆڤ بەرامبەر بە پارە سیکس لەگەڵ کۆیلەدا دەکات لە ئاینی مەزنی ئیسلامدا ؟ بۆیە دواکارم هیچ دژە ئیسلامێك ئەو (١٤) ئایەتەمان بۆ دا نەنێت بە بەڵگە بۆ کۆیلایەتیی ئافرەت بۆ سیکس

وە هەر کەس دای دەنێت با بزانێت مانای چییە و چی کێشەیەکی کۆیلە چارەسەر دەکات ؟ ئەو کات بە جوانی تێ دەگات ئەو ئایەتانە بۆ بنە بڕکردنی کۆیلایەتییە نەك هان دان بێت بۆ کۆیلایەتی و ئاینی ئیسلامی مەزن هەوڵ بدات بۆ ناو گەڵ . بەڵکو دژە دینەکان هەوڵ دەدەن بۆ ناو گەڵیان لە ڕێگای فلیم و گۆڤارە سیکسیەکانەوە .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمانەیە:** با وای دا بنێین ئێستا ئاینی ئیسلام زۆر بە هێزە و خیلافەی ئیسلامی هەیە و ئەوروپایان فتح کردووە . ئایا سوپای ئیسلام هەموو کچ و ژنەکانی ئەوروپا دەکات بە کەنیزە بۆ ئەوەی سواریان بێت و یأتیهن اجورهن وە پاش هەموو سەر جێیەك بڕێك پارەیان دەداتێ ؟ ئەگەر وەڵامتان بە بەڵێیە : بێزەحمەت پێمان بڵێن چی ئایەتێك یان چی حەدیسێك هەیە بڵێت ئافرەتەکان ببەن بە کەنیزەك ؟ حەدیسی زەعیفیشمان قبوڵە . ئەگەر هەموو ئافرەتەکان نابات بە کەنیزە ئەی کام ئافرەتانە دەبەن

بە کەنیزە ؟ بێزەحمەت ئەوەشمان بۆ بنوسن بە بەڵگەوە ؟ ئەو ١٤ ئایەتە ش هیچیان بەڵگە نین بۆ گرتنی کۆیلەی ئافرەت بەڵکو بەڵگەن بۆ ڕزگار کردنیان و چۆنێتیی مامەڵە کردن لەگەڵیاندا . و تحدای هەموو مێژوو و مێژونوسان دەکەم یە ك بەڵگەمان بۆ بهێنێت سوپای ئیسلامی لە کاتی فتوحاتدا ژن و کچانی شارێك یان گوندێك یان وڵاتێکیان برد بێت . هەرکەسیش دەڵێت بەڵێ برراوە با بەڵگەمان بۆ بهێنێت لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە نەك قسەی گیرفان .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل

## مائة الف او يزيدون چەندە ؟

عذرا أو نذرا ﴿المرسلات: ٦﴾

فقولا له قولا لينا لعله يتذكر أو يخشى ﴿طه: ٤٤﴾

فاصبر لحكم ربك ولا تطع منهم آثما أو كفورا ﴿الانسان: ٢٤﴾

وكذلك أنزلناه قرآنا عربيا وصرفنا فيه من الوعيد لعلهم يتقون أو يحدث لهم ذكرا ﴿طه: ١١٣﴾

وعلى الذين هادوا حرمنا كل ذي ظفر ومن البقر والغنم حرمنا عليهم شحومهما إلا ما حملت ظهورهما أو الحوايا أو ما اختلط بعظم ذلك جزيناهم ببغيهم وإنا لصادقون ﴿الأنعام: ١٤٦﴾

ثم قست قلوبكم من بعد ذلك فهي كالحجارة أو أشد قسوة ﴿البقرة: ٧٤﴾

فإذا قضيتم مناسككم فاذكروا اللـه كذكركم آباءكم أو أشد ذكرا ﴿البقرة: ٢٠٠﴾



پرسیارە بێ وەڵامەکان
بۆ هەموو دژە
ئیسلامەکان









دژە ئیسلام ڕەخنە لە ئایەتی ١٤٧ ی سورەتی **الصافات** دەگرێت و دەڵێت چۆن خودا نازانێت یونسی بۆ چەند کەس ناردووە ؟ چونکە نوسراوە ( **و ارسلناه الى مائة الف او يزيدون** ) بە حسابی ئەوان واتا ناردونی بۆ قەومێك (١٠٠) هەزار یان زیاتر بوون . وێنەی ڕەخنەکەی ئەوانیشمان لە وێنەکەدا بۆ داناوە .

بۆ وەڵامی ئەم گومانەش لە پێشدا با بزانین ( او ) مانای چییە ؟

بۆ ئەوەی ئاستی نەزانی و نە شارەزایی خۆیان دەر بخەین لە بوای زمانی عەرەبیدا با بزانین ( او ) مانا ی چییە ؟ ووشەی ( او ) بە مانای ( یان ) نایەت وە بە چەند مانایەك دێت لەوانە مانای گومان دێت : دەڵێن جاء عمر او زید واتا عەمر یان زەید هات . یان دەڵێن (تعال الیوم او غدا )واتا یان بەیانی یان دوو بەیانی وەرە هەروەها بە مانای ( وە ) یان ( لەگەڵ ) دێت لە شیعری عەرەبیدا

**توبة بن الحمیر دەڵێت : وقد زعمت لیلی بأني فاجر لنفسي تقاها ( أو ) علیها فجورها .**

واتا وە فجورەکەشی نەك یان فجورەکەی

**أبي الأسود الدؤلي لە شیعرێکیدا دەڵێت : أُحب محمّداً حباً شدیداً وعباساً وحمزة أو علیا.**

**جریر کاتێك مەدحی خەلیفە عمر بن عبد العزیز دەکات دەڵێت : نال الخلافة أو کانت لە قدرا کما أتی ربە موسی علی قدر.**

کەواتە دەبێت بزانین کەی بە مانای یان دێت وە کەی بە مانای ( وە ) دێت ؟ چونکە بە گوێرەی ڕستەکە مانای ( او ) دەگۆڕێت !؟

هەروەها لە قورئاندا لە زۆر شوێندا ( او ) هاتوە واتا ( وە ) نەك ( یان ) لێرەدا (٥) دانەیان دەخەینە ڕو دەق ئایەتەکانیشمان لە وێنەکەدا داناوە

لە ئایەتی ٦ ی **المرسلاتدا** باسی ناردنی فریشتە دەکات بۆ لای پێغەمبەران (ع) وە دەفەرموێت **( عذرا او نذرا )** واتا دەیان نێرین بۆ ئەوەی ( بەڵگە و ئاگاداریان ) پێ بدات بەگوێرەی ڕاڤەی دژە ئیسلام بێت بە مانای ( بەڵگە یان ئاگاداری ) دێت

لە ئایەتی ٤٤ ی سورەتی **طه** دەفەرموێت ( **لعله یتذکر او یخشی** ) کاتێك خودا موسا (ع) دەنێرێت بۆ لای فیرعەون پێیان دەڵێت قسەی نەرمی لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی ( بیری بکەوێتەوە و بترسێت ) . ڕاڤەی دژە ئیسلام دەڵێت ( بیری بکەوێتەوە یان بترسێت )

لە سورەتی **الانسان** ٢٤ دا دەفەرموێت ( **اثما او کفورا** ) واتا گوێ ڕایەڵی ( **تاوان بار و کافر** ) مەبە . ڕاڤەی دژە ئیسلام دەڵێت ( تاوان بار یان کافر )

لە ئایەتی ١١٣ ی سورەتی **طه** دەفەرموێت ( **لعلهم یتقون او یحدث لهم ذکرا** ) باسی قورئان دەکات دەبێتە هۆی ئەوەی تەقوای خودایان هەبێت و ببێت بە باسێك بۆیان

لە سورەتی **الانعام** ١٤٦ دا دەفەرموێت ( **الا ما حملت ظهورهما او الحوایا** ) باسی چەوری دەکات لە بنو اسرائیل حەرام کراوە کە بە سەر پشتەوەیە واتا پشتە مەغزەکە و ڕیخۆڵەوە

......

وەك بینیتان ( او ) بە مانای ( وە ) هەروەها ( بەڵكو ) دێت .

ئەو ئایەتەش دەفەرموێت (و ارسلناه الى مائة الف او یزیدون )واتا ناردمانن بۆ سەد هەزار و زیاتر یان سەد هەزار بەڵكو زیاتریش نەك وەك دژە ئیسلام هیچ لە زمانی عەرەبی نازانێت وە بە ئارەزوی خۆی ڕاڤەی دەكات و دەڵێت سەد هەزار یان زیاتر . وە لە هەمووی گرنگ تر ئەوەیە كە دژە ئیسلام شارەزای قورئان نییە چونكە قورئان بە هیچ شێوەیەك گوێی نەداوەتە ژمارە و ژمێریاری یان سەر ژمێری لە هیچ بوارێكی قورئاندا سەرژمێری و ژمارە گرنگ نییە

هەروەها ( او ) بە مانای ( بل ) دێت لە زمانی عەرەبیدا ئەویش هەر بە مانای ( وە ) دێت لە كوردیدا بەڵام ( بل ) دڵنیا كردنەوەی بۆ ئەو شتە . چۆن لە زمانی كوردیدا بڵێین تۆ ئەو شتەیت و زیاتریش یان ئەو شتەیت و ئەولا تریش ئەمەش بەكار دەهێنرێت بۆ ئەوەی بەرامبەر دڵنیا بكەیتەوە كە ئەو شتە بە دڵناییەوە وایە

نموونە زۆرن لە ئایاتی قورئان بۆ ( بل ) كە دڵنیا كردنەوەیە لە ڕاستیی ئەو شتە . بەم دوو ئایەتە كۆتایی بە باسەكە دەهێنین .

خودای زانا لە سورەتی **البقرەدا** باسی كەلە ڕەق و دڵ ڕەقیی بنو ئیسرائیل دەكات و دەفەرموێت

( **فهي كالحجارة او اشد قسوة** ) واتا دڵتان وەك بەردە و لە بەردیش ڕەق ترە

هەروەها لە ئایەتی ٢٠٠ ی **البقرەدا** باسی مناسك **الحج** دەكات دەفەرموێت **( فاذكروا الله كذكركم ابائكم او اشد ذكرا )** واتا ناوی خوا بهێنن چۆن ناوی باوك و دایكتان دەهێنن و لاتان گرنگە و باشیان دەناسن وە زیاتریش

وە كاكی دژە ئیسلام لەسەر وێنەكەی نوسیوێتی ( ترحێو الله نازانێت چەند كەس بوون ) منیش دەڵێم تبت یداك یا ابو لهب ساڵی ٢٠١٥ . ترحێو لە خۆت كە خەریكی كوێی و پەیستیت و نازانیت لە قورئاندا لە شوێنی تریشا ووشەی ( او ) هاتووە و ووشەی ( او ) بەمانای وە دێت نەك بە تەنها یان ووشەی ( او ) بە مانای ( و . بل ) دێت پێكەوە واتا دڵنیات دەكاتەوە كە ئەو ژمارەیە تەواوە و بە دڵنیاییەوە زیاتریشن .

چونكە لە هەموو زمانێكی جیهانیدا قەرەباڵەخی بە تقدیری حساب دەكرێت و دەڵێن هەزار و بەرەو ژور یان ملیۆن و قسور . واتا كابرا دڵنیایە كە هەزار كەسن بەڵام زیادەشیان لەگەڵدایە یان ملیۆنێك و زیاترن وەك گوتم ژمارە لە قورئاندا وە لە هیچ كۆمەڵگایەكدا گرنگ نییە . چونكە هەموو كۆمەڵە خەڵكێك كە زۆر بوون زۆرینەكەی باس دەكرێت و زیادەكەی تخمین دەكرێت وە خودای زاناش لەو ئایەتەدا دەفەرموێت ١٠٠ هەزارو زیاتر بوون یان ١٠٠ هەزار و قسور بوون نەك سەد هەزار یان زیاتر بوون وەك كاكی ترحێوی دژە ئیسلام دەهۆڵی بۆ دەكوتێت .

چونكە ئەگەر ( او ) بە مانای یان بهاتایا كابرای دەشتەكیی قورەیشی زۆر لە تۆ شارەزاتر بوو لە زمانەكەیدا و دەی گوت خوداكەی محمد (صلى الله علية وسلم) ژمارە نازانێت . بەڵام كابرای قورەیشی و خەڵكی ئێستاش دەزانن پێوانەی قەرەباڵەخی بە تقدیری دەكرێت وە گرنگ ژمارە سەرەكیەكەیە وە باقیاتی خەڵكەكەی تر مەزەنە دەكرێت و دەڵێن ١٠٠ هەزار و قسور یان سەد هەزار و زیاتر

یان بەرەو ژور وە قورئان و كتێبە ئاسمانیەكانی تریش بە زمانی خەڵكی قسە دەكات چونكە بۆ خەڵك دابەزیووە و بە پێوانەی خەڵك قسە دەكات بۆ نموونە كابرای كۆپی و پەیستی بێدینی كورد ئەم گومانەی لە كڵێسا و كەناڵە مەسیحیەكانی وەك اخ رشیدەوە وەرگرتووە و بڵاوی دەكاتەوە . با بزانین كتێبەكەی خۆیان چی دەڵێت ؟

....................

لە سفری ( **یۆنان** ) دا كە لە نوسخە كوردیەكەدا گۆڕیویانە بە ( **یونس** ) لە بەشی ٤ دەقی ١١ دا نوسراوە

افلا اشفق انا على نينوى المدينة العظيمة التي يوجد فيها اكثر من اثنتي عشرة ربوة من الناس

واتا زیاتر لە __١٢_ ( **ربوة** ) ی تێدایە . ربوة واتا تەپۆڵكە كاتێكیش خەڵكی كۆ دەبێتەوە واتا دەچنە پاڵ یەك یان سەر یەك و تەپۆڵكەیەك دروست دەكەن وە ( **ربوة** ) واتا ١٠٠٠٠ وە ١٢ ربوة واتا ١٢٠ هەزار كەس .

وە لە تەوراتیشدا هەر ژمارەكە بە تقدیری دانراوە دەڵێت ١٢٠ هەزارو زیاتر یان بەرەو ژور یان قسور بوون ببورن بۆیە بە كوردی دەقەكەمان دا نەنا چونكە لە نوسخە كوردیەكەدا زۆر بە سەقەتی ترجمەیان كردووە خۆتان دەتوانن سەیری بكەن .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان** بۆ اخ رشید ئەمەیە ئایا دەكرێت ئێمە رەخنە بگرین بڵێێن خودا لە تەوراتدا حسابی نەزانیوە ؟وە دە هەزاری بە تەپۆڵكە ژماردووە ؟ یان دەڵێێن زمان و تێگەیشتنی خەڵكی ئەو زەمانە بەو شێوەیە بووە و تەپۆڵكەیان بە دە هەزار خەمڵاندووە . پاشان هەر كتێبەكەی خۆشتان دەڵێت ١٢٠ هەزار و زیاتر... ناڵێت ١٢٠ هەزار یان زیاتر . وە بە هەمو پێوەرێك لە كۆن و نوێدالە هەموو زمانێكدا بۆ حساب كردنی ژمارەی زۆر دەڵێین ئەوەندە هەزار و زیاتر ناڵێین ئەوەندە هەزار یان زیاتر . چونكە وەك لایەنی زمانەوانی هەڵەیە وە هەمیشە لە ژمارەی ١٠٠ و بەرەو ژوردا هیچ قەوم و هیچ كەسێك ناڵێت ١٠٠٠ یان زیاتر بەڵكو دەڵێن هەزار و زیاتر یان ١٠٠ و زیاتر

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : فەرموو بە زمانی عەرەبی بۆمان بسەلمێنە ( او ) لەو ئایەتەدا بە مانای ( یان ) دێت . وە یان ( او ) بۆ گومان بەكار دێت بۆ شتێك كە نەی زانیت ؟دەڵێم های ترحێو جەنابی دژە ئیسلام رەخنە لە شتێك دەگریت خۆشت نازانیت چییە ؟ تۆبە بكە و واز لەو چەواشە كاریانە بهێنە و تبت یداك یا ابي لهب ئەگەر تۆبە نەكەیت ستصلى نارا ذات لهب .

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و یەك

## حۆریی بەهەشت دوعا لە ژنانی سەر زەوی دەکات

إسناده حسن من أجل إسماعيل بن عياش .
وأخرجه ابن ماجه (2014) ، والترمذي (1174) ، والشاشي في "مسنده" (1374) ، والطبراني في "الكبير" 20/ (224) ، وفي "الشاميين" (1166) ، وأبو نعيم في "الحلية" 5/220، وفي "صفة الجنة" (86) ، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" 4/47 من طرق عن إسماعيل بن عياش، بهذا الإسناد . وحسنه الترمذي، وصحح إسناده الذهبي .

علل الحديث لابن أبي حاتم (ص: 460)
1264- وسمعت أبا زرعة ، وذكر الحديث الذي رواه نعيم بن حماد ، عن بقية ، عن بحير بن سعد ، عن خالد بن معدان ، عن كثير بن مرة الحضرمي ، عن معاذ بن جبل ، عن النبي صلى الله عليه وسلم ، قال : لا تؤذي امرأة زوجها في الدنيا ، إلا قالت زوجته من الحور العين : لا تؤذيه ، قاتلك الله ، فإنما هو عندك دخيل عسى أن يفارقك.
قال أبو زرعة : ما أدري من أين جاء به نعيم ! , أراه شبه على نعيم ، لم يرو هذا الحديث عن بحير غير إسماعيل بن عياش ، إلا أن يكون بقية ، عن إسماعيل بن عياش. وذكر أبو زرعة : أن هذا الحديث ليس عندهم بحمص في كتب بقية.

((لاتؤذی امرأة زوجها فی الدنيا الا قالت زوجته من الحور العين: لاتؤذيه قاتلك الله فانما هو عندك دخيل_ أي ضيف_يوشك أن يفارقك الينا)) رواه احمد والترمذي
واتە:هیچ ئافرەتێك ئازاری پیاوەکەی نادات لەدونیادا ئیلا ئافرەتەکەی لەحۆری عەین ئەڵێت:ئازاری مەدە خوابتکوژێت ئەو پیاوە لەلای تۆ میوانە ئەوەندەی نەماوە بەجێت بێڵێ و بێت بۆ لامان



دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە حەدیسێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەگرن و دەڵێن سوکایەتی بە ئافرەت دەکات و دەڵێت ئەگەر ئافرەتێك لە دونیادا ئافرەتێك ئازاری مێردەکەی بدات حۆریەکانی بەهەشت دوعای لێ دەکەن و قسەی پێ دەڵێن . لێرەدا ڕەخنەی دژە ئیسلام تەواو بو وێنەی ڕەخنەکەشمان داناوە.

دژە ئیسلام کاتێك حەدیس بڵاو دەکاتەوە نا گەڕێت بە دوای پلەی حەدیسەکەدا . وە زۆر لە مەلا و بانگ خوازەکانی خۆشمان هەمان شێوەن ناگەڕێن بزانن ئەو حەدیسە صحیحە یان نا ؟ پاش گەڕان بە دوای ئەو حەدیسەدا دەرکەوت اسنادەکەی باشە وە حەدیس واتا اسناد و متن . اسناد واتا ئەو کەسانەی گێڕاویانیەتەوە متن واتا دەقی حەدیسەکە . وە لەم حەدیسەدا هەموو محدسەکان دەڵێن سنەدەکەی باشە وە ناڵێن ڕاستە بەس بە تەنها شیخ البانی بە ڕەحمەت بێت دەڵێت سنەدەکەی ڕاستە کەواتا بە هەمو پێوەرێك ئەم حەدیسە ڕاست نییە بەڵام بۆیە لە کتێبی حەدیسەکاندا نوسراوەتەوە چونکە لە سنەدەکەیدا ( اسماعیلی کوڕی عیاشی الحمصی ) ی تێدایە و دەڵێن کابرایەکی ڕاست گۆ بووە . اسماعیل ئەم قسەیە لە بحیری کوڕی سعدەوە بیستووە

هەردووکیان خەڵکی حمصن لە سوریا . بەڵام حەدیسەکە دەڵێت گوێم لێ بوو ابو زرعة گوتی لە ڕێگای نەعیمەوە . لێرەدا لە نێوان ابو زرعة و نعیمدا کەسێکی تر هەیە دیار نییە واتا نعیم لە کێی ترەوە گوێی لەم حەدیسە بووە دیار نییە بەڕێزان ئەم حەدیسە ڕاست

نییە و البانیش بە ڕەحمەت بێت لەسەر اساسی ڕاست گۆیی اسماعیلی کوڕی عیاش دەڵێت ڕاستە . واتا گێڕانەوەکە لە کەسێکی ڕاست گۆوەیە بەڵام ناڵێت مەتنەکەی ڕاستە واتا ناوەڕۆکی حەدیسەکە ڕاستە کە حۆریی بەهەشت دوعا لە ژنی سەر زەوی بکات فەرموون ئەمەش ئەو سەرچاوانەن کە حەدیسەکانیان داناوە هیچیان ناڵێن متنەکە ڕاستە و هەر هەموویان دەڵێن اسنادەکە ڕاستە کە اسماعیلی کوڕی عیاشە

وأخرجه ابن ماجه (٢٠١٤) ، والترمذي (١١٧٤) ، والشاشي في "مسنده" (١٣٧٤) ، والطبراني في "الكبير" ٢٠/ (٢٢٤) ، وفي "الشاميين" (١١٦٦) ، وأبو نعيم في "الحلية" ٢٢٠/٥، وفي "صفة الجنة" ( ٨٦ ) و حسنه الذهبي في "سير أعلام النبلاء" ٤٧/٤ من طرق عن إسماعيل بن عياش، بهذا الإسناد وحسنه الترمذي، وصحح إسناده الذهبي

ئەمەش شیکاریی ئەو حەدیسەیە کە بۆچی بە صحیح وەرنەگیراوە ؟

......................

علل الحديث لابن أبي حاتم (ص: ٤٦٠ )

1264-وسمعت أبا زرعة ، وذكر الحديث الذي رواه نعيم بن حماد ، عن بقية ، عن بحير بن سعد ، عن خالد بن معدان ، عن كثير بن مرة الحضرمي ، عن معاذ بن جبل ، عن النبي صلى الله عليه وسلم ، قال : لا تؤذي امرأة زوجها في الدنيا ، إلا قالت زوجته من الحور العين : لا تؤذيه ، قاتلك الله ، فإنما هو عندك دخيل عسى أن يفارقك ،،

قال أبو زرعة : ما أدري من أين جاء به نعيم ! ، أراه شبه على نعيم ، لم يرو هذا الحديث عن بحير غير إسماعيل بن عياش ، إلا أن يكون بقية ، عن إسماعيل بن عياش

وذكر أبو زرعة : أن هذا الحديث ليس عندهم بحمص في كتب بقية

..........................................................................................................

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و دوو

## ئاینی ئیسلام دەڵێت بۆتان هەیە زینا لەگەڵ خوشك و دایكتان بكەن

ماڵپەڕ و گروپ و پەیجە مەسیحیە عەرەبەکان حوکمێکی ابو حنیفەیان بڵاو کردوەتەوە و کردویانە بە هەرا کە دەڵێت هەر چوار مەزهەبە ئیسلامیەکان دەڵێن : ئەگەر یەکێك زینا بکات لەگەڵ دایکی یان خوشکی یان کچی یان پوری یا نەنکی یان کچی برای یان خوشکی ئەمانە هیچیان حەد ( سزا ) ی لەسەر نییە لە کاتێکدا کابرا باش دەزانێت ئەمانە کەس و کاری ئەوون وە کابرا سزا نادرێت بەڵکو ( تعزیز ) دەکرێت . وە ئەم حوکمە قەشە کوردەکانیش کردویانە بە کوردی و بڵاوی دەکەنەوە لە ماڵپەڕ و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا

فەتوای ابو حنیفە: ابو حنیفە دەڵێ: حەدێک جێبەجێ ناکرێ بەسەر کەسێکدا کە زەواج بکات لەگەڵ دایکی کە لێی بووە، کچ، خوشک، دایەگەورە، پوو هەم لە دایکی و هەم لە باوکی، کچی براو کچی خوشک، لە کاتێکدا کە بزانێ نیسبەتی بەو کەسانە چییە و حورمەتی زەواج لەگەڵ مەحارمیش بزانێ، و لەگەڵیان سێکس بکات، منداڵ حەڵاڵزادەیە و دانی مارەیی واجیبە، تەنیا دەبێ تعزیر بکرێت و ئەوەش تەنیا ٤٠ قامچی، ڕای "سفیان سوری"ش هەر ئەوەیە.

ئەمە وەرگێرانی قەشەی کوردە بۆ ئەوحوکمەی ابو حنیفە دیقەتی ژمارە چل بدەن لە پۆستەکەدا ڕون کردنەوەمان داوە

ئەمە هەمان گومانە لە پێگە مەسیحیە عەرەبەکانەوە

أين أنتم من هذا التغييب يامسلمين ؟ أين عقولكم وضمائركم .. الله قدوس يحب القداسة .. المسيح قال :" كونوا قديسين كما أنى قدوس " .. أين قداسة دينكم وقداسة تعليم رسولكم ؟ هل بعد كل هذه الإباحية هل إله الإسلام قدوس ؟؟؟

وَقَالَ أَبُو حَنِيفَةَ : لَا حَدَّ عَلَيْهِ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ ، وَلَا حَدَّ عَلَى مَنْ تَزَوَّجَ أُمَّهُ الَّتِي وَلَدَتْهُ ، وَابْنَتَهُ ، وَأُخْتَهُ ، وَجَدَّتَهُ ، وَعَمَّتَهُ ، وَخَالَتَهُ ، وَبِنْتَ أَخِيهِ ، وَبِنْتَ أُخْتِهِ - عَالِمًا بِقَرَابَتِهِنَّ مِنْهُ ، عَالِمًا بِتَحْرِيمِهِنَّ عَلَيْهِ ، وَوَطِئَهُنَّ كُلَّهُنَّ : فَالْوَلَدُ لَاحِقٌ بِهِ ، وَالْمَهْرُ وَاجِبٌ لَهُنَّ عَلَيْهِ ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ إلَّا التَّعْزِيرُ دُونَ الْأَرْبَعِينَ فَقَطْ - وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ ، قَالَا : فَإِنْ وَطِئَهُنَّ بِغَيْرِ عَقْدِ نِكَاحٍ فَهُوَ زِنًى ، عَلَيْهِ مَا عَلَى الزَّانِي مِنْ الْحَدِّ— تقريبا في منتصف الصفحة تجد النص

ويقول أبو حنيفة: وَجَدْتُمْ أَنَّ مَنْ تَزَوَّجَ أُمَّهُ - وَهُوَ يَدْرِي أَنَّهَا أُمُّهُ - أَوْ ابْنَتَهُ - وَهُوَ يَدْرِي أَنَّهَا ابْنَتُهُ أَوْ أُخْتَهُ - أَوْ إحْدَى ذَوَاتِ مَحَارِمِهِ - وَهُوَ يَدْرِي عَالِمٌ بِالتَّحْرِيمِ فِي كُلِّ ذَلِكَ : فَوَطِئَهُنَّ فَلَا حَدَّ عَلَيْهِ ، وَالْمَهْرُ وَاجِبٌ لَهُنَّ عَلَيْهِ ، وَالْوَلَدُ لَاحِقٌ بِهِ ، فَمَا نَدْرِي هَذَا إلَّا فِي غَيْرِ الْإِسْلَامِ —- نهاية الصفحة
لَا يجب الحد بِوَطْءِ مَحْرَمٍ تَزَوَّجَهَا وَهَذَا هُوَ الشُّبْهَةُ فِي الْعَقْدِ سَوَاءٌ كَانَ عَالِمًا بِالْحُرْمَةِ أَوْ لَمْ يَكُنْ عَالِمًا بِهَا عِنْدَ أَبِي حَنِيفَةَ — السطر الاول من كتاب جامع الفقه الاسلامي ( السّني طبعاً)

وهذا أبوحنيفة النعمان بن ثابت يقول: لو أن رجلاً عقد على أمّه عقدة النكاح وهو يعلم أنها أمه ثم وطئها لسقط عنه الحد , ولحق به الولد!!! راجع الفقه على المذاهب الاربعة للجزيري ج5 ص141 والمغنى لابن قدامة ج1 ص149 .. فراجع المصادر

ويقول أبوحنيفة: لو أنّ رجلاً إستأجر غسالة أو خياطة أو خبازة أو غير ذلك من أصحاب الصناعات, ثم وثب عليها فوطئها وحملت منه, يسقط عنه الحد!! ولحق به الولد!! المصادر: المحلى لابن حزم ج11 ص250 , والمغني لابن قدامة ج10 ص187 . وحلية العلماء ج8 ص15 فراجع المصادر

بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەڵێین زینا کردن لەگەڵ خوشك و دایك و پور و مەحرەمەكانی خێزاندا لە قورئان دا باس کراوە لە ئایەتی ٢٣ ی سورەتی **النسائدا** . ئایا دەکرێت کەسێکی وەك ابو حنیفە یان(٣ ) ئیمامەکەی تر بێ ئاگا بن لەو ئایەتە دزورو درێژە ؟ ئایا دەکرێت ئەو (٤) ئیمامە سەرپێچی قورئان بکەن و لە کتێبە فقهیەکانیاندا ئەو حوکمە دا بنێین کە کابرا ی گاور باسی دەکات ؟ بە هەموو پێورێك وەڵامەکەی نەخێرە . چونکە موسوڵمانێکی سادەی ئاسایی ئەو شتە دەزانێت ئێستا چۆن ئەو ئیمامە بەرێزانە دەکەونە هەڵەیەکی لەو جۆرەوە ؟

لێرەدا دوو شیکاری هەیە :

**یەکەمیان:** کابرای گاور لە کتێبەکەی خۆیدا زنا المحارم جایزە و ١٠ حاڵەتی زنا المحارم لە کتێبەکەیدا هەیە . بۆیە زۆر بە ئاسانی باوەڕ بەو حوکمەی هەر چوار ئیمامەکی ئیسلام دەکات

**دووەمیان**: جهل و نەزانییەتی لە فقە و حوکمی ئیسلام.

چونکە سەرەتای ئەو حوکمەی ابو حنیفە تێیدا نوسراوە ( لا حکم علیه ) واتا ئەو کەسە هیچ حوکمێکی لەسەر نییە کە زینا لەگەڵ خوشك و دایکی خۆیدا دەکات . خەڵکی موسوڵمانی نە شارەزا و عەوامیش ئەو قسەیەیان لا سەیرە چۆن ابو حنیفە دەڵێت هیچ سزایەکی لەسەر نییە ؟وە لێرەدا موسوڵمانی داماویش دەکەوێتە گومانەوە . کڵێساش ئەو خاڵەی استغلال کردووە بۆیە توانیوێتی گومان بخاتە دڵی هەموو موسوڵمانێکەوە کاتێك ئەو حوکمە بخوێنێتەوە . با بزانین بۆچی ابو حنیفە دەڵێت هیچ حوکمێکی لەسەر نییە !؟

چونکە حوکمی سزادان لە ئاینی ئیسلامی مەزندا **سێ** جۆرە

**یەکەمیان**: القصاص واتا تۆڵە وەرگرتنەوە لە کاتی کوشتن و تەعەدا کردن لە خەڵکی و پارە و ماڵ خواردن و هەر تاوانێکی تر لەو جۆرە بێت

**دووەم** : الحدود واتا حەدەکان وەك حەدی زینا و دزی و هاو شێوەکانی .

وە جۆری **سێیەمیان** : ( التعزیز ) واتا ئەو تاوانانەی کە شەرع دیاریی نەکردون و سزاکانی تەئدیبییە وە لە حوکمی زینا کردن لەگەڵ خوشك و دایك و مەحرەمەکاندا ئەبو حنیفە و شەرعی ئیسلام هەر چوار مەزهەبەکە دەڵێن حوکمی لەسەر نیە و تعزیز دەکرێت .

بۆ ئەوەی جوانتر تێ بگەن بۆچی هەر( ٤ ) مەزهەبەکە دەڵێن زینا لەگەڵ کەسی خێزانی خۆتدا حوکمی لەسەر نییە ؟ لە پێشدا بۆتان باس دەکەم ( التعزیز ) چییە ؟ ئەو کات دەگەڕێینەوە بۆ لای حوکمەکەی ابو حنیفة التعزیز واتا تەمێ کردن چۆن دایك و باوك منداڵ تەمێ دەکەن وە سزای دەدەن ؟ هەموو کەس منداڵی خۆیی خۆش دەوێت و سزای نادات وە ئەگەر سزاشی بدات سزای قورسی نادات !؟ وە لە نیەتیدا نییە سزایەکی بدات ئازاری بدات . بەڵام سزادانەکە دەگۆڕێت بەگوێرەی سەرپێچیی منداڵەکە هەندێك جار بە قسە یان بە هاوارکردن بە سەریدا یان بەوەی شتی نادەنێ یان بۆی ناکڕن وە زۆر جۆری تریش . بەڵام کاتێك منداڵەکە گەورە دەبێت وە کێشەیەکی گەورە دروست دەکات . دایك و باوکەکە دەڵێن حاشا ئەوە منداڵی ئێمە نییە بڕۆن خۆتان چی لەگەڵ دەکەن بیکەن ئێمە دایك و باوکی ئەو نیین لە ئاینی ئیسلامی مەزنیشدا یاساکان دانراون بۆ هەموو تاوانێك بەڵام زۆر تاوان هەیە چاوەڕوان کراو نییە وەك زینا کردن لەگەڵ خوشك و دایك و ئەوانەی سەرەوە کە باس کراوە . وە کەس ناچێت ئەو کارە قێزەونە بکات و لەگەڵ دایکی خۆی جووت بێت و منداڵی ببێت تەنانەت لای خەڵکی بێدین و کافر و هەموو کۆمەڵگاکان لە جیهاندا لە کۆن و نوێدا ئەو کارە شتێکی نە شیاو بووە و زۆر کەم بووە . بۆیە هەر چوار مەزهەبەکە دەڵێن حەدی یان سزای لەسەر نییە وەك لە پێشەکیی فەتواکەی ابو حنیفەدا هەیە دەڵێت حەدی لەسەر نییە چونکە لە ئیسلامدا حەدی زینا دیاری کراوە یان ڕەجمە یان جەلدە ، بەڵام تاوانی زینا لەگەڵ خوشك و دایکدا چاوەڕوان نەکراوە و پاشان هێندە مەزنە حەدیان بۆ دا نەناوە . چونکە تصور ناکرێت موسوڵمان لەگەڵ خوشك و دایکیدا زینا بکات ؟ وە قسەکەی ابو حنیفە تەواوە بەڵام کاکی گاور ئاگای لە حەدی زینا نییە لە ئاینی ئیسلامی مەزندا وە ئەو کارە قێزەونە شتێکی چاوەڕوان نەکراوە وەك چۆن شتێکی چاوڕوان نەکراوە کاتێك دایك و باوك حاشا لە منداڵیان بکەن بڵێن بڕۆن بیکوژن ئێمە هەقمان نیە و منداڵی ئێمە نییە . وە حوکمی تعزیزیش هەمان شێوەیە هەر (٤) مەزهەبەکە ئەم شتە چاوەڕوان نەکراوەیان داناوە بۆ ئەو کاتەی کەسێك هەبێت ئەو کارە بکات دادگای ئەو کاتە بە گوێرەی کردارەکە و زەمانەکە و گەورە و بچوکیی کارەکە و ئاسەواری ئەو کارە چی دەبێت لەناو کۆمەڵگادا حوکمی بۆ دا دەنێت بۆ ئەوەی باشتر تێ بگەن ابو حنیفە دەڵێت حوکمی لەسەر نییە .

چونکە حوکمی زینا زانراوە لە ئیسلامدا وە ئەو کارە قێزەونە هەر (٤) مەزهەبەکە حوکمی تعزیزیان بۆ داناوە چونکە ئەوان نازانن کەی و لە چی زەمانێکدا ئەو کارە دەکرێت و چی کاریگەریەکی دەبێت لەو زەمانەدا و کێ حوکم دەکات ؟ وە ئەوەش لە دانای و زانایی ئەو (٤) ئیمامەیە حوکمیان بۆ دا نەناوە و جێیان هێشتووە بۆ دادوەری پاش خۆیان . بەلام ئەوەی جێگای بەزەییە کابرای قەشەی کورد بەناوی بێدینەوە ئەم قسانە دەکات لە نوسینە کەیدا نوسیوێتی ( تەنیا دەبێ تعزیر بکرێت و ئەوەش تەنیا ٤٠ قامچی) دیقەت بدەن کابرای قەشە فارسە و نە عەرەبی و نە کوردی باش نازانێت چونکە فۆنتی کۆمپیوتەرەکەی ژمارە ی فارسییە . خۆ هەموومان فۆنتی کوردی بەکار دەهێنن و فۆنتەکانیش هەمووی فارسییە بۆچی ٤٠ لای من یان ئێوە بە فارسی دەرناچێت ؟وە لە ئیسلامی مەزندا حوکمی تعزیز بە تەنها بۆ زنا المحارم دا نەنراوە بەڵکو بۆ هەموو شتێکە وە هەموو فقیە و زاناکان وە هەر( ٤ ) مەزهەبەکەش لە هەموو بوارێکدا حوکمیان داناوە و فقهی ئیسلامی زۆر دەوڵە مەندە لە بواری فقهی معاملات و سزادان و دادگا و نوێژ و ... هتد

بەڵام زۆر شت هەیە چاوەڕوان نەکراوە . بۆیە حوکمی تعزیزیان بۆ داناوە هەتا دادوەر و فقهای ئەو زەمانی دوای خۆیان بە گوێرەی کات و خەڵکی و گەورە و بچوکیی ئەو تاوانە و ڕادەی کاری گەریی ئەو تاوانە لەناو خەڵکدا حوکمی بدەن بۆ ئەوەی فیتنە دروست نەبێت زینا کردن لەگەڵ خوشك و دایك و خێزاندا کارێکی قێزەونە و هیچ کۆمەڵگایەك قبوڵی ناکات وە ئاینی مەزنی ئیسلام زینای بە گشتی حەرام کردووە ئێستا چۆن فقهی ئیسلامی حەڵاڵی دەکات ؟ وە دەتوانن بگەڕێن لە لای خۆمان و لە جیهاندا حاڵاتی زینای خێزان زۆر کەمە لە دادگاکانیان وە دەتوانین بڵێین هەر نییە و لەوانەیە لە ١٠٠ ساڵ حاڵەتێکی لەو شێوەیە ڕوو بدات لەوانەشە هەر ڕوو نەدات چونکە کەس ئەو کارە قێزەونە ناکات وە زاناکانی هەر( ٤) مەزهەبەکەش بە شتێکی چاوەڕوان نەکراویان داناوە بۆیە دایان ناوە بۆ حوکم و دادوەرانی دوای خۆیان .

**پرسیاری بێ وەڵامیشم** :بۆ قەشەی فارسی گاور ئەمەیە : ئادەی پێم بڵێ ئەم ٤٠ قامچیەت لە کوێ هێناوە ؟لە کاتێکدا هەر چوار مەزهەبەکە حوکمەکەیان بۆ دوای خۆیان جێ هێشتوە ؟ ئادەی پێم بڵێ کوا موسوڵمانی پابەند بە دینەوە زینا دەکات لەگەڵ ئافرەتی دەرەوەی خێزانی هەتا لەگەڵ ئافرەتانی ناو خێزانەکەیدا زینا بکات ؟ وە ئایا لە ئیسلامدا حوکمی زیناکار ڕون و ئاشکرا نییە و دا نە نراوە ؟ ئەگەر بڵێیت بەڵێ کەواتە بۆچی فقهی ئیسلامی حوکمی زینای لەگەڵ دایك و خوشکدا بە هەمان حوکمی ڕەجم یان جەلد دا نەناوە ؟ چونکە تاوانێکی مەزنە و بە جەلد و رەجم چارەسەر ناکرێت و دەبێت حوکمێك بدرێت خەڵکی ئاقڵ بن کەس نەوێرێت ئەو کارە بکات و حوکم و جۆری حوکمەکەیان داناوە بۆ ئەو کاتەی ئەو تاوانەی تێدا دەکرێت

داواکارم لە خوشك و برا موسوڵمانەکانیشم بەم جۆرە بڵاو کراوانە نەشڵەژێن و ئەوانیش باوەڕ بە هەموو شتێك نەکەن و خێرا نە پەشۆکێن لە ئاستی ئەم گومانانەدا !؟ چونکە ئایەتی صریح و ڕون هەیە دەڵێت ئافرەتانی خێزانەکەت لێت حەرامە ئێستا چۆن ئەو (٤ )مەزهەبە و ئەو ئیمامە بەرێزانە حوکمی قورئان دەشکێنن و نەك زینا بەڵکو زینای خوشك و دایك حەڵاڵ دەکەن ؟

# پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :سەد و چل و سێ

## خودا شایەتیی لە تۆوی ئادەم وەرگرتووە

وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ شَهِدْنَا أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ ﴿الأعراف: ١٧٢﴾

أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ ﴿الأعراف: ١٧٣﴾

دژە ئیسلامەکان ڕەخنە دەگرن لە ئایەتی ١٧٢ ی سورەتی **الاعراف** و دەڵێن چۆن خودا شایەتی لە تۆو ی ئادەم وەرگرتووە کە بڵێت من خودای ئێوەم و ئەوانیش گوتبێتیان بەڵێ تۆ خودای ئێمەیت ؟ وە ئادەم هەزارەها ساڵە مردووە ئێمە ئێستا لە ٢٠٠٠ لە دایك دەبین چۆن خودا شایەتی لە تۆوی پشتی ئادەم وەرگرتووە لە کاتێکدا ئێمە لە دایك نەبووین !؟

بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەبێت بزانین باسی کێ دەکات ؟ باسی تۆو دەکات یان باسی قەومێك یان میلەتێك یان هەموو مرۆڤەکان دەکات لەسەر زەوی لە کۆن و ئێستا و هەتا ڕۆژی قیامەت ؟ وە دەقی ئایەتەکە دە فەرموێت ( **و اذ اخذ الله من بني ادم من ظهورهم ذريتهم و اشهدهم على انفسهم**) واتا خودا پشتا و پشت شایەتیی وەر گرت لە نەوەکانی ئادەم وە کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە . دیقەت بدەن تا ئێرە هەر هەمووی بە کۆیە وە باسی پشتا و پشتی نەوەکانی ئادەم دەکات کە کراون بە شایەت بەسەر خۆیانەوە هەر ئەم بەشەی ئایەتەکە گومانەکە پوچەڵ دەکاتەوە چونکە ئایەتەکە ناڵێت ( **و اذ اخذ الله من ادم من ظهره** ) واتا خودا لە پشتی ئادەم شایەتیی وەر گرتووە .

ئەگەر ئایەتەکە بەو شێوەیە بنوسرایە ئەوکات قسەی اخ رشید و کڵێسا ڕاست بووبەڵام ئایەتەکە بە کۆیە و باسی ئەوە دەکات خودا پشتا و پشت پێغەمبەرانی ناردووە بۆ نەوەکانی ئادەم و شایەتن بەسەر خۆیانەوە کە خودا هەیە و لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە ئەو خەڵکەش زانیویانە خودا هەیە و خۆیان شایەتی لەسەرخۆیان دەدەن نەك بڵێت لە تۆوی ئادەم شایەتی وەرگیراوە ئایەتەکە بە کۆیە نەك بە تاك دەڵێت ( بني ادم = ڕۆڵەکانی ئادەم ) نەك ( ادم بە تەنها ) دەڵێت ( ظهورهم = پشتا و پشتیان ) نەك بڵێت ( ظهر واتا لە پشتی ئادەم بە تەنها یان بە تاك ) دەڵێت ( ذريتهم ) منداڵ یان منداڵەکانی هەموو کەسێك ذریەتە . لێرەشدا هەر بە کۆ دەڵێت نەك بە تاك ئەمەش ئیعجازێکی تری قورئانە . چونکە خودا دەزانێت ڕۆژانێك دێت مرۆڤ پەیدا دەبێت و باوەڕی بە ئادەم و حەوا نییە ئەگەر بە تاك بوایە مانای ئایەتەکە هەر تەواو بوو چونکە ئێمە هەمومان لە ذریەتی ئادەمین . بەڵام ئێستا لەم زەمانەدا خەڵکی دەڵێن مرۆڤ لە هیچەوە پەیدا بووە و ئادەم و حەوا بونیان نییە !؟ تەنانەت بیرمەند و بانگ خوازی ئیسلامیش لە نمساوە پەیدا بووە

دەڵێت ئێمە ئامۆزای شمپازین . وە ئایەتەکە بۆ کۆ باسی نەوە دەکات لە دوای نەوە دەکات لە ڕێگای ذریاتە کانیانەوە هەتا ڕۆژی قیامەت نەك بە تەنها باسی ئادەم یان تۆوی ئادەم بکات ؟

وە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێت پاش ئەوەی شایەتیان وەرگرت کە خودا هەیە ڕۆژی قیامەت ناتوانن نکوڵی لەوە بکەن بڵێن ئێمە بێ ئاگا بووین لەوەی خودا هەیە . لەوانەیە دژە دینێکمان لێ پەیدا ببێت بڵێت من باوەڕم بە خودا نییە دەڵێین بەس ئەو قسەیەت بەڵگەیە بۆ ئەوەی دەڵێیت خودا هەیە ، مادام بیستوتە و دەزانیت خودا هەیە ئەوە تۆش ئەو شایەتیەت دا کە ئەو ئایەتە باسی دەکات وە ڕۆژی قیامەت نا توانیت بڵێیت نازانم خودا هەبووە یان نە بووە !؟ کاتێکیش مردیت ئەو ڕاستیانە دەزانیت و ئەم پۆست و کۆمێنتانەی فیسبوکیش هەر هەمووی شایەتن بۆ ئەوەی کە زانیوتە خودا هەیە و خۆت باوەڕت پێی نەکردووە وە ئەگەر سورەتی **الاعراف** لە ئایەتی ١٥٨ وە بخوێنیتەوە هەتا ١٧٢ ڕوون تر و باشتر مانای ئەو شایەتیە تان بۆ دەر دەکەوێت لە کۆتا پێغەمبەرەوە هاتووە بۆ هەموو خەڵکی واتا قورئان و محمد (صلی الله علیه وسلم) شایەتن بۆ بونی خودا وە پاشان دێتە سەر باسی بنو اسرائیل وە یەکەم شایەتی و کتێبی خودایە و چۆن پشتا و پشت خودا پێغەمبەری بۆ ناردوون بۆ شایەتی کە خودا هەیە وە باوەڕدار و بێ باوەڕیان تێدا بووە . کاتێك دەگەیتە ئایەتی ١٧٢ زۆر بە ڕونی و بە جوانی تێ دەگەیت مەبەستی ئایەتی ١٧٢ ی **الاعراف** پشتی ئادەم و تۆوی ئادەم نییە !؟ بەڵکو مەبەستی نەوەکانی ئادەمە وە زوریەتی منداڵەکانێتی پشتا و پشت وە کاتێك ئایەتی ١٧٣ دەخوێنیتەوە بەهانە و پاساوی موشریك و بێدینەکانیش دەبڕێت کە دەڵێن باو باپیرانمان موشریك بوون ئێمەش دوای ئەوان کەوتوین . ئێ باشە خۆ ئێستا تۆ دەزانیت خودا هەیە و قورئان هەیە بۆ هەر لەسەر ڕێچکەی باو باپیرانت دەڕۆیت ؟ وەك ئەم زەردەشتیانە وە زۆر قەومی تریش کە ئاگاداری قورئان و بوونی خودان بەلام هەر لەسەر ڕێچکەی باو باپیرانیان دەڕۆن وە پەیامی ئیسلام ئەو شایەتیەیە بۆ بوونی خودا بۆ هەر کەسێك بوونی خودا و ئیسلام ڕەت بکاتەوە .

بۆ ئەوەی بزانن دژە ئیسلام چۆن گومانەکەی دروست کردووە !؟ سەیر بکەن بزانن چۆن گۆڕیویێتی ؟ ئایەتەکە دەفەرموێت

## واذ اخذ الله من بني ادم من ظهورهم ذريتهم و اشهدهم على انفسهم

## و اذ اخذ الله من ادم ذريتهم من ظهره و اشهدهم على انفسهم

دیقەت بدەن لە **دووەمیاندا** ئەو بە شێوەی تاك بۆ ئێوەی باس دەکات بۆیە ئێوەش هەست دەکەن باسی تۆو بکات ، وە حەدیسێکیش دا دەنێن لەگەڵیدا کە دەفەرموێت خودا پشتی ئادەمی سڕیووە

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : بێ زەحمەت پێمان بڵێن ئەم ئایەتە لە کوێدا دەڵێت خودا شایەتی وەر گرتووە لە منداڵەکانی ئادەم لەناو تۆوەکەیدا پێش ئەوەی لە دایك ببین ؟ ئایا شایەتی لە تۆو وەردەگیرێت لە کاتێکدا ملیۆنەها منداڵ لەبار دەچن هێشتا نە هاتونەتە دنیاوە ؟ ئایا کاکی بێدین تۆش ئینکاریی ئەوە دەکەیت خودا هەیە ؟ ئایا تۆش شایەتی نادەیت کە خودا هەیە؟ لە بەرامبەردا دەڵێیت نەخێر من ئەو شایەتیە نادەم منیش دەڵێم مادام شایەتی نادەیت کەواتا تۆش ئەو بانگەوازەت

پێ گەیشتووە بەڵام ڕەتی دەکەیتەوە . هەرکات مردیت و فریشتە و ئەو دنیات بینی قبوڵی دەکەیت بەڵام شایەتیی پاش مردنت سودی نابێت بۆت بەڵکو ئێستا شایەتی بدە چونکە بە ئینکاریت لەو شایەتیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەو بانگەوازەت پێ گەیشتووە کە دەفەرموێت ( **الست بربكم ؟ وقالوا بلى شهدنا** ) خۆشبەختی بۆ ئەوانەی لە دنیادا دەڵێن بەڵێ . وە چارە ڕەشی و نا خۆش بەختییە بۆ ئەوانەی پاش مردن دەڵێن بەڵێ چونکە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێت ڕۆژی قیامەت دەڵێن ئێمە ئاگامان لەم ئایەتە نەبووە !؟ بەڵام تۆ شەو ڕۆژ خەریکی پۆست کردن و کۆمێنت و نوسینیت بۆ دژایەتیی خودا !؟ ئێستا تێ گەیشتیت چۆن خۆت شایەتی لەسەر خۆت دەدەیت و تۆش ئەو ئایەتەت پێ گەیشتووە !؟ دڵی خۆت بەو چەواشەکارییە خۆش مەکە بڵێیت قورئان هەڵەی کردووە لە تۆوی ئادەم چۆن شایەتی وەر دەگیرێت ؟ وە ئەو ئایەتە باسی تۆو ناکات بەڵکو تۆ چەواشەکاری دەکەیت وە دەقی ئایەتەکە هەر هەمووی بە کۆیە باسی زوریەتی ئادەم دەکات پشتا و پشت نەك بڵێیت لە پشتی ئادەم بە تەنها شایەتیەکە وەرگیراوە !؟ وەك لە سەرەوە باسمان کرد . خۆشت ئازادیت و مردنیش لە ڕێگای هەموانە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و چوار

## خواردنی گۆشتی کەر لە ئاینی مەزنی ئیسلامدا



عن أبي قتادةَ رضيَ اللهُ عنهُ ؛ أنه كان مع رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ حتى إذا كان ببعضِ طريقِ مكةَ تخلَّفَ مع أصحابٍ له مُحْرِمينَ . وهو غيرُ مُحْرِمٍ . فرأى حمارًا وحشيًّا . فاستوى على فرسِه . فسأل أصحابَه أن يناولُوه سوطَه . فأبَوْا عليه . فسألهم رُمْحَه . فأبَوْا عليه . فأخذَه . ثم شدَّ على الحمارِ فقتلَه فأكل منه بعضُ أصحابِ النبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ . وأبَى بعضُهم . فأدركوا رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ . فسألوه عن ذلك ؟ فقال " إنما هي طُعْمَةٌ أطعمكُموها اللهُ " . وفي روايةٍ : عن أبي قتادةَ رضيَ اللهُ عنهُ . في حمارِ الوحشِ مثلَ حديثِ أبي النضرِ . غيرَ أنَّ في حديثِ زيدِ بنِ أسلمَ : أنَّ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ قال : " هل معكم من لحمِه شيءٌ ؟ "

الراوي : أبو قتادة الأنصاري | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم

الصفحة أو الرقم: 1196 | خلاصة حكم المحدث : صحيح



دژە ئیسلامەکان دەڵێن پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کردووە بە خواردنی گۆشتی کەر . بەلام ئەو چەواشە کارانە ناڵێن فەرمان کراوە بە خواردنی گۆشتی کەری کێوی ( زیبرا ) نەك هەموو کەرێك وەك لە دەقی حەدیسەکە دا دەبینن لە وێنەکەدا دانراوە

**پرسیاری بێ وەلاممان ئەمەیە:** ئایا گۆشتی کەر و ئەسپ و هێستر حەرامە ؟ نەخێر حەرام نییە ؟ئەی بۆچی خەڵکی نای خۆن ؟ چونکە لە زەمانێکدا کە هۆکاری گواستنەوەی وەك سەیارە و فرۆکە و ... هتد . نەبووە ئەگەر خەڵکی ئەو ئاژەلانەی سەر بڕیایە و بی خواردایە بەچی هات و چۆی بکردایە و شمەکەکانیی بگواستایەتەوە ؟ بۆیە من و تۆش ئەگەر لەو زەمانەدا بژیاینایە کەرێکمان لە خۆمان خۆشتر دەویست چونکە خۆمان و بارەکانیشمانی دەگواستەوە بۆیە کەس نەی خواردووە بەلام کەری کێوی کەس سودی لێ وەر نە گرتووە بۆیە خواردویانە وە ئێستاش لە جیهاندا خەڵکی گۆشتی کەری کێوی و ئەسپ دەخۆن و لە **یوتوب** بگەڕێن زۆر ساید دەدۆزنەوە تایبەتە بە خواردنی کەری کێوی و ئەسپ ئەمە یەکێکیانە

https://www.youtube.com/watch?v=dcBgXQVkDvs

.................................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و پێنج

## پێش ئیمام بکەویت دەبیت بە کەر

دژە ئیسلام ڕەخنە دەگرن لە حەدیسێك دەفەرموێت ئایا ناترسن ئەگەر لە کاتی نوێژدا پێش ئیمام بکەون لە رکوع یان سجوددا سەرتان یان دەم و چاوتان ببێت بە سەر ی کەر !؟ وە دژە ئیسلامەکان دەڵێن بۆچی موسوڵمانەکان تاقیی ناکەنەوە کاتی نوێژ پێش ئیمامەکەیان سەریان بەرز بکەنەوە و بزانن چی ڕوو دەدات !؟

**بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەڵێین** : حەدیسەکە ناڵێت ئەو کارە ڕوو دەدات بەڵکو سەرەتای حەدیسەکە دەڵێت ( **اما یان الا یخشی** ) واتا ئایا ناترسن واتان لێ بێت !؟ کەواتە ئەمە ئەگەرە نەك بەڵێن بێت بۆ شتێك ڕوو دەدات وە حەدیسەکە نا فەرموێت ئەگەر پێش ئیمام بکەون سەرتان دەبێت بە سەری کەر بەڵکو ئەگەری ڕودان ی شتێکە و هەموو ئەگەرێکیش لەوانەیە ڕوو بدات و لەوانەیە ڕو نەدات وە زیاتر ئەو قسەیە مەجازییە نەك ڕاستی بێت چونکە کەر ناسراوە بە نەزانی و بێ مێشکی وپابەند نەبونەوە و مەخسەدی حەدیسەکە لەوەیە نابێت خەڵکی پێش ئیمام بکەوێت لە رکوع و سجوددا وە کەرێتییە ئەگەر ئەو کارە بکرێت . وە لە ئەدەبیات و شیعر و قسەی ئاسایی هەموو گەلێکدا مەسەل بە کەر لێ دراوە بۆ نەزانی و بێ مێشکی و پابەند نەبوون بە یاسا و ڕێساکانەوە و گەلی کوردیش لەو مەسەلانەی زۆرە ئەمانە چەند نمونەیەکن

ئەوەنەی کەرێکت خوارد مناڵ گەورە بێ ئەڵێن ئەوەنەی کەرێکت لێ هاتووە - کەری دێز حەز بە تۆپینی خۆی و زەرەری ساحێبی ئەکات - کەرە مەمرە بەهارە کورتانت بۆ دێت لە شارە - هەمووی جاشی ماکەرێکن – ئەگەر دۆعای کەر قبوڵ بێت جۆ دەبارێت کەر لە کوێ کەوتووە و کونە لە کوێ دراوە - نە کەرە و نە بارە بە هەردووك لا خوارە - هەر کەس لە دوای کەرەوە بڕوات دەبێت بۆنی تس بکات – ئەگەر کەر بچێتە بغداش نابیت بە هێستر – برنج ئالیکی کەر نییە کەرێك بە پارەی بەفر بکڕیت ئاو دەی بات – کەر بە دوای خاوەنی خۆیدا ناگەڕێ ... وە زۆر پەند و مەسەلی تر هەیە لەسەر کەر

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان دەڵێین**: وەرە ئەم کەرە لەم قوڕە دەربهێنە بە دەست تێگەیشتنی دژە ئیسلامەوە بۆ ئەو حەدیسە و پێمان بڵێ . ئایا کاتێك ئەو مەسەلانە بەکار دەهێنرێت مەبەست لەوەیە ئەو کەسە کەرە یان بووە بە کەر یان کاری کەرانە دەکات ؟ چونکە مەبەست لێ مەجازییە نەك ڕاستی !؟ ئەو حەدیسەش هەر هەمان شتە باسی ئەگەر دەکات نەك شتێك ڕوو بدات و بە کوردی دەڵێت کەرێتییە پێش ئیمام بکەوین لە کاتی سجود و رکوعدا.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و شەش

## سووتاندنی مرۆڤ لە ئیسلامدا

الاموال لابن زنجويه باب حكم رقابة اهل الذمة ج1 ص387

أنا حميد أنا عثمان بن صالح ، حدثني الليث بن سعد بن عبد الرحمن الفهمي ، حدثني علوان ، عن صالح بن كيسان عن حميد بن عبد الرحمن بن عوف ، أن أباه عبد الرحمن بن عوف ، دخل على أبي بكر الصديق رحمة الله عليه ، في مرضه الذي قبض فيه ، فرآه مفيقا ، فقال عبد الرحمن : أصبحت ، والحمد لله بارئا ، ................ "الى قوله فقال : « أجل إني لا آسى من الدنيا إلا على ثلاث فعلتهن وددت أني تركتهن ، وثلاث تركتهن وددت أني فعلتهن ، وثلاث وددت أني سألت عنهن رسول الله صلى الله عليه وسلم ، أما اللاتي وددت أني تركتهن ، فوددت أني لم أكن كاشفت بيت فاطمة عن شيء ، وإن كانوا قد أغلقوا على الحرب ووددت أني لم أكن حرقت الفجاءة السلمي ، ليتني قتلته سريحا ، أو خليته نجيحا ، ولم أحرقه بالنار . ووددت أني يوم سقيفة بني ساعدة ، كنت قذفت الأمر في عنق أحد الرجلين ، عمر بن الخطاب أو أبي عبيدة بن الجراح ، فكان أحدهما أميرا ، وكنت أنا وزيرا ،

تاريخ اليعقوبي ج1 ص158 :

وقدم إياس بن عبد الله بن الفجاءة السلمي على أبي بكر فقال: يا خليفة رسول الله! إني قد أسلمت، فأعطاه أبو بكر سلاحا، فخرج من عنده، فبلغه أنه يقطع الطريق، فكتب إلى طريفة بن حاجزة: أن عدو الله ابن الفجاءة خرج من عندي، فبلغني أنه قطع الطريق، وأخاف السبيل، فسر إليه حتى تأخذه. وتقدم طريفة، فسار إليه، فقتل قوماً من أصحابه، ثم لقيه، فقال: إني مسلم، وإنه مكذوب علي! فقال طريفة: فإن كنت صادقا، فاستأسر حتى تأتي أبا بكر فتخبره! فاستأسر. فلما قدم به على أبي بكر أخرجه إلى البقيع فحرقه بالنار، وحرق أيضاً رجلاً من بني أسد يقال له شجاع بن ورقاء .

دەڵێن ابوبکری صدیق کەسێکی سوتاندووە ناوی **الفجاءة السلميه** . کێشەکە لەوەدای دەڵێن ئەمە حەدیسە وە کابرای دژە ئیسلام جیاوازیی نێوان حەدیس و مێژوو ناکات !؟ چونکە کاتێك دەڵێین حەدیس دەبێت لە زاری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕرا

بێتەوە و قسەی ئەو بێت بەڵام ئەم ڕوداوەی ابو بکری صدیق بە هیچ پێوەرێك حەدیس نیە بەڵکو ڕوداوە مێژوو نوس نوسیویێتی ٣٠٠ ساڵ دوای مردنی ابو بکری صدیق . وە قسەی مێژونوس ناکرێت بە بەڵگە یان بە بەشێك لە ئاین چونکە نە ئایەتی قورئانە و نە حەدیسە

وە سەرچاوەی ئەو قسەیە لە کتێبی **تاریخ الطبري** بەشی ٣ لاپەڕە ٢٦٤ دا نوسراوە هەروەها لە **الاموال هی ابن زنجویه** بەشی حکم رقابة اهل الذمة بەشی ١ لاپەڕە ٣٨٧ . لە **تاریخ الیعقوبي** بەشی ١ لاپەڕە ١٥٨ دا نوسراوە **یعقوبی** شیعەیە و قسەی وەر ناگیرێت ئەگەر داعشێکی دوژمنی خودا یان گروپێکی ئیسلامیی نەزان پەیدا ببن و خەڵکی بسوتێنن بە گوێرەی ئەو **سێ** بەڵگەیەی سەرەوە بەڵگەیە بۆ جەهالەت و نەزانیان لە ئاینی ئیسلامی مەزن چونکە ئەو سێ بەڵگە یە قسەی مێژوو نوسە نەك ئایەتی قورئان یان قسەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێت .

**بۆ زیاتر زانیاریتان** سەیری پرسیارە بێ وەڵامەکان (٢٤ ) **بکەن لا پەرە** (٥٧)

.....................

وە ئەو سەرچاوانەی باسی سوتاندنی فوجائە دەکات چیرۆکی مێژوییە و لەوانەی کە گێڕاویانەتەوە کەسێکی تێدایە ناوی (**علوان بن داود النجلي** ) ئەو کەسە لای حەدیس گێڕەوەکان بە درۆزن ناسراوە . ابن حجر لە کتێبی لسان المیزاندا دڵێت بوخاری گوتویەتی علوان **منکر** الحدیثە و حەدیسی لێ وەر ناگیرێت . الحافظ نور الدین الهیثمي لە مجمع الزوائددا دەڵێت ئەو چیرۆکەی طبرانی گێڕاویەتیەوە لاوازە چونکە علوانی تێدایە و هیچی لێ وەر ناگیرێت . وە علوان کەسێکی ناسراوە و هیچ کەس قسەی لێ وەر نە گرتووە لە هەمووی گرنگ تر ئەمەیە : هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر کارێکیان کرد بێت یان بە گوێرەی ئایەت یان حەدیس یان کردارێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردویانە و لایان نەداوە لێی یە ك مسقاڵە زەڕە .

ئایا هیچ ئایەتێك هەیە لە قورئاندا بڵێت خەڵکی بسوتێنن ؟ ئایا پێغەمبەر (الله علیه وسلم) هیچ کەسێکی سوتاندووە ؟ یان حەدیس هەیە بڵێت خەڵکی بسوتێنن ؟ لە هەمووی سیر تر کاکی **معتزلە**یە لە بێدین خراپ ترە و ئەم چیرۆکە بڵاو دەکاتەوە .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە:** فەرموو بە دەقێکی قورئان یان حەدیسێکی درۆ یان هەڵبەستراویش بێت پێمان بڵێت بۆتان هەیە مرۆڤ بسوتێنن بۆمان دا بنێن . ئەگەر نییە قسەی مێژوو نوسێك نابێت بە بەڵگە بۆ منهج و شەرعی ئاینی ئیسلامی مەزن . وە ئەگەر هیچ دەقێکی قورئان و حەدیسێك نەبێت و نەتوانن بیهێنن دڵنیا بن ابو بکری صدیق قەت ئەو کارەی نە کردووە چونکە سەرپێچیی قورئان و سونەتە و حاشا لله ئەگەر هاوەڵانی خۆشەویست محمد (صلی الله علیه وسلم) سەرپێچیی قورئان و سونەتیان کرد بێت

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و حەوت

## هەڵەی قورئان بطونه و بطونها

وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ (٢١ المؤمنون)

وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ (٦٦ النحل)

جیاواز لەوەی ئەم ئایەتە (النحل ٦٦) هەڵەی زانستی زەقی تێدایە کە باسی لە جێگەی شیر دەکات، دەبینین هەڵە زمانەوانی یان ئیملایشی تێدایە.

لە ئایەتی ٢١ی سورەی المؤمنون دا وشەی "بُطُونِهَا" هاتووە کە درووستە و ئیشارەتە بە "الانعام" کە مێینەیە واتە مونث و ضمیری مونث بە درووستی بەکار هاتووە کە "ها"یە، تەنانەت گەر بڵێین بۆ مێینەیە وا شیرەکەی هەیە دیسانیش درووستە.

بەڵام لە ئایەتی ٦٦ سورەی النحل وشەی "بُطُونِهِ" هاتووە کە لە ضمیری مذکری(ـە) کەڵک وەرگیراوە، لە کاتێکدا نە الانعام مذکرە و نە شیردەرەکان

بتی شـــــــکاو



ئای داماو پەیجی بتی شکاو بینیت چۆن خۆت تێك شکایت ؟ وە ئەوە چارەنوسی تۆ و هەمو بتەکانی ترە

دژە ئیسلام ڕەخنە لە ئایەتی ٢١ ی سورەتی **المؤمنون** و ئایەتی ٦٦ ی سورەتی **النحل** دەگرێت و دەڵێت لە هەردووك ئایەتەکەدا باسی جێگای شیر دەکات و هەڵەی زمانەوانی و ئیملایی تێدایە . ئەوەی لە وێنەکەدا دەیبینن گومانی دژە ئیسلامەکانە وەك خۆی دام ناوە . بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەبێت لە پێشدا بزانین الانعام چییە ؟

الانعام واتا هەموو ئەو ئاژەڵانەی مرۆڤ بەکاری دەهێنێت و سوودی لێ وەر دەگرێت وەك( مەڕ و بزن و گا و مانگا و حوشتر و ئەسپ و ... هتد) .

وە لە زمانی کوردیدا بەوانە دەگوترێت ماڵات یان گاو گۆتەڵ یان مەڕ و ماڵات کابرای دژە ئیسلام لێرەدا کەوتوەتە هەڵەیەکی زۆر گەورەوە کە نە شارەزایی دەر دەخات لە زمانی عەرەبیدا و نازانێت الانعام مانای چییە ؟ چونکە ئەگەر بیزانیایە الانعام مانای ماڵاتە ئەو ڕەخنەیەی نە دەگرت چونکە ماڵات کۆیە ( جمعه ) وە هەموو کۆیەکیش تێکەلاوە واتا نێر و مێیە .

وە کاتێك نێر و مێ تێکەڵاو بێت کەواتا باسی جێگای شیر ناکات چونکە ماڵات نێریشی تێدایە و نێر شیری نییە و کاکی دژە ئیسلام گا بە گوندا دەناسێت وە لێرەدا تێ کەوتووە و دەتوانرێت بەس بەم خاڵە ڕەخنەکەی پوچەڵ بکرێتەوە بەڵام ئێمە زیاتر نەشارەزاییان دەر دەخەین . وە لە زمانی عەرەبیدا هەموو کۆیەك دەکرێت بە مذکر وە بە مؤنثیش واتا بە نێر و بە مێ بە هەردووکیان تەواوە و ڕاستە .

چونكە كاتێك بە كۆ قسە دەكرێت واتا تێكەڵاوە نێرو مێ وە ئەوە ستانداردە لە هەموو زمانێكی جیهاندا كاتێك دەڵێن ماڵات بە كۆمەڵ واتا نێرو مێ تێكەڵاون وە دەكرێت بە مێ بنوسرێت وە دەكرێت بە نێر بنوسرێت .

چونكە زمانی عەرەبی لە هەموو شتێكدا نێرو مێی هەیە بۆیە پێوەری تایبەتیی هەیە بۆ نێرو مێی كۆ ( الجمع ) لە نوسیندا ئەگەر باسی زۆرینە بكات بە مێ دەنوسرێت ئەمەش خۆی بۆ خۆی بەڵگەیەكی بەهێزە بۆ ئەوەی مێ بە زۆرینە حساب دەكرێت و فەزڵی هەیە بەسەر نێردا كە بە كەمینە حساب دەكرێت و ئیسلام فەزڵی مێی داوە بەسەر نێردا نەك مافی مێ بخوات . وە بۆ بەڵگە دوو نموونە دێنینەوە

لە ئایەتی ١٤ ی **الحجراتدا** دەفەرموێت **( قالت الاعراب امنا )** واتا دەشتەكییەكان گوتیان ئیمانمان هێناوە لێرەدا باسی خەڵكی دەرەوەی شارەكان دەكات وە لە هەموو وڵاتێكدا زۆرینەن بۆیە بە مێ ناو هێنراون وە خەڵكی شارەزا لە زمانی عەرەبیدا دەزانێت مەبەست لە زۆرینەیە وە شتێكی دیارە كە خەڵكی دەشت یان گوند نشینەكان ژن و پیاون واتا نێر و مێن وە زۆرینەن بۆیە بە مێ نوسراوە . بە پێوەری دژە ئیسلام بێت ئەمە هەڵەیە و دەبێت بنوسرێت ( قال الاعراب ) چونكە الاعراب نێرە

لە ئایەتی ٣٠ ی سورەتی **یوسفدا** دەفەرموێت **( و قال نسوة في المدينة )** لێرەدا **نسوة** واتا ژنان مێیە بە پێوەری دحە قورئانەكان ئەمە هەڵەیە و دەبێت ئایەتەكە بنوسرێت ( و قالت نسوة في المدينة ) بەڵام لێرەدا مەبەست لە كەمینەیە چونكە ئەو ئافرەتانەی یوسفیان (ع) بینی و دەستی خۆیان بڕی كەم بوون و ژنی وەزیر و دەسەڵات دارە كان بوون باسی ئەو ڕوداوەیان دەكرد بۆیە بە نێر نوسراوە ( قال ) نەك ( قالت ) خەڵكی شارەزا تێ دەگات مەبەست لە كەمینەیە نموونەی تر زۆرن لە قورئاندا بۆ نموونە **الاعراف** ٤٣ دەفەرموێت **( جاءت رسل ربنا )** لە ال **عمران** ١٨٣ دەفەرموێت **( قد جائكم رسل من قبلي )** لە هەردووك ئایەتەكەدا پێغەمبەران یان نێرراوانی تێدایە وە خۆشتان دەزانن نێرراوەكان هەمویان پیاون بەڵام لە ئایەتی یەكەمدا بە مێ هاتووە ( جاءت ) باسی زۆرینەیان دەكات

وە لە ئایەتی **دووەمیشیان** بە نێر هاتووە ( جائكم ) باسی كەمینە یان دەكات . پاش ئەوەی تێگەیشتن كە ناوی كۆ دەكرێت بە **مذكر و مؤنث** واتا نێر و مێ واتا بە هەردووكیان بنوسرێت وە بەگوێرەی مانای ئایەتەكە هەر هەمووی دەزانرێت باسی زۆرینە دەكات یان كەمینە !؟

ئێستا با بێینە سەر ڕەخنەی دژە ئیسلام چونكە لە هەردووك ئایەتەكەدا دەفەرموێت **( و ان لكم في الانعام لعبرة )** واتا لە هەردوو ئایەتەكەدا باسی ماڵات دەكات و ماڵاتیش نێر و مێیە تێكەڵاون وەك لە سەرەوە باسمان كرد بەڵام دەبێت بزانین پاش ئەوە چی نوسراوە ؟

لە ئایەتی یەکەمدا ٢١ ی **المؤمنون** باسی گاو گۆتاڵ دەکات بە گشتی واتا نێر و مێ وە دەفەرموێت ئەوەی ناو سکیتان دەدەینێ بۆ ئەوەی بیخۆنەوە واتا شیرەکەی . **(و لکم فیها منافع کثیرة)** واتا سوودی زۆریشی هەیە بۆتان وەك پێستەکەی و پاشەڕۆکەی و ... هتد وە دەفەرموێت **(و منها تاکلون)** واتا لە گۆشتەکەشی دەخۆن .

وە ئایەتی دوای ئەوە دەفەرموێت **( و علیها و علی الفلك تحملون)** واتا دەتوانن خۆشتان و شمەکەکانتانی بخەنە سەر و بتان گوێزێتەوە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر وە لێرەدا ئەسپ و گوێ درێژ و حوشتر و ... هتد دێتە ناو بازنەی ( الانعام ) وە لەم ئایەتەدا زۆرینەی ماڵاتەکە و بگرە هەر هەمووی باس کراوە بۆیە بە مێ هاتووە .

چونکە باسی هەموو جۆرەکانی ماڵات کراوە بە نێر و مێوە لەگەڵ سودەکانیشیدا بەڵام لە ئایەتی دووەمدا ٦٦ ی **النحل** بە تەنها باسی مێیەکان کراوە کە شیر دەدەن وە لە شیر دەرەکانیش باسی ئەوانە کراوە کە شیریان دەخورێتەوە . چونکە کەر و ئەسپ و لامدا و ... هتد شیریان هەیە بەڵام دەدرێت بە بەچکەکانیان بۆیە لە دووەمدا بە نێر باس کراوە چونکە باسی کەمینە دەکات وە باسی بە تەنها مێیەکان دەکات کە شیرە کەیان دەخورێتەوە نەك هەر هەموو ( الانعام ) وە ئەگەر سەیری ئایەتی ٦٩ ی سورەتی **النحل** بکەین دەفەرموێت : **(یخرج من بطونها شراب مختلف الوانه)**. لێرەدا باسی مێش هەنگوین دەکات بە مێ باسی دەکات ( **بطونها** ) دوای ئەوە دەفەرموێت ئەو هەنگوینە جۆرا و جۆرە . خۆشتان دەزانن هەنگ دەبێت لە زۆربەی زۆری هەڵاڵەکان کۆ بکاتەوە ئینجا دەتوانێت هەنگوین دروست بکات و لێرەشدا بۆیە مێیە چونکە باسی زۆرینەی هەڵاڵەی گوڵەکان دەکات

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : کاکی کۆپی و پەیست تۆ کە شارەزا نییت لە زمانی عربی ڕەخنە لە چی دەگریت ؟ چونکە کابرای قورەیشیی موشریك زۆر لە تۆ شارەزاتر بووە لە زمانی عەرەبی وە ئەگەر بیزانیایە ئەو دوو ئایەتەی جەنابت دات ناوە و دەڵێیت هەڵەی ئیملا و نێر و مێی تێدایە . کابرا هەر کاتی خۆی قورئانی پوچەڵ دەکردەوە و دەی گوت خودای محمد (صلی الله علیه وسلم) فەرقی نێوان نێر و مێ ناکات چۆن من شوێنی دەکەوم !؟

هیوادارم تۆش چاو بە خۆت و زانیاریەکاندا بخشێنیتەوە و پێ بەقەدەر زانیار و تێگەیشتنە کانتدا ڕا بکێشیت و دڵنیا بیت هیچ هەڵەیەکی زمانەوانی و قواعدی و نوسین لە قورئاندا نییە و کافرانی پێش تۆ لە قورەیش زۆر لە تۆ تینو تر بوون هەڵە لە قورئان بگرن و ئاینی ئیسلامیان لە کۆڵ بێتەوە و ئەگەر بە ئەقڵی تۆ و بەم نەزانیەی ئێستای تۆ دژایەتیی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) بکردایە بە دڵنیاییەوە بە( ٦) مانگ لەناو دەچوون و پێویستی نەدەکرد قورئان بە ٢٣ ساڵ بێتە خوارەوە

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و هەشت

## شیر دان بە گەورە

ئەو وێنە و نوسینە معتز
لەکان دایان ناوە و لێیان
نوسیوە
دەقی حەدیسەکەش ئێمە
دامان ناوە



ئەم وێنەیە
پێشکەش بە
سەلەفییەکان
و کاهین و
عەبدەکانی
بوخاری و
موسلیم

أنَّ سالمًا - مولَى أبي حذيفةَ - كان مع أبي حذيفةَ وأهلِه في بيتِهم ، فأتت بنتُ سُهَيلٍ إلى النَّبيِّ صلَّى اللَّهُ عليه وسلَّم ، فقالت : إنَّ سالمًا قد بلغ ما يبلُغُ الرِّجالُ ، وعقل ما عقلوه ، وإنَّه يدخُلُ علينا ، وإنِّي أظنُّ في نفسِ أبي حُذَيفةَ من ذلك شيئًا ؟ فقال النَّبيُّ صلَّى اللَّهُ عليه وسلَّم : أرضعيه تحرُمي عليه ، فأرضعته ، فذهب الَّذي في نفسِ أبي حُذَيفةَ ، فرجعتُ إليه فقلتُ : إنِّي قد أرضعتُه ، فذهب الَّذي في نفسِ أبي حُذَيفةَ !

الراوي : عائشة أم المؤمنين | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح النسائي

الصفحة أو الرقم: 3323

خلاصة حكم المحدث

صحيح



پێشکەش بەوانەی باوەڕیان وایە بوخاری و موسلیم بوهتانچی نەبوون و سوکایەتیان بە پێغەمبەر نەکردووە

گومانێك هەیە هەموو دژە ئیسلامەکان بڵاوی دەکەنەوە هەر لە شیعەو معتزلەوە بیگرە بۆ خاوەن ئاینەکانی تریش وە بێدینەکانیش ئەویش شیردانە بە پیاوی گەورە وێنەکە دەی بینن لە پەیجی معتزلەکانەوە وەرگیراوە ئەم گومانە بە زۆر شێوە و بە زۆر جۆر بێ ڕێزی باس دەکرێت بۆیە ناچینە ئەو باسەوە . بەڵام ئێمە باسی ئەوە دەکەین ئەم شیردانە بە گەورە کەی داهات و بۆچی داهات و هۆکاری چی بوو؟ کاتێك ئەم وردە کاریانەمان زانی گومانەکە خۆی خۆی پوچەڵ دەکاتەوە جاران لە قورەیشدا خەڵکی منداڵیان هەڵ دەگرتەوە و بەخێویان دەکردن وە یان کردن بە کوڕی خۆیان کاتێك ئەو ئایەتە دابەزی و ئەو دیاردەیەی نەهێشت . یەکێك لە صحابەکان کە ناوی ابو حذیفەیە کوڕێکی هەڵ گرت بووەوە ناوی سالم بوودەقی حەدیسەکەش لە وێنەکەدا دامان ناوە و دەڵێت : ژنەکەی ابو حذیفە کە ناوی سهلة ی کچی سهیل بوو هات بۆ لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) پێی گوت ئێستا سالم گەورە بووە دیقەتم داوە کە سالم دێتە ناوماڵ ابو حذیفە شتێك لە دڵیدا دروست دەبێت پێغەمبەریش (صلی اللە علیە وسلم) پێی گوت برۆ شیری بدەرێ . ئەویش چوو شیری پێدا و سهلە دەڵێت لەو ڕۆژەوە کە شیرم پێیدا ئیتر ابو حذیفە هیچ لە دڵیدا نەما.

حەدیسەکە لێرەدا تەواو بوو . ئەوەی تێی دەگەین لەم حەدیسە سالم گەورە بووە و ابو حذیفەش وەك جۆرێك دڵ پیسی یان ئیرەیی یان هەر شتێکی لەو شێوەیە هەبووە بەرامبەر سالم وە ژنەکەی هەستی بەو شتەی ناو دڵی ابو حذیفە کردووە ئەم جۆرە شتانە ئافرەت زیاتر لێی تێ دەگات و هەستی پێ دەکات وە خۆشی هەمان شت دەڵێت بە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ئایا معقولە یان

لۆژیکە ئەو ئافرەتە مەمکی بخاتە دەمی سالمەوە ؟ لە کاتێکدا خۆی هەستی بەو شتەی ناو دڵی مێردەکەی کردووە ؟ وە ئایا مێردەکەی بەوە ڕازی دەبێت ژنەکەی مەمکی بخاتە ناو دەمی سالمەوە لە کاتێکدا هەستی بەرا مبەر سالم گۆڕاوە ؟ هەر خۆی دەق حەدیسەکە گومانی دژە ئیسلامەکان پوچەڵ دەکاتەوە . چونکە ژنەکە خۆی هەستی بەوە کردووە مێردەکەی شتێکی لە دڵدایە بەرامبەر سالم وە هەر ژنەکە خۆی چووە داوای چارەسەری کردوە لە پێغەمبەر (صلى الله علية وسلم) ئایا ئەو ئافرەتە هێندە مێرەدەکەیی خۆش بوێت ڕێگا دەدات بەوەی سالم مەمکی بمژێت ؟ بەڵکو شیرەکەی لە مەمکی دەرهێناوە و کردویەتیە شتێکەوە و پێی داوە خواردویەتیەوە ( ٥ )جار بۆ ماوەی( ٥ )ڕۆژ . وە ئەو حوکمە بەس بۆ سالم بووە نەك بۆ هەموو کەسێك وە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە حوکمی شیردان بە گەورە تایبەت بووە بەس تەنها بە سالم لەوانەیە کەسێك بڵێت ئەی دایکمان عائشە دەڵێت ئەو حووکمە بۆ هەموو کەسە نەك تایبەت بێت بە سالم !؟ لە وەڵامدا دەڵێین ئەوە تەنها ئیجتهاد و تێ ڕوانینێکی دایکمانە بۆ ئەو حەدیسە وە ئێمەی موسوڵمان ئاین لە خودا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەر دەگرین وە دایکمان عائشە ئیجتهادێکە و کردوێتی دەکرێت ڕاست بێت و دەکرێت هەڵە بێت .

**وە پرسیاری بێ وەڵامان ئەمەیە:** ئەگەر حوکمی شیردان بە گەورە تایبەت بێت بە سالم یان تایبەت بێت بە هەموو کەس تکایە ( ١٤ )کەسمان بۆ بهێنن کە لە ماوەی ١٤٠٠ ساڵدا شیریان خوارد بێت وەك سالم . واتا هەر ١٠٠ ساڵ ( ١ )کەسمان بۆ بهێنن لە فقهی ئیسلامدا دڵنیا بن ناتوانن (١) کەسیش بهێنن بۆمان . چونکە تبني لە ئیسلامدا نەماوە و ئەو حاڵەتی شیردان بە گەورە یەش تایبەت بووە بەس بە سالم . پاشان هەر دەق حەدیسەکە و خۆشەویستیی ئەو ئافرەتە بۆ ابو حذیفەی مێردی و هەست کردن بە ئیرەیی مێردەکەی گوومانی دژە ئیسلامەکان پوچەڵ دەکاتەوە کە مەمکی نە خستوەتە دەمی سالمەوە بەڵام معتزلە و بێدینەکان دەق حەدیسەکە وەك خۆی دا نانێن وەك دەبینن من دام ناوە لە وێنەکەدا.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و چل و نۆ

## ئایا ژیانی بەهەشت حەیوانە ؟

سایدە گاورە عەرەبەکان گومانیان بڵاو کردوەتەوە لەسەر ئایەتی ٦٤ ی **العنكبوت** وە دەڵێن لە قورئاندا خودا ماڵی کۆتای واتا ئەو دنیای بە ئاژەڵ وەسف کردوە و نوسراوە ( **و ان الدار الاخرة لهي الحيوان** ) کاکی قەشەی کوردیش هەمان گومانی کڵێسا و عەرەبەکانی ترجمە کردوە و بۆ وەڵام دانەوەی لە لایەن ئێمەوە مەرجی هەیە و دەڵێت ئەگەر الحیوانت بە الحیاة پینە کرد . پێم بڵێ چۆن الحیاة و الحیوان یە ك مانایان هەیە ؟

ئەمە وێنەی ئەو گومانیە قەشەی کورد بلاوی کرد ۆتەوە وەك خۆی دامان ناوەتەوە



کێ بون ئەوانەی هێشتا قورئانیان نەخوێنۆتەوە و ئەڵێن کەس ناتوانێ وەکو قورئان بنوسێت یان قورئان هەڵەی تیا نیە ؟

وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ ( العنكبوت ٦٤ )
واتا ماڵی کۆتایت ئاژەڵە

ئەگەر الْحَيَوَانُت پینەکرد بە الحیاة پێم بڵێ لەکەیەوە الحیاة و الحیوان یەک مانایان هەبوە ؟؟ ئەی ئەو هەمو ووشەی الحیاتەی تر چۆن هەیە لە قورئاندا و نەبوە بە الحیوان

لە وەڵامدا دەڵێم : منیش وەك تحدا بە قسەت دەکەم و باسی ( الحیاة ) هەر ناکەم بەس بە تەنها ئاستی نەزانیی تۆ دەر دەخەم وە ناچمە باسی زمانەوانییەوە بزانین الحیاة و الحیوان مانای چییە بە گوێرەی معجمە عەرەبییەکان سەرەتا تۆ ئایەتەکەت بڕیوە و وەك خۆی دات نەناوە !؟ دەقی ئایەتەکە دەفەرموێت : (**و ما هذه الحياة الدنيا الا لهو و لعب و ان دار الاخرة لهي الحيوان لو كنتم تعلمون** )!؟ ئایەتەکە زۆر بە سادەیی ڕاڤە دەکەم بە کوردی و دەفەرموێت

ئەم ژیانەی دنیا کە تێیدان پێك هاتووە لە ( لهو واتا هەر شتێك مەشغولت بکات ) وە ( لعب لە زمانی عەرەبیدا واتا دژی جدیات ) وە ماڵی کۆتایی واتا ئەو دنیا ژیانی تەواوەتییە ئەگەر بزانن !؟ کاکی قەشە دیقەت بدە هەر لەناو هەمان دەقدا ووشەی ( الحیاة ) ی تێدایە باشە ئەگەر بە راڤەی جەنابت بێت دەبێت بەم شێوەیە بێت : ئەم ژیانەی کە تێیدان پێك هاتوە لە لهو لعب وە ماڵی کۆتایی واتا ئەو دنیا ئاژەڵە ئەگەر بزانن . ئەگەر ئەم ئایەتە بەو تێگەیشتنەی تۆ بوایە ئایا ئەم ئایەتە نە دەبوو بە باشترین پاساو بۆ کافرانی قورەیش گاڵتە بە قورئان و موسوڵمانان بکەن ؟ئایا ئەم ئایەتە باشترین بەڵگە نە بوو بۆ کافرانی قورەیش و جولەکەکانی مەدینە و منافقەکان بەکاری بهێنن دژی موسوڵمانەکان بۆ ئەوەی پەشیمان ببنەوە لە ئیسلام ؟ چونکە ئاینی ئیسلام هەموو هەوڵێکی بۆ دابین کردنی ژیانی تا هەتایی دوای مردنە لە بەهەشتدا وە ئەگەر کابرا لەو دنیا ئاژەڵ بێت کەواتا بۆ شوێن ئیسلام و قورئان بکەوێت ؟ وە بە دڵنیای یەوە ئەم ئایەتە کۆتایی بە ئاینی ئیسلام دەهێنا و کەس شوێن قورئان نە دەکەوت و خۆی نە دەخستە ئاستی ئاژەڵەوە پاشان ١٤٠٠ ساڵە ئاینی ئیسلامی مەزن بەردەوامە ئایا ئەو خەڵکە هیچیان ئەقڵیان بەوە نەشکاوە شوێن ئەم ئاینە نەکەون چونکە ڕەنج بە خەسارن و لەو دنیا دەبن بە ئاژەڵ . وە لە کۆتایی ئایەتەکەشدا هەر خۆی دەفەرموێت ( **لو كنتم تعلمون** )

واتا بیر بکەنەوە و هەڵ بژێرن لە نێوان ژیانێکی دنیایی کە یاری و گەمەیە و ژیانێکی دوای مردن کە ئاژەڵن !؟ ئایا هیچ کەسێك هەیە هێندە گەمژە بێت بخرێتە بەردەم دوو هەڵ بژاردن ( الحیاة ) وە ( الحیوان ) کە هەردووکی لە دەقی ئایەتەکەدا هەیە کابرا ..

حیوانەکە هەڵ بژێرێت نەك حیاتەکە ؟ کاکی قەشە خۆ هەر دەقەکە خۆی بە درۆت دەخاتەوە و ئاستی نەزانیت نیشان دەدات و پێویست ناکات تۆ پێمان بڵێیت مەگەڕێن بە دوای مانای **الحیاتدا** ؟ چونکە هەردووکیان لە دەقەکەدا هەیە و لە کۆتایشدا اختیار دەداتە دەست خۆت دەڵێت (لو کنتم تعلمون) واتا کامیان هەڵ دەبژێریت الحیاة یان الحیوان !؟ کەواتا ئەوەی نازانێت مانای الحیوان و الحیاة چییە ؟ تۆی داماویت نەك ئێمەی موسوڵمان و نەك قورئان هەڵەی کرد بێت !؟

فەرموو ئەوە من هیچ باسی الحیاتم بۆ نەکردیت و ئاستی نەزانی و نە شارەزایی تۆم دەر خست و بە سادەترین ڕاڤەش بۆم ڕاڤە کردیت

**پرسیاری بێ وەڵامی منیش ئەمەیە** : کاتێك باسی ژیانی کۆتایی دەکرێت بۆ یە ك کەس نییە بەڵکو بۆ هەموو خەڵکە و دەبێت بە کۆ بێت ؟ وە کۆتایی ئایەتەکەش بە ( **لو کنتم تعلمون** ) کۆتایی هاتووە وە ووشەی ( الحیوان ) تاکە،فەرموو جەنابت پێمان بڵێ بە کۆ بە ( الحیوان ) دەڵێن چی ؟ وە بۆچی ووشەی ئەو ئاژەڵە بە تاکە نەك بە کۆ ؟ بە هەموو پێوەرێك دەبوایە ووشەی الحیوان بە کۆ بهاتایە نەك بە تاك !؟ وە پێمان بڵێ کۆی ( الحیاة ) چییە لە زمانی عەرەبیدا ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا

## خودا بۆچی ڕێگریی نەکرد لە دەست کاری کردنی ئینجیل !؟

چەند پرسیارێکی لاهوتی ،
یەکەم : ئایا خوا (کلیی معریفە ) تەواوی زانیاری هەیە یان نا ؟؟
دوهەم : ئایا بەر لەدروستکردنی گەردون خوا ئەی زانی ئینجیل دەستکاری دەکرێت ؟؟ یان نەی ئەزانی ؟؟
سێ هەم : ئەگەر نەی زانیەوە ئەوە خوانیە !!
وە ئەگەر زانیویتی ئایا تواناى نەبو رێگرى لیبکات ؟؟ یان تواناى هەبوو ؟؟ ئەگەر هەی بو بۆ رێگرى لینەکرد؟؟ وە ئەگەر تەواوى توانایی (کلیی القدرە ) نیە ئەوە خوانیە ؟؟



پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

بەڕێزان چەند پرسیارێکی کۆن وروژاوە کە لای موسوڵمانی کورد تازەیە و نەی بیستووە ؟ تکایە سەیری وێنەکە بکەن و پرسیارەکان ببینن . وە ئەم پرسیارانە کڵێسا دەی وروژێنن نەك جولەکە . بۆیە ئێمەش لە پێشدا لە کڵێسا خۆیەوە دەست پێ دەکەین و بە خودی ئینجیلەکان و سەرچاوەکانی خۆیان وەلامیان دەدەینەوە و بۆ ئێوە و بۆ ئەوانیشی دەسەلمێنن کە شوێن ئاینێك کەوتون کتێب و شەریعەتەکانیان دەست نوسی مرۆڤە

سەرەتا ئەوە بزانن کە کتێبی پیرۆز دوو بەشە کە ئێشتر باسمان کردووە . پەیمانی کۆن کە ئێمە پێی دەڵێین تەورات وە پەیمانی تازە کە ئێمە پێی دەڵێین ئینجیل . وە هەموو کڵێساکان لە جیهاندا لە کۆن و لە ئێستادا دەبێت هەردووك کتێبەکە بەکار بهێنێت ئینجا دەتوانێت دینداری بکات چونکە لە پەیمانی کۆندا هەموو شەریعەتەکانی تێدایە . بەڵام لە پەیمانی تازەدا هیچی تێدا نیە و هەر

( ٤ )ئینجیلە کەیان ژیان نامەی عیسایە (ع) و سەرگوزشتەیە و باقیاتی تری پەیمانی نوێ نامەی تایبەتیی خەڵکییە ناردوێتی بۆ کەسانی تر . وە نامەکان هیچ نین ئەوانیش هەمووی ئامۆژگارییە و هیچ شەریعە تێکی تێدا نییە وە جولەکە بە تەنها پەیمانی کۆن بەکار دەهێنێت و باوەڕی بە پەیمانی تازە و عیسا (ع) وە کڵێسا نییە بەڵام ئاینی کڵێسا و گاورەکان دەبێت مل کەچ بن بەرامبەر جولەکە و پەیمانی کۆن و ئەگەر یاسایەك دەر بچێت بڵێن نابێت کڵێسا پەیمانی کۆن بەکار بهێنێت .

ئەوا ئاینی کڵێسا و مەسیحیەت لە چاو تروکاندنێکدا دەتوێتەوە. لێرەدا پرسیارێك دەکەین : بۆچی جولەکە باوەڕی بە ئینجیل نییە و مەسیحی دەبێت باوەڕی بە تەورات هەبێت ؟ خۆ جولەکە موسوڵمان نین و بڵێن ئینجیل تەحریف کراوە ! بەڵکو هەر باوەڕیشیان بە یە ك وشەی نییە کە تێیدا نوسراوە لە کاتێکدا مەسیح (ع) خۆی جولەکە بووە و بە تەنها بۆ جولەکە نێرراوە لە ئینجیلی **مەتا** ١٥ دەقی ٢٤ دا مەسیح دەڵێت : من تەنها بۆ مەڕە وون بووەکانی ماڵی ئیسرائیل نێردراوم کەواتە دەبێت یەکەم کەس شوێن مەسیح بکەوێت جولەکە بێت . وە نابێت هیچ قەومێکی تر شوێن مەسیح بکەوێت چونکە دەقەکە ڕون و ئاشکرایە دەڵێت ( بە تەنها ) بۆ جولەکە گومڕاکان نێرراوم . وە ئاینی جولەکە ئاینێکی داخراوە و کەس وەر ناگرێت و ئاینێ مەسیحیش وەك دەبینن بەس بۆ جولەکە نێرراوە نەك بۆ هەموو جیهان وە دەست کاری کردنی کتێبەکانیان ئاساییە چونکە لەبەر دەستی چەند کەسانێکی کەم دان و نازانرێت چیی تێدایە !؟ با لێرەدا هەڵوێستەیەك بکەین و بزانین کێ تەوراتی نوسیەوە ؟ تکایە کلیکی ئەم لینکە بکەن و ڕاستیی نوسینەوەی تەوراتیشتان بۆ دەر دەکەوێت لە زەمانی موساوە هەتا عیسا علیهم السلام

https://www.facebook.com/1553401181577496/photos/pb.1553401181577496.-2207520000.1435465478./1570964199821194/?type=3&theater

..............................

**بابەتی ناو لینك**

## سەیری پرسیارە بی وەڵامەکان ( ٦٩) بکەن لا پەرە (١٤٠)

........................

هەر ئینجیلی **مەتا** بەشی ٢٣ دەقی ٣٧ و ٣٨ و ٣٩ مەسیح (ع) خەمبارە بەوەی جولەکە پێغەمبەران دەکوژن و بەرد بارانیان دەکەن وە خودا لە زەمانی عیسای کوڕی مەریەمەوە پێیان دەڵێت چەندەها جار ویستومە کۆتان بکەمەوە و بتان کەم بە یە ك میلەت و یە ك کتێب وەك مریشك چۆن جوجەڵەکانی دەخاتە ژێر باڵیەوە منیش ئاوها کۆتان بکەمەوە بەلام ئێوە خۆتان بە دەستی خۆتان ماڵەکەتان وێران دەکەن . باشە ئێستا ئایەتی ١٣ و ٤٤ ی سورەتی **المائدة** و ئایەتی ٤٦ ی سورەتی **النساء** بخوێننەوە بزانن چۆن وەسفی جولەکە دەکات ؟

ئایا خودا پێی گوتوون پێغەمبەرەکان و نێرراوەکانی بکوژن ؟ ئایا خودا دەی زانی پێغەمبەرەکانی دە کوژرێن و بەرد باران دەکرێن ؟ ئەگەر دەیزانی بۆچی بۆی دەناردن ؟

هەروەها لە سفری **ارمیا** بەشی ٢٣ دەق ٣٣ هەتا ٤٠ دا بە ڕونی نوسراوە و ارمیا پێیان دەڵێت ئێوە وەحی خودا تحریف دەکەن بۆیە خوداش لەناوتان دەبات وە دیقەتی دەق ٣٦ بدەن بە ڕونی باسی تحریفەکە دەکات وە کلێسای میزۆپۆتامیا تحریفی ترجمە کردوە بە سروش وە سروشی بۆ ترجمە کردوین بە بارگرانی ئایا ئەمە تحریف نییە ؟ ئایا ئەمە دەست کاری نییە ؟ من و ئەوانەی ئەم پۆستە دەخوێننەوە دەزانین ئێوە لە هەولێر دەست کاری ئەم کتێبە دەکەن . ئەی چۆن خودا نازانێت دەست کاری دەکەن ؟ فەرموون دەست کارییەکە بە جاوی خۆتان ببینن و لەگەڵ نوسخەکانی تردا بەراوردی بکەن

http://www.kitebipiroz.com/bible/jer/23

.........................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » یەرمیا » بەشی ٢٣

**پەیام و پێغەمبەرایەتی درۆزن**

33 (کاتێك ئەم گەلە یان پێغەمبەر یان کاهینێك لێت دەپرسێت: "سروشی[b] یەزدان چییە؟" پێیان بڵێ: "سروشی چی؟ یەزدان دەفەرموێت: من لە کۆڵ خۆمتان دەکەمەوە."

34 هەر کەسێك، پێغەمبەر یان کاهین یان لە گەل، ئەگەر وا بڵێت: "ئەمە سروشی یەزدانە،" خۆی و ماڵەکەی سزا دەدەم.

35 ئاوا بە یەکتری دەڵێن، هەریەکە بە برادەرەکەی و هەریەکە بە براکەی: "وەڵامی یەزدان چی بوو؟ یەزدان چی فەرمووی؟"

36 بەڵام چیتر باسی "سروشی یەزدان" ناکەن، چونکە هەرکەسە و قسەکەی خۆی دەبێت بە سروشەکەی، ئێوە دەستکاری فەرموودەکانی خودای زیندووتان کرد، فەرموودەکانی خودامان، یەزدانی سوپاسالار.

37 ئاوا بە هەر پێغەمبەرێك دەڵێیت: "وەڵامی یەزدان چی بوو؟ یەزدان چی فەرمووی؟"

38 هەرچەندە وا بڵێن: "ئەمە سروشی یەزدانە،" یەزدان ئەمە دەفەرموێت: لەبەر ئەوەی ئەم قسەیە دەکەن: "ئەمە سروشی یەزدانە،" هەرچەندە من بۆم ناردوون کە وا نەڵێن: "ئەمە سروشی یەزدانە،"

39 لەبەر ئەوە بە تەواوی لەبەردەمی خۆم هەڵتان دەگرم و لە کۆڵ خۆمتان دەکەمەوە، خۆتان و ئەم شارەش کە بە خۆتان و باوباپیرانتانم داوە.

40 ڕیسواییەکی هەتاهەتایی و سەرشۆڕییەکی هەتاهەتاییتان لەسەر دادەنێم کە هەرگیز لەیاد نەچێت.)

---

a. هەندێك لە فریشتەکان لەبەردەم خودا ئامادە دەبن، خودا لە فەرمایشت و فەرمانەکانی دەکرێ ڕاوێژیان پێ بکات و گفتوگۆیان لەگەڵ بکات

b. عیبری: بارگرانی.

....................................................

هەر سفری **ارمیا** بەشی ٨ خودا لۆمەی جولەکە دەکات بەوەی قەت ڕوو ناکەنە خودا و پشتی تێ دەکەن بۆیە خوداش سزایان دەدات وە لە دەق هەشتەمدا باسی ئەو سزایە دەکات و دەڵێت چونکە قەڵەمی زانا ئاینیەکانتان بۆ نوسینەوەی درۆیە نەك کتێبی خودا !؟ ئێوە چۆن دەڵێن: ئێمە داناین، چونکە فێرکردنی یەزدانمان لەلایە بەڵام ئەوەتا پێنوسی درۆی ماڵمەکان بۆ درۆ دەستبەکار بوو؟ بەڕێزان جوان دیقەت بدەن دەقەکە ڕونە دەڵێت مالمەکان واتا زانا ئاینیەکانی جولەکە دەڵێن ئێمە فێرکردنی یەزدانمان لایە واتا تەورات بەلام ئەو قەڵەمانەی تەوراتی پێ دەنووسنەوە قسەی خودای پێ نا نوسنەوە بەڵکو درۆی پێ دەنوسنەوە هەروەها لە **سفری**

**پاشایانی** یەكەمدا بەشی ١٩ دەق ١٠ باسی ئەوە دەكات ایلیا یان الیاس یەكێكە لە پێغەمبەرانی جولەكە و لە ترسی جولەكە هەڵ هاتووە بۆ ئەشكەوتێك و خودا لێی دەپرسێت ایلیا بۆچی هەڵ هاتویت الیاسیش دەڵێت

ئەویش وەڵامی دایەوە: دڵگەرمییەكی زۆرم هەیە بۆ یەزدان، خودای سوپاسالار، نەوەی ئیسرائیلیش پەیمانەكەی تۆیان شكاندوە قوربانگاكانی تۆیان وێرانكردووە، پێغەمبەرەكانی تۆیان بە شمشێر كوشتووە، منیش بە تەنها ماومەتەوە، ئەوانیش بەدوامدا دەگەڕێن هەتا بمكوژن بۆ ئەوەی بابەتەكە دوور و درێژ نەبێت ئەوەندە بەسە بۆ خوێنەر تێ دەگات كە كتێبەكەی خۆیان دەڵێت ئەمان پێغەمبەرانیان كوشتووە و كتێبەكانیان تحریف كردوە و گۆڕیوە . لێرەدا پرسیار لە كڵێسای مەسیحیی كورد زمان دەكەین : بۆچی خۆتان هەڵ دەستن بە نوسینەوەی كتێبی پیرۆز و هەڵەكانی چاك دەكەنەوە ؟ وە لە نوسخە كوردیەكاندا هەموو هەڵەكانی كتێبی پیرۆزیان چاك كردوەتەوە كە ٥٠ هەزار هەڵەیە . بەلام من دوو هەڵە دەخەمە بەر چاوتان

**یەكەمیان** : لە **سفری التكوین** پەیدابوون بەشی ١٤ دەق ١٢ دا نوسراوە لوط برازای ابراهیمە و هەر دوو دەق دوای ئەوە دەق ١٤ تێیدا نوسراوە لوط برای ئیبراهیمە . بەڵام لە نوسخە كوردیەكەدا ئەو هەڵەیەیان راست كردوەتەوە و هەردووكیان كردووە بە برازا .

**دووەمیان** : لە سفر **الاخبار الایام الثاني** – پوختەی مێژو ٢ بەشی ٩ دەق ٢٥ دا نوسراوە : سلێمان چوار هەزار تەویلەی ئەسپ و گالیسكە و دوازدە هەزار ئەسپی هەبوو. بەلام لە **سفر الملوك الاول** پاشایانی ١ بەشی ٤ دەق ٢٦ دا نوسراوە : **وكان لسليمان اربعون الف مذود لخيل مركباته واثنا عشر الف فارس.** لەم سفرەی **دووەمیان** نوسراوە ٤٠ هەزار تەویلەی ئەسپی هەبوو . بەلام برادەرانی عەینكاوە هاتوون لە هەردووك لا كردویانە بە ٤ هەزار. بەو شێوەیە كاتێك خوێنەری كوردی داماو كتێبی پیرۆز دە خونێتەوە هەست بەو دەس كاریانە ناكات كە قەشەكان لە عینكاوە بە ئارەزوی خۆیان كتێب دەنوسنەوە ؟

**پرسیاری بێ وەلامیشمان** یە ك پرسیارە و زیاتر نییە . خودای زانا لە قورئاندا لە سورەتی الحجر ٩ دا دە فەرموێت : **(انا نحن نزلنا الذكر و انا له حافظون)** . خودا زەمانەتی ١٠٠% ی داوە بەوەی كتێبی قورئان كۆتا كتێبە و فێر كردنە بۆ مرۆڤایەتی و كەس نا توانێت دەست كاری بكات . وە ئەو كتێب و پێغەمبەرا نەی پێش قورئان كاتی بوون و بۆ زەمانێكی دیاری كراو بووە وە پاش دابەزینی قورئان ئەو كتێبانە هیچیان هیچ ئەرزشێكیان نییە و كتێبی خودایی نەماون هەر كەس هەڵ دەستێت بە ئارەزوی خۆی دەی نوسێتەوە ئەگەر بەراوردی نوسخە كوردییەكە بكەین لەگەڵ نوسخەكانی تردا دەبینین ئەم كتێبە نوسین و وەحیی خودا نیە بەڵكو نوسینی برادەرانی عەینكاوەیە وەك لە سەرەوە بینیتان . پاشان ئەگەر كڵێسا راست دەكات با واز لە پەیمانی كۆن بهێنن و بەس بە ئینجیل كڵێسا بەرن بە ڕێوە ؟ ئەگەر ناتوانن بەس بە ئینجیل حوكم بكەن كەواتە ئەوە بەڵگەی حاسا هەڵ نەگرە ئینجیل وتەی خودا نیە !؟ بەڵكو وەك نوسخە كوردیەكەی عەینكاوەیە و بە ئارەزووی خۆیان نوسیویانەتەوە و هیچ كەس نازانێت متا و مرقۆس و لۆقا و یوحنا كێیە ؟ وە ئەگەر نەسخەی ئینجیلی عیسایان لایە ئیمەش دەتوانین بڵێین ئینجیل دەستكاری نەكراوە ؟ وە با ئەوان

یە ك دەقمان بۆ بهێنن لە پەیمانی كۆن یان تازە خودا زەمانەتی ئەوەی دابێت ئەو كتێبە دەپارێزێت لە تحریف( **انا نحن نزلنا الذكر و انا له لحافظون**).

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :سەد و پەنجا و یەك

## شەیتان چۆن چووە بەهەشتەوە ؟

1. فوسوس لهما الشيطان ليبدي لهما ما ووري عنهما من سوآتهما وقال ما نهاكما ربكما عن هذه الشجرة إلا أن تكونا ملكين أو تكونا من الخالدين ﴿الأعراف: ٢٠﴾
2. فوسوس إليه الشيطان قال يا آدم هل أدلك على شجرة الخلد وملك لا يبلى ﴿طه: ١٢٠﴾

ئەو ئایەتانەی باسی چونە ناو بەهەشتی دەكات



### له 11 ئایەتدا باسی ابلیس كراوە 9 دانەیان تایبەتە بە ئادەم ؟

إلا إبليس أبى أن يكون مع الساجدين ﴿الحجر: ٣١﴾

قال يا إبليس ما لك ألا تكون مع الساجدين ﴿الحجر: ٣٢﴾

وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس قال أأسجد لمن خلقت طينا ﴿الإسراء: ٦١﴾

وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس كان من الجن ففسق عن أمر ربه أفتتخذونه وذريته أولياء من دوني وهم لكم عدو بئس للظالمين بدلا ﴿الكهف: ٥٠﴾

وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس أبى واستكبر وكان من الكافرين ﴿البقرة: ٣٤﴾

ولقد خلقناكم ثم صورناكم ثم قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس لم يكن من الساجدين ﴿الأعراف: ١١﴾

وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس أبى ﴿طه: ١١٦﴾

إلا إبليس استكبر وكان من الكافرين ﴿ص: ٧٤﴾

قال يا إبليس ما منعك أن تسجد لما خلقت بيدي أستكبرت أم كنت من العالين ﴿ص: ٧٥﴾

ئەم پرسیارەم زۆرێ دەكرێت لە لایەن موسوڵمانەكانەوە بە تایبەتی كاتێك بێدینەكان لێیان دەپرسن باشە كە خودا شەیتانی دەركرد لە ڕەحمەتی خۆی چۆن جارێكی تر چووەوە ناو بەهەشت و ئادەم و حەوای هەڵ خەڵەتاند ؟

**بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەڵێین** : كاتێك ئادەم (ع) خلق كرا ابلیسی بینی چونكە فریشتەكان هەموویان كڕنوشیان بۆ برد بەس ابلیس كڕنوشی بۆ نەبرد وە لە قورئاندا( ١١ ) جار ناوی ابلیس هاتووە (٩) ئایەتیان باسی ڕوداوی سوجدە نە بردنی ابلیس دەكات بۆ ئادەم (ع) بەڵام كاتێك دەچێتەوە بۆ بەهەشت و ئادەم و حەوا علیهما السلام لە خشتە دەبات لە قورئاندا لە دوو شوێندا باس كراوە لە ئایەتی ٢٠ ی سورەتی **الاعرافدا** دەفەرمەوێت ( **فوسوس لهما الشیطان** ) واتا شەیتان وەسوەسەی خستە دڵی هەردووكیانەوە هی ئادەم و حەوا علیهما السلام وە لە ئایەتی ١٢٠ ی سورەتی **طه** دا بە تەنها باسی ئادەم (ع) دەكات و دەفەرموێت ( **فوسوس الیه الشیطان** ئەگەر دیقەت بدەن لە هەردووك ئایەتەكەدا ناڵێت ( ابلیس ) بەڵكو دەڵێت ( شیطان ) وە دەڵێت وەسوەسەی كردووە . خۆشتان دەزانن ابلیس نا بینرێت و كاری ئەوەیە وەسوەسە بكات و لە خشتەمان بەرێت وەك چۆن وەسوەسەی كرد و ئادەم و حەوای (ع) هاندا لە بەری ئەو دارە بخۆن . كەواتا شەیتان بە لاشە نە چوەتە بەهەشتەوە چونكە ئەگەر بە لاشە بوایە ئادەم (ع)

دەی ناسیپەوە و لەمەوبەر بینی بووی بەڵکو لە ڕێگای وەسوەسە وە ئەو کارەی کردووە  وە نە ئادەم (ع) وە نە ئێمەش وەسوەسەی شەیتان نا بینین و هەمیشە لەگەڵماندایە و هەموو کارێکمان پێ دەکات وە بۆ زانینی جیاوازیی نێوان شەیتان و ابلیس کلیکی ئەم لینکە بکە ن

pb.1553401181577496.-/photos/١٥٥٣٤٠١١٨١٥٧٧٤٩٦/https://www.facebook.com
theater&type=3؟/١٥٥٦٠٣٠٠٠١٣١٤٦١٤/.٠٠٠٠.١٤٤١٩٣٣٣٩9220752

.................................

**بابەتی ناو لینک**

سەیری پرسیارە بێ وەلآمەکان ( ٤٢ ) بکەن .لاپەرە(٨٣)

........................................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و دوو

## لە قورئاندا نە زانراوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەمرێت یان دەکوژرێت



دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە ئایەتی ١٤٤ ی سورەتی **ال عمران** دەگرن و دەڵێن خودا نەی زانیووە پێغەمبەرە کەی (صلى الله عليه وسلم) کەی و چۆن دەمرێت ؟ چونکە ئایەتەکە دەفەرموێت : (افان مات او قتل )!؟ ئەم ڕەخنەیەش هەر هی بێدینەکان نییە بەڵکو

هی شیعەی رافیزەیە و ئەمانیش لە شیعەوە وەریان گرتووە چونکە شیعە دوو ڕیوایەتیان هەیە و دەڵێن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) عائشەی خێزانی زەهری داوەتێ مردووە و دەڵێن کە هاوەڵاکانی کوشتویانە بۆ ئەوەی خۆیان ببن بە خەلیفە!

وەلامی ئەم گومانە زۆر ئاسانە و پێویستی بە ڕون کردنەوەی زۆر نییە . چونکە ئەگەر لە ئایەتی ١٣٩ وە بیخوێنینەوە هەتا ١٤٥ بۆمان دەر دەکەوێت باسی شەڕی ئوحد دەکات و هەر هەموو موفەسیرە کانیش لەسەر ئەوە کۆکن کە باسی دوای شەڕی غەزوەی ئوحد دەکات و ڕوداوەکانی شەڕەکە باس دەکات چی بووە ؟ دیار ترین ڕوداوی غەزوەی ئوحد بریندار بوونی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم) وە شکانی موسوڵمانان بو لەگەڵ شڵەژان ی موسوڵمانان لە کاتی شەڕەکە چونکە کەس نەی دەزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چی بەسەر هاتووە !؟

دوای شەڕەکە ئینجا زانییان بریندارە و ئەو دیار نەمانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە کاتی شەڕەکەدا پشێویی گەورەی دروست کرد . وە دوای شەڕەکە خودای زانا بە موسوڵمانان دەڵێت محمدیش (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەرێکە وەك پێغەمبەرانی پێشوتان و ئەویش مرۆڤە یان دەمرێت یان دەکوژرێت وە ئایا ئەگەر مرد یان کوژرا ئێوە بۆچی ڕیزەکانتان تێك دەدەن و تێك دەچن و پاشەکشێ دەکەن ؟ ئەگەر مرد یان کوژرا ئێوە بەردەوام بن و ئاین و پەیامی خۆتان بگەیێنن و مردن و کوشتنی ئەویش نابێتە ڕێگر لەوەی ئێوە بەر دەوام نەبن لە گەیاندنی پەیامەکەتان یان لە شەڕدا بکشێنەوە و دەست بەر بدەن لەبەر ئەوەی محمد (صلی الله علیة وسلم) کوژراوە وە هەر ئایەتی ١٤٥ گومانی شیعەی ڕافیزە و کابرای قەشەی کورد بە ناوی بێدینەوە پوچەڵ دەکاتەوە دەفەرموێت **( و ما كان لنفس ان تموت الا باذن الله كتابا مؤجلا )**. واتا هیچ کەسێك نامرێت ئیلا بە ئیزن و ویستی خودا نە بێت وە نوسراوە کەی دەمرێت .

کەواتا ئەو ئایەتەی ژمارە ١٤٥ دڵنیامان دەکاتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەمرێت و ناکوژرێت بەڵام هێشتا کاتی نە هاتووە !؟ و ئەم ئایەتەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کۆتایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە مردنە نەك کوشتن !؟ یان زەهر دەرخوارد دان .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەم جارە بۆ موسوڵمانەکانە :**

بۆچی کاتێك گومانێك بڵاو دەبێتەوە دەبێت بە کێشەی گەورە بۆتان ؟ وە تاکەی دەرس وەر ناگرن و تێ ناگەن کە دژە ئیسلامە کان دەقەکان دەبڕن ؟**وە بۆچی ئێوەی موسوڵمان تۆزێك خۆتان ماندوو ناکەن پاش و پێشەکەی بخوێننەوە و گەڕانێکی بۆ ناکەن** ؟ وە دڵنیا بن وەلامی هەموو گومانێك لە دەقی ئایەتەکە یان حەدیسەکەدایە . بەڵام ئێوە تەمبەڵن و تاقەتی گەڕانتان نییە ئایا دەتان زانی ئەو ئایەتەی ١٤٤ ی **ال عمران** باسی پاش تەواو بونی شەڕی ئوحد دەکات

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و سێ

## خوداکان زۆرن لە قورئاندا

فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ المؤمنون ١٤
الله موبارەکە کە باشترین دروستکەرە
کەواتە بە پێی ئەم ئایەتە زۆرێک خالق هەنە
بەڵام الله لە هەمویان باشترە
ئیسلامیەکان قسەی سەر زاریان ئەمەیە (خوای گەورە)
کەواتە خوای گچکەو مام ناوەند و گەورەش هەیە!
ئێستا بەپێی قورعان خالیق زۆرە باش و
خراپیان هەیەو الله لەهەمویان باشترە، بەپێی
قسەی موسڵمانانیش خوا بە قەبارەیە گەورەو
بچوک و ناوەندی هەیە واتا فری سایز نیە!!!
بۆ ئەوەی ئەم بابەتە یەکلایی بکەینەوە پێشنیار ئەکەم
هەر کەس ناوی خوای خۆی بنوسێت و جیاوازیەکانی
لەگەڵ خواکانی تر بە بەڵگەوە .. ئەوەی بەڵگەی تەواو
بوو خواکەی ئەنێرین بۆ بەرنامەی من جیاوازم!

دژە ئیسلامەکان ڕەخنە لە ئایەتی ١٤ ی سورەتی **المؤمنون** دەگرن کە دەفەرموێت ( **فتبارك الله احسن الخالقين** ) وە دەڵێن ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی غەیری الله خالقی تریش هەیە . ئەگینا خالق بەس بۆ خودا بەکار دەهێنرێت مادام دەڵێت خالقین بە کۆ مانای وایە خالقەکان یان خوداکان و خودا تاك و تەنها نییە !؟ طبعا ئەم گومانە هی ساید و کەناڵە مەسیحیەکانە . بەلام ئەوەی جێگای پێکەنینە گاورە کوردەکان لە کۆپی و پەیستیشدا لێهاتو و شارەزا نین نەزانە هاتووە ( **تبارك** ) ی بە موبارەك ڕاڤە کردووە و نوسیوێتی الله موبارەکە وەك لە وێنەی پۆستەکەدا دەیبینن . وەھ تبارك مانای تعالى و تقدس واتا بەرزی و پیرۆزی . بە هەر حاڵ با واز لە وڕێنەی گاوری کورد بهێنین !؟ و بێێنە سەر وەلامی گومانەکە

لە زمانی عەرەبیدا خالق بە **سێ** مانا دێت وە هەرسێکیان بە مانای دروست کەر یان بنیات نەر دێن وە کاتێك دەڵێین الله خالقە واتا لە هیچەوە هەموو شتێك دروست دەکات ( **انما امره كن فيكون** ) واتا بە بێ کەرەستە دەتوانێت هەموو شت دروست بکات بەلام

بونەوەرەکانی تر دەبێت کەرەستەیان لا بێت ئینجا دەتوانن شت دروست بکەن . ئەمە مانای یەکەمی خالقە بۆ خلق وە ئەم مانایەش ڕونە لای دیندار و دژە ئیسلامیش کە تەنها خودا دەتوانێت بە بێ کەرەستە شت دروست بکات وە خلق بکات وە مانای **دووەمی** خلق ( درۆ ) یە لە زمانی عەرەبیدا وەك لە ئایەتی ١٧ ی سورەتی **العنكبوتدا** ابراهیم (ع) بە قەومەکەی دەفەرموێت ( **وتخلقون افكا** ) واتا درۆ دەکەن و بت دروست دەکەن و دەڵێن ئەمە خودایە . ئەگەر بە تێگەیشتنی دژە ئیسلام بێت دەبێت بڵێن بتەکانیش خالقن !؟ وە لەم ئایەتەدا باسی خلق دەکات وە درۆ بە خلق ناو دەبات بەلام بە مانای خلق الله نایەت !؟ هەروەها مانای **سێیەمیش** بۆ هەموو کەس دەشێت بڵێن خالق چونکە مرۆڤیش شت خلق دەکات بەلام کاری مرۆڤ هەمیشە دەبێت کەسەرەستەکەی لا بێت ئینجا دەتوانێت شتەکە دروست بکات لە ئایەتی ٤٩ ی ال **عمراندا** عیسا (ع) دەفەرموێت **( اني اخلق لكم من الطين كهيئة الطير** ) واتا لە قوڕ شتێکی هاو شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم وەلێرەدا وشەی خلق هەیە ئایا دەکرێت بڵێێن عیسا (ع) خالقە ؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر چونکە لە قوڕەکە باڵندەکەی دروست کردووە نەك بە بێ کەرەستە دروستی بکات . کەواتا جیاوازی نێوان خلق کە دروست کراوە و خالق کە دروست کەرەکەیە . ئەمەیە خودا و خەڵکیش هەردووکمان خالقین وە شت خلق دەکەن بەڵام جیاوازیان ئەمەیە خودا لە هیچ شت دروست دەکات بەڵام مرۆڤ لە کەرەستە شت دروستی دەکات . بۆیە ووشەی خالق بۆ مرۆڤیش بەکار دێت کاتێك شتێك دروست دەکات بەڵام ناچێتە پلەی خلقی خوداوە کە بە بێ کەرەستە شت دروست دەکات.

چونکە مرۆڤ دەبێت حساب و تقدیر بۆ شتەکان بکات پاشان کەرەستەکان بهێنێت ئەو شتەی لێ دروست بکات وە عەرەب خۆیان تێ گەیشتون لە مانای ( **احسن الخالقين** ) وە زانیویانە مرۆڤیش هەر بە خالق یان دروست کەر ناسراوە لەلایان ئەگینا ئەو ئایەتەی دژە ئیسلام ڕەخنەی لێ دەگرێت باشترین بەهانە و حوجە بووە بۆ موشریکەکانی قورەیش . چونکە ئەوان باوەڕیان بە فرە خودای و بە بتەکانیان هەبووە .. وە قورئانیش دەڵێت (**تبارك الله احسن الخالقين**) ئەوەش خاڵی هاوبەش بووە لە نێوانیاندا بۆ ئەوەی خوداکەی محمدیش (صلى الله علية وسلم) بخەنە ڕیزی خوداکەی خۆیان . ئەی بۆچی موشریکەکانی قورەیش ئەو ئایەتەیان نە قۆزتەوە و بیکەن بە بەڵگە بۆ پوچەڵ کرد نەوەی تاك و تەنهایی الله وە بت پەرستەکان بڵێن ئێمە خودای بتمان زۆرە ئێوەش خوداتان زۆرە دەڵێن ( **احسن الخالقين** ) وەرن با خوداکانمان تێکەڵ بکەین !؟ ئایا نەیان دەتوانی بەو ئایەتە قورئان پوچەڵ بکەنەوە و کەس شوێنی ئیسلام نەکەوێت ؟ ئایا کاتێك پێغەمبەریان (صلى الله علية وسلم) بانگ کرد گوتیان ڕێك دەکەوین لەگەڵتان ڕۆژێك خودای ئێمە بپەرستن ئێمەش ڕۆژێك خودای ئێوە دەپەرستین . بۆچی ڕێك نەکەوتن لە کاتێکدا لە دوو ئایەتدا باسی احسن الخالقين دەکات لە ئایەتی **الصافات** ١٢٥ و ١٤ ی **المؤمنون** وە ئەو دوو ئایەتە دەبوو بە خاڵی هاوبەشی نێوان موسوڵمان و بت پەرستەکان نەزانیی دژە ئیسلام لەوەدایە هیچ زمانی عربی نازانێت و ڕەخنە دەگرێت بەلام کابرای قورەیشی شارەزا بوە لە زمانی خۆیدا و زانیوێتی مرۆڤیش خالقە بەلام خلقی مرۆڤ و خودا زەوی و ئاسمانی فەرقە و لە شیعری عەرەبیشدا ناوی خالق هاتووە و زهیر دەڵێت

**ولأنت تفري ما خلقت **** وبعض القوم يخلق ثم لا يفري**

کاتی خۆی عەرەب لە بیابان کە جل و بەرگ یان پێڵاویان دروست دەکرد لە پێستە دەهاتن قیاسیان دەگرت پاشان دەیان بڕی ئینجا دەیان دووری . وە پێی دەڵێن خلق واتا دروست کردن . ئەو شیعرەش دەڵێت :

**(و لانت تفري ما خلقت:)** واتا : ئەگەر تۆ بتەوێت شتێك دروست بكەیت دەبێت قیاس یان تقدیری بگریت ئینجا دروستی بكەیت ( **و بعض القوم یخلق ثم لا یفري** ) بەڵام خەڵكی تر دروستی دەكەن بە بێ ئەوەی تقدیر و حسابی بۆ بكات دروستی دەكات ئەگەر دیقەت بدەن باسی خلق دەكات وە كابرای عەرەبی قورەیشی دەزانێت خلق مانای چییە ؟ و خلقی الله و خلقی مرۆڤ لێك جودا دەكاتەوە و دەزانێت احسن الخالقین مانای خودا یان خوداكان نییە وە كابرای بت پەرست زۆر لە ئێوە شارەزاتر و بە ویژدان تر بووە و نەی توانیووە درۆ بكات چونكە گەر راڤەی **احسن الخالقین** ی بە خوداكان بكردایە چوار دەورەكەی حەیایان دەبرد . بەڵام تۆی دژە ئیسلام نازانیت مانای تەریق بونەوە چییە ؟ وە گوێی نادەیتێ چونكە ئەو ئایەتەی جەنابت ڕەخنەی لێ دەگریت بە تەواوەتی ئایەتەكە بخوێنەوە باسی دروست بوونی قۆناغەكانی كۆر پەلە دەكات وە لە كۆتاییدا دەفەرموێت فتبارك الله احسن الخالقین . واتا ئێوەش شت دروست دەكەن بەلام ئەم خلق و دروست كردنەی الله لەگەڵ ئێوەدا زۆر جیاوازە و ناتوانن ئەوە دروست بكەن وە تقدیر و حسابی بۆ بكەن . لەوانەیە كەسێك بڵێت ئەی ئەوە نییە منداڵی شوشە دروست دەكەن ؟ ئێمەش دەڵێین با بتوانن بە بێ تۆو دروستی بكەن ؟وە تبارك الله احسن الخالقین بە مانای حساب و تقدیر دێت باسی حساب و تقدیری خودا دێت بۆ دروست كردنی كۆرپەلە كە مرۆڤ ناتوانێت ئەو حساب و تقدیرە بكات . بۆیە خودا باشترین خالق و بنیات نەر و دروست كەرە وە كابرای قورەیشی زۆر جوان لە مانای ئەو ئایەتە تێگەیشتووە . و جیاوازیی دروست كراوی خۆی و خودای كردوە و زانیوێتی الله باشترین خالقە نەك مرۆڤ وە ئەو ئایەتەش موعجیزە و تحدایە بۆ تۆی بە ناو بێدین لەم زەمانی ٢٠١٥ یەدا كە دەتوانرێت هەموو شتێك دروست بكرێت بەلام ناتوانرێت هیچ مرۆڤێك دروست بكرێت ؟ وە حساب و تقدیری تۆی بە حساب زانست باز هەر محدود و دیاری كراوە و خلقی تۆ و خلقی الله زۆر جیاوازە

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : وا بزانە ئەو ئایەتەی جەنابت ڕەخنەی لێ دەگریت ئێستا دابەزیوە و چونكە تۆ دەڵێیت پێویستم بە خودا نییە و خۆم دەتوانم هەموو شتێك دروست دەكەم . ئایەتەكەش باسی كۆرپەلە دەكات و دەفەرموێت (**فتبارك الله احسن الخالقین** ). فەرموو جەنابت بتوانە كۆرپەلەمان لە هیچ بۆ دروست بكە ؟هەروەها عەرەبی جاهیلی و شارەزایان لە زمانی عەرەبیدا لە ئێستادا دەزانن خلق دوو جۆرە خلقی خودا و خلقی مرۆڤ بەڵگەشمان ئایەتی ١١ ی سورەتی **لوقمانە** دەفەرموێت (**هذا خلق الله فاروني ماذا خلق الذین من دونه بل الظالمون في ضلال** مبین ). لێرەدا بە جوانی ئەو گومانەی دژە ئیسلامەكان پوچەڵ دەبێتەوە چونكە خودای زانا باسی دروست كراوەكانی الله دەكات وە دەڵێت الله ئەم كەونەی خلق كردووە ، ئادەی خلق و دروست كراوی مرۆڤم نیشان بدەن بزانین چییان دروست كردووە و بە ( من دونە ) مرۆڤ و هەموو شتێك وەسف دەكات واتا زۆر نزم و لە خوار و بێ دەسەڵاتن و ناتوانن هیچ شتێك خلق بكەن وەك الله وە ئەم ئایەتە ڕوون و ئاشكرایە كە خلق و خالق بۆ مرۆڤ و الله ش

بەکار دێت بەلام خلق الله کن فیکونە و بێ کەرەستەیە و خلقی مرۆڤ بە حساب و کیتابە بۆیە ئێمەش دەڵێین فتبارك الله احسن الخالقین کە کەس ناتوانێت وەك الله داهێنان و دروست کردن بکات لە هیچەوە و بێ کەرەستە ئایا ئێستا زانیت مانای خالقین بە خوداکان نایەت وە جیاوازیی نێوان خلقی مرۆڤ و الله دەکەیت ؟ هیوادارم بتوانیت راڤەی ئەم شیعرەش بکەیت کە باسی درۆزن دەکات وە دروست کردنی درۆش بە خلق ناو دەبات ؟ ئایا درۆزن خالقە ؟ ئەگەر خالقە لەکام خانەی خالقیندایە ؟

لي حيلة فيمـن ينم **** وليس في الكذاب حلية

من كان يخلق ما يقول**** فحيلتي فيه قليلة

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و چوار

## ئایەتەکانی زانین و بینین لە قورئاندا







لە قورئانی پیرۆزدا ووشەی ( **الم تروە الم تروا وە الم یروا وە اولم یروا وە ... هتد** ) هاتووە . دژە ئیسلامیش ڕەخنەیان لێ دەگرێت و دەڵێت لە قورئاندا باسی شتی ڕابردوو دەکات و دەڵێت ئایا نەت بینی یان نەتان بینی بە کۆ ؟ئێمەش دەڵێین نەخێر نەمان بینی و مادام شتێکمان نە بینیووە بۆچی باوەڕی پێ بکەین ؟ سەیری وێنەکە بکەن ڕەخنەی دژە ئیسلامامان وەك خۆی داناوە بۆتان

بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەڵێێن ووشەی الم تر و الم یر بە تاك و بە کۆ بە مانای بینین دێت وە زیاتر بە مانای زانین یان زانیاری دێت وە بە گوێرەی ئایەتەکە ماناکەی دەگۆڕێت . بۆ نمونە لە ئایەتی ١٤٨ ی **الاعرافدا** باسی قەومی موسا (ع) دەکات پاش دەرچونیان لە میسر لە خشڵ و ئاڵتونەکانیان گوێرەکەیەکیان دروست کرد وە خودا دە فەرموێت **( الم یروا لا یکلمهم و لا یهدیهم )**؟ لێرەدا ڕووی ئەو بینین و تێگەیشتنە بۆ ئێمە نییە بەڵکو بۆ قەومی موسایە !؟ پێیان دەفەرموێت ئەی نەیان بینی یان نەیان زانی ئەو گوێرەکە نە قسەیان لەگەڵ دەکات و نە دەتوانێت هیدایەتیان بدات ؟ وە لەم ئایەتە دا الم یروا بە مانای بینین و زانینیش دێت بەڵام بۆ ئێمە نییە بەڵکو بۆ بنو اسرائیلە و بە تایبەتی ئەوانەی لەگەڵ موسادا (ع) لە میسر دەرچوون و ئەو ڕوداوەیان بینیووە . خودا لە قورئاندا پرسیار دەکات دەڵێت ئایا نەیان دەزانی ئەو گوێرەکەیە ناتوانێت قسەیان لەگەڵدا بکات ؟بۆیە بە مانای بینین و زانینیش دێت وە لێرەدا ڕووی قسە بە تەنها لەو کەسانەیە کە لەگەڵ موسادا (ع) دەرچون لە میسر وە نەسیحەت و عیبرەتە و مانای زانین دەبەخشێت بۆ ئێمە کە ئەو ڕوداوە بزانین بەلام بۆ ئەوانەی لەگەڵ موسادا (ع) بوون بە مانای زانین و بینینیش دێت بەلام بۆ ئێمە بەس زانینە

لە ئایەتی ١٥ ی سورەتی **فصلتدا** خودای زانا باسی قەومی عادمان بۆ دەکات کە دەیان گوت هیچ کەس نییە لە ئێمە بەهێزتر بێت لەسەر زەوی . پاشان دەفەرموێت **(او لم یروا ان الله الذي خلقهم هو اشد منهم قوة )** ئایا نەیان دەزانی کە خودا زۆر لەوان بەهێز ترە ؟ بەڵێ دەیان زانی چونکە خودای تعالی پێغەمبەر هود ی (ع) بۆ ناردن بەڵام گاڵتەیان پێ دەکرد و هەر خۆیان بە بەهێزتر دەزانی زیاتر لە خودا . بەڵام کاتێك لەناو چوون و هێز و توانای خودایان بینی زانینەکەیان فریایان نەکەوت چونکە بینییان هێزی خودا لەوان زیاترە ئینجا زانییان هێزی خودا چییە ؟ پاش لەناو چوونیان . بۆیە بۆ قەومی عاد **( او لم یروا )** بە مانای زانین و بینینیش دێت . بەڵام بۆ ئێمە بە مانای زانین دێت بە تەنیا لە ئایەتی ٧٧ ی سورەتی **یاسیندا** دەفەرموێت ئایا مرۆڤ نازانێت کە لە قەترەیەك ئاو دروستمان کردووە کەچی دژایەتیمان دەکات لێرەدا **( او لم یر )** بۆ کۆن و ئێستا و داهاتووشە بۆ بینین و زانینیشە چونکە لە کۆن و نوێ و لە داهاتووشدا مرۆڤ دەزانێت و دەی بینێت کە لە تۆوی پیاو ژن دروست دەبێت وە ئەم ئایەتە بۆ بینین و زانینیش و بۆ هەموو کات و زەمانێکیشە بێ جیاوازی بە هەر حاڵ ئەو ئایەتانەی کە باسی الم تر و اولم یروا هاو شێوەکانی زیاتر بە مانای زانین دێت بۆ ئێمە چونکە ئێستا لە ڕێگای قورئانەوە ئەو هەواڵ و بەسەرهاتانە دەزانین بۆیە بە گوێرەی ئایەتەکە و سیاق ئایەتەکە واتا هەموو ئایەتەکە و پاش و پێشی ئایەتەکە مانای ( الم تر و اولم یروا ) هاوشێوەکانی دەگۆڕێت و بە گوێرەی بەسەر هاتەکان ماناکەی دەگۆڕرێت و کاتێك باسی ڕوداوەکە دەکات بۆ ئەوانەی لە ڕوداوەکەدا ژیاون بە مانای بینین و زانین دێت چونکە باسی ئەو کاتە دەکات وە ئەو کاتەش ئەو کەسانە ئەو ڕوداوا نەیان بینیووە بۆیە بۆ ئەوان بە مانای بینین و زانین دێت . بەڵام بۆ ئێمە بە تەنها بە مانای زانین دێت وە هەموو مفسرەکان کۆکن لەسەر ئەوەی بە مانای زانین دێت نەك بینین چونکە هەموو ڕوداوەکان باسی لەمەوبەر دەکات و باسی ڕوداوێك دەدات ڕووی داوە . باشترین نموونەش ڕووداو ی فیلە کە دەفەرموێت **( الم تر کیف فعل ربك باصحاب**

**الفيل** ؟ ) ئەم پرسیارە ڕوو بە ڕوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وە موشریکەکانی قورەیش و ئێمەش کراوەتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت دەفەرموێت ئایا نەت بینی یان نەت زانی خودا چی لە خاوەن فیلەکە کرد ؟ ئەگەر لێکی بدەینەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو ڕوداوەی نە بینیوە و ٤٠ ساڵ پێش ئەو بووە . چونکە خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) لە ساڵی فیلدا لە دایك بووە بۆیە ڕوداوەکەی نە بینیوە بەڵام لە ڕێگای خەڵکییەوە زانیوێتی . وە خەڵکانێکیش هەبون ئەو ڕوداوەیان بینیوە و کاتێك سورەتی فیل دابەزیوە بۆیە بۆ ئەو کەسانە بینین و زانین بووە . بەلام بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەس تەنها زانین بووە چونکە بیستوێتی بەلام بۆ ئێمە تەنها زانینە و هەواڵێکە لە ڕێگای قورئانەوە دەیزانین و بۆ ئێمە بینین نیە . بۆیە ئەو ئایەتا نەی باسی الم تر و الم یروا ... هتد . دەکات هەر هەمووی بە مانای زانین دێت نەك بینین و هەر هەمووی وەك مێژوو وایە وە زۆر جاریش باسی داهاتوو دەکات یا ئێستا و بەردەوامیش باس دەکات بۆیە کاتێك دژە ئیسلامەکان ڕەخنە دەگرن لەو جۆرە ئایەتانە ئێوەش دەقی ئایەتەکە و پاش و پێشی وەربگرن ئینجا وەلامیان بدەنەوە و گومانەکانیان پوچەڵ دەکەنەوە.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و پێنج

## خودا مۆر لە دڵی بێ باوەڕان دەدات ؟

ئەمە ئەو 7 ئایەتەیە کە باسی هۆکاری کفری ئەو کافرانە دەکات لە لایەن خۆیانەوەیە

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿البقرة: ٦﴾

خَتَمَ اللَّـهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ وَعَلَىٰ أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿البقرة: ٧﴾

ئەمەش ئایەتی 6 و 7 ی البقرەیە کە دژە اسلامەکان ڕەخنەی لێ دەگرن

1. فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِآيَاتِ اللَّـهِ وَقَتْلِهِمُ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ بَلْ طَبَعَ اللَّـهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿النساء: ١٥٥﴾
2. تِلْكَ الْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَائِهَا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا مِن قَبْلُ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّـهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الْكَافِرِينَ ﴿الأعراف: ١٠١﴾
3. إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَاءُ رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ وَطَبَعَ اللَّـهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿التوبة: ٩٣﴾
4. أُولَـٰئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّـهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ وَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿النحل: ١٠٨﴾
5. كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّـهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿الروم: ٥٩﴾
6. الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّـهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّـهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّـهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿غافر: ٣٥﴾
7. وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰ إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِندِكَ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفًا أُولَـٰئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّـهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ ﴿محمد: ١٦﴾



پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

ڕەخنە لە ئایەتی ٧ ی **البقره** دەگرن و دەڵێن خودا لە قورئاندا دەڵێت مۆرم داوە لە دڵ و گوێی کافرەکان و لەسەر چاویشیان پەردە هەیە وە عەزاب دەدرێن وە دەڵێن ئێمە تاوانمان چییە کە خودا مۆری لە دڵمان دا بێت وە بۆچی عەزابمان دەدات ؟ ئەمەش دەقی

ئایەتەکەی قورئانەکەی خۆتانە وا دەڵێت : (**ختم الله على قلوبهم و على سمعهم و على ابصارهم غشاوة و لهم عذاب عظيم** ). بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەبێت پێشەکی بزانین ختم چییە ؟ ئەو کات گومانە کە خۆی پووچەڵ دەبێتەوە

ختم واتا مۆر : مۆریش واتا طبع یان چاپ وە هەموو مۆرێکیش لە دنیادا چاپ دەکات واتا ئەو شتەی تێیدا نوسراوە دەی گوێزێتەوە بۆ سەر کاغەز یان ئاسن یان قوڕ یان ... هتد . وە هەمیشە یەك شت طبع دەکات و ناگۆڕێت کەواتا مۆر هەموو جارێك هەمان شتە و نە گۆڕە . هەروەها مۆر ناسراوە چونکە هەر جێگا و فەرمانگە و کارگە و ... هتد . مۆرێکی تایبەتیی خۆیی هەیە کاتێك دەی بینین دەزانین ئەو شتە یان ئەو کاغەزە تایبەتە بەو شوێنە کەواتە مۆر ناسراوە و نەگۆڕە . هەموو مۆرێکیش لە کۆتاییدا دەدرێت لە شمەك یان لە کاغەز واتا کاتێك کارگەیەك پارچەیەك شت دروست دەکات لە کۆتایدا مۆرەکەی لێ دەدات مرۆڤیش کاتێك کارێکی دەبێت لە فەرمانگەیەك کارەکەی تەواو دەبێت ئینجا مۆر لە کاغەزەکە دەدرێت واتا کاری لەو بەشە یان لەو فەرمانگەیە نەما و کارەکری قبوڵ کرا

هەر بۆیە کاتێك کەسێك قورئان هەر هەمووی دەخوێنێتەوە دەڵێت قورئانم خەتم کرد واتا هەموویم تەواو کرد ئێستا تێ گەیشتین مۆر ناسراوە و نەگۆڕە و بۆ کۆتایی هەموو شتێکە . هەروەها کۆتا مانای مۆر بۆ داخستنیش بەکار دێت ، کاتێك خواردنەوەیەك سەر قاپی پێوەیە و کەسەکە هەڵی دەپچڕێت دڵنیا دەبێت کە خۆی ئەو شتەی کردوەتەوە و پاکە و یەکەم کەسە ئەو شتە دەخواتەوە یان دەخوات . پاش ئەوەی مانای مۆرمان زانی با بزانین ئایە تەکە چی دەفەرموێت ؟ وەك دەزانن دژە ئیسلام ئایەتەکان دەبڕێت . وە ئایەتی پێش ئەو کە ئایەی شەشە دەفەرموێت : (**ان الذين كفروا سواء عليهم اانذرتهم ام لم تنذرهم لا يؤمنون**) واتا ئەوانەی کفر دەکەن ئەگەر ئاگادار بکرێنەوە و نە کرێنەوە وەك یەکە و باوەڕ نا هێنن . کێشە لێرەدا ئەوەیە ئەم ئایەتە موسوڵمانی عەوام لێی تێ ناگات !؟ ئیللا ئەو کەسانە باش لێی تێ دەگەن کە لەگەڵ دژە ئیسلامەکاندا گفتوگۆ و مێز گرد دەکەن وە ١٠٠% لە مانای ئەم ئایەتە تێ دەگەن و دەزانن دژە ئیسلام بە هەموو شێوەیەك باوەڕ نا هێنێت وە تەنانەت وای لێ هاتووە ئەوانەی زۆر قاڵن لەگەڵ دژە ئیسلامەکاندا دەیان ناسن و بە هیچ شێوەیەك مناقشەیان ناکەن چونکە دەزانن هیچ سودی نییە و کاتی خۆیان لەگەڵیاندا ناکوژن چونکە مەسەلەی مناقشەی ئیمان و کفر لای ئەوان نێرە بی دۆشەیە . بەڵام لای موسوڵمانی عەوام شتێکی ترە کابرای عەوام یان کە دژە ئیسلام نا ناسێت دەڵێت بەڵکو خودا هیدایەتی بدات و خەریك دەبێت لەگەڵیدا . هەتا ئەویش دەگاتە خاڵی نێرە بیدۆشە و کابرا دەناسێت ئینجا کۆڵ دەدات .

کەواتا حاڵی موسوڵمان دوو جۆرە **یەکێکیان** کە دژە ئیسلامەکە دەبینیت هیچ گوێی پێ نادات چونکە دەی ناسێت و دەزانێت قسەی بۆ بکات و نەکات وەك یەکە . ئەوی **دووەمیشیان** مناقشەی دەکات .ئێستا لە ئایەتی( ٦ ) تەواو بووین و زانیمان دژە ئیسلام حەلی نییە و ئەگەر لەگەڵی بلێێن و نە لێین وەك یەکە . با ئێستا بێینە سەر ئایەتی (٧) کە دژە ئیسلام ڕەخنەی لێ گرتووە دەفەرموێت( **ختم الله على قلوبهم و على سمعهم و على ابصارهم غشاوة** ). لە پێشەوە باسمان کرد ختم یان مۆر ناسراوە و نەگۆڕە و بۆ کۆتایی

هەموو شتێکە و بۆ داخستنیش بەکار دێت ئەم کەسانەش لای خودا ناسراون و دەزانێت نا گۆڕێن وە کۆتاییان هەر بە کافری دەمرن وە ئەقڵ و گوێ و چاویان داخراوە . نەك خودا گوێ و جاو ئەقڵی دا خستبێتن !؟ چۆن ئێمەی مرۆڤ کە لە بوواری دژە ئیسلامدا کار دەکەین و باشیان دەناسین طبعا لای خوداش ئەوانە ناسراون وە خودا دەزانێت ئەمانە تا مردنیان باوەڕ نا هێنن بۆیە عەزابی گەورە ی بۆ داناون . چونکە خودای تعالی علمی غیب دەزانێت و دەزانێت ئەو کەسە باوەڕ نا هێنێت و بە بێ باوەڕی دەمرێت و لله المثل الاعلی چۆن ئێمە ی شارەزا لە بوواری دژە ئیسلامدا دەیان ناسین و ئیهمالیان دەکەین چونکە طبعیان دەناسین و (یە ك ملیار) نموونەیان بۆ بهێنینەوە ئەوان هەر باوەڕ ناکەن . بۆیە زۆر گوێیان نادەینێ ئەی خودای زانا کە علمی غەیب دەزانێت وە خۆی خالقی ئەو کەسەیە و لە ئێمە زاناترە دەزانێت باوەڕ نا هێنێت ئەگەر هەموو دنیای بۆ بکەیت بە بەڵگە . وە خۆزگەم موسوڵمانان بە عام لەگەڵ ئەو کافر و دژە ئیسلامانەدا گفت و گۆیان دەکرد ئەو کات بە جوانی لە مانای ئەو ئایەتە تێ دەگەیشتن کە دژە ئیسلام بە هەموو شێوەیەك ئامانجی ئەوەیە قسەی قورئان ڕەت بکاتەوە نەك لێکۆڵینەوە و گفت و گۆ بکات بۆ تێگەیشتن وە ئەگەر لە هەموو لایەکەوە بەڵگەی موسوڵمان بەهێز بێت ئەوی ملحد لە کۆتای دا بە هەر هۆکارێك بێت ڕەتی دەکاتەوە

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئەگەر مانای ختم بە قفڵ یان داخستنیش وەر بگرین ئایا ئەو داخستنی دڵ و گوێچکە و جاوە لای خوداوەیە یان لای کافرەوەیە ؟ ئەگەر بڵێن لای خوداوەیە بۆچی چەندەها کەسی بێ باوەڕ و ملحد ئیمان دەهێنن ؟ وە هەمیشە ڕێژەی ئەوانەی ئیمان دەهێنن زیاترە لەوانەی ئیمان نا هێنن . چونکە کابرای ملحد ئەگەر بە نەزانی یان بە هەڵە لە ئاین تێ گەیشت بێت بیر دەکاتەوە و پرسیار دەکات و دەگاتە ڕاستییەکان . بەلام ئەو کافر و ملحدەی کە ئامانجی ڕەت کردنەوەی خودا و قورئان و ئیسلامە نا بیستێت و نا بینێت و بیر ناکاتەوە و هەمیشە دژایەتی دەکای بۆ ئەوەی بڵێت نەخێر ئەوانە دەچنە خانەی **( سواء علیهم اانذرتهم ام لم تنذرهم لا یؤمنون )** چونکە خۆیان بە دەستی خۆیان هەموو هەستەکانیان داخستووە بۆ ئەوەی ڕاستی و بەڵگەکان بە درۆ بخەنەوە . بەڵگەشمان زۆرە کە ئەو کافر و ملحدانە خۆیان هۆکاری ئەو خەتمە یان ئەو طبعەن نەك خودا وە خۆیان نا بیستن و کاریان ئەوەیە بە هەموو توانایان بڵێن اسلام درۆیە

سەیری وێنەکە بکەن ( ٧ )ئایەتمان بۆ داناون خۆتان دەتوانن پاش و پێشی ئایەتەکان بخوێننەوە و بزانن باسی کێ دەکات ؟ وە هۆکاری ئەوەی نا بیستن یان نا بینن یان بیر ناکەنەوە یان کفر دەکەن هەر کەسە کافەکە خۆیەتی نەك خودا وە هەر هەمووشمان خەڵکانێکی زۆری کافر و ملحد و دژە ئیسلاممان دیوە لێکدانەوە و بیر کردنەوەیان هەبووە و گوێیان ڕا گرتووە بۆ بەڵگەکان و ڕێگای ڕاستیان دۆزیوەتەوە . وە زۆریشیان هەیە هەتا دەمرێ کاری ئەوەیە دژایەتی بکات وە هیچ شتێك بە بەڵگە دا نانێت و خەڵکیش لێی بێزاربوون دەی ناسن کە ئەو کەسە کەڵکی قسە وەرگرتن ی نەماوە و گفت و گۆکانی نێرە بیدۆشەیە . وە ئەو ختمەی باس کراوە بە دەست مرۆڤەکە خۆیەتی چۆن طبعی دەکات وە چۆن خۆی دەناسێنێت لای خودا و لای خەڵکیش نەك خودا طبعی وا دروست کرد بێت هیچ وەر نەگرێت !؟

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و شەش

## بۆچی زیاتر لە نیو ملیۆن صحابی لە اسلام هەڵ گەڕانەوە ؟

دەڵێن محمد (د.خ) بوکەکەی خۆیی هێناوە کە دەکاتە ژنی کوڕەکەی بەڵگەشیان بۆ قسەکانیان ئایەتی 37 ی سورەتی الاحزابە



پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّـهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّـهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّـهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّـهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّـهِ مَفْعُولًا ﴿الأحزاب: ٣٧﴾

دەڵێن محمد (د.خ) منداڵێکی 9 ساڵانی هێناوە و چۆن دەبێت منداڵی 9 ساڵان بدرێت بە شوو !؟ بەڵگەشیان حەدیسی صحیحە لە کتێبەکانی حەدیسدا هەیە

عن عائشةَ ، قالت : تزوَّجني النبيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ وأنا بنتُ ستِّ سنينَ . وبنى بي وأنا بنتُ تسعِ سنينَ .

الراوي : عائشة أم المؤمنين | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم الصفحة أو الرقم: 1422 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

کورد دەڵێت بە تیرێك دوو نیشانە دەشکێنم یان بە بەردێك دوو چۆلەکە دەکوژم . ئێمەش بەم **بابەتە** دوو گومانی گەورەی دژە ئیسلامەکان پوچەڵ دەکەینەوە بە ئیزنی خودا

**گومانی یەکەمیان** : دەڵێن (صلی الله علیه وسلم) بوکەکەی خۆیی هێناوە کە دەکاتە ژنی کوڕەکەی . بەڵگەشیان بۆ قسەکانیان ئایەتی ٣٧ ی سورەتی **الاحزابە**

**گومانی دووەمیان** : دەڵێن محمد (صلی الله علیه وسلم) منداڵێکی( ٩ )ساڵانی هێناوە و چۆن دەبێت منداڵی( ٩ )ساڵان بدرێت بە شوو !؟ بەڵگەشیان حەدیسی صحیحە لە کتێبەکانی حەدیسدا هەیە

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : ئایا محمد (صلی الله علیه وسلم ) کوڕی هەبوو ؟ کوڕەکەی ناوی چی بو وە لە کام ژنەی بوو ؟ بۆچی محمد (صلی الله علیه وسلم) ژنی کوڕەکەی خۆیی هێنا لە کاتێکدا لە ئاینی ئیسلامدا ئەو شتە حەرامە ؟وە بۆچی ئەو ژن هێنانە نەکرا بە بەڵگە بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئاینی ئیسلام لە لایەن موشریکە کانی قورە یشەوە ؟ و بڵێن ئێوە بوکی خۆتان دەهێنن و ئەوەش پێچەوانەی ئاینی ئیسلامە ؟

بۆچی کاتێك محمد (صلی الله علیه وسلم) منداڵێکی( ٩ ) ساڵانی هێنا موشریکەکانی قورەیش نەیان کرد بە هەرا و خەڵکی هان بدەن بۆ ئەوەی لە ئیسلام پەشیمان ببنەوە . بەڵگەشیان زۆر بەهێز بوو ئەویش بە شودانی کچێکی منداڵی (٩) ساڵان بوو

یان تۆی دژە ئیسلام بە ئەقڵی ئایفۆن و ئایپاد بیر دەکەیتەوە و بێ ئاگایت لە مێژوو !؟ فەرموو تەنها یەك بەڵگەمان بۆ بهێنە کە محمد (صلى الله عليه وسلم) ژنی کوڕەکەی خۆیی هێناوەتەوە و ناوی دایکی ئەو کوڕەشمان بۆ بنوسە لە کام ژنەی بووە ؟یان ڕەخنەی کافرەکانی قورەیش و جولەک و منافقەکانی مەدینەمان بۆ بهێنن لەوەی سەر زەنشتییان کرد بێت بوکەکەی خۆی هێناوەتەوە ، یان کارێکی خراپی کرد بێت بەوەی کچێکی (٩) ساڵانی هێناوە و کردوێتی بە ژنی ؟ یان پێمان بڵێن لەسەر ئەو ( ٢) ژن هێنانە چەند کەس پشتی لە ئیسلام کرد و بە کارێکی نەشیاوی دانا ؟ وە معقولیش نییە نەتوانیت یە ك بەڵگە بهێنیت کە ئەو کارە ڕەت کراوەتەوە یان بە عەیبە و نەشیاو دانراون ؟ کەواتا مادام ناتوانیت بەڵگە بهێنیت جەنابت ڕەخنە لە چی دەگریت ؟ وە چۆن پێوانەی ژیانی ئێستا و ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر ووەك یەك دەکەیت ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و حەوت

## القران حمالة اوجه

1- الوجوه والنظائر في القرآن العظيم، لمقاتل بن سليمان البلخي ( ت: 150 )
2- الوجوه والنظائر في القرآن الكريم ، لهارون بن موسى ( ت: 170 )
3- التصاريف، ليحي بن سلام ( ت: 200 )
4- تحصيل نظائر القرآن، للحكيم الترمذي ( ت : 320 )
5- وجوه القرآن، للحيري ( ت : 430 )
6- الوجوه والنظائر لألفاظ كتاب الله العزيز، للدامغاني (ت : 478)
7- نزهة الأعين النواظر في علم الوجوه والنظائر، لابن الجوزي ( ت: 597)
8- كشف السرائر في معنى الوجوه والأشباه والنظائر، لابن العماد المصري ( ت: 887 )

ئەو کتێبانەی لەسەر الوجوه و النظائر لە قورئاندا نوسراون

گومانی دژە ئیسلامی کورد کە لە سایدە گاورە عەرەبییەکانەوە وەری گرتوە وەك خۆی دانراوە

بەکوردی دووڕوو واتا درۆزن، ئەی فرەڕوو مانای چیە قورئان ڕۆ؟



من اصدق ما قيل عن القران
ان القرآن حمال أوجه
علي بن ابي طالب
نهج البلاغة ١/٤ ص ٤٠٥ - دار الكتب العلمية - بيروت – لبنان الطبعة الخامسة عام ٢٠٠٣

ڕاستگۆترین قسە لەسەر قورئان وترابێت: قورئان فرە ڕوو هەڵئەگرێت




کاتێك ئیمامی عەلی هات بۆ عیراق و کێشەی شیعە هەبوو ڕۆشت قسەیان لەگەڵدا بکات وە ابن عباس پێی گوت بە قورئان قسەیان لەگەڵ مەکە چونکە ( حمالة اوجه ) واتا زۆر مانا لە خۆی دەگرێت . بەڵکو بە حەدیس قسەیان لەگەڵدا بکە دژە ئیسلام هاتووە دەڵێت قورئان مانای ڕوون نییە بۆیە چەندەها ساڵە تەفسیری جیا جیای هەیە وە بۆیە ابن عباس گوتویەتیبە حەدیس قسە

بکە چونکە حەدیس صحیح و زەعیف و هەڵبەستراو زۆر شێوەی تری هەیە و دەتوانیت بڵێیت ئەو حەدیسە ڕاست نییە و کێشەکان کۆتایی پێ بهێنیت وێنەی گومانی دژە ئیسلامی کوردمان داناوە وەك خۆی . وە سەرەتا وەڵامی دژە ئیسلام دەدەینەوە کە هیچ شارەزا نییە لە ئاینی ئیسلام و کۆپی و پەیستی سایدە عەرەبییەکان دەکات . چونکە زەمانی ئیمامی عەلی و ابن عباس حەدیسی صحیح و زەعیف بونی نە بووە و هەردووکیان لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیة وسلم) ژیاون و حەدیسەکانیان راستەوخۆ لە زاری خۆشەویستەوە بیستووە . وە عیلمی عەدیس ٢٥٠ بۆ ٣٠٠ ساڵ دوای ئەو ڕوداوە هاتوەتە کایەوە و نوسراوەتەوە

ئەمە **یەکەم** مێخە لە ئەقڵ و تێگەیشتنی دژە ئیسلامی کوردی دەدەین . **دووەم** مێخمان ئەوەیە کاتێك ابن عباس دەڵێت ( القران حمالة اوجه ) خۆی شارەزاتر بوە لە بێدینی ٢٠١٥ و زانیوەتی زمانی خۆی چەند دەوڵەمەند و بەر بڵاو فرە مانایە بۆیە پێی گوتووە بە قورئان گفت و گۆیان لەگەڵ مەکە چونکە ( حمالة اوجه ) .

لە سەرەتادا با بزانین **حمالة اوجه** مانای چییە ؟ واتا هەڵگری شێوەکانە بۆ زیاتر تێگەیشتنیش دەبێت بزانین عیلمێك هەیە لە زانین و تفسیری قورئاندا پێی دەڵێن عیلمی ( الوجوە و النظائر ) وە هیچ مفسرێك ناتوانێت قورئان تەفسیر بکات ئەگەر ئەو عیلمە نەزانێت وە زۆر کتێبی لەسەر نوسراوە لە وێنەکەدا ناوی ( ٨ ) کتێبی ناسراومان بۆ داناون . بە کورتی ئەم عیلمە واتا تێگەیشتن و ڕاڤە کردنی قورئان بە گوێرەی زمانە ئەسڵییەکەی چونکە لە کاتی هیچ پێغەمبەرێکدا موفەسیر بونی نەبووە !؟ ئەو پێغەمبەرە قسەی کردوە و خەڵکەکەش لێی تێگەیشتوون . وە پاش چەند سەدەیەك زمان گۆڕراوە ئینجا مفست هاتوەتە کایەوە بۆ ئەوەی خەڵکی تێ بگەیێنێت لەو ئاینە بە گووێرەی زمان و تێگەیشتنە ئەسڵییەکە وە لە هەمو ئاینێکیشدا مفسر بونی نە بووە لە کاتی سەرەتای بڵاو بونەوەی ئەو ئاینەدا . بۆیە علمی **الوجوە و النظائریش** دوای قورئان هاتوەتە کایەوە و مەبەستی سەرەکی ڕاڤە کردن و شیکاری کردنی وشەکان و ئایەتەکان بە گوێرەی تێگەیشتن و کار پێکردنی زەمانی وەحی واتا گەڕانەوە بۆ بنەما ئەسڵییەکەی وەك دەزانن قورئان وشەکانی دوبارەن بۆ نموونە خیر شر هیدایة امة وە ... هتد . ئەم دوبارانە پێی دەڵێن النظائر واتا هەمان ووشەیە و چەندەها جار دووبارە بوەتەوە . وە الوجوە لە وجهەوە هاتووە واتا شێوە واتا کانی ئەو وشەیە لە شوێنە جیاجیاکاندا بە گوێرەی پاش و پێشی ئەو ووشەیە ماناکەی چی دەبەخشێت بۆیە ابن عباسیش گوتویەتی ( القرئان حمالة اوجه ) واتا ماناکان دەگۆڕرێن بە گوێرەی ئایەتەکان وە بەرامبەریش یان زۆر شارەزایە دەتوانێت هەمان وشەت بۆ بهێنێت لە ئایەتێکی تردا بۆ ئەوەی چوار دەوری چەواشە بکات چونکە ئەو کاتە ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبی نوێ بوو لە عیراقدا وە بەو شێوەیە کابرای عەوام کە عربی نازانێت گوێی لێ دەبێت هەمان ووشەیە دوبارە دەبێتەوە نازانێت کامیان ڕاست دەکەن ؟ وە ئیمامی عەلی لەگەڵ بەرامبەردا ناگەنە ئاکامێکی باش . بۆ ئەوەی جوانتر تێ بگەن باسی بە تەنها ووشەی ( هدای ) دەکەین چونکە ئیمامی عەلی چووە بۆ ئەوەی ئەوانە بگەڕێنەوە و هیدایەت وەر بگرن وە ئەگەر باسی هدی یان لەگەڵدا بکات زیاد لە ( ١٥٠) جار ئەم وشەیە لە قورئانداهەیە وە لێرەدا ( ١٧ ) ئایەتیتان بۆ باس دەکەین کە ئەمە ماناکانێتی بە گوێرەی پاش و پێشی ئایەتەکە ماناکەی دەگۆڕرێت

1-بە مانای جێگیر بوون و بەردەوامی ( **اهدنا السراط المستقيم** ) .

٢ – ڕوون کردنەوە ( **اولئك على هدى من ربهم** ) .

٣ – ئاین ( **ان الهدى هدى الله** ) .

٤ - ئیمان ( **و يزيد الله الذين اهتدوا هدى** ) .

٥ – دوعا ( **و لكل قوم هادي و جعلناهم ائمة يهدون بامرنا**).

6 -- نێررا و کتێبەکانیان ( **فاما ياتينكم مني هدى** ) .

٧ – زانین ( **و بالنجم هم يهتدون** ).

٨ – پێغەمبەر محمد (صلى الله علية وسلم) ( **ان الذين يكتمون ما انزلنا من البينات و الهدى** ) .

٩ – قورئان ( **و لقد جاءهم من ربهم الهدى** ) .

١٠ – تەورات ( **و لقد اتينا موسى الهدى**).

11-گەڕانەوە بۆ لای خودا ( **و اولئك هم المهتدون** ) .

١٢ – بەڵگە و حوجە وەك لە ئایەتی ٢٥٨ ی سورەتی **البقرەدا** هاتووە ابراهیم (ع) بەڵگەی لە نمرود بەهێز تر بوو . وە خودا دەفەرموێت ( **ان الله لا يهدي القوم الظالمين**).

13 --توحيد ( **ان نتبع الهدى معك** ) .

١٤ – سونە ( **فبهداهم اقتده و انا على اثارهم مقتدون** ) .

١٥ – اصلاح و چاکسازی ( **و ان الله لا يهدي كيد الخائنئن** ) .

١٦ – ئیلهام و ڕێ نیشان دان چۆن بتوانن بژین خواردنی خۆیان پەیدا بکەن و خۆیان لە مەترسی بپارێزن و بمێننەوە ( **اعطى كل شئ خلقه ثم هدى**

-17 تۆبە کردن ( **انا هدنا اليك** ) .

وابزانم ئێستا تێگەیشتن لە حمالة اوجە چییە ؟ بۆیە هەڵەیە مانای ووشەیەك هەمان مانای بۆ بەکار بهێنین بۆ هەموو ئایەتەکان چونکە بە گوێرەی ئایەتەکە ماناکەش دەگۆڕرێت . بۆیە دەبینین معتزلەکان کاتێك قسە دەکەن بە ئایەت قسە دەکەن بەڵام ماناکانی تێك دەدەن و موسوڵمانی عەوامیش نازانێت ئەم دژە ئیسلامانە چەواشەکاری دەکەن وە دەڵێت ماموستای معتز لە کان بە ئایەت قسە دەکات بەڵام ماموستا فلان و کابرای بێدین هەردووکیان لە سیاق ماناکە دەر دەچن و گومان بڵاو دەکەنەوە و خەڵکی شارەزا دەزانێت ئەمانە درۆ دەکەن و ئەو ئایەتە ئەو مانایە نا بەخشێت کە ماموستا فلان یان فلان بێدین زوڕنای بۆ لێ دەدات !؟ ابن عباسیش بە ئیمامی عەلی گوتووە بە حەدیس قسە بکە چونکە ئاینی ئیسلام و بڵاو بونەوەی زمانی عربی تازە بووە و خەڵکی چوار

دەور تێ نەگەیشتوون کامیان ڕاست دەکەن ؟ وەك چۆن ئێستا ئەم بێدین و معتزلانە بابەت بڵاو دەکەنەوە موسوڵمانی کوردیش عربی نازانێت ! وا دەزانێت مامۆستا فلان یان فلانە بێدین ڕاست دەکات و موسوڵمانی عەوام توشی گومان دەبێت لەو ناوەندەدا .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە:**

ئایا هەموو زمانەکانی جیهان وشەی زۆری تێدا هەیە هەمان وشە ماناکەی بگۆڕێت بە گوێرەی ڕستەکە یان نا ؟ طبعا دەڵێن بەڵێ ئێمەش دەڵێین کەواتا بۆچی ڕەخنە لە زمانی قورئان دەگریت حمالة الوجهه ؟ خۆ ئەو حمالة الوجهه لە هەمو زمانێکی جیهانیدا هەیە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت زیاتر شارەزا بن لە مانای یە ك ووشە بە گوێرەی ئایەتەکان دەتوانن سود لەم کتێبە ببینن – _قاموس القران او اصلاح الوجوه و النظائر في القران الكريم للفقيه المفسر الجامع الحسين بن محمد الدامغاني_

وە ئەگەر هەر کەس بتوانێت ئەم ووشانە لەبەر بکات و لێی تێ بگات ئەو کات تێگەیشتن و کار کردنی بە قورئان وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە هاوەڵانی وایە . چونکە مانا جیاجیاکانی قورئانی تێدایە بۆ یە ك ووشە بە گوێرەی ئایەتەکان وە دەتوانێت خۆی حساب بکات لەو فیرقیەی کە دەچێتە بەهەشتەوە لە (٧٣) فیرقەکە ، چونکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەسڵی قورئانەکە وەك چۆن دابەزیووە و خەڵکی لێی تێ گەیشتوون بە بێ مفسر .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و هەشت

## مێش هەمووی لە دۆزەخدان بێجگە لە مێش هەنگ



قال ابن الجوزي في الموضوعات

باب دخول الذباب النار فيه عن ابن عمر وأنس .

فأما حديث ابن عمر فله ثلاثة طرق :

1 الطريق الاول : أنبأنا إسماعيل بن أحمد أنبأنا ابن مسعدة أنبأنا حمزة بن يوسف أنبأنا أبو أحمد بن عدى أخبرني الحسن بن سفيان حدثنا شيبان حدثنا أيوب بن حوط عن ليث عن نافع عن ابن عمر قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " الذباب كله في النار " .

2 الطريق الثاني : أنبأنا على بن عبيدالله وأحمد بن الحسن الفقيه قالا أنبأنا / صفحة 266 / عبد الصمد بن المأمون أنبأنا على بن عمر الحربى حدثنا محمد بن محمد الباغندى حدثنى محمد بن عمار حدثنا القاسم بن يزيد بن سفيان عن منصور عن مجاهد عن عبيد بن عمير عن ابن عمر أن النبي صلى الله عليه وسلم : [ الذباب كلها في النار ] .

3 الطريق الثالث : أنبأنا محمد بن عبدالملك أنبأنا إسماعيل بن أبى الفضل أنبأنا حمزة السهمى أنبأنا ابن عدى حدثنا أحمد بن الحسين بن عبد الصمد حدثنا يحيى بن حكيم حدثنا عمير بن سفيان أنبأنا إسماعيل المكى عن الاعمش عن مجاهد عن ابن عمر قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " الذباب كله في النار غير النحلة " .

4 و أما حديث أنس : أنبأنا ابن خيرون أنبأنا ابن مسعدة أنبأنا حمزة أنبأنا ابن عدى أنبأنا أبو يعلى حدثنا سنان حدثنا سكين بن عبد العزيز عن أبيه عن أنس قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " عمر الذباب أربعون يوما " .

هذه الاحاديث لا تصح .

أما حديث ابن عمر ففى طريقه الاول أيوب بن خوط .

قال يحيى : لا يكتب حديثه ليس بشئ .

وقال الفلاس والنسائي والرازي والسعدى والدار قطني : متروك .

وقال ابن حبان : منكر الحديث جدا يروى المناكير عن المشاهير كأنه مما عملت يداه .

وأما الطريق الثاني فالقاسم مجهول .

والثالث : فيه إسماعيل المكى . قال يحيى : لم يزل مختلطا ، وليس بشئ .

وقال على : لا يكتب حديثه .

وقال النسائي : متروك الحديث .

وقال الدار قطني : إنما هو عن مجاهد عن النبي صلى الله عليه وسلم . وأما حديث أنس فقال النسائي : سكين ليس بالقوى

فهذه الأحاديث كلها لا تصح . كما بين ابن الجوزي في الموضعات .

والعجيب أن البعض استدل بها في بعض المواقع على أهمية النحل .

حەدیسێك هەیە دەڵێت مێش هەمووی لە ئاگردایە واتا لە دۆزەخدایە بێجگە لە مێش هەنگوین . واتا مێش هەنگوین ئەهلی بەهەشتە .

بە ڕاستی ئەمە نەك لە قسەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڵکو لە قسەی هیچ مرۆڤێکی ئاسایی نا چێت وە بنەماکانی ئاینی ئیسلام زۆر دوورە لەم جۆرە قسانەوە ، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاژەڵ و مێرووەکان هیچیان حسابیان لەسەر نییە و بەس تەنها مرۆڤ محاسەبە دەکرێت وە کێشەی ئەم حەدیسە لەوەدایە ئەوانەی هەنگ بەخێو دەکەن کردویانە بە موعجیزە چونکە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت مێش هەمووی لە ئاگردایە بێجگە لە مێش هەنگوین نە بێت ( ٤٠ ) شەو دەژی . وە ئەم جۆرە حەدیسانە . دوورە لە بنەمای ئیسلام و ڕۆژی قیامەت و حسابەوە و جگە لە مرۆڤ هیچ بونەوەرێکی تر محاسەبە ناکرێت و بچێتە بەهەشت یان جهنمەوە و حاشا لله پێغەمبەر (صلى الله علية وسلم) قسەی لەو جۆرە بکات کە دوور بێت لە قورئان و ڕۆژی قیامەتەوە وە زانایانی ئیسلام دەڵێن ئەم حەدیسە دروست کراوە ابن جوزی لە ڕیزی حەدیسە هەڵ بەستراوەکان دای ناوە و هەر هەموو زانایانی حەدیس کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم حەدیسە صحیح نیە . وە هۆکاری درۆ و نا ڕاستیی ئەم حەدیسەش وەك باسمان کرد دورە لە بنەماکانی ئیسلام و ڕۆژی حساب و لێ پرسینەوەی مێش .

وە دووەمیان ئەو کەسانەی گێڕاویانەتەوە خەڵکی ڕاست گۆ نە بوون وەك لە وێنەکەدا دەی بینن دامان ناوە و هەر هەموو محدسەکان ئەو حەدیسەیان بە راست دا نەناوە بێجگە لە شێخ البانی ئەویش لەبەر سندەکەی دەڵێت صحیحە نەك متنەکەی واتا ناوەڕۆکی حەدیسەکە وە هەر هەموو محدسەکانی تر ئەم حەدیسەیان لە خانەی نەك لاواز بەڵکو درۆ و هەڵ بەستراو دایان ناوە بە دەم پێغەمبەرەوە (صلى الله علية وسلم).

........................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و پەنجا و نۆ

## قورئان یە ك نوسخە نیە و جۆری زۆرە

ئەم جارەیان بە شێوەیەکی جیاواز وەڵامی دژە ئیسلام دەدەینەوە کە بە ناوی بێدینەوە ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگرێت . با لە پێشدا بزانین ڕەخنەکەی چییە ؟ وەك خۆی دامان ناوە با بیخوێنینەوە

((لە ابن مسعودەوە هاتوە دەڵێ : (**سمعت رجلا قرأ آية ، وسمعت النبي يقرأ خلافها فأخذت بيده ، فاتيت به رسول الله فقال.. كلاكما محسن لا تختلفوا ، فإن من كان قبلكم اختلفوا فهلكو..**) صحيح البخاري

ابن مسعود دەڵێ .. گوێم لە پیاوێک بوو ئایەتێکی دەخوێند ، وە پێشتر گوێم لە پێغەمبەر بوو کە ئەو ئایەتەی بەشێوازێکی تر دەخوێند ، جا دەستی کابرام گرت بردمە لای محمد ،،، دیارە لەو بەینەدا محمد گوێی لە خوێندنی هەر دووکیان گرتووە ،،، ئینجا

محمد وتی .. قورئان خوێندنەکەی هەردووکتان باش بوو بۆیە ئاژاوەو خیلاف دروست مەکەن ، ئەوانەی پێشی ئێوە خیلافیان دروست کرد بۆیە لەناو چوون......

ئەرێ ئەوە قورعان چۆن دەبێت دوو جۆری هەبێت ئاخر مەگەر لە لەوحی مەحفوزدا هەر بەیەک شێوە نوسراوە کەواتە دەبێ ئەو دووانە یەکێکیان راستبن ، ئیتر محمد یائەوەتا خۆی لەبیری چۆتەوە ئایەتەکەی وەرەقی کوری نەوفەل بۆیە نەی گوت کامەی راستە ، یا ئەوەتا درۆی کردوە چونکی یەک قورعان هەیەو لە کن خوای تەبارەک وە تەعالان هەر یەک قورعانە ، بەلام محمد ویستویەتی دەستکاری بکات ، بۆیە موسلمانان ئاگادار ئەکەمەوە لە محمد ، کە **کافرەو** ویستویەتی قسەی خودا دەستکاری بکات))

منیش لە وەلامدا دەڵێم تبت یدا ابي لهب و تب کافرێکی ملعونی زندیقی وەك تۆ بە سەروەری مرۆڤایەتی بڵێت **کافرە** . خودای زانا ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش پێی گوتوون تبت یداکم و ستصلون نارا ذات لهب ئەگەر لەسەر ئەم چەواشە کاریانە بمرن کاکی گاور تۆ بە ناوی بێدینەوە ڕەخنە دەگریت یەك پرسیارت لێ دەکەم : ئایا هەموو زمانێکی جیهان دیالێکت و زاراوەی جیا جیای هەیە یان نا ؟ طبعا دەڵێیت بەڵێ لە زمانی عەرەبیشدا هەر هەمان شێوەیە ، وە هەموو کەس( ٧ ) خوێندنەوەکە دەزانێت ( القرائات السبع ) واتا شێوە جیا جیاکانی زمانی عەرەبی . لەوانەیە کەسێکمان لێ پەیدا ببێت بڵێت خۆ ابن مسعود خۆی عەرەب بووە ئایا نەی دەزانی ئەو ( ٧) خوێندنەوەیە هەیە ؟

لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ زانیوێتی بەڵام دورگەی عەرەبی فراوان و بەر بڵاوبووە و خەڵکی بە زۆری دەشتەکی بوون . وە لە هەموو وڵاتێکی جیهاندا چەند زاراوەیەك هەیە وە لە ناو هەر یەکێکیش لەو زاراوانەدا بە گوێرەی گەورەی و فراوانیی شوێنەکە هەمان زاراوە جیاوازیی تێدا هەیە تەنانەت لە ناوچە سنوریەکاندا دوو زاراوە تێکەلاو دەبێت و سەر لە هەردووك زاراوە جیاکانیش تێك دەچێت وە تا ئێستاش ئەو جیاوازییە هەیە لە هەموو وڵاتێك و قەومێکدا .

خۆ ابن مسعود زمانی هەموو هۆزە دورەکانی نە زانیووە . هەروەك چۆن ئێستا من و تۆ کوردی بە تەواوەتی نازانین کاتێك لوڕ یان کرمانج یان هەورامی دەبینین نازانین قسەی لەگەڵدا بکەین وە تەنانەت زمانی سۆرانیەکەی خۆشمان بە تەواوی نازانین کاتێك دەچینە ناوچە جیا جیاکانی بە سۆرانی قسە دەکەن بە تایبەتی لە گوندەکان وە کاتێکیش نزیکی ئەو سنورانە دەبین کە سۆرانی لەگەڵ هەورامی یان لوڕ یان کرمانجدا تێکەلاون زمانێکی زۆر سەیری سۆرانی و ناوچەی سنوری بەرامبەری تێکەڵاو دەبیستین .

وە بۆیە پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی خوێندنەوەی هەردووکتان تەواوە چونکە هەردووکیان هەر بە عربی بووە و زاراوەکان فەرقی هەبووە و ابن مسعود بە ڕەحمەت بێت شارەزای ئەو زاراوەیە نە بووە.

# پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و شەست

## ئیسلام ڕێگای بە درۆ داوە لە ئایەتی ٨٩ ی المائدەدا

لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ﴿٨٩﴾ سورة المائدة

لَّا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ﴿٢٢٥﴾ سورة البقرة

ڕەخنەی گاور کە کوردی خۆشمان وەك خۆی کۆپی و پەیستی دەکات !؟؟؟؟؟

وساخة القران وبالادلة

1. اباح الكذب سورة المائدة (سورة المائدة 89)

ئەمەش دەقەکانی ئەو پێغەمبەرە درۆزنەیە کە درۆیان کردوە خوداش هیچی نەکردوە

11 پێغەمبەرێکی پیر هەبوو لە بێتئێل دەژیا، کورەکانی هاتن و هەموو ئەو کارەیان بۆ گێڕایەوە کە پیاوەکەی خودا لەو ڕۆژەدا لە بێتئێل کردی، ئەو قسانەش کە بە پاشای وتبوو، بۆ باوکیان گێڕایەوە.

12 باوکیشیان لێی پرسین: (بە کام ڕێگادا ڕۆیشت؟) کورەکانی ئەو ڕێگایەیان پیشان دا کە پیاوەکەی خودا ئەوەی لە یەهوداوە هاتبوو پێدا ڕۆیشتبوو.

13 ئینجا بە کورەکانی وت: (گوێدرێژەکەم بۆ کورتان بکەن.) ئەوانیش گوێدرێژەکەیان بۆ کورتانکرد و سواری بوو.

14 لەدوای پیاوەکەی خودا ڕۆیشت و دۆزییەوە لە ژێر داربەڕووێکدا دانیشتبوو، پێی وت: (ئایا تۆ پیاوەکەی خودایت، ئەوەی لە یەهوداوە هاتووە؟)
ئەویش وتی: (بەڵێ ئەوم.)

15 پێی وت: (لەگەڵم وەرەماڵەوە و نان بخۆ.)

16 پیاوەکەی خوداش وتی: (ناتوانم لەگەڵت بگەڕێمەوە و لەگەڵت نایەمە ژوورەوە، لەم شوێنە لەگەڵت نان ناخۆم و ئاو ناخۆمەوە،

17 چونکە بە فەرمایشتی یەزدان پێم وتراوە: "لەوێدا نان مەخۆ و ئاو مەخۆوە و بەو ڕێگایەدا مەگەڕێوە کە پێدا ڕۆیشتی.")

18 ئەویش پێی وت: (هەروەها منیش وەك تۆ پێغەمبەرم و فریشتەیەك بە فەرمایشتی یەزدان قسەی لەگەڵ کردم و فەرمووی: "لەگەڵ خۆتدا بیبە ماڵەکەت هەتا نان بخوات و ئاو بخواتەوە.") - - بەمە درۆی لەگەڵ کرد.

19 پیاوەکەی خوداش لەگەڵی گەڕایەوە و لە ماڵەکەی نانی خوارد و ئاوی خواردەوە.

20 لە کاتێکدا کە لەسەر خوانەکە دانیشتبوون، ئەوە بوو فەرمایشتی یەزدان هات بۆ پێغەمبەرەکەی کە گەڕاندییەوە.

21 بانگی پیاوەکەی خودای کرد، ئەوەی لە یەهوداوە هاتبوو، وتی: (یەزدان ئەمە دەفەرمووێت: "لەبەر ئەوەی سەرپێچی فەرمایشتی یەزدانت کرد و ئەو فەرمانەت نەپاراست کە یەزدانی خوداکەت فەرمانی پێ کردیت،

22 گەڕایتەوە و نانت خوارد و ئاوت خواردەوە لەو شوێنەی کە پێت وترا نان و ئاوی لێ مەخۆ، لەبەر ئەوە لاشەکەت ناچێتە ناو گۆڕی باوباپیرانت.")

بەڕێزان کاتێك دەچینە ئەو پێگە عەرەبییانەی دژە ئیسلامن و ئەم کوردەی خۆشمان سەرچاوەیان هەر ئەو پێگانەیە بە تایبەتی مەسیحیەکان زۆر ڕەخنەی هیچ دەبینین وەك ئەو لیستەی کە لە وێنەکەدا دەی بینن دامان ناوە لە ژێر ناونیشانی بۆگەنییەکانی ئیسلام وە بە کورتی ریزێك ڕەخنەیان داناوە و ژمارەی ئایەتێکیش لەگەڵیدا . بۆیە منیش دانە دانە وەڵامیان دەدەمەوە بە گوێرەی کتێبەکەی خۆیان وە ئەمە یەکەم دانەیانە کە دەڵێن ئیسلام ڕێگای بە درۆ داوە سەیری ئایەتی ٨٩ ی **المائدة** بکەن . باشە ئێمەش دەچین بۆ ئەو ئایەتە بزانین چی دەفەرموێت ؟ **(لا یؤاخذکم الله باللغو في ایمانکم و لکن یؤاخذکم بما عقدتم الایمان)** .

واتا خودا لێتان ناگرێت یان محاسەبەتان ناکات ئەگەر سوێندتان خوارد کە دەمتان پێی ڕا هاتووە بەڵام محاسەبەتان دەکات ئەگەر مەبەستان هەبوو لە سوێند خواردنەکە . لێرەدا گاورەکان ئایەتەکە جوان ڕاڤە ناکەن و ئایەتەکە شەرتی داناوە بۆ سوێند خواردن واتا مرۆڤ دەمی ڕاهاتووە دەڵێت وەڵا ناخۆم وەڵا ناچم وەڵا ئەوە دەکەم وەڵا ئەوە نا کەم وەڵا ... هتد . ئەگەر مرۆڤەکە سوێندی خوارد و ئامانجی نە بوو لە سوێندەکە ئەوکات هیچ سزایەکی نییە . بەڵام ئەگەر ئامانجی هەبوو واتا بابەتەکە جدی بوو کەسەکە لە خواردنێك چووە بە ڕقدا و دەڵێت وەڵا ناخۆم پاشان خواردنەکەی خوارد یان گوتی وەڵا ناچم بۆ فلان شوێن و پاشان چوو بۆ شوێنەکە یان هەر شتێکی تر کە سوێندی لەسەر خوارد و پاشان سوێندەکەی شکاند و کارەکەی کرد ئەو کات سزا دەدرێت وە

سزاکەشی لە دەقی ئایەتەکەدا هەیە . بۆ ئەوەی ئاستی نەزانیی گاور نیشان بدەیت بۆ تەحەدا دەڵێین لە ئایەتی ٢٢٥ ی **البقرەشدا** هەمان شێوە باسی اللغو في الایمان دەکات و دەفەرموێت( **لا يؤاخذكم الله باللغو في ايمانكم و لكن يؤاخذكم بما كسبت قلوبكم**) . لێرەشدا خودای باڵا دەست دەڵێت ئەو سوێندانەی دەمتان پێی ڕا هاتووە سزای نییە بەڵام ئەگەر بە دڵ و بە جدی سوێنەکە بخۆن و پاشان پەشیمان ببنەوە سزا دەدرێن ئادەی فەرموو کاکی گاور کوا قورئان دەڵێت درۆزن سزا نا درێت ؟ تۆ ئەقڵت بە یە ك ئایەت شکاوە من ئایەتێکی تریشم بۆ زیاد کردیت وەك تحدا . ئێستا با بچینە خزمەت کتێبە پیرۆزەکەی جەنابت و بزانین درۆ و درۆزن هەیە لە کتێبەکەتاندا یان نا ؟لە **سفر التكوين** ( پەیدابوون ) بەشی ١٨ دەقی ١ بۆ ١٥ دا نوسراوە خودا هاتووە بۆ لای ابرهیم (ع) وە سارای ژنی مژدەیان پێ بدات کە منداڵیان دەبێت ساراش لای سەیر بووە هەردووکیان پیرن و منداڵیان چۆن دەبێت ؟ پێکەنینی بە وەزعەکە هاتووە . خوداش گوتوێتی ئەوە پێ دەکەنیت ؟ سارا درۆی کردووە گوتوێتی پێ نەکەنیم !؟ ئای لەم خودا ساویلکەیە درۆی لەگەڵدا بکرێت و پێی نەزانێت ؟ ئەمەش لینکەکەیەتی

http://www.kitebipiroz.com/bible/gen/18

..............................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز « پەیدابوون « بەشی ١٨

**سێ میوان**

1 ئینجا یەزدان لەلای داربەڕووەکانی مەمرێ بۆ ئیبراهیم دەرکەوت، لەو کاتەدا کە لە گەرمای ڕۆژدا لە دەرکی چادرەکەیدا دانیشتبوو.

2 سەری هەڵبڕی و بینی وا سێ پیاو لە نزیکی وەستاون. کاتێک ئەوانی بینی، لە دەرگای چادرەکەیەوە بەرەو ڕوویان ڕایکرد کڕنۆشی برد و سەری خستە سەر زەوی.

3 ئینجا وتی: (گەورەم، ئەگەر جێی ڕەزامەندیتم، بەسەر خزمەتکارەکەت تێمەپەڕە.

4 با تۆزێک ئاو بهێنرێت و پێتان بشۆن، لە ژێر دارەکە پاڵ بدەنەوە.

5 پارووە نانێکیشتان بۆ دێنم هەتا بەری دڵتانی پێ بگرن و پاشان تێپەڕن، چونکە ئێوە بۆ لای خزمەتکارەکەتان هاتوون.) ئەوانیش فەرموویان: (ئەوەی وتت بیکە.)

6 ئیتر ئیبراهیم بە پەلە بەرەو چادرەکە چووە لای سارا و وتی: (خێرا سێ پێوانە[a] ئاردی سفر[b] بهێنە و بیشێلە و بیکە نانی برژاو.)

7 هەروەها ئیبراهیم بۆ لای مێگەلەکە ڕایکرد و گوێرەکەیەکی ناسک و چاکی هێنا و دایە دەست کوڕێکەوە، ئەویش خێرا کەوتە ئامادەکردنی.

8 ئینجا دەرمە[c] و شیر و ئەو گوێرەکەیەی ئامادە کرابوو، هێنای و لەبەردەمیان داینا. خۆشی لە ژێر دارەکە لەسەریان ڕاوەستا، کاتێک ئەوان نانەکەیان دەخوارد.

9 پاشان پێیان فەرموو: (کوا سارای ژنت؟)
ئەویش وتی: (ئەوەتا، لەناو چادرەکەیە.)

10 ئینجا یەزدان فەرمووی: (بێگومان ساڵێکی دیکە ئەم کاتانە دێمەوە لات و سارای ژنیشت کوڕێکی بووە.)
ساراش لە دەرگای چادرەکەی خۆیەوە کەوا لەپشتی ئەمەوە بوو، گوێی گرتبوو.

11 ئیبراهیم و سارا دوو پیری بەساڵدا چووبوون. ساراش تەمەنی منداڵبوونی بەسەر چووبوو.

12 سارا لە دڵی خۆیدا پێکەنی و وتی: (ئایا لەدوای ئەوەی لە کەڵک کەوتووم و مێردەکەم پیر بووە، خۆشیم بۆ دەبێت؟)

13 ئینجا یەزدان بە ئیبراهیمی فەرموو: (بۆچی سارا پێکەنی و وتی: "وا من پیر بووم، ئایا بە ڕاستی منداڵم دەبێت"؟

14 هیچ شتێک هەیە بۆ یەزدان ئەستەم بێت؟ ساڵی داهاتوو لە کاتی دیاریکراو دێمەوە لات و ساراش کوڕێکی بووە.)

15 سارا درۆی کرد و وتی: (پێنەکەنیم)، چونکە ترسا، بەڵام ئەو فەرمووی: (بەڵێ، پێکەنیت.)

له سفر **الخروج** ( دەرچوون ) بەشی یه ك  دا فیرعەون فەرمان دەكات بە مامانەكان كوڕەكانی لەو ساڵەدا لە دایك دەبن بی كوژن بەلام مامانەكان

نایان كوژن وە درۆ لەگەڵ فیرعەون دەكەن . خوداش لەسەر درۆ كەیان پاداشتیان دەداتەوە

http://www.kitebipiroz.com/bible/exo/1

............................

**بابەتی ناو لینك**

كتێبی پیرۆز » دەرچوون » بەشی ١

## چەوساندنەوەی نەوەی ئیسرائیل

1 ئەمانە ناوی کوڕەکانی ئیسرائیلن کە لەگەڵ یاقوب بۆ میسر چوون، هەریەك لەگەڵ خێزانەکەی:

2 ڕەئوبێن، شیمۆن، لێڤی و یەهودا،

3 یەساخار، زەبولون و بنیامین،

4 دان و نەفتالی، گاد و ئاشێر.

5 هەموو وەچەکانی یاقوب حەفتا[a] کەس بوون، بێجگە لە یوسف کە لە میسر بوو.

6 یوسف و هەموو براکانی و هەموو ئەو نەوەیە مردن،

7 بەڵام نەوەی ئیسرائیل بەردار بوون و زۆر زیاد بوون و زۆر و توانادارتر بوون، خاکەکە پڕ بوو لەوان.

8 ئینجا لە میسر پاشایەکی نوێ هاتە سەر تەخت و یوسفی نەدەناسی.

9 بە گەلەکەی وت: (ئەوەتا نەوەی ئیسرائیل گەلێکن لە ئێمە زۆرتر و بەتواناترن.

10 وەرن با دانا بین، نەوەك زۆرتریش بین و کاتێك بکەوینە جەنگەوە، ئەوان بچنە پاڵ دوژمنەکانمان و لە دژمان بجەنگن و لە خاکەکە دەربچن.)

11 ئیتر سەرکاری بێگارییان لەسەر دانان، بۆ ئەوەی بە بارگرانییەکەیان زەلیلیان بکەن، جا شاری ئەمباریان بۆ فیرعەون بنیاد نا، (پیتۆم) و ڕەعمسێس.

12 بەڵام هەرچەندە زەلیلیان دەکردن ئەوەندە گەشەیان دەکرد و بەربڵاو دەبوون، جا لەبەر ئەوە میسرییەکان بەرامبەر بە نەوەی ئیسرائیل ترسیان لێ نیشت.

13 ئیتر میسرییەکان بە زەبرەوە کۆیلایەتییان بە نەوەی ئیسرائیل دەکرد.

14 ژیانیان تاڵ کردن بە خزمەتکارییەکی سەخت، بە قوڕکاری و خشت دروستکردن و هەموو جۆرە کارێکی کێڵگە، هەموو کارێك کە پێیان دەکردن بە زەبرەوە بوو.

15 ئینجا پاشای میسر بە دوو مامانی ژنە عیبرانییەکانی وت، کە ناوی یەکێکیان (شیفرە) و ئەوی دیکەیان (پوعە)[b] بوو،

16 وتی: (کاتێك مامانی ژنە عیبرانییەکان دەکەن و لەسەر بەردەکان[c] تەماشایان دەکەن، ئەگەر کوڕ بێت بیکوژن، ئەگەر کچیش بێت با بژیێت.)

17 بەڵام مامانەکان لە خودا ترسان و ئەوەیان نەکرد کە پاشای میسر پێی وتبوون، هێشتیان کوڕەکان بژین.

18 دواتر پاشای میسر مامانەکانی بانگکرد و پێی وتن: (بۆچی ئەمەتان کردووە؟ بۆ هێشتتان کوڕەکان بژین؟)

19 مامانەکانیش بە فیرعەونیان وت: (چونکە ژنە عیبرانییەکان وەك ژنە میسرییەکان نین، ئەوان گورجوگۆڵن و پێش گەیشتنی مامان منداڵیان دەبێت.)

20 خوداش لەگەڵ مامانەکان باش بوو. گەل زۆر و بە توانا بوون.

21 ئەوە بوو کە مامانەکان لە خودا ترسان، ئەویش کردنی بە خێزان.

22 ئینجا فیرعەون فەرمانی دا بە هەموو گەلەکەی و وتی: (هەر کوڕێك کەوا بۆ عیبرانییەکان لە دایك بێت فڕێیبدەنە ناو نیلەوە، هەموو کچێکیش با بژیێت.)

---

a. لە هەندێك دەستنووسی کۆندا بە ژمارەی حەفتا و پێنج هاتووە. بڕوانە پەیدابوون 46: 27 و کرداری نێردراوان 7: 14.
b. ناوەکانی (پوعە) و (شیفرە) تەنها لێرە هەن. ئیتر مەرج نییە عیبری بوو بن، بەڵام یارمەتی ژنە عیبرانییەکانیان دەدا.
c. مەبەست لەسەر ئەو شوێنەی دایك منداڵی دەبوو.

..................................................................

باشترین درۆش ئەم درۆیەیە کە لە سفر **الملوك الاول** ( پاشایان ١) بەشی ١٣ دا دەق ١ بۆ ١٨ دا هاتووە باسی پێغەمبەرێك دەکات دێت بۆ ( بیت ئیل – ناوچەیەکە ) مژدە دەدات بەوەی لە نەوەی داود پێغەمبەر ێك لە دایك دەبێت وە شارەکە بە جێ دەهێڵێت وە پێغەمبەرێکی پیر لە هەمان شاردا دەبێت کورەکانی بەسەرهاتەکە بۆ باوکیان دەگێڕنەوە پێغەمبەرە پیرەکە شوێن پێغەمبەرەکەی تر دەکەوێت و دەی دۆزێتەوە و پێی دەڵێت بگەڕێوە وەرە بۆ ماڵی ئێمە پێغەمبەرەکەی تر دەڵێت خودا فەرمانی پێ کردووم لەو شارەی ئێوە نان نەخۆم و لە ڕێگەیەکەوە ڕۆشتم جارێکی تر پێیدا نە ڕۆمەوە . پێغەمبەرە پیرەکەش دەڵێت منیش وەحیم بۆ هاتوە و خودا پێی گوتم برۆ ئەو پێغەمبەرەی تر بهێنەوە بۆ ماڵی خۆتان پێغەمبەرە پیرەکە بە درۆوە دەڵێت وەحیم بۆ هاتووە بۆیە پێغەمبەرەکەش بە قسەی دەکات و دەچێت بۆ ماڵیان . لە کاتی نان خواردندا خودا فریشتەیەك دەنێرێت پێی دەڵێت پێغەمبەرە پیرەکە درۆی کرد بۆچی گەڕایتەوە بۆ ئەو شارە ؟ مادام فەرمانت شکاندوم تۆ پێغەمبەر نییت سەیری دەق ٢٢ بکەن !؟ خودا و وەحی و فریشتە و پێغەمبەران هەر هەموویان درۆزنن . لە هەمووی سەیرتر هەر کتێبەکەی خۆیان **التثنیة دوا** وتاری موسا بەشی ١٨ دەق ٢٠ دەڵێت ئەگەر پێغەمبەری درۆزن هەبوو خودا دەی کوژێت !؟ ئەی بۆچی خودا ئەو پێغەمبەرە پیرە درۆزنەی نە کوشت ؟ لە کاتێکدا ئەو پێغەمبەرە گەمژەیەی هەڵ خەڵەتاند و درۆی لەگەڵدا کرد و گەڕانیەوە بۆ ماڵی خۆی ؟ دەقەکانمان لە وێنەی **سەرەوە** داناوە و ئەمەش لینکە کەیەتی

http://www.kitebipiroz.com/bible/1ki/13

.................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز « پاشایان ١ « بەشی ١٣

18 ئەویش پێی وت: (هەروەها منیش وەك تۆ پێغەمبەرم و فریشتەیەك بە فەرمایشتی یەزدان قسەی لەگەڵ کردم و فەرمووی: "لەگەڵ خۆتدا بییە ماڵەکەت هەتا نان بخوات و ئاو بخواتەوە.") - - بەمە درۆی لەگەڵ کرد.

19 پیاوەکەی خوداش لەگەڵی گەڕایەوە و لە ماڵەکەی نانی خوارد و ئاوی خواردەوە.

20 لە کاتێکدا کە لەسەر خوانەکە دانیشتبوون، ئەوە بوو فەرمایشتی یەزدان هات بۆ پێغەمبەرەکەی کە گەڕاندییەوە.

.................................

بەڕێزان درۆ زۆرە لە کتێبی پیرۆزدا تەنانەت ئافرەتی لەش فرۆش و داوێن پیسیش بەهۆی درۆکانیەوە دەکرێت بە ( قدیسة ) واتا پیرۆز و پایە بەرز . چونکە لە **سفری یشوع** بەشی ٢ دەق ١ بۆ ٦ دا باسی ئەوە دەکات یشوعی پێغەمبەر دوو جاسوس دەنێرێت بۆ شاری اریحا وە پادشا دەزانێت جاسوس هاتوەتە شارەکەیەوە دەنێرێت بە شوێن سەرگەورەی لەش فرۆشەکاندا کە ناوی راحابە پێی دەڵێت کوا ئەو دوو جاسوسە ؟ ڕاحابیش دەڵێت لە شار دەرچوون . بەڵام راحاب درۆ دەکات و لە ماڵی خۆیدا هەردووکیانی شاردوەتەوە بۆیە یشوعی کوڕی نونی پێغەمبەر کاتێك شارەکە دەگرێت راحابی لەش فرۆش نا کوژێت وەك لە سفری **یشوع** بەشی ٦ دەق ١٧ و ٢٥ دا هاتووە . بۆ ئەوەی مەسیحییەکان نەڵێن ئەوانەی باسی دەکەیت تەوراتە و پەیمانی کۆنە و پەیوەندیی بە ئێمەوە

نییە دەڵێم راحابی لەش فرۆشی نەنکتان پۆلص لە نامەی **عیبرانیەکاندا** بەشی ١١ دەقی ٣١ دا بە باوەڕ دار ناوی دەبات لە کاتێکدا لەش فرۆش و درۆزنیش بووە پۆلص پێی دەڵێت : بە باوەڕ راحابی داوێنپیس لەگەڵ یاخیبووان لەناونەچوو چونکە پێشوازییەکی ئاشتییانەی لە سیخوڕەکان کرد هەر پەیمانی تازەی خۆتان لە نامەی **یعقوب** بەشی ٢ دەقی ٢٥ ستایشی راحابی لەش فرۆشی درۆزن دەکات و بە ئیمانداری عەیارە ٢٤ باسی دەکات . ئەوەتا لە ئینجیلەکەتدا ئافرەتێکی لەش فرۆشی گەوادە ی درۆزنی جاسوس بە پیرۆز و خاوەن شکۆ لە قەڵەم دەدەن . ئیتر رەخنەی چی لە قورئان دەگریت ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و شەست و یەك

## رێگا دراوە بە زینا و موتعە و فسق و فجور لە قورئاندا

سێ گومان پێکەوە پوچەڵ کراوەتەوە

2. اباح الزنى بملكات اليمين (سورة النساء 3)

وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾

3. اباح الزنى بزواج المتعة (سورة النساء 24)

۞ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۖ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ ۚ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾

4. اباح الهام الفجور للنفس البشرية (سورة الشمس 8)

وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾

ئەم جارەیان سێ گومان پێکەوە پوچەڵ دەکەینەوە بە ئیزنی خودا چونکە کابرای ملحد و گاور و دژە ئیسلا می کوردیش هیچیان شارەزاییان لە ئاینی ئیسلامی مەزن نیە و کۆپی و پەیست دەکەن . بەڵگەشمان بۆ نە شارەزای و کۆپی و پەیستەکانیان هەر پۆست و نوسینەکانی خۆیانە

فەرموون سەیر بکەن لە رەخنەی ژمارە دوو دا نوسیویانە ئیسلام رێگای داوە بە زینا کردن لە رێگای ملك اليمينەوە بەڵگەشیان ئایەتی ٣ ی سورەتی **النسائە** . بەڵام ئایەتی ٣ ی **النساء** باسی فرە ژنی دەکات و سنورداری کردووە دەفەرموێت( ٤ ) ژن بهێنن بەڵام ناتوانن ئەو کارە بکەن بۆیە (١) ژن بەسە . بەڵام لە کتیبەکەی خۆیاندا فرە ژنی هەیە و هیچ سنورێکیشی بۆ دا نەنراوە . ئەمەش بەڵگە لە کتێبەکانی خۆیانەوە

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1442770462./1675620735990113/?type=1&theater

**بابەتی ناو لینك**

فرە ژنی لە کتێبی پیرۆزدا



گاورەکان ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگرن و دەڵێن قورئان باسی فرە ژنیی کردووە . لە کاتێکدا ( ژن) هێنان لە ئیسلامدا یاسا نییە !؟ بەڵکو بۆ حاڵەتی تایبەتییە ئەگەر شەڕ هەبێت و پیاو نەمێنێت و ژن زۆرتر بێت لە پیاو هەروەها دەبێت پیاوەکە داد پەروەر بێت لەگەڵ ژنەکانیدا و هەر هەمان ئایەت دەفەرموێت وە ناش توانن دادپەروەر بن بۆیە (1 )دانە بەسە . کەواتا قورئان تاکە کتێبە سنوری داناوە( ١ ) ژن بەسە بۆ پیاوێك وە هیچ کتێبێکی تر ژن هێنانی سنوردار نە کردووە

با بزانین لە کتێبی پیرۆزدا چۆن باسی فرە ژنیی کردوە ؟

لە سفر **القضاة** ( ڕابەران ) ٨-٣٠

جدعۆن حەفتا کوری لەپشتی خۆی هەبوو، چونکە ژنی زۆربوو

**لەساموێلی یەك** ١و ٢ دا باسی دوو ژن دەکات و نوسراوە/پیاوێك هەبوو لە ڕاماتەیمی چوفییەکان لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەفرایم ناوی ئەلقانەی کوری (یەرۆحام)ی کوری (ئەلیهو)ی کوری (تۆحو)ی کوری چوفی ئەفرایمی بوو دوو ژنی هەبوو، یەکێکیان ناوی (حەنا) و ئەوی دیکەیان ناوی (پەنینا) بوو، پەنینا منداڵی هەبوو، بەڵام حەنا منداڵی نەبوو

لە **ساموێلی دوو** ٥-١٣ دا دەڵێت داود ژنێکی تری هێناوە و لەگەڵ چەند کەنیزەیەکدا ؟هەروەها داود پاش ئەوەی لە حەبرۆنەوە هاتە ئۆرشەلیم چەند کەنیزە و ژنێکی دیکەی هێنا، ئینجا کور و کچی دیکەی داود لەدایك بوون

لە **ساموێلی دوو** ١٢-٨ دا خودا بە چەندەها ژن دەدات بە شاولی پادشا و نوسراوە

ماڵی گەورەکەتم پێدایت و ژنەکانی ئەوم خستە باوەشتەوە، بنەماڵەی ئیسرائیل و یەهودام پێ دایت. ئەگەر ئەوەش کەم بووایە ئەوا زیاتریشم بۆ دەکردیت

لە سفر **الملوك الاول** ( پاشایان ١ ) ١١-٣ دەڵێت سلیمان

حەو سەد ژنی خانەدان و سێ سەد کەنیزەی هەبوو، جا ژنەکانی دڵیان هەڵگەڕاندەوە

اخبار **الايام الثانية** ( پوختەی مێژوو دوو ) ١١-٢١

ڕەحەڤەعام مەعکای کچی ئەبشالۆمی لە هەموو ژن و کەنیزەکانی دیکەی خۆی زیاتر خۆشدەویست، چونکە هەژدە ژن و شەست کەنیزەی هەبوو، بیست و هەشت کور و شەست کچیشی بوو

هەر هەمان **سفر** ١٣ -٢١ دا نوسراوە

بەڵام ئەبیا بەردەوام بەهێز بوو. چواردە ژنی هێنا و بیست و دوو کور و شانزە کچی بوو

هەمان **سفر** ٢٤-٣

یەهۆیاداع دوو ژنی بۆ یۆئاش هێنا و کوران و کچانی بوو

کاکی گاور بۆچی ڕەخنە لە اسلام دەگریت ؟ دڵنیام ئێستا دەڵێن ئەوە پەیمانی کۆنە و ئێمە شوێن پەیمانی تازە دەکەوین نەك تەورات !؟ بۆ ئەوەی ئەو پاساوەشتان ببرین دەڵێم : ئایا دەتوانیت پێم بڵێیت کاتێك مەسیح هات فرە ژنیی سنوردار کرد ؟ ئەگەر دەڵێیت بەڵێ : فەمووو پێمان بڵێ لە کوێدا یسوع وای گوتووە ؟ ئەگەر ژن هێنان سنوردار کراوە دەقێکی ئینجیلمان بدەنێ !!!!!!

..............................................................................................................................................

**ڕەخنەی دووەم** ڕەخنەی ژمارە سێیە کە دەڵێن **( اباح الزنا بزواج المتعة سورة النساء ٢٤ )** واتا ئاینی ئیسلام ڕێگای بە زینا کردن داوە بە ناوی زواج المتعة یان سیغە وە بەڵگەشیان ئایەتی ٢٤ ی سورەتی النسائە طبعا لەمەشیاندا هەر تێ کەوتون و ئاستی نە شارەزاییان دەر دەخات لەسەر ئاینی ئیسلامی مەزن و هونەری کۆپی و پەیستیان دەردەخات . وە ئەوان ئەم بەشەی ئایەتەکەیان داناوە کە دەفەرموێت ( **فما استمتعتم به منهن فاتوهن اجورهن** )ئەوەیان بە زواجی موتعە و کاتی ناو بردوە گوایا ئیسلام ڕێگا دەدات بۆ ماوەیەکی کاتی ژن بهێنیت لە بەرامبەری بڕێك پارەدا وەك چۆن شیعەکان ئەو کارە دەکەن وە لەوەش خۆشتر دژە ئیسلامی کورد هاتووە ئەو کۆپی و پەیستەی گاورەکانی بە هەڵە راڤە کردووە و دەڵێن لەگەڵ ژنی خۆشتدا بە پارە سەر جێ دەکەیت لە ئیسلامدا وە زواجی متعە لە ئاینی ئیسلامی مەزندا بونی نییە و تەنها شیعەی رافیزەیە ئەو کارە دەکات . بە فەزڵی خودا وەڵامی ئەو چەواشە کاریە شمان داوەتەوە لە پێشو تردا ئەمە لینکە کەیەتی

https://www.facebook.com/1553401181577496/photos/pb.1553401181577496.-2207520000.1442771280./1607466342837646/?type=3&theater

..................................................

بابەتی ناو لینك

سەیری پرسیاری بێ وەلامی ١٢٧ بکەن لاپەرە ( ٢٨٣ )

..................................................................................................

**ڕەخنەی سێیەم**: ڕەخنەی ژمارە چواری ئەوانە دەڵێن ئیسلام ڕێگای داوە بەوەی مرۆڤ فسق و فجور بکات و ڕێگای نیشان دەدات بۆ ئەو کارە بەڵگەشیان ئایەتی ٨ ی سورەتی **الشمسە** . بەڕێزان لێرەدا دەمەوێت تێبینیی شتێك بکەن ئەوان فێر بوون ژمارە و ناوی ئایەتەکە دادەنێن چونکە دەزانن خەڵکی کۆپی و پەیست زۆر دەکات بۆیە کاتێك کەسێك لەو پۆستانەتان بۆ دا دەنێت پێی بڵێن ئادەی ئایەتەکەمان بۆ بهێنە ؟ پاشان پێی بڵێن پاش و پێشەکەشی دا بنێ وە داوای لێ بکەن مانای چییە ؟ ئیتر دژە ئیسلامی داماو بە دەستی خۆی دەکەوێتە داوەکەوە و دەزانێت چەند نەزانە ؟ وەك ئەو دوو نموونەیەی سەرەوە باسمان کرد وە ئەم ڕەخنەیەی سێیەمیش کە ئایەتی ٨ ی سورەتی **الشمسە** . وە لە ئایەتی ٧ ی سورەتی **الشمسدا** دەفەرموێت وە نەفسی ئینسان ببینن چۆن دروست کراوە ؟ وە ئایەتی ٨ کە دوای ئەوە و کردویانە بە ڕەخنە دەڵێت : خۆی ئۆتۆماتیکی باشە و خراپەی خۆی دەزانێت **( فالهمها فجورها و تقواها )** وە مرۆڤ وەك کۆمپیوتر برمجە کراوە و ڕاست و چەوت و باش و خراپی خۆی دەزانێت خۆشتان دەزانن هیچ کەس نیە لە دنیادا ڕاست و هەڵە و باش و خراپ لێك جودا نەکاتەوە ؟ بەس بە تەنها شێت و کاڵ فامەکان نە بێت وە ئەوانیش حسابیان لەسەر نییە . پاشان ئایەتی ٩ و ١٠ دەفەرموێت( **قد افلح من زکاها و قد خاب من دساها** ) لێرەدا بەس باسی ( افلح ) دەکەین واتا سەرکەوتن و

بردنەوە . لە زمانی عەرەبیدا ( نجاح ) هەیە و فلاح هەیە كاتێك لە كاروباری دنیاییدا سەركەوتوو دەبیت پێی دەڵێن ( نجاح ) یان كەسێكی ( ناجحە ) بەڵام فلاح واتا سەركەوتن لە دنیا و لە قیامەتیشدا بۆیە دەبینین كاتی بانگ دەدرێت دەڵێن ( حي على الفلاح ) وە ئەو ئایەتەش دەفەرموێت( قد افلح من زكاها ) وە تزكیەی نفسیش بەس بە یە ك شت دەكرێت ئەویش ئاینی خودایە و هەر كەس لە ڕێگای ئاینی ئیسلامە وە تزكیەی چاك و خراپەكانی بكات لە دنیا و قیامەتیش سەركەوتن بە دەست دەهێنێت . چونكە پێوەری بۆ ژیان و كاركردن لەسەر منهجی خودایە و كاتێكیش دەمرێت بەری ڕەنج و تەزكیە و كارەكانی دەبینێت و كەسێكی سالحە . بەلام ئەگەر بەس بۆ دنیا هەوڵ بدەیت لە دنیادا ناجحیت بەڵام مردیت فالح نییت پاشان دەفەرموێت و(**قد خاب من دساها** ). واتا ئەوانەی ژیانیان و كرداریان بە خراپەكاری و فسق و فجور خراپ دەكەن و ژیانیان پیس دەكەن ئەوانە زیانیان كردوە و دۆڕاون لە دنیا و لە قیامەتیشدا كەواتا ئێستا تێ دەگەین ئەو ئایەتانە پێمان دەڵێن مرۆڤ بە شێوەیەك دروست كراوە باش و خراپی خۆی دەزانێت ئاقڵ ئەوەیە خودا بناسێت و لە ڕێگای خوداوە باش و خراپەكانی هەڵ بژێرێت بۆ ئەوەی لە دنیا و قیامەتدا سەر فراز بێت و دۆڕاویش ئەو كەسەیە كە ژیانی خۆی تێك دەدات بە خراپەكاری

ئادەی كاكی گاور و كاكی دژە ئیسلامی كورد پێمان بڵێن لە كوێدا ئایەتی ٨ ی سورەتی **الشمس** ڕێگا دەدات بە موسوڵمان فسق و فجور بكات ؟

---

## پرسیاره بێ وەڵامەكان ژمارە :سەد و شەست و دوو

## فره پیاوی بۆ یە ك ژن لە قورئاندا



پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ ۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ ۗ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾

ئەمەی ناو لاکێشە سورەکە ڕەخنەی کڵێسایە کە کوردی خۆمان کۆپی و پەیستی دەکات وە ئەو دەقانەش مشتێکە لە خەروارێك لە کتێبی پیرۆزدا لەسەر فرە پیاوی و داوێن پیسی

5. اباح تعدد الازواج بشريعة المحلل الرجسة (سورة البقرة 230).

کتێبی پیرۆز » ساموئێل 2 » بەشی 12

11 (یەزدان ئەمە دەفەرموێت: "ئەوەتا من لەناو ماڵەکەی خۆتدا خراپەت بەسەردا دەهێنم، بە بەرچاوتەوە ژنەکانت دەبەم و دەیاندەمە ئەو کەسەی کە لێت نزیکە، لە ڕووناکی ئەم خۆرەدا لەگەڵ ژنەکانت جووت دەبێت.

12 تۆ بە نهێنی ئەو کارەت کرد، من لەبەردەم هەموو ئیسرائیل و لە ژێر ڕووناکی خۆردا ئەم کارەت پێ دەکەم.")

کتێبی پیرۆز » ئامۆس » بەشی 7

16 ئێستاش گوێ لە فەرمایشتی یەزدان بگرە، تۆ دەڵێیت: پێشبینی لەسەر ئیسرائیل مەکە، لە دژی بنەماڵەی ئیسحاق وتار مەدە

17 لەبەر ئەوە یەزدان ئەمە دەفەرموێت: ژنەکەت لە شاردا لەشفرۆشی دەکات کور و کچەکانت بە شمشێر دەکوژرێن زەوییەکەت بە گوریس دابەش دەکرێت

کتێبی پیرۆز » یەرمیا » بەشی 8

10 لەبەر ئەوە ژنەکانیان دەدەمە خەڵکی دیکە کێڵگەکانیان بەوانەی میراتگریانن چونکە لە بچووکەوە هەتا گەورە هەموو پەرۆشی قازانجن لە پێغەمبەرەوە هەتا کاهین هەموو ساختە دەکەن **نوسخەی کتێبی پیرۆز بە کوردی بە ئارەزوی خۆیان دەست کاریی دەکەن سەیر بکەن درۆیان کردوە بە ساختە ؟**

لذلك اعطي نساءهم لاخرين وحقولهم لمالكين لانهم من الصغير الى الكبير كل واحد مولع بالربح من النبي الى الكاهن كل واحد يعمل بالكذب

گومانی پێنجەمی ئەم لیستەی گاورەکان کە بڵاوی دەکەنەوە : دەڵێن ئاینی ئیسلام یاسای پیاو زۆرییان هەیە واتا ژنێك دەتوانێت زیاتر لە پیاوێکی هەبێت وە بەڵگەشیان ئایەتی ٢٣٠ ی سورەتی **البقرەیە** وەك دەبینیت لە وێنەکەدا دامان ناوەوە ئاینی ئیسلامیان بە ( رجس ) ناو بردووە و رجس لە قورئاندا لە ( ١٠ ) شوێندا هاتووە بە مانای جیا جیا وە بە مانای پیسی و کفر و نزمیی ئاستی مرۆڤ و بت و گومڕای دێت دڵنیاش بن کابرای گاور نازانێت رجس مانای چییە ؟بۆیە پێش ئەوەی وەڵامی ئایەتەکە بدەینەوە با فێری بکەین رجس چییە ؟ وە ئایا ئاینی ئیسلامی مەزن رجسە یان کتێبی پیرۆزەکەی ئەو ؟ با بزانین فرە پیاوی و بە ١٠٠ پیاو زینا لەگەڵ یە ك ئافرەتدا بکەن لە ئاینی ئیسلامدا هەیە یان لای ئەوان ؟ با بزانین کتێبەکەیان چی دەڵێت ؟

لە سفری **ساموێلی** دوو بەشی ١٢ دەقی ١١ و ١٢ دا خودا ژنەکانی داودی پێغەمبەر (ع) دەدات بە دەست خەڵکییەوە بە ڕۆژی نیوەڕۆ لەبەر چاوی خەڵکیدا سواریان بن وە نوسراوە یەزدان ئەمە دەفەرمووێت: "ئەوەتا من لەناو ماڵەکەی خۆتدا خراپەت بەسەردا دەهێنم، بە بەرچاوتەوە ژنەکانت دەبەم و دەیاندەمە ئەو کەسەی کە لێت نزیکە، لە ڕووناکی ئەم خۆرەدا لەگەڵ ژنەکانت جووت دەبێت تۆ بە نهێنی ئەو کارەت کرد، من لەبەردەم هەموو ئیسرائیل و لە ژێر ڕووناکی خۆردا ئەم کارەت پێ دەکەم

لە سفری ( **ئاموس** ) عاموسدا بەشی ٧ دەقی ١٦ و ١٧ دا عاموسی پێغەمبەر بە امصیا ی کاهینی بیت ئیل دەڵێت ئێستاش گوێ لە فەرمایشتی یەزدان بگرە، تۆ دەڵێیت پێشبینی لەسەر ئیسرائیل مەکە لە دژی بنەماڵەی ئیسحاق وتار مەدە !؟ لەبەر ئەوە یەزدان ئەمە دەفەرمووێت ژنەکەت لە شاردا لەشفرۆشی دەکات

لە سفری **ئیرمیا** ٨-١٠ دا خودا بە جولەکە دەڵێت لەبەر ئەوە ژنەکانیان دەدەمە خەڵکی دیکە، کێڵگەکانیان بەوانەی میراتگریانن، چونکە لە بچووکەوە هەتا هەموو پەرۆشی قازانجن، لە پێغەمبەرەوە هەتا کاهین هەموو خەریکی درۆن

بەڕێزان لە نوسخە کوردیەکەدا ( هەموو خەریکی درۆن ) گۆڕیویانە بە ( هەمو ساختەن ) ئایا کاکی گاور ئێستا زانیت چی شەریعەتێك نجسە ؟ ئەوە شەریعەتی تۆیە و نوسەرانی کتێبەکەی تۆیە دەڵێت داود (ع) چووە زینای لەگەڵ ژنی سەرکردەیەکی خۆیدا کردووە و بە زینا سولەیمانی (ع) لێ بووە پاشان خودا تۆڵەی لە داود کردوەتەوە ژنەکانی داوەتە دەست گەلەکەی بە ڕۆژی نیوەڕۆ پیاو سواریان بن ، وە حاشا للە نە داود و نە خوداش کاری وا ناکەن ؟ ئەوە شەریعەتی تۆیە نجسە و پێغەمبەرێکی وەك عاموس دێت بە یەکێك لە کاهینەکان دەڵێت چیتر باسی کوڕەکانی ئیسحاق مەکە

چونکە ژنەکەی تۆ لەش فرۆشە و دەچێتە لای زۆر پیاو تاوانی امصیای کاهین ئەوە بووە ڕەخنەی لە نەوەی ئیسحاق گرتووە بە فەرمانی خودا ژنەکەی حیز بووە و دەی دات بە دەست خەڵکییەوە سواری بن ئەوە ئیرمیای پێغەمبەرتانە دەڵێت ژنەکانی جولەکە دەدەم بە پیاوانی تر و ئیتر پیاوەکان چەند کەسن بۆ ( ١) ژن گرنگ نییە ؟ وە ئیرمیا خۆی باشترتان دەناسێت چونکە دەڵێت هەمووتان درۆزنن وە لە ئێستاشدا کە ٢٠١٥ یە ئەوەتان ئیسپات کرد ئەوەتا ئەو دەقەی ئیرمیاتان بۆ کوردی بە ساختە ترجمە

کردوە نەك بە درۆزن . پاش ئەوەی زانیت فرە پیاوی و لەش فرۆشتن و زینا لە کتێبەکەی خۆتدا هەیە نەك لە قورئاندا !؟کاکی گاور وەرە با فێرت بکەم و پێت بڵێم ئەو ئایەتەی ٢٣٠ ی **البقرە** مانای چییە ؟

ئەو ئایەتە کە لە وێنەکە دایە سەر بەرزییە بۆ ئافرەت و بەرز کردنەوەی پلە و پایەی ئافرەتە بۆ ئەوەی مێردەکەی بە سوکی سەیری نەکات و هەمیشە پێی بڵێت تەلاقت دەدەم وە خودای باڵا دەست یاسا ی داناوە و دەڵێت ئەگەر تەلاقی بدەیت دەبێت پیاوێکی تر مارەی بکاتەوە بە شێوەیەکی شەرعی وە ببێت بە ژنی پیاوی دووەم . وە پیاوی دووەم کەی خۆی ویستی تەڵاقی بدات ئەو کات بۆی هەیە بگەڕێتەوە بۆ لای پیاوی یەکەم . ئەمەش سزایەکی توندە بۆ پیاو چونکە هیچ پیاوێك قبوڵی ناکات ژنەکەی لای پیاوی تر بنوێت هەر چۆن هیچ ژنێکیش قبوڵی ناکات پیاوەکەی لای ژنی تر بخەوێت . بۆیە لە قورئاندا ئەو حوکمە هەیە هەتا هیچ پیاوێك نەوێرێت و نە توانێت بە سوکی سەیری ژنەکەی بکات و ئەوەی لەبەر چاو بێت ئەگەر تەڵاقی بدات ژنەکەی دەبێت بە موڵکی پیاوێکی تر بۆ ئەوەی پیاوان ئاقڵ بوون نەوێرن ژنەکانیان بە سوکی سەیر بکەن و کەی بیانەوێت تەڵاقیان بدەن . وە بۆ گەڕانەوەی ئافرەتەکەش بۆ لای پیاوەکە فێڵی شەرعی نیە وەك تحلیل و محلل چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەعنەتی لەو کەسە کردوە بە فێڵ دەیان گەڕێنتەوە لای یەکتری یان فێڵێك دەکات بۆ ئەوەی ئەو ژنە کە تەڵاق دراوە نەچێتە لای پیاوێکی تر و لەگەڵیدا نەخەوێت بە عقد ی مارەیی شەرعی و ئەو شەریعەتەی محلل یان تحلیلەی تۆی گاور بە رجس و فرە پیاوی ناوی دەبەیت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو کەسەی بە لعنت کردووە کە تحلیل دەکات

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە:**

کاکی گاور جەنابت ئایەتێکت هێناوە بە بەڵگە بۆ فرە پیاوی لە ئیسلامی مەزندا بەلام ئەو ئایەتە بۆ ئاقڵ کردنی پیاوە و هەتا ژنەکەی بە سوك سەیر نەکات و نەوێرێت تەلاق بدات . وە ئەو ئایەتە وەك گورزێك یان شەقێك وایە بۆ پیاو نەك فرە پیاوی بێت پاشان ئاینەکەی خۆت فرە پیاویی تێدایە وەك بە بەڵگە دامان نا . پاشان کاکی کوردە تۆ بۆچی هەمان ڕەخنەی گاور لە سایدە عەرەبیەکان وەردەگێڕیت بۆ کوردی و بڵاوی دەکەیتەوە ؟ دەبێت تۆ خۆشت گاور بیت و بەناوی بێدینەوە ئەو کارانە بکەیت . یان هەر خۆت بێدینیت و گەمژەیت و خەریکی کۆپی و پەیستیت ؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و شەست وسێ

## ئیسلام ڕێگا دەدات ئافرەتی کۆیلە لەش فرۆشی بکات

چەواشە کاریی شەشەمی کڵێسا بۆ ئیسلامی مەزن ئایەتی ٣٣ ی سورەتی **النورە** و دەڵێن ئیسلام ڕێگای داوە بەوەی ئافرەتە کۆیلەکان لەش فرۆشی بکەن !؟

6. اباح اكراه الجواري على البغاء (سورة النور 33)

وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾

کتێبی پیرۆز » یۆحەنا » بەشی 8

ژنێکی داوێنپیس

بەڵام عیسا چووە کێوی زەیتوون.
لە بەرەبەیاندا گەڕایەوە پەرستگا، هەموو خەڵك هاتنە لای و ئەویش دانیشت و فێری دەکردن.
مالمەکان و فەریسییەکان ژنێکیان هێنا کە لە کاتی داوێنپیسیدا گیرابوو، لە ناوەڕاستدا ڕایانگرت
پێیان وت: (مامۆستا، ئەم ژنە لە داوێنپیسی‌کردندا گیراوە.
موساش لە تەوراتدا فەرمانی پێ کردووین ژنی ئاوا بەردباران بکرێت. تۆ چی دەڵێی؟)
ئەمەیان بۆ تاقیکردنەوەی وت، تاکو شتێکیان هەبێت سکاڵای لێ بکەن.
بەڵام عیسا خۆی چەماندەوە و بە پەنجە لەسەر زەوی دەینووسی.
7 کاتێ بەردەوام بوون لە پرسیارکردن، هەڵستاوە و پێی فەرموون: (کامەتان بێ گوناهە با یەکەم بێت بەردێکی تێبگرێ.)
8 دیسان خۆی چەماندەوە و لەسەر زەوی دەینووسی.
9 ئەوانەی گوێیان لێبوو، یەك لەدوای یەك ڕۆیشتن، دەستپێك لە پیرانەوە. ئەوسا عیسا بە تەنها مایەوە، ژنەکەش لەناوەڕاست
10 عیسا ڕاستبۆوە و پێی فەرموو: (خانم، ئەوانە چییان لێهات؟ کەس تاوانباری نەکردوویت؟)
11 وتی: (کەس، گەورەم.) عیسا فەرمووی: (منیش حوکمت نادەم. برۆ ئیتر گوناه مەکە.)

**وەڵامی گومانی ژمارە 6 ی گاورەکان لەسەر قورئانی پیرۆز و بەراورد کردنی لەگەڵ کتێبی پیرۆزی خۆیاندا**



**پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان**

با لە سەرەتادا ئاستی نە شارەزایی بەرامبەر دەربخەین و ئایەتەکە وەك خۆی ڕاڤە بکەین بزانین چی دەڵێت ؟

ئەو پیاوانەی کە هەژارن با داوێن پاك بن و خۆیان بپارێزن لە زینا هەتا خودا ڕسقیان دەدات و دەتوانن ژن بهێنن . وە ئەو کۆیلانەی دەتوانن خۆیان ئازاد بکەن و پارە بدەن لە بری ئازاد کردنەکانیان . با نوسینێك هەبێت لە نێوان کۆیلە و خاوەن کۆیلەکە تێیدا بنوسرێت ئەم کۆیلەیە ڕزگار بووە بەرامبەر ئەو برە پارەیە وەك بەڵگەیەك لە نێوانیاندا بۆ ئازاد بونی کۆیلەکە . وە ئافرەتە کۆیلەکان ئیجبار مەکەن لەش فرۆشی بکەن لە کاتێکدا ئافرەتە کۆیلەکان نا یانەوێت ئەو کارە بکەن وە ئەگەر بە زۆر ئەو کارەیان پێ بکەن خودا بەخشندەیە بۆ ئافرەتەکان نەك بۆ خاوەنەکانیان چونکە کۆیلەکان بە زۆر کاری لەش فرۆ شییان پێ کراوە و خاوەنەکانیان پارەیان پێ پەیدا دەکردن بە لەش فرۆشی. ب

هرێزان وەك دەبینن باسی ئافرەتی کۆیلە دەکات وە پێش ئیسلام خاوەن کۆیلەکان کاری لەش فرۆشیان بە ئافرەتە کۆیلەکان دەکرد و ئەو پارەیەی ئافرەتە کۆیلەکان لەو کارە دەستیان دەکەوت بۆ خاوەنەکانیان بوو . بەڵام ئاینی ئیسلامی مەزن بەو ئایەتە ئەو جۆرە لەش فرۆشیەی قەدەغە کرد وەك دەبینن ئایەتەکە دەفەرموێت ( **و لا تکرهوا فتیاتکم علی البغاء ان اردن تحصنا لتبتغوا عرض الحیاة الدنیا** ) وە لێرەدا دەوەستین چونکە هەر ئایەتەکە خۆی وەڵامە بۆ گاورەکان و کۆپی پەیست چییەکانی کورد وە ئاستی نە خوێندەواریان دەردەخات ، ئەگەر دیقەتی ئەم گومانە کورتانە بدەین کە گومانێك بە کورتی دەنوسێت و ژمارەی ئایەتێك دا دەنێت بۆ نموونە وەك ئەم ئایەتە دەنوسن ئیسلام ڕێگای داوە بەوەی ئافرەتە کۆیلەکان لەش فرۆشی بکەن ( بڕوانە ئایەتی ٣٣ ی نور ) بەو شێوەیە یاری بە ئەقڵی شوێن کەوتوەکانیان دەکەن و ئاسان دەبێت بۆ کۆپی و پەیست و خوێندنەوە . یاری بە ئەقڵی موسوڵمانی

عەوامی داماویش دەکەن کە شارەزا نیە لە ئاینی ئیسلام و گومان دەخەنە دڵی بەڵام کاتێك ئایەتەکە بە تەواوەتی دەخوێنینەوە دەبینین هەر خودی ئایەتەکە خۆی گومانەکە پوچەڵ دەکاتەوە و وەڵامی تێدایە دەڵێت زۆر مەکەن لە کۆیلەکان لەش فرۆشی بکەن و ئێوەش پارەکەیان وەر بگرن !؟ با ئێستا بزانین کتێبی گاورەکان خۆی چی دەڵێت لە بارەی لەش فرۆشیی ئافرەتانەوە؟ طبعا ئەگەر باسی لەش فرۆشی بکەین لە کتێبی پیرۆزدا دەبێت بۆتان بکەین بە ٢٠٠ پرسیاری بێ وەڵام بەڵام بۆ کار ئاسانی زۆر بە کورتی باسی لەش فرۆشی دەکەین وە ژمارەی دەقەکان دا دەنێین و خۆتان بەدواداچونی بۆ بکەن.

بە گوێرەی شەریعەتی موسا (ع) لە تەوراتدا لە سفر **التثنية** دوا وتاری موسا ٢٣ – ١٧ دا دەڵێت کچانی ئیسرائیل بۆیان نییە ببنە لەشفرۆش لە نزرگەکان و کوڕانی ئیسرائیلیش بۆیان نییە ببنە دوودەگی لەو شوێنانە ... دیقەت بدەن تەنها بۆ جولەکە قەدەغەیە کچانیان لەش فرۆشی بکات و کوڕانیان ببێت بە دودەگی وە بۆ هەموو نەتەوەکانی تر ئاساییە لەش فرۆشی و دودەگێتی بکات . بەلام بە درێژایی مێژوی جولەکە و هەتا سبیی بابل ئەم کارە هەبووە لەناو جولەکەدا لێرەدا بە کورتی باسی هەندێکیان دەکەین

لە سفر **الملوك** الاول پاشایانی یەکەم بەشی ١٤ دا باسی زەمانی پادشا یربعامی کوڕی سلیمان پێغەمبەر (ع) دەکات چۆن جولەکە پشتیان کردوەتە خودا و خراپە کاریان کردوە و لەناو نزرگە و پەرستگاکان یاندا پڕ بووە لە دودەگی. بڕوانە دەقی ٢٤ وە هەر هەمان سفر بەشی ١٥ دا دەڵێت ( ئاسا ) بو بە پادشا کە لە نەوەی داوده (ع) هەستا ماڵی دودەگییە کانی تێکدا . ئەمە کارێکی باشە بەڵام کێشە لەوەدایە دایکی پادشا خۆی ماڵی دودەگیەکانی بنیات نابوو بۆیە پادشا دایکیی لە پلەی شاژنی لابرد فلیمەکە لێرەدایە : لە نوسخە کوردیەکەدا نوسیویانە معکا ( داپیرەی ) پادشایە و لە نوسخەکانی تردا نوسیویانە دایکێتی !؟ کڵێسای مەسیحی کورد زمان بۆچی کردوتە بە داپیری لە کاتێکدا نوسخەکانی تر دەڵێن دایکێتی ؟ سەیری دەقەکانی ٩ هەتا ١٤ بکەن ، هەر هەمان سفر بەشی ٢٢ باسی یهوشافات دەکات کوڕی ئاسایە لە جیاتی باوکی بوو بە پادشا هێشتا نەی توانیوە ئاساری دودەگیەکان تێك بدات و کاری لەش فرۆشی و دودەگێتی هەر بەردەوام بووە سەیری دەقەکانی ٤١ هەتا ٤٦ بکەن

وە لە سفر **الملوك الثاني** پاشایانی دووەمدا بەشی ٢٣ باسی یوشای پادشا دەکات و لەو زەمانەشدا هەر دودەگێتی و لەش فرۆشی هەبووە و ژنەکان لەوێدا خێمەیان دروست کردوە بۆ ئەوەی سکسی تێدا بکرێت و خەڵکی نەیان بینێ بڕواننە دەقی **( ١ بۆ ٧ )** وە ئەم کارە بەردەوام بووە هەتا زەمانی ایوب (ع) لە **سفری ایوب** بەشی ٣٦ دەق ١٤ دا باسی ئەو کەسانە دەکات کە خراپن و هەمیشە خەریکی کاری لەش فرۆشی و دودەگێتین و هەر لەسەر ئەو کارە دەمرن و لەناو دوو دەگیەکانیشدا دەمرن تەنانەت ئەم کارە بەردەوام بووە هەتا ساڵی ٧٢٢ ی پێش هاتنی مسیح (ع) واتا پێش سبیی بابل . چونکە هوشعی پێغەمبەریان لە سفری **هوشع** بەشی ٤ دا بەهەمان شێوە باس لەوە دەکات کچان و بوکەکانیان خەریکی لەش فرۆشین وە ئەوەی لەش فرۆشییان لەگەڵ دەکات هەر پیاوەکانی خۆیانن . بۆیە خودا سزای کچ و بوکەکانیان نادات چونکە خۆ بەخۆی سواری کچ و بوکەکانی خۆیان دەبن لە هەمووی سەیر تر شەریعەتی عیسا (ع) هات ئەم شتانەی حەرام نەکرد بەڵکو ڕەهای کرد وەك لە ئینجیلەکاندا نوسراوە . ئافرەتە زیناکارەکەیان هێنا

بۆ لای مسیح (ع) ئازادی کرد وە ڕەجمی نەکرد پاساوی مسیحیش ئەوە بوو گوتی : کێ بێ تاوانە و تاوانی نە کردووە با بەردێکی تێ بگرێت ؟ بەڵام مەسیحیش وەك خەڵکەکە تاوان بار بوو چونکە ئەویش بەردی تێ نەگرت !؟ باشە ئەوە خەڵکەکە تاوان بار بوون و ژنە زیناکارەکەیان رەجم نەکرد ! ئەی مسیح خۆی بۆچی بەردێکی تێ نە گرت ؟ ئایا ئەویش تاوان بار بوو ؟ بۆچی ئەو حوکمەی خودای تطبیق نەکرد ؟ وە لەش فرۆشی ڕەها کرد لە ئاینی کڵێسادا ؟

پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە: بێ زەحمەت پێمان بڵێن لە کوێی ئەو ئایەتەی ٣٣ ی **النوردا** ڕێگای داوە بەوەی کۆیلە لەش فرۆشی بکات ؟ ئایا کاکی گاور دەتەوێت بەو چەواشە کارییەت سەر شۆڕییە سیکسیەکانی کتێبەکەت بسڕیتەوە کە لە سەرەوە باسمان کرد و هێشتا زۆر تریش ماوە کە **سفری نشید النشاد** پشکی شێری بەر دەکەوێت ؟ ئەی کاکی بێدینی کورد تۆ بۆچی ئەم گومانانە کۆپی و پەیست دەکەیت ؟ ئایا تۆش گاوریت بە ناوی بێدینەوە ئەم کارانە دەکەیت ؟ یان خۆت نە خوێندەواریت و بێ ئاگایت لە ئیسلام و ئەم کورتە پۆستانە ئاسانە بۆ کۆپی و پەیست و لەبەر کردنیش وەك طوطی وە بۆ ئەوەی بڵاویان بکەیتەوە ؟

.................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و شەست وچوار

## ئیسلام ڕێگای داوە لە ژنان بدرێت

گومانی حەوتهەمی قەشەکانی کڵێسا دەڵێن ئیسلام ڕێگای داوە لە ژن بدرێت بە بەڵگەی ئایەتی ٣٤ ی **النساء** لە وێنەکەدا دامان ناوە بۆتان . کێشەی گاور و دژە دینەکان ئەوەیە لە قورئاندا یە ك ووشەی لێ وەر دەگرن کە خۆیان دەیانەوێت لەم ئایەتەش بە تەنها وشەی ( و اضربوهن ) یان لێ وەر گرتوە ئیتر باقیی ئایەتەکەیان وەر نە گرتووە کە دەفەرموێت ( و اللاتي تخافون نشوزهن ) واتا ئەو ئافرەتانەی دەترسن نەشاز بن . لێرەدا ئەم مانایانە لە خۆی دەگرێت

**یەکەم :** باسی هەموو ئافرەت ناکات وە ناڵێت بە گشتی دەبێت لە ئافرەت بدرێت . بەڵکو جۆرێکی تایبەتە باسی دەکات کە نەشاز بن . وە لە زمانی عەرەبیدا بە لوتکەی بەرزایی تەپۆڵکە دەگوترێت ( نشوز ) وە هەر شتێك دیار و بەرز بێت پێی دەڵێن نشوز تەنانەت لە کوردیی خۆشماندا ووشەی نەشاز بەکار دەهێنین هەر لە ( نشوز ) ی عەرەبی وەرگیراوە کاتێك شتێك دەبینین نارێکە یان لە شتەکانی تر جیایە و وەك ئەوان نییە پێی دەڵێین نەشازە وە هەموو شتێك لەگەڵ عورف و عادەت یان لەگەڵ ڕێچکەی ئەو کارەدا نەگونجێت پێی دەگوترێت نەشاز بۆ نموونە دەنگێکی ناخۆش یان ئاوازێك لەگەڵ باقیی مۆسیقاکانی تردا جیا بێت وە ... هتد . بۆیە پێویست ناکات باسیٔ نەساز بکەین چونکە هەمووان دەزانن نەشاز چییە ؟کەواتا ئەم ئایەتەی دەهۆڵێ بۆ لێدەدەن بۆ هەموو ئافرەتان بە گشتی نییە بەڵکو بۆ نەشازەکانە . نەشازیی ئافرەتەکە لە چیدایە ؟ ئایەتەکە دەڵێت ئەگەر سەر جێی نەکرد !! هەموومان دەزانین ئافرەت نەخۆش دەبێت یان بێ تاقەت دەبێت لەو کاتانەدا ناتوانێت سەر جێی بکات بەلام ئەگەر ساغ بێت و کێشەی نە بێت بۆچی سەر جێی ناکات ؟ هەر ئایەتەکە دەڵێت ( فعظوهن ) واتا قسەیان لەگەڵدا بکەن بزانن هۆکارەکەی چییە ؟ ئەگەر نە گەشتنە چارەسەر !؟ ئایەتەکە چارەسەرێکی تری داناوە دەفەرموێت ( و اهجروهن في المضاجع ) واتا لەسەر یەك جێگا و لە ناو یە ك پێخەفدا پێکەوە مەنوون و جیا بەرەوە لێی . طبعا مانای ئەو جیابونەوەیە و نوستن بە جیایە هەر خاڵێکی لاوازی پیاوەکەیە چونکە ناڵێت ئافرەتەکە دەر بکە و با ئەو بە جیا بنوێت بەڵکو فەرمان بە پیاوەکە دەکات بڕوات و بە جیا بنوێت ئەمەش هەر بار لاریی پیاوەکەیە کە ئەو بڕوات بە جیا بنوێت . وە لە هەموی گرنگ تر بەس ئافرەتان لەوە تێ دەگەن چەند ناخۆشە پیاوێك جێگا جیا بکاتەوە و دور بنوێت لە ژنەکەی !؟ وە ئافرەت ئەو کارە ی زۆر پێ ناخۆشە و ئەوەش سزایەکی دەروونییە بۆ ئافرەتەکە ئەگەر ئەوەش چارەسەری نە بوو !؟ دەفەرموێت ( و اضربوهن ) واتا لێیان بدەن وە هەمو فیقە و شەرع و مفسرە ئیسلامیەکان لەسەر ئەوە کۆکن نابێت لێی بدرێت ئازاری پێ بگات یان جێگای بشکێندرێت بەڵکو لێدانێك وەك ئامۆژگاری وا بێت چۆن کەسێك منداڵی خۆی ئامۆژگاری دەکات و جار جار بە هێواشی دەدات بە ڕومەتی یان بە شوێنێکیدا ئازاری نەگات لێدانی ژنەکەشی بە هەمان شێوە بێت . کەواتا قورئانی پیرۆز عقوبەی لێدانی ژنی نە سەپاندووە ؟ بەڵکو قورئانی مەزن سزای لێدانی داناوە بۆ ئافرەتێك ساغ بێت و سەر جێی نەکات پاش ئامۆژگاری و گفت و گۆ کردن و پاش ئەوەی لە هەمان پێخەفدا پێکەوە نەخەون . وە ئەگەر ئەو کارە شتێکی نەشاز نە بێت دەبێت چی نەشاز بێت ؟ لە کاتێکدا سەر جێی حەقی هەردووك لایانە بەسەر یەکەوە

با بزانین کتێبەکەی خۆیان چی دەڵێت بۆ گوێ ڕایەڵیی ئافرەت بەرامبەر مێردەکەی ؟

**مەتا** ٥-٣٢ دا باسی ئافرەتی تەلاق دراو دەکات وە بە ئافرەتێکی زیناکار لە قەڵەمی دەدات تاوانی ئافرەت ی داماو چییە لەگەڵ کەسێکدا نەگونجێت و تەڵاق بدرێت دوایی کەسێکی تر ئەو ئافرەتە بهێنێتەوە ژنی نییە بەڵکو لەش فرۆشە. وە بە گوێرەی ئەو دەقەی مەتا لە ئاینی مەسیحیدا نابێت پیاو ژن تەڵاق بدات ئیلا ئەگەر زینا بکات . واتا ئەگەر پێکەوە نە گونجێن دەبێت هەر ژنی بێت هەتا دەمرێت بەلام ئەگەر زینای کرد ئەو کات بۆی هەیە تەلاقی بدات . بۆیە ئافرەتی مەسیحی باشترین چارەسەر ئەوەیە زینا بکات بۆ ئەوەی تەڵاق دان شمولی بکات و لە مێردەکەی جیا ببێتەوە . وە زینا باشترین چارەسەرە بۆ ئەوەی لە مێردەکەی جیا ببێتەوە

لە نامەی **بطرسی** یەکەمدا ٣-١ دەڵێت : ئەی ژنەکان، بە هەمان شێوە ملکەچی مێردەکانتان بن

کولەسی ٣-١٨ دەڵێت : ئەی ژنەکان، ملکەچی مێردەکانتان بن، وەك لە خوداوەند دەوەشێتەوە

لە افسوس ٥-٢٢ دەڵێت : ئەی ژنان، ملکەچی مێردەکانتان بن هەروەك بۆ خوداوەند

دیقەت بدەن هەر هەموو دەقەکان دەڵێن دەبێت ئافرەت مل کەچی مێردەکانیان بن . کاکی گاور بۆچی ڕەخنە دەگریت لە قورئان لە کاتێکدا ئافرەتێکی نەشاز مل کەچی مێردەکەی نابێت پاش ئامۆژگاری و بەجێ هێشتنی ناو پێخەف دەڵێت لێدانێکی لێدە بۆ ئامۆژگاری لە نامەی تیماساوسی یەکەمدا بەشی ٢ دەق ١١ و ١٢ دەڵێت ئافرەت دەبێت دەمی دابخات و قسە نەکات لە نوسخە کوردییەکەدا دەم داخستنیان کردوە بە هێمنی . لە وێنەکەدا دەقەکانمان داناوە

لە کتێبی پیرۆزدا ئەگەر ئافرەت تەڵاق بدرێت گڵاو دەبێت کلیکی ئەم لینکە بکەن بۆ بینینی دەقەکان

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1443040695./1637788439773343/?type=3&theater

.....................................

**بابەتی نا لینك**

تەورات و مافی ئافرەت لە تەڵاقدا



لە شەریعەتی موسادا (ع) لە **سفر التثنية** ( دوا وتاری موسا ) بەشی ٢٤ دەق ١ بۆ ٤ دا نوسراوە

ئەگەر پیاوێك ژنێکی هێنا و پەسەند نەبوو لەبەرچاوی، چونکە بێئابڕوویەکی تێدا بینی و تەڵاقنامەی بۆ نووسی و دایە دەستی، لە ماڵەکەی خۆی بەڕێی کرد، ئەویش کە لە ماڵەکەی دەرچوو، بووە ژنی پیاوێکی دیکە، جا ئەگەر پیاوەکەی دووەم ڕقی لێی بووەوە و تەڵاقنامەی بۆ نووسی و دایە دەستی و لە ماڵەکەی خۆی بەڕێی کرد، یان ئەگەر پیاوەکەی دووەم کەوا هێنابووی مرد،ئەوا مێردەکەی یەکەمی کەوا تەڵاقی دابوو ناتوانێت بیهێنێتەوە .... تا ببێت بە ژنی دوای ئەوەی گڵاو بووە چونکە ئەوە شتێکی قێزەوونە لەلای یەزدان، جا گوناه مەهێنە سەر ئەو خاکەی یەزدانی خودات بە میرات دەتداتێ ئایا ئافرەت بە تەڵاق دان گڵاو دەبێت ؟ وە چارەنوسی ئەو ئافرەتە داماوە چی دەبێت ؟

.................................................................

ئەگەر دوو پیاو لە کڵێسا یان لە بازاڕدا شەڕ بکەن یەکێك لە پیاوەکان بکەوێتە سەر زەوی و ئەوی تر لێێ بدات ژنی پیاوە لێدراوەکە گونی پیاوەکەی تر بگرێت بۆ ئەوەی مێردەکەی ڕزگاری بێت . دەبێت دەستی ژنەکە ببڕرێتەوە . لەم لینکەدا زانیاریی زیاتری تێدایە

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1443040695./1606139456271575/?type=3&theater

........................

**بابەتی ناو لینك**

سزای گون گرتن چییە لە کتێبی پیرۆز دا ؟




لە تەورات دا سفر التثنية ٢٥ دەق ١١ و ١٢ دا نوسراوە

ئەگەر دوو پیاو لەگەڵ یەکتری کردیان بە شەڕ ژنی یەکێکیان هات تا فریای پیاوەکەی بکەوێت لە دەست ئەوەی لێی دەدات جا دەستی درێژکرد و گونی گرت دەستی ببڕنەوە و بەزەییتان پێیدا نەیەتەوە من هیچ ناڵێم !! بۆ ئێوەی بەڕێزی جێ دەهێڵم . گاور و

جولەکەکان دەڵێن ئیسلام زوڵم لە ئافرەت دەکات ئەوەتا لە کتێبەکەی خۆیاندا دەڵێن بەزەیتان بەو ئافرەتەدا نەیەتەوە و دەستی بېڕن چونکە یارمەتیی مێردە کەیی داوە و گونی کابرای گرتووە بۆ ئەوەی مێردەکەی ڕزگار بکات . ئەو ئافرەتە داماوە تاوانی چییە ؟

..............................................................................

کۆمێنتێکی بە سوود

بۆ زیاتر مەعلوماتتان هاوریان هیوادارم سود لەو کۆمێنتەش وەربگرن : خاتوو عائشە ئەگێڕێتەوە پیغەمبەری خوا هەرگیز لەخزمەتکارو ئافرەتی نەیاوە عَنْ عَائِشَةَ ، قَالَتْ : " مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَادِمًا لَهُ قَطُّ وَلَا امْرَأَةً لَهُ قَطُّ .... ) صحيح مسلم ئەم ئایەتە هیناوتە حالەتیکی تایبەتە پیاو کاتێ تورە ئەبیت یەکسەر پەنا ئەباتە بەر لیدان خوای گەورە ئامۆژگاری پیاوان ئەکات بەسێ ریگە ئافرەتیك یاخی بوو لیتان چاکی بکاتەوە بۆئەوەی تورەیی یەکەی دابمرکیتەوە :وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ ۖ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا (٣٤) سورە النساء واتە : ئەو ئافرەتانەی ئیوە ئەترسن سەرکیشی و سەرپیچی بکەن ١- ئامۆژگاریان بکەن (ئەگەر سودی نەبوو ) . ٢- لەناو جیگە پشتیان تێ بکەن (ئەگەر سودی نەبوو. ٣- لیان بدەن ( بەمەرجیك سوکە لیدان بیت و لەدەم و چاوی نەدریت ) ئەگەر بەم هۆیانە لەلادان و یاخی بوون وازیان نەهینا ریگەی تر مەگرنە بەر ( بۆ ئازاردانیان ) بیگومان خوا بەرزو بلندو گەورەیە ...بەلگە لەسەر ئەوەی نابیت لەدەم و چاوی ئافرەت بدریت (قال رجل من الصحابة: يا رسول الله! ما حق زوجة أحدنا عليه؟ قال: أن تطعمها إذا طعمت، وتكسوها إذا اكتسيت ولا تضرب الوجه، ولا تقبح ولا تهجر إلا في البيت)). رواه أحمد في المسند و أبو داود (حديث حسن). واتە: پیاوێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا مافی خێزانی هەر یەکێکمان بەسەر ئێمەوە چیە؟ پێغەمبەرصلی الله علیه وسلم فەرموی: مافەکە ئەوەیە کە خواردنی بدەیتێ و جل و بەرگی بۆ بکەی و نابێ لە دەم و چاوی بدەی و نابێ قسەی ناشیرینی پێ بڵێی و تەنانەت لەسەر جێگای خەوتن پشتی تێ مەکە و جێگەت مەگۆرە و نەچیە ژورێکی تر بخەوی.... بەلگەشم بۆ ئەوەی سوکە لیدانە ((من خطبة النبي صلى الله عليه وسلم في حجة الوداع:.. ألا واستوصوا بالنساء خيراً !اتقوا الله في النساء! فإنكم أخذتموهن بأمان الله واستحللتم فروجهن بكلمة الله ولكم عليهن أن لا يوطئن فرشكم أحداً تكرهونه، فإن فعلن ذلك (( فاضربوهن ضرباً غير مبرح ))ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف. وقد تركت فيكم ما لن تضلوا بعده إن اعتصمتم به: كتاب الله: وأنتم تسألون عني، فما أنتم قائلون؟ !قالوا: نشهد أنك قد بلغت وأديت ونصحت. فأشار بأصبعه السبابة يرفعها الى السماء وينكبها الى الناس ويقول: اللهم اشهد! اللهم اشهد ثلاث مرات.)). رواه مسلم.

پێتان رادەسپێرم کە لەگەڵ ...)) :واتە: لە حەجی ماڵ ئاوایی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە وتارەکەی ئەوەی فەرموو دەرهەق ئافرەتان لە خوا بترسن (زوڵمیان لێ نەکەن)! چونکە ئافرەتان ئەمانەتی !ئافرەتان بە چاکە رەفتاریان لەگەڵ دا بکەن خوان لەلای ئێوە و بە هۆی دین و وشەی خوای گەورە فەرجیان بۆتان حەڵاڵ کراوە. ئێوەش مافتان لەسەریان ئەوەیە کەکەس نەیەتە ماڵتانەوە و لە شوێنی خۆتان دابنیشێ کە خۆتان پێتان ناخۆشە بێن بۆ ماڵتان. گەر بەفەرمانیان نەکردن ئەو کاتە بە لێدانێکی سوک لێیان بدەن ئەوەش پاش ئامۆژگاری کردنیان بە گوتەی شیرین یان سەرجێیی نەکردن، ژنەکانیشتان مافیان لەسەرتان هەیە کە رۆزیان بۆ پەیدا بکەن و بە باشی پۆشتەیان بکەن. کیتابی خوا کە قورئانە بۆم بەجێ هێشتون گەر دەستی ئەوانەی لەوێ ئامادەی وتارەکە !پێوە بگرن هیچ کاتێك گومراو سەرلێشێواو نابن، ئێوەش دەربارەم دەپرسن، ئێوە چی دەڵێن؟ جا .بوون گوتیان: گەواهی و شایەتی دەدەین ئەوەی کە لەسەرت بو گەیاندت و بەجێت هێنا و ئامۆژگاریشت کرد لەو بارەیەوە پەنجەی شایەتمانی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و بەلای خەڵکەکەی لادەدا و دەیفەرموو: خوایە شایەت بە، خوایە شایەت بە سێ جار ئەمەی فەرموو....... پیغەمبەریك کۆتایی وەسیەتی ئەوە بوو لەگەل ئافرەتەکانتان بەچاکە رەفتار بکەن .

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :سەد و شەست وپێنج

## ئیسلام ڕەشوە دەدات بۆ ئەوەی خەڵكی ببن بە موسوڵمان

8. اباح الاغراء بالمال للمؤلفة قلوبهم (سورة التوبة 60)

1. إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّـهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّـهِ وَاللَّـهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ

﴿التوبة: ٦٠﴾



پرسیارە بێ وەڵامەكان
بۆ هەموو دژە
ئیسلامەكان

لَعنَةُ اللهِ على الْمُرتَشِي ، و الرَّاشِي

الراوي : عبدالله بن عمرو | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الجامع — الصفحة أو الرقم: 5114 | خلاصة حكم المحدث : صحيح

كڵێسا هەمیشە خەریكی ڕەشوە و پارەدانە بە خەڵكی بۆ ئەوەی ببن بە مەسیحی بە تایبەتی لەو ناوچانەی شەڕی تێدایە یان ئەو ناوچانەی بێ پارەی و برسێتیی تێدایە خەڵكی داماو استغلال دەكەن بە ناوی یارمەتییەوە . ئەوە ئێوەن ڕەشوە دەدەن نەك ئاینی ئیسلامی مەزن ؟ چونكە كاتێك ئیسلام پارە و بەخششی داوە بە المؤلفة قلوبهم

هیچیان نە لە ناوچەی شەڕدا بون نە لە برسێتی و بێ داریدا بون بەڵكو ئەو كەسەی بەخشسەكەی وەر گرتووە زۆر دەسەڵات دار و بێ منەت بووە لە بەخششەكە و لەوەش كە ببێت بە موسوڵمان . نەك وەك ئێوە كە بون بە كرمی زارو خوێنی خەڵكی دەمژن لە ناوچە كێشاویەكاندا و استغلالی كێشەكانیان دەكەن و دەیان كەن بە گاور

ڕەخنەی هەشتەمی كڵێسا دەڵێن قورئان پارە و ڕەشووە دەدات بە خەڵكی بۆ ئەوەی ببن بە موسوڵمان و بێنە ناو ئاینی ئیسلامەوە و زۆر بە كورتی نوسیویانە

اباح الاغراء بالمال للمؤلفة قلوبهم – سورة التوبة ٦٠

بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەبێت پێشەكی بزانین المؤلفة قلوبهم مانای چییە ؟ بۆ ئەوەی جوانتر تێ بگەین نموونەیەك دەهێنینەوە

دایك و باوك وە خاوەن كارەكان و بەڕێوەبەری فەرمانگەكان و زۆر شوێنی تریش هەندێك بەخششیان هەیە بۆ منداڵەكانیان یان كرێكارەكانیان یان فەرمان بەرەكانیان . ئەگەر منداڵەكەی سەركەوتوو بێت لە كارێكدا یان لە قوتابخانەدا شتێكیان دەدەنێ یان بۆ دەكڕن . هەروەها بۆ ئەوەی ڕادەی وەبەرهێنان لە كارگەیەكدا بەرز بێتەوە بەخشش دەدەن بە كرێكارەكان یان بە فەرمان بەرەكان .

وە سروشتی مرۆڤیش لە كۆن و نوێدا بەو شێوە یەیە هەمیشە بە بەخشش كارەكانیان باشترو زیاترو چاك تر دەكەن

وە بەخششی المؤلفة قلوبهم بەس بە تەنها بۆ موسوڵمانان نییە بەڵكو بۆ غەیرە موسوڵمانیشە ئەگەر لە سەنگەردا نە بێت بەرامبەر موسوڵمانەكان وە ئەمانەش چەند جۆرێكن : كەسانێك چاوەڕوان دەكرێت خۆی یان هۆزە كەی بێنە ناو ئیسلامەوە و ببن بە موسوڵمان وەك **صفوانی كوڕی ئومەیە** جۆرێكی تریان ئەو كەسانەن بۆ ئەوەی موسوڵمانان لە شەڕ و گێچەڵیان بپارێزرێن -

جۆرێكی تریان تازە موسوڵمان بوون بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لە ئیسلامدا . جۆرێكی تریان گەورە و سەرۆك هۆزی بێ باوەڕانە وەك **عدي كوڕی حاتم الطائی**، جۆرێكی تریان ئەوانەن كە ئیمانیان لاوازە و خەڵكی بە قسەیان دەكەن – جۆرێكی تریان ئەو موسوڵمانانەن كە لەسەر سنورەكانن بەرامبەر دوژمن . ئەمانە هەر هەمووی پێیان دەگوترێت المؤلفة قلوبهم و دەچنە ئەو خانەیەوە ئەگەر دیقەت بدەن یە ك خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوان هەر هەموویاندا . ئەویش ئەوەیە دەوڵەت پارە دەدات بەوان نەك ئەوان پارە بدەن بە دەوڵەت !؟ واتا ڕەشوە نییە . چونكە هەمیشە هاوڵاتی ڕەشوە دەدات بە دەوڵەت یان بە كەسێكی خاوەن دەسەڵات بۆ ئەوەی كارێكی بۆ بكات بەڵام پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) پارەی داوە بەوان نەك ئەوان پارە بدەن بە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) . هەر ئەم خاڵە گومانی بەرامبەر پوچەڵ دەكاتەوە . چونكە ڕەشوە كەسێك دەی دات بە دەوڵەت بۆ بەرژەوەندیی كەسەكە وە هەمیشە هاوڵاتی دەی دات بە دەوڵەت وە ئەگەر ئەو پارەیەی دەدرێت بە مؤلفة قلوبهم ڕەشوە بێت مەسڵەحەتی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) چییە لەو كارەدا ؟ بۆ ئەوەیە كۆیان بكاتەوە لە بەهەشتدا و هیدایەت وەر بگرن . وە ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) هەوڵی بۆ پارە بدایە و بیویستایە دەوڵەمەند بێت پارەی نە دەدانێ و بۆ خۆیی هەڵ دەگرت وەك دژە ئیسلامەكان دەڵێن بە شمشێر و بە ترس دەی كردن بە باوەڕدار !؟ پاشان پێدانی پارە و ڕەشوە هەمیشە بۆ بەرژەوەندیی تایبەتییە . ئایا ئەو پارەدانە بە مؤلفة قلوبهم چی بەرژەوەندیەكی شخصیی هەبووە بۆ پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ؟بۆ ئەوەی جوانتر و باشتر لە ( المؤلفة قلوبهم ) تێ بگەن بە یە ك نموونەی زیندوی ئێستای ساڵی ٢٠١٥ مان كۆتای بە باسەكە دەهێنم لەم كوردوستانەی خۆماندا دوو ساڵە وەزعی خەڵكی باش نییە موچە نییە بازاڕ نییە هەموو شتێك نییە هۆكارەكەشی نەبوونی بودجەیە . ئەگەر ئێستا كەسێكی زیرەك و بە توانا بێتە پێشەوە و موچە و بازاڕ و باری ئابوریمان بۆ چاك بكات . ئایا هەتا دونیا دونیایە ئەو كەسە نابێت بە كەسێكی خۆشەویست لای گشت كوردەكان !؟ ئایا نابێتە جێگای متمانە و باوەڕی هەمووانمان ؟ ئایا هەموو لێ كۆ نابینەوە و نابین بە المؤلفة قلوبهم ؟ لە كاتێكدا ئەو كەسەش دەبێت بە مێژویەكی پڕ سەروەری بۆمان . چونكە كابرا ئامانجی ئەوەیە ئێمە ڕزگار بكات لەم قەیرانانە مرۆڤیش لە كۆن و نوێدا هەر هەمان شێوەیە ئەگەر باری ئابوریی باش بێت زیاتر متمانە بەو كەسە و بەو لایەنە دەكات و دەزانێت بەرژەوەندیی خەڵكیی دەوێت نەك هی خۆی !؟ چونكە بەخشش لە لایەن گەورە و سەركردەوە هەمیشە جێگای ڕێزە و خەڵكی زیاتر لە چوار دەوری كۆ دەبنەوە و دەزانن ئەو گەورەیە دەتوانێت پارەكە بۆ خۆی بەرێت و نەی دات بە میلەت !؟ بەڵام گەورەكە پارەی ناوێت بەڵكو هیدایەتی خەڵكیی دەوێت نەك بەرژەوەندیی خۆی

**پرسیاری بێ وەلامیشمان بۆ كلێسا ئەمەیە** : فەرموون پێمان بڵێن بە درێژایی ٢٠١٥ ساڵی كڵێسا و ئاینی مەسیحی پێمان بڵێن كەی و لەچی زەمانێكدا خەڵكی بوون بە مسیحی بەهۆكاری ئەوەی كە پەیڕەو پرۆ گرامی كتێبی پیرۆز جوان بوبێت و خەڵكی ئاینەكەیان قبوڵ كردبێت ؟یان لەبەر ئەوەی كتێبەكەتان یان پرۆگرامەكەتان جێگای سەرنج و دەست خۆشی بوبێت و خەڵكی خوێندویە تیەوە و كاریگەریی هەبووە لە سەری !؟ بۆ ئەوانەی نازانن ئەم ئاینە چۆن بڵاو بوەتەوە : لە ساڵی ٣٢٥ دا واتا پاش ٣٢٥ ساڵ لە

هەڵکێشانەوەی مسیح (ع) بۆ ئاسمان ئیمپراتۆری ڕۆم قستنطینی یەکەم ئەم کتێبە پیرۆزەی نوسییەوە و بە حوکمی دەسەڵاتی بڵاوی کردەوە . ئەگینا کتێبی پیرۆز هیچ شتێکی تێدا نییە بێتە هۆکاری هیدایەت !؟ وە کڵێسا هەمیشە خەریکی ڕەشوە و پارەدانە بە خەڵکی بۆ ئەوەی ببن بە مەسیحی بە تایبەتی لەو ناوچانەی شەڕی تێدایە یان ئەو ناوچانەی بێ پارەی و برسێتی تێدایە خەڵکی داماو استغلال دەکەن بە ناوی یارمەتییەوە . ئەوە ئێوەن ڕەشوە دەدەن نەك ئاینی ئیسلامی مەزن !؟ چونکە کاتێك ئیسلام پارە و بەخششی داوە بە المؤلفة قلوبهم هیچیان نە لە ناوچەی شەڕدا بوون نە لە برسێتی و بێ داریدا بوون !؟ بەڵکو ئەو کەسەی بەخشسەکەی وەر گرتووە زۆر دەسەڵات دار و بێ منەت بووە لە بەخششەکە و لەوەش کە ببێت بە موسوڵمان . نەك وەك ئێوە کە ببون بە کرمی زارو خوێنی خەڵکی دەمژن لە ناوچە کێشاویەکاندا و استغلالی کێشەکانیان دەکەن و دەیان کەن بە گاور

**کۆتا پرسیاریشمان ئەمەیە** : ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) ڕەشوەی دابێت بۆ ئەوەی خەڵك بیە ناو ئاینی ئیسلامەوە . بۆچی هەر خۆی لەعنەتی کردووە لەو کەسەی ڕەشوە دەدات و لەو کەسەش کە لێی وەر دەگرێت ؟ دەقی حەدیسەکە لە وێنەکەدا دانراوە و حەدیسی صحیحە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و شەست وشەش

## ئیسلام ڕێگای داوە بە کوشتنی خەڵکی بێ تاوان

9. اباح القتل وسفك دماء الابرياء (سورة الانفال 65)

الَّذِينَ عَاهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۚ إِنَّ اللَّـهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ ﴿٥٨﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا ۚ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّـهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّـهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّـهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِن جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّـهِ ۚ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٦١﴾

وَإِن يُرِيدُوا أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّـهُ ۚ هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـٰكِنَّ اللَّـهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّـهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾



پرسیارە بێ وەڵامەکان
بۆ هەموو دژە
ئیسلامەکان

چەواشەکاریی ژمارە (٩ ) ی کڵێسا دەڵێت : اباح القتل و سفك دماء الابرياء ( سورة الانفال ٦٥ ) ئایەتی ٦٥ ی الانفالمان لە وێنەکەدا داناوە . بۆ ئەم گومانە زۆری لەسەر ناڕۆین . چونکە ئایەتەکانی پێش خۆی گومانەکە پوچەڵ دەکاتەوە واتا لە ئایەتی ٥٦ وە بیخوێنەوە مەبەستی ئایەتی ٦٥ دەردەکەوێت چییە ؟ چونکە سورەتی **الانفال** باسی شەڕ و چۆنێتیی شەڕ و ڕێك کەوتن لە نێوان دوو سوپادا لە کاتی شەڕدا دەکات و یاساکانی شەڕ ڕوون دەکاتەوە چییە و چۆنە ؟لە ئایەتی ٥٦ وە باسی ئەوە دەکات ئەگەر پەیمانی شەڕ ڕاگرتنتان هەبوو بەرامبەر پەیمانەکەی شکاند وەك چۆن هەموو جارێك پەشیمان دەبنەوە لە پەیمانەکانیان . بۆیە ئێوەش باوەڕ بە پەیمانەکانیان مەکەن و هەمیشە ئاگادار بن و وا بزانن لە شەڕدان لەگەڵیاندا چونکە هەمیشە پەیمان دەشکێنن و پەلامارتان دەدەن . بۆیە ئێوەش وەك ئەوان بن و ئەسیریان لێ بگرن بۆ ئەوەی ئاقڵ ببن و چیتر هەڵتان نە خەڵەتێنن بە ناوی ڕێك کەوتنەوە . وە ئەگەر لەگەڵ قەومێکدا پەیمانتان هەبوو وە ئێوە ترسان یان گومانتان هەبوو ئەوان لە پەیمانەکەیان پەشیمان بونەتەوە . ئێوە دەست پێشکەری بکەن و پێیان بڵێن کە ئێمە پەیمانمان لەنێواندا نەماوە و پەیمانەکە هەڵ بوەشێننەوە و غەدریان لێ مەکەن چونکە خودا خیانەت کارانی خۆش ناوێت !؟ کەواتا لە ئایەتی ٥٦ هەتا ٥٩ باسی دوو جۆر پەیمان دەکات

**یەکێکیان** لەگەڵ قەومێکدا کە هەمیشە خیانەت بکات و پەیمانی شەڕ وەستان بشکێنێت . تۆش متمانەی پێ مەکە و کارێکی وایان پێ بکە ئاقڵ ببن و چیتر خیانەت نەکەن .

وە **دووەمیان** ئەگەر گومانتان هەبوو ئەوان کاری خراپ دەکەن و پەیمان دەشکێنن ئێوە دەست پێش خەری بکەن و پێیان بڵێن ئێمە پەیمانەکە هەڵ دەوەشێنینەوە . واتا لە پشتەوە خەنجەر یان لێ مەدەن و بە ئاشکرا پێیان بڵێن پەیمانەکەمان هەڵ وەشاندوەتەوە . پاشان دەفەرموێت خۆتان ئامادە بکەن بە باشترین جۆری چەك بۆ ڕوو بە ڕوو بونەوەی دوژمنەکانتان . وە ئیسلامیش ئاینی دەوڵەتە و دەوڵەت دەبێت چەکی باشی هەبێت و بەهێز بێت بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی حسابی بۆ بکەن و لێی بترسن . هەروەك چۆن ئێستا دەوڵەتەکان حساب بۆ دەوڵەت دەکەن و مجلسی امنیان داناوە و بە ئارەزوی خۆیان حوکم دەکەن . دەوڵەتی ئیسلامیش دەبێت بەهێز بێت و چەکی باشی هەبێت بۆ ئەوەی حسابی بۆ بکرێت . پاشان دەفەرموێت ئەگەر ئەوان ئاشتییان ڕاگەیاند تۆش داوای ئاشتی بکە و شەڕ ڕاگرن کەواتا ئەم ئامادە باشییە بۆ ئەوە نییە هێرش بکرێتە سەر کافران بەڵکو بۆ ئەوەیە موسوڵمان خۆی بپارێزێت و ئەگەر ئەوان شەڕیان وەستاند تۆش بە قسەیان بکە و شەڕ ڕابگرە . وە ئەگەر بەرامبەر ویستیان هەڵتان بخەڵەتێنن و فێڵتان لێ بکەن خەمتان نەبێت خودا پشت گیریتان دەکات . هەروەك چۆن لە شەڕی **احزابدا** پشت گیریی کردن و یەك ڕیزیی خستە نێوانتانەوە لە کاتی تریشدا هەر بەهەمان شێوە پشت گیریتان دەکات و یەك ڕیزیتان دەپارێزێت پاشان دەفەرموێت ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێندە بەسە بۆ تۆ خودا و ئیمانداراکانت لەگەڵدایە واتا پشت بە خودا و بە موسوڵمانەکان ببەستە و خودا سەرتان دەخات بەسەر کافرەکاندا . ئێستا دێینە سەر ئایەتی ٦٥ کە گاورەکان ڕەخنەیان لێی هەیە

وە دەڵێن ئیسلام کوشتنی خەڵکی ڕەها کردوە کابرای گاور ئەم پێشەکیەی بڕیووە کە لە سەرەوە باسمان کرد . پاش ئەوەی خودای زانا باسی چۆنێتیی پەیمان بەستن و پەیمان شکاندنی شەڕمان بۆ دەکات و پێمان دەڵێ ئەگەر شەڕیان ڕاگرت ئێوەش ڕای بگرن دەفەرموێت **( یا ایها النبي حرض المؤمنین على القتال )** واتا تشجیعی ئیمانداران بکە بۆ شەڕ کردن و ورەیان بەرز بکەرەوە . هەروەك چۆن ئێستاش دەوڵەتەکان کاتی شەڕ تشجیعی خەڵکی دەکەن بۆ ئەوەی بەرگری بکەن وە چەندەها سرود و جۆری تر کاری تر دەکەن بۆ ئەوەی ورەی سوپا بەرز بێتەوە . قورئانیش بەهەمان شێوە داوا دەکات ورەی خەڵکی بەرز بێتەوە لە کاتی شەڕدا و خۆ ئایەتەکە نا فەرموێت حرض المؤمنین على القتل واتا تشجیعی خەڵکی بکە بۆ کوشتن !؟ بەڵکو دەفەرموێت ( على القتال ) واتا شەڕ کردن .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : ئەگەر ئایەتەکانی پێش ئایەتی ٦٥ ی **الانفال** بخوێنینەوە کە فێرمان دەکات کاتێك دوژمن خیانەتی لێ کردین چی بکەین ؟ وە چۆن پەیمان ببەستین و چۆن هەڵی وەشێنینەوە وە ئامادەبین بۆ داواکاریی بەرامبەر ئەگەر ئاشتییان ویست . وە هەموو شتێك ئامادە بکەین بۆ بەرگری کردن لە خۆمان . ئایا ئەمە ڕێگا پێدانە بە کوشتنی خەڵکی بێ تاوان ؟ یان ئامادەکارییە بۆ خۆ پاراستن لە شەڕ و لێدانی بەرامبەر ؟بۆ ئەوەی دژە ئیسلامەکان چەواشەتان نەکەن بە ئایاتی ( **قاتلوا وە اقتلوا** ) تکایە کلیکی ئەم لینکە بکەن .

https://www.facebook.com/1553401181577496/photos/pb.1553401181577496.-2207520000.1443373148./1571321976452083/?type=3&theater

..................

**بابەتی ناو لینك**

سەیری پرسیارە بێ وەڵامەکان ٧١ **بکەن لاپەرە (١٤٦)**

.........................................................................

ئایا ئەو ئایەتەی ٦٥ ی سورەتی **الانفال** دەڵێت خەڵی بکوژن یان مەسیحی ئاشتی خواز کە پەیامی بۆ مرۆڤایەتی شمشێر و دوبەرەکی بووە . فەرموون سەیر بکەن بزانن مەسیح (ع) دەڵێت من بۆچی هاتووم و پەیامەکەم چییە ؟

لە ئینجیلی **مەتا** ١٠ دەق ٣٤ بۆ ٣٧ دا مەسیح دەڵێت

وا مەزانن کە هاتووم تاکو ئاشتی بهێنمە سەر زەوی ؟ نەهاتوم بۆ هێنانی ئاشتی بەڵکو شمشێر چونکە من هاتووم بۆ هەڵگەڕاندنەوەی کوڕ لە باوکی و کچ لە دایکی و بوك لە خەسوی دوژمنی مرۆڤیش لە خانەوا دەکەی خۆی دەبێت ئەوەی باوك یان دایکی لە من خۆشتربووێت، شایانی من نییە. ئەوەی کوڕ یان کچی لە من خۆشتر بووێت شایانی من نییە

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :سەد و شەست وحەوت

## ئیسلام ڕێگای داوە بە تالانی

ئەمە ڕەخنەی گاورەکانە کە کوردی خۆشمان کۆپی و پەیستی دەکات و بەڵگەشی ئایەتی 41 و 69 ی انفالە

10. اباح النهب والغنائم (سورة الانفال 41 و69)

وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿الأنفال: ٤١﴾

فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿الأنفال: ٦٩﴾

بحث عن سلب في الكتاب المقدس

ابحث عن سلب في الكتاب المقدس ابحث

عرض ايات 1-25 من اصل 48.

بحث عن نهب في الكتاب المقدس

ابحث عن نهب في الكتاب المقدس ابحث

عرض ايات 1-25 من اصل 69.

گەران لە کتێبی پیرۆز

گەران لە [کتێبی پیرۆز] بۆ [تالان] ، سەرجەمی دۆزراوە بریتیە لە [130] دانە .

دێر ناوەرۆک

پەیدابوون:34:27 ئینجا کوڕانی یاقوب هاتنە سەر کوژراوەکان و شارەکەیان تالان کرد، چونکە داوێنی خوشکەکەیان پیس کردبوو.

پەیدابوون:34:29 هەرچی سامانیان هەبوو بە تالان بردیان، تێکڕای منداڵ و ژنیان ڕاپێچ کرد، هەرچیش لە ماڵەکان بوو بردیان.

گەران لە [کتێبی پیرۆز] بۆ [دەستکەوت] ، سەرجەمی دۆزراوە بریتیە لە [86] دانە

لە قورئاندا 2 جار وشەی ( غنيمة ) واتا دەست کەوت هاتوە بەڵام لە کتێبی پیرۆزدا 48 جار وشەی ( سلب ) هاتوە واتا شت بەزۆر سەندن لە خەڵکی وە وشەی ( نهب ) 96 جار هاتوە واتا تاڵانی کردن

لە نوسخە کوردیەکەدا تاڵانی 130 جار وە 86 جار وشەی ( سلب ) هاتوە گۆڕیویانە بە دەست کەوت لە کاتێکدا قورئان باسی تاڵانی و شت بەزۆر سەندن ی تێدا نە هاتووە بە هیچ جۆرێك !؟

ڕەخنەی دەیەمی کڵێسا لە کۆی ٢٣ ڕەخنەکە دەڵێت ئیسلام ڕێگای داوە بە تاڵانی وە ئایەتی ٤١ و ٩٦ ی انفالیان داناوە بە بەڵگە . ئەم جارەیان بە شێوەیەکی زۆر سادە وەڵامیان دەدەینەوە . ئەویش بەس تەنها باسی ووشەی تاڵانی دەکەین چونکە ئایەتی ٤١ و ٦٩ ی **الانفال** باسی ( الغنيمة ) دەکات وە کابرای گاور هیچ شارەزا نییە لە زمانی عەرەبی وە نازانێت تاڵانی چیە و مانای چییە ؟

و هەمان ڕەخنەی گاورەکان دەڵێتەوە بە حساب پێی ناخۆشە خەڵکی تاڵانی کراون لە لایەن سوپای ئیسلامەوە !؟ دژە ئیسلامەکان هیچیان نازانن ( سلب و نهب و غنيمة ) چییە ؟ ( سلب ) واتا شت لێ سەندن لە خەڵك ( نهب ) واتا تاڵانی ( غنيمة ) واتا دەست کەوت لە شەڕی سوپاکاندا لە کۆن و نوێدا دوو جۆر دەست کەوت هەبووە . یەکێکیان کاتێك سوپاکە بەزیووە ! دەست گیراوە بەسەر هەموو شتەکانی ئەو سوپایەدا . دووەمیان کاتێك سوپاکە هەڵ هاتووە ئەو شتانەی لێیان جێ ماوە دەستیان بەسەردا گرتووە جاران هەمیشە سوپاکان لە دەرەوەی شارەکاندا شەڕیان کردوە لە دەشتدا دوور لە ئاوەدانی و شارەکانیان زۆر جاریش لەناو قەڵاکاندا شەڕیان کردووە و خۆیان لەناو قەڵاکاندا شاردووەتەوە و لە پشت قەلاکانیانە وە شەڕیان لەگەڵ سوپای بەرامبەردا کردووەئەم بابەتە پێویست ناکات زۆر شیکاری بۆ بکەین چونکە دژە ئیسلام نازانێت تاڵانی چییە ؟

وە **پرسیاری بێ وەڵامی خۆمانی لێ دەکەین** و دەڵێین ئادەی یە ك بەڵگەمان بۆ بهێنن سوپای ئیسلام شارێك یان گوندێکی تاڵان کرد بێت ؟ یە ك دانە زیاتر نا.

ئاگاداربە شەڕی ناو قەڵامان بۆ نەهێنن !؟ چونکە لە مێژوودا هەر سوپایەك ترسا بێت وە لەناو قەڵاوە شەڕی کرد بێت . پاش ئەوەی قەڵاکە گیراوە هەر هەموویان بە شەڕکەر حساب کراون . بۆیە دەڵێین سوپای موسوڵمانان هەمیشە دەست کەوتیان هەبووە کاتێك سوپاکە هەڵ هاتووە و ئەوانەی لێیان جێماوە بووە بە ( غنیمة ) یان کاتێك سوپاکە بەزیوە دەستیان بەسەر سوپاکەدا گرتووە و ئەو شتانەی دەستیان کەوتووە بووە بە ( غنیمة ) بۆ سوپای موسوڵمانان

وە تحدای هەموو جیهان دەکەم یە ك بەڵگە بهێنێت پاش شکاندنی سوپای دوژمن . سوپای ئیسلامی چوبێتە ناو شارو گوندەکانی سوپای بەرامبەرەوە و تاڵانیی کرد بێت واتا ( سلب و نهب ) ی کرد بێت . پاش ئەوەی زانیتان ( غنیمة و سلب و نهب ) چییە ؟

فەرموون بچن بۆ کتێبی پیرۆز بگەڕێن بۆ ووشەی ( سلب و نهب ) ١١٧ جار هاتووە لە نوسخە عەرە بییەکەدا . ئەگەر داشکاندنیان بۆ بکەین و بڵێین نیوەی بۆ ئامۆژگارییە دەمێنێتەوە ٥٧ جار واتا ٥٧ جار کتێبی پیرۆز فەرمان دەکات بە تاڵانی و شت بە زۆر سەندن لە خەڵکی و لە گەلان .

لە نوسخە کوردیەکەدا تاڵانی واتا ( نهب ) ١٣٠ جار هاتووە . سلب ( شت بەزۆر سەندن) ٨٦ جار هاتووە بەڵام لە نوسخە کوردیەکەدا چەواشە کارییان کردووە : وە ( سلبیان ) بە دەست کەوت ترجمە کردووە واتا ( غنیمة ) ئەگەر ئەو ٨٦ دەقە بخوێنینەوە لە دەقەکەدا بۆمان دەر دەکەوێت دەست بەسەردا گرتن نیە بەڵکو بەزۆر لێ سەندنە . وە ئەگەر تاڵانی و شت بەزۆر لێ سەندن کۆ بکەینەوە ١٣٠ + ٨٦ = ٢١٦ جار هاتووە داشکاندنیان بۆ بکەین دەکاتە ١٠٨ جار

**کۆتا پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە**: تەنها یە ك جار ناوی ( سلب یان نهب ) مان بۆ بهێنن لە قورئاندا ؟ یان پێمان بڵێن سوپای موسوڵمانان چی شارێك یان چی گوندێکیان تاڵان کردووە ؟ فەرموون ئەمەش کوشتار و تاڵانی لە کتێبی پیرۆزدا بە ژمارەی خۆیان وە پاش ئەوەی تاڵانیان کردوون ژن و منداڵەکانیشیان کوشتون و خەڵکی بێ تاوانیشیان قڕکردووە .

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1443225422./1556297074589147/?type=3&theate

...............................................................

**بابەتی ناو لینك**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| الغنم ٦٧٥,٠٠٠ | للجند ٣٣٧,٥٠٠ | نصيب الله من الجنود | ٦٧٥ |
| | للشعب ٣٣٧,٥٠٠ | نصيب اللاويين من الشعب | ٦٧٥٠ |
| البقر ٧٢,٠٠٠ | للجند ٣٦,٠٠٠ | نصيب الله من الجنود | ٧٢ |
| | للشعب ٣٦,٠٠٠ | نصيب اللاويين من الشعب | ٧٢٠ |
| الحمير ٦١,٠٠٠ | للجند ٣٠,٥٠٠ | نصيب الله من الجنود | ٦١ |
| | للشعب ٣٠,٥٠٠ | نصيب اللاويين من الشعب | ٦١٠ |
| الأشخاص ٣٢,٠٠٠ | للجند ١٦,٠٠٠ | نصيب الله من الجنود | ٣٢ |
| St-Takla.org | للشعب ١٦,٠٠٠ | نصيب اللاويين من الشعب | ٣٢٠ |

دوژمنانی اسلام و گاورەکان ڕەخنە لە اسلام دەگرن و دەڵێن اسلام انفال دەکات وە بە ناوێکی زۆر ناشرین لە قەڵەمی دەدەن . وە کرداری زاڵمێکی وەك صەدام حسێنی گۆڕ بە گۆڕی بەعسی عەلمانی لەسەر اسلام حساب دەکەن . لە کاتێکدا انفال واتا بەش کردنی دەست کەوتی جەنگ ، وە ئەو کارەش لە هەموو سوپا کۆنەکاندا هەبووە وە لە سوپای ئێستا و تازەشدا هەیە . وەك دەبینن استعماری تازە شەڕ دەکات و بەشی خۆی لەو وڵاتە دەبات لە خێر و خێراتی وەك نەوت و ئاڵتون و الماس و یۆرانیۆم و … هتد . بۆچی ئێستا ئەنفال بۆ امریکا و ڕۆژ ئاوا حەلالە و بۆ اسلام حەرامە ؟ بۆچی بۆ موسا حەلاڵە و بۆ محمد حەرامە علیهما السلام ؟ بۆچی بۆ تەورات حەلاڵە و بۆ قورئان حەرامە ؟

لە تەورات دا سفر **العدد** بەشی ٣١ باسی شەڕی نێوان جولەکە بە سەرکردایەتیی موسا (ع) دەکات لەگەڵ میدیانیەکاندا وە بنو اسرائیل (١٢ )هەزار چەکداری نارد و هەموو نێرینەکانیان کوشتووە ، وە شار و سارۆچکەی متدیانیەکانیان سوتاندوە و ژن و منداڵ و هەرچیەکیان هەبووە تاڵانیان کردون و گەڕاونە تەوە بۆ لای موسا (ع) وە موسا لێیان تورە بوە بۆچی ئافرەتەکانتان نە کوشتووە ؟ و لە دەقی ١٧ و ١٨ دا دەڵێت : ئێستاش هەموو منداڵە نێرینەکان بکوژن لەگەڵ هەر ژنێك کەوا لەگەڵ نێر جووت بووە . بەڵام هەموو ئەو کچانەی لەگەڵ پیاو جووت نەبوون بۆ خۆتان بە زیندوویی بیانهێڵنەوە . ئەسیر بە تایبەتی ژن و منداڵ لە هیچ شەرع و حوکمێکدا نا کوژرێت بەڵام کتێبی پیرۆز دەیان کوژێت و بەس کچەکان دەهێڵێتەوە بۆ سەر بازەکان وەك لەم کتێبە بەناو خوداییەدا نوسراوە پاسان لە دەقی ٢٧ و ٢٨ دا نوسراوە : تاڵانەکە لەنێوان ئەوانەی دەستیان بە شەڕ کرد و بۆ جەنگ دەرچون و لەنێوان هەموو کۆمەڵ نیوە بکە بەشی یەزدانیش دەربهێنە لە بەشی ئەوانەی بۆ جەنگ دەرچوون، یەك لە پێنج سەدی خەڵك و گاوگۆتاڵ و گوێدرێژ . وە لێرەدا لە سەدا پێنجیشی بۆ خودا لا دەدەن ئەوەی مایەی پێکەنینە بەشەکەی خودایە . کەس نازانێت ئەو بەشەی خودا چیی لێهات و بۆ کوێ چوو وە خودا ئیشی بە کچ و گوێ درێژ و گاو گۆتاڵ و مەڕ و ماڵات و ئاڵتون چییە ؟

هەر تەورات خۆی هەمان بەش دەقی کۆتایی واتا ٥٤ دەڵێت : جا موسا و ئەلعازاری کاهین زێڕەکەیان لە فەرماندەکانی هەزاران و سەدان وەرگرت و هێنایانە ناو چادری چاوپێکەوتنەوە، وەك یادگاری بۆ نەوەی ئیسرائیل لەبەردەم یەزدان . لەوانەیە لە نوسخە تازەکانی چەند ساڵێکی تردا بڵێن ئەو یادگاریەیان لە تویتر یان فیسبوکدا بڵاو کردەوە دەڵێت کردیان بە یادگاری وێنەیان گرتووە لەگەڵ خودا و دەستکەوتی تاڵانیەکانیاندا . ئەو وێنەیەش کەدا دامانان وە ڕوونی دەکاتەوە تالانیەکان چەند بوون و بەشی سەربازەکان چەند بووە و بەشی لاویەکان واتا نەوەی موسا و هارون چەند بوە و بەشی خوداش چەند بووە

# پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و شەست وهەشت

## ئیسلام ڕێگای داوە بە سوێند خواردن

11. اباح الحنث في القسم (سورة البقرة 225)
12. اباح الشعائر الوثنية في الحج (البقرة 108)
13. اباح الحلف (سورة الفجر 1-5)

ئەم جارەیان وەڵامی 3 پرسیارە بەڵام 11 و 12 هیچ نین

کتێبی پیرۆز » پەیدابوون » بەشی 22

15 فریشتەکەی یەزدان جارێکی دیکە لە ئاسمانەوە ئیبراهیمی بانگکرد و

16 وتی: (یەزدان دەفەرموێت سوێندیێت بە خۆم، لەبەر ئەوەی تۆ ئەمەت کرد و دەستت بە کورە تاقانەکەتەوە نەگرت،

کتێبی پیرۆز » پەیدابوون » بەشی 26

3 بۆ ماوەیەك لەم خاکە بمێنەوە، خۆم لەگەڵت دەبم و بەرەکەتدارت دەکەم. چونکە هەموو ئەم خاکانە دەدەمە خۆت و نەوەکەت، ئەو سوێندەش دەچەسپێنم کەوا بۆ ئیبراهیمی باوکتم خواردووە.

کتێبی پیرۆز » دواوتاری موسا » بەشی 29

12 تا بچنە ناو پەیمانی یەزدانی خوداتان و سوێندەکەی کەوا یەزدانی خوداتان ئەمڕۆ لەگەڵتانی دەبەستێت،

13 هەتا ئەمڕۆ بە گەلی خۆی داتانبنێت، ئەویش ببێتە خوداتان وەك پێی فەرموون و وەك سوێندی بۆ ئیبراهیم و ئیسحاق و یاقوبی باوباپیرانتان خوارد.

14 ئەم پەیمان و سوێندەش تەنها لەگەڵ ئێوەی نابەستم،

15 بەڵکو لەگەڵ ئەوەی کەوا لێرە ئەمڕۆ لەگەڵماندا لەبەردەم یەزدانی خودامان وەستاوە و ئەوەش کەوا ئەمڕۆ لێرە لەگەڵماندا نییە.

کتێبی پیرۆز » ئیشایا » بەشی 62

8 یەزدان بە دەستی ڕاستی خۆی و بە هێزی بازووی سوێندی خوارد: چیتر دانەوێڵەکەت ناکەم بە خۆراك بۆ دوژمنەکانت و شەرابە تازەکەشت کە پێوەی ماندوو بوویت ناموٚکان نایخۆنەوە

کتێبی پیرۆز » کردار » بەشی 2

29 برایان، ڕێگا دراوە بە ئاشکرا پێتان بڵێم کە داودی باوکمان مرد و نێژرا، گۆڕەکەشی تاکو ئەمڕۆ لەلامانە.

30 ئەویش کە پێغەمبەر بوو، دەیزانی خودا بە سوێند سوێندی بۆ خواردووە کە لە بەری پشتی ئەو لەسەر تەختەکەی دادەنیشێت.

کتێبی پیرۆز » عیبرانییەکان » بەشی 4

3 لەبەر ئەوەی ئێمەی باوەڕدار دەچینە ناو حەسانەوەکەی، وەك فەرموویەتی:[بۆیە لە توورەییمدا سوێندم خوارد: نایەنە ناو حەسانەوەی من ]

ڕەخنەی ژمارە ( ١١ ) ی گاورەکان دەربارەی درۆ کردنە لە ئایەتی ٢٥ ی سورەتی **البقرە** بەڵام ئێمە تەرح مان داوەتێ و لە **برسیارە بێ وەڵامەکان** دا لە ژمارە (١٦٠ ) دا وەڵاممان داوەتەوە و ئەم ئایەتەشمان بۆ داناوە کە ئەو ئەقڵی پێ نەشکاوە بۆیە وەڵامی نادەینەوە

..............

ڕەخنەی ژمارە ( ١٢ ) دەڵێت ئیسلام ڕێگای داوە بە ڕێ و ڕەسمی بت پەرستەکان لە کاتی حەجدا و بەڵگە ی ئایەتی ١٠٨ ی **البقرەیە** . ئەم ڕەخنەیەش بەڵگەیە بۆ نە شارەزایی قەشەکانیان کە ئەم ڕەخنانە دەگرن وە بەڵگەیە بۆ شوێن کەوتوانیشیان کە هیچ نازانن و کۆپی و پەیست دەکەن چونکە ئایەتی ١٠٨ ی **البقرە** باسی حەج ناکات بۆیە وەڵامی ئەوەشیان نادەینەوە .

..............

ڕەخنەی ژمارە ( ١٣ ) دەڵێت ئیسلام ڕێگای داوە بە سوێند خواردن بەڵگەیان (٥) ئایەتی سەرەتا ی سورەتی **الفجرە** وە شیعە و سۆفیەکان و بێدینیش لەو خاڵەدا کۆکن لەگەڵ گاورەکاندا و کردویانە بەڵگە بۆ سوێند خواردن بە غەیری خودا . وە دەڵێن مادام

خودا سوێندی بە مخلوقاتەکانی خواردوە کەواتە جایزە مخلوقیش بە غەیری خودا سوێند بخوات . بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەبێت بزانین سوێند خواردن چییە ؟

سوێند خواردن لە ئەدەبیات و شیعری هەموو گەلاندا هەیە . بۆیە کاتێك خوداش سوێند دەخوات شتێکی نامۆ نییە لای خەڵکی وە سوێند خواردن بەو شتە لە قورئاندا مانای ئەوە نییە ئەو شتە پیرۆزە یان مەزنە و دەبێت سوێند ی پێ بخورێت بەڵکو بەڵگەیە بۆ گەورەی مخلوقاتەکانی و نزیکیی لە مرۆڤ و سودەکانی وەك هەنجیر و زەیتون کە دوو میوەی بەسودن بۆ مرۆڤ و هەموو مرۆڤ ناتوانن یە ك دەنك زەیتون یان هەنجیر دروست بکەن لە هیچە وە ئیللا خالقی کەون نە بێت کە الله یەئەمەش نمونەیە بۆ ئەوەی کە خالق لە مخلوق مەزن ترە و ئەوەتا ئەو میوە بچوکە ئێوە سودی لێ دەبینن بەڵام نا توانن یە ك دەنکی لێ دروست بکەن !؟ هەروەها سوێند خواردن هەیە بۆ بەڵگە و نموونە و ڕێنمای و بیر کردنەوە بۆ نموونە

(**و الشمس و ضحاها و القمر اذا تلاها** ... هەتا کۆتایی ئایەتەکان . خەڵکی هەمیشە ئاسمان و خلقی خۆیان لا گرنگە و مەزنە بۆیە خودا سوێندیان پێ دەخوات بۆ ئەوەی خەڵکی لە ڕێگەی بیرکردنەوە لە ڕودانی شەو ڕۆژ و تاریکی و ڕوناکی و خۆر بیر لەو شتانە مەزن تر بکەنەوە کە خالقەکەیانە . یان ( و الفجر و ليال عشر و ... هەتا کۆتایی ئایەتەکانبە هەر حاڵ سوێند خواردن بەو شتانە مانای ئەوە نییە ئەو شتانە مەزن ترن و گەورەترن لە خودا بەڵکو بۆ استدلال و بیر کردنەوەیە لەو شتانە و پاشان خودای تعالى (**لا يسال عما يفعل و هم يسالون**) خوا سوێند دەخوات بە مخلوقاتی وە خلقی خۆیەتی فەرموو جەنابیشت شتێکمان لە هیچ بۆ خلق بکە و سوێندی پێ بخۆ ؟ پاشان کاکی گاور بێ ئاگایە خودا لە کتێبی پیرۆزدا سوێندی خواردووە بە شانازیی یعقوبەوە (ع) وەك لەم دەقەدا هاتووە ).

لە سفری **عاموس** ٨-٧ دا خودا سوێند بە فەخر و شانازیی یعقوب دەخوات و دەڵێت : یەزدان سوێندی بە شانازی یاقوب خوارد: (هەتاهەتایە کردەوەکانیان لەیاد ناکەم.)

لە سفری **پەیدابون** ٢٢ دەق ١٥ و ١٦ دا خودا سوێندی بە خۆی خواردووە . هەر لە هەمان سفردا ٢٦-٣ دا خودا سوێندی بۆ ابراهیم خواردووە .

لە سفری **التثنية** دوا وتاری موسا بەشی ٢٩ دەق ١٢ بۆ ١٥ دا خودا سوێندی بۆ ابراهیم و اسحاق و یعقوب خواردووە

لە سفری **اشعياء** ٦٢ – ٨ دا خودا سوێندی خواردووە بە دەستی ڕاست و هێز و بازوی خۆی .

لە سفر **اعمال الرسل** ( کردار ) ٢ دەق ٢٩ و ٣٠ دا خودا سوێندی بۆ داود (ع) خواردوە . لە عیبرانیەکان ٤ – ٣ دا خودا لە تورەیدا سوێندی خواردووە

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : کاکی گاور کتێبەکەی خۆشت باسی سوێندی خودا دەکات . ئایا خودا سوێند دەخوات بەم شتانەی لە کتێبەکەتاندا باس کراوە ؟ ئایا دەکرێت ئێمەش ڕەخنە بگەین و بڵێێن خودا سوێندی خواردووە بە شانازیی یعقوب لە

کاتێکدا یقوب لە کتێبی پیرۆزدا دزە و پێغەمبەرایەتیی لە عیسۆی برای دزیوە زینای کردووە لەگەڵ کەنیزەکانی ژنەکەیدا نوستووە . ساختە چی بووە لە مەڕەکاندا فێڵی لە لابانی خاڵی کردووە . حاشا لله سیدنا یعقوب ئەو شتانە ناکات وە ئێمە وا ناڵێین ئەوە ئێوەن وا دەڵێن . ئایا دەکرێت بڵێین خودا چۆن سوێن بۆ داود (ع) دەخوات لە کاتێکدا هەر خۆتان دەڵێن داود (ع) زینای کردوە لەگەڵ بثشبعدا و سلیمانی کوڕی لەو زینایە بووە پاشان مێردی بثشبعی کوشتووە ئایا خودا سوێند دەخوات بۆ کەسێکی زیناکار و قاتل ؟ حاشا لله ئەوە ئێوەن وا دەڵێن . وە سوێند خواردنی خودا بۆ ئەوە نییە کە ئەو شتە مەزنە و دەبێت بپەرسترێت !؟ بەڵکو هەر سوێند خواردنێك یان بۆ عیبرەتە یان بۆ بیر کردنەوەیە یان بۆ بەڵگە و شایەتییە کە ئەو شتانە هی خالقە و بیر لەوە بکەینەوە ئەو شتە بچوکانە هێندە بچوکن و هێندە بە سودن وەك زەیتون . بۆیە دەبێت خالقی ئەو شتانە چەند مەزن بێت و چەند بە سود بێت بۆمان وە بیر بکەینەوە لە گەورەی و مەزنی خالقی ئەو شتانە هەر وەك لە سەرەوە باسمان کردن سوێند خواردن لە ئەدەبیاتی هەموو گەلێکدا هەیە بۆیە دەبینین لە کتێبە ئاسمانیەکانیشدا هەر هەیە . و کتێبی ئاسمانیش بۆ خەڵك دابەزیوە و ئەو سوێندانەشیان ئاسای وەر گرتووە نەك بەوەی کە خودا سوێند بەو شتە دەخوات لە خودا مەزن تر بێت

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و شەست ونۆ

## چوار گومانی کۆپی و پەیست

**پرسیاری بێ وەڵامی ئەم جارەمان بۆ تۆی موسوڵمانە و چۆن مامەڵە لەگەڵ گومانداا بکەیت**

**1**

14. اباح مصادقة شياطين الجن ( الاحقاف 29-31)

وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا ۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّـهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾

**2**

15. اباح الثأر (النحل 126)

وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ ﴿١٢٦﴾

**3**

16. اباح انكار الله (سورة النحل 106)

مَن كَفَرَ بِاللَّـهِ مِن بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَـٰكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّـهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾

**4**

17. اباح الانتقام (سورة البقرة 194)

الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَاتَّقُوا اللَّـهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّـهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾



پرسیارە بێ وەڵامەکان
بۆ هەموو دژە
ئیسلامەکان

گومانی ژماره ١٤ ی گاورەكان دەڵێن ئیسلام ڕێگای داوه مرۆڤ هاوڕێیەتی لەگەڵ شەیتان وه جنۆكەكا ندا بكات وه بەڵگەشیان ئایەتی ٢٩ هەتا ٣١ ی سورەتی **الاحقافه** . به ڕاستی ئەمه لوتكەی نەزانی و جهالەته و دیاره ئەو برادەرانه لەو دەڤەره ئەو ئایەتانەیان هەر نه خوێندوەتەوه و ناش زانن باسی چی دەكات ؟ چونكه ئەو ئایەتانه باسی بانگەشەی جن دەكات بۆ ئیسلام و هیچ پەیوەندیی به هاوڕێیەتیی نێوانیانەوه نیه . بۆیه ئێمەش هیچ نا ڵێین !؟ چونكه ئەو ڕەخنەیه ئاستی نه خوێندەواریی بەرامبەر دەر دەخات.

.................

گومانی ژماره (١٥ ) دەڵێت ئیسلام ڕێگای داوه به تۆڵه كردنەوه بەڵگەشیان ئایەتی ١٢٦ ی سورەتی **النحله** ئەم پرسیارەش شایانی وەڵام دانەوه نییه . چونكه ئایەتەكه دەفەرموێت ئەگەر سزای كەسێكتان دا وەك خۆی سزای بدەنەوه ،واتا كابرا چیی كرد بوو هەمان شتی لەگەڵدا بكەنەوه . هەمووشمان دەزانین سزا دان له دنیادا له كۆن و نوێدا بۆ خەڵكی سەر پێچی كاره و هەر كەس سەرپێچی نەكات هیچ تاكێك و هیچ دەسەڵاتێكیش له جیهاندا سزای نادات بۆیه ئەو ڕەخنەیەش هەر بەڵگەیه بۆ نه شارەزای و نه خوێندەواریی بەرامبەر چونكه هەموو سزایەك بۆ خەڵكی تاوان باره و بۆ كەسێك نییه تاوانی نه كرد بێت وه له تەوراتیشدا هەمان یاسا هەیه بۆ تاوان باران به گوێرەی تاوانەكەی سزا بدرێتەوه پاشان له كۆتایی ئایەتی ١٢٦ ی **النحلدا** دەفەرموێت ئەگەر سەبریشتان هەبێت له سزاداندا خێری زیاتره.

.................

با ئێستا بچین بۆ لای ڕەخنەی ژماره( ١٦ ) له هەمویان هەزەلی تره و دەڵێن : ئیسلام ڕێگای داوه ئینكاری له بوونی خودا بكەیت به گوێرەی ئایەتی ١٠٦ ی سورەتی **النحل** ئەم ڕەخنەیەش مایەی پێكەنین و گاڵته جاڕییه . چونكه ئایەتەكه باسی ئەو كەسانه دەكات ئیمان دارن و لای دوژمن گیراون و دەست بەسەرن یان ئەسیرن . ئەشكەنجەیان دەدرێت و پێیان دەڵێن كفر بكەن وه كابرا له تاو ئازاری گیانی و بۆ ئەوەی نەمرێت لەژێر ئەشكەنجەدا مەجبوره كفر بكات وه كابرا ئەو كفره بەس بۆ ئەوه دەكات ڕزگاری بێت نەك بۆ ئەوه بێت ڕقی له ئاینی ئیسلام بێت . وه هەر ئایەتەكه خۆی دەفەرموێت بەڵام ئەگەر كەسێك به دڵ و به قەناعەت كفر بكات ئەوه غەزەبی خودای له سەره.

...........

ڕەخنەی ژماره( ١٧ ) دەڵێن ئاینی ئیسلام ڕێگای داوه به تۆڵه كردنەوه بەڵگەشیان ئایەتی ١٩٤ ی سورەتی **البقرەیه** . بەڕێزان ئەم ئایەته باسی اشهر الحرم دەكات واتا ئەو مانگانەی نا بێت شەڕی تێدا بكرێت كه بریتییه لەم چوار مانگه ذو **القعدة**، ذو **الحجة**، **محرم**، **رجب** . وه ئایەتەكه دەفەرموێت ئەگەر لەم مانگانەدا كه شەڕی تێدا ڕا گیراوه لایەنی بەرامبەر هاتنه سەرتان و شەڕیان لەگەڵدا كردن . ئێوەش بۆ خۆتان دا بنیشن و گوڵیان بۆ بەرن چونكه دەیانەوێت بتان كوژن ئەگەر شەڕ ڕا گیرا بێت و لایەنی بەرامبەر بێته سەرت و بیەوێت بت كوژێت شتێكی ئاساییه تۆش دەبێت بەرگری له خۆت بكەیت و ڕوو به ڕویان ببیتەوه . ئەو

ئایەتەش هەر وا دەڵێت وە لۆژیك و منطقیش هەر هەمان شت دەڵێن ئادەی کاکی گاور پێم بڵێ لە کوێدا باسی تۆڵە وەر گرتنەوە دەکات ؟ ئەو ئایەتە باسی بەرگری کردن دەکات نەك تۆڵە سەندنەوە .

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەم جارە** : بۆ موسوڵمانە بەڕێزەکانە نەك بۆ دژە ئیسلامەکان !؟

خوشك و برایانی بەڕێزم کاتێك ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگرن ، تۆ یەکسەر هەڵ مەچۆ و هێرش بکەیتە سەر بەرامبەر. بەڵکو لە پێشدا سەیر بکە بزانە ڕەخنەکە دەڵێت چی ؟ وە باسی چی ئایەتێك یان چی حەدیسێك دەکات ؟پاشان بگەڕێ بە دوای سەرچاوەی ئەو ئایەتە یان ئەو حەدیسەدا وە بزانە ڕەخنەی بەرامبەر چییە و خاڵی هاوبەشی نێوان ڕەخنەکە و ئایەتەکە یان حەدیسەکە چییە ؟ ئەو کات دەتوانیت بە گوێرەی پێویست وەلام بدەیتەوە چونکە لە ڕەخنەکەش و لە دەقی ئایەتەکە یان حەدیسەکەش تێ گەیشتوویت . وە ئەگەر هیچ نازانیت تکایە وەڵام مەدەرەوە چونکە دەبیت بە بار گرانی بۆ خۆت و بۆ ئاینی ئیسلامیش وە دەبیت بە گاڵتە جاڕی بەرامبەرت وە دەڵێن ئەوە موسوڵمانە هیچ نازانن و بە نەزانی شوێن ئاینی ئیسلام کەوتوون . وە لەو حاڵەدا تۆی نە شارەزا دەبیت بە بار گرانی بۆ ئاینی ئیسلام و نمونەیەکی خراپ بۆ موسوڵمانان. چونکە زۆربەی ڕەخنەکانی بەرامبەر هیچ نییە : وەك ئەو( ٤) ڕەخنەیەی لە سەرەوە باسمان کرد هیچیان پەیوەندییان بە ئایەتەکانەوە نە بوو !؟ کابرای بەرامبەر نە شارەزایە و تۆش بە نە شارەزایی بەرگری دەکەیت گفت و گۆکەتان وەك ئەوە وایە کوێرێك و کەڕ و لاڵێك مناقشە بکات کوێرەکە ئیشارەتەکانی کەڕ و لاڵە کە نا بینێت و بەرامبەریش گوێی لە کوێرەکە نییە چی دەڵێت ؟ وە نا گەنە هیچ ئەنجامێك . بۆیە داواکارم خەڵکی شارەزاش بە بێ لێ کۆڵینەوە و بە دوادا چوون وەڵامی هیچ گومانێك و هیچ ڕەخنەیەك نەداتەوە چونکە کۆپی و پەیستی بابەتەکان زۆرن و بەرامبەر بە نە شارەزایی بڵاویان دەکاتەوە . ئەگەر تۆ شارەزا بیت و لێکۆڵینەوە بکەیت دڵنیا بە هەمیشە تای تەرازوی تۆی موسوڵمان قورس ترە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و حەفتا

## چوار ژن هێنان لە ئیسلامدا

18. اباح الشهوات بتعدد الزوجات والطلاق (سورة النساء 3)

وَآتُوا الْيَتَامَىٰ أَمْوَالَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَهُمْ إِلَىٰ أَمْوَالِكُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾

پرسیارە بێ وەڵامەکان
بۆ هەموو دژە
ئیسلامەکان



ڕەخنەی ١٨ ی کڵێسا دەڵێت ئیسلام ڕێگای داوە بە خۆشی و شهوات لە ڕێگای فرە ژنی و تەڵاق دانەوە بەڵگەشیان ئایەتی ٣ ی سورەتی **النسائه** . ئەوەی مایەی پێکەنینە ئەم نەزانانە ڕەخنەی ژمارە دویان هەرهەمان ئایەتی ٣ ی سورەتی **النسائه** وە لە ڕەخنەی ژمارە دوو دا نوسیویانە ئیسلام ڕێگای داوە بە زینا کردن لە ڕێگای ملك الیمینەوە واتا لە ڕێگای کەنیزەوە . وە لە ڕەخنەی ژمارە دوودا وەڵاممان نەداوەتەوە چونکە ئایەتەکە پەیوەندی بە کەنیزە وە نییە ئەمەش مانای ئەوەیە ئەم دژە ئیسلامانە چەند نەزانن وە هیچ نا خوێننەوە بەڵکو کۆپی و پەیست دەکەن .


2. اباح الزنى بملكات اليمين (سورة النساء 3)

وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾

ئەگینا معقول نییە ئایەتی ٣ ی سورەتی **النساء** بۆ دوو گومان بەکار بهێنن !؟ بۆیە ئێمەش زۆر بە کورتی و بەقەدەر ئەقڵی بەرامبەر وەڵامیان دەدەینەوە هەروەها کاتی خۆمانیان پێوە نا کوژین . چونکە ئەم ئایەتە زۆر قسەی لەسەر کراوە و خەڵکیش بە هەڵە شیکاریی بۆ دەکەن وە لە ئایەتی ٢ دا دەفەرموێت پارەی هەتیوو مەخۆن و پارەکانی خۆتان لەگەڵ منداڵان ی هەتیودا تێکەڵ مەکەن پاشان دێتە سەر ئایەتی ٣ و دەفەرموێت ئەگەر ترسان داد پەروەر نەبن لەگەڵ منداڵی هەتیوودا ( **فانکحوا ما طاب لکم من النساء مثنی و ثلاث و رباع** ) واتا هەتا ٤ ژن بهێنن کە خاوەن هەتیوو بن وە شەرتی (٤) ژنەکەی بەستوتەوە بە خاوەن هەتیووەوە وە هەر پاش ئەوە دەفەرموێت ( **فان خفتم الا تعدلوا فواحدة او ما ملکت ایمانکم ذلك ادنی الا تعولوا** ) واتا ئەگەر زانیتان یان ترسان لەوەی نە توانن داد پەروەر بن لە نێوان ئەو (٤ ) ژنەدا (١) ژن بەسە یان ئەو کەنیزانەی هەتانە کەواتا خودای تعالی دەزانێت پیاو نا توانێت داد پەروەر بێت لەگەڵ( ٤ ) ئافرەتدا و بە ( ١) چاو بە (١) حساب لەگەڵ هەر چواریاندا هەڵس و کەوت بکات لێرەدا سنورداری کردووە کە (١) ژن بەسە و خودا خۆی لە ئێمە زانا ترە کە پیاو ناتوانێت داد پەروەر بێت بەڵگەشمان بۆ ئەم قسەیەمان ئایەتی ١٢٩ ی سورەتی **النسائه** دەفەرموێت **( و لن تستطیعوا ان تعدلوا بین النساء و لو حرصتم** ) واتا ناتوانن دادپەروەر بن لەگەڵ ژنەکانتاندا هەرچەند تێ بکۆش و بتانەوێت داد پەروەر بن ئەو کارەتان پێ ناکرێت کەواتا ئەوەی تێی گەیشتوین( ٤ ) ژن هێنان بۆ کاتێکی تایبەتە و بۆ پاراستنی هەقی هەتیووە . هەروەها قورئان تاکە کتێبە کە ڕێژەی ژن هێنانی سنوردار کردووە. چونکە هیچ کتێبێکی ئاسمانی یان هیچ یاسا یەکی مرۆی پێش ئیسلام یاسای ژن هێنانی دیاری نە کردووە و پیاو بۆی هەبووە بێ سنور ژنی هەبێت . بەڵام ئیسلام هات و تاکە یاسا بوو کە ژن هێنانی سنوردار کرد بە( ٤) دانە و بۆ چوار دانەکەش دەڵێت ناتوانن داد پەروەر بن بۆیە (١) ژن بەسە لەگەڵ کەنیزەکانتاندا وە خۆشتان دەزانن ئێستا کەنیزە نەماوە کەواتا (١) ژن بەسە بۆ پیاوێك

وە پاش ئەوەی کە دیاریی کردوە (١) ژن بەسە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێت ( **ذلك ادنى الا تعولوا** ) وە هەر هەموو موفەسیرەکان کۆکن لەسەر ئەوەی ذلك ادنى الا تعولوا واتا بۆ ئەوەی زوڵمیان لێ نەکەن وە زۆر حەدیسیشمان هەیە

**غیلان بن سلمة الثقفي** کاتێك بووە بە موسوڵمان (١٠) ژنی هەبووە پێغەمبەر (ﷺ) پێی گوتووە چواریان هەڵ بژێرە و شەشیان تەڵاق بدە . هەروەها عمیرة الأسدي( ٨) ژنی هەبووە کاتێك بوە بە موسوڵمان هەمان شت پێغەمبەر (ﷺ) پێی گوتووە چواریان هەڵ بژێرە.

کەواتا لە کاتی خۆیدا (٤ ) ژن هێنان بووە بە یاسایەکی مەزن بۆ بەرز ڕاگرتنی مافی ئافرەت و بۆ ئەوەی کابرا بە ئارەزوی خۆی ژن نەهێنێت . وە خودای زانا لە ڕێگای قورئانەوە فرە ژنیی سنوردار کردووە بۆ ئەوەی زوڵمیان لێ نەکرێت ( **ذلك ادنى الا تعولوا** ) بەڵام لە بەرامبەردا لە کتێبی پیرۆزدا هیچ یاسایەك نیە بۆ فرە ژنی وە سنوردار کردنی ڕێژەی ژن هێنان ئایا چوارە دەیە هەزارە یان یە ك دانەیە . وە تحدای کتێبی پیرۆز و کڵێساش دەکەین یە ك دەقمان لە کتێبەکەیان بۆ بهێنن تێیدا ژن هێنانی تێدا سنوردار کرا بێت ؟ فەرموو کاکی گاور پێش ئەوەی ڕەخنە لە ئیسلامی مەزن بگریت سەیری کتێبەکەی خۆتان بکەن بزانن چۆن باسی فرە ژنی کراوە !؟

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1443829399./1675620735990113/?type=3&theater

....................

**بابەتی ناو لینك**

**دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ لاپەرە (٣٥٦)**

.................................................

**پرسیاری بێ وەڵامیشـمان**: بۆ ئەوانەی ڕەخنە لەم حوکمەی ئیسلام دەگرن و بۆ ئەو موسوڵمانانەش کە وەڵامیان دەدەنەوە ئەم پرسیار لە خۆیان بکەن وە یان موسوڵمانەکان ئەم پرسیارانەیان لێ بکەن : ئایا( ٤) ژن هێنان فەرزە یان سونەتە یان ڕوخسەتە ؟ئایا دەبێت هەموو پیاوێك ( ٤ ) ژن بهێنێت ؟ کەی و چۆن و بۆچی دەبێت بیان هێنێت ؟ ئەگەر پیاوێك (٤ ) ژنی هێنا و نەی توانی دادپەروەر بێت لە نێوانیاندا ! ئایا سەرپێچیی خودای نە کردوە ؟ لە مێژوی ئیسلامدا بە درێژایی ١٤٠٠ ساڵ ڕێژەی فرە ژنی چەند بووە ؟ ئایا هیچ زۆرینەی پیاوان لە جیهاندا دەتوانن ئیدارە ی (٤) ماڵ بدەن ؟ ئایا ڕێژەی فرە ژنی لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا ئێستا چەندە ؟ وە بۆچی لە ملیۆنێکدا یەکە ؟ هەمومان ژنمان هەیە و گەر ژنمان نە هێنا بێت دایك و باوکمان هەبووە و مامەڵەی نێوان ژن و پیاومان بینیوە . ئایا هەموو پیاوێك زەلیل نە بووە بە دەست یە ك ژنە و یە ك ماڵەوە ؟ ئایا دەتوانێت زۆر بە باشی ئیدارە ی یە ك ژن و یە ك ماڵ بدات وەك پێویست ؟طبعا دەڵێن نەخێر ( ئاگادار بن باسی نیسبەتی عام دەکەین نەك تاك و تەرا ) ئەی ئەگەر پیاو نەتوانێت ئیدارەی (١)ژن بدات چۆن دەتوانێت بیکات بە ٢ و بە ٣ و بە ٤ !؟ کەواتا وەڵامی دژە ئیسلامەکان بۆ( ٤ ) ژنی لە ئایەتی ١٢٩ ی **النسـائدایە** دەفەرموێت : ( **و لـن تسـتطیعوا ان تعدلوا بین النسـاء و لـو حرصـتم** ) کەواتا مادام ناتوانین ئەو کارە بکەین

دەبێت لەوەش تێ بگەین حوكمی( ٤) ژن هێنان عام نیه و بۆ هەموو كەس نییه و بۆ كاتی دیاری كراوه كه شەڕهەبێت وه بێوەژن زۆر بێت و هەتیوو زۆر بێت.

.......................................................................

**بۆسوود وەرگرتن و زیاتر روونكردنەوە ئەم كۆمێنتە بخوێنەوە**

:(**فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ**) النساء:٣.واته: ژن ماره ببرن لەوانەی كه بۆتان حەڵاڵه دوان یان سیان یان چواریش بن هەروایه. ئەگەر ترسان نەتوانن ژنەكانتان وەكو یەك تەماشا بكەن، ئەوا دەبێ یەك ژن بهێنن.... كەوایه مەرجی فرەژنی چی یه ؟؟ تَعْدِلُواْ واته دادپەروەربن لەهەموو روویەكەوە .. گەر نەیان توانی دادپەروەربن تەنها یەك ژن بەسه !! كەوایه یەك ژن واجبه پیاو بیهینی هەر لەهەمان سورەتی **النساء** ئایەتی ١٢٩ (**وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ [النساء:١٢٩]**).ئەستەمه بتوانن دادپەروەری بكەن .. سەیربكه لەئایەتی( ٣ ) پیت ئەلیت گەر ترسان دادپەروەری بكەن تەنها یەك بەسه لەئایەتی ١٢٩ پیت ئەلیت ئەستەمه بتوانن دادپەروەری بكەن كەوایه هانی پیاو ئەیات تەنها یەك ژن بهینن گەر زیاد لەژنیكیشیان هینا مەرجی دادپەروەری بۆ داناوه نەك ئەوەی تۆ باسی ئەكەیت كه ژنیك بهینێ ژنەكەی تری فەرامۆش بكات پیغەمبەری خوا ئەفەرمویت گەر پیاویك دوو خیزانی هەبوو دادپەروەر نەبوو لەنیوانیان لەرۆژی قیامەت لاسەنگ ئەبیت .. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: ((**المقسطون يوم القيامة على منابر من نور على يمين الرحمن (وكلتا يديه يمين) الذين يعدلون في حكمهم وأهليهم وماولوا**)). رواه مسلم و غيره.

واته: دادگەران له ڕۆژی قیامەتدا لەسەر چەند چرایەكن له لای دەستەڕاستی خوا (هەردو دەستی خوا ڕاستەیە) جا ئەو كەسانە ئەوانەن كه له فەرمانڕەوایی و خێزانیان و ئەوەی دەكەوێتە بەر دەستیان دادگەری دەكەن.بابزانین ئەم ئایەتەی باسی فرەژنی ئەكات مانای وایه ئیسلام فرەژنی داهیناوه یان فرەژنی سنوردارکردووه .. هاوەلیك ئەگەریتەوه غیلان (١٠) ژنی هەبوو هات موسلمان بوو پیغەمبەری خوا پێ فەرموو تەنها (٤) دانه بهیلەوه ئەمەش بەلگه هەر له تەفسیری إبن كثير لەم ئایەتەی باسی فرەژنی ئەكات باسی كردووه قال الإمام أحمد : حدثنا إسماعيل ومحمد بن جعفر قالا حدثنا معمر ، عن الزهري . قال ابن جعفر في حديثه : أنبأنا ابن شهاب ، عن سالم ، عن أبيه : أن غيلان بن سلمة الثقفي أسلم وتحته عشرة نسوة ، فقال له النبي صلى الله عليه وسلم : اختر منهن أربعا ... كەوایه ئیسلام هات بۆ ئەوەی ئەو فرەژنی یەسنوردار بكات پیاو هەبووه ئەوەنه ژنی هەبووه هیچ مافیكی نەیاوەته ئافرەتەكانی بەلام ئیسلام هات دیاری كرد پاشان داوای دادپەروەری لێ كرد ئەگینا تەنها یەك ژن بەسه !!

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و حەفتاویەك

### بعثت بالسیف وە جعل رزقي تحت ظل رمحي

بعثت بالسيف وە جعل رزقي تحت ظل رمحي

بُعِثْتُ بين يدي الساعةِ بالسّيفِ ، حتى يَعبُدَ اللهُ تعالى وحده لا شريكَ له ، و جَعِلَ رِزْقِي تحت ظِلِّ رُمْحِي ، وجُعِلَ الذُّلُّ و الصَّغارُ على من خالفَ أمري ، و من تَشَبَّه بقومٍ فهو منهم

الراوي : عبدالله بن عمر | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الجامع ▬ الصفحة أو الرقم: 2831 | خلاصة حكم المحدث : صحيح



دەقی حەدیسەکە



ڕەخنەی گاوری کورد بە ناوی بیدینەوە وەك خۆی دامان ناوە

بعثت بالسيف بين يدي الساعة حتى يعبد اللّه وحده لا شريك له صحيح البخاري ٢٧٥٧
بە شمشێر بۆتان هاتوم کۆتایی و مردنتان بە دەست منە ، تا ئەوکاتەی اللە ی تاك و تەنیا ئەپەرستن

وجعل رزقي تحت ظل رمحي صحيح البخاري ٢٧٥٧
ڕزقم لە ژێر سێبەری ڕمەکەمدایە (شمشێر یاخود ڕم)

کتێبی پیرۆز » لۆقا » بەشی 8

1 دوای ئەمە بە هەموو شار و گوندێکدا دەگەڕا، وتار و موژدەی[a] پاشایەتی خودای دەدا، دوازدەکەشی لەگەڵبوو.

2 چەند ئافرەتێکیش کە لە ڕۆحیپیس و نەخۆشییان چاکبوونەوە: مریەم کە بە مەجدەلی ناودەبرا و حەوت ڕۆحیپیسی لێ دەرچووبوو،

3 یۆوەنای ژنی خوزای بریکاری هیرۆدس و سوزانە و زۆری دیکەش، بەماڵی خۆیان یارمەتییان دەدان



مسیح (ع) وە 12 قوتابیەکەی بەپارەی ژنان ژیاون کڵێسای کورد زمان پارەکەی کردوە بە ماڵ !؟

انجيل المسيح حسب البشير لوقا اصحاح 8

1 وعلى اثر ذلك كان يسير في مدينة وقرية يكرز ويبشر بملكوت الله ومعه الاثنا عشر. 2 وبعض النساء كن قد شفين من ارواح شريرة و امراض: مريم التي تدعى المجدلية التي خرج منها سبعة شياطين 3 ويونا امراة خوزي وكيل هيرودس وسوسنة واخر كثيرات كن يخدمنه من اموالهن

بەڕێزان وەك دەزانن ئاینی ئیسلام ئاینی عیبادەت و دەوڵەتە نەك ئاینی گۆشەگیری لە سوچێکدا و خۆمان خەریك بکەین بە نوێژ و تسبیحاتەوە و لایەنەکانی تری ژیان فەرامۆش بکەین وە دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامی بوونی نەبێت پێغەمبەریش (ﷺ) هەردووك لایەنەکەی فێرکردوین عیابادات و بەڕێوەبردنی دەوڵەتیش . ئەم حەدیسەی دژە ئیسلامەکان ڕەخنەی لێ دەگرن باسی لایەنی سیاسی دەکات بۆ دامەزراندن و بەڕێوە بردنی دەوڵەت و خیلافەتی ئیسلامی و دەفەرموێت ( **بعثت بين يدي الساعة بالسيف ، حتى يعبد الله وحده لا شريك له**) . سەیری وێنەکە بکەن کابرای قەشەی کوردی کۆپی و پەیست نوسیوێتی ( **بعثت بالسيف بين يدي الساعة** ) و ڕاڤەی کردووە نوسیوێتی بە شمشێر بۆتان هاتووم کۆتایی مردنتان بە دەست منە هەرکەس بە حاڵ عەرەبی بزانێت دەزانێت قەشە درۆی کردووە و ئەو نوسینە عەرەبییە نە دەڵێت بە شمشێر بۆتان هاتوم وە نە دەڵێت مردنتان بە دەست منە و ئەسڵەن باسی ئەوە ناکات کەسێك بە شمشێرەوە بێت بۆ خەڵکی و بەو شمشێرە بیان کوژێت !؟ وە حەدیسەکە دەفەرموێت لە ئاخر زەماندا نێرراوم بە شمشێر . بۆ ئەوەی بە تەنها خودا بپەرسترێت بە بێ شەریك . کەواتا هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئاخر زەماندا بۆ ئەوەیە خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای خودا و ئاینی خودا

نەك بۆ ئەوەبێت مردنیان بە دەست ئەو بێت یان بیان کوژێت یان بۆ پارە و تاڵانی بێت . ئەو شمشێرە دەوری چییە ؟ شمشێر واتا دەسەڵات واتا چەك بە زمانی ئێستای ئێمە . وە هەر دەوڵەتێکیش لە کۆن و نوێدا شمشێری نەبووبێت هەمیشە تێ هەڵ دراو بووە ئیسلامی مەزنیش شمشێری بەکار نەهێناوە بۆ بڵاو کردنەوەی لا اله الا الله !؟ بەڵگەشمان سوویا ئیسلامە کانە لە مێژودا بە درێژایی ١٤٠٠ ساڵ چونەتە هەر وڵاتێك داوای ( ٣ ) شتیان لە بەرامبەر کردوە

**یەکەم** : داوایان لێ کردون بڵێن لا اله الا الله دەق حەدیسەکەش دەڵێت ( حتى يعبد الله وحده ) ئەگەر بەرامبەر بیگوتایە لا اله الا الله شمشێر و دەسەڵات دەوری نە دەما .

وە **دووەمیان** : ئەگەر نەیان گوتایە لا اله الا الله !؟ دەبوایە جزیەیان بدایا لەو کاتەشدا شمشێر هەر دەوری نە بوو.

ئەگەر بەو دوو مەرجە ڕازی نەبونایە ئەوکات دەوری شمشێر و دەسەڵات دەهاتە پێشەوە . لەوانەیە کەسێکمان لێ پەیدا ببێت بڵێت ئەگەر شەڕ نەبوایە ئەو خەڵکە نە دەبون بە موسوڵمان و لەترسی شمشێر و بە زەبری شمشێر بوون بە موسوڵمان وەڵامی ئەم پرسیارەش زۆر ئاسانە و بە بەڵگەوە دەڵێین فتوحاتی ئیسلام لەگەڵ تەنها دوو کەسدا بووە نەك لەگەڵ گەلانی ئەو سەردەمەدا . تکایە ئەو کەسەی ڕەخنە دەگرێت و ئەو موسوڵمانەش کە دەیەوێت شارەزا بێت لە وەڵام دانەوەی بڵاو بونەوەی ئیسلامی مەزن بە شمشێر با کلیکی ئەم لینکە بکات .

https://www.facebook.com/1553401181577496/photos/pb.1553401181577496.-2207520000.1444007121./1598015533782727/?type=3&theater

......................

**بابەتی ناو لینك**

**سەیری پرسیاری بێ وەڵامی ١٠٤ بکەن لا پەرە (٢٣١)**

...............................

بەشی دووەمی حەدیسەکە هفەرموێت ( **و جعل رزقي تحت ظل رمحي** ) قەشەی کورد لە پۆستەکەیدا تا ئێرەی نوسیووە و تەواوی نەکردووە !؟ واتا ڕسقم لەژێر سێبەری ڕمەکەم دایە . لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە : بۆچی نەی فەرمووە ڕسقم لەژێر سێبەری شمشێرەکەمدایە ؟ خۆ ئێمە لە بەشی یەکەمی ئەم حەدیسەدا گوتمان شمشێر واتا هێز و دەسەڵات دەبوایە ڕسقی موسوڵمان لەژێر سایەی شمشێرەکەدا بوایە نەك ڕمەکە !؟ ئەمەش مانای ئەوەیە هێزەکە کە شمشێرە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامیە وە ڕزگار کردنی خەڵك لە پەرستنی مرۆڤ و دەسەڵاتی مرۆڤ بۆ دەسەڵاتی خودا کاتێکیش دەسەڵات و دەوڵەت دامەزرا . حاکم و خەلیفەی موسوڵمان دەوڵەت دەبات بەڕێوە و هەموو ڕسق و داهاتی ئەو وڵاتە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی دەبێت وە ئەوەش یاسایەکی جیهانیە لە کۆن و نوێدا دەسەڵات داری ئەو وڵاتە دەبێتە خاوەنی ڕسقی ئەو وڵاتە . بۆیە باسی سێبەری ڕمیش کراوە . چونکە لە شەڕە کۆنەکاندا ئاڵای ئەو دەوڵەتە کراوە بە سەری ڕمەکانەوە لە کاتی شەڕدا لە هەموو شەڕێکدا ئەو ئاڵایەی ڕمەکەی پێوەیە کەوت

بێت ئەو سوپایە خۆیان ڕایان کردوە و بەزیون لە زەمانی ئێستای خۆشماندا هەر وڵاتێك بڕوخێت ئاڵاکەی دا دەگیرێت. وە حوکمی هەر وڵاتێکیش لە جیهانی کۆن و نوێدا بە گوێرەی سێبەری ئاڵاکەی بووە .

تەنانەت دەوڵەتەکانیش لە کۆن و نوێدا فەخریان کردووە بە سێبەری ئاڵاکانیانەوە و دەڵێن ئێمە لەژێر سێبەری فلان ئاڵادا دەژیین . یان دەڵێن سێبەری ئالای فلان وڵات زۆر گەرە یان درێژ یان فراوانە بە گوێرەی ئەو ڕووبەرەی کە ئاڵاکەی حوکم دەکات لە زەمانی کۆندا ئاڵا دەکرا بە ڕمەوە بەلام ئێستا ئاڵا دەکرێت بە عمودەوە . وە کۆتایی ئەو حەدیسە کە قەشەی کورد بڕیویەتی بە تەواوی هەموو گومانەکان لا دەبات وە دەفەرموێت ( **و جعل الذل و الصغار على من خالف امري . و من تشبه بقوم فهو منهم**) واتا هەر کەس پێچەوانەی فەرمانەکانم بکات سوك دەبێت و هەمیشە بە بچوك سەیر دەکرێت . وە هەر کەس شوێن هەر قەومێك بکەوێت و وەك ئەوان هەڵس و کەوت بکات لەو قەومە حساب دەکرێت . بە کوردیی خۆمان واتا مەنجەڵ و سەر قاپی یەکن وەك گوتمان بانگەشەی محمد (ﷺ) **بۆ لا اله الا الله** یە ئەوانەی شوێنی ناکەون پاش مردن حساب و کتابیان لەگەڵدا دەکرێت و دەزانن خودا هەیە ئەو کات هەست بە سوکایەتی و بچوکیی خۆی دەکات . وە موسوڵمانانیش بەهەمان شێوە سوك دەبن و بچوك دەبن کاتێك سەر پێچیی ئەو حەدیسە بکەن .

باشترین نمونەش پاش ڕوخانی خیلافەتی عوسمانی هەتا ئەمڕۆ مان کە ساڵی ٢٠١٥ یە موسوڵمان لە هەموو جیهاندا سوك و سەلیم و هیچن و لە هەموو دنیادا بە بچوك و قەزەم و بگرە بە نەبوو حساب دەکرێن چونکە بەشی یەکەمی حەدیسەکەیان فەرامۆش کردووە ( **بعثت بين يدي الساعة بالسيف** ) دەسەڵات و چەکیان نییە .

و سێبەری ڕمەکانیان هەر یەکە و ئاڵایەکی جیایە لەوی تریان و هەر هەمویان یە ك ئاڵایان نە بەستووە لە یە ك ڕم و سێبەری ڕمی دەوڵەتی ئیسلامی لە ڕۆژ هەلاتەوە بۆ ڕۆژ ئاوا هێندە زۆر بێت تەواو نەبێت !؟ لە بەرامبەریشدا . امریکا ئەو ولاتانەی چەکیان هەیە و سێبەری ڕمەکانیان بە هەموو جیهاندا بڵاو بوەتە وە بە ئارەزووی خۆیان ئێمەی موسوڵمانیان زەلیل کردووە و زۆر بە هیچ و قەزەم سەیرمان دەکەن . ئایا ئەو حەدیسە پڕاو پڕ باسی ئێستا و هەموو زەمانێك ناکات کە موسوڵمان شمشێر و سێبەری ڕمیان نەبێت ؟ ئایا فلادیمیر پۆتین بەچی توانیی لە ئیستادا لە سوریا سیاسەتی ناوچەکە بگۆڕێت ؟ بە شمشێر و سێبەری ڕمەکەی نەبوو ؟ ئایا ئێستا ئەو هەموو دەوڵەتە بەناو ئیسلامیە هەیە هەموویان سوك و سەلیم و قەزەم نین لەبەر دەم خودا و جیهان و هاوڵاتیەکانی خۆشیاندا ؟ ئایا هەموو دەوڵەتێك لە جیهاندا دینی بێت یان مدنی بێت بە شمشێر و سێبەری ڕمەکەی حوکم ناکات ؟ ئایا ئێران بە شمشێر و سێبەری ڕمەکەی وای لێ نەهاتوە هەمو دنیا حسابی بۆ بکات و سێبەری ڕمەکەی گەیشتوەتە هەمو جیهان و لە یمن لە عیراق لە سوریا لە افغانستان وە لە هەر وڵاتێکی تر بیەوێت بە شمشێر و سێبەری ڕمەکەی چیی بوێت دەی کات . لە بەرامبەریشدا لە کوردوستانی خۆمان شمشێری کورد بوونی نییە وەك وڵاتە عەرەبییەکان وایە . وە سێبەری ڕمەکەی کورد ئەوە هەر بوونی نیە و هیچ ئاڵایەکیشمان نییە

بۆیە بەڕێزان ئەم حەدیسە سیاسییە و باسی هێز و ئاڵای دەوڵەت دەکات . وە بە نمونەی ئێستا و کۆن و دەوڵەتی ئاینی و دنیایش نموونەمان هێنایەوە . ئەو حەدیسە باسی دەسەڵات و ئاست و گەورەی و بەر فراوانیی دەسەڵات دەکات نەك کوشتن.

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : کوا ئەو حەدیسە باسی کوشتن دەکات ؟ ئایا ئەو لە خیلافەتی راشدی و اموی و عباسی و عوسمانی . ڕسقی ئەو وڵاتانە بۆ دەوڵەت بوو یان بۆ خەڵکی بوو ؟ ئایا بەراورد بکرێت لەگەڵ دەوڵەتی فارس و ڕۆمدا وە لەگەڵ دەسەڵاتی وڵاتە زل هێزەکانی ئێستادا . کامیان داد پەرەوەر تر و بە بەزەی تر بوون بۆ دابەش کردنی ڕسق و سامانی دەوڵەت بۆ هاوڵاتانیان ؟ تکایە قسەی گیرفان مەکە و بە نموونە و بە بەڵگە بۆمان بەراورد بکە

پاشان کاکی قەشەی کورد کە بەناوی بێدینەوە ئەم پۆستانە دەکەیت . بۆچی ڕەخنە لە یسوع یان عیسا ی خودات ناگریت ڕسق و بژێویی خۆی و هەر( ١٢) قوتابییەکەی لەسەر ئەو ئافرەتە داماوە شێتانە بووە کە ڕۆحی پیسی لێ دەرکردون ؟ وە ڕسقی لەسەر ئەو ئافرەتە گەڕ و گول و نەخۆشە داماوانە بووە کە چاکی کردونەتەوە ؟ بۆچی ڕەخنە لە کتێبەکەی خۆت ناگریت خوداکەت و ١٢ قوتابییەکەی لەسەر ڕسق و بژێویی ئافرەتان ژیاوە نەك بەرهەمی دەسەڵاتی خۆی ؟ ئەی کاکی قەشە کە بە ناوی بێدینەوە ڕەخنە لە ئیسلامی مەزن دەگریت بۆچی پێت شەرمە ئەو دەقانەی سەرەوە کە باسم کردن لە ئینجیلی **لۆقا** بەشی ٨ دێڕی ١ و ٢ و ٣ دا نوسراوە ڕسقی مەسیح و پارەی ئەو ژنانەتان بە ماڵ ترجمە کردووە بۆ ئەوەی سەر لە خوێنەر تێك بدەن . سەیری وێنەی پۆستەکە بکەن دەقەکەی لۆقا هەشتمان بۆ داناون

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و حەفتا و دوو

## پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم) بۆ تۆقاندن هاتووە نصرت بالرعب

دژە ئیسلامەکان دەڵێن پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم ) دەڵێت بە تۆقاندن سەر کەوتوم واتا من بە تۆقاندنی خەڵکی سەکەوتن بە دەست دەهێنم و ئیسلام و پەیامبەرەکەشی تۆقێنەرن . طبعا ئەوەی خەڵکی دەتۆقێنێت کابرای دژە ئیسلامە نەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چونکە قورئان و ئاینی ئیسلام و پەیامبەرەکەی ڕەحمەتن هەتا ڕۆژی قیامەت و بۆ قیامەتیش چونکە پەیامەکەی بەرەو بەهەشت و خۆشیت دەبات . بەلام تۆی دژە ئیسلام تۆقێنەریت بەوەی درۆ دەکەیت وڕاستییەکان وەك خۆی نا گەێنیت . وە خەڵکی دەتۆقێنیت لە ئاینی ئیسلامی مەزن ، سەیری وێنەکە بکەن ڕەخنەی دژە ئیسلاممان خستوەتە لا کێشەیەکی شینەوە نوسیوێتی بە تۆقاندن سەرکەوتم .

## پێغەمبەر (د.خ) بۆ تۆقاندن هاتوە نصرت بالرعب

**دەقی حەدیسەکە لە بخاریەوە**

1 - أنَّ النبيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم قال : أُعطيتُ خمسًا ، لم يعطَهنَّ أحدٌ قَبلي : نُصِرتُ بالرُّعبِ مَسيرةَ شهرٍ ، وجُعِلَت لي الأرضُ مسجدًا وطَهورًا ، فأيُّما رجلٍ من أُمَّتي أدركَتْه الصلاةُ فلْيُصلِّ ، وأُحلَّت لي المغانمُ ولم تَحِلَّ لأحدٍ قَبلي ، وأُعطيتُ الشفاعةَ ، وكان النبيُّ يُبعثُ إلى قومِه خاصةً ، وبُعِثتُ إلى الناسِ عامةً .

الراوي : جابر بن عبدالله | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري

الصفحة أو الرقم: 335 | خلاصة حكم المحدث : [صحيح] | انظر شرح الحديث رقم 15782

**هەندێک لە ووتە بەنرخەکانی پەیامبەری داعش**

**بعثت بالسيف بين يدي الساعة حتى يعبد الله وحده لا شريك له صحيح البخاري ٢٧٥٧**
**بە شمشێر بۆتان هاتوم کۆتایی و مردنتان بە دەست منە ، تا ئەوکاتەی اللە ی تاک و تەنیا ئەپەرستن**

**أأمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله (رواه البخاري ومسلم)**
**فەرمانم پێ کراوە کە دژی خەڵکی بجەنگێم تاکو ئەڵێن ( اشهدوا أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله)**

**وجعل رزقي تحت ظل رمحي صحيح البخاري ٢٧٥٧**
**ڕزقم لە ژێر سێبەری ڕمەکەمدایە (شمشێر یاخود ڕم)**

**يا معشر قريش لقد جئتكم بالذبح ( البخاري ٣٢٣١ . مسلم ١٧٩٥)**
**ئەی خەڵکی قورەیش بەسەربڕین بۆتان هاتوم**

**ونصرت بالرعب البخاری ٢٨١٥ بە تۆقاندن سەرکەوتم**

سەیری دەقی حەدیسەکە بکەن لە وێنەکەدا دامان ناوە دەفەرموێت ( **نصرت بالرعب مسيرة شهر** ) نصرت واتا پشت گیریم لێ کراوە نەك سەرکەوتووم وەك کابرای دژە ئیسلام ڕاڤەی کردووە و جیاوازیی نێوان ( نصر و نصرة ) ناکات وە ئەم چەواشە کاریە ئەگەر بە زانین بێت یان نەزانین گەورەترین جۆری تۆقاندنە بۆ هاو بیرەکانی چونکە الحمد لله ئێمەی موسوڵمان دەزانین ( **نصر** ) سەرکەوتنە و ( **نصرة** ) پشت گیرییە بەڵام تۆی دژە یسلام درۆ لەگەڵ هاو بیرەکانت دەکەیت و بە هەڵە ڕاڤەیان بۆ دەکەیت وە ئەوە پێی دەڵێن تۆقاندنی فکری بۆ هاوبیرەکانت وە گاڵتە کردنە بە هزری خۆت و چوار دەورت چونکە ئێمە دەزانین ئەو حەدیسە کە جەنابت بڕیوە باسی ڕێگای مانگێك ڕۆشتن دەکات بە گوێرەی ڕۆشتنی پیادە و وڵاخی ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر وە حەدیسەکە دەفەرموێت : پشت گیریم لێ کراوە بەوەی بەرامبەرم لێم بترسن و بتۆقن لە دوریی ڕۆشتنی ( ١ ) مانگەوە . وە دەبێت بزانین پێغەمبەری (صلى الله علية وسلم ) رحمة للعالمين ئوم قسەیەی لە شەڕی تبوك دا کردووە کە کۆتا غزوەی بووە کاتێك ڕۆم زانیيان هێزێکی تازە پەیدا بووە ناوی ئیسلامە هاتن خۆیان کۆ کردەوە لەگەڵ ئەو هۆزە عەرە بیانەی نێوان ئوردون و مەدینەی منەورەدا بوون ڕێك کەوتن بێن لە پێغەمبەر (صلى الله علية وسلم) و موسوڵمانان بدەن لە مەدینەی منورة بۆیە سوپایەکی ٣٠ هەزار کەسی کۆ کرایەوە لە مەدینەوە بەرەو ورِوی سوپاکەی ڕۆم ڕۆشت ئادەی کاکی گاور بە ناوی بێدینەوە خۆت دەر دەخەیت و پۆست دەکەیت بۆم حساب بکە لە مەدینەوە سوپایەك بە پێ و بە وڵاخ هەتا سنوری ڕۆم بڕوات مانگێکی پێ دەچێت یان نا ؟ بۆچی ئەو بەشەت لە حەدیسەکە بڕیوە ؟ پاشان کێ هاتوەتە سەر کێ ؟ ڕۆم یان موسوڵمان ؟ ئایا ئەوە پیاوەتی و غیرەت و ئازایەتی نییە خەڵکی بەرگری لە زەوی و ئاو شەرەفی بکات و بچێت بەرەو ڕوی دوژمنانی بیێتەوە ؟ ئایا ڕۆم نە هاتووە موسوڵمان بتۆقێنێت ؟

بەڕێزان سوپای ڕۆم پێك هات بوو لە (٤٠ ) هەزار کەس کاتێك بیستیان سوپای ئیسلام بەرەو ڕویان دەچێت ئەو هۆزە عەرەبیانەی پەیمانیان بەست بوو لەگەڵ ڕۆمدا پشتیان کردە ڕۆم و هاتنە ناو سوپای ئیسلامەوە ئەو هێزانەی ڕۆمیش کە هاتبونە ناوەوە هەموویان لە ترسان هەڵ هاتن و گەڕانەوە بۆ سنوری ڕۆم واتا بۆ سنوری ئوردن سوریای ئێستا . بەو شێوەیە سوپای ئیسلام بە بێ شەڕ و ڕوبەڕو بونەوە سەرکەوتن بەسەر ڕۆمدا و سنوری دەوڵەتی ئیسلامیشیان فراوان کرد گەیشتنە سنوری ڕۆم و ئەو هۆزە عەرەبانەش هاتنە ناو ئیسلامەوە .

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : ئادەی پێمان بڵێن سوپای ئیسلام کێی تۆقاند و چەند کەسی کوشت لە شەڕی تبوکدا ؟ ئەوەی تۆی گاوری داخ لە دڵیت لە ئیسلامی مەزن درۆ و گومان بڵاو دەکەیتەوە چونکە لەو حەدیسەدا باسی تۆقاندن کراوە کە خودا ترس دەخاتە دڵی دوژمنانی ئیسلامەوە . وەك چۆن ئێستا تۆش تۆقیویت لە ئیسلام و ناتوانیت بەرەو ڕوی بیتەوە و لەژێر ناوی بێدیندا خۆت شاردوەتەوە . و ناتوانیت تەنانەت گفت و گۆش بکەیت لەسەر کتێبەکەت وە لە ٤ شوێنی تریشدا لە قورئاندا باسی ( رعب ) کراوە کە خودا ترس دەخاتە دڵی دوژمنانی ئیسلامەوە لە ئایەتی ١٢ ی **انفالدا** کاتی شەڕی بەدر . وە لە ئایەتی ١٥١ ی **ال عمراندا** لە کاتی غزوەی ئوحددا . وە لە ئایەتی ٢٥ ی **الاحزابدا** کاتی غەزوەی الاحزابدا . وە لە ئایەتی ٢ ی **الحشردا** کاتێك بنو نضیر خیانەتیان لە موسوڵمانەکان کرد خودا ترس و تۆقاندنی خستوەتە دڵی دوژمنانی ئیسلامەوە ،

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : ئایا لەو( ٤ )ئایەتە و ئەو ( ٤ ) ڕوداوەدا موسوڵمانان هێرشکەر بوون ؟ یان پارێزگاریان لە خۆیان دەکرد و دوژمنانی ئیسلام تۆقێنەر بوون و هاتوون دەیان ویست ئیسلام لەناو بەرن ؟ ئەوە ئینجیلەکەی **مەتای** ئێوەیە لە بەشی ١٠ دەقی ٣٤ هەتا ٣٩ مەسیح (ع) دەڵێت نەهاتووم بۆ ئاشتی بڵاو بکەمەوە بەڵکو شمشێر وە هاتوم بۆ ئەوەی ڕق و دوبەرەکی بخەمە ناو خێزانەکانتانەوە . ئەوە ئینجیلەکەی **لۆقایە** بەشی ١٢ دەقی ٤٩ بۆ ٥٣ مەسیحی ئاشتی دەڵێت : هاوتوم ئاگر هەڵ دەمە سەر زەوی و چەند بمەوێت گڕی زیاتر بگرێت و دوبەرەکی بخەمە ناوتانەوە وە من بۆ ئاشتی نەهاتووم بەڵکو بۆ دوبەرەکی . کاکی گاور ئەوە ئینجیلەکانی خۆتە باسی تۆقاندن دەکات و لەناو ملێکدا باوك و دایك و منداڵ بدات بە شەڕدا و شیرازەی خێزان تێك بدات و دوبەرەکی و تۆقان بڵاو بکاتەوە لەسەر زەوی

بەڕێزان ئەو وێنەیەی کە دەی بینن هی گاورەکانە کە بەناوی بێدینەوە بڵاو دەکەنەوە پێك هاتووە لە ( ٥ ) ڕەخنە دوانیان هی یە ك حەدیسە و ئەوان کردویانە بە دوو بەشەوە ئەمە وەڵامەکەیەتی

**بۆ وەلامدانەوەش ئەم وینەیە سەیری ئەمانە بکە**


پرسیاری بێ وەڵامی ١٧١ ل(٣٨٤)

پرسیارە بێ وەڵامەکان ٣٠ ل(٦٥)

پرسیارە بێ وەڵامەکان ١٧ ل(٤٢)

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و حەفتا و سێ

## خودا بۆچی باسی نوستن و شەوی کردوە لە قورئاندا ؟

خودا بۆچی باسی نوستن و شەوی کردوە لە قورئاندا

ڕەخنەی قەشەی کورد بەناوی بێدینەوە وەك خۆی دامان ناوە

ناوی زانستیی هۆرمۆنەکە

وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا

( سورة النبأ ١١ )

خەوتنمان بۆ کردون بۆ سرەوتن شەوگارمان بۆ کردون وەک داپۆشەرێک ڕۆژمان بۆ کردون بۆ بە دەستهێنانی ڕزق.

بەڕاستی بەزەیم بە کاک جوبرەئیلدا یەتەوە لەو ڕێگا دورەوە بێت تاکو ئەم زانیاریە گرنگە بدات بە ئێمە!

ئەرێ ئەم نوسەری قورئانە هەر باسی سەردەمی قورەیش و دورگەی عەرەبی ئەکات خەوتنی چی و کاروکاسپی چی و ڕزقی چی ؟

نیوەی جیهان بە شەو کار ئەکەن لەم سەردەمدا لەهەمان کاتدا جێگا هەیە شەش مانگ ڕۆژەو و شەش تری هەر شەوە

جا ئەم قسانە بۆکاتی قورەیشیش پێی ئەوترێ ( بدیهیات ) وەکو ئەوە وایە تۆ بڵێیت کاتێک بە ڕێگادا ئەڕۆم قاچم ئەجوڵێنم

هەمو کەس ئەزانێ ئەو قسانە بکات!

Sundown Naturals

EXTRA STRENGTH

Melatonin

5 MG

Clinically Studied Ingredient

Sleep Aid*

Melatonin

$CH_3O$

$CH_2CH_2NHCOCH_3$

ڕەخنە لە ئایەتەکانی ٩ و ١٠ و ١١ ی سورەتی **النبا** دەگرن وەك لە وێنەکەدا دەی بینن . وە دەڵێن خودا بۆچی باسی نوستنی کردووە !؟ بەڵام هەمیشە دژە ئیسلام بە ڕادەی ئاستی زانیاریی خۆی لە دنیا و چوار دەوری تێ دەگات چونکە ئەگەر سەیری ئایەتەکانی سورەتی ( **النبا** ) بکەین بە ( عم يتساءلون ) باسی بێدین و کافران دەکات لە ڕاستی و حەقیقەتی زیندوو بونەوە ؟ وە خودای زانا لە ئایەتەکانی سەرەتادا باسی چۆنێتیی خلقی زەوی و شاخەکانمان بۆ دەکات پاسان دێتە سەر خلقی مرۆڤ . پاشان لە ئایەتی ( ٩ ) دا دێتە سەر باسی نوستن و بە نموونە دەی هێنێتەوە بۆ زیندوبونەوە چونکە سەرەتای ئایەتەکە دەفەرموێت ( **عم يتساءلون عن النبا العظيم** ) پێمان ڕا دەگەێنێت ئایا ئێوە ناخەون پاشان هەڵ ناسنەوە ؟ مردن و هەستانەوەش دوای مردن وەك نوستن و هەستان لە خەو وایە . بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان دەقی ئایەتەکە خۆیەتی دەفەرموێت ( **و جعلنا نومکم سباتا** ) سباتا ئەسڵەکەی لە ( **سبت** ) وەرگیراوە سبت لە زمانی عەرەبیدا بە قطع و الراحة و السكون هاتووە . واتا دابڕان و ئیسراحەت و هێمنی بۆیە بە ڕۆژی شەمەش دەڵێن ( السبت ) چونکە لای جولەکە ڕۆژی دابڕانە لە هەموو کارێك و هیچ کارێك ناکەن کەواتا ( **سباتا** ) بە مانای بێ دەنگی و دابڕان دێت لە هەموو کارێك بەڵگەشمان اصمعييە دەڵێت

( **يصبح مخمورا و يمسي سبتا** ) واتا بە ڕۆژ سەرخۆشە و بە شەویش تەخت بووە هیچ جوڵەیەکی نییە خۆشتان دەزانن سەرخۆش کاتێك دەنوێت لە هەموو جوڵەیەك دەوەستێت هەروەها عرب دەڵێت ( سبت المريض ) واتا هیچ جوڵەیەك ناکات وەستاوە . خۆشتان دەزانن نەخۆش دەنوێت بەڵام ئازارەکانی هەر بەردەوامە . بە هەرحاڵ سباتا واتا وەستان لە هەموو کارێك وە خودای زانا بۆیە باسی خەوتن و سبتی کردووە

نمونەی پێ هێناوەتەوە بۆ زیندوو بونەوە چونکە خۆتان دەزانن کاتێك مرۆڤ دەنوێت بێ ئاگا دەبێت تەنانەت دز دێتە ماڵەکەی ئەو بێ ئاگایە و بەیانی دەزانێت چی ڕوی داوە کاتێك لەخەو ڕا دەبێت و پشێوی لە ماڵەکەدا دەبینێت وە کوردی خۆشمان دەڵێت خەو مردنیان گوتووە . ئەمەش نمونەیە بۆ ئەوەی هەی بێدینی کافر تۆ هەموو ڕۆژێك دەمریت و بۆ بەیانی زیندو دەبیتەوە ئیتر بۆچی ژیانی دوای مردن بە درۆ دەخەیتەوە لە کاتێکدا ڕۆژانە ئەو زیندوو بونەوەیە دەبینیت ، بۆ ئەوەی ئاستی نەزانی و نە شارەزایی خاوەن ڕەخنە دەر بخەین کە قەشەیە و کۆپی و پەیست دەکات و بێ ئاگایە لە بێدینی و بابەتی زانستی پێی دەڵێن کاکی قەشە ئەگەر ڕەخنەی جەنابت زانستی بوایە لەسەر ئیسلامی مەزن ئەم ڕەخنەی نوستنەت نەدەگرت لە قورئانی مەزن وە دەت زانی جبریل (ع) لە ئاسمانەوە هاتووە باسی خەوی بۆ نەکردوین بەڵکو باسی زیندو بونەوەی بۆ کردوین و لەگەڵ ئەوەشدا ئیعجازێکی عیلمیی لە لایەن خودای خالقەوە بۆ هێناوین کە محمد (صلى الله عليه وسلم) و قورەیشیش نەیان زانیوە ( میلاتونین ) چییە ؟ تەنانەت تۆی نەزانیش نەت زانیوە میلاتونین چییە ؟ چونکە ئەگەر بت زانیایە ئەم قسە هیچە و ئەم ڕەخنەیەت لە قورئانی مەزن نە دەگرت ؟ بەکورتی باسی Melatonin دەکەین بۆتان

هۆڕمۆنێکە لە مۆخدایە و لە ڕێگای غودەی سنەوبەریەوە دەردەچێت و هەموو زیندەوە کان ئەو هۆڕمۆنەیان تێدایە و بەتەنها لە شەودا ئەو هۆڕمۆنە دەر دەچێت وە هەرچەند چوار دەورت تاریك بێت ئەو هۆڕمۆنە زیاتر دەر دەچێت وە مرۆڤ هەست بە خاو بونەوەی لەش دەکات و باوێشك دەدات و گیانی سست دەبێت و دەیەوێت بنوێت بە هەرحاڵ خۆتان دەتوانن بگەڕێن بەدوای میلاتۆنیندا . وە سودی زۆرە بۆ مرۆڤ بۆیە شەوانە هەر چەند تاریکی زۆر بێت ئەو هۆڕمۆنە زیاتر دەرژێت و ئەو کەسە زیاتر دەنوێت و ئیسراحەت دەکات هەر چەندە ڕۆشنای زۆر بێت ئەو کەسە نانوێت چونکە ئەو هۆڕمۆنە بەس لە تاریکیدا دەردەچێت . وە ئەگەر بە شەو کار بکەیت و بە ڕۆژ بنویت ئەو هۆڕمۆنە نارژێت و کەسەکە توشی سەر ئێشە و بێ تاقەتی و کەئابە و چاو ئاوسان و زۆر شتی تریش دەبێت . تەنانەت ئەو کەسانەی کە کەم دەنون یان خەویان باش نییە دوکتۆر میلاتۆنینیان بۆ دەنوسێت بۆ نوستن و اعصاب هێور کردنەوە.

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : کاکی قەشەی بەناو بێدین ئایا تۆ دەتزانی میلاتۆنین چییە و بۆچی بەس تەنها بە شەو دەر دەچێت و ڕۆژ بێتەوە ئەو هۆڕمۆنە دەوەستێت و کابرای بە شەو کار دەکات توشی جۆرەها نەخۆشی دەبێت چونکە ئەو هۆڕمۆنە لە کار

دەوەستێت ؟ ئایا محمد (صلی الله علیه وسلم) دەیزانی سبت یان سباتا هۆکاری هۆرمۆنی میلاتۆنینە ؟ یان ئەمە خودای خالقی کەون ئەم زانیاریانەی بە جبریلدا (ع) بۆ ناردوین و ئەم ئایەتەش بووە بە ئیعجازێکی عیلمی وە بەڵگە بۆ ئەوەی نوسەری ئەم قورئانە خودایە نەك مرۆڤە ؟

.......................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەلأمەکان ژمارە :سەد و حەفتا وچوار

### خودا نەی زانیوە مەسیح چیی گوتووە ؟




گاورەکان ڕەخنە لە ئایەتی ١١٦ ی سورەتی **المائدة** دەگرن و دەڵێن خودای قورئان نازانێت مەسیح (ع) چیی گوتووە ؟ و لە مسیح دەپرسێت ئایا تۆ ئەو قسەیەت کردووە بڵێیت من و دایکم بپەرستن وەك دوو خودا و من و دایکیشم هەر خوداین بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەڵێین وەك کاری هەموو جارێکیان ئایەتەکەیان بڕیووە و بەس پێشەکیە کەیان داناوە کە دەفەرموێت **(وإذ قال الله يا عيسى ابن مريم أأنت قلت للناس اتخذوني وأمي إلهين من دون الله** ) وە ئایەتەکەیان تەواو نە کردووە هەروەها هەردوك ئایەتی ١١٧ و ١١٨ ش تەواو کەری ئەو پرسیارەیە . وە ئەو مشهدەی ئەو ئایەتانە باسی دەکات هی ڕۆژی قیامەت و حسابە و قورئانیش زۆر دیمەنی قیامەتمان بۆ باس دەکات و ئەمەش یەکێکە لەو دیمەنانە وە خۆشتان دەزانن ڕۆژی قیامەت واتا دادگای کردن وە خودای تعالی دادوەرە . با لێرەدا هەڵ وێستەیەك بکەین و بزانین ئایا لە دنیادا دادوەر کاری چییە ؟ وە ئایا هەموو کەس دەچێتە دادگا و بەردەم دادوەر یان بەس تاوان باران دەچنە بەردەم دادوەر و دادگا بە ملاین کەس هەتا دەمرن تاوان ناکەن و دادگا نابینن . وە کاتێکیش تاوان بار دەچێتە بەردەم دادوەر لێی دەپرسێت تۆ ئەو کارەت کردووە ؟ بە شەرتێك کابرای دادوەر مەلەفەکەی

لەبەر دەستدایە و ١٠٠% دڵنیا یە ئەو کەسە تاوان بارە وە بە گوێرەی پشکنین و لێکۆڵینەوەی پۆلیس ئیسپات بووە کە ئەو کەسە تاوانەکەی کردووە . بەڵام کابرا ی دادوەر لێی دەپرسێت تۆ ئەو تاوانەت کردووە ؟ بۆ ئەوەی ببێت بە دان پیانان لەلایەن تاوان بارەوە بۆ تاوانەکەی ئینجا حاکمەکە حوکم دەدات وە ئەمەش پێی دەڵێن داد پەروەری . وە ئەگەر کابرا تاوان بار نەبێت . دەتوانێت بڵێت نەخێر ئەو کات دادوەر بە گوێرەی مەلەفەکەی بەر دەستی و قسەی کابرا حوکم دەدات . ئەمەی باسم کرد حوکمی سەر زەوییە و دادوەر بۆ ئەوەی دادپەروەر بێت دەپرسێت ئەو کارەت کردووە ؟ بۆ ئەوەی ببێت بە دان پیانان و اقرار لەلایەن تاوان بارە کەوە . کەواتا لە هەموو دادگایەکی جیهاندا دادوەر حوکم لەسەر شتێك دەدات کە کراوە و مەبەست لە حوکم دانەکەش کردارەکەیە کە کراوە واتا کابرای دادوەر دەزانێت مەسەلەکە چییە و چی ڕوی داوە و هەمیشە پرسیاری دادوەر بۆ اقرار و دان پیانانە لە بەرامبەرەوە . با بگەڕێینەوە لای ئایەتەکە و بپرسین ئایا مەسیحیەکان دەڵێن مەسیح خودایە ئایا دەڵێن مریم خودایە ؟ بە دڵنیاییەوە وەلامەکەی بەڵێیە مادام ئێمە دەزانین خودای تعالاش دەزانێت چونکە ڕوداوەکە هەیە . بۆیە کاتێك ئێمە لەم مەسیحیانە دەپرسین ئایا مەسیح خودایە ؟ دەڵێن بەڵێ . دەڵێین بەڵگەمان بەنێ لە ئینجیلەکانتان ؟ بەلام ئەوان بەڵگە یان پێ نییە و دەڵێن دەبێت ڕۆحی پیرۆز بێتە لەشتەوە ئینجا هەستی پێ دەکەیت . یان وەرە بۆ کڵێسا قاوەیەك دەخۆین و تێت دەگەێنم وە زۆر بەهانەی تریش بەلام وەك دەق لە کتێبەکانیاندا هیچ دەقێك نییە مەسیح بڵێت من خودام و بم پەرستن یان دایکم خودایە و بی پەرستن . بەڵام ئەوان ئەو کارە دەکەن کەواتا کارەکە هەیە بەلام بەڵگەکە نییە وە بەڵگەی ئەسڵی خودی مەسیح (ع) خۆیەتی .

وە هەر ئەم ئینجیلانەی بەر دەستمان بەڵگەیە بۆ مەسیح خۆی کە نەی گوتووە من و دایکم بپەرستن کەواتا کردارەکە هەیە وە بەڵگەش هەیە ئێستا لەبەر دەستماندایە کە کتێبەکانی خۆیانە وە ئێمەی مرۆڤ دەزانین مەسیح (ع) ئەو قسەیەی نە کردووە . کەواتا چۆن خودا نازانێت کە مەسیح ئەو قسەیەی نە گوتووە لە کاتێکدا ئەم کتێبەی بەردەستمان شایەتە بۆ مەسیح بەسەر مەسیحیەکانەوە ؟ کەواتا پرسیار کردنی خودای تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا لە خودی مەسیح (ع) بۆ ئەوە نیە نەی زانی بێت یان ڕوداوەکە ڕوی نەدا بێت ؟ بەڵکو بۆ ئەوەیە مەسیح (ع) خۆی ببێت بە بەڵگە بەسەر مەسیحیەکانەوە وە بە دەمی خۆی ئیقرار بکات کە شتی وای نە گوتووە . ئەگینا ئەگەر ڕۆژی قیامەت ئەم ئینجیلانەی ئێستاش بهێنن کە لەبەر دەستماندایە و بە قەشەیەك بڵێن ئادەی پێمان بڵێ لە کوێدا نوسراوە مەسیح بلێت من و دایکم خودان و بمان پەرستن ؟ ئەو دەقە نا دۆزنەوە چونکە تێیدا نییە . وە ئەسڵی پرسیارەکە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەوەیە خەڵکەکە بزانێت کێ ئەو قسەیەی کردووە ؟ چونکە خۆتان دەقی ئایەتەکانی ( ١١٦ و ١١٧ و ١١٨ )ی سورەتی المائدة بخوێننەوە دەزانن کە مەسیح (ع) ئەو قسەیەی نە کردووە ؟ کتێبەکەی خۆشیان ئەو قسەیەی تێدا نییە ؟ ئەو کات ئەو کەسە دەر دەکەوێت کە ئەم عیبادەتەی بڵاو کردوەتەوە و عیسا و دایکی کردووە بە خودا و قەشەکان دوای قسەی عیسا نەکەوتوون بەڵکو ئەو کەسە کەوتون کە عیسا و دایکی کردووە بە خودا وە کتێبەکەشیان بێ

بەرییە لەو قسەیە . ئەمەش داد پەروەربی خودایە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو تاوان بارەی کە عیسا و مریمی کردوە بە خودا و تا ئێستاش شوێنی دەکەون

لەوانەیە گاورێکمان لێ پەیدا ببێت بڵێت راستە دەڵێین عیسا خودایە بەلام ناڵێین دایکی خودایە بۆ وەلامی ئەم برادەرەش دەڵێین ارثذۆکس و کاثۆلیك دەڵێن مریم خودایە بەلام پرۆتستانت و شهود یهوة وا ناڵێن وە هەر پرۆتستا نت و شهود یهوة خۆیان دەبن بە شایەت بۆ ئەوەی کە مەسیح (ع) نەی گوتووە دایکم بپەرستن . **وە ئەو پیاوە کە لە وێنەکە دا** دەبینن **هی کڵێسا ی پرۆتستانتە چۆن بتی مریم دەشکێنن دەڵێت گەر خوا بێت دەبێ شتێکم لێ بکات یان بەرگری لە خۆی بکات** . کەواتە من و تۆش دەبین بە شایەت بۆ مسیح (ع) کە نەی گوتووە دایکم بپەرستن

**پرسیاری بێ وەلامیشمان بۆ کاکی گاور ئەمەیە** : ئایا ئەگەر کتێبەکەتان شایەت بێت بەسەرتانەوە ئەو دەقانەی تێدا نییە وە ئێمە شایەت بین بەسەرتانەوە کە دەڵێن مریم و مسیح دوو خودان ئایا گەمژەی نییە بڵێیت خودا نازانێت مەسیح چیی کردوە و لێی دەپرسێت ئایا وات گوتووە ؟ هەر کەس دەیەوێت شارەزا بێت لە عیبادەتی مریم و بە خودا کردنی بە بەڵگەوە با ئەم کتێبە بخوێنێتەوە **کتاب عبادة مریم في المسیحیة والظهورات المریمیة - معاذ علیان.**

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و حەفتا و پێنج

## حوکمی ڕەجمی زیناکار لە ئیسلامدا و ئەو ئایەتەی بزن خواردی

پرسیاری بێ وەلامی ئەم جارەمان بۆ قورئانی و معتزلەکانە چونکە دەڵێن حوکمی ڕەجم کردنی زیناکار لە قورئاندا نییە وە هەر هەموو بەڵگەکانیشیان لە دوکتۆر مصطفی محمودە وە وەرگرتووە خودا بە ڕەحمەتی خۆیی لەگەڵدا بکات بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەڵێین بەڵگەی حەدیسی صحیح زۆرن بۆ ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئافرەت و پیاو یشی ڕەجم کردووە . بەڵام کاکی قورئانی و معتزلة باوەڕ بەو حەدیسانە نا کات !؟ بۆیە مەجبورین بە **پرسیاری بێ وەلام** دەست پێ بکەین و دەڵێین پێوەری ئێوە چییە کە ئەو حەدیسانە راست نییە ؟ چونکە کاتێك ئێمەی موسوڵمان دەڵێین فلان حەدیس ڕاستە یان درۆیە یان لاوازە یان ... هتد . اهلی جرح و تعدیلمان هەیە و ناسراون چۆن ئەو قسانەیان لە بێژنگ داوە و بۆشیان ڕون کردوینەتەوە بۆچی فلان حەدیس ڕاستە یان درۆیە یان هەڵ بەستراوە یان ... هتد بەڵام کاکی معتزلة و قورئانی هیچ بەڵگەیەکی پێ نییە بۆمان بسەلمێنێت بۆچی ئەو حەدیسانەی ڕەجم کردنی زیناکار ڕەت دەکاتەوە ؟ یان دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەسی ڕەجم نە کردووە ؟فەرموو جەنابتان بە بەڵگەی کتێب و سەرچاوەکانی خۆتان بۆمان ڕون بکەنەوە ئەو حەدیسانە درۆیە و هۆکاری درۆکانیشمان بۆ بنوسن . چۆن ئێمەی موسوڵمان جرح و تعدیلمان کردووە ئێوەش جرح و تعدیلمان بۆ بکەن و بۆمان بدەن لە بێژنگ پاشان ئەگەر ئەو حەدیسانە ڕاست نە بوایە ؟

چۆن عمری کوڕی خطاب لەسەر مینبەر لە خوتبەدا دەی گوت دەترسم ڕۆژگارێك بێت خەڵکی بڵێن حوکمی ڕەجم لە قورئاندا نییە و نسخ کراوە ؟ ئەگەر ئەو قسە یەی عمری کوڕی خطاب ڕاست نە بوایە ؟ئایا سەحابەکان لێی هەڵ نە دەستان و بەرەنگاری نە دەبونەوە ؟ ئایا ئەو قسەی عمر کەراماتێك نیە لە خوداوە بۆ ئێوە کە ئێستا دەڵێن حوکمی ڕەجم لە قورئاندا نییە ؟ ئایا ئەو قسەیە نابێت بە بەڵگە بەسەر تانەوە ڕۆژی قیامەت کە ئەو قسەیەی عومەرتان بیستووە لەگەڵ ئەوەشدا دژایەتیی ئاینی ئیسلامتان کردووە و دەڵێن حوکمی ڕەجمی زیناکار لە قورئاندا نییە لە کاتێکدا عمری کوڕی خطاب دەڵێت بەڵێ هەیە و ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر دا (صلی الله علیه وسلم) زینا کارمان ڕەجم کردوە ؟دەقی حەدیسەکەی ئیمامی عومەرمان لە وێنەکەدا داناوە .



پاشان هەر چوار مەزهەبە ئیسلامەکە لەسەر ڕەجم کردن کۆکن . جەنابتان بەچی بەڵگەیەك ئەو حوکمە ڕەت دەکەنەوە ؟ئادەی پێمان بڵێن پێوەری ئێوە چییە ؟ لە کاتێکدا هەر (٤ ) مەزهەبەکە دەڵێن دەبێت زیناکار ڕەجم بکرێت ؟ وە ئێوە ئاینی ئیسلام و حوکمەکانی لە کێوە و لە چی ئیمام و مەزهەبێك وەر دەگرن پاشان ئایەتی ٣٥ ی سورەتی **النسائیان** کردووە بە بەڵگە و دەڵێن چۆن ئافرەتێك زینا بکات نیو بەرد باران دەکرێت ؟ کوا نیو مردن یان نیو بەرد باران کردن هەیە ؟ وە ڕێژەی ئەو بەردانە چەندە کە نیوەی ڕەجم کردنە ؟ ئا لێرەدا دوکتۆر مصطفی بە ڕەحمەت بێت؟کەوتوتە هەڵەوە چونکە سەرەتای ئایەتەکە دەڵێت ( **و من لم یستطع منکم طولا ان ینکح المحصنات المؤمنات** ) ئەگەر کەسیکتان لەبەر نەبوونی و دەست کورتی و بێ پارەی نەی توانی ئافرەتی محصن بهێنێت و بیکات بە هاوسەری خۆی هەڵەکە لێرەدایە ( المحصنات ) دوکتۆر بە ئافرەتی خاوەن مێردی ڕاڤە کردووە . خۆشتان دەزانن لە هیچ شەریعەتێکی ئاسمانی و لە هیچ یاسایەکی مرۆیدا ئافرەتی مێرددار شوو ناکات بە کەسێکی تر !؟ چونکە خۆی مێردی هەیە چۆن دەتوانێت شو بکات بە کەسێکی بێ پارە ؟وە محصن بە مانای حصن دێت واتا شورا وە هەر ئافرەتێك باوك و برای هەبێت یان

کەسێکی هەبێت پارێزگاریی لێ بکات یان بەحەیا و حورمەتیش بێت ئەگەر شووی نە کرد بێت هەر پێی دەڵێن محصن دەق ئایەتەکەش لێرەدا باسی ئەو ئافرەتانە دەکات کە شویان نە کردووە وەك لە ئایەتەکەشدا نوسراوە ئەوانەی نا توانن ئافرەتی ئیمانداری محصن بهێنن . بەڵام دوکتۆر محصنی بە ئافرەتی خاوەن مێرد تفسیر کردوە و لێرەدا کەوتوەتە هەڵەوە . پاشان ئایەتەکە دەفەرموێت :( **فمن ما ملكت ايمانكم من فتياتكم المؤمنات**) مادام کابرا ناتوانێت ئافرەتێکی ئازاد بهێنێت بۆی هەیە ئافرەتێکی کۆیلە بهێنێت بە شەرتێك باری ئابوریی نزم بێت و پارەی نەبێت و کۆیلەکەش دەبێت ئیماندار بێت . وە ئەگەر ئەو کۆیلەیە زینای کرد حوکمی زیناکەی نیوەی ئافرەتێکی ئازادە واتا دەبێت ( ٥٠ )جەلدی لێ بدرێت . نەك نیوە مردوو بکرێت یان نیو بەرد باران بکرێت ؟ چونکە نیو بەرد باران کردن قسەیەکی هیچ و نا لۆژیکە و هیچ پێوەرێك نیە بۆ نیو بەرد باران کردن لە هیچ یاسایەکی جیهاندا . وە بە کاکی معتزلە دەڵێین فەرموو ئەوە هەموو شەرع و فیقهی ئیسلامدا حوکمی نیو بەرد باران کردنمان لە ئایەتی ٣٥ ی **النسائدا** بۆ دەر بهێنە ؟ ئەگەر نەت توانی دەری بهێنیت !؟ ئەوە دڵنیابە کە ناتوانیت ئاینی ئیسلام بە گوێرەی هەوا و ئارەزوو و تێگەیشتنی ئەقڵی خۆت شیکاری بکەیت وە هەمو زانایانی ئیسلام کۆکن لەوەی ئەو حوکمە ( ٥٠) قامچییە بۆ ئافرەتی کۆیلە شوی کرد بێت و زینا بکات نەك ( ١٠٠ ) قامچی وەك ئافرەتی ئازاد وە نەك نیو بەرد باران کردن وەك جەنابت دەهۆڵی بۆ دەکوتیت ؟ فەرموو لە کتێبە ئیسلامیەکاندا بۆمان بهێنە بزانین نیو بەرد بارانە یان ٥٠ قامچیە ؟

بۆ حەدیسی خواردنی بزن بۆ ئایەتی الشیخ و الشیخە ئەو حەدیسە ڕاست نییە چونکە محمد بن إسحاق تێدایە و زۆر لەسەر ئەو باسە نارۆین ئەمە لینکی **الدرر السنيةيە** کە تایبەت مەندە لە عیلمی حەدیسدا بە جوانی ڕونی کردوەتەوە بۆچی ئەو حەدیسە ڕاست نییە

http://www.ahlalhdeeth.com/vb/showthread.php?t=16139

...........................................

**بابەتی ناو لینك**

**هل صح عن عائشة حديث الداجن الذي أكل الصحيفة التي فيها آية الرجم والرضاعة ؟؟؟**

## هذه الرواية منكرة ولاتصح

(وقد وردت عند ابن ماجه(١٩٤٤

حدثنا أبو سلمة يحيى بن خلف ثنا عبد الأعلى عن محمد بن إسحاق عن عبد الله بن أبي بكر عن عمرة عن عائشة وعن عبد الرحمن بن القاسم عن أبيه عن عائشة قالت لقد نزلت آية الرجم ورضاعة الكبير عشرا ولقد كان في صحيفة تحت سريري فلما مات رسول الله وتشاغلنا بموته دخل داجن فأكلها

وأخرجه أحمد (٢٦٩/٦) وأبو يعلى في المسند(٤٥٨٧) والطبراني في الأوسط (١٢/٨) وغيرهم من طريق محمد بن إسحاق قال حدثني عبدالله بن أبي بكر بن حزم عن عمرة بنت عبدالرحمن عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه وسلم به

والعلة في هذا الحديث هو محمد بن إسحاق فقد اضطرب في هذا الحديث وخالف غيره من الثقات

وهذا الحديث يرويه ابن إسحاق على ألوان

فمرة يرويه عن عبد الله بن أبي بكر عن عمرة عن عائشة

ومرة يرويه عن عبد الرحمن بن القاسم عن أبيه عن عائشة

ومرة يرويه عن الزهري عن عروة عن عائشة كما عند أحمد (٢٦٩/٦) وليس فيه هذه اللفظة المنكرة

وفي كل هذه الروايات تجد أن محمد بن إسحاق قد خالف الثقات في متن الحديث

فالرواية الأولى رواها ابن إسحاق عن عبدالله بن أبي بكر عن عمرة عن عائشة قالت لقد نزلت آية الرجم ورضاعة الكبير عشرا ولقد كان في صحيفة تحت سريري فلما مات

رسول الله وتشاغلنا بموته دخل داجن فأكلها

وقد روى هذا الحديث الإمام مالك رحمه الله عن عبدالله بن أبي بكر عن عمرة عن عائشة قالت نزل القرآن بعشر رضعات معلومات يحرمن ثم نسخن بخمس رضعات معلومات فتوفي رسول الله وهن مما نقرأ من القرآن

كما في الموطأ (٦٠٨/٢) ومسلم (١٤٥٢) وغيرها

وكذلك أخرجه مسلم (١٤٥٢) عن يحيى بن سعيد عن عمرة بمثله

:وسئل الدارقطني في العلل (المخطوط (٥ /١٥٠-١٥١ )) عن حديث عائشة عن عمرة قال نزل القرآن بعشر رضعات معلومات يحرمن ثم صرن إلى خمس فقال

يرويه يحيى بن سعيد وعبدالرحمن بن القاسم

واختلف عن عبدالرحمن

فرواه حماد بن سلمة عن عبدالرحمن بن القاسم عن أبيه عن عمرة عن عائشة

قاله أبو داود الطيالسي عن حماد بن سلمة

وخالفه محمد بن إسحاق فرواه عن عبدالرحمن بن القاسم عن أبيه عن عائشة لم يذكر عمرة

وقول حماد بن سلمة أشبه بالصواب

وأما يحيى بن سعيد فرواه عن عمرة عن عائشة

قال ذلك ابن عيينه وأبو خالد الأحمر ويزيد بن عبدالعزيز وسليمان بن بلال

وحدث محمد بن إسحاق لفظا آخر وهو عن عائشة لقد نزلت آية الرجم ورضاعة الكبير عشرا ، فلما مات النبي صلى الله عليه وسلم انشغلنا بموته فدخل داجن فأكلها) .انتهى

وفي مسند الإمام أحمد بن حنبل ج:٦ ص:٢٦٩

ثنا يعقوب قال حدثنا أبي عن بن إسحاق قال حدثني الزهري عن عروة عن عائشة قالت أتت سهلة بنت سهيل رسول الله فقالت له يا رسول الله إن سالما كان منا حيث قد علمت إنا كنا نعده ولدا فكان يدخل علي كيف شاء لا نحتشم منه فلما أنزل الله فيه وفي أشباهه ما أنزل أنكرت وجه أبي حذيفة إذا رآه يدخل علي قال فأرضعيه عشر رضعات ثم ليدخل عليك كيف شاء فإنما هو ابنك فكانت عائشة تراه عاما للمسلمين وكان من سواها من أزواج النبي يرى إنها كانت خاصة لسالم مولى أبي حذيفة الذي ذكرت سهلة من شأنه رخصة له

وقد انفرد محمد بن إسحاق في هذا الحديث بلفظ (فأرضعته عشر رضعات) وقد رواه عن الزهري ابن جريج ومعمر ومالك وابن أخي الزهري بلفظ (أرضعيه خمس رضعات) ((حاشية المسند (٣٤٢/٤٣

وقال الزيلعي في تخريج الأحاديث والآثار الواقعة في ج:٣ ص:٩٥

قوله 1000

وأما ما يحكى أن تلك الزيارة كانت في صحيفة في بيت عائشة فأكلتها الداجن فمن تأليفات الملاحدة والروافض

قلت رواه الدارقطني في سننه في كتاب الرضاع من حديث محمد بن إسحاق عن عبد الله بن أبي بكر عن عمره عن عائشة وعن عبد الرحمن القاسم عن أبيه عن عائشة قالت لقد نزلت آية الرجم والرضاعة وكانتا في صحيفة تحت سريري فلما مات النبي تشاغلنا بموته فدخل داجن فأكلها انتهى

وكذلك رواه أبو يعلى الموصلي في سنده

ورواه البيهقي في المعرفة في الرضاع من طريق الدارقطني بسنده المتقدم ومتنه

وكذلك رواه البزار في مسنده وسكت والطبراني في معجمه الوسط في ترجمة محمود الواسطي

وروى إبراهيم الحربي في كتاب غريب الحديث ثنا هارون بن عبد الله ثنا عبد الصمد ثنا أبي قال سمعت حسينا عن ابن أبي بردة أن الرجم أنزل . في سورة الأحزاب وكان مكتوبا في خوصة في بيت عائشة فأكلتها شاتها انتهى

فهذه الرواية التي ذكرها عن الحربي في الغريب فيها عدة علل منها ضعف عبدالصمد بن حبيب وجهالة والده والإرسال

فتبين لنا مما سبق أن هذه الرواية المنكرة قد تفرد بها محمد بن إسحاق وخالف فيها الثقات ، وهي رواية شاذة منكرة

وهذه بعض أقوال أهل العلم في حديث محمد بن إسحاق في غير المغازي والسير

قال يعقوب بن شيبة: سمعت ابن نمير-وذكر ابن اسحاق-فقال( إذا حدث عمن سمع منه من المعروفين فهو حسن الحديث صدوق، وإنما أتي من أنه يحدث عن ] (المجهولين أحاديث باطلة [تاريخ بغداد للخطيب (٢٧٧/١

(وقال عبدالله بن أحمد بن حنبل قيل لأبي يحتج به-يعني ابن اسحاق-قال(لم يكن يحتج به في السنن

(وقيل لأحمد:إذا انفرد ابن اسحاق بحديث تقبله قال لا والله إني رأيته يحدث عن جماعة بالحديث الواحد ولا يفصل كلام ذا من كلام ذا-سير(٤٦/٧

وقال أحمد(وأما ابن اسحاق فيكتب عنه هذه الأحاديث -يعني المغازي ونحوها-فإذا جاء الحلال والحرام أردنا قوماً هكذا- قال أحمد ابن حنبل-بيده وضم يديه وأقام (الإبهامين)تاريخ ابن معين(٥٠٤/٢-٥٥

[وقال الذهبي في السير(٧/٤١)[وأما في أحاديث الأحكام فينحط حديثه فيها عن رتبة الصحة إلى رتبة الحسن إلا فيما شذ فيه،فإنه يعد منكراً

وقال الذهبي في العلوص٣٩ [وابن اسحاق حجة في المغازي إذا أسند وله مناكير وعجائب] ا هـ

---

## پرسیاره بێ وەلأمەكان ژماره :سەد و حەفتا وشەش

## هەموو گومانەكانی اصحاب الكهف












گاورەكان دەڵێن چیرۆكی اصحاب الكهف درۆیە و لە مەسیحیەكان دزیویانە و كاتێك دقلدیانوس حاكمی ڕۆم مەسیحیەكانی دەچەوساندەوە كۆمەڵێك رایان كرد لە زوڵم و قورئانیش باسی ئەو كەسانە دەكات . وە دەڵێن چیرۆكێكی تری یۆنانی هەیە بەناو نیشا نی ( ٧ نوستوەكە ) لەو چیرۆكەوە موسوڵمانیش وەری گرتووە هەروەها ژمارەی كەسەكان چەند بووە لەو ئەشكەوتەدا نەزانراوە هەروەها جبرائیل ناچێتە ماڵێكەوە كە سەگی تێدا بێت چۆن چووە ئەو ئەشكەوتەوە ئەو گەنجانەی ئەم دیوو ئەو دیوو دەكرد ؟ بۆ وەڵامی ئەم گومانە دەبێت شیكاری بكەین بزانین ئەم ئایەتە باسی چی دەكات ؟ ڕیوایەتەكان دەڵێن موشریكەكانی قورەیش چوون بۆ لای جولەكە كانی مەدینە لێیان پرسیون شتیان پێ بڵێن لە تەوراتدا هەبێت . ئەوانیش لە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم ) بپرسن بۆ ئەوەی تاقی بكەنەوە بزانن بە ڕاستی پێغەمبەرە یان نا ؟ وە ئەوانیش باسی اصحاب الكهفیان پێ گوتوون .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گاور و مەسیحیەکان کە ئەو نوسخەیەی تەوراتی جولەکەکانی مەدینە باسی اصحاب الكهفی تێدا بووە و ئێستا لا براوە

پاشان دەڵێن لە کتێبێکی یۆنانیەوە وەرگیراوە . منیش دەڵێم ئەگەر ڕاست دەکەن پێمان بڵێن ئەو کتێبە کەی نوسراوە و نوسەرەکەی کێیە و ساڵی چەند نوسراوە ؟ ئایا لە جزیرەی عەرەبیدا هیچ کەسێکی لێ بووە بزانێت یۆنانی بخوێنێتەوە یان بنوسێت بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە لە قورئاندا دا بنرێت ؟ پاشان ئەگەر لە کتێبی یۆنانیەوە وەر بگیرایە دەبوایە ژمارە ی کەسەکانی اصحاب الكهف دیاری بکرانایە لە قورئاندا بنوسرایە (٧) کەس بوون . بەڵام لە قورئادا دەڵێت نازانرێت چەند کەس بوون ؟ چونکە قورئان وەك تەورات نییە باسی ساڵ و ناوی کەسەکان و ژمارەی کەسەکان بکات و ببێت بە کتێبێك بۆ ناساندنی خەڵکی و ناوەکانیان وەك لە تەوراتدا هەیە . وە قورئان هەمیشە باسی ناوەڕۆك و ئەسڵی بابەتەکان دەکات بۆیە خودای زانا دەفەرموێت **( فلا تمار فيهم الا مراء ظاهرا )** واتا مجادەلە و مناقشەی ئەو شتە مەکەن چونکە گرنگ نییە چەند کەس بوون . وە کاتی خۆشی موشریکەکانی قورەیش کێشەیان نەبووە لەسەر ئەوەی اصحاب الكهف چەند کەس بوون ؟ بەڵکو گرنگ ئەوە بووە کاتێك ئەوان پرسیاریان لە محمد (صلى الله عليه وسلم) کردووە زانیویتی باسی چی دەکەن و چیرۆکەکەی بۆ گێڕاونەتەوە . پاشان ئەو شتانە هیچ سودی نییە بۆ ئاین بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەگەر شوێنەکەیان دیاری بکرایە خەڵکی چەندەها قسەیان دەکرد و بۆ نموونە دەیان گوت ئەو ناوچەیە ئازادیی ڕا دەربڕینی تێدا نەبووە یان زۆر شتی تریش یان ئەگەر زەمانەکەیان دیاری بکرایا دەیان گوت ئێستا ئەو زەمانە بەسەر چووە ؟ ئەگەر ژمارەکەیان دیاری بکرایا هەزارەها چیرۆك و خورافاتیان لەسەر ئەو ژمارەیە دروست دەکرد بەناوی ئیعجازی ژمارەی لە قورئاندا . بۆیە قورئان هەمیشە باسی ناوەڕۆکی کردووە بە بێ گوێ دانە کات و شوێن و ژمارە . و ئەو شتانەی باس نەکردووە بەڵکو پەند و عیبرەتی باس کردووە لە ڕوداوەکاندا پاشان ئەم ئایەتانەی سورەتی الكهف ڕاست گۆیی قورئان و پەیام بەرەکەی دەردەخات نەك نەزانی و بێ ئاگاییان بەرامبەر بە ڕوداوەکان ؟ وە دەقەکان دەڵێت گرنگ نییە چەند کەس بوون چونکە جەماعەتی کافرەکانی قورەیشیش نەیان زانیووە اصحاب الكهف چەند کەس بوون و جولەکەکانیش نەیان زانیووە چەند کەس بوون بەڵگەشمان دەقی ئایەتە کەی ژمارە ٢٢ خۆیەتی دەفەرموێت : (**سيقولون ثلاثة رابعهم كلبهم و يقولون خمسة سادسهم كلبهم رجما بالغيب و يقولون سبعة ثامنهم كلبهم**).

وە ئەگەر جولەکەکان ژمارەکەیان بزانیایە بە موشریکەکانیان دەگوت بۆ ئەوەی بزانن ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەزانێت چەند کەس بوون یان نا ؟ وە ئەو کات دەیان کرد بە بەڵگە بەسەریەوە دەیان گوت پرسیارمان لە محمد (صلى الله عليه وسلم) کردووە نەی زانیوە اصحاب الكهف چەند بووە ؟ بۆیە ڕاست ناکات و وەحی بۆ نایەت لای خوداوە و ئەو قورئانەی بۆتان باس دەکات قسەی خۆیەتی . فەرموون ئەوە جولەکەکان بڕۆن لێیان بپرسن بزانن اصحاب الكف چەند کەس بوون ؟

وە محمد (صلی الله علیه وسلم) نەی زانی چەند اصحاب الکهف چەند کەس بوون کاتێك پرسیارمان لێ کرد ، بەو شێوەیە دەتوانرا ئاینی ئیسلام و قورئانیش پوچەڵ بکرێتەوە لەناو مەکەدا . وە ئەو کاتە کاریگەریی ئەو ڕەخنەیە زیاتر دەبوو نەك ئێستا بڵێێت خودای قورئان نەی زانیووە اصحاب الکهف چەند کەس بوون ؟ چونکە ئایەتی دوای ئەو ژمارە ٢٣ و ٢٤ قسەی کاکی گاور لەم زەمانەدا بە درۆ دەخاتەوە دەفەرموێت ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مەڵێ من سبەینێ فلاَن کار دەکەم ؟ یان فلاَن شت دەکەم ئیلا ئەگەر ویستی خودای تێدا بێت . وە ئەگەر ئەم قورئانە محمد (صلی الله علیه وسلم) خۆی نوسیبێتیەوە دەی توانی هەر لە خۆیەوە ژمارەیەك بدات بۆ ئەوەی جولەکەکان بە درۆ بخاتەوە ؟ وە لەو کاتەدا کە کافرەکانی قورەیش و جولەکەکان

داوای بەڵگەی لێ دەکەن ئەگەر بڵێت من ناتوانم لە خۆمەوە شت بڵێم ئەوە دەبێت بە خاڵی لاوازی وە بەرامبەر دەتوانێت ئەو خاڵە بقۆزێتەوە .

خاڵی کۆتایشمان ئەمەیە : زۆر جار ڕەخنە دەگرن لەوەی دەڵێن ئەم ئایەتە زۆر هەزەلییە لە قورئاندا نوسراوە **(سیقولون ثلاثة رابعهم کلبهم و یقولون خمسة سادسهم کلبهم رجما بالغیب و یقولون سبعة و ثامنهم کلبهم)** . منیش دەڵێم ئەوە جەنابتیت هەزەلییت و لە دەقەکان تێ ناگەیت ؟ ئەو قسانە هی جولەکەکانی مەدینەیە کە بە کافرەکانی برا گەورەکانی قورەیشی ئێوەیان گوتووە چونکە دەقەکە ڕوونە دەڵێت ( **سیقولون وە یقولون** ) واتا ئەوان وا دەڵێن نەك خودا یان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وە قورئانیش وەلامیان دەداتەوە دەڵێت ئەو ژمارانە هێندە گرنگ نین بۆخۆتان چی دەڵێن بیڵێن . ئێستا زانیت کێ هەزەلییە کاکی نەخوێندەوار ؟

**هەروەها** دەڵێن باشە جبرائیل ناچێتە شوێنێکەوە سەگی لێبێت . چۆن دەچووە ئەو ئەشکەوتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانە ئەم دیو ئەو دیو بکات ؟ منیش دەڵێم بێرەحمەت پێمان بڵێ چۆنت زانی جبرائیل ئەو کەسانەی ئەم دیو ئەو دیو دەکرد ؟ فەرموو بەڵگەمان بۆ بهێنە پاشان کاکی ڕەخنەگر لە ئایەتەکەدا نوسراوە **(وکلبهم باسط ذراعیه بالوصید** ) وەصید مانای چییە ؟ ئایا تۆ دەزانیت الوصید بە مانای دەرگا دێت ؟ وە بە هەموو پێوەرێك ئایەتەکان بخوێنەوە ئەو سەگە لەبەردەم دەرگاکەدا بووە نەك لە ناو ئەشکەوتەکەدا وە شوێنی دەرگا یان دەروازەی چونە ناوەوەی هەر جێگایەك لە زمانی عەرەبیدا وەصیدە . بۆیە خودای زانا لە قورئاندا لە وەسفی جهنمدا دەفەرموێت **(إنها علیهم مؤصدة)** واتا دەرگاکانیان لێ داخراوە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی وصید جێگای دەرگایە لەوانەیە کەسێکمان لێ پەیدا ببێت بڵێت باشە ئێوە ڕاست ناکەن ئەوە کتێبی پیرۆز و پەیمانی کۆن تورات ی جولەکەیە پێمان بڵێ لە کوێدا باسی اصحاب الکهف کراوە ؟ منیش دەڵێم برۆ بگەرێ بزانە ابوکریفا چییە ؟ ابوکریفا واتا ئەو کتێبانەی لە تەوراتدا لا براون و دەڵێن قسەی خودا نییە و هاتوتە ناو تەوراتەوە و یەك و دوان نییە بەڵکو بە سەدە ها کتێبن .

## پرسیاره بێ وەڵامەکان ژماره :سەد و حەفتا وحەوت

## ئایا قازی یحیا نێرباز بوو ؟



زۆر جار دژه ئیسلامەکان دەڵێن کاری دوو دەگێتی و نێربازی له ئیسلامدا حەڵاڵە وه نموونه به قازی یحیا یان به یحیای کوڕی اکثم دەهێننەوه . دڵنیام زۆربەتان ئەم ناوەتان نه بیستووه و نازانن کێیه ؟بۆیه بۆتان باس دەکەم بۆ ئەوەی ئێوەش ئەم پیاوه بەڕێزه بناسن و بزانن بۆچی به دودەگێ ناو براوه ؟ بۆ ئەوەی وەلامی دژه ئیسلامەکان بدەنەوه به بەڵگەوه . چونکه کابرای دژه ئیسلامیش خۆی نازانێت یحیای کوڕی اکثم کێ بووه و کەی ژیاوه و کاری چی بووه ؟ وه هەموو کەس دەزانێت کاری نێربازی له ئاینی ئیسلامدا حەرامه . کەواتا کەسێك بکرێت به قازی واتا دادوەر چۆن نازانێت ئەو کاره حەرامه ؟ وه چۆن دەکرێت به دادوەر له خیلافەتی مەئمونی کوڕی هارون الرشیددا ؟بەڕێزان مامون کوڕی هارون الرشید بوو دایکی فارس بوو دایکی بەسەر مەئمونەوه مرد و به بێ دایك گەوره بوو . وه مامون زۆر به لای فارسدا لای دەدا و زۆری خۆش دەویستن چونکه دایکی فارس بوو وه نەی بینی بوو بۆیه له خیلافەتی ماموندا فارس و شیعه زۆر له دەوری خەلیفه کۆ بوبونەوه و دەسەڵاتی بەرزیان هەبوو له دەوڵەتدا . وه یەکێك لەو قازیانەی که راوێژکار و قاضي القضاتي ئەو سەردەمه بوو واتا وەزیری عەدلی ئێستا دەکات . ناوی احمد بن داود بو فارس بو شیعەی ڕافیزه بوو زۆر شتی له دەوڵەتدا حەڵاڵ کرد بوو . وەك المتعة و زۆر شتی تری . کاتێك مامون نازناوی یحیای بن اکثمی بیست چەند شارەزایه له ئاینی ئیسلامدا نزیکی خستەوه له خۆی وه قەناعەتی به قسەکانی قازی یحیا کرد که متعة و ئەو یاسایانه له ئاینی ئیسلامدا بونی نییه مەئمون احمد بن داودی دەرکرد و یحیای بن اکثمی خسته جێگای وه بوو به قاضي القضاة واتا وەزیری عەدل

بە شەرتێك قازی یحیا تەمەنی (٢٠ ) ساڵ بووکە کرا بە وەزیری عەدل . وە شیعەکانیش ڕقیان لێ هەڵ گرت و ئەو تۆمەتەیان بۆ دروست کرد کە دەڵێنە نێرباز و دودەگی بوە وە خۆشتان دەزانن لە دونیای ئێستاشماندا ئەگەر کەسێك دودەگی بێت لە پلەی وەزیری لای دەبەن تەنانەت لە امریکاش ئەی چۆن خیلافەتی ئیسلامی ڕێگا دەدات بە دودەگیەك ببێت بە وەزیری عەدلی خیلافەت ؟ بۆیە ئێوەش بزانن کە سەرچاوەی ئەم گومانە شیعەی ڕافیزەن . لەگەڵ براکانی شیعە کە معتزلەن چونکە لە زەمانی مائمون فیتنەی ئەوە هەڵ گیرسا ئایا قورئان بە تەنها کەلامی خودایە یان مخلوقە ؟ وە هەمووومان دەزانین ئیمامی احمدی کوڕی حەنبەل ڕۆڵی مەزنی هەبوو لەو فیتنەیەدا و دەی گوت قورئان کەلامی خودایە و مخلوق نییە وە زۆر ئازاری چێشت وە زۆر سزا درا لەسەر ئەو هەڵوێستەی . وە قازی یەحیاش پشت گیری احمدی کوڕی حنبلی دەکرد بۆیە مەئمون لە وەزارەت لایدا و دەری کرد . پاش ئەوەی بۆ مائمون ڕون بووەوە احمدی کوڕی حنبل ڕاست دەکات پەشیمان بووەوە لە هەڵوێستەکەی و قازی یحیاشی گەڕاندەوە بۆ دەسەلاتی خۆی .

وەمعتزلەش بە هەمان شێوە دوژمنی احمدی کوڕی حنبل و قازی یحیان و معتزلەش دەڵێن یحیای کوڕی اکثم دودەگی بووە و هەموو ئەو سەرچاوانەیئەم پیاوە بەڕێزە لەکە دار دەکەن شیعە و معتزلەن ، وە ئێستا ئەو کەسانەی داوای مافی مرۆڤ و ئازاد یی سیکسی دەکەن بۆ ئەوەی لە ڕووی ئاینییەوە حەلاڵی بکەن دەڵێن لە ئیسلامیشدا دودەگێتی هەیە و قازی یحیا یەکێکە لەوانە کاتێکیش ئێمە داوای سەرجاوەیان لێ دەکەین یان لە کتێبی شیعە یان معتزلە بەڵگەکانمان بۆ دەهێنن . هیوادارم ئێوەش ئەم پیاوە بەڕێزە بناسن و لە هەر شوێنێك ئەمیان کرد بە بەڵگە بۆ نێربازی ئێوەش زانیاریتان هەبێت وەلام بەرامبەر بدەنەوە . کۆتایی باسەکەشم بە یەکێك لەو فیتنە و دژایەتیانە دەهێنم کە ڕو بە ڕوی بووەوە کاتێك کرا بە وەزیری عدل قاضي القضاة معتزلة و شیعة ویستیان بچوکی بکەنەوە و بە منداڵ بیدەن لە قەڵەم کە هێشتا منداڵە و هیچ نازانێت ؟ چونکە وەك گوتمان (٢٠ )ساڵان بوو کە کرا بە قاضي القضاة . سەیری وەلامی ئەم پیاوە بکەن چەند ژیرانە وەلامی بەرامبەری داوەتەوە بۆ پلە و پایەی لەو تەمەنەدا پێیان گوتووە : تەمەنی ئەو وەزیرە چەندە ؟ ئەویش دەڵێت

**(من گەورەترم لە عتابی کوڕی اسید کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردی بە والي مەکە . وە گەورەترم لە معاذی کوڕی جبل کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردی بە قازیی یەمەن . وە گەورەترم لە کعبی کوڕی سور کاتێك عومەر کردی بە قازیی بەصرە)**

تێبینی : کە دەڵێت گەورەترم مەبەستی گەورەیی تەمەنە واتا لەوان بە تەمەن ترم . کەچی ئێستاش کابرا دەبێت بگاتە (١٨) ساڵ ئینجا دەڵێن گەورە بووە . لە کاتێکدا ئەو پیاوە بەڕێزانە زۆر لە تەمەنی بچوکدا دەسەڵاتی مەزنیان هەبووە

# پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و حەفتا وهەشت

## خواردنەوەی میزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

حەدیسێك هەیە لە زمانی ام ایمنەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت : پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شەو هەستا بو میز بکات وە کردبویە شەربەیەکەوە لە تەنیشت ماڵەکەی خۆی دای نا بووە. منیش شەو هەستام تینوم بو دەمم پێوەنا و خواردمەوە بەیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە خەو هەستا گوتی ام ایمن برۆ ئەو میزە برژە . منیش گوتم وەڵا شەو هەمویم خواردەوە . ئەویش پێکەنی و گوتی لەمەودوا قەت سکت نا ئێشێت یان ژان ناکات !؟ لێرەدا حەدیسە کە تەواو بوو .

وەك دەزانن ئەو حەدیسانەی نوسراون لە ڕێگای کەسەکانەوە نوسراون کە گێڕاویانەتەوە و پێی دەڵێین سند . وە ئەو کەسانەی ئەم حەدیسانەیان گێڕاوەتەوە : أبي مالك النخعي لە الأسود بن قيس بیستویەتی وە نبيح العنزي لە ام ایمنەوە بیستویەتی

.وە ئەم حەدیسە ئەمانە نوسیویانە : الحاكم في لە مستدركدا ( ٤ / ٧٠ ) وە أبو نعيم في لە الحلية دا ( ٢ / ٦٧ ) وە الطبراني لە الكبير دا ( ٢٥ / ٨٩ ، ٩٠ ) وە ابن دقيق العيد لە الامامدا (٣٨٦/٣ ) وە هیثمي لە مجمع الزوائددا (٢٧٤/٨) وە زۆر کتێبی تریش نوسیویانە و هەر هەمویان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم حەدیسە لاوازە و ڕاست نییە و درۆیە لەبەر دو هۆکار .

**یەکەمیان** : نبيح العنزي دەڵێت لە ام ایمنەوە بیستویەتی وە نبیح لە زەمانی ام ایمندا نە ژیاوە . چۆن ئەو حەدیسەی لێ بیستووە ؟

**دووەمیان** : ئەم حەدیسە ئاخر کەس ابو مالك النخعي گێڕاویەتیەوە کە ناوی ڕاستیی خۆی عبدالملك بن حسينە وە هەموو نوسەرەکانی حەدیس کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم کابرایە درۆزنە و قسەکانی هیچ نییە و هیچیان حەدیسیان لێ وەر نەگرتووە

بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان خۆتان دەتوانن ئەم بەشەی پێشەکیی حەدیسەکە کۆپی بکەن و لە بەشی گەڕانی ماڵ پەڕی حەدیسدا دای بنێن:

(قام رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم من الليلِ إلى فَخَّارَةٍ في جانِبِ البيتِ فبالَ فيها فقُمْتُ منَ الليلِ وأنا ،عطْشَانَةٌ فشَرِبْتُ ما فِيها)

وە ببینن هەر هەموو حەدیسەکان کە نوسراوە ئەو ڕیوایەتەیان ڕەفز کردوەتەوە چونکە ابو مالك النخعى یەکێکە لەو کەسانەی گێڕاویەتیەوە و کەس متمانەی بە قسەکانی نە کردوە و نبیحیش لە زەمانی ام ایمن دا نەژیاوە و نەی بینیوە لەوانەیە کەسێك بپرسێت ئەی ئەگەر دەزانن درۆزنە بۆچی قسەکانیتان نوسیوەتەوە ؟ منیش دەڵێم ئەمە گەورەی و عەزەمەتی ئاینی ئیسلامی مەزنە کە زاناکانمان بە ڕاست گۆییەوە ڕوداوەکانیان بۆ گێڕاوینە تەوە و وەك خۆی بۆیان نقل کردوین لە هەمان کاتیشدا ڕون کردنەوەیان داوە بۆ ئەوەی خەڵکانی دوای خۆیان چەواشە نەبن و درۆزن و ڕاست گۆ بناسن و بزانن چی قسە و حەدیس و ڕیوایەتێك ڕاستە و چی درۆیە !؟ وە خیانەتیان نە کردوە لە خۆیان و لە گەیاندنی زانستەکەیان کە عیلمی حەدیسە . وە دەتوانرا ئەو قسە درۆیانە نە گوێزنەوە بۆمان و لای بەرن !؟ بەڵام لەبەر ورع و تەقوا و ترسیان لە خودا بۆ گەیاندنی ئەو حەدیسانە نەهاتون نەی نوسنەوە یان

بزری بكەن وەك چۆن جولەكە و مەسیحیەكان هاتون ئەسڵی ئاینەكەیان شاردوەتەوە و لایان بردووە !؟ بەڵام لێرە و لەوێ مەلا و موسوڵمانی نەزان و نە شارەزا دێن ئەو ڕیوایەتانە دەگێڕنەوە . ئەوە نابێت بە ڕەخنە لەسەر ئاینی ئیسلامی مەزن !؟ چونكە ئەسڵی ڕیوایەتەكان بە بێژنگ دراوی و پوختەی هەیە لە كتێبەكانماندا بەڵام كابرا نە شارەزایە و بەبێ لێكۆڵینەوە نەقڵی دەكات ئەوە خەتای نەشارەزایی كەسەكەیە !؟ نەك هەڵە بێت لە ئاینی ئیسلامی مەزندا !؟ چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مرۆڤ بووە وەك من و تۆ پیسای و میزی پیس بووە و هیچ حەدیسێك یان ڕیوایەتێك نیی بڵێت میزەكەی بخۆنەوە !؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەكان ژمارە :سەد و حەفتا و نۆ

## كوێرێك بۆچی عصماء بنت مروان دەكوژێت

یەكێكی تر لەو حەدیسانەی كە دەڵێن ئافرەتێك جنێوی داوە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كوشتویانە ئافرەتێكی جولەكەیە ناوی عصمائی كچی مەروانە) . با بزانین متنی حەدیسەكان چی دەڵێن ؟ ئافرەتێكی جولەكە هەبووە قسەی بە پێغەمبەر دەگوت (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی ئەو جنێوانە گەیشت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتی كێ دەتوانێت ئەو ئافرەتەم بۆ بكوژێت ؟ عمیر ی كوڕی عودەی ( كوێر ) بوو گوتی من دەی كوژم . ڕۆشت بۆ ناو بازاڕ وە عصماء خورما فرۆش بوو عمیر سەیری خورماكەی كرد گوتی ئەم خورمایە باش نییە هی باشترت لایە ؟ عصماء گوتی بەڵێ بردیە ناو دوكانەكەوە سەری دانا بو بۆ ئەوەی خورماكەی نیشان بدات . عمیریش سەیری ئەم لا و ئەو لای كرد كەس دیار نەبوو پنەیەكی نان كردنی بینی دانرابوو هەڵی گرت و دای بە سەریدا و كوشتی . پاشان گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە گوتی ئایا هیچ سزایەكم دەدەیت ؟ ئەویش گوتی نەخێر !؟ بە ڕاستی بەڕێز ئەمە گاڵتە جاڕییە نەك حەدیس چونكە كابرا كوێرە چۆن زانیی خورماكەی باش نییە ؟پاشان چۆن لەناو دوكانەكەدا پنەی نانەكەی بینی وە بۆچی سەیری ئەم لا و ئەو لای كرد بزانێت كەس دیار نیە ؟ خۆ كابرا كوێر بووە ئیتر بۆچی سەیری ئەم لا و ئەو لا دەكات ؟ بە ڕاستی ئەمە گاڵتە جاڕییە و خۆشتان تێ دەگەن ئەمە قسەی منداڵانیش نییە نەك حەدیس ؟هەروەها ئەم حەدیسە بەم شێوەیە گێڕراوەتەوە عصمائی كچی مروان كە ژنی یزیدی كوڕی زید بووە زۆر جنێوی دەدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كاتێك لە شەڕی بەدر بوون . عمیری كوڕی عدي كە كوێرە دەڵێت نەزرم كردوە ئەگەر موسوڵمانەكان بگەڕێنەوە عصماء دەكوژم . شەو بووە چووە بۆ ماڵی عصماء وە دەستی داوە لە ژنەكە زانیوێتی منداڵێكی شیرە خۆرە لەسەر سنگێتی منداڵەكەی لا بردوە و شمشێری كردوە بە سكی ژنەكەدا لە پشتیەوە دەر چووە بۆ بەیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بینیوێتی پێی گوتووە عصمائت كوشت ؟ ئەویش بە ترسەوە گوتویەتی بەڵێ . پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) گوتویەتی هیچت لێ ناكرێت وە سەیری هاوەڵانی كردووە گوتویەتی ئەگەر بتانەوێت كەسێك ببینن كە خودا و پێغەمبەرەكەی سەر خستووە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاگای

لەو کارە نەبووە . سەیری ئەم پیاوە بکەن . ئەمەش بە هەمان شێوە یاریی منداڵانەیە و کەسێکی کوێر چۆن دەتوانێت بچێتە ماڵێکەوە نەی بینی بێت و سارەزای نە بێت چاو ساغ ناتوانێت بچێتە ماڵێکەوە بۆ کوشتنی کەسێك کە شارەزای نە بێت و لەمەو پێش نەی بینی بێت ئێستا چۆن کوێرێك ئەو کارەی کرد ؟ لە کاتێکدا کوێر دەست دەدات بە شتدا ئینجا دەزانێت چی لە ژێر دەستیدایە ؟ حەدیسەکەش دەڵێت بە دەستە کوتێ زانیوێتی منداڵێك لەسەر سنگێتی و لای بردووە ئینجا کوشتوێتی . بە ڕاستی ئەمەش گاڵتە جاڕییە نەك حەدیس و بە هەموو پێوەرێك هەر کەس باوەڕی پێ بکات نەخۆشە یان کاڵ فامە بەڵێ بەڕێزان بۆیە ئەو ئیمامە بەڕێزانەی ئەو حەدیسانەیان نوسیوەتەوە گاڵتەیان بەو قسانە هاتووە ؟ بەلام وەك ئەمانەتی عیلمی نوسیویانەتەوە . بۆیە دەبینین کەسێکی نەزانمان لێ پەیدا دەبێت دەڵێت ئەوەتا لە کتێبەکانی خۆتاندا ئەم شتانە نوسراوەتەوە یان مەلای نەزانمان زۆرە دەڵێت ئەوەتا لە فلانە کتێبدا نوسراوەتەوە و لەسەر مینبەر بۆ خەڵکیی باس دەکات وە کابرای دژە ئیسلامیش نەزانیی مەلاکە دەکات بە بەڵگە بەسەرمانەوە !؟ وە هەردووك نەزانی مەلا و دژە ئیسلامیش کابرای معتزلة و قورئانیش لەولاوە بوەستێت بە نەزانی و نە خوێندەواریی خۆیان دەڵێن ئەو کتێبانە دەبێت نەمێنن چونکە هەڵەی تێدایە . بەڵام هەر هەمویان هیچیان بە دواداچونیان بۆ نەکردوە کە ئەو حەدیسانە و ئاستی نەزانیی خۆیان دەر دەخەن چونکە ئە حەدیسە و حەدیسەکانی تر لێکۆڵینەوەی بۆ کراوە و لەگەڵ حەدیسەکاندا دەرەجەی حەدیسەکە نوسراوە و بۆچی ئەو حەدیسە ڕاستە یان درۆیە ؟ بۆ حەدیسی خورما فرۆشەکە بوخاری دەڵێت ئەو حەدیسە ئیسنادەکەی باطلە واتا پوچەڵە و قسەی خەڵکە و دروست کراوە چونکە محمدی کوڕی حجاج گێڕاویەتیەوە حەدیسی لێ وەر ناگیرێت وە ابن معین دەڵێت : درۆزن و موخەنەتە ار قطنی دەڵێت درۆزنە و متمانەی پێ ناکرێت وە ابن عدي دەڵێت محمدی کوڕی حجاج خۆی ئەو حەدیسەی دروست کردووە ابن الجوزي و البانیش هەمان ڕایان هەیە و دەڵێن خۆی ئەو حەدیسەی دروست کردوە . کەواتا زانایا نی حەدیس دەزانن کە ئەو حەدیسە قسەی محمدی کوڕی حجاجە نەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) !؟

بۆ حەدیسی دووەمیشیان کە دەچێت بە شەو بیکوژێت واقدی گێڕاویەتیەوە بزانین زانایانی حەدیس چی دەڵێن دەربارەی واقدي ؟ ئیمام احمد دەڵێت اسنادەکەی بچر بچڕە واتا ئەو کەسانەی حەدیسەکەیان گێڕاوەتەوە لەو زەمانەدا نەژیاون . هەروەها واقدی درۆزنە و قسە هەڵ دەگێڕێتەوە ابن معین دەڵێت باوەڕ پێکراو نیە . مرة دەڵێت حەدیسەکانی نا نوسرێتەوە . بوخاری دەڵێت گوێ لە قسە ی نا گیرێت . ابو حاتم و نسائی دەڵێن خۆی حەدیس دروست دەکات . با بابەتەکە دوور و درێژ نەبێتەوە هەموو زانایانی حەدیس واقدي بە درۆزن لە قەڵەم دەدەن و حەدیسیان لێ وەر نە گرتووە . بەڵام دژە ئیسلامەکان نە خوێندەوارن و دەڵێن موسوڵمانەکان هەر شتێکیان بە دڵ نەبێت دەڵێن زەعیفە . بەلام کابرای دژە ئیسلام ڕادەی ئەقڵ و تێگەیشتنی زەعیفە و هەر نوسراوێك ببینێت دەڵێت ئەوەتا لە کتێبی خۆتاندا نوسراوە . لەگەڵ ئەوەشدا دژە ئیسلامی وەك قورئانی و معتزلە لە بێدینەکە خراپ تر و نە خوێندەوار ترە و دەرەجەی ڕاستیی حەدیسەکە و هۆکاری نا ڕاستیەکەی نا خوێنێتەو و داوا دەکات کتێبە ئیسلامیەکان

نەمێنن . وە ئاستی نەزانیی دژە ئیسلامەکان لەوەدایە کە ئەم حەدیسانە و حەدیس گێڕەوە و ئەوانەی نوسیویانە بە ئەمانەتێکی زۆرەوە ئەم حەدیسانەیان پێ گەیاندوین و ڕاست و درۆیان پێکەوە نوسیووە و هۆکاری ڕاست و درۆکەشیان بۆ نوسیوین بەڵام نە خوێندەواری و ئاستی نەزانیی بەرامبەر وای کردوە دژایەتیی سونەی سەروەرمان بکات .

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا

## ئاخر زەمان نایەت هەتا ئەو منداڵە پیر نەبێت

يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّـهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿الأحزاب: ٦٣﴾

إِنَّ اللَّـهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴿لقمان: ٣٤﴾

إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ السَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَاتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا ﴿فصلت: ٤٧﴾

سمعتُ النبيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يقول ، قبل أن يموتَ بشهرٍ " تسألوني عن الساعةِ ؟ وإنما عِلمُها عند اللهِ . وأقسمُ باللهِ ! ما على الأرضِ من نفسٍ منفوسةٍ تأتي عليها مائةُ سنةٍ " الراوي : جابر بن عبدالله | المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم الصفحة أو الرقم: 2538 | صحيح

أرأيتكم ليلتكم هذه، فإن رأسَ مائةٍ لا يَبقى ممن هو اليومَ على ظهرِ الأرضِ أحدٌ . فوَهِل الناسُ في مَقالةِ رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم إلى ما يتحدَّثون من هذه الأحاديثِ عن مائةِ سنةٍ، وإنما قال النبيّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم : لا يَبقى ممن هو اليومَ على ظهرِ الأرضِ، يُريدُ بذلك أنها تخرِمُ ذلك القَرنَ الراوي : عبدالله بن عمر | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم: 601 | خلاصة حكم المحدث : [صحيح

عن انس؛ ان رجلا سال رسول الله صلى الله عليه وسلم: متى تقوم الساعة؟ وعنده غلام من الانصار، يقال له محمد. فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم "ان يعش هذا الغلام، فعسى ان لا يدركه الهرم، حتى تقوم الساعة
( صحيح مسلم باب قرب الساعه )٢٩٥٣
ئەوە ١٤٠٠ ساڵ تێپەڕ بو هێشتا ئاخرزەمان نەهاتوە و ئاشیەت تۆ بڵێی ئەو منداڵە هێشتا پیرنەبوبێت ؟




حەدیسێکی صحیح هەیە بە زۆر شێوە گێڕراوەتەوە یەکێك لە شێوەکانی دەفەرموێت پرسیاریان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد کەی ( ساعة ) یە ؟ ئەویش فەرمووی ساعة نایەت هەتا ئەو منداڵە پیر نەبێت !؟ وە دژە ئیسلام دەڵێن ئەوە ١٤٠٠ ساڵە ئاخر زەمان نە هاتووە و ئایا ئەو منداڵە تا ئێستا پیر نە بووە بۆ ئەوەی ئاخر زەمان بێت !؟ لە وێنەدا لە خوارەوە دەقی حەدیسەکە و ڕەخنەی دژە ئیسلامیشمان داناوە بۆتان وەك خۆی بەڕێزان وەك دەزانن ( الساعة ) زۆربەی خەڵکی بە ئاخر زەمانی لێك دەدەنەوە ئەوەش ڕاستە و الساعة واتا ئاخر زەمان . کەواتا خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) بۆچی دەڵێت هەتا ئەو منداڵە پیر دەبێت ئاخر زەمان دێت ؟ لە کاتێکدا الساعة واتا ئاخر زەمان

پێشەکی با بزانین پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاخر زەمانی زانیوەھ کەیە ؟ لە سورەتی **الاحزاب** ٦٣ دا دەفەرموێ خەڵکی لێت دەپرسن لە کاتی ئاخر زەمان تۆش پێیان بڵێ ئەو شتە خودا دەیزانێت . لە سورەتی **لقمان** ٣٤ دا دەفەرموێت کاتی ئاخر زەمان خودا دەیزانێت . لە سورەتی **فصلت** ٤٧ دا کاتی ئاخر زەمان لای خودایە . لە سورەتی **طه** ١٥ خودا بە موسا دەفەرموێت ئاخر زەمان دێت بەڵام شاردراوەیە و کاتەکەی نەزانراوە وەك دەبینین ئایەتەکانی قورئان هەمووی دەڵێن ( الساعة ) ئاخر زەمان بەس بە تەنها خودا دەیزانێت . کەواتا ئەگەر الساعة بەس بە تەنها بە مانای ئاخر زەمان بهاتایا بە دڵنیاییەوە ئەو ( ٤ ) ئایەتە بەس بوو بۆ کافرانی قورەیش و منافقەکان ئەو قسەیەی پێغەمبەر ی (صلی الله علیه وسلم) کە ئیسلامی پێ پوچەڵ بکەنەوە بۆچی قورەیش نەیان توانی ئەو کارە بکەن ؟ لەبەر ئەوەی کابرای قورەیشی و دژە ئیسلامەکانی ئەو زەمانە وەك دژە ئیسلامی ئێستا نەزان نەبوون و زانیویانە ( الساعة ) بە مانای مردنیش دێت وە جیاوازیی نێوان هەردووك ساعة کەیان زانیووە،هەروەها حەدیسی زۆر هەیە خۆتان دەتوانن بگەڕێن باس لەوە دەکات ( اعرابیەکان ) واتا عەرەبە دەشتە کییەکان کە لە بیابان بوون هەمیشە دەهاتن بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و یەکەم پرسیاریان دەربارەی ئەوە بوو ( متی الساعة ) ؟وە ئەم حەدیسەش کە ڕەخنەی لێ دەگرن پرسیاری لێ دەکەن ( متی الساعة ؟ ) لە وەڵامدا دەفەرموێت ئێوە یان تۆ نامریت هەتا ئەو منداڵە پیر نەبێت . وە مردنیش پێی دەڵێن الساعة الصغری وە ئاخر زەمانیش پێی دەڵێن الساعة الکبری وە کابرای عەرەب باش تێگەیشتووە لە الساعة و ئەو حساباتانەی زانیووە چونکە دەزانن الساعة بە مانای ١٠٠ ساڵیش دێت واتا قەرنێك . وە ئەو منداڵە لەوانەیە ١٠٠ ساڵ بژی ؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە حەدیسێك دا لە وێنەکەدا یەکەم حەدیسە دامان ناوە پێش ئەوەی بمرێت دەفەرموێت لێم دەپرسن ئاخر زەمان کەیە ؟ ئەوە بەس عیلمی لای خودایە و ئەو دەزانێت . وە سوێند دەخۆم بە خودا هیچ نەفسێك ناگاتە ١٠٠ ساڵ . ئەمەش بە مانای ئەوە دێت مرۆڤ و نفسی بەشەر دەگاتە ١٠٠ ساڵ و دەمرێت دیقەت بدەن لەم حەدیسەدا باسی ئاخر زەمان و مردن و ١٠٠ ساڵەکەی کردوە پێکەوە . ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کابرای عەرەب لە زمانی خۆی تێگەیشتووە و زانیوێتی ( الساعة ) چییە ؟ نەك وەك دژە ئیسلامی ٢٠١٥ نەزان بێت هەر لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێت : لەم شەوەی تێیدان هەتا ١٠٠ ساڵی تر کەس نامێنێت لەسەر ئەم زەوییە .

واتا قەرنی تازە دێت و ئەمانەی ئێستا نا مێنن و خەڵکی تر دێتە جێگایان . بە هەر حاڵ با زۆر لەسەر ئەم بابەتە نەڕۆین چونکە حەدیسەکە صحیحە و باسی ئاخر زەمان ناکات بەڵکو باسی مردن دەکات ( الساعة الصغری ) وە هەر کەس ڕەخنەی لێ دەگرێت لە نەزانییەتی لە الساعة الکبری و الصغری ؟ وە قورئان شایەتە کە هیچ کەس نازانێت ئاخر زەمان کەیە ؟ ئێستا چۆن مامۆستای بەشەریەت دەکەوێتە ئەو هەڵەیەوە و ئاخر زەمان دیاری بکات بە پیر بوونی منداڵێك و سەرپێچیی قورئان و خودا بکات و بڵێت هەتا ئەو منداڵە پیر دەبێت ئاخر زەمان هەڵ دەستێت ؟

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا ویەك

## ئایا سورەتی التوبة سێ بەشی لابراوە ؟

گومانی ئەم جارەمان دەربارەی سورەتی التوبة یە و دژە ئیسلامەکان دەڵێن ئەم سورەتەی ئێستا لە بەر دەستماندایە جاران دوور و درێژ تر بووە و **سێ** بەشیان لێ لا بردووە . بەڵگەکانیشیان حەدیسەکانی خۆمانە لە کتێبەکانی خۆمان دەریان هێناوە بەڵام فێڵیان کردوە و نەیان نوسیوە ئەو کەسانەی ئەو حەدیسانەیان نوسیووە رایان چی بووە لەسەر حەدیسە کان !؟ بۆیە ئێمە لەم نوسینەدا حەدیسەکان و رای حەدیس گێرەوەکانیشتان بۆ دا دەنێین . چونکە ئیسلام ی مەزن ئاینی بەڵگەیە نەك قسە !؟

با فێری فێڵێکی تری دژە ئیسلامەکان ببن . کاتێك ئەوان حەدیسێك یان ریوایەتێك دا دەنێن بۆ رەخنە لە ئیسلامی مەزن . هەمیشە دەچن بۆ حەدیسە لاواز و هەڵبەستراو درۆکان دای دەنێن وە بە فەزڵی خودا زانایانی جرح و تعدیل بۆیان دیاری کردوین بۆچی ئەو حەدیسانە صحیح نین!!

وە لە پەراوێزی کتێبەکانیاندا هۆکارەکانیان نوسیوە . بەڵام کاکی دژە ئیسلام هۆکاری نا راستیەکەی دانانێت بۆیە ئێمە لە انترنێت گەراوین و لاپەرە ی ئەو حەدیسانەمان بە پەراوێزەوە بۆتان داناوە

حەدیسی یەکەمیان نوسراوە ( عن حذیفة ) دەڵێت ئەم سورەتی تەوبەیە کە ئێوە ناوی دەبەن ناوی سورەت ی العذاب بووە . ئێستا ئێوە ئەو ئایەتانەی ئێستا ئێوە لە سورەتی التوبەدا دەی خوێننەوە روبعێکی ئەو ئایە تانەیە کە ئێمە جاران دەمان خوێندەوە بەرێزان لێرەدا ئەم حەدیسە سندی نییە ! واتا ئەو کەسانە کێن کە ئەم حەدیسەیان گێراوەتەوە و لە حذیفە وە بیستویانە دیار نین ؟ وە سەرچاوەی ئەم حەدیسە مجمع الزوائدە و بەڵگەی مجمع الزوائدیش بۆ ئەم حەدیسە الطبرانیە لە الاوسطدا ئەم حەدیسەی نوسیووە ئەمەش لینکی حەدیسی ژمارە( ١١٠٣٥ )

http://shamela.ws/browse.php/book-61#page-2007

..................

**بابەتی ناو لینك**

**مجمع الزوائد ومنبع الفوائد**

[سُورَةُ بَرَاءَةٌ]

11035 - عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: الَّتِي تُسَمُّونَ سُورَةَ التَّوْبَةِ هِيَ سُورَةُ الْعَذَابِ، وَمَا يَقْرَؤُونَ مِنْهَا مِمَّا كُنَّا نَقْرَأُ إِلَّا رُبْعَهَا.

رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي الْأَوْسَطِ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

ئەگەر بە کتێب مجمع الزوائدتان لا بێت یان لە انترنێت بەو لینکەی سەرەوە سەیری مجمع الزوائد بکەن **وە لە سەرەوە دامان ناوە** لە ژێر حەدیسی ژمارە ١١٠٣٥ دا نوسراوە ( رواه الطبراني في الاوسط ) واتا ئم حەدیسەی لە طبرانیە وە وەرگرتووە لە کتێبی الاوسطەوە و جرح و تعدیلی تێدا نەکراوە وکۆپی و پەیستە بە زمانی ئێستامان با ئێستا بچین بۆ معجمی الاوسطی الطبرانی بزانین چی دەڵێت دەربارەی ئەم سەنەدە ؟ طبرانی دەڵێت ئەم حەدیسە بەس بە تەنها ابراهیمی کوڕی طهمان گێڕاویەتیەوە لە زاری عمری کوڕی سعیدەوە . کەسی تریش لە ڕێگای ئیبراهیمەوە ئەم قسەیەی نە کردووە بە تەنها نوعمانی کوڕی عبد السلام نە بێت . وە ابراهیمی ابن سوید کە ئەو حەدیسەی گێڕاوەتەوە و لە کتێبی مجمع الزوائددا بۆیان نوسیوە ئیمامی هیثمی لە طبرانیەوە نقلی کردووە ئیمامی هیثمی نوسیوێتی بوخاری دەڵێت ابراهیم ( منكر الحديث ) وە النسائي دەڵێت کەسێکی متمانە پێکراو نییە و حەدیسەکانی نا نوسینەوە

کەواتا حەدیسی یەکەمیان ابراهیمی کوڕی سویدی تێدایە و حەدیسەکە ڕاست نییە

http://shamela.ws/browse.php/book-28171#page-1346

.................

**بابەتی ناو لینك**

المعجم الأوسط

ابحث في الكتاب:

1330 – حَدَّثَنَا أَحْمَدُ قَالَ: نا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الْأَسْفَاطِيُّ قَالَ: نا إِبْرَاهِيمُ بْنُ أَبِي سُوَيْدٍ قَالَ: نا النُّعْمَانُ بْنُ عَبْدِ السَّلَامِ قَالَ: نا إِبْرَاهِيمُ بْنُ طَهْمَانَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَمَةَ، [ص: 86] عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: «الَّتِي تُسَمُّونَ سُورَةَ التَّوْبَةِ هِيَ سُورَةُ الْعَذَابِ، وَمَا تَقْرَءُونَ مِنْهَا مِمَّا كُنَّا نَقْرَأُ إِلَّا رُبْعَهَا»

لَمْ يَرْوِ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ إِلَّا إِبْرَاهِيمُ، وَلَا عَنْ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا النُّعْمَانُ، تَفَرَّدَ بِهِ: ابْنُ أَبِي سُوَيْدٍ "

..................................

پاشان نوسیویانە المستدرك على الصحيحين لەوێشدا هەمان شت نوسراوە . بەڵام لە حاشیەکەدا نوسراوە الحاكم دەڵێت : ئەم حەدیسە اسنادەکەی تەواوە بەڵام بخاری و مسلم لە کتێبەکانیاندا دایان نەناوە و پلەیان بۆ دانەناوە ڕاستە یان درۆیە !؟ ئەمەش لینکەکەیەتی

http://shamela.ws/browse.php/book-2266#page-3396

....................

بابەتی ناو لینك

المستدرك على الصحيحين للحاكم

ابحث في الكتاب:

3274 - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَمْشَاذَ الْعَدْلُ، ثنا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُغِيرَةِ الْيَشْكُرِيُّ، ثنا الْقَاسِمُ بْنُ الْحَكَمِ الْعُرَنِيُّ، ثنا سُفْيَانُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: «مَا تَقْرَءُونَ رُبُعَهَا، يَعْنِي بَرَاءَةَ، وَإِنَّكُمْ تُسَمُّونَهَا سُورَةَ التَّوْبَةِ وَهِيَ سُورَةُ الْعَذَابِ» هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ "

[التعليق - من تلخيص الذهبي]

3274 - صحيح

بەلام ئەم حەدیسە سەنەدەکەشی ڕاست نییە چونکە ( عبد الله ی ابن سلمة ) ی تێدایە وە ئەم عبداللە ی کوڕی سلمەیە لە هەموو حەدیسەکاندا هەیە کە باسی سورەتی التوبة دەکات با ئێستا بزانین ئەم کەسە کێیە بە گوێرەی موسلم و بخاری سەیری ژمارە ( ٢٨٥ ) بکەن نوسراوە عبداللە ی کوڕی سلمە گوێمان لێ دەگرت قسەی دەکرد و پەشیمان دەبووەوە . وە پیر ببو گوێمان لێ نەدەگرت ئەمەش لینکی التاریخ الکبیر للبخاریە

http://shamela.ws/browse.php/book-956#page-1878

...............

بابەتی ناو لینك

التاريخ الكبير للبخاري بحواشي المطبوع

ابحث في الكتاب:

سهل بِهَذا، وقَالَ مُحَمَّد حَدَّثنَا النُّفَيْلِيُّ حَدَّثنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ عَنِ ابْنِ إِسْحَاقَ: حَدَّثَنِي أَبُو ليلى عَبْد اللَّه بْن سهل بْن عَبْد الرَّحْمَن بْن سهل الْأَنْصَارِيّ أخو بَنِي حارثة ان عائشة رضى الله عَنْهَا قَالَت كَانَت أم سعد في الحصن.

285 - عَبْد اللَّه بْن سلمة أَبُو العالية الهمداني الكوفي (1) عَنْ سعد وابْن مَسْعُود (1) أو عَبْد اللَّه بْن سلمة المرادي (2)، عَنْ سعد وابْن مَسْعُود وعلي وصفوان بْن عسال رضي الله عنهم، روى عنه [أبو إسحاق] (3)، قَالَ أَبُو دَاوُد عَنْ شُعْبَة عَنْ عَمْرو بْن مرة: كَانَ عَبْد اللَّه يحدثنا فنعرف (4) وننكر وكَانَ قد كبر، لا يتابع في حديثه، وقَالَ ابْن نمير (5): إن عَبْد اللَّه بْن سلمة الَّذِي روى عَنْهُ أَبُو إِسْحَاق غير الَّذِي روى عَمْرو بْن مرة [عَنْهُ] (6)، قَالَ عَمْرو بْن مرة: / هو رجل من الحي.

با بێین بزانین لە کتێبی الكامل في ضعفاء الرجال کە باسی ئەو پیاوانە دەکات قسەکانیان لاواز بووە و هیچ نە بووە چی دەڵێت دەربارەی عبدالله ی کوڕی سلمة ؟ بڕۆن بۆ ژمارە (٩٨٩ ) ڕای هەموو زانایان لەسەری ئەوەیە دەڵێن گوێمان لێ دەگرت و قسەکانیمان وەر نەدەگرت چونکە پیر ببوبوو و خەڵەفا بوو . لە خواری خوارەوە نوسراوە (٥) پاشان (٢٧٩) واتا بەشی (٥) لاپەڕە( ٢٧٩ تۆ بیکە بە ٢٨٠) دەچیت بۆ لاپەڕە ی دووەمیش ڕای زاناکانی تری تێدایە و هەمویان حەدیسیان لێ وەر نەگرتووە ئەمەش لینکی کتێبەکەیە

http://shamela.ws/browse.php/book-12579#page-2395

.................

**بابەتی ناو لینك**

989- عَبد الله بن سلمة أبو العالية الهمداني كوفي.

حَدَّثَنَا أحمد بن علي بْنِ بَحْرٍ، حَدَّثَنا عَبد اللَّهِ الدورقي سمعت إبراهيم بن سَعِيد يَقُولُ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ أبو العالية عن علي اسمه عَبد اللَّهِ بْنُ سَلَمَةَ.

حَدَّثَنا الْفَضْلُ بْنُ الْحُبَابِ، حَدَّثَنا أَبُو الوليد، حَدَّثَنا شُعْبَة أخبرني عَمْرو بن مرة سمعت عَبد الله بن سلمة يقول، وإن كنا نعرف وننكر

[جزء / صفحة] 5 279 [الرقم]

دووەمیش ڕای زاناکانی تر

الكامل في ضعفاء الرجال

ابحث في الكتاب:

حَدَّثَنَا خالد بْن النضر، حَدَّثَنا عَمْرو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنا أَبُو داود، حَدَّثَنا شُعْبَة عَنْ عَمْرو بْنِ مرة، قَال: كان عَبد الله بن سلمة يحدثنا وقد كبر فكنا نعرف وننكر.

حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ سليمان، حَدَّثَنا أحمد بن سعد، حَدَّثَنا نُعَيْمُ بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنا عَبد اللَّهِ بْنُ إِدْرِيسَ عَنْ شُعْبَة عَنْ عَمْرو بْنِ مُرَّةَ، حَدَّثَنا عَبد اللَّهِ بْنُ سَلَمَةَ ونحن نعرف من عقله وننكر قال ثم يقول أخرجته من عنقي إلى أعناقكم.

حَدَّثَنَا السَّاجِيُّ، حَدَّثَنا بُنْدَار، حَدَّثَنا أَبُو الوليد قال شُعْبَة، حَدَّثَنا عَمْرو بْنِ مُرَّةَ عَنْ عَبد الله بن سلمة تعرف وتنكر.

حَدَّثَنا ابن حماد، حَدَّثَنا صالح، حَدَّثَنا علي سمعت يَحْيى قال شُعْبَة، قال عَمْرو بن مرة كان عَبد الله بن سلمة تعرف وتنكر.

قال وَحَدَّثَنا علي سمعت أبا داود، حَدَّثَنا شُعْبَة عَنْ عَمْرو بْنِ مرة، قَال: كان عَبد الله بن سلمة يحدثنا فكان قد كبر فكنا نعرف وننكر فقال شُعْبَة والله لأخرجنه من عنقي ولألقينه في أعناقكم.

[جزء / صفحة] 5 280 [الرقم]

بەڕێزان کێشەی ئەم دژە ئیسلامیانە لەوەدایە نوسیویانە تا ئێستا هیچ کام لە موسوڵمانەکان ئەم فەزیحەتە ی قورئانی بیستووە ؟ منیش دەڵێم هەی نەزان تۆ لە کتێبەکانی خۆمان دەری دەهێنیت وە ئێمە خۆمان زۆر لە تۆ شارەزاترین لە کتێبەکانمان بەڵگەشمان ئەوەیە تۆ هاتویت حاشیەکانمان لێ دەبڕیت وە درۆمان لەگەڵ دەکەیت . وەك بینیت ئێمەش ئەو درۆیەی تۆ کەشف دەکەین و ئەوە فەزیحەتە بۆ تۆ کە درۆ و چەواشە کاری دەکەیت . ئایا ئێستا لە ڕوت دێت بڵێیت ڕەخنەم گرتووە ؟ لە ڕوت دێت بڵێیت سورەتی **تەوبە** ڕوبعێکی لا براوە ؟ بە ڕاستی ئێوە کەسانێکی درۆزن و ساختە کارن و بە هیچ تەڕ نابن . کێشەی ئێمە و ئێوە لەوەدایە . ئێوە کارەکەتان ئاسانە کۆپی و پەیست دەکەن . بەڵام ئێمە دەبێت سەرچاوە کان بگەڕێین و بۆ موسوڵمانان و ئێوەی دا بنێین بۆ ئەوەی فەزیحەتەکانتان ببینن.

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا ودوو
## زۆر ئایاتی قورئان لابراوە لەگەڵ ٣٤٠،٢٠٠ پیت

دوو گومانی تری دژە ئیسلامەکان

**یەکەمیان**: حەدیسێکە دەڵێت هیچ کەس لە ئێوە نەڵێت هەموو قورئانم لایەوە نازانێت زۆر لە قورئان نەماوە بەڵکو با بڵێت ئەوەم لە قورئان وەرگرتووە کە دیارە . دژە اسلامە کان دەڵێن زۆر لە قورئان دیار نەماوە

کابرای ڕەخنە دەگرێت و السیوطي کردوە بە بەڵگە . وە کابرا نەزانە چونکە سیوطی لە ساڵی ٩١١ ی هیجریدا مردووە واتا لە نێوان ساڵی ١٤٠٠ بۆ ساڵی ١٥٠٠ ژیاوە . چونکە سیوطی محدث نیە بەڵکو لە کتێبی حەدیسەکانەوە نقل دەکات نەك خۆی حەدیس بگێڕێتەوە ئێمەش دەڵێین ئەم حەدیسە ١٠٠% صحیحە وەك متن و وەك سندیش . ئەمە بزماری یەکەمە لێیان دەدەین چونکە دژە ئیسلامەکان دەڵێن موسوڵمانەکان هەر حەدیسێکیان بە دڵ نە بێت دەڵێن صحیح نییە !؟ بەڵام ئەوان نەزانن وە ئێمەی موسوڵمان پێوەری خۆمان حەیە بۆ ڕاستی و نا ڕاستیی حەدیسەکان و بە گوێرەی ئەو پێوەرانە حوکم دەدەین . بەڵام دژە ئیسلام نە خوێندەوارە و بێ ئاگایە لەوەی ئەم حەدیسە السیوطی لە خانەی ( باب ما رفع من القران بعد نزوله و لم یثبت في المصاحف ) دا نوسراوە واتا خانەی ئەو ئایەتانەی لە قورئاندا دانەنراون پاش دابەزینیان . هەموو کتێب و سەرچاوە ئیسلامیەکان ئەو حەدیسەیان لەو خانەیەدا داناوە . کەواتا کەسێکی نەزان ناکرێت پێمان بڵێت قورئان ئایاتی لێ لابراووە . چونکە ئەو حەدیسە باسی ئەو ئایەتانە دەکات کە لە ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لابراون وە خۆشەویست خۆی بە فرمانی جبریل علیهما السلام فەرمویەتی ئەم ئایەتانە مە نوسنەوە بۆ نموونە وەك ئایتی ( الشیخ و الشیخة اذا زنتا ) وە نمونەی تریش وە هەمو زانایانی ئیسلام لە کتێبەکانیاندا کۆکن لەسەر ئەوەی ئەو حەدیسە باسی ئەو ئایەتانە دەکات کە نسخ کراون ( واتا نا

خوێرێنەوە و لە قورئاندا نە نوسراون ) بەڵام حوکمەکانیان ماوە . چونکە حەدیسی صحیحی زۆرمان هەیە کە دەڵێت : پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ شتێکی لە دوای خۆی جێ نە هێشتووە قورئانی لە بەرگەوە بۆ بەرگ ( ما بين الدفتين ) پێ ڕاگەیاندوین چونکە شیعەی رافیزە دەڵێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموو قورئانی پێ را نەگەیاندوین وە زانایانی ئیسلامیش وەڵامی شیعە دەدەنەوە و لە خانەی ئەو ئایەتانەی لە قورئاندا دانەنراون ئەو حەدیسەیان داناوە کە ئێستا کاکی دژە ئیسلام کردویەتی بە ڕەخنە بەسەرمانەوە لە کاتێکدا دژە ئیسلامی داماو خۆی نازانێت ئەم ڕەخنەیە هی شیعەیە بۆ یە دەبینین کڵێسا و بێدین پێکەوە کردویانە بە هەرا گوایا قورئان ئایاتی تێدا لا براوە !؟ وە قورئانی مەزن پارزراوە لە لای خوداوە و نە هیچی لێ لابراوە و نە هیچیشی بۆ زیاد دەکرێت وە نە کەسیش دەتوانێت هاوشێوەی قورئان بنوسێتەوە

بە نیسبەت حەدیسی **دووەمیشیانەوە** .

قسەیەکی زۆر هیچ و بێ بنەمایە و ڕەخنەی دژە ئیسلامەکان ئاستی نەزانی و نە شارەزاییان دەر دەخات سەبارەت بە ئاینی ئیسلامی مەزن . وە دەڵێن عمری کوڕی خطاب دەڵێت قورئان هەزار هەزار و بیست و حەوت هەزار پیتە هەر کەس هەمووی بخوێنێتەوە بە گوێرەی ئەو ژمارانە حۆریی پێ دەدرێت . کابرای دژە ئیسلام بێ ئاگایە لەوەی کە لە قورەیشدا خەڵکی خوێندەوار نە بوون بەڵکو زۆر کەمیش بوون لە هەزار کەس یە ك کەسی خوێندەواریان نە بووە . پاشان ژمارەیان نەزانیوە ئێستا چۆن هاتن ئەم پیتانەی قورئانیان حساب کرد و کردیە (١ ملیۆن و ٢٧ هەزار پیت )!؟ پاشان ژمارەی ملیۆن یان هەزار هەزار تازەیە و ١٤٠٠ ساڵ لەمەوپێش ئەو ژمارەیە بونی نەبووە و کەس نەی توانیوە حسابی بکات بە تایبەتی لە دورگەی عەرەبیدا کە خەڵکی نەیان زانیوە ١٠٠ یان ١٠٠٠ چەندە ؟ چۆن توانیویانە هەزار هەزار و ٢٧ هەزار حساب بکەن بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان

**ئەم پرسیارە بێ وەڵامەیە** : فەرموون پێمان بڵێن ئەم حەدیسی (ملیۆن و ٢٧ هەزار) پیتە صحیحە یان نا ؟ وە بڕۆن هەموو حەدیسەکان بگەڕێن هیچیان بە لاوازیشیان دا نەناوە بەڵکو بە درۆ و بوهتان و قسەی هیچیان داوە ئەگەر بڵێێت ئەی خۆ سەرچاوەکانی خۆتان باسی کردووە ؟ دەڵێم هەر سەرچاوەکانی خۆشمان دەڵێن ئەو حەدیسە صحیح نییە . بەڵام جەنابت نە شارەزایت وە بە نە شارەزایی خۆت دەتەوێت ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن بگریت

**کۆتا پرسیاری بێ وەڵامیشمان لەسەر ڕەخنەی یەکەمە** و دەڵێین ئەو ئایەتانە چییە کە لە قورئاندایە و لابراوە و جەنابت دەهۆڵی بۆ دەکوتیت دەڵێیت فەزیحەتی قورئان . وە ئایەتی زۆر لە قورئاندا لا براوە ؟ ئەمەش لینکی هەموو حەدیسەکان لە الدرر السنية دا فەرموون حەدیسی دووەممان بۆ دەر بهێنن کە حەدیسێکی صحیحە ؟ هەر هەمووو محدسەکان دەڵێن ئەو حەدیسە درۆیە و هەڵ بەستراوە

http://www.dorar.net/hadith

## پرسیارە بێ وەلآمەکان ژمارە :سەد و هەشتا وسێ
## ئایەتی( وما اوتیتم من العلم )هەڵەیە ؟

گومانی ئەم جارەمان کە دژە ئیسلامی کورد وەریگێڕاوە بۆ کوردی هـ ( اباضیەکانە ) وە الاباضیة بەشێکن لە شیعەی ڕافیزە بەلام تۆزێك لە شیعە باشترن وە زیاتر لە بیر و باوەڕی معتزلەوە نزیك ترن و اسماء و سیفاتی خودا ڕەت دەکەنەوە بە هەر حاڵ با زۆر لەسەریان نەڕۆین خۆتان دەتوانن بگەڕێن بە دوایاندا و بنوسن ( الاباضیة ) زانیار ی زیاترتان دەست دەکەوێت . وە دەڵێن ئایەتی ٨٥ ی سورەتی **الاسراء** ( و ما اوتیتم من العلم الا قلیلا ) جاران بەم شێوەیە نوسرا بوو

( *و ما اوتوا من العلم ) بەلاَم ئەو هەڵە گەورەیەی اباضیة و بەناو بێدینی کوردی تێکەوتووە ئەوەیە بخاری بە ڕەحمەت بێت ئەم حەدیسەی لە ( باب وما أوتیتم من العلم إلا قلیلا ) واتا لەو بەشەدا داناوە و بەشێکی تایبەتی بۆ ئەو ئایەتە کردووەتەوە بەو شێوەیەی کە ئێستا لە قورئاندا نوسراوە و پاشان باسی حەدیسەکەی ( اعمشی ) کردووە لێرەدا دەپرسین ئەگەر بوخاری بلێت ئەم ئایەتە کاتی خۆی نوسراوە ( و ما اوتوا نەك و ما اوتیتم ) ئایا بەشێکی تایبەتی دەکردەوە و عینوانەکەی بنوسێت **(باب وما أوتیتم من العلم إلا قلیلا** )؟ ئەمە بزماری یەکەم بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەم گومانە . فەرموون ئەمەش صحیحی بوخاری فەرمون سەیر بکەن لە چ بابێکدا ئەم حەدیسەی نوسیووە ؟

http://shamela.ws/browse.php/book-1681#page-251

..............................

**بابەتی ناو لینك**

صحيح البخاري

ابحث في الكتاب:

125 – حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ حَفْصٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَاحِدِ، قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ سُلَيْمَانُ بْنُ مِهْرَانَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خَرِبِ المَدِينَةِ، وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ مَعَهُ، فَمَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ اليَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ؟ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ تَسْأَلُوهُ، لاَ يَجِيءُ فِيهِ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَنَسْأَلَنَّهُ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَقَالَ يَا أَبَا القَاسِمِ مَا الرُّوحُ؟ فَسَكَتَ، فَقُلْتُ: إِنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، فَقُمْتُ، فَلَمَّا انْجَلَى عَنْهُ، قَالَ: «(وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتُوا مِنَ العِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا)». قَالَ الأَعْمَشُ: هَكَذَا فِي قِرَاءَتِنَا

[تعليق مصطفى البغا]

125 (1/58) –[ ش أخرجه مسلم في صفات المنافقين وأحكامهم باب سؤال اليهود النبي صلى الله عليه وسلم عن الروح رقم 2794 (خرب المدينة) أماكن خربة منها والخرب ضد العامر. (يتوكأ) يعتمد. (عسيب) عصا من جريد النخل. (تكرهونه) خشية أن يوحى إليه بشيء تكرهونه فيجبيكم به. (ما الروح) ما حقيقتها. (فقمت) حائلا بينه وبينهم. (انجلى) ذهب عنه ما يصيبه من حال الوحي. (من أمر ربي)

[جزء / صفحة] 1 37 [الرقم] 125

كاكەی دژە اسلام وە لە حادیثەكەیدا نوسراوە : اعمش دەڵێت بەم شێوەیە خوێندومانەتەوە . ئێ خۆ اعمش صاحبی نە بووە لە نوسەرانی وەحی نە بووە هەتا ببێت بە شایەت بەسەر خوێندنەوەی قورئانەوە ؟ لە خواری خواریشەوە نوسراوە ئەم جۆرە خوێندنەوەیە ( و ما اوتوا ) خوێندنەوەیەكی شاز و نەشازە و شتی وا نیە . كاكی دژە ئیسلامی كوردی كۆپی و پەیست . ئاینی ئیسلامی مەزن ئاینی بەڵگەیە و حەدیسەكانمان لە بێژنگ دراون و زانایانی جرح و تعدیل پیاوانی حەدیس گێڕەوەیان باش ناسیووە و ڕاست گۆ و درۆزنیان بۆ دیاری كردون وە پێوەری تایبەتییان هەبووە بۆ وەرگرتن و نوسینی حەدیسەكان و بۆشیان نوسیوین ئەو حەدیسە بۆچی صحیحە و بۆچی صحیح نییە . ئیمامی احمد لە (كتێبی العلل ومعرفة الرجال٢/ ٤١٦ )دا كەسایەتیەكانمان پێ دەناسێنێت كە حەدیسیان گێڕاوەتەوە دەربارەی اعمش دەڵێت : اعمش دەڵێت حەدیسی درۆ و دروست كراوم گێڕاوەتەوە خۆشم لام سەیر بووە كە ئەوە حەدیس بێت كەچی پاش گێڕانەوەكەی دیقەتم داوە خەڵكی ئەو حەدیسەیان كردووە بە بەشێك لە ئاین !!؟؟

هەروەها **ابن حجر** لە لە فتح الباري ١-٢٢٤ دا دەڵێت ئەو خوێندنەوەی ( اعمش ) نە لە قرائات السبعدا هەیە و نە لە لای خوێندنەوە مەشهورەكانی قورئاندا هەیە !؟ وە نە لە هیچ كام لە خوێندنەوەكاندا هەیە !؟

وە ابو عبید لە كتێبی جۆرەكانی خوێندنەوەی قورئاندا اعمشی ئیهمال كردووە !؟ سەیر بكەن ابن حجریش ئەو ئایەتە ی هەر لە ( **باب وما أوتيتم من العلم إلا قليلا** ) داناوە . وەك خوێندنەوەی ئێستا نەك وەك اعمش كە دەڵێت !؟

اعمش سلیمان بن مهران كێێە لە زاری پیاوانی جرح و تعدیلەوە لە كتێبی : **موسوعة أقوال الإمام أحمد بن حنبل في رجال الحديث وعلله** : بەشی (٢ لاپەڕە ١٠٢ ژمارە ١٠٧٢) دا باسی الاعمش دەكات كێیە و چۆن بووە لای خەڵكی وە حەدیس گێڕەرەوەكانیش . وە دەڵێت هیچ كەس لە حەدیس گێڕەرەوەكان بەقەدەر اعمش حەدیسیان سەقەت و خراپ نە كردووە واتا كەس وەك اعمش نە بووە هێندە حەدیسی درۆ و دروست كراوی گێڕا وەتەوە بڵاوی كردوەتەوە ئەوە ئێمە هۆكاری نا ڕاستیی ئەم حەدیسەمان بۆ ڕون كردنەوە :

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە**: ئادەی بێرەحمەت ئێوەی دژە ئیسلامیش ئەم حەدیسەمان بۆ بهێنن بزانین كام محدیس دەڵێت صحیحە ؟

---

## پرسیاره بێ وەڵامەكان ژمارە :سەد و هەشتا وچوار

## وەڵامی ( ٥ )گومانی نەشارەزاكان

١- دژە ئیسلامەكان لەسەر ئایەتی ١٩٨ ی **البقرەیە** لە مصحفی عوسمانیدا نوسراوە ( **ليس عليكم جناح ان تبتغوا فضلا من ربكم** ) وە دەڵێن ابن عباس كاتێك دەی خوێندەوە پاش من ربكم دەیگوت ( **في مواسم الحج** ) ئەمە ڕەخنە نییە لەسەر قورئان یان

ئایەتەکانی قورئان . چونکە سەحابە بەرێزەکان کە خوێندەواریان هەبووە نوسخەی خۆیانیان نوسیووە لەگەڵیشیدا وەك تەفسیر یان تێبینی خۆیانیان نوسیووە . بە زمانی ئەمڕۆ پێی دەڵێن حاشیة یان پەڕاوێز وە خۆیان شارەزا بوون و زانیویانە ئەوە بەشێك نییە لە قورئان بەڵکو ڕوون کردنەوەیە یان تەفسیرە . بۆ نموونە ئەو ئایەتەی ١٩٨ ی **البقرة** کە ڕەخنەی لێ دەگرن باسی ئەوە دەکات پاش ئەوەی موسمی حەج تەواو بوو دەتوانن کڕین و فرۆشتن و تیجارەتی خۆتان بکەن . وە ئایەتەکە و پاش و پێشی ئایەتەکە دیارە باسی وەرزی حەج دەکات ؟ وە ابن مسعودیش هەمان شت دەڵێت ( **في مواسم الحج** ) دیارە تەفسیرە نەك زیادە بێت بۆ قورئان وە ئەگەر ئەو زیادەیەی ابن عباسی لەگەڵدا بێت و لەگەڵدا نەبێت هەر دەزانرێت مەبەست لەو ئایەتە مەوسمی حەجە ... وە لە نوسخەی سەحابەکاندا ئەو تەفسیرانە زۆر بووە . بۆیە عوسمانی کوڕی عەفان هات هەموو نوسخەکانی سوتاند بۆ ئەوەی ئەو جۆرە تەفسیرانە نەمێنن وە چەند نمونەیەکی تریشتان بۆ دەنوسین وەك بەڵگە ، لە ئایەتی ٦٠ ی سورەتی **النوردا** نوسراوە ( **فليس عليهن جناح أن يضعن ثيابهن غير متبرجات بزينة** ) بەڵام خوێندنەوەی ابن مسعود دەڵێت ( **و ليس عليهن جناح ان يضعن ثيابهن** ) ان يضعن الجلباب و لا يضعن الخمار . هەر کەس عەرەبی بزانێت دەزانێت ئەمە تەفسیرە نەك قورئانە . وە نموونە زۆرن لەسەر ئەو جۆرە قرائاتانە و تەفسیرین وە هەڵەی قورئان نییە

ئایەتی ١٢ ی **النساء** نوسراوە ( **او امراة و له اخ او اخت** ) بەڵام لە قرائەی سەعدی کوڕی ابو وقاصدا دەڵێت ( **او امراة و له اخ او اخت من ام** ) لێرەدا ( ام ) زیادەیە و ئایەتەکە باسی دابەش کردنی میرات دەکات وە سەعدی کوری ابو وقاص باسی دایك دەکات واتا ئەگەر خوشکێکتان هەبوو لە دایکتانەوە . خۆشتان دەزانن میراتی لە باوکەوە جێ دەمێنێت وە ئەگەر کەسێك دایکی دوو شوی کرد بێت و خوشکێکی هەبێت لە باوکێکی تر بە کچی ئەو پیاوە حساب ناکرێت بەلام لە شەرعی ئیسلامدا ئەو کچەش کە لەو دایکەوەیە میراتیی بەر دەکەوێت بۆیە سعد بە خوشك لە دایکەوە خوێندویەتیەوە . وە تەفسیرە نەك بەشێك بێت لە قورئان

٢- **ڕەخنەی تریان** دەڵێن ئەم ئایەتە هاتوەتە خوارەوە ( **ان بلغوا قومنا ان قد لقينا ربنا فرضي عنا و ارضانا** ) دواتر ئەم ئایەتە لە قورئاندا نەماوە . بە ڕاستی ئەم دژە ئیسلامانە شایانی بەزەین ، چونکە دەقی حەدیسەکە. خۆی نوسیوێتی ئەم ئایەتە نسخ کراوە .

عن أنس بن مالك قال : بعث النبي صلى الله عليه وآله وسلم أقواما من بني سليم إلى بني عامر في سبعين ، فلما قدموا ، قال لهم خالي : أتقدمكم فإن أمنوني حتى أبلغهم عن رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم وإلا كنتم مني قريبا . فتقدم ، فأمنوه ، فبينما يحدثهم عن النبي صلى الله عليه وآله وسلم إذ أومؤوا إلى رجل منهم فطعنه فأنفذه ، فقال : الله أكبر فزت ورب الكعبة . ثم مالوا على بقية أصحابه فقتلوهم إلا رجلا أعرج صعد الجبل ، قال همام ، فأراه آخر معه ، فأخبر جبريل عليه السلام النبي صلى الله عليه وآله وسلم أنهم قد لقوا ربهم فرضي عنهم وأرضاهم ، فكنا نقرأ ( أن بلغوا قومنا أن قد لقينا ربنا فرضي عنا وأرضانا ) ثم نسخ بعد ، فدعا عليهم أربعين صباحا على رعل وذكوان وبني لحيان وبني عصية الذين عصوا الله تعالى ورسوله صلى الله عليه وآله وسلم.

صحيح البخاري 2659 كتاب الجهاد
صحيح مسلم ج2ص 136

کەواتا دژە ئیسلام ڕەخنە لە چی دەگریت ؟ وە ئەوە بۆچی ڕەخنە یان فەزیحەت بێت بۆ قورئان لە کاتێکدا سەرچاوەکانی خۆمان دەڵێت ئەو ئاەتە نسخ کراوە ( لابراوە ) !؟

٣- ڕەخنەی تریان هەمان شتە باسی ئایەتی ٧٩ ی سورەتی **الكهفه**




و ئەو ئایەتەش نسخە بەو شێوە یە و کێ دەیەوێت زیاتر بە دواداچوون بکات با سەیری ئەم لینکە بکات

http://vb.tafsir.net/tafsir34914/#.VjFVxXF_Oko

.......................

بابەتی ناو لینک


( و كان وراءهم مِلِكٌ يأخذ كل سفينة صالحة ) : قراءةٌ منسوخة و روايةٌ محمولة على ما كان قبل النَّسخ

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾. [الكهف: 79]

٤- ڕەخنەی تر ئایەتی ٣ ی سورة **الليله** لێرەشدا حەدیسەکە ڕون و ئاشکرایە و پرسیار دەکەن کێ دەزانێت ئەو ئایەتە بخوێنتەوە وەك خوێندنەوەی ( عبد الله ) واتا ابن مسعود بە خەتی سور دیاریمان کردووە داوای خوێندنەوەی عبدالله دەکەن


حدثنا عمر بن حفص حدثنا أبي حدثنا الأعمش عن إبراهيم قال قدم أصحاب عبد الله على أبي الدردا. فطلبهم فوجدهم فقال أيكم يقرأ على قراءة عبد الله قال كلنا قال فأيكم أحفظ فأشاروا إلى علقمة قال كيف سمعته يقرأ والليل إذا يغشى قال علقمة والذكر والأنثى قال أشهد أني سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقرأ هكذا وهؤلاء يريدوني على أن أقرأ وما خلق الذكر والأنثى والله لا أتابعهم

سەرچاوە:
صحيح البخاري رقم 3532
صحيح مسلم 109,6



وەك دەبینن ابو **الدردائیشی** لێیە و بە هەمان شێوە ئەویش لەگەڵ ئەو خوێندنەوەیەدایە و ئەمیش هەر یەكێكە لە ئایەتە نسخەکان . وە ئەمەش هەڵەی قورئان نییە و هەر شتێك لە نوسخەی عوسماندا نە بێت بە قورئان حساب ناکرێت وە سەحابەکان و زانایانی ئیسلامیش هەمویان لەسەر نوسخەی عوسمانی کوڕی عفان كۆكن و ئەم دژە ئیسلامانە ئاسنی سارد دەکوتن .

٥- بۆ وەڵامی ڕەخنەی تریان ئەو حەدیسەی عومەری کوڕی خطاب باسی ئەوە دەکات ئایەتی ڕەجم و ئایەتی ( **ان لا ترغبوا عن ابائكم فانه كفر بكم ان ترغبهوا عن ابائكم** ) یان ( **او ان كفرا بكم ان ترغبوا عن ابائكم** ) سڕراوەتەوە و نسخ کراوە . کەچی کاکی دژە ئیسلام نوسیوێتی عوسمان ئەم ئایەتەشی لا بردووە ؟ ئەمە بەڵگەیە بۆ نەزانی و نە شارەزایی دژە ئیسلام چونکە عمر پێش عوسمان بووە . وە ئەم قسەیەی سەروەر مان عمر شایەت و بەڵگەیە بۆ سیدنا عوسمان کە عوسمان بە ڕای گشتی سەحابەکان ئەو ئایەتانەی لا بردووە و ئەوەتا عمریش شایەتی دەدات کە ئەو ئایەتە نەسخ کراوە . نەزانیی دژە ئیسلام گەیشتوەتە لوتکە : چونکە بەڵگەکانی بۆ لابردن و نسخی ئایاتی قورئان هەر سەرچاوەکانی خۆمانە و خۆمان دەڵێین لابراوە و نای شارینەوە . ئیتر تۆ ڕەخنە لەچی دەگریت ؟ وە ئەوانە ڕەخنە نیە لەسەر ئیسلامی مەزن ؟ بەڵکو ڕەخنەیە لە ئاستی نەزانی و شارەزایی تۆ دەربارەی ئیسلامی مەزن وە ڕەخنە لە شتێك دەگریت خۆمان لە کتێبەکانماندا دەڵێین لابراون و نسخ کراون . ئەقڵ تۆ لە کوێیت ؟ نەزانیی دژە ئیسلام کوشتی.!

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا وپێنج

## ئایا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شك و گومانی هەبووە لە قورئان ؟

ولقد جاءكم يوسف من قبل بالبينات فما زلتم في شك مما جاءكم به ﴿غافر: ٣٤﴾

63. ولقد آتينا موسى الكتاب فاختلف فيه ولولا كلمة سبقت من ربك لقضي بينهم وإنهم لفي شك منه مريب ﴿فصلت: ٤٥﴾

64. وما تفرقوا إلا من بعد ما جاءهم العلم بغيا بينهم ولولا كلمة سبقت من ربك إلى أجل مسمى لقضي بينهم وإن الذين أورثوا الكتاب من بعدهم لفي شك منه مريب ﴿الشورى: ١٤﴾

بل هم في شك يلعبون ﴿الدخان: ٩﴾

51. وما كان له عليهم من سلطان إلا لنعلم من يؤمن بالآخرة ممن هو منها في شك وربك على كل شيء حفيظ ﴿سبأ: ٢١﴾

52. وحيل بينهم وبين ما يشتهون كما فعل بأشياعهم من قبل إنهم كانوا في شك مريب ﴿سبأ: ٥٤﴾

58. أأنزل عليه الذكر من بيننا بل هم في شك من ذكري بل لما يذوقوا عذاب ﴿ص: ٨﴾

18. قالوا يا صالح قد كنت فينا مرجوا قبل هـذا أتنهانا أن نعبد ما يعبد آباؤنا وإننا لفي شك مما تدعونا إليه مريب ﴿هود: ٦٢﴾

17. قل يا أيها الناس إن كنتم في شك من ديني فلا أعبد الذين تعبدون من دون اللـه ولـكن أعبد اللـه الذي يتوفاكم وأمرت أن أكون من المؤمنين ﴿يونس: ١٠٤﴾

24. ألم يأتكم نبأ الذين من قبلكم قوم نوح وعاد وثمود والذين من بعدهم لا يعلمهم إلا اللـه جاءتهم رسلهم بالبينات فردوا أيديهم في أفواههم وقالوا إنا كفرنا بما أرسلتم به وإنا لفي شك مما تدعوننا إليه مريب ﴿ابراهيم: ٩﴾

25. قالت رسلهم أفي اللـه شك فاطر السماوات والأرض يدعوكم ليغفر لكم من ذنوبكم ويؤخركم إلى أجل مسمى قالوا إن أنتم إلا بشر مثلنا تريدون أن تصدونا عما كان يعبد آباؤنا فأتونا بسلطان مبين ﴿ابراهيم: ١٠﴾

بل ادارك علمهم في الآخرة بل هم في شك منها بل هم منها عمون ﴿النمل: ٦٦﴾

9. وقولهم إنا قتلنا المسيح عيسى ابن مريم رسول اللـه وما قتلوه وما صلبوه ولـكن شبه لهم وإن الذين اختلفوا فيه لفي شك منه ما لهم به من علم إلا اتباع الظن وما قتلوه يقينا ﴿النساء: ١٥٧﴾

19. ولقد آتينا موسى الكتاب فاختلف فيه ولولا كلمة سبقت من ربك لقضي بينهم وإنهم لفي شك منه مريب ﴿هود: ١١٠﴾

ڕەخنە دەگرن لە ئایەتی ٩٤ ی **یونس** کە دەفەرموێت : (**فإن كنت في شك مما أنزلنا إليك فاسأل الذين يقرءون الكتاب من قبلك لقد جاءك الحق من ربك فلا تكونن من الممترين** ). وە دەڵێن محمد (صلى الله عليه وسلم) گومانی هەبووە لە قورئان ئەوەتا قورئانەکەی خۆتان وا دەڵێت و قسەی ئێمە نییە !؟

منیش دەڵێم باشە منیش هەر بە قورئانەکەی خۆمان وەلامت دەدەمەوە و قسەی من نییە !؟ چونکە مەزنیی ئەم قورئانە لەوەدایە خۆی وەڵامی هەموو ڕەخنە و گومانەکان دەداتەوە

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەم قورئانە لە لایەن خودایەکی زاناوە دابەزیووە ناکرێت ڕەخنەی لێ بگیرێت یان هەڵە بکات و تعالى الله عما يصفون . وەك هەمووان دەزانن ووشەی ( شك ) لە عەرەبیدا واتا گومان وە ئێمەی کوردیش هەر ووشەی شك بەکار دەهێنین کە گومانمان لە شتێك بێت . کاتێکیش یەکێکمان شکمان لە شتێك یان ڕوداوێك بێت لە کاتی دەربڕیندا بەرامبەرمان لێمان تێ دەگات ئایا ١٠٠% گومانی کابرا تەواوە یان خۆشی لە گوماندایە کە بەرامبەرەکەی ئەو کارەی کرد بێت !؟

لێرەدا دەپرسم ئایا کاتێك ئێمەی کورد دەمانەوێت بەرامبەر تێ بگەێنین کە گومانەکەمان لەو کەسە سەدا سەد ڕاستە یان خۆشمان نازانین ئەو کەسە ئەو شتەی کردووە یان نا چیی پێ دەڵێین ؟ من وەڵام نادەمەوە و بۆ ئێوەی جێ دەهێڵم

بەلام لە زمانی عەرەبیدا دوو ئامڕازی شەرت هەیە کە ئەم دوانەن ( ان ) وە ( اذ ) وە بە گوێرەی بوونی ئەم ئامرازانە لە ڕستەکاندا مەبەستەکە دەزانرێت . وە هەردووکی بە مانای ( ئەگەر ) دێت لە کوردیدا با لە پێشدا بزانین ( ان ) چییە ؟

(ان) بە مانای ڕودانی ئەو شتە نایەت بەڵکو احتمالە یان ئەگەری بوونی ئەو شتە ڕوون دەکاتەوە و لە ڕستەدا ئەگەری ئەو شتە دەکەوێتە ساحەی بەرامبەرەوە ، واتا ئەگەر ئەو کەسە ئەو شتە بکات یان نەکات !؟ هەر لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێت (**فإن كنت في شك مما أنزلنا إليك** ) واتا ئەگەر گومانت هەیە لەوەی بۆمان دابەزاندویت کە قورئانە . پرسیارەکە لێرەدا ئەمەیە : ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یان هیچ کام لە سەحابەکان گومانیان هەبووە ئەم قورئانە لە لایەن خوداوە نییە ؟

یان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گومانی هەبووە و بچێت لای جولەکەکان پرسیار بکات !؟ وە ئەگەر باسی ( اذ ) ی شرطی بکەین بە مانای ئەوە دێت ئەو شتە ڕوو دەدات و مەجالی ئیحتیمالی تێدا نییە .

بەڵگەشمان هەر قورئانی مەزنە

( اذ ) لە قورئاندا ٦٩ جار هاتووە لە ٦٦ ئایەتدا هەر هەمووی جەخت لەوە دەکاتەوە ئەو شتە ڕووی داوە با گاورەکان بچن بۆ ئایەتی ١١٠ ی **المائدة** و بزانن ئەو زانیاریانەی تێیدا نوسراوە ڕاستە یان نا ؟ چونکە چوار جار ( اذ ) نوسراوە وە بە جوانی لە ئاینی مەزنی ئیسلام و زمانی قورئان تێ دەگەن و جیاوازیی نێوان ( ان & اذ ) دەکەن وە بۆیان دەر دەکەوێت ڕەخنەکەیان پوچەڵە و لە نە شارەزاییان لە زمانی عربی ئەو ڕەخنەیەیان گرتووە .

پاش ئەوەی جیاوازی نێوان ( ان و اذ ) تان زانی کە ( ان ) بۆ ئەگەر بەکار دەهێنرێت و فەرەزیاتە بەڵام ( اذ ) حەتمییە و ئەو شتە ڕوو دەدات وە ئەو ئایەتە بە ( ان ) ی شرطی دەستی پێکردوە .

پاشان کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێت( **لقد جاءك الحق من ربك فلا تكونن من الممترين**) واتا ئەوەی بۆت دابەزیووە حەقە لە لای خوداوە گومانت نەبێت لەوەی کە لە لایەن خوداوەیە . دیقەت بدەن لێرەدا نوسراوە ( فلا تكونن ) چونکە پێش ئەو باسی گومان دەکات کە هەیە ئەویش ئەوەیە ئەگەر گومانت هەیە برۆ لە ئەهلی کیتاب بپرسە وە هەر ئایەتەکە خۆی وەڵامی گومانەکە دەداتەوە و دەفەرموێت ( فلا تكونن من الممترين ) دوپاتی دەکاتەوە کە نابێت گومان بکات وە (**ممتر**) واتا کەسێك گومانی هەبێت وە هەر ئایەتی دوای ئەوە کە ژمارە ٩٥ دەفەرموێت ( **و لا تكونن من الذين كذبوا بايات الله فتكون من الخاسرين** ) واتا مەبە بە یەکێك لەو کەسانەی کە ئایاتی خودا بە درۆ دەخاتەوە چونکە خۆت زەرەرمەند دەبیت واتا دەبیت بە کافر وە زیان دەکەیت چونکە ئایاتی خودا بە درۆ دەخەیتەوە . دیقەت بدەن هەر سیاقی ئایەتەکانی( ٩٤ و ٩٥ )ی **يونس** خۆی گومانەکە پوچەڵ دەکاتەوە .

چونکە نەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵکو موسوڵمانێکی ئاسی لە کۆن و نوێدا قەت گومانیان لە هیچ ئایەتێکی قورئان نەبووە و نایانەوێت ئایاتی خودا بە درۆ بخەنەوە چونکە دەزانن زەرەرمەند دەبن و کفر دەکەن . خودا پەنامان بدات لە کوفر و بە درۆ خستنەوەی ئایاتی خودا . ئایا معقولە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گومانی هەبێت و بچێت پرسیار لە جولەکە بکات بۆ دڵنیای !؟ یان کابرای دژە ئیسلام نەزانە و ئایەتەکە دەبڕێت و سەر لە خەڵکی عەوام تێك دەدات ؟ وە ئایەتی( ١٤٦ و ١٤٧ )ی **البقره** هەمان گومان پوچەڵ دەکاتەوە چونکە نوسراوە ( **فلا تكونن من الممترين** ) وە باس دەکات کە اهلی کیتاب چۆن منداڵەکانیان دەناس ئاوهاش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەناسن . وە لە ئایەتی ١١٤ ی الانعامدا بەهەمان شێوە ( **فلا تكونن من الممترين** ) هاتووە و ئەو گومانە پوچەڵ دەکاتەوە و دەفەرموێت ئایا غەیری خودا هیچ دادوەرێکی تر هەڵ دەبژێرم ؟ چونکە خودا کتێبی ناردووە بۆ ئێمە و بۆ ئەوانیش ( واتا اهل الكتاب ) وە اهلی کتاب خۆیان زۆر باش دەزانن کە ئەم قورئانە لە لایەن خوداوە دابەزیووە بۆیە هیچ گومان مەکە وە ئایەتەکە دەفەرموێت ( **لقد جاءك الحق من ربك فلا تكونن من الممترين** ) وە لام لەگەڵ ( لقد ) هاتووە ئەوە لامی توکید واتا دڵنیاییە و تەئکیدی لێ دەکاتەوە کە نابێت ممتر بێت واتا نابێت شك بکات و نابێت یەکێك بێت لە الخاسرين واتا درۆرراوەکان کە خودا و قیامەت بدۆڕێنێت وە نابێت یەکێك بێت ( من الكاذبين ) واتا خودا بە درۆ بخاتەوە .

ئایا هیچ کەسێکی ئاقڵ هەیە **سێ** ئاگاداریی بدرێتێ و ئەو هەر بەردەوام بێت لە گومان کردن ؟ حاشا لله پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ شکی نە کردووە بەڵام کابرای دژە ئیسلام نەزانە و بە نەزانیی خۆی گومان بۆ خۆی و چوار دەور ی دروست دەکات

وە کاتێك ئەم ئایەتە دابەزیووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی سوێند بە خودا نە پرسیار دەکەم و نە گومان دەکەم وە ئەم حەدیسە لەم سەرچاوانەدا نوسراوە : عبد الرزاق فی مصنفه ( ١٠٢١١ ) ، و الطبری فی التفسیر ( ١١ / ١٠٨٩ ) ، و أورده السیوطی فی الدر المنتثور ( ٣ / ٥٧١)

وە ئەم جۆرە وتارانە لە قورئاندا زۆرە ڕوو بە ڕووی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کراوەتەوە بەڵام مەبەست لێی خەڵکییە بە گشتی نەك خودی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) . چونکە ئەگەر پێغەمبەرێك گومانی هەبێت ئەوە قەت ناکرێت پەیام بگەێنێت وە تەنانەت هیچ تاکێك و هیچ دەوڵەتێك و هیچ حیزبێك و هیچ خاوەن فکرێك لە جیهاندا گومانی لە پەیامە کەی نییە و ئەگەر گومانی لە پەیامەکەی هەبێت . ناتوانێت شوێن کەوتووی هەبێت و ئەو تاکە یان ئەو حیزبە یان ئەو فکرە فەشەل دەهێنێت

وە پەیامی ئیسلام ئەوەتا ١٤٠٠ ساڵە بەردەوامە و لە زیاد بوندایە . چونکە تاکەکانیشی گومانیان نییە لە قورئان و خودا و ئاینی ئیسلامی مەزن . ئێستا چۆن خاوەنی پەیامەکە گومانی لا دروست دەبێت !؟ بەڵکو کابرای دژە ئیسلام بەم ڕەخنانە ئاستی نەزانی و ڕق و کینەی خۆی دەردەخات بێجگە لە درۆ و فێڵ کردن کە ئایەتەکە دەبڕێت .

بۆ دڵنیایی زیاتر سەیری وێنەکە بکە لە (١٥) ئایەتی تردا ووشەی ( شك ) هاتووە لە ( ١٣ ) دانەیاندا بە ڕونی باسی ئەوە دەکات ئەوانە گومان و شەکە و دروست بووە . لە دوانیاندا مەبەست لەوەیە کە گومان نییە یەکەمیان ئایەتی( ٩٤) ی **یونسە** کە بابەتی ئەم نوسینەیە و الحمد لله گومانەکەمان پوچەڵ کردەوە .

وە دووەم ئایەتیشیان هەر لە سورەتی **یونسە** ١٠٤ بەهەمان شێوە باسی ئیمانی قەومی **یونس** (ع) دەکات وە هەموان دەزانین قەومی یونس هەمویان باوەڕیان هێنا و هیچ گومان و شکیان نە بوو بۆیە دەفەرموێت : ( **ان كنتم في شك من ديني**)

کابرای دژە ئیسلام ئەمەشمان بۆ ڕاڤە دەکات کە قەومی یونس شکیان هەبووە !؟ بەڵام قەومی یونس شکیان نە بووە و هەمویان باوەڕیان هێناوە . دیقەت بدەن ئایەتی ٩٤ دەڵێت ( **فان كنت في شك** ) وە هەر ئایەتی ١٠٤ ی هەمان سورەت بە کۆ دەفەرموێت ( **ان كنتم في شك** ) وە لە هەردووك ئایەتەکە باسی گومان ناکات بەڵکو باسی باوەڕ دەکات و . بەڵام لە ١٣ ئایەتەکەی تردا بە دڵنیاییەوە باسی ئەوە دەکات گومان هەیە و ئەو کەسانە گوماناوین و باوەڕیان نییە.

عەرەبی قورەیش و جولەکەکانی مەدینە باش شارەزای زمانی عەرەبی بوون و دەیان توانی بەو ئایەتەی ٩٤ ی **یونس** و ١٤٧ ی **البقرة** و ١١٤ ی **الانعام** قورئان و منهجی ئیسلام پوچەڵ بکەنەوە و بڵێن محمد (صلى الله عليه وسلم) گومانی هەیە لە ئاینەکەی و پرس بە اهل الکتاب دەکات .

بەڵام ئەوان عەرەبییان زانیوە و دەیان زانی ئەو مانایە نا بەخشێت . ئەگینا ئەوە باشترین چەك بووە کاتی خۆی بەکاری بهێنن .

بەڵام نەزانێکی وەك تۆ پاش ١٤٠٠ساڵ دێت دەیەوێت ئیسلام بە نەزانی پوچەڵ بکاتەوە مەحاڵە و بە زمانی نەزانیی خۆت ئەم **پرسیارە بێ وەڵامەت لێ دەکەین** : وای دابنێ ڕاڤەی تۆ ڕاستە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گومانی هەبووە !؟ ئادەی پێمان بڵێ گومانی لە چی هەبووە ؟ پرسیاری لە کێ کردووە ؟ ئەگەر گومانی هەبوایا و پرسیاری بکردایە بەهەمان شێوە بەهانەیەکی بەهێزی دەدا بە دوژمنانی وە دەیان گوت ئێوە شوێن ئاینێك کەوتون خۆشتان گومانتان لێی هەیە و ئەوەتا دێن بۆ لای ئێمە پرسیاری ڕاست و دروستیی قورئانەکەتان دەکەن ئایا لای خوداوەیە یان نا ؟ وە ئاینی ئیسلام سەری هەڵ نەدەدا و نەدەما هەر لە سەرەتاوە . پ

اشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری چیی لە جولەکە بکردایا ؟ سفری **نشيد الانشاد** و جۆری مەمك و سیکس و دەست لەملان و سەرجێی لە نیوەی شەودا ؟ یان زینا کردنی لوط لەگەڵ کچەکانیدا ؟ یان زینا کردنی داود (ع) لەگەڵ ژنی سەرکردەکەیدا و سلیمانی (ع) بە زینا ببێت لەو ژنە کە مێردەکەیی کوشت بە دەسیسەیەکی گڵاو یان زیناکردنی خوشك لەگەڵ براکەیدا یان هەزارەها سوکایەتیی تر کە لە کتێبی پیرۆزدا هەیە

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا وشەش

## ئایەتی الصلاة الوسطی &لو كان لابن ادم واديان له گەل گومانی تر

دژە ئیسلامەکان ئایەتی ٢٣٨ ی البقرەیە . وە حەدیسی صحیح هەیە دەڵێت دایکمان عائشة فەرمانی کردووە کە مصحفێکی تایبەتی بە خۆی بۆ بنوسرێتەوە . کاتێك گەیشتوەتە سەر ئایەتی ٢٣٨ ( **حافظوا على الصلوات و الصلاة الوسطى**) بە نوسەرەکەی گوتووە لێرەدا بنوسە ( و صلاة العصر ) چونکە گوێم لێ بووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەم شێوەیە خوێندویەتیەوە . دژە ئیسلام دەڵێت بۆچی ئەم نوسخەیەی قورئانی بەر دەستمان ( و صلاة العصر ) ی تێدا نییە و لابراوە ؟ وەك لە بەشەکانی تردا باسمان کرد ئەمەش یەکێکە لە ئایەتەکان کە نسخ کراوە . بەڵگەشمان بۆ قسەکان مان حەدیسی ٦٣٠ ی صحیح مسلمە بۆمان داناوە

عن أبي يونس . . . فأملت عائشة عليّ [حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وصلاة العصر وقوموا لله قانتين] قالت عائشة: سمعتها من رسول الله.

صحيح مسلم 130, 1

برائی کوڕی عازب دەڵێت ئەو ئایەتە بەم شێوەیە دابەزیووە حافظوا على الصلوات و صلاة العصر . پاشان نسخ بوو گۆڕرا بە ( حافظوا على الصلوات و الصلاة الوسطى ) کەسێکیش لەوێ دانیشت بوو گوتی : کەواتا نوێژی عەسرە ؟ بەرائیش گوتی من پێم گوتیت چۆن دابەزیوە و چۆن نسخ کراوە

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەو ئایەتە نسخ کراوە و صحابەکانیش زانیویانە نسخ کراوە . ئەو حەدیسەی دایکمان عائشەش هەر صحیحە و باسی هەمان شت دەکات . پاشان ئەوە ناکرێت بە بەڵگە چونکە ئەو نوسخەیە تایبەت بووە بە دایکمان عائشة

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەوەیە** : کاتێك عوسمانی کوڕی عفان هەموو نوسخەکانی سوتاند ئەوەی دایك مانی تێدا بوو . ئەی بۆچی هیچ ناڕەزاییەکی دەر نەبڕیووە لەو بارەیەوە ؟ بۆچی نەی گوتووە دەبێت ( و صلاة العصر ) بنوسنەوە ؟ چونکە

دڵنیا بووە کە نسخ کراوەتەوە و صحابەکانیش شایەت بون کە نسخ کراوە بە ( **حافظوا على الصلواة و الصلاة الوسطى** ) ئەوەش هەڵە نییە لە قورئاندا چونکە ئەو نسخانە لە کاتێکدا بووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ژیاندا بووە و صحابەکانیش شایەت بوون.

گومانی دووەمی دژە ئیسلامیەکان دەڵێن ئەم ئایەتە دیار نەماوە ( لو كان لابن آدم واديان من مال لابتغى واديا ثالثا ولا يملأ جوف ابن آدم إلا التراب ) ) بۆ وەڵامی ئەم گومانە دوو بۆچون هەیە بۆچونی

**یەکەمیان** دەڵێت ئەم ئایەتە نسخ کراوە و گۆڕراوە بە ئایەتی( الهاكم التكاثر) . وە ئەگەر نسخیش کرا بێت نا بێت بە هەڵە بۆ قورئان وە هەموو ئەو حەدیسانەی باسی نسخ دەکەن هیچیان صحیح نین وە ئێمە بۆ بەرچاو ڕونی بۆتانی باس دەکەین و احتمالی نەسختان بۆ دا دەنێین ، ئەگەر نسخ کرا بێت هیچ کێشەیەك نییە چونکە نسخەکان هەر هەمووی لە زەمانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووە و سەحابەکان ئاگاداری بوون بەڵام هیچ حەدیسێکی صحیح نییە بە ڕاشکاوی بڵێت ئەم ئایەتە نەسخ کراوە ؟

**دووەمیان** ئەمەیان تەواوە کە دەڵێن ئەمە ئایەتی قورئان نیە ! بەڵکو حەدیسی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) بەڵگەکانی ئەوەی کە حەدیسە بەهێزترە لەوەی کە بڵێت ئایەتە و نسخ کراوە !؟ چونکە ابن عباس کە ترجمانی قورئانە دەڵێت نازانم ئەمە ئایەتە لە قورئان یان نا ؟ وە ابي بن كعبیش دەڵێت ئێمە وامان دەزانی ئەمە ئایەتی قورئانە هەتا( الهاكم التكاثر ) دابەزی . بە هەر حاڵ هەموو بۆچونەکان زیاتر بەلای ئەوەدا لا دەدەن کە ئەمە ئایەت نەبێت و حەدیس بێت وە ئەگەر ئایەت بوایە بە دڵنیاییەوە سەحابەکان دەیان زانی یان پرسیان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد ئایا ئەمە ئایەتە و نسخ کراوە یان نا ؟

.............................................

****** گومانی تریان کە لەبەیجەکانیان بلاوی دەکەنەوە بێ دینەکان.**

**١- ارضاع الكبير: ڕەخنە لە شیردان بە گەورە دەگرن. پاشان زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی ئێستا ارضاع الكبير نەماوە و کەس منداڵی کەسی تر ناکات بە کوڕی خۆی وە ئەو ئایەتە کە دابەزیووە کاتی خۆی و نسخ کراوە هۆکارەکەی ئەوە بووە خەڵکانێك پێش دابەزینی قورئان منداڵیان هەڵ گرتوەتەوە پاش ئەوەی کە ئایەت دابەزی و گوتی ئەوانە منداڵی ئێوە نین وە ئەو دیاردەیە بەس لە سەرەتای اسلامدا هەبوو نەك ئێستا.**

**٢- دەڵێن ٢٠٠ ئایەت لە سورەتی الاحزاب بزر بووە . بەڵام دژە ئیسلام چەواشەکاری دەکات و حاشية ( پەراوێز ) ی کتێبەکان نقل ناکات بەڵکو حەدیسەکان نقل دەکات وە هەر هەمان کتێب کە دژە ئیسلام ڕەخنەی لێ دەگرێت لە حادیثەکەیدا نوسراوە ئەو حەدیسانە لاوازن**

**٣- ڕەخنە لە ئیسلامی مەزن دەگرن دەڵێن دوو ئایەتی قورئان لە قورئاندا نە نوسراونەتەوە . ئەویش ئایەتی ( خلع و حفد ) ن وە ئەوەی مایەی پێکەنینە هەر کابرای دژە ئیسلام خۆی بە ڤیدیۆ شێخ عبد الرحمان السديسي داناوە ئەو دوعایانە دەخوێنێت لە کاتی نوێژدا وە کابرای دژە ئیسلام جیاوازیی نێوان دوعا و ئایەتی قورئان نازانێت !؟ ئەگەر بیزانیایە ئەو ڤیدیۆیەی سدیسیی دا نەدەنا !؟ چونکە ئەگەر ( خلع و حفد ) ئایەتی قورئان بووایا لەگەڵ نوێژدا دەخوێنرا نەك دوای نوێژ وەك دوعا بخوێنرێت !؟ وە ئەگەر ئەو دو ئایەتە هی قورئان بووایا و لا ببرایا بۆچی ئێستا لە دوای نوێژ دەخوێندرێت ؟ دەبوایا هەر نەشمان زانیایە ئەو دو دوعایە چییە ؟**

**٤- یان دەڵێن شەیتان لە کاتی نوێژدا توکی کۆم ڕا دەکێشێت بۆ ئەوەی تڕ یان تس لێ بدەن ئەم حەدیسە لاوازە و هەموو حەدیس گێڕەوەکان و اهلی جرح و تعديل لە لیستی حەدیسە لاوازەکان دایان ناوە وە حەدیسەکە بە کوردی دەڵێت**

لە کاتی نوێژدا شەیتان دێت و توکێکی پاشەڵی نوێژ خوێنەکە ڕا دەکێشێت دەوەستێت هەتا لیی بەر دەبێتەوە و ناڕوات هەتا گوێی لە دەنگێك نە بێت یان بۆنێك نەکات . ئەم حەدیسەش قسەیەکی هیچ و منداڵانەیە . چونکە بە ملیارەها خەڵك نوێژی کردووە هەتا ئەمڕۆمان وە دەبوایا کاتی نوێژ کردن ئیمام بە تەنها بمایاتەوە و لە کاتی نوێژدا ئەو خەڵکە خەریکی تڕ و تس لێدان بونایە و بچونایە دەست نوێژ تازە بکەنەوە !؟ وە ئەو شتانە بە دەگمەنی ڕوو دەدات پەیوەندیی بە شەیتانەوە نییە . بەڵکو جۆری خوراردنەکەیە

٥- پیسایی پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکی تر لە ڕەخنەکانی دژە ئیسلام حەدیسێکی درۆی هەڵ بەستراوە کە ئەسڵی نییە و درۆی خەڵکییە و هەڵ بەستراوە . حەدیسەکە دەڵێت : عائشة گوتویەتی ئەی پێغەمبەری (ﷺ) کاتێك دەچیت بۆ دەشت دەست بە ئاو بگەێنیت پیساییەکەت نا بینرێت وە نا مێنێت . پێغەمبەریش (ﷺ) ئەی نازانیت هەر شتێك لە پێغەمبەرانەوە دەر بچێت زەوی قوتی دەدات و لەسەر زەوی نامێنێتەوە

بەڕێزان ئەو حەدیسە حەدیسێکی درۆ و بوهتان و هەڵ بەستراوە و هیچ سەرچاوەیەکیش نییە بڵێت تەنانەت لاوازیشە بەڵکو محدسەکان دەڵێن هەڵ بەستراوە

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) مرۆڤ بووە و وەك مرۆڤ پیسایی کردووە و بۆنیشی هاتووە و پاشان چی گرنگیەکی تێدایە ئەگەر پیساییەکەی

زەوی قوتی بدات یان بیشارێتەوە ؟ خوداش لە قورئاندا لە زاری خۆشەویستەوە دەفەرموێت انما انا بشر مثلکم . وە ئەو جۆرە حەدیسانە نەك درۆیە بەڵکو هەڵ بەستراوە و هیچ حیکمەتێکیش لەوەدا نیە پیسایی ئەو یان هەر پێغەمبەرێکی تر زەوی بیشارێتەوە و ئەو قسانە درۆ و دەلەسەیە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا وحەوت

## نوسینی قورئان بە ئارەزوی نوسەرەکانی وەحی

عبدالله بن ابي الصرح - وە نوسینی قران بە کەیفی خۆی

وقد اختلف أهل التأويل في ذلك.

13556 – حدثني محمد بن الحسين قال، حدثنا أحمد بن المفضل قال: حدثنا أسباط، عن السدي: " ومن أظلم ممن افترى على الله كذبًا أو قال أوحي إليّ ولم يوح إليه شيء " إلى قوله: تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ . قال: نـزلت في عبد الله بن سعد بن أبي سرح، أسلم، وكان يكتب للنبي صلى الله عليه وسلم، فكان إذا أملى عليه: " سميعًا عليمًا "، كتب هو: " عليمًا حكيمًا "، وإذا قال: " عليمًا حكيمًا " كتب: " سميعًا عليمًا "، فشكّ وكفر، وقال: إن كان محمد يوحى إليه فقد أوحي إليّ، وإن كان الله ينـزله فقد أنـزلت مثل ما أنـزل الله ! قال محمد: " سميعًا عليمًا " فقلت أنا: " عليمًا حكيمًا " ! فلحق بالمشركين، ووشى بعمار وجبير عند ابن الحضرمي، أو لبني عبد الدار. فأخذوهم فعُذِّبوا حتى كفروا، وجُدعت أذن عمار يومئذ.(34) فانطلق عمار إلى النبي صلى الله عليه وسلم فأخبره بما لقي، والذي أعطاهم من الكفر، فأبى النبي صلى الله عليه وسلم أن يتولاه. فأنـزل الله في شأن ابن أبي سرح وعمار وأصحابه: مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا [سورة النحل :106] ، فالذي أكره: عمار وأصحابه = والذي شرح بالكفر صدرًا، فهو ابن أبي سرح.(35)



تحدایەکیش بۆ دژە ئیسلامەکان ئەم پرسیارە بێ وەلامە دەکەین : ئەگەر راست دەکەن لە کتێبی حەدیسە کانمان ئەو ڕیوایەتەمان بۆ دەر بهێنن بە متن و سندەوە و پێمان بڵێن ئەو حەدیسە تا چی رادەیەك ڕاستە پلەی ئەو حەدیسە چییە لای زانایانی حەدیس ؟ وە دڵنیاتان دەکەمەوە هەتا ڕۆژی قیامەت بگەڕێن ناتوانن ئەو حەدیسەمان بۆ بهێنن !؟

گومانێکی دژە ئیسلامەکان هەیە دەڵێت عبداللە ی بن ابي صرح یەکێك بووە لە نوسەرە کانی وەحی وە عبداڵله دەڵێت کاتێک سورەتی **المؤمنين** هاتەخوارەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کردم بۆی بنوسمەوە سەرەتای ئایەتەکە دەستی پێکرد (**ولقد خلقنا الانسان من سلاله من طين** ) ....... هتد .... کۆتایی ئایەتەکەش بەم جۆرە بوە ( **ثم انشأناه خلقآ أخر** ) کاتێک عبداللە گوێی لەم وەسفە ئەبێت بۆ دروستبوونی مرۆڤ زۆر سەرسام ئەبێت ،، بۆیە ئەڵێت ( **فتابارک اڵله احسن الخالقين** )

ئێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو ساتەدا بە عبداللە ئەڵێت بینوسە ئەوەش چونکە ئایەتەکە خۆی وا هاتووە ئێستاش ئایەتەکە بەو برگەیە تەواو ئەبێت .. لێرەوە عبداللە دەکەوێتە شکەوە لە محمد (صلى الله عليه وسلم) و دەڵێت ( ئەگەر محمد ڕاستگۆبێ وەحی بۆ بێت کەواتە منیش وەکو ئەو وەحم بۆ هاتووە . ئەگەر درۆزنیش بێت ئەوەی ئەو ئەیڵێت منیش ئەیڵێم کەواتە لە هەردوو حاڵەکەدا من وەکو محمدم (صلى الله عليه وسلم) هەروەها عبداللە ئەڵێت لە ئایەتەکانی تردا هەمان شت دووبارە ئەبۆوە بۆ نموونە کاتێت محمد (صلى الله عليه وسلم) پێم ئەڵێ بنوسە ( **سميعا عليما** ) من نوسیومە ( **عليما حكيما** ) هەروەها بە پێچەوانەشەوە . بەڵام محمد (صلى الله عليه وسلم) هیچ کێشەیەکی نەبووە و ڕازی بووە ، ئیتر عبداللە بە تەواوەتی دەکەوێتە شکەوە و مرتد ئەبێت و لەدەست محمد (صلى الله عليه وسلم) ڕادەکات ،، دەچێتە لای قورەیش ئەڵێت ( ئەوەی محمد ئەینوسێت منیش ئەتوانم بینوسم ) یان هەردووکمان پەیامبەرین یان هیچمان ،، ئەڵێ محمد (صلى الله عليه وسلم) پێی وتوم بنوسە (الضالمين ) من نوسیومە ( الكافرين ) بەڵام محمد هیچ کێشەی نەبووە و وتویەتی ( كلهم سواء ) واتا فەرق ناکات وەکو یەکن. ئایا خوداکەی محمد (صلى الله عليه وسلم) نەی دەزانی عبداللە دەستکاری قورئانەکەی ئەکات ؟ ئایا نەیەتوانی بە جوبرەئیل بڵێت ئاگاداری محمد بکات کە عبداڵله نەکات بە نوسەری خۆی ؟ پێویستە موسوڵمانان ئەوە بزانن هەرکاتێک ووشەی ( الكافرين ) یان (الضالمين ) ئەخوێننەوە ڕەنگە عبداللە ئاڵوگۆڕی کرد بێت لێرەدا گومانی دژە ئیسلام تەواو دەبێت وەك خۆی لە سەرەوە بۆمان داناون وە بەڵگەشیان بۆ قسەکانیان تەفسیری طبرییە

وە ئەم ڕیوایەتە وەك لە وێنەکەدا دەیبینن لە تفسیری طبری دەرمان هێناوە لە سەری سەرەوە طبری نوسیوێتی ( و قد اختلف اهل التاويل في ذلك ) واتا ئەوانەی ئەم ڕوداوەیان گێڕاوەتەوە و دەڵێن سبب نزولی ئایەتی ٩٣ ی **الانعام** ئەوانەی ئەم ڕوداوەیان گێڕاوەتەوە بە جوۆراو جۆر باسی دەکەن و هەندێکیان دەڵێن لەسەر مسيلمة ی کذاب یان عبداللە بن ابي صرح یان اسود العنسي دابەزیوە . پاشان ئەم ڕیوایەتە لە ڕێگای دوو کەسەوە گێڕراوەتەوە سەیری وێنەکە بکەن نوسراوە حدثنا ( اسباط ) اسباط بن نصر ئەم حەدیسەی نوسیووە بۆیە بە لاواز دا دەنرێت وە زەعیفە و لە نوسخەی تەفسیری طبری هی کتێبدا لە حاشییەکەیدا نوسراوە ئەم حەدیسە زەعیفە لەبەر اسباط بن نصر وە اسباطیش دەڵێت لە ( السدي ) ئەو حەدیسەم بیستووە . واتا گێڕانەوەی حەدیسەکە لە سدیەوە بۆ اسباطە . وە ( سدي ) صحابی نە بووە و ( عبداللە ی بن ابي صرح ) ی نە بینیوە . ئیتر چۆن ئەو حەدیسەی گوێ لێ بووە ؟

وە ئەم جۆرە حەدیسانە وەرناگیرێت چونکە پێی دەڵێن ( مرسل ) وە مرسلیش واتا ئەو کەسانەی گێراویا نەتەوە بزرن . چونکە لە نێوان سدي و اسباطدا ئەو خەڵکانە بزرن کە ئەو شتەیان گێڕراوەتەوە لە زمانی عبداللەی بن ابي صرحەوە وە هەموو حەدیسێکی مرسل وەك هەواڵ دادەنرێت نەك وەك حوجە و بورهان هەروەها هەمان ڕیوایەت هەیە ( كلبي ) گێڕاویەتیەوە . کلبیش ناسراوە شیعەیەکی ڕافیزەی درۆزنە و هیچ کەس حەدیسی لێ وەر نەگرتووە

وە ئەو حەدیسەی دژە ئیسلام کردوێتی بە بەڵگە لە تەفسیری طبری سەیر بکەن ژمارە ٣٤ و ٣٥ نوسراوە و خراوەتە مربعی سورەوە . کردوێتی بە بەڵگە وە تێیدا نوسراوە گوێی عماری کوڕی یاسر بڕراوە ، بەڵام لە حادیثەکەدا نوسراوە ئەو هەواڵە درۆیە . بە هەر حاڵ با زۆر لەسەر ئەو بابەتە نەڕۆین . وە ئەو هەواڵەی عبداللە ی بن ابي صرح درۆیە و ڕاست نییە وە بە هیچ شێوەیەك قورئانی بە پێچەوانەی وەحیەوە نە نوسیووە ؟ وە بۆ دڵنیایی موسوڵمانانی خۆمان و تحدایەکیش بۆ دژە ئیسلامەکان ئەم پرسیارە بێ وەلامە دەکەین : ئەگەر ڕاست دەکەن لە کتێبی حەدیسە کانمان ئەو ڕیوایەتەمان بۆ دەر بهێنن بە متن و سندەوە و پێمان بڵێن ئەو حەدیسە تا چی ڕادەیەك ڕاستە و پلەی ئەو حەدیسە چییە لای زانایانی حەدیس ؟ وە دڵنیاتان دەکەمەوە هەتا ڕۆژی قیامەت بگەڕێن ناتوانن ئەو حەدیسەمان بۆ بهێنن !؟ بۆ تحدای زیاتریش ئەم سەرچاوانەش باسی ئەو ڕوداوەیان کردووە غەیری طبری

ابن أبي حاتم في تفسيره (٤/ ١٣٤٧) الخطابي كما في "معالم السنن" (٢/٢٨٧) ، وشيخ الإسلام ابن تيمية كما في "مجموع الفتاوى" (٣/ ٢٩١) ، و "الصارم المسلول" (ص ١١٥) ، والقرطبي كما في "تفسيره" (٧/ ٤٠)

وە هەر هەمویان تەفسیرن نەك حەدیس بن وە هەر هەموشیان سەرجاوەکەیان ( سدییە ) وەك لە سەرەوە باسمان کرد . وە فعلا عبداللە بن ابي الصرح مرتد بووە و هەڵ هاتووە و چووەتە ناو قورەیشەوە . بەڵام نەی گوتووە من بە پێچەوانەی وەحییەوە نوسیومە و محمد (صلی اللە علیە وسلم) هەر شتێکی گوت بێت منیش شتێکم بۆ زیاد کردووە و پێیان نەزانیووە !؟ هەر کەسیش دەڵێت وا نییە با حەدیسمان بۆ بهێنێت لە کتێبی حەدیسەکان بزانین ئەو ڕیوایەتە هەیە یان نا ؟ وە دڵنیاش بن کە ناتوانن ئەو حەدیسە بهێنن . وە ئەگەر عبداللە بن ابي الصرح وای بکردایە و قورئانی بە ئارەزوی خۆی بنوسیایە و ئەو قسەیە ڕاست بووایا دڵنیا بن هەر ئەو کات باشترین بەهانەی دەدا بە دەست کافرانی قورەیش بۆ ئەوەی ئاینی ئیسلام و قورئان پوچەڵ بکرێتەوە ! ئەی بۆچی نەیان توانی ئەو کارە بکەن ؟ خۆ عبداللە هەڵ هات بوو بۆ ناو کافرانی قورەیش و ترسی کوشتنی نەبوو . پاشان کاتێك فەتحی مەکە کرا بۆچی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) نەی کوشت ؟ وە بۆچی سەحابەکان ڕازی بوون بە زیندوی بمێنێتەوە لە کاتێکدا ئەو دەڵێت من فێڵم کردووە و قورئانم بە ئارەزوی خۆم نوسیووە ؟ ئەم سەحابیە بەڕێزە پاش فتحی مەکە حوکمی مسریان پێ بەخشی وە زۆربەی زۆری ناوچەکانی افریقیا لەسەر دەستی عبداللە فتح کرا . وە بێ بەرییە لەو قسەیە کە بڵێن بە پێچەوانەی وەحی نوسیویەتیەوە . چونکە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) بۆ هەموو ئایەتەکانی قورئان کە دا دەبەزی خۆی لەبەری دەکرد ئینجا دەی گوت بی نوسنەوە و

چەند جارێکیش لە نوسەرەکە دوپاتی دەکردەوە چیی نوسیوە ؟ وە پاشان چەند نوسەرێکی تری بانگ دەکرد دەی فەرموو ئادەی بۆم بخوێنەوە بزانم ئەمە چی نوسراوە ؟ بۆ ئەوە ی دڵنیا بێتەوە بە دروستی نوسراوە

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا وهەشت

## معتزلة و قورئانی و گاڵتەکردنیان بە سورەتی فیل




وەڵامی گومانی ئەم جارەمان هی بە ناو موسوڵمانەکانە کە بە خۆیان دەڵێن قورئانی وە ڕەخنەیان هەیە لە سورەتی ( الفيل ) و دەڵێن چون فیل دە توانیت بە ناو لمی گە رمی بیاباندا بروات بە و لاشە زل و زە بە لاحە ؟ هە روە ها چون بە رگە ی بێ ئاوی دە گریت لە کاتیکدا لە **یەك** سە عاتدا پێویستیی بە چە ندە ها لیتر ئاو هەیە چون بە رگە ی گە رما و تونیتی دەگرێت ؟ چۆن خواردن بۆ ئەو فیلە دابین کراوە ؟

بەڵێ بەڕێزان وەك دەبینن ئەمە ڕەخنەی بە ناو موسوڵمانەکانە بۆ ئایەتێکی قورئان و بە حساب ناویشیان لە خۆیان ناوە قورئانی .

ئەی دەبێت دوژمنانی ئیسلام چیمان پێ بڵێن کاتێك ئەم ڕەخنانە دەبینن لە بەناو قورئانیەوە ؟ بۆ وەڵامی ئەم گومانەش دەڵێین

کاکی چەواشەکار بێ زەحمەت چی لێکۆڵینەوە و چی دیراسەیەکت کردووە یان دات ناوە بۆ ئەوەی پشت گیری لە چەواشەکاریەکانت بکات ؟ ئایا دورگەی عەرەبی ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش بیابان بووە بەم ڕادەیەی ئێستا ؟

ئایا دەزانیت ئەو سوپایەی ابرهة لە حەبەشەوە چۆن هاتن و بە چی ڕێگایەکدا هاتن ؟ ئایا دەزانیت حەبەشە لە کوێیە ؟ بۆچی نابێت لە ڕێگای دەریاوە هات بێتن بۆ مەکە ؟ ئایا ئاسان تر نییە ؟ ئایا تۆ هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیت لایە پێمان بڵێت فیل تحمولی گەرمای بیابان دەکات یان نا ؟ ئایا دەتوانێت بە بیاباندا بڕوات یان نا ؟ ئایا چەند خواردنی پێویستە و چەند ئاوی پێویستە ؟ ئایا چەند ڕۆژ دەتوانێت بێ خواردن و ئاو ڕێ بکات ؟ بەڵام کاکی بەناو قورئانی هاتووە بە بێ بەڵگە و بێ لێکۆڵینەوە بە ئارەزوی خۆی شیکاری دەکات . لێرەدا پرسیارێکی زۆر گرنگ سەر هەڵ دەدات : ئایا کەش و هەوای ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر وەك ئێستا بووە ؟

چونکە حەدیسێکی صحيح ی مسلم ژمارە 1196

هەیە دەڵێت : کەری وەحشی ( زیبرا ) هەبووە و ڕاویان کردووە لە دورگەی عربی . بەڵام ئێستا زیبرا بەس لە افریقیا دەبینرێت وە بە گوێرەی ئەو حەدیسە بێت دورگەی عربی ئەو کاتە کەش و هەوای خۆشی هەبووە مادام زیبرای لێ ژیاوە پاشان با بزانین ئایا مێژوو چی دەڵێت دەربارەی فیل ؟ بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەش پێویستیمان بە کتێبی ( قصة الحضارة ) ی نوسەری بەناوبانگ ( **ول ديورانت** ) دەبێت کە سەرچاوەکانی باوەڕ پێکراون لە هەموو زانکۆ ناسراوەکانی جیهاندا . دیورانت دەڵێت:

لە دەوڵەتی قرطاجنة کە دەکاتی ( قرطاج ) ی ئێستا کە لە تونسە کە پایتەختی فینیقیەکان بووە لە ساڵی ٢٠٢ هەتا ٢٦٤ ی پێش هاتنی مسیح (ع) لەو شارەدا ٢٥٠ هەزار کەس ژیاوە و لەناو شارەکەدا گەوڕی تێدا بووە بۆ ٤٠٠٠ ئەسپ و 3000 )فیل ) *١

ئەو مێژووەش هێندە دور نیە و ٨٠٠ ساڵ پێش هاتنی ئیسلامە . وە ئەگەر ئێستا سەیری تونس بکەین زۆربەی زۆری لمە . بە حسابی کاکی قورئانی بێت دەبێت ئەم هەواڵە هەڵە بێت و فیل چۆن لە تونسدا هەبووە ؟

لەوەش گرنگ تر با بزانین فینیقیەکان ئەم فیلانەیان بۆچی بووە ؟ هەر دیورانت دەڵێت : ئەم فیلانەیان بەکار هێناوە بۆ شەڕ لەگەڵ ڕۆمادا . وە سنوری نێوان ڕۆم و فینیقییەکان ڕوباری ( ئیبرە ) بوو لە ئیسپانیا وە خۆتان دەتوانن بگەڕێن بۆ ئەو ڕوبارە کەوتوەتە ڕۆژ هەڵاتی ئیسپانیاوە . فینیقییەکان ڕۆمەکانیان بەزاند لەو شەڕەدا کە پێی دەڵێن شەڕی ڕوباری ئیبرەBattle of Ebro River

پاشان شاخەکانی ( برانسیان ) بڕی کە زۆر سەختن وە بەرەو نمسا ڕۆشتن خۆشتان دەتوانن بگەڕێن بە دوای شاخەکاندا و بنوسن بە فرنسی (Pyrénées ) بە ئیسپانی (Pirineos )

پاشان بە شاخەکانی ( البدا ) سەرکەوتن بەرەو ئیطالیا ڕۆشتن وە فیلیشیان پێ بوو . بە شەرتێك بگەڕێن بۆ زنجیرە چیاکانی ( الب ) هەر هەمووی بەفرە ١٢ فەسڵە . کاکی قورئانی بە هەوا و بە ئەقڵی خۆی دێت قورئانمان بۆ بە درۆ دەخاتەوە و دەڵێت چۆن فیل بە سەحرادا ڕێ دەکات و هێندە ئاو هێندە خواردنی دەوێت . ئادەی کاکی بە ناو قورئانی وەرە تێمان بگەیێنە چۆن ئەو فیلانە لە ئیسپانیاوە چون بۆ ڕۆما بەو ڕوبارە و ئەو شاخە سەختانەدا

وە تێمان بگەێنە چۆن فیل بەو شاخە بەفرینانەی البدا ڕێ دەکات وە خواردن و ئاویان چۆن بۆ دابین کردون ؟ یان جەنابت ئحاینمان بە کەیف و هەوا و ئەقڵی خۆت پێ دەفرۆشیت ؟ ٢*

وە لەوەش گرنگ تر هەرول یبورانت دەڵێت : کاتێك هارون الرشید دیاریی نارد بۆ شارلمانی سەرۆک ی فەرەنسا سەعاتە ئاوییە بە ناو بانگەکە لەگەڵ فیلێکدا بۆ نارد ٣*

ئادەی کاکی ئەقڵانی پێمان بڵێ

فیل چیی دەکرد لە بغداد ؟ وە چۆن فیلێك لە بغدادەوە ڕۆشت بۆ پاریس ؟ ئادەی کاکی بە ناو قورئانی داوای بەڵگەمان لێ دەکەیت دەڵێیت بۆچی ئاسەواری ئەو فیلانە نەماون کە هێرشیان کرد بۆ مەکە ؟

ئەی بۆچی داوای ئاسەواری ئەو فیلانەی فینیقیەکان ناکەیت ؟ خۆ ساخەکانی الب هەموی بەفرە و زۆربە ی فیلەکان لە الب مردن چونکە قورس بون ڕێگاکان تەنگ بوو دەکەوتنە خوارەوە . خۆ دەبێت ئاسەوار یان ما بێت چونکە ئەو ناوچانە هەمیشە بەفری تێدایە و ساردە . ئەوەی مایەی گاڵتە جاڕییە کاکی معتزلة و قورئانی باوەڕی بە ئەقڵ و شیکاریی خۆی هەیە و دەڵێت ئەو ڕوداوە لە مەکە نە بووە ؟ باشە ئادەی تۆ پێمان بڵێ ئەو ڕوداوە لە کوێ بووە ؟

هەموو سەرچاوە ئیسلامیەکان دەڵێن ئەو ڕوداوە لە مەکە بووە . تەنانەت ڕوداوی فیل لە شیعری جاهیلی پێش ئیسلامیشدا هەبووە . پێش دابەزینی قورئان کافرانی قورەیش زانیویانە ڕوداوی فیل چییە ؟

بۆ ئەو چەواشە کاریەتان زۆری لەسەر ناڕۆین چونکە الحمد لله بە تێری لە پرسیاری بێ وەڵامی ٦١ دا وەڵامی ئەو چەواشەکاریەمان داوەتەوە **سەیری لاپەری (١٣٢) بکەن**

سەرچاوەکان:

1*قصة الحضارة لاپەڕە ٢٩١٤

2*قصة الحضارة لاپەڕە ٢٩٢٧ هەتا ٢٩٣٠

3*قصة الحضارة لاپەڕە ٤٥٢٤

بۆ ڕاست و دروستیی قسەکانمان ئەمەش لینکی کتێبی قصة الحضارەیە کاتێك لینکەکە دەکەیتەوە لە سەرەوە نوسراوە ( الصفحة ) واتا لاپەڕە ئەو ٣ ژمارەیەی دامان ناوە ژمارەی لاپەڕەکانی ئەو ڕوداوانەیە کە لە سەرەوە باسمان کردن خۆشتان دەتوانن دڵنیا ببنەوە کە بەڵگەکانمان ڕاستە . وەك کابرای بەناو قورئانی یان معتزلة بە ئەقڵ و هەوای نەفس قسە ناکەین و بەڵگەی کۆنکرێتی دا دەنێین لە سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە

کە ول دیورانتە و کتێبەکانی ول دیورانت وەك مۆری سەر ئاڵتون وایە باوەڕ پێکراوە لە هەموو زانکۆ جیهانیەکاندا و هەر لێکۆڵینەوەیەك ئاماژە بە ول دیورانت بدات لە جیهاندا ڕەت ناکرێتەوە ، هیوادارم ئەو کەسانەی تاقەتی خوێندنەوەیان هەیە ئەم

کتێبە بخوێننەوە کە ١٦ مجلدە واتا ١٦ هەزار لاپەڕەیە . من خۆم خوێندومەتەوە و زۆر سودم لێ بینیوە . بەهیوای سود گەیاندن بە ئێوەی بەڕێزیش

http//:www.civilizationstory.com/

.....................................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و هەشتا ونۆ

## فڕێدانە پیسای بۆ ناو بیری بضاعة

أنّه قيلَ لرسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ أنتوضَّأُ من بئرِ بضاعةَ وهي بئرٌ يطرحُ فيها الحيضُ ولحمُ الكلابِ والنَّتنُ فقالَ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ الماءُ طَهورٌ لا ينجِّسه شيءٌ الراوي : أبو سعيد الخدري | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح أبي داود الصفحة أو الرقم: 66 : صحيح

سنن أبي داود

ابحث في الكتاب:

1 - كتاب الطهارة

باب التخلي عند قضاء الحاجة

باب الرجل يتبوأ لبوله

باب ما يقول الرجل إذا دخل الخلاء

بَابُ مَا يُنَجِّسُ الْمَاءَ

67 – حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي شُعَيْبٍ، وَعَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ يَحْيَى الْحَرَّانِيَّانِ، قَالَا: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ سَلِيطِ بْنِ أَيُّوبَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ رَافِعٍ الْأَنْصَارِيِّ ثُمَّ الْعَدَوِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُقَالُ لَهُ: إِنَّهُ يُسْتَقَى لَكَ مِنْ بِئْرِ بُضَاعَةَ، وَهِيَ بِئْرٌ يُلْقَى فِيهَا لُحُومُ الْكِلَابِ، وَالْمَحَايِضُ وَعَذِرُ النَّاسِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ»، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَسَمِعْت قُتَيْبَةَ بْنَ سَعِيدٍ، قَالَ: سَأَلْتُ قَيِّمَ بِئْرِ بُضَاعَةَ عَنْ عُمْقِهَا؟ قَالَ: أَكْثَرُ مَا يَكُونُ فِيهَا الْمَاءُ إِلَى الْعَانَةِ، قُلْتُ: فَإِذَا نَقَصَ، قَالَ: دُونَ الْعَوْرَةِ، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: " وَقَدَّرْتُ أَنَا بِئْرَ بُضَاعَةَ بِرِدَائِي مَدَدْتُهُ عَلَيْهَا، ثُمَّ ذَرَعْتُهُ فَإِذَا عَرْضُهَا سِتَّةُ أَذْرُعٍ، وَسَأَلْتُ الَّذِي فَتَحَ لِي بَابَ الْبُسْتَانِ فَأَدْخَلَنِي إِلَيْهِ، هَلْ غُيِّرَ بِنَاؤُهَا عَمَّا كَانَتْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: لَا، وَرَأَيْتُ فِيهَا مَاءً مُتَغَيِّرَ اللَّوْنِ "

[جزء / صفحة] 1 18 [الرقم] 67

گومانی ئەم جارەمان مایەی گاڵتەجاڕییە بە گاورەکان و پاشان بە بێدینەکان کە ڕەخنەی گاورەکان نقل دەکەن و بە حساب ڕەخنە لە ئاینی ئیسلامی مەزن دەگرن . حەدیسەکە دەڵێت : بە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) گوت ئێمە لەبیری بضاعة دەست نوێژ دەگرین وە ئەو بیرە گۆشتی سەگ و پەڕۆی سوڕی مانگانە و پیسایی تێ فڕێ دەدرێت . پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) گوتی ( ئاو پاکییە و هیچ شتێك پیسی ناکات ) .

لێرەدا حەدیسەکە تەواو بوو بەڵام کاتێك خەڵکی و موسوڵمانی عەوام ئەم حەدیسە دەبیستن دەڵێن ئەوە پیسییە وە فعلا ئەوە پیسی و بۆگەنیشە وە کەس بەو شتە ڕازی نییە موسوڵمان بێت یان کافر بێت !؟ بەڵام کاتێك دەڵێین بیر یەکسەر بیرمان بۆ بیرێکی قوڵ دەچێت بە حبل بە سەتڵێکەوە ئاوی لێ دەر بهێنن وە خەڵکیش شتی پیسی تێ فڕێ بدات لەم حاڵەدا ئەو بیرە پڕ دەبێتەوە لە پیسی و

خەڵکی ناتوانن ئاوی لێ دەربهێنن . جێجگە لەوەش ئەو پیسیا نە بۆگەن دەکەن وە کەس نا توانێت بەلای بیرەکەدا بڕوات . بۆیە پڕ دەکرێتەوە بۆ ئەوەی نەخۆشی بڵاو نەبێتەوە لەو شوێنەوە .

کەواتا چۆن خەڵکی دەست نوێژ لەو شوێنە دەگرن ؟ وە چۆن دەتوانن ئەو بۆگەن و پیسیە بدەن لە دەم و چاویان ؟ ئەمەش دەمان گەێنێت بەوەی کە ئەو بیرە قوڵ نەبووە ! بەڵکو بیرێك بووە ئاوی لەبەر ڕۆشتوە لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە ئاراوە .ئەی بۆچی خەڵکی پیسیان تێ فڕێ داوە ؟ سەرچاوەی ئاو لە دنیادا نابێت پیس بکرێت لە کۆن و نوێدا خەڵکی بەدوای ئاوەوە بوون تەنانەت کوردەواریی خۆشمان بە شوێنی نیشتەجێ دەڵێن ( ئاوەدانی ) و هیچ کەسێك لە کۆن و نوێدا سەرچاوەی ئاو پیس ناکاتەو حەدیسەش ابو داود لە ( کتاب الطهارة ) دایناوە واتا کتێبی پاك و تەمیزی لە بەشی ( ماینجس الماء ) واتا ئەو شتانەی ئاو پیس دەکەن . وە کردوێتی بە بەڵگە بۆ ئەوەی هەر ئاوێك لەبەری بڕوات پیس نا بێت . بەڵام کاکی گاوری نەخوێندەوار حەدیسەکە نقل دەکات و پێمان ناڵێت لەچی بەشێك وەری گرتووە ؟ یان هەر ئەو شتانەش نازانێت و کۆپی و پەیستی دەکات . فەرموون ئەمەش کتێبی ئەو حەدیسەیە لە سنن ابي داوددا لە ( باب ما جاء في بئر بضاعة ) ١-١٧ حەدیسی ٦٦. **لە وێنەکە دیارە دامانەوە**

وە حەدیسی دوای ئەو کە حەدیسی ژمارە ( ٦٧) دەکات باسی قوڵی و پانیی ئەو بیرە دەکات و دەڵێت : قوڵی بیرەکە دەگاتە ناو گەڵی کەسێك واتا مەترێك دەبێت . وە پانیەکەی (٦ باڵە واتا ٦ )مەتر دەبێت . ئێستا ئێمە تێ دەگەین کە ئەو بیرە قوڵ نە بووە وە پان و بەرین بووە بۆیە خەڵکی توانیویانە لە چوار دەوری دەست نوێژ بگرن . دەقی حەدیسی ( ٦٧ ) مان لە وێنەکەدا بۆ داناون و لێرەدا جارێکی تر ئەو پرسیارە سەر هەڵ دەدات : بۆچی پیسای لەو بیرەدا بووە ؟ هەمو حەدیس گێڕەوە کان و مێژونوسەکان دەڵێن خەڵکی پیساییەکانیان فڕێ دەدایە دەرەوە و کاتێك باران دەباری ئەو پیساییانە ی لەگەڵ خۆی ڕا دەماڵی بۆ ئەو بیرە چونکە لەسەر ڕێگای خەڵکی بو وە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم) واتا لە سەنتەری شاردا بوو بە زمانی ئێستامان وە دەکەوێتە باشوری ڕۆژئاوای مزگەوتەکەوە و دەکاتە شوێنی پارکی سەیارەکانی ئوتێلی الحارثية ی ئێستا لە مەدینەی منەورە وەك گوتمان لە کۆن و نوێشدا خەڵکی ئاو سەرچاوەی ئاویان پیس نە کردووە ! چونکە سەرچاوەی ژیانیان بووە . بەڵکو باراناو ئەو پیسیانەی هێناوە و تێی فڕێ داوە . لە فقهی ئیسلامیشدا هەر ئاوێك وەستاو بۆگەن بێت ئەو ئاوە بەکار ناهێنرێت بۆ هیچ شتێك . وە هەر مرۆڤیش خۆی ناتوانێت ئەو ئاوە بەکار بهێنێت ئەگەر موسوڵمان بێت یان کافر بێت . وە لە کتێبی عون المعبود لشرح سنن ابي داود بەشی (١ لاپەڕە ٨٨ هەتا ٩١) ابن القيم بە تفصيلی باسی هەموو حەدیس گێڕەوەکانی کردووە بە بەڵگەوە کە ئاوی بیری ( بضاعة ) لەبەری دەڕۆشت و لە کاتی باراندا ئەو پیسیانەی تێ دەکەوت وە بیرەکە خۆشی قوڵ نە بووە و شتەکانی فڕێ داوەتەوە .

پێویست ناکات زۆر بڕۆین لەسەر ئەم حەدیسە چونکە هیچ کەس سەرچاوەی ئاو پیس ناکات لە هیچ زەمانێکدا وە هەموو سەرچاوە ئیسلامیەکان و فقهی ئیسلامیش باسی بیری بضاعة دەکەن بە بەڵگە بۆ ئەوەی هەر ئاوێك لەبەری بڕوات پیس نیە وە ئەو حەدیسەش هەمان شت دوپات دەکاتەوە دەڵێت مادام بیری بضاعة ئاوەکەی دەڕوات پیس نییە بەڵام کاکی گاور بیری چووە کە

خوداکەی پێی دەڵێت گوتان دەرخوارد دەدەم ؟ سەیری سفری **حزقیال** ٤ بکەن دەق ١٢ و ١٣ نوسراوە کولێرەی جۆ دەخۆیت، لەسەر ئەو پیساییەی لە مرۆڤەوە دەردەچێت لەبەرچاویان دەیبرژێنیت یەزدان فەرمووی: نەوەکانی ئیسرائیل بەم چەشنە نانی گڵاو دەخۆن لەنێو ئەو نەتەوانەی بۆ لایان دەریان دەکەم

.........................................................................................................................................................................................

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و نەوەد

## کوشتن و مل بڕین و لێدان بە شمشێر لە ئیسلامدا

1. لَيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّـهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿البقرة: ١٧٧﴾

2. إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّـهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّـهِ وَاللَّـهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿التوبة: ٦٠﴾

3. فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّـهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَـٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّـهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿محمد: ٤﴾

1. وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ إِلَّا أَن يَصَّدَّقُوا فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللَّـهِ وَكَانَ اللَّـهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿النساء: ٩٢﴾

2. لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّـهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّـهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿المائدة: ٨٩﴾

3. وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّـهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿المجادلة: ٣﴾

4. فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿البلد: ١٣﴾

( فَاضْرِبُواْ فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُواْ مِنْهُمْ كل بَنَانٍ )

بدەن لە سەریان و ملیان بپەڕێنن وە هەموو دەست و قاچەکانیشیان ببڕنەوە

( إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ )

هەر کاتێك توشی کافرەکان بوون بیدەن لە ملیان و سەریان بپەڕێنن

پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەمو دژە ئیسلامەکان

یەکێکی تر لە ڕەخنەی دژە ئیسلامەکان ئەوەیە دەڵێن لە قورئاندا ئایەتی ١٢ ی **انفال** هانی موسوڵمان دەدات بۆ کوشتن . ئەوەی مایەی پێکەنینە تێ نەگەیشتنی ئەم دژە ئیسلامانەیە . تەنانەت بە وێنەش ئایەتەکە بڵاو دەکەنەوە نوسیویانە ( بدەن لە سەریان و ملیان بپەڕێنن و هەموو دەست و قاچەکانیشیان ببڕنەوە ) لە کاتێکدا ئەو ئایەتە باسی مل پەڕاندن و بڕینی دەست و قاچ ناکات وە ئایەتەکە دەفەرموێت :(( **اذ یوحي ربك الى الملائكة اني معكم فثبتوا الذين امنوا سالقي في قلوب الذين كفروا الرعب فاضربوا فوق الاعناق و اضربوا منهم كل بنان)** ). ئەم ئایەتە باسی غزوەی بەدر دەکات کە موسوڵمانەکان کەم بون خودا ١٠٠٠ فریشتەی ناردووە بۆ یارمەتیی موسوڵمانەکان . وەئەم ئایەتە تایبەتە بە فریشتەکان چونکە سەرەتای ئایەتەکە دەفەرموێت ( **اذ یوحي ربك**

**للملائكة )** وە کاری ئەو فریشتانە ئەوە بووە ( **فاضربوا فوق الاعناق و اضربوا منهم كل بنان** ) واتا لە سەرو ملیان بدەن . سەرو ملی هەموو کەسێکیش سەرێتی واتا فریشتەکان لە سەری کافرەکانیان دەدا ، خۆشتان دەزانن ئەگەر لە سەری مرۆڤ بدرێت کەسەکە گێژ دەبێت یان لە هۆش خۆی دەچێت یان زۆر جار شتێکی بەهێز بەر سەرمان دەکەوێت بەر چاومان ڕەش دەبێت و هیچ نا بینین یان وەك ئاگر بە بەرچاوماندا دێت و ترکیزمان نامێنێت . کاری دووەمی فریشتەکان لێدانی پەنجەکانیان یان سەری پەنجەکانیان بووە ( **و اضربوا منهم كل بنان** ) وە بنان واتا سەری پەنجەکان بەڵگەشمان ئایەتی ٤ ی سورەتی **القیامەیە** ( **بلى قادرين على ان نسوي بنانه** ) کاتێکیش مرۆڤ لە سەری پەنجەکانی دەدرێت زۆر کاریگەری زیاترە وەك لە دەستی یان قوڵی بدرێت چونکە لێدانی سەری پەنجە دەست سڕ دەکات و هەرچییەکت بە دەستەوە بێت لێت دەکەوێت وە مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك نا توانێت لە کاتی شەڕدا لە سەری پەنجەی دوژمنەکە ی بدات ! وە ناشتوانێت لە سەری بدات چونکە بەرامبەرەکەشی شمشێر و قەڵغان و ڕمی پێیە و دەتوانێت بەرگر ی لە خۆی بکات و نەهێڵێت لەو شوێنانەی یان شوێنی تری بدرێت کەواتا کاری فریشتەکان ئەوە بووە لە سەری کافرەکان بدەن بۆ ئەوەی گێژ ببن وە لە سەری پەنجەکانیش یان بدەن بۆ ئەوەی ئەو شمشێر و قەڵغان و ڕم و ئامێری جەنگانە یان لێ بکەوێت . ئەو کات بە ئاسانی دەکوژرێن وە ئەو ئایەتە تایبەتە بە فریشتەکان نەك بە موسوڵمانەکان . سەرەتای ئایەتەکەش صریحە کە ئەو لێدانانە تایبەتە بە فریشتەکان نەك موسوڵمانەکان ؟ وە مرۆڤ نا توانێت لەو شوێنانە بدات لە کاتی جەنگدا . ئادەی دژە ئیسلام پێمان بڵێ ئەو ئایەتە کوا باسی سەر پەڕاندن و دەست و قاچ بڕین دەکات ؟ یان کارەکەی تۆ ئاسانە ئایەتە کە ببڕە و کۆپی و پەیست بکە ئیتر کاری تۆ تەواوە و ڕەخنەت لە ئیسلام گرتووە . ئێستا با بچینە لای ئایەتی ٤ ی سورەتی **محمد** دەفەرموێت ( **فاذا لقيتم الذين كفروا فضرب الرقاب)** . کابرای دژە ئیسلام ڕاڤەی کردووە نوسیویێتی هەر کات توشی کافرەکان بون بیدەن لە ملیان و سەریان بپەڕێنن ! سەیری وێنەکە بکەن !؟ ئەوەی مایەی پێکەنینە ئەم تێگەیشتن و ترجمەیەیە چونکە ئایەتەکە باسی گۆڕەپانی جەنگ دەکات وە هەموو جەنگێکیش لە جیهاندا دەبێت سەرباز یان بەرامبەرەکەی بکوژێت یان خۆی بکوژرێت . ئیتر ڕەخنەی چی لەو ئایەتە دەگرن ؟ لە کاتێکدا شەڕی کۆن بە شمشێر بووە و هەموو سەربازێکیش لە شەڕدا بە گوێرەی بەرزایی ئاستی دەستی شەڕ دەکات و شمشێر دەوەشێنێت پاشان ئادەی وەرە کاکی دژە ئیسلام پێم بڵێ بە چی پێوەرێك ( ضرب الرقاب ) لای جەنابت بە مانای مل پەڕاندن دێت !؟ خۆ لە قورئاندا لە ئایەتی( ١٧٧ ی **البقرة** و ٦٠ ی **التوبة) دا** ناوی ( الرقاب ) وەك ئایەتی ٤ی **محمد** بە کۆ هاتووە مەبەستی لە کۆیلەکانە . هەروەها ( الرقبة ) واتا کۆیلە بە تاك شەش جار هاتووە لە ئایەتی ٩٢ ی **النساء** وە ٨٩ ی **المائدة** وە ٣ ی **المجادلة** وە ١٣ ی **البلددا** ).

**پرسیاری بێ وەڵامیشمان ئەمەیە** : بۆچی لە ئایەتی١٢ ی **انفالدا** بە اعناق هاتووە ولە ئایەتی ٤ ی **محمددا** بە رقاب هاتووە ؟ ئایا تۆ دەزانیت مانا و جیاوازیی نێوان عنق و رقبة و جید چییە ؟ خۆ لە ئایەتی ٥ ی **المسددا** دەفەرموێت (**في جيدها حبل من مسد** ) خۆ(عنق و رقبة و جید) هەرسێکیان بە مانای مل دێت . بۆچی بە کۆیلەش دەگوترێت رقبة ؟ یان فك رقبة ؟ خۆ ئەگەر تۆ ئەم ئایەتە

ڕاڤە بکەیت دەنوسیت ( کردنەوەی ملێك ). یان لە ئایەتی ١٧٧ ی **البقرة** و ٦٠ ی **التوبەدا** باسی صدقات دەکات دەبێت بدرێت ( و في الرقاب ) بە ڕاڤەی جەنابت بێت دەبێت ئەو پارە بدرێن بە ملەکان !؟ دڵنیام ناتوانیت وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەیتەوە و ئاستی زانیاریت هێندە بەرز نییە ئەم جارەیان ئاسان کاریت بۆ دەکەم . وە پێت دەڵێم کاتێك لە کوردەواریی خۆماندا دوو کەس زویر دەبن کابرا دەڵێت ( گەردنم ئازاد بکە ) یان ( **دەڵێت من لە ئاستی ڕاستیدا گەردنم لە مویەك باریك ترە** ) وە زۆر نموونەی تریشمان هەیە لەسەر گەردن کابرا مەبەستی لە هەموو لاشەیەتی نەك بەس بە تەنها لە بەشێکی لاشەی بێت کە گەردنێتی . بۆیە دەبینین لە زمانی عەرەبیشدا کۆیلە بە ( رقبة یان رقاب ) ناو براون مەبەست لە کەسەکەیە نەك لە ملی ! وە ئایەتەکە دەڵێت لێیان بدەن نەك لە ملیان بدەن چونکە لە کاتی شەڕی دەستە و یەخە و ڕوبەڕوبونەوەدا بە تایبەتی شەڕی کۆن بە شمشێر و ڕم . هەر یەکەیان لە چەندەها شوێنی بەرامبەری دەدات واتا لە لاشەی کەسەکە بە تواوەتی دەدرێت هەر لە قاچی هەتا سەری وە هیچ سەربازێك بۆی ڕێ ناکەوێت هەموو جارێك ١٠٠% لە ملی بەرامبەرەکەی بدات بەڵکو لە هەموو گیانی دەدات هەتا دەکەوێت و دەکوژرێت . بۆیە ڕاڤە کردنی ( الرقاب ) بە هەموو لاشە دروستە و هیچ کێشەی نییە وەك لە سەرەوە باسمان کرد . ئەگەر ئایەتەکەش بە تەنها بە مانای ( لێدانی مل ) ڕاڤە بکەین هەر تەواوە و هیچ کێشەیەکی نییە چونکە لە کاتی شەڕدا هەموو شتێك جائیزە و هیچ شەڕێك لە کۆن و نوێدا یاسای تایبەتی نەبووە لە کوێ بدەن و لە کوێ نەدەن . وە ئایەتەکەش باسی کاتی شەڕ دەکات کە دوو سوپا تێکەڵ بوبێتن نەك باسی دوای شەڕەکە بکات و هەر کافرێکیان بینی لە ملی بدەن !؟

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و نەوەد و یەك

## کەرەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یعفور

بەڕێزان ئەم کەرە کە ناوی یعفورە بەس لە سەرچاوەکانی شیعە و سۆفییەکاندا هەیە و هیچ سەرچاوەیە کی ئیسلامی باسی نە کردووە !؟ با لە سەرەتادا ڕەخنەی دژە یسلامەکانتان وەك خۆی بۆ دابنێینەوە . لە سایدە عەرەبیەکان وەریان گرتووە و دەڵێن پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کەرێکی هەبووە ناوی ( یعفور ) بووە و ئەم کەرە زۆر حەدیسی سەیر سەیریان لەسەر داناوە . دەڵێن گوایا کەرەکە قسەی کردووە . وە گوایا ئەم کەرە لە نەوەی ئەو کەرەیە کە لە کەشتیەکەی نوحدا بووە وە تایبەت بووە بە پێغەمبەران عليهم السلام و نەوەی ئەم کەرە نەی هێشتووە هیچ کەسێك سواریان ببێت ئیلا پێغەمبەران نەبێت . وە دەڵێن ئەم یعفورە کاتێك بیستوێتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مردووە ئەمیش هیچی نە خواردووە هەتا تۆپیوە . وە دەڵێن نا ئەم کەرە کە بیستوێتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مردووە ئینتیحاری کردوە و خۆی فڕێ داوەتە بیرێکەوە . بە هەر حاڵ ڕیوایات و قسەی هیچ و خورافات زۆرە لەسەر یعفور بەلام هیچیان ڕاست نین وە ئەم حەدیسانەی یعفور هەر هەمووی درۆیە و تەنانەت هیچ کام لە

حەدیسەکان بە لاوازیشیان دا نەناوە بەڵکو دەڵێن باطلە یان درۆیە یان هەڵ بەستراوە یان ... هتد . وە یعفور و باسی یعفور بەس لە دوو شوێندا هەیە.

وە بە ڕاستی دا دەڵێن : **یەکەمیان** حسینیەکان و ئیمامەکانی شیعە . **دووەمیان** تەکیە و خانەقای دەروێشەکان و شێخانی تەریقەت .

وە دژە ئیسلامەکان بۆ ئەوەی گومان دروست بکەن دێن چەندەها سەرچاوە دا دەڵێن کە قسەکانیان ڕاستە ئێمەش لێرەدا دوو سەرچاوەمان بۆ داناون لەوانەی دژە ئیسلام دەیکەن بە بەڵگە و حاشیەکەی دەبڕن وە ئەو حەدیسەیە درۆیە . فەرموون ئەمە سەرچاوەی یەکەمی ئەوان .

کتێبی ابن کثیرە البدایة و النهایة.

ئەمە لینکی ئەو حەدیسەیە لە ابن کثیردا لاپەڕە ٧١٧ بۆ یعفور دەڵێت ( **هذا حديث غريب جدا** ) واتا حەدیسێکی زۆر غەریب و سەیرە

http://shamela.ws/browse.php/book-930/page-2494#page-2495

................

بابەتی ناو لینک

السيرة النبوية لابن كثير

ابحث فى الكتاب:

يُوسُفَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سُوَيْدٍ الْجُذُوعِيُّ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بن أذين الطَّائِيُّ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِخَيْبَرَ حِمَارٌ أَسْوَدُ فَوَقَفَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا عَمْرُو بْنُ فُلَانٍ، كُنَّا سَبْعَةَ إِخْوَةٍ كُلُّنَا رَكِبَنَا الْأَنْبِيَاءُ وَأَنَا أَصْغَرُهُمْ، وَكُنْتُ لَكَ فَمَلَكَنِي رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَكُنْتُ إِذَا ذَكَرْتُكَ كَبَوْتُ بِهِ فَيُوجِعُنِي ضَرْبًا.

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَأَنْتَ يَعْفُورٌ.

هَذَا حَدِيث غَرِيب جدا.

وَإِلَى هُنَا تنتهي السِّيرَة النَّبَوِيَّة للامام ابْن كثير، وَالْحَمْد لله الذى أعَان عَلَيْهِ، ويتلوها جُزْء مُفْرد فِي شمائل الرَّسُول وخصائصه وفضائله وَدَلَائِل نبوته

[جزء / صفحة] 4 717 [الرقم]

ئەمەش لسان الميزان محمد بن مزيد ناوەکەی لە لیستەکەدا ژمارە ١٢٢٦ وە ابن حبان دەڵێت ئەم حەدیسە باطلە

1226 – "محمد" بن مزيد أبو جعفر عن أبي حذيفة النهدي ذكر بن حبان 1أنه روى عن أبي حذيفة هذا الخبر الباطل عن عبد الله بن حبيب الهذلي عن أبي عبد الرحمن السلمي عن أبي منظور وكانت له صحبة قال لما فتح الله على نبيه خيبر أصابه من سهمه أربعة أزواج خفاف وعشر أواق من ذهب وفضة وحمار اسود فكلم النبي صلى الله عليه وآله وسلم الحمار فقال: ما اسمك قال يزيد بن شهاب اخرج الله من نسل جدي ستين حمارا كلهم لم يركبهم إلا نبي ولم يبق من نسل جدي غيري ولا من الأنبياء غيرك اتوقعك أن تركبني وقد كنت قبلك لرجل

وه ئەمەش سایدی الدرر السنیة کە هەموو حەدیسەکانی تێدایە . خۆتان بە فۆنتی عربی بنوسن ( یعفور ) هەموو محدسەکان دەڵێن یعفور درۆیە و پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم) کەری نەبووە قسە بکات و ناوی یعفور بێت

http://www.dorar.net/hadith

---

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و نەوەد و دوو

## ڕۆح چییە ؟



هەموتان حەز دەکەن بزانن ڕۆح چییە ؟ تۆزێك بابەتەکە درێژە بەڵام ڕاستیی زۆری تێدایە کە تۆ بێ ئاگایت لێی دەربارەی ڕۆح ئەم پرسیارە زۆر گرنگە لای هەمو مرۆڤێك دیندار و بێدین . وە ڕەخنەیان لە قورئان ئەوەیە دەڵێن بۆچی قورئان وەڵامی ئەو پرسیارەی

نەداوەتەوە : (**يسالونك عن الروح قل الروح من امر ربي** )؟ وە دەیكەن بە ڕەخنە بەسەر خودا و اسلام و قورئانەوە جۆرەها ڕەخنەیان دروست كردوە بەڵام هەر هەمووی یەك ڕێچكەیان هەیە دەڵێن الله یان محمد (صلى الله عليه وسلم) نەیزانیوە رۆح چییە ئێمەش لەم باسەدا بە گوێرەی بیر و باوەڕەكانی بەرامبەر وەڵام دەدەینەوە و با بزانین لای بەرامبەر رۆح چییە ؟

سەرەتا دەچینە لای كتێبی پیرۆز هەردووك بەشەكەی پەیمانی كۆن و نوێ : لە سفری **اللاوين ڕێنمایی كاهینی** ١٩ -٣١ دەڵێت مەگەڕێنەوە بۆ لای نێوانگر و بەدوای رۆح ئامادەكاردا مەگەڕێن، پێیان گڵاو دەبن، من یەزدانی خوداتانم ئەم دەقەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی لە تەوراتیشدا خودا هەمان شتی قورئان دەڵێت ( قل الروح من امر ربي ) تەنانەت فەرمانیشیان پێ دەكات بە دوایدا نەگەڕێن چونكە پێی گڵاو دەبن . كەواتا كەسێكی جولەكە یان گاور بۆی نییە ڕەخنە لە قورئان بگرێت وە بڵێت الله لە قورئاندا نازانێت ڕۆح چییە ؟ چونكە ئەوە كتێبەكەی خۆی پێی دەڵێت بەدوایدا مەگەڕێن بەڵام كێشە لەوەدایە ئەمان سەرپێچی خودایان كردووە و جۆرەها رۆحیان دروست كردووە و نوسیووە لە كتێبەكەیاندا فەرموون سەیری جۆرەكانی رۆح بكەن لە كتێبی پیرۆزدا : لە پوختەی مێژو (٢ بەشی ١٨ دەق ١٩ بۆ ٢٤) رۆحی فێڵ باز هەیە خەڵكی فریوو دەدات وە خودا ویستویەتی ئاحاڤ پادشای ئیسرائیل فریوو بدات گوتویەتی كێ دەتوانێت ئەو كارەم بۆ بكات ؟ رۆح گوتویەتی من ئەو كارە دەكەم و دەچمە ناو لەشی پێغەمبەرەكانی بنو ئیسرا ئیلەوە و دەیان كەم بە پێغەمبەری درۆزن وە فیتنەی خستوەتە ناو پێغەمبەرەكانەوە لەبەر دەم پادشادا هەروەها لە **سفری القضاة ڕابەران** ٩ – ٢٣ دا خودا رۆحی خراپی ناردووە بۆ ئەوەی تۆڵە بكاتەوە لە **سفری ساموێلی** یەك ١٦ دەق ١٤ بۆ ٢٣ باسی ئەوە دەكات شاولی پادشا ( ئێمە پێی دەڵێین طالوت ) خودا ڕۆحی پیسی بۆ ناردووە ئەوانیش گەڕاون بە دوای كەسێكدا قیثارە بژەنێت ( قیثارە ئالەتێكی كۆنە) گەڕاون داود (ع) باشترین قیثارە ژەن بووە كاتێك ڕۆحە پیسەكە بۆ طالوت هاتووە داودیش قیثارەی لێداوە و ڕۆحەكە ڕۆشتووە هەر **ساموێلی یەك** ١٩-١٠ دەڵێت ڕۆحە بەدەكەی شاول بە قیسارەش دانەمركایەوە و شاول ویستی داود بكوژێت داودیش هەڵ هاتووە هەر سفری **ساموێلی یەك** بشی ٢٨ باسی جادوگەرە درۆكان دەكات . وە دەڵێت شاول ( جالوت ) هەمو جۆرە فاڵ گرتنەوە و رۆح ئامادە كردنێكی قەدەغە كردووە . شەڕی بووە لەگەڵ فەلەستینیەكان دا و ئەوان هێزیان زیاتر بووە شاول ترساوە لەو كاتەشدا ساموێلی پێغەمبەریش مردووە هەتا لێی بپرسێت چی بكات و داوا لە خودا یارمەتی بدات بۆیە گەڕاون بە دوای فاڵچەكدا وە ئافرەتێكیان دۆزیوەتووە شاولیش پی گوتووە لە ڕێگای جنۆكەوە ساموێلم بۆ بدۆزەرەوە ؟كاتێكیش ژنەكە دۆزییەوە ، شاول پێی گوت چی دەبینیت ؟ ژنەكە گوتی رۆحێك ( واتا خودایەك ) دەبینم بەرز دەبێتەوە . دیقەت بدەن لێرەدا رۆح خودایە وە خوداش رۆحە

ماناكانی رۆح لە پەیمانی تازەدا ( ئینجیل ) : وە مانای ئەسڵی ڕۆح بە ( ريح او نسمة ) واتا با یان شنەبا هاتووە . وە مانا و جۆری تریشی هەیە بۆ نموونە شتێكی نە بینراو وەك رۆحی فاڵچییەكان وەك لە كردار **اعمال الرسل** ١٦-١٦ دا نوسراوە ئەوەبوو بۆ شوێنی نوێژكردن دەچووین، تووشی كارەكەرێك بووین رۆحی فاڵچییێتی تێدابووڕۆحی چەواشەكار هەیە وەك لە نامەی **یەكەمی یوحنا** ٤-٦ دا

نوسراوە : ئێمە لە خوداوەین و ئەوەی خودا بناسێت گوێمان لێ دەگرێت، بەڵام ئەوەی لە خوداوە نەبێت گوێمان لێ ناگرێت. ڕۆحی ڕاستی و ڕۆحی چەواشە بەمە دەناسین هەروەها پۆلص لە نامەی یەکەمیدا بۆ **تیمۆساوس** ٤-١ دا دەڵێت ڕۆح بە ڕاشکاوی دەفەرموێ لە کۆتایی ڕۆژگار هەندێك لە باوەڕ هەڵدەگەڕێنەوە شوێنی ڕۆحی چەواشە و فێرکردنەکانی ڕۆحەپیسەکان دەکەون ڕۆحی مەسیح هەیە لە نامەی یەکەمی یوحنا ٤-٣ دا نوسراوە بەڵام هەر ڕۆحێکیش دان بە عیسا نەنێت، لە خوداوە نییە ئەو ڕۆحە دژە مەسیحە کە بیستووتانە دێت و ئێستا وا لە جیهاندایە :ڕۆحی بێ فیز وەك **لە اشعياء** ٥٧ – ١٦ دا باس کراوە . ڕۆحی دڵ نەرمی وەك پۆلص لە نامەی یەکەمی بۆ **کۆرنتۆس** ٤-٢١ دا دەڵێت چیتان دەوێ؟ بە دار بێمە لاتان یاخود بە خۆشەویستی و ڕۆحی دڵنەرمی؟ڕۆحی شکاو لە **مزموری** ٥١-١٧ دا دەڵێت : قوربانییەکان بۆ خودا ڕۆحی شکاوە ڕۆحی فاشل لە نامەی دووەمی پۆلص بۆ **تیمۆساوس** ١-٧ دا دەڵێت : چونکە خودا ڕۆحی ترسی پێمان نەداوە بەڵکو ڕۆحی هێز و خۆشەویستی و خۆڕاگری .ڕۆحی جێگر لە نامەی پۆلص بۆ ڕۆما ١-٤ دەڵێت : هەروەها بەگوێرەی ڕۆحی پیرۆزیێتی بە هێزەوە کوڕی خودا دیاری کرا، بە هەڵستانەوەی لەنێو مردووان، عیسای مەسیحی گەورەمان

دیقەت بدەن لە کتێبی پیرۆزدا (**ڕۆحی فێڵباز &بەد &خراپ &خودا &با &شنەبا &نەبینراو &فاڵچی &چەواشەکار &پیس &مەسیح &بێ فیز &دڵ نەرمی &شکاو & فاشل &ترس &جێگر هەیە . وە لە کۆتایشدا روح القدس هەیە**)

لێرەدا پرسیارێك لە اهل الکتاب دەکەین . بە گوێرەی کتێبەکەتان ڕۆح کامیانە ؟ وە ئەم ڕۆحانە کامیان هی مرۆڤە ؟ بۆچی بە قسەی موساتان نەکردوە لە تەوراتدا لە **سفری لاوین** ١٩ – ٣١ کە دەڵێت بە دوای ڕۆحدا مەگەڕێن !؟ ئایا خۆشتان دەزانن ڕۆح چییە و کامیانە ئەگەر بێینە لای سۆفی و شیعەکان تەفسیر و شیکاریی سەیر و خورافییان هەیە بۆ ڕۆح کە دورە لە بنەماکانی ئاینی ئیسلامەوە . هەروەها لای بوذییەکان ڕۆح هێزێکە دەتوانن مرۆڤ یاریی پێ بکەن و لە ڕێگای وەرزشەوە کە پێی دەڵێن یۆگا ؟. دەتوانن زۆر شت بکەن . بەڵام ئەوەی سەیرە ناتوانن نەهێڵن بمرن وە ڕۆحەکەیان هەر لێ دەستێنرێت لای هیندۆس و زەردەشتییەکان و زۆر تایەفەی تریش ڕۆح پاش مردنی کەسەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی و دەچێتە شتێکی ترەوە

بۆ نموونە ڕۆحی ئاژەڵێك دەچێتە مرۆڤێکەوە هەروەها بە پێچەوانەشەوە . ئەمەش پێی دەڵێن تناسخ الارواح واتا استنساخ کردنی ڕۆحەکان . ئەگەر مێژوو بگەڕێین پڕە لە چیرۆکی ڕاستی و خورافاتیش دەربارەی ڕۆح و نەمردن و ژیانی تا هەتای وە هەوڵیان داوە ( اکسیر الحیاة ) بدۆزنەوە کە بە گەنجی بمێننەوە و نەمرن وە اکسیر الحیاة لە چیرۆکی هەموو گەلانی جیهاندا هەیە . وە وێنەکە یەکێکە لە چیرۆکە چینییە بە ناو بانگەکان کەروێشکێکی سپییە خەریکی دروست کردنی اکسیر الحیاتە،ئەم ئەکسیرەش دەرمانێکە ئامادەی دەکەن بۆ ئەوەی ئەو کەسە بیخواتەوە و نەمرێت . بەڵام تا ئێستا ساڵی ٢٠١٥ کەس نەی توانیوە ئەو اکسیرە بدۆزێتەوە . ئەگەر بێینە سەر باسی ڕۆح لە لای بێدینەکان وە لێیان بپرسین ڕۆح چییە ؟ناڵێت نازانم !؟ بەڵکو دەڵێت ڕۆح فشەیە و خورافاتی

ئاینەکانە . کاتێکیش لێی دەپرسین باشە ئەو میکانیزمە چییە کە دێتە مرۆڤەوە دەبێتە مایەی ژیانی و پاشان لێی دەردەچێت کەسەکە دەمرێت ؟ بە هەمان شێوە قسەی سەیرت بۆ دەکات خۆشی نازانێت باسی چی دەکات !؟ لەم نوسینە کورتەدا بۆمان دەر دەکەوێت کەس نەیزانیوە رۆح چیە ؟ لە پێش ئیسلام و لە دوای ئیسلامیش کەواتا بۆچی ڕەخنە لە قورئان و ئیسلام دەگرن و دەڵێن بۆچی باسی رۆحی نە کردووە ؟ بۆچی وەڵامی پرسیاری رۆحی نەداوەتەوە چییە ؟ رۆح نهێنییەکی خودایە و نایەوێت کەس بیزانێت بەڵگەشمان ئەوەیە تا ئێستا هیچ کەس نازانێت ڕۆح چییە ؟ وە ئەوانەی باسی دەکەن و تەفسیرات بۆ رۆح دادەنێن . تەنها یەك **پرسیاریان لێ دەکەم** وە هەموو قسە و شیکاریەکانیان پوچەڵ دەبێتەوە پێیان دەڵێم : تۆی مەسیحی یان جولەکە پێمان بڵێ چەند ڕۆح هەیە و ڕۆح چییە لای جەنابتان ؟ وە جیاوا زیی ڕۆحی مرۆڤ و رۆحی خودا و رۆحی پیرۆز و ئاژەڵێك یا مێرویەك چیە ؟ خۆ تۆش نازانیت ڕۆح چییە ئیتر بۆچی ڕەخنە لە اسلام دەگریت ؟

**پرسیارێك بۆ شێخانی تەریقەت و شیعەکان** و ئەو موسوڵمانانەی باوەڕیان بە رۆح و بینین و مامەڵە لەگەڵ ڕۆحدا هەیە . ئایا ئەو ڕۆحەی ئێوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن رۆحە یان جن و شەیتانەکانە ؟ ئەگەر دەڵێیت استغفر الله چۆن مامەڵە لەگەڵ جن و شەیتاندا دەکەین ؟ منیش دەڵێم باشە خۆ پێغەمبەرەکەت (صلی الله علیه وسلم) نەیزانیوە رۆح چییە ؟ خوداش هیچ رون کردنەوەیەکی نەداوە لە قورئاندا ؟ کەواتا پێوەری تۆ چیە بۆ ئەوەی تۆ مامەڵە لەگەڵ ڕۆحدا دەکەیت ؟

**بۆ ئەو بوذی و هندۆس و اهلی یۆگاش** دەڵێم ئەگەر ئێوەش مامەڵە لەگەڵ جن و شەیتانەکان دەکەن وەك شێخانی تەریقەت و شیعەکان . ئەگەر دەڵێن وا نییە ؟ فەرموو مەهێڵن بمرن ؟ خۆ ئێوە دەڵێن ئێمە مامەڵە لەگەڵ ڕۆحەکەدا دەکەین وە بەرز دەبینەوە بۆ ئاسمان وە زۆر کاری تریش دەکەین . کەواتا ئێوە لە شێخانی تەریقەت و شیعە باشترن و دەسەڵاتتان هەیە بەسەر رۆحەکەدا لە ڕێگای یۆگاوە . کەواتە دەتوانن نەهێڵن بمرن وە یان کەسێك لە مردن ڕزگار بکەن بەهۆی ئەوەی ئێوە سەیتەرەتان هەیە بەسەر رۆحەکەدا . وە بۆ بێدینیش هیچ پرسیارێکمان نییە چونکە هەمیشە حەزیان لە قسەی لابەلایە و بابەت بە لا ڕێدا دەبەن . وە زانستی پزیشکی گەیشتوەتە لوتکە و بە نەخۆش دەڵێن هەفتەیەکی تر یان سێ مانگی تر ئەم کەسە دەمرێت . وە لێیان بپرسە دەتوانن هیچی بۆ بکەن ؟ دەڵێن نەخێر چونکە پزیشکیش نازانێت ئەو میکانیزمە چیە کە لە لاشەی ئەو نەخۆشە دەردەچێت ؟ ئەو کەسانە ی ڕەخنە لە ئیسلامی مەزن دەگرن وە دەڵێن قورئان نازانێت رۆح چییە ؟ هۆکاری نە شارەزای و نە خوێندەوارییانە وەك لە سەرەوە باسمان کرد : بە درێژایی بونی مرۆڤ لەسەر زەوی کەس نەیزانیوە رۆح چییە ؟ وە تەورات و ئینجیلیش باسیان نە کردوە وە دەڵێن قورئان نازانێت رۆح چییە ؟ رۆحیش نهێنیەکی خودایە و نایەوێت هیچ کەس بیزانێت وە کێش دەڵێت وا نییە . با بێت بۆمان بسەلمێنێت ڕۆح چییە ؟ وە رۆح بکات بە بەر مێشولەیەکدا یان کەسێکی مردوو چاك بکاتەوە .ئەگەر نەی توانی هیچ بکات سەری خۆتانی لەگەڵ مەئێشێنن و کابرا حەزی لە زۆر بلێی و قسە کردنە و هەتا ڕۆژی قیامەتیش کەس نازانێت رۆح چییە و ئەو ڕەخنەیەش لەسەر قورئان هۆکاری نە خوێندەواری و نەشارەزاییە

# پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و نەوەد و سێ
## بۆ موعتەزیلەکان و دابەزینی عیسا (ع)

پرسیاری بێ وەلامی ئەم جارەمان بۆ بەناو موسوڵمانەکانە کە پێیان دەڵێن معتزلة و ئێستا گەورە و سەر کردە و پێشڕەویان ناوی ( عدنان ئیبراهیمە ) لە نمسا دا دەنیشێت . وە ئەمانە دەڵێن عیسا (ع) لە ئاخر زەماندا ناگەڕێتەوە و ئەو قسەیە درۆیە لە کاتێکدا حەدیسێکی زۆرمان هەیە دەڵێت گەڕانەوەی عیسا (ع) یەکێکە لە مەرجەکانی ئاخر زەمان وە وە معتزلەکان باوەڕیان بە حەدیس نییە ئێ باشە با بچینە خزمەت قورئان . ئایا قورئانیش بە درۆ دەخەنەوە !؟ لە ئایەتی ٤٦ ی **ال عمراندا** دەفەرموێت : قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات کاتێك لە بێشکەدایە و کاتێك پیر دەبێت .

وە بە ( **کهل** ) ناو براوە . کهلیش لە زمانی عەرەبیدا لە سەرو سی ساڵەوەیە واتا هەر کەس گەیشتە ٣٠ ساڵ و بەرەو ژور بەرەو ٤٠ و ٥٠ ساڵی و زیاتر ڕۆشت پێی دەڵێن کهل . عیساش (ع) لە تەمەنی ٣٣ ساڵیدا هەڵ کێشا بۆ ئاسمان . وە بە منداڵیش قسەی کردووە لەگەڵ خەڵکیدا کاتێك لە دایك بووە فەرمویەتی **(اني عبد الله اتاني الكتاب و جعلني نبيا)** وەك لە ئایەتی ٣٠ ی سورەتی مریمدا هاتووە . کەواتا هێشتا ماوێتی بچێتە ساڵەوە و جارێکی تر قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکات . وە بە هەموو پێوەرێك دەبێت ئەو کاتە بێت کە دەگەڕێتەوە سەر زەوی چونکە قورئان وا دەڵێت وە قسەی خودا و قورئانیش ڕاستییە و زۆر وازح و دیارە کە دەفەرموێت ( **و يكلم الناس في المهد و كهلا و من الصالحين** ) کەواتا مەسیح (ع) لە دایك بونی و پیر بونیشی هەر موعجیزەیە چونکە کاتێك منداڵ بووە لە بێشکەداقسەی کردووە و هەتا لەسەر زەوی بوو نەگەیشتە تەمەنی ( کهولة ) واتا بەساڵادا چوو . وە ئەو کاتەش هێشتا نە هاتووە کە بگەڕێتەوە و قسە بکات . وە لە دایك بونی و پیریشی موعجیزەیە و بە منداڵی و بە پیریش لەگەڵ خەڵکی قسە دەکات ئایا هیچ بەڵگەیەك هەیە لە قورئاندا بڵێت عیسا (ع) نیشانەیەکە لە نیسانەکانی ئاخر زەمان ؟ دەڵێین بەڵێ ئایەتی ٦١ ی سورەتی **الزخرف** . خودا دەفەرموێت ( **و انه لعلم لساعة** ) ئەم ئایەتە بە بە فەتحە و بە کەسرەش دەخوێندرێتەوە واتا دەڵێن ( عەلەم وە عیلم لساعة ) ئەگەر بە عەلەم بخوێنرێتەوە هەمومان دەزانین عەلەم ئاڵایە وە کاتێك دەڵێن عەلەمی فلان وڵات ، یان عەلەمێك دەبینین یەکسەر دەڵێین ئەوە عەلەمی فلان ولاتە واتا عەلەمەکە نیشانەیە بۆ ئەو وڵاتە وە بۆیە کاتێك بە زمانی تری غەیرە عەرەبی دەڵێن ئاڵا یان فلاگ یان ... هتد .

ئەو مانایە نا بەخشێت کە لە زمانی عەرەبیدا هەیە . و ( علم ) بە فەتحە لەسەر عەین و لامەکە واتا نیشانە وە عەلەمی هەموو ولاتێکیش نیسانەیە بۆ ئەو ولاتە عیساش (ع) نیشانەیە بۆ ئاخر زەمان چونکە دەفەرموێت ( انه لعلم لساعة ) . وە ئەگەر بە مانای ( علم ) واتا کەسرە لە ژێر عەینەکەدا بیخوێنینەوە دەبێت بە ( عیلم ) وە عیلمیش واتا زانین . کاتێکیش عیسا (ع) دێتە خوارەوە

خەڵکی دەزانن تەواو ئیتر ئاخر زەمان زۆر نزیکە و دنیا بەرەو نەمان دەچێت . کەواتا ئەو ئایەتە بە دوو جۆر باسی هاتنە خوارەوەی عیسایان (ع) کردوە ( عیلم و عەلەم ) واتا بە هاتنی عیسا (ع) زانین و نیشانەیە بۆ ئاخر زەمان

**پرسیاری بێ وەلامیشمان ئەمەیە** : ئەگەر ئێوەی معتزلة دەڵێن حەدیسەکان درۆیە . ئەی خۆ قورئانیش هەمان شتی حەدیسەکان لەسەر دابەزینی مەسیح (ع) دوپات دەکاتەوە . ئایا قورئانیش درۆ دەکات ؟ وە ئایا ئینکاری کردنی ئێوە لە هاتنە خوارەوەی مەسیح (ع) چی سودێکی هەیە بۆ ئیسلام ؟ وە شیکاریی ئێوە چییە بۆ ئەو ئایەتانەی باسمان کردن ؟

---

## پرسیارە بێ وەلاّمەکان ژمارە :سەد و نەوەد و چوار

## شەیتان چۆن زاوزێ دەکات ؟

پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان



ئەمەی خوارەوە ڕەخنەی دژە ئیسلامەکانە وەك خۆی دامان ناوەتەوە بۆتان

وقال مجاهد : إن إبليس أدخل فرجه في فرج نفسه فباض خمس بيضات ؛ فهذا أصل ذريته . وقيل : إن الله - تعالى - خلق له في فخذه اليمنى ذكرا وفي اليسرى فرجا ؛ فهو ينكح هذا بهذا ، فيخرج له كل يوم عشر بيضات ، يخرج من كل بيضة سبعون شيطانا وشيطانة ، فهو يخرج وهو يطير .

تفسير القرطبي/ تفسير الآية ٥٠ من سورة الكهف

ئەمەی خوارەوەش تەفسیری قرطبی کە دەڵێت ئەو قسەیە ڕاست نییە بەڵام ئەوان بریویانە



تفسير القرآن

تفسير القرطبي

محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي

دار الفكر

سنة النشر: -

رقم الطبعة: ---

عدد الأجزاء: عشرون جزءا



بئس للظالمين بدلا أي بئس عبادة الشيطان بدلا عن عبادة الله . أو بئس إبليس بدلا عن الله . واختلف هل لإبليس ذرية من صلبه ؛ فقال الشعبي : سألني رجل فقال هل لإبليس زوجة ؟ فقلت : إن ذلك عرس لم أشهده ، ثم ذكرت قوله أفتتخذونه وذريته أولياء فعلمت أنه لا يكون ذرية إلا من زوجة فقلت نعم . وقال مجاهد : إن إبليس أدخل فرجه في فرج نفسه فباض خمس بيضات ؛ فهذا أصل ذريته . وقيل : إن الله – تعالى – خلق له في فخذه اليمنى ذكرا وفي اليسرى فرجا ؛ فهو ينكح هذا بهذا ، فيخرج له كل يوم عشر بيضات ، يخرج من كل بيضة سبعون شيطانا وشيطانة ، فهو يخرج وهو يطير ، وأعظمهم عند أبيهم منزلة أعظمهم في بني آدم فتنة ، وقال قوم : ليس له أولاد ولا ذرية ، وذريته أعوانه من الشياطين . قال القشيري أبو نصر : والجملة أن الله – تعالى – أخبر أن لإبليس أتباعا وذرية ، وأنهم يوسوسون إلى بني آدم وهم أعداؤهم ، ولا يثبت عندنا كيفية في كيفية التوالد منهم وحدوث الذرية عن إبليس ، فيتوقف الأمر فيه على نقل صحيح .

ڕەخنە لە ئایەتی ٥٠ ی سورەتی **الكهف** دەگرن کە باسی ابلیس دەکات وە دەفەرموێت ( **افتتخذونه و ذريته اولياء من دوني** ) واتا ئایا ئێوە ابلیس و نەوەکانی دەکەن بە گەورەی خۆتان و خوەدا ناکەن بە گەورە و پێشڕەوی خۆتان ؟

وە دەڵێن لە تەفسیری قرطبیدا ئەو ئایەتە بەم شێوەیە تفسیر کراوە : ابلیس چوکی خۆیی خستوەتە ناو زێی خۆی وە (٥) هێلکەی کردووە . ئەمەیە ئەسڵی نەوەکانی شەیتان و بەم شێوەیە نەوەکانی پەیدا بوون وە دەڵێن خودای تعالی لە ڕانی ڕاستیدا چوک بۆ

خەلق کردووە و لە ڕانی چەپیشیدا کۆئەندامی ئافرەتی بۆ خەلق کردووە و بە راستی دەیخاتە ناو چەپی وە ڕۆژانە دە هێلکە دەکات وە لە هەر هێلکەیەك (٧٠) شەیتانی نێر و مێ دەردەچێت و دەفڕن

لێرەدا ئەو ڕەخنەیە تەواو بوو . فعلا ئەو قسەیە ڕاستە لە تفسیری قرطبیدا نوسراوە بە ڕەحمەت بێت . .

بەڵام دژە ئیسلامەکان پاش ئەو قسەیەیان بۆ ئێوە دا نە ناوە و بڕیویانە .کە نوسراوە : ولا يثبت عندنا كيفية في كيفية التوالد منهم وحدوث الذرية عن إبليس ، فيتوقف الأمر فيه على نقل صحيح . بە کوردی دەڵێت لای ئێمە ئیسپات نە بووە چۆن ابلیسەکان زاوزێ دەکەن ؟ وە چۆن نەوە دەخەنەوە ؟ وە هیچ حەدیسێك یان گێڕانەوەیەکی ڕاستمان لا نییە بۆ ئەو قسانە . کەواتا هەر قرطبی خۆی لە کۆتایی جۆری زاوزێی ابلیسەکاندا نوسیوێتی هیچ بەڵگەیەکی ڕاستم لا نییە لە قورئان و سونەت بۆ سەلماندنی ئەو قسانە بۆیە ناتوانین پشت بەستین بەو قسانە کە کراوە .

بەڵام کاکی دژە ئیسلامی قین لە دڵ بۆ ئەوەی گومان بخاتە دڵی موسوڵمانانەوە و ئیمانیان بێ هێز بکات نایەت ئەو بەشی کۆتاییەی قرطبیتان بۆ نقل بکات وە بە تەنها دێت قسەی گیرفانەکەتان بۆ نقل دەکات .

وە قرطبیش خۆی نوسیوێتی ئەوە قسەی گیرفانە و بەڵگەمان پێ نییە بڵێین راستە !؟ کەواتا دژە دین یان خۆی باش دەزانێت قرطبی چی دەڵێت ؟ بەلام ئەو دێت بڵاوی دەکاتە وە چونکە دڵی پڕە لە قین بەرامبەر ئاینی ئیسلامی مەزن !؟ وە یان هەر خۆی نە خوێندەوار و نەزانە و کۆپی و پەیست دەکات !؟ وە ئەگەر دیقەتی تەفسیرەکەش بدەین هەڵەیەکی زۆر زەقی بەرچاوی تێدایە . نوسراوە ابلیس لە قاچی راست و چەپیدا ئەندامی زاوزێی نێر و مێی تێدایە و خۆی لە خۆی دەپەڕێت .

کەواتا دەبێت ابلیسەکانی تریش هەمان شێوە بن بەلام دەڵێت : ڕۆژانە دە هێلکە دەکات وە لە هەر هێلکەیەك (٧٠) شەیتانی نێر و مێ دەردەچێت و دەفڕن ئەمەش هەڵەیەکی زەقە چۆن نێر و مێ دەبێت لە کاتێکدا ئەسڵەکەیان نێر و مێ نییە و ئەندامی زاو زێکەی لە قاچی ڕاست و چەپیدایە ؟

هەر کەس تەفسیری قرطبی لایە بە کتێب با بچێت بۆ تەفسیری ئایەتی ٥٠ ی **الكهف**.

وە ئەگەر لاتان نییە **سەیری** وێنەی پۆستەکە بکە ئەو تەفسیرەمان داناوە و ئەو بەشەی دژە ئیسلامیش برێویتی بە ڕەنگی شین بۆمان دیاری کردون

# پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و نەوەد و پێنج

## ئایا کعبا اترابا مایەی شەرمەزارییە ؟

وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا

نە مانای خڕ دەدات، نە مانای مەمک



گەران لە کتێبی پیرۆز

گەران لە [کتێبی پیرۆز] بۆ [مەمك] ، سەرجەمی دۆزراوە بریتیە لە [26] دانە .

بحث عن ثدي في الكتاب المقدس

ابحث عن ثدي في الكتاب المقدس ابحث

عرض ايات 1-25 من اصل 27.

Version: kjv 27 references 27 references Match Phrase Match Case New Search

Viewing References Part 1 [1-10 in 27 refs]: Searching for 'breasts'... [27 refs]

Ge 49:25 Even by the God of thy father, who shall help thee; and by the Almighty, who shall bless thee with blessings of heaven above, blessings of the deep that lieth under, blessings of the breasts, and of the womb:

Lev 9:20 And they put the fat upon the breasts, and he burnt the fat upon the altar:

لە ئایەتی ٣٣ ی سورەتی **النبا** دا ( **و کواعب اترابا** ) هاتووە زۆربەی زۆری موسوڵمانان و نا موسوڵمان یش ئەو ئایەتە بە مەمك خڕ راڤە دەکەن . هۆکاری ئەم تەفسیرەش دەگەڕێتەوە بۆ رەخنەی قەشەکانی کڵێسا لە ئاینی ئیسلامی مەزن چونکە لە کتێبەکەی خۆیاندا ٢٧ جار باسی مەمك کراوە بە شێوەیەکی زۆر جنسی و سیکسی بۆیە ئەوان رەخنە لە قورئان دەگرن . وە سەیر لەوەدایە قەشەکان هاتوون لەوەشدا فێڵیان کردووە و ٢٦ جار مەمکیان نوسیووە لە نوسخە کوردیەکەدا ئیتر نازانم جووت مەمکیان نە نوسیووە یان تاکە ؟ وە نوسخە کوردیەکە مەمکێك قەرزارە . سەیری وێنەیکە بکەن لە نوسخە عربی و انگلیزیە و هەموو نەسخەکانی تردا ٢٧ جار مەمك نوسراوە . بەڵام نوسەرانی کتێبی پیرۆزی کوردوستان داشکاندنیان کردوە و ٢٦ مەمکیان نوسیوە ، ئێستا باسی مەمکەکانی کڵێسا ناکەین !؟ و لە کۆتایی نوسینە کەدا باسی ئەو مەمکانە دەکەین چۆن سیکسی و جنسین .

با پێشەکی بزانین ( **کواعب اترابا** ) مانای چییە ؟ ئایا باسی سکس و مەمك گرتن دەکات ؟کواعب کۆیە بە تاك پێی دەڵێن ( کعب ) وە کعبیش پاژنەی پێیە و دوو دانە لە هەردووك پێکانی هەموو کەسێك هەیە وە لە ئایەتی ٦ ی **المائدە** دا دەفەرموێت (**و ارجلکم الی الکعبین**) . واتا کاتی دەست نوێژ قاچەکانتان هەتا پاژنەی پێتان بشۆن یان بسرِن !؟ کاتێك کچان دەگەنە تەمەنی( ١٢ بۆ ١٤ )ساڵ مەمکیان سەر هەڵ دەدات خڕو بچکۆلەیە وەك پاژنەی قاچ وایە خڕو بچکۆلەیە بۆیە عرب کچ لەو تەمەنەدا بە ( کاعب ) ناو دەبات

وە بە کۆ پێی دەڵێن ( کواعاب ) یان دەڵێن **بنت الكعاب** واتا مەمکی کردووە . ئەمەش وەسفە بۆ ئەو حۆریانەی بەهەشت کە بەو شێوەیەن نەك باسی جنس و سیکس بکات وە پاش و پێشی ئایەتەکە بخوێنەوە هیچ باسی سیکسی نە کردووە . بەڵکو باسی تەمەنی ئەو حۆریانە دەکات وەسفیان دەکات وەك کچی ١٤ ساڵن ، کە تازە مەمکیان سەر دەر دەکات . هەروەها لە کوردەواریی خۆشماندا ئەو وەسفە هەیە بۆ کچان کاتێك دەڵێن فلانە کچ کاتی شوی هاتووە مەمکی کردووە یان هێشتا منداڵە مەمکی نەکردووە !؟ یان ئەگەر هەواڵی منداڵی ماڵێك بپرسن دەڵێن ئۆو کچەکەی گەورە بووە مەمکی کردووە . وە ئەمە نە عەیبە و نە شورەییە !؟ بەڵکو بەرامبەر تێ دەگات کچی فلانە ماڵ گەورە بووە و گەیشتوەتە تەمەنی (١٢) و بەرەو ژور.

ئەو ئایەتەی قورئانیش هیچ شورەیی تێدا نییە و بە زمانی عەرەب پێمان دەڵێت حۆریەکان لە تەمەنی عازەبدان کە تازە مەمکیان دەردەچێت وە هەر بەو شێوەوش دەمێننەوە . چونکە دەفەرموێت ( **كواعب اترابا** ) واتا لە تەمەنی عازەبی دان و هەر بەو شێوەیەش دەمێننەوە پیر نابن وە ئەگەر ( كواعب اترابا ) مانای سیکس و شەرمەزاری بووایا . کافرانی قورەیش زۆر لە دژە ئیسلامی ٢٠١٥ شارەزاتر بوون لە زمانەکەیان و دەیان گوت محمد (صلى الله عليه وسلم) شوێن کەوتووەکانی بە مەمك و جنس هەڵ دەخەڵەتێنێت بۆ ئەوەی شوێنی بکەون وە زۆر قسەی سەیری تریشیان دەکرد وە عەرەب کۆمەڵگایەکی محافظ بوون وە ئەو شتانەیان پێ عەیب بووە . خەڵکانێکی زۆر لە اسلام پەشیمان دەبونەوە و ئەو ئایەتە دەبوو بە مایە ی پوچەڵ کردنەوەی قورئان بەڵام عەرەب دەیزانی کواعب چییە و خۆیان کچیان بووە و زانیویانە ( کاعب ) چییە !؟ بۆیە نەیان توانیوە ڕەخنە بگرن لەو ئایەتە چونکە چەندەها شیعریان هەبووە پێش دابەزینی قورئان باسی کچی عازەبی کردووە و بە کواعب ناوی بردووە . ئەمە دانەیەکیانە

(دەڵێت چەند ئافرەتی خاوەن مێرد هەیە سەربەرز و خاوەن ڕەوشتی بەرزن وە کچانی تازە هەڵ دەدەن هێشتا نازانێت ناخۆشی ژیان چییە و نەکەوتوەتە دەستاڕی زەمانەوە بپارێت)

## و كم من حصان قد حوينا كريمة .... و من كاعب لم تدر ما البؤس معصر

بەڕێزان ئەوەی مایەی گاڵتە جاڕییە ئەم قورئانییە کوردانەن هاتوون تەفسیری کواعب اترابایان بەم شێوەیە کردوە : کواعب لە کەعبەوە هاتووە واتا شەشپاڵوو چونکە کەعبە لە شێوەی شەشپاڵودایە وە مەمك خڕە کەواتا ئەو ئایەتە باسی مەمك ناکات چونکە مەمك شەشپاڵوو نییە ، وە ووشەی ( اترابا ) بە ( تربة ) شیکارییان کردووە . وە ( کواعب اترابا ) لای کاکەی قورئانیی کورد واتا خودا لە بەهەشتدا خانویان لە شێوەی شەشپاڵوو بۆ دروست دەکات بە خۆڵی بەهەشت وە لە هەمووی هەزەلی تر نوسیویانە.

بێگومان خۆڵی بەهەشت تایبەتییە وە دەڵێن داعشی کۆن و نوێ هەمیشە بە هەڵە تەفسیری قورئان دەکەن منیش پێیان دەڵێم وەرە با فێری قورئان ببن !؟ لە زمانی عەرەبیدا هەر ماڵێك چوار گۆشە بێت پێی دەڵێن كعبة نەك شەشپاڵوو !؟ وە کعبة تاکە بە کۆ پێی دەڵێن ( كعاب ) وە بۆیە بە ماڵی خودا دەڵێن كعبة چونکە چوار گۆشەیە وە هەر کچێکیش مەمك بکات هەر پێی دەڵێن ( الكَعابُ ) واتا تاکە و فتحة لەسەر بائەکەیە . وە بە هیچ شێوەیە کواعب بە مانای کەعبە نایەت !؟ چونکە کواعب خۆی کۆیە وە

تاکەکەی پێی دەڵێن ( کاعب ) وە کعبة تاکە کۆکەی پێی دەڵێن ( کعاب ) بە نیسبەت ووشەی ( اترابا ) کە جەنابت بە خۆڵ تەفسیرت کردووە . خۆڵ نییە چونکە خۆڵ پێی دەڵێن ( تربة ) وە تربة خۆی کۆیە و تاکی نییە لە هیچ زمانێکی جیهاندا .

بەلام ئایەتی ( کواعب اترابا ) هەردووکیان کۆن هەروەها اترابا کۆیە و بە تاك پێی دەڵێن ( تِرْب ) واتا بە هەمیشەی لە تەمەنی کچی (١٤) ساڵدا دەمێننەوە و پیر نابن وە بە مانای خۆڵ نایەت !؟ ئادەی کاکی قورئانی پێمان بڵێ تاك و کۆی خۆڵ چیی پێ دەڵێن یان ئەگەر بە تەفسیری جەنابت بێت دەبێت کواعب اترابا بە مانای ماڵەکان کە لە خۆڵەکان دروست کراوە ؟ چونکە ئایەتەکانی پێش ئەو هەمووی کۆیە ( **ان للمتقين مفازا حدائق و اعنابا** ) پاشان دەڵێت و کواعب اترابا ئەمەش هەردووکیان هەر کۆیە . ئەگەر بە کعبة و خۆڵ بنوسرێت دەبێت ئەو ئایەتە ببێت بە ( کعاب تربة ) چونکە کۆی کعبة کعابە و خۆڵیش خۆی کۆیە و تاکی نییە . پاشان ئەگەر بە شیکاریی جەنابت بێت دەبێت ئایەتی ٣٧ ی الواقعة ( **عربا اترابا** ) بە عەرەبی لە خۆڵ دروست کراوی بەهەشت تفسیر بکەین چونکە خۆڵی بەهەشت تایبەتە .

بەڵام ئەو ئایەتە ( **عربا اترابا** ) باسی ئەو ئافرەتانە دەکات کە پیر بوون و پەکیان کەوتووە لە ژیاندا زۆر پابەند بون بە دینەوە و زۆر بەحەیا و پۆشتە بوون و مێردەکانیان خۆش ویستووە و ژیانیان بۆ ماڵ و مێردیان بووە نەك بۆ خەڵکی تر وە بازاڕی و ڕوو لە دەرەوە نەبوون . لە بەهەشتیشدا دەبنەوە بە ژنی مێردە دونیاییەکانیان و خودا دەیان گێڕێتەوە بۆ تەمەنی ٣٣ ساڵی و بەو شێوەیە دەمێننەوە بۆ تا هەتای . نەك عەرەبێك لە خۆڵ دروست بکرێت بە شیکاریی قورئانیەکان.

**پرسیاری بێ وەڵامەمان بۆ قورئانیەکان ئەمەیە:** ئەگەر ( **اترابا** ) مانای خۆڵ بێت ئایا اترابا تاکە یان کۆیە وە تاك و کۆی خۆڵ چییە ؟ وە ئایا ( عربا اترابا ) مانای چییە ؟ وە تاك و کۆی ( کعبة ) چییە ؟ وە ئێوە لە تفسیری ئەو ئایەتە بە موسوڵمانان دەڵێن داعشی کۆن و نوێ عاشقی مەمك و سێکس و ڕابواردنە و داڵغەی لای ناو گەڵێتی . ئایا جیاوازیی ئێوە ی قورئانی و کابرایەکی بێدین و کڵێسا چییە ؟ خۆ ئەوانیش هەمان قسەی ئێوە دەکەن ؟ کێ داعشە موسوڵمانان بە گشتی یان ئێوە ؟ چونکە ئێوە قورئانتان تێك داوە و هەر ناشزانن باسی چی دەکات ؟ وە زمانی عەرەبیش نازانن جیاواز یی نێوان تاك و کۆ ناکەن و نازانن ڕاڤەی وشەکانیش بکەن ؟ ئایا ئێوە داعشی قورئان نین ؟ ئایا ئێوە دوژمنی قورئان و ئیسلام نین ؟ بۆچی بەو شێوەیە قورئان تەفسیر دەکەن و تێکی دەدەن ؟ ئەگەر دەڵێن نەخێر ئێمە ڕاستین !؟ فەرموون وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بدەنەوە و ڕاست و دروستیی خۆتان دەربخەن وە ئەگەر نەتان توانی دڵنیا بن ئێوە داعش و نازی و تەتار و مەغۆلی ئومەتی ئیسلامین لەناو کورددا

**پرسیاری بێ وەلامیشمان بۆ کڵێسا ئەمەیە** : پاش ئەوەی بۆتان ڕون بووەوە ( کعبا اترابا ) واتا کچانی عازەب کە تازە سەر هەڵدەدەن و بۆ تا هەتای بەو شێوەیە دەمێننەوە . ئایا دەتوانن پێمان بڵێن بۆچی نوسخەی کوردیی کتێبی پیرۆز یەك مەمکێکی تێدا نە نوسراوەتەوە ؟ ئایا ئەوە هەڵەی ترجمەیە ؟ وە ئایا دەتوانن وەڵامی ئەم دەقە پیرۆزە سیکسیانەمان بدەنەوە کە مرۆڤ شەرم دەکات بیان خوێنێتەوە لەناو ماڵ و ژن و منداڵدا ؟ ئایا هەستی ژن و پیاو چییە لە کڵێساکاندا کاتێك ئەم دەقانە دەخوێنرێتەوە ؟ بە تایبەتی

لە کڵێساکاندا ئافرەت جلی پۆشتەی لەبەردا نییە و ژن و پیاو تێکەڵاون بۆ ئەوەی ڕاست و دروستیی کتێبی پیرۆزیان بۆ دەر بکەوێت وە بزانن کە باسی جنس و مەمك و بێ ئابڕوی لە کتێبەکەی ئەواندایە نەك لە قورئاندا ؟ بۆ ئەوەی بزانن کە ئەم کتێبی بەناو پیرۆزە چەند مایەی شەرمەزارییە وە پاش ئەوەی خوێندتانەوە سەیری خۆت بکە لە ئاوێنەدا بزانە چۆن سور دەبیتەوە لە شەرمدا ؟

..................................

**لەم بەشەدا باسی کچێك دەکات هێشتا مەمکی نە کردوە و دەڵێت : خوشکێکمان هەیە مەمکی نییە ؟**

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1447098066./1665326557019531/?type=3&theater

..........................

بابەتی ناو لینك

**خوشکێکمان هەیە مەمکی نییە ؟**

بەڕێزان ئەم دەقە لە کتێبی پیرۆزدا لە سفری گۆرانیی گۆرانیەکان ( **نشيد الانشاد** ) وەرگیرواە کە مایەی شەرمەزارییە بۆ کڵێسا چونکە سفرێکی ڕوتی جنسیی زۆر بێ مانایە و کاتێك دەی خوێنیتەوە لایەنی جنسی و سیکسیی ژن و پیاو دەوروژێنێت و حەز دەکەن سەرجێی بکەن . بۆیە خوێندنەوەی ئەم سفرە لە کڵێسادا زۆر قورسە و تەنانەت بۆ هەرزەکارانیش زۆر قورسە و ئەگەر منداڵی هەرزەت هەبێت ناتوانیت بۆیان بخوێنیتەوە و بۆیان شیکاری بکەیت

بۆ نموونە لە بەشی ٨ دەقی ٨ دا نوسراوە

خوشکێکی بچووکمان هەیە مەمکی نییە چی بکەین بۆ خوشکمان ئەو ڕۆژەی داخوازیکەری بێت؟ دەڵێت خوشکێکی بچوکمان هەیە هێشتا مەمکی نییە ئەگەر خوازبێنی بێت ئێمە چی بکەین ؟

لە تەفسیری ئەم دەقەدا دەڵێن

کچە بچکۆلەکە کڵێسایە و هەر کەسێك مەسیح نە ناسێت و باوەڕی بە مەسیح نەبێت وەك ئەوە وایە مەمکی نەبێت . وە خوازبێنی کەرەکە ڕێبازی مەسیحە ئەگەر بۆ کەسێکی باس بکەیت نازانێت باسی چیی بۆ دەکەیت من هیچ ناڵێم : خۆتان دەقەکە بخوێننەوە و بزانن چی پەیوەندیی بە بانگەشە و بانگەوازی مەسیحەوە هەیە ؟.

.......................................................................

**لێرەدا باسی مەمکی گەورە دەکات و سیلیکۆنیان تێ خستووە و دەیشوبهێنێت بە قولەی شوراکان**

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1447098066./1666745113544342/?type=3&theater

....................

**بابەتی ناو لینك**

**مەمك و قولەی شوراكان**

لە كتێبی پیرۆزدا سفری گۆرانی گۆرانیەكان ( **نشيد الانشاد** ) بەشی ٨ دەق ١٠ دا نوسراوە

من شورام و مەمكەكانم وەك قولەن ئەو كات لەبەر چاوی ئەو پەسەند دەبم

ئەوەی ئێمە تێی دەگەین لەو دەقە : ئافرەتێكە دەڵێت بەژن و باڵام وەك شورایەكە و مەمكەكانیشم قولەی ئەو شورایەن ، وە لەبەر چاوی ئەو واتا پیاوەكە پەسەندم . ئەگەر بە كوردیی پەتیی خۆمان باسی بكەیت ئافرەتێكە دەڵێت باڵام بەرزە و مەمكم قوتە بۆیە لەبەر چاوی خۆشەویستەكەم كە پیاوە پەسەندم .

كڵێسا دەڵێت : ئەو شورایە كڵێسایە ئیماندارانی تێدایە وە مەمكەكانیش كتێبی پیرۆزە پەیمانی كۆن و پەیمانی تازە واتا تەورات و ئینجیل وە بەو دوو مەمكە شیر دەدات بە ئیماندارانی وە كڵێسایش لەبەر چاوی ئیمانداراندا پەسەندە و پێیان خۆشە و پێی رازین كەواتا مەمك بە گوێرەی تەفسیراتی كڵێسا تەورات و ئینجیلە . بەلام ئەوەی جێگای پرسیارە : جولەكە باوەڕی بە ئینجیل نییە وە جولەكە دەڵێن سفری نشید الانشاد قسەی خۆشەویستیی نێوان خودا و كەنیشتە ئەو شوێنەی جولەكە نوێژی تێدا دەكات باشە ئەگەر جوت مەمك ئاماژە بێت بۆ تەورات و ئینجیل ؟ وە جولەكەش باوەڕی بە ئینجیل نەبێت !؟ كەواتە لای جولەكە یە ك تاك مەمك هەیە ئەویش تەوراتە . ئەی مەمكەكەی تر چیی لێ هات ؟

......................................................................

**خەجاڵەت خۆم ئەمەیان باسی نێوان هەردووك مەمك دەكات بیخوێنەوە بزانن چی دەگوزەرێ ؟**

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1447098066./1666745113544342/?type=3&theater

.........................

**بابەتی ناو لینك**

نێوان هەردووك مەمك چییە لە كتێبی پیرۆزدا ؟

لە سفری نشید الانشاد ( گۆرانی گۆرانیەكان ) بەشی ١ سەق ١٣ دا نوسراوە

ئەویندارەكەم چەپكێك مورە كە لەنێو مەمكەكانم شەو بەسەر دەبات

**ئەوەی لەم دەقەدا نامۆیە ووشەی** ( مورە ) لە هەموو ترجمەكاندا هەر بەهەمان شێوە ناو براوە بە انگلیزیMyrrha ئەگەر بگەڕێن لە گوگڵ بەشی وێنەكان بنوسن بە عربی ( المر ) بە كوردیش ( مورِ ) balsamodendron myrrha .

مورِ( ١٨) جار باس كراوە لە كتێبی پیرۆزدا كە رووەكێكی بۆن خۆشە و وەك بخوردیش بەكار دەهێنرێت بۆ بۆن خۆش كردن بەرێزان جاران وەك ئێستا بۆن نە بووە ئافرەت موری بەكار هێناوە . چۆن لە كوردەوار یی خۆماندا سمڵ و مێخەكیان بەكار هێناوە و

کردویانە بە ملوانکە کاتێك ئافرەت ئەم ملوانکەیەی دەکردە ملی ئەو مورە یان ئەو سمڵ و مێخەکە هەمیشە بۆنی بڵاو دەکردە وە بۆ چوار دەوری . شتێکی ئاشکراشە کاتێك ئافرەت دەنوێت و ملوانکەیەك لە ملیدا بێت دەکەوێتە ناو سنگ و مەمکەکانیەوە مرۆڤیش لە کاتی خەودا بە هەموو جۆرێك ئەم دیو ئەودیو دەکات . تصور بکەن ئافرەتێك ملوانکەیەکی بۆن داری لە ملدایە و لەناو سنگیدا کاتی ئەم دیوو ئەو دیوو کردن ملوانکەکە بە ئارەزوی خۆی لەناو مەمکیدا ملوانکەکە وازی دەکات و دەکەوێتە سەر هەموو شوێنێکی مەمکی دەقەکەش دەڵێت :

ئەویندارەکەم کورە عاشقەکەم چەپکێك لەو مورەیە و شەو لەناو مەمکەکانم بەسەر دەبات . لەوە زیاتر لەسەری نارۆم و خۆتان تێ بگەن کورێك شەو لەناو سنگ و مەمکی کچێکدا بەسەر ببات دەبێت چی بکات و چۆن مشغوڵ بێت هەتا بەیانی ؟

تەفسیری کڵێسا بۆ ئەم دەقە چییە ؟ دەڵێن : ئەویندارەکەم چەپکێك مورە بە مانای ئەوە دێت ئەویندارەکە مەسیحە (ع) وە ( مور ) هێمایە بۆ ئازارەکانی مەسیح (ع) کاتی لە خاچ دانی چونکە مور بۆنی خۆشە بەلام تاڵە وە هەموو ئیماندارێك لەپێناوی مەسیحدا (ع) ئازار دەچێژێت بەڵام بۆنێکی خۆش دەبەخشێت

بەشی دووەمی کە دەڵێت : **لەنێو مەمکەکانم شەو بەسەر دەبات**

واتا لەسەر سنگمە نزیکە لە دڵمەوە چونکە ئەو ئازارانە وا دەکات تەحەمولی لە خاچ دان بکەیت چونکە کاتێك مەسیح لە خاچ درا بۆنی خۆشی بلاو کردەوە هەر کەسیش مەسیحی خۆش بوێت دڵی پڕ دەبێت لە خۆشەویستی مەسیح وە ئەو بۆنە خۆشە دەچێتە دڵیەوە وە پاش ئەوەی مەسیح هاتە ناو دڵەوە هەردووك مەمکەکان دەبن بە پەیمانی کۆن و تازە واتا تەورات و ئینجیل : ئەی باشە دەقەکە باسی ئافرەت دەکات وە مەمکەکانی دەبێت بە تەورات و ئینجیل . ئەی پیاوی داماو چیێ بکات ؟ ئەویش ئافرەتێك بخاتە سەر سنگی بۆ ئەوەی مەمکەکانی ببێت بە تەورات و ئینجیل ؟ لە هەمووی هەزەلی تر ئەم تەفسیرەیانە دەڵێت : جاران ئافرەت ئەگەر مێردەکەی دوور بوایە لێی وێنەی مێردەکەی دەکرد بە ملوانکە و دەی کردە ملی لەناو مەمکی دای دەنا . کاتێك وێنەکە شێوەی مەسیحی تێدا دەر بکەوتایە بۆنی خۆشی تێدا بڵاو دەبووەوە

(**بۆ زانیاریتان مێژوی کامێرا و وێنە گرتن دەگەڕێتەوە بۆ ٣٠٠ ساڵ . وەك ئێستاش نە بووە دقیق و وردە کاریی تێدا بکرێت و وێنەی لێ دروست بکرێت بکرێت بە ملوانکە . ئیتر ئەم ملوانکە و وێنەی مێرەیان لە کوێ هێناوە ؟ )**

**بەڕێزان خۆتان حوکم بدەن** . لە دوو بەشی پێشوودا باسی مەمك کراوە هەر لە هەمان سفردا دەڵێن مەمك واتا تەورات و ئینجیل وەك دەبینن ئێستا بووە بە لە خاچ دان و ئازاری مەسیح ئەگەر خوێنەری عەوامیش بیخوێنێتەوە تێ دەگات ئافرەتێك وەسفی پیاوێك دەکات خۆشی دەوێت و حەز دەکات هەمیشە وەك ملوانکە لەناو گەردنیدا بێت وە شەوانەش یاری بکات لەناو سنگ و

مەمکیدا . وە تەفسیری کڵێساشم بۆ داناون . خۆتان حوکم بدەن و چاوەڕوان بن مەمکی تریش بەڕێوەیە بزانین ئەم جوتە مەمکە بە تەورات و ئینجیل ناو دەبەن دەگاتە کوێ ؟

وە مەمك تەورات و ئینجیل نییە بەڵکو سنگی ئافرەتە و ئەو دەقانەش کە لە **سفری نشيد الانسادا** هاتووە دەتوانین ناوی بنێین بە کتێب یان مخلەی سیکسیی زەمانی زوو . چونکە بەس باسی مەمك ناکات بەڵکو باسی ناوگەڵ و سەرجێیش دەکات زۆر بە ڕونی بەڵام ئێمە جارێ لە مەمکەوە دەستمان پێ کردووە .

.............................................................................................

**ئەم جارەیان جوت مەمك نەك مەمك بە تەنها**

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1447098066./1667351110150409/?type=3&theater

..................

**بابەتی ناو لینك**

لە سفری نشید الانشاد ( گۆرانی گۆرانیەکان ) بەشی ٤ دەقی ٥ دا نوسراوە جووتە مەمکەکەت وەك دوو کارمامزن وەك جمکێك ئاسکن کە لەنێو گوڵە سەوسەندا دەلەوەڕێن

دیقەتی ئەو دەقە بدەن کاتێك دەی خوێنیتەوە تێ دەگەین جوت مەمکی ئەو ئافرەتە وەك دوو کارە کێوین کە تازە لە دایك بوون وە لە ناو گوڵە سەوسەندا دەلەوەڕێن . بەڵام کاتێك سەیری ترجمە عربیەکە بکەین نوسراوە

ثدياك كخشفتي ظبية توأمين يرعيان بين السوسن

دیقەت بدەن ووشەی ( خشفتين ) لە نوسخە کوردیەکەدا بەدوو کارمامز ترجمە کراوە و دوو جار ئاسکیان ترجمە کردووە بۆ ئەووەی وشەی خشفتين بشارنەوە . وە ( خشفة ) واتا خشە خش کاتێك کەسێك نەعلی لە پێدایە و بە ڕێدا دەڕوات گوێمان لە خشەی نەعلەکانێتی دەزانین کەسێك نەعلی لە پێدایە و ڕێ دەکات کاتێك جوتێك کارمامز دەلەوەڕێن و ڕێ دەکەن خشەیان دێت چونکە بچوکن و سکیان لە گیا دەخشێت و خش خش دروست دەکەن .

لێرەدا کورەکە وەسفی مەمکی کچەکە دەکات بەوەی منداڵە و مەمکی بچکۆلە یە و لە کراسەکەی دەخشێت کاتێك ڕێ دەکات و کوڕەکەش گوێ بیستی خشەی مەمکەکانی دەبێت

و هەمو ئاژەڵە کێویەکیش کاتیك دەلەوەڕێت هەمیشە سەر دادەنێت بۆ گیاکە و سەر بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوەی چاودێری بکات کەس نەی کات بە نێچیر و بی گرێت . ئافرەتیش کاتیك ڕێ دەکات جوت مەمکی هەڵ بەز و دابەز دەکەن و بەرز و نزم دەبنەوە وەك سەری ئاژەڵە کێوی . وە تەفسیری کڵێسا بۆ ئەم دەقە بەم شێوەیە:

خشفة یان تفسیر كردووە بە دوو چاوی كار مامزەكە چونكە منداڵن و كاتێك دەلەوەڕێن سەیری دور دەكەن دو مەمكەكەشیا بە مەمكی دایكی كارەكان تفسیر كردوە كە شیری لێ دەخۆنەوە و كڵێساذ وەك ئەو جوتە مەمكە وایە شیر دەدات بە شوێن كەوتوانی لە ڕێگای تەورات و ئینجیلەوە . وە تەورات و ئینجیلیش جمكن چونكە لە ڕێگای روح القدسەوە هاتووە وە چاوی ئیمانداری مەسیحی تیژە و بۆ دور دەڕوانێت و ئەو لەوەڕگایەش كڵێسایە ئیمانداران بە ووشەی خودا دەلەوەڕێن و گەورە دەبن واتا سەوسەنەكە ووشەی خودایە هەر هەمان سفر بەشی ٧ دەق ٣ دا نوسراوە

جووتە مەمكەكەت وەك دوو كارمامزن جمكی ئاسكن

بۆ تەفسیری ئەمە كڵێسا هەر هەمان تفسیری پێشوی هەیە . بەڵام لەم دەقەیاندا وەك دەبینن كار مامزەكان نا لەوەڕێن لە كێڵگەی سەوسەندا بەڵكو بە تەنها وەسفی جوت مەمكەكەیە . لە بەشەكانی تردا مەمكی ئافرەت تەورات و ئینجیل بوو . بەڵام لەم دوو دەقەدا گوانی ئاسكیش تەورات و ئینجیلە.

..............................................................................................

**مەمك و سوار بونی دار خورما عەیب نەبێت .**

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1447098066./1667705510114969/?type=3&theater

.................

**بابەتی ناو لینك**

لە گۆرانیی گۆرانیەكان ٧ – ٧ و ٨ و ٩ دا نوسراوە

ئەم بەژنەت لە دارخورما دەچێت مەمكەكانت لە هێشوو

لێرەدا كوڕەكە وەسفی باڵای كچەكە دەكات بەرزە و ڕێكە وەك دار خورما و مەمكەكانیشی وەك هێشوی خورما تۆپەڵن شۆڕ بونەتەوە . ئێستا بزانین دوای ئەم وەسفە كوڕەكە بەتەمای چییە ؟ لە دەقی ٨ دا نوسراوە

وتم : سەر دار خورما دەكەوم و خۆم بە چڵەكانیەوە دەگرم با مەمكەكانت وەك هێشوو بن بە دار مێو بن بۆنی هەناسەت وەك سێو لێرەوە بۆ كوڕەكە دەیەوێت سواری ئەو دار خورمایە بێت . جا سوار بونی دار خورما وەك داری تر نییە بە تەكان سەر دەكەوێت عەیب نەبێت و دور لەڕوی نوسەرانی كتێبی پیرۆز

كەسەكە قوماشێك یان چەرمێكی تایبەت بە حەبلێكەوە دەبەستێت وە دەی كات بە دار خورماكەوە كاتێك سەر دەكەوێت حەبلەكە بڵند دەكات بۆ سەرەوە خۆی لە خوارەوە دەمێنێت تەكانێك دەدات و سەر دەكەوێت بۆ جاری دووەم هەمان شت دەكاتەوە هەتا سەر دەكەوێتە سەری سەرەوە چەندەها تەكان دەدات ( بیلا مانێ ) !؟ دەقەكە دەڵێت بە تەكان سەر دەكەوێت بۆ ئەوەی بگات بە هێشوەكان كە مەمكێتی كاتێك گەیشت بە مەمكەكانی نزیك دەبێتەوە لە دەمی و بۆنی هەناسەی كچەكە وەك سێوە . ئینجا لە دەقی (٩) دا دەڵێت مەلاشوت وەك باشترین جۆری شەرابە بۆ ئەویندارەكەم یەكسەر دەڕژێت بە نەرمی بەسەر لێو دداندا بڕوات

لێرەدا بە وازحی دیارە کابرا دەمی گەیشتوەتە ناو دەمی و تۆو لیکی هەردووکیان لەناو دەمی یەکتریدا تێکەلاو بووە و لە مەلاشوی کچەکەوە لیکێك دەر دەچێت باشترین شەرابە کابرای سەرخۆش کردووە کەواتە تەکان بۆ گرتنی دوو هێشووی مەمك وە بۆنی هەناسە وەك سێو پاشان لیك ڕژان بەسەر ددانددا .

وە لە دەق (١ هەتا ٧ )کوڕەکە لە نەعلەکانی کچەکەوە دەست پێ دەکات بۆ کەوانی ڕانەکانی پاشان بۆ ناو گەڵی کە ئەوان بە ناوك ناوی دەبەن پاشان ماو قەدی دەگرێت وەك چەپکی خەرمان ئینجا سەر دەکەوێت بەسەر دار خورماکەدا بە تەکان بۆ مەمکی و پاشان بۆ ناو دەمی.

تەفسیری کڵێسا دەڵێت پیاو جاکانی مەسیحی وەك دار خورمان ڕێکن و ڕەگیان پتەوە و ئەو ڕەگەش خواردن لە روح القدس وەر دەگرێت . وە دوو مەمکەکەش تەورات و ئینجیلن وە تعبیر کراوە بە هێشوو چونکە هێشوو پڕە و ئیمانداریش بە تەورات و ئینجیل پڕ دەبێت لە خۆشی وە دەڵێت سەر دەکەوم بەسەر دار خورمادا واتا کڵێسا سەر دەکەوێت و بەرز دەبێتەوە و کە دەڵێت دەست دەگرم بە چڵەکانیەوە واتا چڵەکانی کڵێسا دەگرێت . وە مەسیحیش وەك ئەو چڵانە ئیمانداران دەگرێت وە کە دەڵێت بۆنی هەناسەت وەك سێوە ، واتا مەسیح خودایە و بووە بە جەستە و بووە بە مرۆڤ وە ئیماندارانی مەسیحیش هەمیشە بە هەناسەی مەسیح هەناسە دەدەن .. بۆ تەفسیری مەلاشوت وەك باشترین شەرابە دەڵێن ئیمانی ئیماندار نابێت بەس بە لێو بێت بەڵکو دەبێت بچێتە ناوەوە بۆ قوڵایی دەم وە شەرابیش ڕەمزە بۆ خۆشی واتا کاتێك ئیمانداری مەسیحی تسبیحات دەکات دەکەوێتە خۆشیەوە .

باشە بەڕێزان کاتێك ئەو دەقانە دەخوێنەوە چی دێتە پێش چاوتان ؟ دار خورما پیاو چاکە یان ئافرەتێکی باڵا بەرزە ؟ سەرکەوتن بەسەر دارخورمادا بەرز بونەوەی کڵێسایە یان گەیشتنە بە بەروبوم ؟ ئەو بەروو بومە جوتێك مەمکە یان تەورات و ئینجیل ؟کە چووە سەرەوە بۆنی هەناسەی کچێکە یان مەسیحی خودایە و بوە بە مرۆڤ ؟ شەراب مانای سەر خۆشی و بێ ئاگایی لە کاتی جنسدا یان مانایە بۆ تسبیحات ؟

..................................................

ئایا مەمك لە کتێبی پیرۆزدا هەر مەمکە یان مانای تری هەیە ؟

https://www.facebook.com/1506090639609791/photos/pb.1506090639609791.-2207520000.1447098066./1669570946595092/?type=3&theater

.......................

**بابەتی ناو لینك**

بەڕێزان لەم ماوەیەی پێشوودا زنجیرەیەك باسمان بڵاو کردەوە لەسەر مەمك لە کتێبی پیرۆزدا لە سفری نشید الانشاددا هەرهەمووی مەمکیان بە تەورات و ئینجیل لەقەڵەم دا بوو تەنانەت مەمك یان گووانی ئاسکیشیان هەر بە تەورات و ئینجیل لە

قەڵەم دا بوو . لەمە تێ دەگەین باسی مەمك تەفسیر دەکرێت بە تەورات و ئینجیل لە ٨ دەقدا . بەڵام لە ١٦ دەق تردا ناوی مەمك هاتووە لە کتێبی پیرۆزدا با بزانین تەفسیرەکانی خۆیان چی دەڵێت ؟

لە سفر **التکوین** پەیدا بوون بەشی ٤٩ دەق ٢٥ دا **یعقوب** دوعا بۆ یوسف دەکات علیهم السلام کە خودا بەرەکەت بخاتە مەمك و ڕەحمی ژنانی نەوەکەیەوە هەتا نەوەی زۆر بێت و شیریان بدەنێ

لە سفری **ئەیوب** بەشی ٣ دا ئەیوب (ع) نارەزایی و بێ سەبری خۆی دەر دەبڕێت بەرامبەر نەخۆشییە کەی وە لە دەق ١٢ دا دەڵێت مەمك بۆ شیر دانە خۆزگەم . خۆزگەم بە منداڵی شیراین پێ نەدامایە هەتا گەرە نەبوایەم و بگەم بەم ڕۆژە و بەم ئاستە

لە سفری **ایوب** ٢٤ دا ئەیوب باسی خەڵکی پیاو خراپ دەکات بۆچی خودا سزای پیاو خراپەکان نادات و سزای ئەیوب دەدات ؟ وە لە دەق ٩ دا باسی ئەو پیاو خراپانە دەکات تالانی دەکەن منداڵ لەبەر مەمکی دایکیان دەفرێنن

لە **مزموری** ٢٢ – ٩ دا باسی مەسیح (ع) دەکات دەڵێت ئەویش وەك خەڵکانی تر لە شیری مەمکی دایکی دەخوات لە پەندەکانی سلێمان ( **الامثال** ) بەشی ٥ دا باسی پەیوەندیی ژن و مێرد دەکات و لە دەق ( ١٩ ) دا ژنەکە بە ئاسکێك تشبیە دەکات بە مەمکەکانی مێردەکەی تێر دەکات.

لە سفری **اشعیاء** بەشی ٢٣ باسی نەوەی ئیسرائیل دەکات قسەی پێغەمبەرەکانیان ڕەت دەکەنەوە و خۆیان بە زانا دا دەنێن و دەڵێن خۆ ئێمە منداڵ نیین لە شیری مەمك برا بێتینەوە !؟ ئێمە گەورەین و ئێمە زاناین و شت دەزانین

بۆ ئەوەی بابەتەکە دوور و درێژ نەبێت ژمارە ی بەشەکان و دەقەکانتان بۆ دادەنێم کە باسی مەمکی تێدا کراوە لە (**اشعیاء** ٦٦-١١ وە **حزقیال** ١٦-٧ وە ٢٣-٣ و ٨ و ٢١ و ٣٤ هەروەها لە **هوشع** ٢-٢ وە ٩-١٤ وە لە ئینجیلی **لۆقا** ١١ – ٢٧ وە ٢٣ – ٢٩ )دا باسی مەمك کراوە

واتا لە( ١٦ ) دەقدا ( ١٤) یان پەیمانی کۆنە و دوانیان پەیمانی تازەیە باسی مەمك کراوە هەر هەمووی مەبەست ی لە مەمکی ئافرەتە نەك تەورات و ئینجیل . وە لە (٨ ) دەق تردا لە پەیمانی کۆن سفری نشید الانشاددا باسی مەمك کراوە و دەڵێن مەبەست لێی تەورات و ئینجیلە

وە هەر هەموو دەقەکان بە گوێرەی مفسرەکانی خۆیان تەفسیر کراوە مەبەستی لە مەمکی ئاسایی ئافرەتە نەك لە تەورات و ئینجیل .

**پرسیاری سەرەکیشمان ئەمەیە** : بۆچی لەو ٨ دەقەی سفری نشید الانشاددا کە سفرێکی سیکسی و جنسییە مەمك تەفسیر دەکەن بە تەورات و ئینجیل بەڵام لە ( ١٦) دەق تردا کە دەکاتە دوو هێندە هەر هەمە ی مەبەست لێی مەمکی ئاسایی ئافرەتە نەك تەورات و ئینجیل ؟ وە ئایا خودا پێویستیی بەوە هەیە کتێبەکانی بە مەمك ناو ببات ؟

..............................................

لە کۆتایدا بە کڵێسای مەسیحیی کورد زمان لە کوردوستان دەڵێم کتێبەکەتان و دەقەکانی مەمکەکانتان جوانە ؟ لە بیریشتان نەچێت یە ك مەمك قەرزارن نەتان نوسیوە !؟ تۆ بڵێی توشی شێر پەنجەی مەمك نە بوبێت و بڕی بێتیانەوە ؟ ئایا هەردووکی بڕاوەتەوە یان یە ك دانەیان ؟

.................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەلآمەکان ژمارە :سەد و نەوەد و شەش

## ئایا ئەم ئایەتە هەڵە نوسراوە حتى تستانسوا

تفسير الألوسي = روح المعاني

ابحث في الكتاب:

وتفسيره بذلك أخرجه ابن أبي حاتم وابن الأنباري في المصاحف وابن جرير وابن مردويه عن ابن عباس رضي الله تعالى عنهما، ويخالفه ما روى الحاكم وصححه والضياء في المختارة والبيهقي في شعب الإيمان وناس آخرون عنه أنه قال في حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا أخطأ الكاتب وإنما هي «حتى تستأذنوا» لكن قال أبو حيان: من روى عن ابن عباس أنه قال ذلك فهو طاعن في الإسلام ملحد في الدين وابن عباس بريء من ذلك القول انتهى.

وأنت تعلم أن تصحيح الحاكم لا يعول عليه عند أئمة الحديث لكن للخبر المذكور طرق كثيرة، وكتاب الأحاديث المختارة للضياء كتاب معتبر، فقد قال السخاوي في فتح المغيث في تقسيم أهل المسانيد ومنهم من يقتصر على الصالح للحجة كالضياء في مختارته، والسيوطي

[جزء / صفحة] 9 328 [الرقم]

سورة النحل
سورة الإسراء
سورة الكهف
سورة مريم
سورة طه
سورة الأنبياء
سورة الحج
سورة المؤمنون
سورة النور
[سورة النور (24) : الآيات 1 إلى 5]
[سورة النور (24) : الآيات 6 إلى 20]
[سورة النور (24) : الآيات 21 إلى 28]
[سورة النور (24) : الآيات 29 إلى 33]
[سورة النور (24) : الآيات 34 إلى 40]
[سورة النور (24) : الآيات 41 إلى 57]
[سورة النور (24) : الآيات 58 إلى 64]
سورة الفرقان

دەڵێن ئایەتی ٢٧ ی سورەتی **النور** کە دەفەرموێت ( **حتى تستانسوا** ) خۆی لە ئەسڵدا ( **تستاذنوا** ) بووە بەڵام بەهەڵە نوسراوە تستانسوا !؟ بەڵگەشیان حەدیسی ابن عباسە دەڵێن ابن عباس گوتویەتی ئەوە هەڵەی نوسەرەکان بووە دەبوایا بنوسرایە ( تستاذنوا ) نەك ( تستانسوا ) بەڵگەشیان بۆ قسەکانیان تەفسیری ابن کثیرە ٧ -38 وە لە نوسخەی الکترۆنیدا ٦ – ٣٨ . فەرموون ئەمە بەڵگەکەی ئەوان سەیری بکەن لە کۆتایدا ابن کثیر نوسیوێتی و هذا غريب جدا عن ابن عباس واتا ئەمە شتێکی زۆر غەریبە و ابن عباس شتی وا ناڵێت . چونکە ئەگەر هەڵەی کاتبەکان بوایە خۆ ابن عباس لە کاتی نوسینی نوسخەکەی عوسماندا ئەو هەڵەیەی پێ ڕاست دەکردنەوە . ئەمەش لینکی ئەو حەدیسەیە

http://shamela.ws/browse.php/book-8473#page-3270

.................

**بابەتی ناو لینك**

تفسير ابن كثير ت سلامة

ابحث في الكتاب:

قَالَ: إِنَّمَا هِيَ خَطَأٌ مِنَ الْكَاتِبِ، "حَتَّى تَسْتَأْذِنُوا وَتُسَلِّمُوا".

وَهَكَذَا رَوَاهُ (1) هُشَيم، عَنْ أَبِي بِشْرٍ –وَهُوَ جَعْفَرُ بْنُ إِيَاسٍ– بِهِ. وَرَوَى مُعَاذُ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ إِيَاسٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، بِمِثْلِهِ، وَزَادَ: وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقْرَأُ: "حَتَّى تَسْتَأْذِنُوا وَتُسَلِّمُوا"، وَكَانَ يَقْرَأُ عَلَى قِرَاءَةِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

وَهَذَا غَرِيبٌ جِدًّا عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

.................................................................................

هەروەها لە کتێبی **ناسخ و المنسوخی نحاسدا** ١ – ٥٨٧ دا دەڵێت ئەو قسەیەی ابن عباس کە دەڵێت هەڵەی نوسەرەکانە شتێکی زۆر تاوان و ڕێگا پێ نەدراوە چونکە خودای تعالی لا یاتیه الباطل من بین یدیه و لا من خلفه

http://shamela.ws/browse.php/book-13073#page-556

....................

**بابەتی ناو لینك**

الناسخ والمنسوخ للنحاس

ابحث في الكتاب:

وَرَوَى يَزِيدُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، وَالْحَسَنِ، {لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا} [النور: 27] ، قَالَا: " ثُمَّ نَسَخَ مِنْ ذَلِكَ وَاسْتَثْنَى فَقَالَ {لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَكُمْ} [النور: 29] " وَالْقَوْلُ الثَّانِي: أَنَّهُمَا مُحْكَمَتَانِ قَوْلُ أَكْثَرِ أَهْلِ التَّأْوِيلِ فَأَمَّا مَا رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَبَعْضُ النَّاسِ يَقُولُ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ أَنَّهُ قَالَ: أَخْطَأَ الْكَاتِبُ إِنَّمَا هُوَ حَتَّى تَسْتَأْذِنُوا فَعَظِيمٌ مَحْظُورٌ الْقَوْلُ بِهِ لِأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: {لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ} [فصلت: 42] ، وَمَعْنَى {حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا} [النور: 27] بَيِّنٌ عِنْدَ أَهْلِ التَّأْوِيلِ وَأَهْلِ الْعَرَبِيَّةِ

..............................................

هەروەها **لە** کتێبی الدر المصون في علوم الكتاب المكنون ٣٩٦/٨ دا دەڵێت ابن عباس تەفسیری کردووە بە تستاذنوا نەك بڵێت هەڵەی نوسەرەکانە و ئەو قسە یە هەڵ بەستراوە بە دەم ابن عباسەوە

http://shamela.ws/browse.php/book-9057#page-6944

........................

**بابەتی ناو لینك**


الدر المصون في علوم الكتاب المكنون

ابحث في الكتاب:

قوله: {تَسْتَأْنِسُواْ} : يجوزُ أن يكونَ من الاستئناس؛ لأنَّ الطارِقَ يَسْتَوْحِشُ من أنه: هل يُؤْذن له أو لا؟ فيُزالُ استيحاشُه، وهو رَدِيْفُ الاستئذانِ فوُضِع موضعَه. وقيل: من الإِيناس وهو الإِبْصار أي: حتى تَسْتَكْشفوا الحالَ. وفسَّره ابن عباس «حتى تَسْتَأْذِنُوا» وليست قراءةً. وما يُنقل عنه أنه قال: «تستأنسوا خطأٌ من الكاتب، إنما هون تستأذنوا» . . . . . منحولٌ عليه.

وهو نظيرُ ما تقدَّم في الرعد {أَفَلَمْ يَيْأَسِ الذين آمنوا} [الرعد: 31] وقد تقدَّم القول فيه.

والاستِئْناسُ: الاسْتِعْلام، قال:

..........................................................

هەروەها تفسیری **الالوسي روح المعاني** ٩ / ٣٢٨ دا دەڵێت : ئەو حەدیسەی الحاكم گێڕاویەتیەوە و الضیاء في المختارة و بیهقی لە شعب الایمان و زۆر کەسی تریش گێڕاویانەتەوە کە ابن عباس دەڵێت : ئایەتی تستانسوا لە ئەسڵدا تستاذنوا بووە !؟ بەڵام نوسەرانی قورئان هەڵەیان کردوە و بە هەڵە نوسیویانە تستانسوا . بۆیە ابو حیان لە وەڵامی ئەو حەدیسەدا دەڵێت : هەر کەس بڵێت ابن عباس دەڵێت تستانسوا نە بووە تستاذنوا بووە . کەسێکی ملحدە و تانە لە دین دەدات. هەروەها خۆشتان دەزانن کتێبی حەدیسەکانی ( الحاكم ) پشتی پێ نا بەسرێت لای زانایانی حەدیس وە جێگای متمانە نییە . **وەکو لە وێنە ی پۆستەکە سەرەوە بۆ ئێوەمان هێڵی سوور بە ژێر دا هێناوە**

..........................................................

بە هەر حاڵ ئەو سەرچاوانەی ئەوان دای دەنێن حاشیەکەی دەبڕن وە هیچ کام لە بوخاری و مسلم ئەو حەدیسەیان بە صحیح دانەناوە . پاشان ئەگەر وای دابنێین و فەرزیاتی ئەوە بکەین ئەو حەدیسە صحیحە و ابن عباس وای گوتووە ئەی بۆچی لە مصحفی عوسماندا نەیان نوسیووە ( تستاذنوا ) ؟ خۆ ابن عباس بە ڕەحمەت بێت خۆی یەکێك بووە لەو **لیژنە**یەی لە بەرگەوە بۆ بەرگ لە نوسینەوەی نوسخەی قورئانی **عوسمانی کوری عفان** دا بەشدار بووە وە ئەگەر کاتبەکان بە هەڵە لەبری( تستاذنوا تستانسوا )یان نوسی بێت .!؟ خۆ ابن عباس خۆی یەکێك بووە لەو کاتبانە و بە ئاگاداریی ئەو نوسخەی عوسمان نوسراوە پیت بە پیت و وشە بە وشە . دوژمنانی سەر سەختی ئیسلام هیچیان بە دەستەوە نەماوە دەگەڕێن بە دوای حەدیسە درۆ و هەڵ بەستراوەکاندا . پاشان ئەو قسەیە خۆ قسەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) نییە و قسەی ابن عباسە . بۆچی ئێمە وەری بگرین

بۆ قورئان ؟ هەرچەندە ابن عباس شتی وای نە گوتووە و ناڵێت و بێ بەریيە لەو حەدیسە درۆ و هەڵبەستراوە کە شیعەی ڕافیزە بڵاوی دەکەنەوە و کڵێسا و بێدینیش شوێن پێیان هەڵ دەگرن

---

## پرسیارە بێ وەڵاٚمەکان ژمارە :سەد و نەوەد و حەوت

## ئایا قورئان هەڵەی کردووە ناوی سامريی هێناوە ؟

سفر الملوك الاول ( پاشایان 1 ) 16 -24

وإشترى جبل السامرة من شامر بوزنتين من الفضة وبنى على الجبل ودعا اسم المدينة التي بناها باسم شامر صاحب الجبل السامرة.

16:24 And he bought the hill Samaria of Shemer for two talents of silver, and built on the hill, and called the name of the city which he built, after the name of Shemer, owner of the hill, Samaria.

24 ئینجا چیای سامیرەی[a] لە شەمەر بە دوو تالنت زیو[b] کڕی و دەستی کرد بە بنیادنان لە چیاکە، ئەو شارەی کە بنیادی نا ناوی لێنا سامیرە بە ناوی شەمەری خاوەنی چیای سامیرەوە.

a. 24.16 سامیرە: عیبری: شەمرۆن.
b. دوو تالنت: نزیکەی 70 کیلۆگرام.

سفر العدد ( سەر ژمێری ) 26-24

24 لە یاشوف خێڵی یاشوفییەکان لە شیمرۆن خێڵی شیمرۆنییەکان

24 وليأشوب عشيرة الياشوبيين.ولشمرون عشيرة الشمرونيين.

26:24 Of Jashub, the family of the Jashubites: of Shimron, the family of the Shimronites.

گومانی ئەم جارەمان هی گاورەکانە و دەڵێن قورئان لە ئایاتی ٨٥ و ٨٧ و ٩٥ ی سورەتی ( **طه** ) دا ناوی ( **سامری** ) ی هێناوە ئەمەش هەڵەیە . چونکە سامري لە دوای موسا بووە نەك لە زەمانی موسادا بێت.

بۆ وەڵاٚمی ئەم گومانەش دەبێت بچینەوە لای کتێبەکەی خۆیان و بە گوێرەی سەرچاوەکانی خۆیان وەڵاٚم بدەینەوە بزانین سامری چییە و کێیە و کەی هەبووە ؟

لێرەدا سێ ئیحتیمال هەیە :

بە گوێرەی کۆتایی سامر کە پیتی ( ي ) پێوەیە دەبێت ( سامر ) یان ناوی شوێن بێت بە ناوی ئەو شوێنەوە ئەو کەسە بانگ کرا بێت . وەك چۆن دەڵێن کوردي یان افغاني یان انگلیزي یان ... هتد . واتا کەسەکە کوردە یان افغانی یان ... هتدە . یان دەبێت ( سامر ) ناوی شوێن بێت یان دەبێت ( سامر ) ناوی هۆزێك بێت چۆن دەڵێن قەراخي یان زڕگوێزي یان ... هتد . بەڵگەی گاورەکانیش بۆ نا ڕاستيی ناوی ( سامري ) هەر دەق کتێبەکەی خۆیانە و دەڵێن سامري ناوی ناوچەیە و دەڵێن

لە سفر الملوك الاول ( پاشایان ١ ) ١٦ -٢٤ دا نوسراوە : ئینجا چیای سامیرەی لە (شەمەر) بە دوو تالنت زیو کڕی و دەستی کرد بە بنیادنان لە چیاکە ئەو شارەی کە بنیادی نا ناوی لێنا سامیرە بە ناوی شەمەری خاوەنی چیای سامیرەوە واشترى جبل السامرة من ( شامر ) بوزنتين من الفضة وبنى على الجبل ودعا اسم المدينة التي بناها باسم شامر صاحب الجبل السامرة ... وەك دەبینن دەڵێن کەسێك ناوی ( شامر ) بووە چیایەکی کڕیوە ئەو چیایەی ناو ناوە ( سامرة )

چونکە کابرا ناوی ( شامر ) بووە لە زمانی عیبریشدا ( س ) بە ( ش ) دەخوێننەوە وەك ( موسا = موشى ) یان

( اسماعیل = اشمایل ) وە هەروەها . وە لە ژێر سفری١٦ دا لە نوسخە کوردییەکەدا نوسراوە : سامیرە بە زمانی عیبری واتا ( شمرون ) فەرموون ئەمەش لینکی ئەو سفرە و سەیری دەقی ٢٤ بکەن وەرنە خوارەوە سەیری حاشیەکەش بکەن نوسراوە ( سامرة = شمرون )

http://www.kitebipiroz.com/bible/1ki/16

.............................................

بابەتی ناو لینك

کتێبی پیرۆز » پاشایان ١ » بەشی ١٦

24 ئینجا چیای سامیرەی[a] لە (شەمەر) بە دوو تالنت زیو[b] کڕی و دەستی کرد بە بنیادنان لە چیاکە، ئەو شارەی کە بنیادی نا، ناوی لێنا سامیرە بە ناوی شەمەری خاوەنی چیای سامیرەوە.

a. **24.16** سامیرە: عیبری: شەمرۆن.
b. دوو تالنت: نزیکەی 70 کیلۆگرام.

.............................................

ئێستا دەبێت ئێمە بگەڕێین بزانین ( شمرون ) لە کوێی کتێبەکەیاندا نوسراوە و شمرون یان شمرونیەکان کێن و کەی ژیاون و ئەسڵیان خەڵکی کوێن ؟ وە ووشەی شمرون لە تەورات سفر العدد ( سەرژمێری ) ٢٦ دا نوسراوە

**سفر العدديش** واتا سەرژمێری ئەو کات موسا و هارون لە ژیاندا بوون سەرژمێریی بنو اسرائیلیان کردووە پاش ئەوەی لە میسر هەڵهاتن و هاتن بۆ فلسطین . لەم بەشەدا ٢٦ باسی سەرژمێریی ئەو پیاوانە دەکات لە بنو اسرائیل کە موسا (ع) ناو نوسی کردن بۆ ئەوەی ببن بە سەرباز وە یشوع ببێت بە سەرکردەیان بۆ جەنگ ئامادە بن . وە لە دەقی ٢٤ دا نوسراوە: لە یاشوڤ خێڵی یاشوڤییەکان، لە شیمرۆن خێڵی شیمرۆنییەکان . واتا ئەو پیاوانەی لە خێڵی ( شمرون ) بوون وە دەیان توانی چەك هەڵ بگرن موسا (ع) ناوی نوسین بۆ ئەوەی ببن بە سەرباز لەژێر سەرکردا یەتیی یشوعی کوڕی نوندا.

کەواتا بە گوێرەی حاشییەکەی خۆیان ( شمرون ) لە سفر العدد ٢٦ – ٢٤ دا نوسراوە هۆزێکە لە هۆزە کانی جولەکە و سەیری دەقی ٢٢ بکەن نوسراوە ( ئەمانە خێڵەکانی یهوذان ) وە یهودا کوڕە گەورەی سیدنا یعقوب (ع) بوو.

کە ئەمانەن ( یسخار = یسخاریەکان ) ( تۆلاع = تۆلاعیەکان ) ( یوڤە = یوڤیەکان ) ( یاشوف = یاشوفیەکان ) ( شمرۆن = شمرۆنیەکان )

بۆ دڵنیابون دەتوانن خۆتان **سفری** ٢٦ لە دەقی ٢٢ هەتا ٢٤ بخوێننەوە ئەمەش لینکی سفرەکەیە

http://www.kitebipiroz.com/bible/num/26

.........................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز » سەرژمێری » بەشی ٢٦

22 ئەمانە خێڵەکانی یەهودان، بەگوێرەی ژمارەیان حەفتا و شەش هەزار و پێنج سەد کەس بوون.
23 نەوەی یەساخار بەگوێرەی خێڵەکانیان:
لە تۆلاع خێڵی تۆلاعییەکان،
لە پوڤە خێڵی پوڤەییەکان،
24 لە یاشوق خێڵی یاشوقییەکان،
لە شیمرۆن خێڵی شیمرۆنییەکان.

کەواتا بە گوێرەی کتێبەکەی خۆیان ( شامر یان شمرۆن یان سامر ) یەکێکە لە خێڵەکانی بنو اسرائیل وە لە نەوەی یهودایە وە کاتێك دەڵێن سامري واتا سەر بە خێڵی شۆمەر یان سامر ی کوڕی یهودایە وە ئەو سامریەی کە قورئان باسی دەکات سەر بە هۆزی شمرۆن بووە و ( شمرۆنی ) بووە . بووەتە هۆکاری ئەوەی کە جولەکە گوێرەکەی ئاڵتونی بپەرستن . نەك هارونی برای مەوسا چونکە تەورات دەڵێت هارونی برای موسا علیهما السلام.

گوێرەکەی ئاڵتونی دروست کردووە نەك سامري وە حاشا الله ئەگەر پێغەمبەرێکی وەك هارون کاری لەو شێوەیە بکات و لەبری خودا گوێرەکە بپەرستێت . وە شۆمەریەکان یان سامریەکان لای جولەکەش ناسراو بوون

وە خۆشیان نە ویستون چونکە بونەتە هۆکاری گومڕایی بنو اسرائیل و گوێرەکەی ئاڵتونیان دروست کردووە . هەر بۆیە جولەکە ڕقیشیان لە مسیح (ع) بووە و بە شۆمەری یان سامری ناویان بردوە لە ئینجیلی یوحنا ٨-٤٨ دا نوسراوە

جولەکەکان پێیان وت: ئایا ئێمە ڕاست ناڵێین کە تۆ سامیرەیی و ڕۆحیپیست هەیە ؟ واتا مەسیح (ع) سامیرەییە و گومڕا کەرە وەك سامری . هەر لە یوحنا ٤-٩ دا باسی ئەوە دەکات مەسیح (ع) ئافرەتێکی سامیرەیی بینیوە

داوای ئاوی لێ کردووە . ئافرەتەکەش لای سەیر بووە جولەکەیەك داوای ئاو لە شۆمەرییەك دەکات وە پێی گوتوە خۆ جولەکە مامەڵە لەگەڵ سامریەکاندا ناکەن ؟ تۆ چۆن داوای ئاو لە من دەکەیت ؟

لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشەوە : لە **سفر الملوك الاول** ( پاشایان ١ ) ١٦ -٢٤ دا نوسراوە : ئینجا چیای سامیرەی لە (شەمەر) بە دوو تالنت زیو کڕی و دەستی کرد بە بنیادنان لە چیاکە ئەو شارەی کە بنیادی نا ناوی لێنا سامیرە بە ناوی شەمەری خاوەنی چیای سامیرەوە

ئایا کەسێك بۆچی ساخێك دەکرێت ؟ وە ئایا شامر بە تەنیا بوو یان ئەو ساخەی کری بۆ هۆزەکەی بۆ ئەوەی تێیدا نیشتەجێ بن ؟ وە ئایا پێش سامر ئەو شاخە و چوار دەوری خەڵکی تری لێ دەژیان ؟ بۆ ئەم مەبەستەش هەر دەگەڕێینەوە بۆ کتێبەکەی خۆیان و هەر هەمان سفر کە سفری پاشایانی یەکەمە بەشی ١٣ واتا ٣ بەش پێش کڕینی شاخەکە . لە بەشی ١٣ دا باسی پێغەمبەرێکی پیر و پێغەمبەرێکی گەنج دەکات پیرەکە ساختەچییە فێڵ لە پێغەمبەرە گەنجەکە دەکات

ناچینە وردەکارییەکانەوە لینکەکەیتان بۆ دا دەنێین خۆتان وردەکاریی ئەو فێڵانە بخوێننەوە . کاتێك پێغەمبەرە گەنجەکە دەمرێت پێغەمبەرە پیرەکە وەسیەت دەکات لە قەبری پێغەمبەرە گەنجەکەدا بینێژن وە لە دەقی ٣٢ دا نوسراوە چونکە بە تەواوی ئەو پەیامە دێتە دی، کە بەپێی فەرماییشتی یەزدان ڕووەو قوربانگاکەی بێتئێل و ڕووەو هەموو نزرگەکانی سەر بەرزایی کردی، ئەوانەی لە شارۆچکەکانی (سامیرە) دان

ئەمەش دەقێکی حاشا هەڵ نەگرە کە پێش کڕینی شاخەکە ناوچەی سامیرە ئاوەدان بووە و شارۆچکەی زۆری تێدا بووە . وە سامریەکان لەو ناوچەیەدا ژیاون .

الحمد لله بە گوێرەی دەقەکانی خۆیان سەلماندمان کە شۆمەر و شۆمەریەکان کە دەکاتە سامریەکان لە نەوەی یهودان وە لە زەمانی یشوعدا سەربازی یشوع بون بە فەرمانی موسا (ع) وە پاشان لە شارۆچکەکانی سامیرەدا ژیاون وە جولەکەش سامریەکانیان خۆش نە ویستووە بۆیە بە مەسیحیان گوتووە تۆش سامرییت . فەرمون ئەمەش بەڵگە لەسەر دوو پێغەمبەرەکە و لە دەقی ٣٢ دا نوسراوە شارۆچکەی زۆر هەبووە لە سامیرە پێش کڕینی شاخەکە

http://www.kitebipiroz.com/bible/1ki/13

.........................................................................

**بابەتی ناو لینك**

کتێبی پیرۆز « پاشایان ١ « بەشی ١٣

32 چونکە بە تەواوی ئەو پەیامە دێتە دی، کە بەپێی فەرماییشتی یەزدان ڕووەو قوربانگاکەی بێتئێل و ڕووەو هەموو نزرگەکانی سەر بەرزایی کردی، ئەوانەی لە شارۆچکەکانی (سامیرە)دان.

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :سەد و نەوەد و هەشت

## کوشتنی ژن و منداڵی کافرەکان لە ئیسلامدا

9 – بَابُ جَوَازِ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ فِي الْبَيَاتِ مِنْ غَيْرِ تَعَمُّدٍ

26 – (1745) وحَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَحْيَى، وَسَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ، وَعَمْرٌو النَّاقِدُ، جَمِيعًا عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، قَالَ يَحْيَى: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الذَّرَارِيِّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ؟ يُبَيَّتُونَ فَيُصِيبُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ "، فَقَالَ: «هُمْ مِنْهُمْ»

[ ش (الذراري) بتشديد الياء وتخفيفها لغتان التشديد أفصح وأشهر والمراد بالذراري هنا النساء والصبيان
(سئل النبي صلى الله عليه وسلم عن الذراري من المشركين) هكذا هو في أكثرنسخ بلادنا سئل عن الذراري وفي رواية عن أهل الدار من المشركين ونقل القاضي هذه عن رواية جمهور رواة صحيح مسلم قال وهى الصواب وأما الرواية الأولى فقال ليست بشيء بل هى تصحيف قال وما بعده يبين الغلط فيه قلت (اي الإمام النووي) وليست باطلة كما ادعى القاضي بل لها وجه وتقديره سئل عن حكم صبيان المشركين الذين يبيتون فيصاب من نسائهم وصبيانهم بالقتل فقال هم من آبائهم أي لا بأس بذلك لأن أحكام آبائهم جارية عليهم في الميراث وفي النكاح وفي القصاص والديات وغير ذلك والمراد إذا لم يتعمدوا من غير ضرورة
(يبيتون) معنى يبيتون أن يغار عليهم بالليل بحيث لا يعرف الرجل من المرأة والصبي ومنه البيات]

جونێتیی ڕۆشتن بۆ پەڕەکانی دواتر

گەڕانەوە بۆ پێشتر

پرسیارە بێ وەڵامەکان بۆ هەموو دژە ئیسلامەکان

بەڕێزان گومانی ئەم جارەمان زۆر گەورەیە و کاتێك دەی بیستن یان دەیخوێننەوە لە انترنێت لاتان وایە ئاینی ئیسلام زۆر کوشندەیە و تەنانەت منداڵ و ژنیش دەکوژێت !؟ بەڵام وەڵام دانەوەی زۆر ئاسانە و کورد وتەنی زەڵاتەیە

با پێشەکی گومانەکەتان بۆ دا بنێین وەك خۆی کە قەشەکان بڵاوی دەکەنەوە : دەڵێن لە صحیحی موسلیمدا حەدیسی ژمارە ١٧٤٥ دا نوسراوە . لە پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) پرسی جاری وا هەیە شەوانە هێرش دەکەینە سەر دوژمن وە تاریکە و نازانین کامە ژن و منداڵە و دەکوژرێن و بەر دەکەون !؟ پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) گوتی ئەوان لەوانن . واتا مادام ژن و منداڵی دوژمنە و موشریکن فەرقیان نییە ئەوانیش وەك باوکان و مێردەکانیان ئەوانیش بکوژن وە کردویانە بە هەرا دەڵێن ئاینی ئیسلام ژن و منداڵیش دەکوژێت !؟ با ئێستا بێین وەڵامی بدەینەوە و بچین بۆ صحیحی موسلیم

بەشی ٣٢ ( **باب الجهاد و السیر** ) لە بەشی ٨ دا ( **باب تحریم قتل النساء و الصبیان في الحرب** ) واتا بەشی حەرام کردنی کوشتنی ژن و منداڵ لە جەنگدا . حەدیسی ژمارە ١٧٤٤ واتا نوسراوە : لە یەکێك لە غەزوەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بینیمان ئافرەتێك کوژراوە . پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) نەهیی لێکردین گوتی نابێت ژن و منداڵ بکوژرێت !

لە بەشی ٩ دا حەدیسی ژمارە ١٧٤٥ ئەو حەدیسەی قەشە سلێمانی ئەو گومانەی لێ کۆپی و پەیست کردوە لە کڵێسا عەرەبەکانەوە! نوسراوە ( **باب جواز قتل النساء و الصبيان في البيات من غير تعمد** ) واتا بەشی کوشتنی ژن و منداڵ لە شەودا بە بێ ئەوەی بتەوێت ( **من غير تعمد** ) واتا بە عمدی نەبێت وە کابرای قەشە ئەمەی بڕیووە لە نقلی حەدیسەکەدا وە لێرەدا فێڵی لە ئێوە و خۆشی کردووە چونکە ئەمین نەبووە لە نقلەکەیدا !؟ هەر لە حاشیەکەدا نوسراوە ( **والمراد إذا لم يتعمدوا من غير ضرورة** )مەبەست لەوەیە ئەگەر بە عمدی نەبێت ئەو کوشتنە و زەرور نەبێت !؟ خۆتان دەزانن شەو تاریکە و بە زەحمەت شت لێك جیا دەکرێتەوە کابرا ئەگەر بزانێت منداڵە یان ژنە نای کوژێت !؟ بەڵام شەڕە و پەلامار دەدرێت و منداڵ یان ژن بەر دەکەوێت وە لێك جودا ناکرێتەوە لەگەڵ دوژمندا و کوشتنەکە بە عمدی نییە . کابرای قەشە بابەکەی کە نوسراوە ( من غير تعمد ) وە حاشیەکەش کە نوسراوە (**والمراد إذا لم يتعمدوا من غير ضرورة** ) ئەو دوانەی بڕیوە و نەقڵی نەکردووە و لێرەدا خوێنەری چەواشە کردووە و خۆی دەردەخات ئاینی ئیسلام ژن و منداڵ دەکوژێت

بەم شێوەیە وەك ئەتایستێکی خاوەن ویژدان خۆی دەر خستووە بەزەیی بە مرۆڤدا دێتەوە !؟ بەلام قەشە فێڵی لە ئەتایستەکانیش کردووە بەوەی زانیارییەکانی بە بڕاوی نقل کردووە . بەڵام ناتوانێت فێڵ لە ئێمە ی موسوڵمان بکات !؟ چونکە ئێمە شارەزاترین لە کتێب و سەرچاوەکانمان .

وە لە حەدیسی **دووەمی** ١٧٤٥ دا بەهەمان شێوە لە حاشیەکەدا نوسراوە . واتا نابێت بە عمدی بکوژرێن . بەلام کاتێك شەڕ دروست دەبێت و ژن و منداڵ و شەڕ کەر تێکەڵاو دەبن شەویش تاریکە دەکرێت ژن و منداڵ بکوژرێت منیش دەڵێم لەوانەیە هەر کابرای موشریك خۆشی ژن و منداڵ بکوژێت چونکە شەوە و تاریکە و جاری وا هەیە کابرا نزیکە لێی و ژنێك یان منداڵێك لە ترسان هەڵ دێت و دەکەوێتە نێوانیان وە هەر باوکی خۆی دەیکوژێت بە هەڵە

بەڵێ بەڕێزان وەك بینیتان دوو حەدیس هەیە ١٧٤٤ دەڵێت نابێت ژن و منداڵ بکوژرێت . کاکی قەشە ئەوەیان نقل ناکات !؟ وە حەدیسی دوای ئەو مباشر دەڵێت نابێت بە عمدا ژن و منداڵ بکوژرێت . کاکی قەشە ئەوەشیان نقل ناکات با ئێمەش **سێ** نموونە لە کتێبەکەی کاکی قەشەتان بۆ نقل بکەین وەك خۆی بە ویژدانەوە .

لە سفری **مزامير** ( زەبورەکان ) ١٣٧ – ٩ دا نوسراوە دەستی خۆش بێت ئەو کەسەی منداڵەکانت دەگرێت و بە تاشەبەردیاندا دەدات !

سفری **حزقيال** ٩ – ٦ دەڵێت پیر و گەنج و کچ و منداڵ و ئافرەتەکان لەناوببەن و بیانکوژن، بەڵام ئەو کەسەی نیشانەکەی پێوەیە لێی نزیك مەبنەوە. لە پیرۆزگاکەمەوە دەست پێ بکەن. ئەوانیش لەو پیرانەوە دەستیان پێکرد کە لەبەردەم ماڵەکە بوون

سفری **هوشع** ١٣ – ١٦ دەڵێت خەڵکی سامیرە تاوانبار دەکرێن، چونکە لە خودای خۆی یاخی بون و بە شمشێر دەکوژرێن منداڵەکانیان تێکدەشکێنرێن سکی سکپڕان هەڵدەدڕرێت

# پرسیارە بێ وەلأمەكان ژمارە :سەد و نەوەد و نۆ

## ئایا خودا فێڵ بازە ؟ یمكرون و یمكر الله

Search: مكر ◄ page 1 of 2 ► 49 results in 31 ayas

1. ومكروا ومكر الله والله خير الماكرين ﴿آل عمران: ٥٤﴾
2. وكذلك جعلنا في كل قرية أكابر مجرميها ليمكروا فيها وما يمكرون إلا بأنفسهم وما يشعرون ﴿الأنعام: ١٢٣﴾
3. وإذا جاءتهم آية قالوا لن نؤمن حتى نؤتى مثل ما أوتي رسل الله الله أعلم حيث يجعل رسالته سيصيب الذين أجرموا صغار عند الله وعذاب شديد بما كانوا يمكرون ﴿الأنعام: ١٢٤﴾
4. أفأمنوا مكر الله فلا يأمن مكر الله إلا القوم الخاسرون ﴿الأعراف: ٩٩﴾
5. قال فرعون آمنتم به قبل أن آذن لكم إن هذا لمكر مكرتموه في المدينة لتخرجوا منها أهلها فسوف تعلمون ﴿الأعراف: ١٢٣﴾
6. وإذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك أو يقتلوك أو يخرجوك ويمكرون ويمكر الله والله خير الماكرين ﴿الأنفال: ٣٠﴾
7. وإذا أذقنا الناس رحمة من بعد ضراء مستهم إذا لهم مكر في آياتنا قل الله أسرع مكرا إن رسلنا يكتبون ما تمكرون ﴿يونس: ٢١﴾
8. فلما سمعت بمكرهن أرسلت إليهن وأعتدت لهن متكأ ﴿يوسف: ٣١﴾
9. ذلك من أنباء الغيب نوحيه إليك وما كنت لديهم إذ أجمعوا أمرهم وهم يمكرون ﴿يوسف: ١٠٢﴾
11. وقد مكر الذين من قبلهم فلله المكر جميعا يعلم ما تكسب كل نفس وسيعلم الكفار لمن عقبى الدار ﴿الرعد: ٤٢﴾
12. وقد مكروا مكرهم وعند الله مكرهم وإن كان مكرهم لتزول منه الجبال ﴿إبراهيم: ٤٦﴾
13. قد مكر الذين من قبلهم فأتى الله بنيانهم من القواعد فخر عليهم السقف من فوقهم وأتاهم العذاب من حيث لا يشعرون ﴿النحل: ٢٦﴾
14. أفأمن الذين مكروا السيئات أن يخسف الله بهم الأرض أو يأتيهم العذاب من حيث لا يشعرون ﴿النحل: ٤٥﴾
15. واصبر وما صبرك إلا بالله ولا تحزن عليهم ولا تك في ضيق مما يمكرون ﴿النحل: ١٢٧﴾
16. كل ذلك كان سيئه عند ربك مكروها ﴿الإسراء: ٣٨﴾

﴿الحج: ١٨﴾ ● ﴿النمل: ٥٠﴾ ● ﴿النمل: ٥١﴾ ● ﴿الرعد: ٣٣﴾ ● ﴿النمل: ٧٠﴾ ● ﴿سبأ: ٣٣﴾
﴿فاطر: ١٠﴾ ● ﴿فاطر: ٤٣﴾ ● ﴿فاطر: ٤٣﴾ ● ﴿غافر: ٤٥﴾ ● ﴿نوح: ٢٢﴾

گومانێكی كۆن هەیە كە مفسرە ئیسلامییەكان لە تەفسیرەكانیاندا بە تەواوی باسیان كردووە . گاورەكان تازەیان كردوەتەوە و دەڵێن لە قورئاندا خودا بە فێڵباز خۆی وەسف كردوە و بەڵگەشیان ئایەتی( یمكرون و یمكر الله و الله خیر الماكرین). پێشەكی با بزانین ( مكر ) لە زمانی عەرەبیدا مانای چییە ؟ واتا فێڵ و هەڵ خەڵەتاندن وە ئەسڵی مكر واتا هەڵخەڵەتاندن . وە دارێك هەیە پێی دەڵێن ( مكر ) گەڵا و لق و پۆپەكانی بە شێوەیەك تێك ئاڵاوە دارەكە و قەدەكەی پێشەكی با بزانین ( مكر ) لە زمانی عەرەبیدا مانای چییە ؟ واتا فێڵ و هەڵ خەڵەتاندن وە ئەسڵی مكر واتا هەڵخەڵەتاندن . وە دارێك هەیە پێی دەڵێن ( مكر ) گەڵا و لق و پۆپەكانی بە شێوەیەك تێك ئاڵاوە دارەكە و قەدەكەی جودا ناكرێتەوە هێندە ئاڵۆزە و تێك ئاڵاوە ؟ وە ئامانجی ( المكر ) ئەوەیە كە ئەو كارە بكات بەبێ ئەوەی بەرامبەر هەستی پێ بكات بۆیە فێڵیش دوو جۆرە فێڵی باش و خراپ . وە دەڵێن ئەسڵی ( المكر ) هەوڵ دانە بۆ خراپەكاری بە دزییەوە و دانانی پلانێكی بەهێزە بۆ ئەوەی بەرامبەر هەست بە هیچ نەكات و ئەمانیش پلانەكەیان سەر بگرێت .

بە گشتی المكر واتا فێڵ وە هەموو فێڵێكیش لە دنیادا پێویستی بە پلانێكی تۆكمە و بیر كردنەوەیەكی باش هەیە بۆ ئەوەی ئەو كەسەی ئەو فێڵە دەكات بتوانێت ئامانجەكانی بپێكێت بەبێ ئەوەی بەرامبەر هەست بكات .

لێرەدا وەك زمانەوانی لە مانای ( المكر – فێڵ ) تەواو بوین منیش دەڵێم هەموو فێڵێكیش پێویستی بە پلانێكی تۆكمە هەیە و ئەم كارە لە مێژەوە هەیە لە تاكێكەوە ئەو كارە دەكات بۆ كۆمەڵێك و هەتا دەگاتە دەوڵەتیش وە سەركەوتنی هەموو پلانێك پەیوەستە بە

تۆکمەیی ئەو فێڵانەی تێیدایە بۆ ئەوەی بەرامبەر باوەڕ بکات و ئەگەر پلانەکە سەری گرت دەبێت بە دەست کەوت و سەرکەوتن بۆ ئەو کەسە یان ئەو دەوڵەتە . وە لە بەرامبەریشدا خەڵکی و ئەو کەسانەی کە ڕو بەڕووی ئەو فێڵە و ئەو پلانە دەبنەوە حساباتی خۆیانیان هەیە وە ئەگەر بتوانن فێڵەکان کەشف بکەن دەبێتە هۆکاری پوچەڵ بونەوەی پلانەکە و دەبێت بە دەست کەوت و سەکەوتن بۆ ئەو تاکە یان کۆمەڵە یان دەوڵەتە و باس دەکرێت و نیسانەی ئازایەتیی پێ دەدرێت و شیعر و شاناموی پێدا هەڵ دەدرێت و چەندە ها کتێب و سەرگوزشتەی لەسەر دەنوسن .

کەواتا فێڵ و مکر دولایەنە بۆ لایەنێکیان باشە ئەگەر فێڵەکانی بە گوێرەی پلانەکان بڕوات وە بۆ بەرامبەر خراپە کە پلانەکەیان سەر بگرێت وە بۆ ئەو لاینە خراپە ئەگەر پلانەکەی داناوە سەر نەگرێت وە بۆ ئەولا باشە کە پوچەڵی دەکاتەوە بۆیە تێگەیشتنمان بۆ فێڵ و ئەسڵی فێڵ هەروەها وردبینی لە فێڵەکاندا پلانەکە تۆکمە دەکات و بۆ لایەکیان باشە و بۆ لایەکیان خراپە ؟ با ئێستا بێین بۆ ئەو دەقەی کە باسی ( مکر الله ) دەکات بزانین ئایا خودا فێڵ بازە یان ئەوان لە مانای مکر تێ نەگەیشتون ؟

ڕەخنەی ئەوان لە ئایەتی ٥٤ ی ال **عمرانە** دەفەرموێت **(ومكروا ومكر الله والله خير الماكرين** ) وە ئەگەر ئێمە لەگەڵ سیاق ئایەتەکاندا بڕۆین و لە ئایەتی ٤١ وە هەتا ٥١ بیخوێنینەوە بۆمان دەر دەکەوێت باسی چۆنێتیی لە دایك بوونی مسیح (ع) دەکات وە چۆن بووە بە پێغەمبەر و بانگەشەی کردووە ؟ لە ئایەتی ٥٢ هەتا ٥٣ دا باسی ئەوە دەکات کە چۆن جولەکە پلانیان داناوە مسیح (ع) ئازار بدەن و لە خاچی بدەن ؟ پاشان دەفەرموێت **( و مكروا و مكر الله و الله خير الماكرين)....**

واتا ئەوان فێڵیان کرد و پلانیان دانا بۆ لەخاچ دانی . وە لە ئایەتی **٥٥** دا دەفەرموێت بەڵام خودا فێڵ و پلانەکانیانی پوچەڵ کردەوە و عیسا ی هەڵکێشایەوە بۆ لای خۆی . کەواتا لێرەدا ئەو فێڵەی جولەکەکان پوچەڵ کرایەوە لای خودا وە خودا لە ڕێگای قورئانەوە پێمان دەڵێت عیسا (ع) لە خاچ نەدراوە . بەڵام ئەو فێڵەی جولەکەکان و پلانەکەیان تا ئاخر زەمان هەر ماوە و گاورەکان باوەڕیان بەو فێڵ و پلانە کردووە و دەڵێن مەسیح لە خاچ دراوە و خاچ دەپەرستن ئادەی کاکی ڕەخنەگر پێم بڵێ لەم ئایەتەی ٥٤ ی ال **عمراندا** کە ڕەخنەی لێ دەگریت لە کوێدا دەڵێت خودا فێڵی کردووە یان فێڵبازە ؟ یان جەنابت تا ئێستاش باوەڕت بەو فێڵ و پلانەی جولەکە هەیە کە خودا پوچەڵی کردوەتەوە ؟

هەروەها ئایەتی ٣٠ ی **الانفال** بەهەمان شێوە دەفەرموێت **( و الله خير الماكرين** ) ئەگەر دەق ئایەتەکە بە تەواوەتی بخوێنینەوە باس لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات و دەڵێت کافرەکان فێڵ و پلانت بۆ دادەنێن بۆ ئەوەی قۆڵ بەستت بکەن یان بتکوژن یان وە دەرت نێن ئەوان فێڵ دەکەن و پلان دادەنێن وە خوداش پوچەڵی دەکاتەوە بەڵگەشمان ئەوەیە نەیان توانی هیچی لێ بکەن و ئاینەکەشی بڵاو کردەوە و فێڵ و پلانەکانیشیان سەری نەگرت و پوچەڵ کرانەوە

بەڕێزان با زیاتر لەسەر ئەم بابەتە نەڕۆین . چونکە وەك باسمان کرد فێڵ و پلان یان دەبێت بە سەرکەوتن یان پوچەڵ دەکرێتەوە و دەبێت بە شکست بۆ بەرامبەر . وە قورئانی مەزن ٤٧ جار وشەی مكر ی تێدا نوسراوە

**پرسیاری بێ وەڵاممان ئەمەیە** . فەرموون لەو ٤٧ جارە بۆمان دەر بهێنن کامیان باسی فێڵ دەکات ؟ وە هەر هەموو ٤٧ جارەکە باسی فێڵ دەکات و لە بەرامبەریشدا باسی پوچەڵ کردنەوەی فێڵەکە دەکات لە لایەن خوداوە کامتان زۆر شارەزان پێمان بڵێن لە کام ئایەتەیاندا خودا وەك ئەوان فێڵی لێ کردونەتەوە ؟ ئەگەر نەتان توانی وەڵامی ئەو پرسیارە بێ وەلامە بدەنەوە ؟ منیش دەڵێم پاك و بێ گەردی بۆ خودا وە کاتێك تۆ نا زانیت **مكر** چییە ؟وە مكر دولایەنە باش و خراپ وە بە گوێرەی سەرگرتن و پوچەڵ کردنەوەی فێڵەکە حساب بۆ ئەو مکرە دەکرێت . کەواتا مكر دوو لایەنە و بڕۆن هەموو قورئانیش بپشکنن بزانن هەر هەموو ئایەتەکان باسی پوچەڵ کردنەوە فێڵی کافران دەکات لای خوداوە یان نا ؟

با ئێستا بچین بۆ لای کتێبی پیرۆزی گاورەکان و بزانین خودا چۆن فێڵ دەکات لە کتێبەکەیاندا ؟ تەنانەت فێڵ لە خودا دەکرێت و پێغەمبەرایەتیی لێ دەستێنن و یعقوب بە فێڵ و پلانێکی گڵاو دەبێت بە پێغەمبەر وە خوداش هێندە گێلە بێ ئاگایە لەو پلانە و یعقوب دەکات بە پێغەمبەر ئەمەش بەڵگە **سفر التكوين** بەشی ٢٧ هەتا دەقی ٤٠ بخوێنەوە

http://www.kitebipiroz.com/bible/gen/27

................

بابەتی ناو لینك

کتێبی پیرۆز » پەیدابوون » بەشی ٢٧

27 ئەویش چووە پێشەوە و ماچی کرد. ئیتر ئیسحاق بۆنی جلەکانی کرد، داوای بەرەکەتی بۆ کرد و وتی:
(بڕوانە، بۆنی کوڕەکەم
وەك بۆنی دەشتودەرە
کە یەزدان بەرەکەتداری کردووە.

28 با خودا لە شەونمی ئاسمان و
لە چەوری زەویت بداتێ،
هەروەها دانەوێڵەی زۆر و شەرابی نوێ.

29 با گەلان ببنە خزمەتکارت،
نەتەوەکانیش کڕنۆشت بۆ ببەن.
ببە بە سەروەری براکانت،
کوڕانی دایکت کڕنۆشت بۆ ببەن.
با نەفرەت لێکەرانت نەفرەت لێکراو بن و
ئەوانەی داوای بەرەکەتت بۆ دەکەن بەرەکەتدار دەبن.)

30 پاش ئەوەی ئیسحاق لە داواکردنی بەرەکەت بووەوە بۆ یاقوب، یاقوب لەلای ئیسحاقی باوکی چووە دەرەوە، عیسۆی برای
لە ڕاوەکەی هاتەوە.

31 ئەویش خواردنی ئامادە کرد و بۆ باوکی بردە ژوورەوە، بە باوکی وت: (باوکە، هەستە لە ڕاوی کوڕەکەت بخۆ، تاوەکو داوای
بەرەکەتم بۆ بکەیت.)

32 ئیسحاقی باوکیشی پێی وت: (تۆ کێیت؟)
ئەویش وتی: (من کوڕە نۆبەرەکەی خۆتم، عیسۆ.)

33 ئیتر ئیسحاق لەرزینێکی زۆر توند لەرزی و وتی: (ئەی کێ بوو ئەوەی کە نێچیرێکی ڕاوکردبوو و بۆی هێنام؟ منیش لە
هەموویم خوارد، پێش ئەوەی تۆ بێیت داوای بەرەکەتیشم بۆ کرد، هەروەها بەرەکەتداریش دەبێت.)

34 عیسۆ کە قسەکانی باوکی بیست هاواری کرد، هاوارێکی بەرز و زۆر خەمبار، بە باوکی وت: (باوکە، دە داوای بەرەکەت بۆ
منیش بکە!)

35 ئەویش وتی: (ئاخر براکەت بە فێڵبازی هات و بەرەکەتی تۆی برد.)

36 عیسۆ وتی: (ئایا لە جێی خۆیدا نییە کە ناونراوە "یاقوب"[a] ؟ ئەوە دوو جارە فێڵم لێ دەکات، نۆبەرایەتییەکەی منی برد، وا
ئێستاش بەرەکەتەکەی منی برد.) ئینجا وتی: (ئەی هیچ بەرەکەتێکت بۆ من نەهێشتۆتەوە؟)

37 ئیسحاق وەڵامی دایەوە و بە عیسۆی وت: (وا ئەوم کردووە بە سەروەری تۆ و هەموو کەسوکاریشیم داوەتێ تا ببنە
خزمەتکاری ئەو، بە دانەوێڵە و شەرابی نوێ پشتگیریم کردووە. ئیتر بۆ تۆ چی بکەم، کوڕم؟)

38 عیسۆش بە باوکی وت: (ئایا تەنها یەك بەرەکەتت هەیە؟ هەروەها بۆ منیش داوای بەرەکەت بکە باوکە.) ئیتر عیسۆ دەنگی
هەڵبڕی و گریا.

39 ئیسحاقی باوکی وەڵامی دایەوە و وتی:
(نشینگەکەت دوور لە دەوڵەمەندی زەوییەوە دەبێت،
دوور لە شەونمی ئاسمان لە سەرەوە.

40 لەسەر شمشێرەکەت دەژیت و
دەبیتە خزمەتکاری براکەت.
بەڵام کاتێك سەرکێش بوویت،
نیرەکەی[b] دەشکێنیت
کە بە ملتەوەیە.)

فەرموون سەیری سفری ارمیا ٥٠ – ٢٤ بکەن خودا تەڵە بۆ ساری بابل لە عیراق دادەنێت و نوسراوە

ئەی بابل، تەڵەم بۆت نایەوە، بەبێ ئەوەی بزانی پێوە بویت و دۆزرایتەوە و گیرایت چونکە دژایەتی یەزدانت کرد .... دیقەت بدەن

خودا تەڵە دا دەنێت لەبری ئەوەی بنەهێڵێت کەس بە تەڵەوە بێت !؟

http://www.kitebipiroz.com/bible/jer/50

بابەتی ناو لینك

كتێبی پیرۆز » یەرمیا » بەشی ٥٠

24 ئەی بابل، تەڵەم بۆت نایەوە،
بەبێ ئەوەی بزانی پێوەبوویت.
دۆزرایتەوە و گیرایت،
چونكە دژایەتی یەزدانت كرد.

25 یەزدان جبەخانەكەی خۆی كردەوە و
چەكەكانی تووڕەیی خۆی دەرهێنا،
چونكە یەزدان، پەروەردگاری سوپاسالار،
كارێكی هەیە لە خاكی بابلییەكان.

26 لەوپەڕەوە وەرنە سەری!
ئەمبارەكانی بكەنەوە،
وەك كۆمەی دەغڵودان كەڵەكەی بكەن.
بە تەواوی قڕی بكەن،
پاشماوەی نەمێنێتەوە!

27 هەموو جوانەگاكانی[f] بكوژن،
با بۆ سەربڕین ببردرێن!
قوربەسەریان! چونكە ڕۆژیان هات،
كاتی سزادانیان.

هەر سفری **ئیرمیا** ٤٨ – ٤٣ و ٤٤ دا باسی موئابیەكان دەكات . كە نەوەی زینان لە كچەكانی لوط (ع) گوایا باوكیان سواریان بوە و منداڵیان لە باوكیان بووە و پێیان دەڵێن موئابیەكان و بن عمونەكان وە من هیچ ناڵێم سەیری ئەم خودایە بكەن چی لە خەڵكی دەكات و چۆن بە فێڵ و تەڵە و چاڵ هەڵكەندن ڕەحمەتی خۆی نیشانی عەبدەكانی دەدات ؟ ئەی دانیشتووی مۆئاب، ترس و چاڵ و تەڵە چاوەڕێت دەكات ئەوە فەرماییشتی یەزدانە ئەوەی لە ترس هەڵدێت دەكەوێتە ناو چاڵەكەوە ئەوەی لە چاڵەكە دێتە دەرەوە بە تەڵەكەوە دەبێت، چونكە ساڵی سزادان بەسەر موئابدا دەهێنم ئەوە فەرمایشتی یەزدانە

http://www.kitebipiroz.com/bible/jer/48

........................

بابەتی ناو لینك

كتێبی پیرۆز » یەرمیا » بەشی ٤٨

43 ئەی دانیشتووی مۆئاب،
ترس و چاڵ و تەڵە چاوەڕێت دەكات.
ئەوە فەرماییشتی یەزدانە.

44 (ئەوەی لە ترس هەڵدێت
دەكەوێتە ناو چاڵەكەوە،
ئەوەی لە چاڵەكە دێتە دەرەوە
بە تەڵەكەوە دەبێت،
چونكە ساڵی سزادان
بەسەر مۆئابدا دەهێنم.)
ئەوە فەرماییشتی یەزدانە.

لە سفری **حزقیال** ١٢ – ١٣ دا خودا تۆڕ دادەنێت بۆ ڕاو کردنی خەڵکی ؟ نازانم خودای کتێبی پیرۆز مرۆڤ بە ماسی تێ گەیشتووە یان بە ڕیشۆڵە بە تۆڕ دەیان گرێت و دەڵێت منیش تۆڕی خۆمی بۆ دادەنێمەوە، دەکەوێتە تۆڕەکەمەوە، دەیهێنم بۆ بابل، خاکی کلدانییەکان، بەڵام نایبینێت و لەوێ دەمرێت

http://www.kitebipiroz.com/bible/ezk/12

..................

بابەتی ناو لینک

کتێبی پیرۆز « حزقیێل « بەشی ١٢

13 منیش تۆڕی خۆمی بۆ دادەنێمەوە، دەکەوێتە تۆڕەکەمەوە، دەیهێنم بۆ بابل، خاکی کلدانییەکان، بەڵام نایبینێت و لەوێ دەمرێت.

.......................................................................................................................................................

## پرسیارە بێ وەڵامەکان ژمارە :دووسەد

## هەڵەی قورئان خالدا وە خالدین

ئەوەی زانراوە خودای زانا تحدای هەموو مرۆڤەکان دەکات هەتا ڕۆژی قیامەت وە دەفەرموێت ئەم قورئانە لەو پیتانە پێك هاتوون کە ڕۆژانە بەکاری دەهێنن لە قسە کردنتاندا . فەرموون قورئانێکی وەك ئەمە دابنێن یان سورەتێك یان ئایەتێك !؟ ئەوەی تێ دەگەین ئەمە دەبێت کارێکی ئاستەم بێت بۆیە خودا بەو گەورەی و زانایەی خۆیەوە تحدامان دەکات !؟ بەو قورئانە وە کێشە لەوە دایە کابرای دژە ئیسلام خۆی لێ کردوین بە شارەزاتر لە **ابوجهل** و ابو **لهب** و **وەلیدی کوڕی مغیرە** و کافرە سەرسەختەکانی تری قورەیش وە دەڵێت قورئان هەڵەی زمانەوانی تێدایە یەکێك بە حساب لەو هەڵانە ئایەتی ١٤ ی سورەتی **النسائە** لەوێدا باسی تا هەتایی دۆزەخ دەکات و بە تاك ناوی هێناوە ( **خالدا فیها** ) وە لە ئایەتی ٢٣ ی سورەتی **الجن** دا بە کۆ ناوی هاتووە نوسراوە ( **خالدین فیها** ) وە دەڵێن لە هەردووك ئایەتەکەدا باسی تاك دەکات بۆچی لە دانەیەکیاندا هەر بە تاك نوسراوە ( **خالدا** ) بەڵام لە سورەتی جندا بە کۆ نوسراوە ( **خالدین** ) ئەوە هەڵەیە و دەبوایە لە هەردووك ئایەتەکەدا بە تاك بووایا . بۆ وەڵامی ئەم گومانە بە ئیزنی خودا دەڵێین

لە ئایەتی ١٤ ی **النسائدا** ئەگەر ئایەتەکان لە ژمارە یەکەوە هەتا ( ١٢ ) بخوێنینەوە باسی میراتی و دابەش کردنی میراتی و پاراستنی حەق هەتیو دەکات . خۆشتان دەزانن پارە و موڵك شادەماری ژیانی تاك و کۆمەڵ و دەوڵەتیشە کاتێك کەسێك دەمرێت و ئەو موڵکە جێ دەمێنێت دەبێت بە دادپەروەری دابەش بکرێت و زوڵم لە هیچ کام لە بنەماڵەی مردووەکە نەکرێت وە هەتا ئایەتی (١٢ ) ڕوون کردنەوەی چۆنێتی دابەش کردنی ئەو پارە و موڵك و ماڵەیە لە ئایەتی (١٣) دا دەفەرموێت ئەمانە ئەو سنورانەیە کە خودا دایناوە

بۆ میراتی وە هەرکەس پەیڕەوی بکات دەچێتە بەهەشتەوە . لە ئایەتی( ١٤) دا کە ڕەخنەی لێ گیراوە دەفەرموێت : **(و من یعص الله و رسوله و یتعد حدوده)**

واتا هەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانی خودا و نێرراوەکەی بکات وە سنورەکانی ببەزێنێت . وەك دەبینن لێرەدا دوو تاوان هەیە ( سەر پێچی و سنور بەزاندن ) بۆیە خوداش دوو عەزابی دەدات وە دەفەرموێت

**(یدخله نارا خالدا فیها و له عذاب مهین)** : واتا دەیخاتە ئاگرێکەوە بە تەنیا و ئیهانەش دەکرێت ، بەڕێزان تصور بکەن ئەگەر لە دنیاشدا هەتا دەمریت لە خۆشترین شوێن بیت و بە تەنها بیت هەر ناخۆشە وە ئەگەر لە بەهەشتیش بە تەنها بیت هەر ناخۆشە . بۆیە لە ئایەتەکانی دۆزەخدا هەمیشە بە تاك و بە کۆ هاتووە بە گوێرەی سەر پێچییەکان یان تا هەتایە بە تەنها دەبێت کە ئەویش ئیهانەیەکە و عەزابێکە لە ئاگرەکە نا خۆشترە . وە یان بە کۆیە لەگەڵ خەڵکیدا . بەڵام ئایەتەکانی باسی بەهەشت دەکات هەر هەمووی بە کۆیە و هیچ ئایەتێکی تێدا نییە بەتاك بێت

وە ئەگەر بڕۆین بۆ ئایەتی ٢٣ ی سورەتی **الجن** وە لە ئایەتی سەرەتاوە بیخوێنینەوە قسە کەرەکان جنن واتا جنۆکەن . وە ئەوان باسی ئەوە دەکەن کاتێك قورئانیان بۆ خوێندراوە و هاتوەتە خوارەوە وایان زانیووە دوای عیسا (ع) هیچ پێغەمبەرێك و هیچ کتێبێکی نوێ دانابەزێت . بەڵام کاتێك قورئان دابەزیووە ئینجا زانیویانە کتێب و پەیام بەری نوێ هاتووە . بۆیە بون بە چەند بەشێکەوە ئیماندار بە قورئان وە بێ ئیمان و کافر بە قورئان و ئاینی ئیسلام وە لە ئایەتی ١٩ دا بە ڕونی دیارە کە بۆ کۆمەڵێك جنۆکەی زۆر قورئان خوێنراوە . بەڵام ئەوەی سەیرە تەفسیرە کوردییەکەیە زۆر بە سەقەتی تەفسیر و ڕاڤەی ئەو ئایەتەی کردوە و قوڕ بەسەر ئەو موسوڵمانە داماوەی بە تەنها کوردی دەزانێت وە پشت بەم تەفسیرە کوردییە دەبەستێت بۆ تێگەیشتن و ڕاڤەی قورئان ؟

بە هەر حاڵ لە ئایەتی ٢٣ ی سورەتی **الجن** دا بۆیە بە کۆ دەفەرموێت ( خالدین فیها ) چونکە قسەکەرەکان جنۆکەکانن وە خوێندنەوەی قورئان و تبلیغەکە بۆ جنەکانە و ( جن ) خۆی کۆیە و تاکەکەی پێی دەڵێن ( جني ) وە سیاقی ئایەتەکانیش هەتا دەقی ٢٣ باسی تبلیغ و بانگەشە دەکات وە تبلیغی ئاینیش بۆ تاك نییە بەڵکو بۆ کۆمەڵە !؟

ئایەتەکەی ٢٣ ش ڕون و ئاشکرایە دەفەرموێت( **الا بلاغا من الله و رسالاته**) . واتا تبلیغ و پێ ڕاگەیاندنی پەیامەکانی خودایە و ئەوانەی سەرپێچی بکەن دەچنە دۆزەخەوە بە کۆمەڵ . بەڵام لە ئایەتی ١٤ ی **النسائدا** سەرپێچی و سنور بەزاندنە بەوەی حەقی خەڵکی دەخۆن لە میراتدا بۆیە عەزابەکەی ئەوەیە بە تاك و تەنیای دەمێنێتەوە ئەویش ئیهانەیەکە بۆ ئەو کەسە بەڵام باوەڕ نەهێنان حەقی هیچ کەس ناخورێت و پارە و ماڵی نادزرێت وەك میراتی بۆیە خودا عەزابی دەدات وەك چۆن دەڵێێن سجنی ئینفیرادی

وە لە ئایتی ١٤ ی **النسائدا** حەقی مرۆڤ و خودا پێشێل دەکرێت بۆیە عەزابەکەشی توندە و ئیهانەش دەکەێت .

بەڵام لە ئایەتی ٢٣ ی **الجندا** بە تەنها حەقی خودا پێشێل دەکرێت ، ئەویش باوەڕ نەهێنانە

..............................................................................................................................................

# لە کۆتایدا

ئەوەی دەمەوێت پێتانی ڕا بگەیێنم لە کۆتایی ئەم کتێبەدا ئەوەیە : ئەم گومانانە زۆر کۆنن وە تەمەنیان ١٤٠٠ ساڵە وە کاتێك ئەم گومانانە بایەخی هەبوو کە ئاینی ئیسلام لە سەرەتای سەر هەڵدانیدا بوو . وە دوژمنانی ئیسلام و موشریکانی قورەیش دەیان توانی سودی لێ وەر بگرن و و نەهێڵن ئیسلام سەرهەڵ بدات بەو شێوەیە دەیان توانی ئیسلام لەناو بەرن .

پرسیاری گرنگ ئەوەیە : بۆچی کافرانی قورەیش نەیان توانی ئەو کارە بکەن ؟ ئەگەر بڵێن ئەقڵیان پێ نەشکاوە و نەیان زانیوە !؟ دڵنیابن کابرای دژە ئیسلام بێ ئاگایە لە مێژوی اسلام وە بێ ئاگایە لەوەی ئەم گومانانەی ئەم لە ساڵی ٢٠١٥ دا پێمان دەفرۆشێت هەموی قسە و ڕەخنەی موشریکەکانی قورەیشن وە ئەوان زۆر لە دژە ئیسلامی ئێستا شارەزاتر و بە پەرۆش تر بوون بۆ لەناو بردنی ئاینی ئیسلام و قورئان بەڵام نەیان توانی ئیسلام لەناو بەرن . لە هەمووی سەیرتر کە مایەی پێکەنینە دژە ئیسلام باس لەوە دەکات قورئان هەڵەی زمانەوانی تێدایە . ئەمەش خۆی لە خۆیدا مایەی بەزەی و پێکەنینە بە ئاستی زانیاریەکانی دژە ئیسلام . چونکە ئەگەر قورئان هەڵەی زمانەوانیی تێدا بووایا موشریکانی قورەیش زۆر زاناتر و شارەزاتر بووە لە بواری زمانی عەرەبیدا لە دژە ئیسلام و تەنانەت لە زانا عەرەبە ئیسلامییەکانی ئێستاش وە دەیتوانی بەو هەڵانە زۆر بە ئاسانی ئاینی ئیسلام پوچەڵ بکاتەوە و خەڵکیش زمانی خۆیان بوە لەو سەردەمەدا زیاتر باوەڕیان بە کافرانی قورەیش دەکرد کە قورئان هەڵەی کردووە لە بواری بلاغة و زمانەوانیدا . پرسیاری سەرەکیشمان ئەوەیە : بۆچی کابرای کافری قورەیشی نەیتوانی ئاینی ئیسلام پوچەڵ بکاتەوە کە سەرەتای سەر هەڵدانی بوو ؟ بۆچی تۆی دژە ئیسلام لە ساڵی ٢٠١٥ دا هەمان قەوانی کۆنی کافرانی قورەیش لێ دەدەیتەوە و ناتوانیت هیچ بکەیت و هیچ زیانێك بە ئاینی ئیسلام بگەیێنیت ؟ وەڵامەکەی لە ئایەتی ٨ ی سورەتی الصفدایە خودای زانا دەفەرموێت : (یریدون لیطفئوا نور الله بافواههم و الله متم نوره و لو کره الکافرون).

سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ. "

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

وَصَلَّى اللهُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ

# پێرستی بابەتەکان